
التاج
الجامع للأصول
في أحاديث الرسول ﷺ
دانراوی: مامۆستا شێخ مەنصور عەلی ناصف
وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان
محمود أحمد محمد
پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە
دار المعرفة
بيروت - لبنان



# التَّاجُ
# ألجَامِعُ لِلأُصُول
## في أحاديث الرَسُول ﷺ

دانراوى: ماموّستا شيّخ مەنصور عەلى ناصف

وەرگيّرانى: نورى فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد
پيّيدا چوّتەوەو سەرپەرشتى لە چاپدانى كردووە

بەرگى سيّهەم - چاپى چوارەم

دار المعرفة
بيروت - لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

# التاجُ الجامِعُ للأصُول


📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حمە خان

📖 پێداچونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد

📖 چاپ: چوارەم

📖 ساڵی چاپ : ٢٠٠٨

📖 تایپ و دیزاین: کەژاڵ حسین/کۆمپیوتەری شانیا

📖 تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن:

📖 هەڵەگری: لاڤە هۆشیار محمد علی - کچەزای م.نوری فارس





📖 ژمارە سپاردنی (٢٣٩٥) ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێدراوە

ئـــەم پـــەڕاوە پـــیرۆزە لەســـەر فەرمایـشتی دانەرەکـــەی پوختـــەی حەدیثەکانی ئەم پەڕاوە پیرۆزانەیە :

١ ) صحيح البخارى

٢ )صحيح مسلم

٣ )سنن أبى دَاوُدَ

٤ ) جامِعُ الترمذي

٥ )المُجْتَبى لِلنَّسَائِىَ

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی حودوود (تۆڵەی تاوان)

(ئەم نامەیە حەوت باس و پاشەكییەكە (پاشكۆیەكە))

## ٨١) باسی یەكەم: هەڕەشەكردن لەكەسێ كەسێ بكوژێ و باسی ئەوەی كە حەددی شەرعی پێویست دەكا

## كتاب الحدود: (وفيه سبعة أبواب وخاتمة)

## الباب الأول: في الترهيب من القتل وما يوجب الحد

قال الله تعالى: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا} (٤/٩٣).

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی نەوەدو سێدا دەفەرموێ: هەركەسێ موسوڵمانێ بەقەستی بكوژێ بە ناڕەوا، ئەوە سزای ئەو بكوژە دۆزەخەو حاڵی وایە هەتا هەتایە لە دۆزەخا دەمێنێتەوە، وە خودا رق و خەشمی لێ دەگرێ و نەفرین و لە عنەتی لێ دەكا و دووری دەخاتەوە لە رەحمەت و میهرەبانی خۆی و سزایەكی گەورەی بۆ ئامادە دەكا.

٢٢٨٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لاَ تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، لأَنَّهُ كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ[1].

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەفەرموێ وەهەر كەسێ بەناڕەوا بكوژرێ بەشێ لە ئۆباڵی خوێن رشتنەكەی بە ئەستۆی كوڕە پێشووەكەی ئادەمە واتە: بە ملی قابیلە چونكە ئەو یەكەم كەس بوو كە پیاو كوشتنی داهێنا وەك خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (مائیدة) دا لە ئایەتی سیێهەمدا دەفەرموێ: {فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ} جا نەفسی قابیل كوشتنی

---

[1] بخاری. أحادیث الأنبیاء: ٣٣٣٥، ٦٨٦٧، ٧٣٢١. مسلم. قسامة: ٤٣٥٥. تیرمذی. علم: ٢٦٧٣. نسائی. تحریم الدم: ٣٩٩٦.

**هابیلی برایی لەبەر چاوی جوانکرد، وەکوشتی، ئیتر بەم کردەوە ناپەسەندە قابیل بوو بە پیاوێکی پیاو کوژی زیانبار لە هەردوو جیهاندا.** (ش/ت/ن- **واتە ئیمامی بوخاریو ئیمامی موسلیمو ئیمامی تیرمیذیو ئیمامی نەسائی** (خودایان لێ رازی بێ) **ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووە).**

**٢٢٨٨- وَعَنْهُ عَنْ النبِي** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ. وفِي رواية: أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلاَةُ وَأَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ. رواهما الخمسة إلا أبا داود**[2]. [1]

**واتە: دیسان عەبدوڵلاَ** (خودای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت یەکەم شت کە ئادەمیزاد لەسەری دادگەرییو مەحکەمە دەکرێ مەسەلەی خوێن ڕشتنو پیاو کوشتنە. لە گێڕانەوەیەکا: یەکەم شت کە بەندە لەسەری موحاسەبە دەکرێ نوێژە، یەکەم شتیش کەئادەمیزاد مەحکەمەی دەکرێ لەسری مەسەلەی خوێن ڕشتنو کوشتنە (ش/ت/ن).**

---

[2] بخاری. رقاق: ٦٥٣٣، ٦٨٦٤. مسلم. قسامة ومحاربين: ٤٣٥٧. ترمذی. دیات: ١٣٦٩، ١٣٩٧. نسائی. تحريم الدم: ٤٠٠٣، ٤٠٠٤، ٤٠٠٥، ٤٠٠٧.

[1] قال المؤلف (طيب الله تعالى ثراه) في خطبة الكتاب في بداية المجلد الأول مايلی: وأن قلت راوه الشيخان عنيت البخاری ومسلما، وأن قلت رواه الثلاثة أردت الشيخين وأبا داود، و ان قلت رواه الأربعة قصدت الثلاثة والترمذی وان قلت رواه الخمسة عنيت الأربعة والنسائي وان قلت رواه أصحاب السنن قصدت أبا داود والترمذي والنسائي، ولو أختلف النظام عن هذا بينته بالنص عليه: دانەر (پڕ گلکۆکەی لە بۆنو بەرامەی بەهەشت بێ) لە سەرەتای بەرگی یەکەمدا دەفەرموێ: ئەگەر گوتم: شەیخان ئەم حەدیسەیان ریوایەت کردووە ئەوە مەبەستم لە شەیخان شێخی بوخاریو شێخی موسلیمە، ئەگەر گوتم: سێ ئیمامەکان گێڕاویانەتەوە ئەوە مەبەستم بوخاری و موسلیمو ئەبو داوودە، ئەگەر گوتم: چوار ئیمامەکان گێڕاویانەتەوە، ئەوە مەبەستم بوخاری و موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیذییە، ئەگەر گوتم: پێنج ئیمامەکان گێڕاویانەتەوە، ئەوە مەبەستم بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائییە، ئەگەر بە جۆرێکی تریش بوو جیا لەم یاسایە، ئەوا خۆی چۆن بوو ڕێك وا دەڵێم. - وەرگێڕ-

٢٢٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عنهما) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَنْ يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ، مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود. ولفظه: (عَلى ماهو في الشرح): لا يَزَالَ الْمُؤْمِنُ مُعْنِقاً (أي خفيف الظهر) صالحاً مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا (أي لم يُقتل عمداً) فَإذا أَصَابَ دَماً حَرَاماً بَلَّحَ (أي هلك)[٣].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان هەتا خوێن رشتنی ناڕەوا نەبێ بە تووشیەوە هێشتا ئایینی بەبەریەوە دەمێنێ (ب/د) گفت (لفظ) ی ئەبو داوود – بە پێی شەرحەکەی دانەر خۆی کەناوی غایەتولمەئموولی شەرحی تاجول ئوصول – ئاوایە: موسوڵمان هەتا خوێنی ناڕەوا بە قەستی نەڕێژێ هێشتا کوڵی سووکەو خۆش رەوتەو هەر باشە، بەڵام هەر کاتێ خوێنی ناڕەوا بوو بە تووشیەوە ئیتر لەپێ دەکەوێ و دەوەستێ؟

٢٢٩٠- ولأبي داود والنسائي: كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إِلاَّ مَنْ مَاتَ مُشْرِكاً أَوْ مُؤْمِنٌ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّدًا[٤].

ئەبو داوودو نەسائی (رەزای خودایان لێبێ) دەگێڕنەوە کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەوانەیە کە خودا لە گوناهی هەموو کەسێ خۆش ببێ، بەڵام لە گوناهی ئەو کەسە خۆش نابێ کەلەسەر بتپەرستی و خودا نەناسی دەمرێ، هەروەها لە گوناهی ئەو موسڵمانەیش خۆش نابێ کەبەقەستی موسوڵمانێ دەکوژێ!

٢٢٩١- وَللترمذي والنسائي: لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ[٥].

---

[٣] بخاری. دیات: ٦٨٦٢، ٦٨٦٣.

[٤] سكت عنه الشارح.

[٥] رَواه الترمذی بسند صحيح «شرحه».

تیرمـذی‌و نەسـائی (ڕەزای خـودای گـەورەیان لێبـێ) دەگێڕنـەوە لـە حەزرەتـەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: لـەلای خـودا ئـەم جیهانـە لـە ناوبچێ نـەوەكا پیاوێكی موسوڵمان بەناڕەوا بكوژرێ (ت-س/ص-ن).

٢٢٩٢- وللترمذي: لَوْ أَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ وَأَهْلَ الأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لأَكَبَّهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ[٦].

تیرمذی (خودای لێ ڕازی بێ) بەسەنەدێكی غەریب دەگێڕێتـەوە لـە حەزرەتـەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: ئەگـەر خـەڵكی ئاسمـان‌و خـەڵكی سـەرزەوی بەهاوبەشی خوێنی بڕواداری (موسوڵمانێ) بەناڕەوا بڕێـژن، خـودا هـەموویان لەسەر ئەوە لە ئاگری دۆزەخدا سەرەنگرێ دەكا.

٢٢٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَهْوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَحَسَّى سَمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَسَمُّهُ فِي يَدِهِ، يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ، يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا. رَوَاهُ الأربعة (رضوان الله تعالى عليهم)[٧].

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) دەڵـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: كەسێ لە كێوێكەوە یا لـە بەرزییەكەوە خۆی بەربداتـەوەو خۆی بكوژێ، ئەوە هەمیشە لەو كێوەوە خۆی هەڵدەداتە ناو ئاگری دۆزەخـەوەو هەتا هەتایە ئەوە كارو پیشەیەتی‌و بە ئێجگاری تیا دەمێنێتـەوە، وە كەسێ زەهر بخواتەوەو بەزەهر خۆی بكوژێ ئەوە لـە ئاگری دۆزەخیشا زەهرەكەی هەر وا لەناوی دەستیاو پەیتا پەیتا دەیخواتەوەو هەتا هەتایە بە ئێجگاری لـە ئـاگری دۆزەخـدا دەبـێ‌و هەمیـشەیش ئەمـە حـاڵ‌و كـارو پیـشەی دەبـێ! وە كەسێ بە پارچە ئاسنێ خۆی بكوژێ ئـەوە لـە ئاگری دۆزەخیشا ئـەو پارچە

---

[٦] رَوَاهُ الترمذی بسند غریب (شرحه).

[٧] بخاری. جنائز: ١٣٦٥، ٥٧٧٨، ١٣٦٣. مسلم. إیمان: ٢٩٦، ٢٩٧. ترمذی. طب: ٢٠٤٤. نسائی. جنائز: ١٩٦٤.

**ئاسنە دەگرێ بەدەستیەوەو خۆش خۆش دەیكا بەورگی خۆیا، ئیتر هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو ئەوە حاڵیەتی[1].**

**٢٢٩٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٨].**

**دیسان ئەو لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): خۆتان دوور بگرن لە حەوت تاوانی كوشندە. یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو حەوتە چیو چین؟ فەرمووی:**

**یەكەم: شیركو هاوبەش پەیدا كردن بۆ خودای تاكو تەنیا.**

---

[1] أتفق اهل الحق ان من مات موحدا دخل الجنة قطعاً أما لطفاً وكرما من الله تعالى وأما بعد الحساب والعقاب، فإذا ورد حديث أو آية في ظاهرة مخالفة لهذه القاعدة المقررة وجب تأويله عليها، وخلاصة التأويل للأحاديث المصرحة بخلود المؤمن في النار أن المراد بذلك أما في حق المستحيل أو المراد المكث الطويل. -المترجم-

واتە: زانا هەقناسەكان دەفەرموون: كەسێ لەسەر ئیسلامەتی بمرێ زوو یا درەنگ دەچێتە بەهەشت سا یا بەكەرەمی خودا خۆی، یا لەپاش لێ پرسینەوەو تۆڵە لێ سەندن. جا ئەگەر حەدیسێ یا فەرموودەیێ بەدیمەن لەگەڵ ئەم یاسایەدا جوێ بوو ئەوە دەشێ بە پێی ئەم یاسا بڕیاردراوە تەئویل بكرێ، واتە: ببرێتەوە سەر مەبەستە راستەقینەكەی، وەك لێرانەدا مەبەست مانەوەیەكی ئێجگار زۆرە لە دۆزەخدا، یا مەبەست هەڕەشەو زەجرو چاو ترساندنو كۆكردنەوەیە لە خۆ كوشتن، بگرە لە هەموو، شوێنێ كە بۆنی ئەم بابەتەی لێ دێ پوختەی تەئویلو بردنەوە سەرمەبەستەكەی ئەمەیە كە گوترا، هەندێ لە برادەران دەفەرموون: ئەگەر كەمە كەمە شەرحو راڤەیش، بە پێی پێویست، بۆ ڕوونكردنەوەی شوێن هەبێ باشترە، بەتایبەت لە سەرەتای بەرگەكانەوە. - وەرگێڕ-

[٨] بخاری. وصايا: ٢٧٦٦، ٥٧٦٤، ٦٨٥٧. مسلم. إيمان: ٢٥٨، ٢٥٧. ترمذی. بيوع: ١٢٠٧، ٣٠١٨. نسائی. تحريم: ٤٠٢١، ٣٦٧٣، ٤٨٨٢. أبو داود. وصايا: ٢٨٧٤.

دووەم: سیحرو جادووگەری.

سێیەم: کوشتنی کەسێ کە خودا رەوای لەسەری نەبێ.

چوارەم: سوو خواردن (ریبا).

پێنجەم: خواردنی ماڵی هەتیو.

شەشەم: هەڵهاتن و پشت هەڵکردن لە دوژمنی دین لە ڕۆژی هێرش هێنانی دوژمنانا.

حەوتەم: بوختانی داوێنپیسی هەڵبەستن بۆ ئافرەتی داوێنپاکی بێ ئاگای موسوڵمان (ش/د/ن).

٢٢٩٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَبْغَضُ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ ثَلاَثَةٌ مُلْحِدٌ فِي الْحَرَمِ، وَمُبْتَغٍ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَمُطَّلِبُ دَمِ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَقٍّ لِيُهَرِيقَ دَمَهُ. رَوَاهُ البخاري[٩].

لە ئیبنوعەبباسەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا لە هەموو کەسێ زیاتر رقی لەم سێ کەسەیە:

یەکەم: زەندیقی ناو حەرەمی مەککە.

دووەم: کەسێ لە ئیسلامەتیدا، منەیی رەوشت و یاسای سەردەمی نەزانی بکا.

سێیەم: کەسێ منەی خوێنی کەسێ بکا تا بە ناڕەوا خوێنی بڕێژێ. (ب = بوخاری. رەزای خودای لێبێ).

٢٢٩٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَقْتُلُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ. وَزَادَ أبو هريرة في رواية لهذا والتَّوبَةَ مَعْرُوضَةٌ بَعْدُرَوَاهُ الخمسة[١٠].

---

[٩] بخاری. دیات: ٦٨٨٢.

[١٠] تقدم فی المجلد الثانی برقم: ١٩٢٢ تسلسل/ ١٧٥.

➡(ب – ٢ ز – ١٧٥ ل – ٣٦٦ ف – ١) گێڕانـــەوەی ئێـــرە بـــەم شێوەیەیە: ئیبنو عەبباس (خودایان لیّ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: بەنـدە (لـەو کاتـەدا کـە خـەریکی شەروالپیـسییە) بەموسـوڵمان دانانرێ، وە هەروا لەکاتی کردنی دزیشدا، وە هـەروەها لـەکاتی خواردنـەوەی ئارەقـدا، موسـوڵمانو پیـاو کوشتنیـشیان نـەگوتووە! لـە گێڕانـەوەی ئـەبو هـورەیرەدا ئـەم فەرموودەیـە ئـەم زیادەیەشـی هەیـە: بـەلاّم لـەوەدوا، دەرگـای تەوبە لە سەرپشتەو لەکەس داناخرێ تا دەگاتە ڕادەی گیانەلاّ (ش/د/ت/ن).

٢٢٩٧- وَسُئِلَ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَمَّنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا ثُمَّ تَابَ وَاهْتَدَى (أله من توبةٍ؟) فَقَالَ: وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: يَجِيءُ الْمَقْتُولِ مُتَعَلِّقًا بِالْقَاتِلِ تَشْخُبُ أَوْدَاجُهُ دَمًا فَيَقُولُ أَيْ رَبِّ سَلْ هَذَا فِيمَ قَتَلَنِي. ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ نَزَلَتْ وَمَا نَسَخَهَا شَيْءٌ[11].

پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس (خودایان لیّ رازی بێ) ئەگەر کەسێ بە ئەنقەست موسوڵمانێ بکوژێو لـە پاشا ڕێـی ڕاسـت بگـرێ، ئایـا تەوبـەو پەشیمانی بۆ هەیـە یانـا؟ گـوتی: لـە کـوێ تەوبـەی بـۆ هەیـە، بـە گـوێی خـۆم ژنـەوتم لـە پێغەمبـەری نـازداری ئێـوە دەیفـەرموو شـاڕەگەکانی ملـی کـوژراو کفـارەی خوێنیـان دێ وەك تـازە ئـەو دەمـە کوژرابـێ ئـاوا لەسـەر ئـەو حاڵـە، دەچـێ یەخەی بکوژەکەی دەگرێو دەیهێنـێ بۆ خزمـەتی خـوداو عـەرزی دەکا: ئـەی پەروەردگاری من! لەمە بپرسە لەسەر چی منی کوشت ئینجا ئیبنو عـەبباس (خودایان لیّ رازی بێ) گوتی: بەو خودایە ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا} ➡ ئـــەم ئایەتـــە ئەوەتـــەی هاتۆتـــە خـــوارەوە هێـــشتا هـــیچ شـــتێ هـــەڵی نەوەشاندۆتەوەو حوکمەکەی نەسخ نەکردۆتەوە جا کەوا بوو ئیتر تەوبـەی بۆ نیە (د/ش).

---

[11] بخاری. تفسیر: ٤٧٦٣، ٤٧٦، ٤٥٩٠. مسلم. تفسیر: ٧٤٦٤، ٧٤٦١.

٢٢٩٨- وَقَالَ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْر:قُلْتُ لِابنِ عَبَّاس: هَلْ لِمَـنْ قَتَـلَ مُؤْمِنًـا مُتَعَمِّـدًا تَوْبَةٌ؟ قَالَ: لاَ، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ آيَةَ الفُرْقَانِ إلى: {إِلَّا مَن تَابَ} قَالَ: هَذِهِ مَكِّيَّةٌ نَسَخَتْهَا آيَةٌ مَدَنِيَّةٌ {وَمَن يَقْتُـلْ مُؤْمِنًـا مُّتَعَمِّـدًا فَجَـزَآؤُهُ جَهَـنَّمُ}. رواهمـا النـسائي والـشيخان في التفسير[١٢].

سەعیدی کوڕی جوبەیر (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) دەڵیٚ: خەڵکی کووفە لەواتەی ئەم ئایەتەدا ڕایان جیا جیا بوو، جا من چووم گوتم بە ئیبنو عەبباس: ئەگەر یەکیٚ بەقەستی موسوڵمانیٚ بکوژیٚ ئایا گەڕانەوەو پەشیمانی بۆ هەیە؟ گوتی: نەء، منیش ئایەتەکەی سوورەتی فوڕقانم خویٚندەوە بۆی هەتا دەگاتە ئەویٚ کە دەفەرمویٚ: {إِلَّا مَن تَابَ}[١]. ئەویش گوتی: ئەم ئایەتە مەککەییە بەم ئایەتە مەدینەییە هەڵوەشاوەتەوە کە دەفەرمویٚ: {وَمَـن يَقْتُـلْ مُؤْمِنًـا مُّتَعَمِّـدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ}. (ن/ش)

٢٢٩٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَتَلَ نَفْـسًا مُعَاهَدًا لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًـا. رَوَاهُ البخـاري والترمذي[١٣].

---

[١٢] بخاري. تفسير: ٤٧٦٢. مسلم: ٧٤٦١.

[١] فوڕقان ٦٨-٧٠ واتەو تەفسیری ئایەتەکان وایە: بەندەکانی خودای میهرەبان ئەوانەی کە هەر خودا دەپەرستن داوای ڕزق‌و ڕۆزی لەکەسی تر ناکەن لەو نەبیٚ، وە کەسیٚ کە خودا کوشتنی ئەوی ڕەوا نەدیبیٚ نایکوژن مەگەر لەسەر هەق، وە زیناو داویٚنپیسیش ناکەن، وە هەر کەسیٚ ئەم گوناحانە بکا دەگا بە تۆڵەی تاوانی خۆی‌و لە ڕۆژی قیامەتا لەناو دۆزەخا سزاو ئازاری بۆ چەن قات دەکریٚتەوە، ئیتر ئاوا بەدەم ئیٚش‌و ئازارەوە لەناو دۆزەخی داخراودا بە سووکی‌و ترۆیی‌و بیٚ نرخی دەمیٚنیٚتەوە هەتا هەتایە مەگەر کەسیٚ نەبیٚ کە لەپاش کردنی ئەم گوناهانە تەوبە بکاو کردارو ڕەفتاری خۆی باش بکاو ڕوو لە خودابیٚ، ئەوە ئەو جۆرەکەسانە خودای گەورە تاوانەکانیان دەپۆشیٚ‌و خراپەکانیان بۆ ئاڵوگۆڕ دەکا بە چاکە، چونکە خوا میهرەبان‌و تاوانبەخشە. - وەرگیٚڕ -

[١٣] بخاري. ديات: ٦٩١٤.

**عەبدوڵلای کوڕی عەمر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەرکەسێ یەکێ لە ئەهلی ذیممە بکوژێ بۆنی بەهەشت ناکا، وەلحاڵ بۆنی بەهەشت چل ساڵە ڕێگە دەڕوا (ب/ت/** خودایان لێ ڕازی بێ).

**٢٣٠٠- عَنْ جَابِرٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ الطُّفَيْلَ بْنَ عَمْرٍو الدَّوْسِيَّ أَتَى النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ لَكَ فِي حِصْنٍ حَصِينٍ وَمَنَعَةٍ فَأَبَى ذَلِكَ رسول الله** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **لِلَّذِي ذَخَرَ اللَّهُ لِلأَنْصَارِ فَلَمَّا هَاجَرَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **إِلَى الْمَدِينَةِ هَاجَرَ إِلَيْهِ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو وَهَاجَرَ مَعَهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ فَمَرِضَ الرَّجُلُ فَجَزِعَ فَقَطَعَ بَرَاجِمَهُ بِمَشَاقِصَ فَشَخَبَتْ يَدَاهُ حَتَّى مَاتَ فَرَآهُ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فِي مَنَامِهِ فَرَآهُ فِي بِهَيْئَةٍ حَسَنَةٍ وَرَآهُ مُغَطِّيًا يَدَهُ فَقَالَ لَهُ: مَا صَنَعَ بِكَ رَبُّكَ؟ قَالَ غُفِرَ لِي بِهِجْرَتِي إِلَى نَبِيِّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَقَالَ: مَا لِي أَرَاكَ مُغَطِّيًا يَدَيْكَ؟ قَالَ: قِيلَ لِي لَنْ نُصْلِحَ مِنْكَ مَا أَفْسَدْتَ. فَقَصَّهَا الطُّفَيْلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَقَالَ: اللَّهُمَّ وَلِيَدَيْهِ فَاغْفِرْ. رَوَاهُ مسلم في الإيمان نسأل الله الستر والتوفيق آمين. والله أعلى وأعلم[١٤].**

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **عەرزیکرد: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! ئەگەر دەفەرموویت ئەوا کۆچ بکە بۆ وڵاتی ئێمە، بۆت دەبین بە قەڵای پۆڵایین و شووڕای ئاسنین، بەڵام پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **قوبووڵی نەکرد، چونکە خودا ئەو سەربەرزیی و شانازیی و دەستی خێر لێنانەی هەڵگرتبوو بۆ یاریدەدەران و کردی بەخەڵاتی ئەنصار، جا کاتێ کە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **کۆچی کرد بۆ مەدینەی مونەوەرە طوفەیل و پیاوێ لە هۆزەکەی هەردووکیان کۆچیان کرد بۆ خزمەتی، وەلەوێ پیاوەکە ئاوو هەوای ئەوێی پێ نەکەوت و نەخۆش کەوت و ئۆقرەی لێ بڕاو بە دەمەتیرێکی**

---

[١٤] مسلم. إيمان: ٣٠٧.

پانكۆڵــە جەمــسەری پەنجــەكانی خــۆیی بڕییــەوە، ئــیتر هــەردوو دەســتی زاماربوون‌و خوێنیان بەربوو، وە خوێنەكەیان نەوەستایەوە هەتا مرد، لەپاشا طوفەیل لە خەودا لە شێوەیەكی جواندا دەیبینێ، بەڵام دەڕوانێ كە هەردوو دەستی خۆیی داپۆشیوە، جا پێی دەڵێ: پەروەردگارت چۆن بوو لەگەڵتا؟ دەڵێ: بەهۆی كۆچكردنم بۆ خزمەتی پێغەمبەرەكەی لێم خۆش بوو، جا طوفەیل دەڵێ: ئەدی دەبینم هەردوو دەستی خۆتت داپۆشیوە؟ دەڵێ: پێم گوترا: ئەوەی كە خۆت خراپت كردووە لە لەشی خۆت ئێمە چاكی ناكەینەوە بۆت! جا كە طوفەیل ئەم خەونەی گێڕایەوە بۆ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی خودای گەورەمان! لە دەستەكانیشی خۆش ببە دیارە كە نزاو دوعای پێغەمەر گیرایە. (م- خودای لێ رازی بێ).

٢٣٠١- ولأبي داودَ (عَلى ماهو في الشرح): إِذَا زَنَى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنْهُ الإِيمَانُ فَكَانَ عَلَى رَأْسِهِ كَالظُّلَّةِ فَإِذَا أَقْلَعَ رَجَعَ إِلَيهِ الإِيمَانُ. (وكالزنا غيره)[١٥].

ئیمامی ئەبو داوود (رەزای خودای گەورەی لێبێ) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرمووێ: كاتێ پیاو خەریكی شەڕواڵپیسی دەبێ، لەو كاتەدا ئیمان‌و باوەڕەكەی باردەكاو دەچێ لەو دوورەوە لەسەر سەری وەك كاژە هەور دوورە پەرێز را دەوەستێ بەڵام كاتێ دەست هەڵدەگرێ ئیمان‌و باوەڕەكەی دەگەڕێتەوە بۆ لای وە هەموو تاوانەكانی تریش لەم بارەیەوە وەك شەرواڵپیسی وان.

## ٨٢) لا باسێ. باسی تۆڵەسەندن (قیصاص): (فصل في القِصَاصِ)

قَالَ اللّه تَعَالَى: {وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ}(٢/١٧٩).

[١٥] سكت عنه الشارح. راجع رقم: ٦٨٠٩ مع بعده في صحيح البخاري. (مترجم).

**خودای مەزن دەفەرموێ: ئەی هۆشمەندان و هۆشیاران! لە دامەزراندنی یاسای تۆڵەسەندندا (کەبریتییە لە کوشتنەوەی بکوژ لەباتی کوژراو) بۆ ئێوە هەیە ژیان و زیندەگییەکی گەورەو بەنرخ، هیوا وایە کە خۆتان بپارێزن لە پیاو کوشتن.**

وقَالَ تَعَالَى: {يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بالأُنثَى} (٢/١٧٨).

**خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانەکان! خوداوەندی مەزن دایناوە لە سەرتان، تۆڵەسەندن لە هۆی کوژراوەکانەوە، بە یەکسانی، بەم ڕەنگە لەباتی ئادەمیزادی کوژراوی ئازاد ئادەمیزادی بکوژی ئازاد دەکوژرێتەوەو لەباتی بەندە بەندەو لەباتی مێیینە، مێیینە.**

٢٣٠٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ لَهَا مَنْ فَعَلَ بِك هَذَا أَفُلاَنٌ أَوْ فُلاَنٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ، فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَجِيءَ بِالْيَهُودِيِّ فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَرُضَّ رَأْسُهُ بِحَجَرَيْنِ. رَوَاهُ الخمسة[١].

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێکی جوولەکە لەسەرهەنێ خشڵ لە نێوانی دوو بەردا سەری کچۆڵەیەکی شکاندبوو لە پاشا تووڕیشی دابووە ناو بیرێکەوە، کاتێ دۆزییانەوە هێشتا نیوە گیانێکی تیا مابوو جا لێیان دەپرسی: کێ وای لێکردووی؟ ئایا فیسارە کەس بوو؟ ئایا ئەم بوو؟ ئایا ئەو بوو؟ تا ناوی کابرایەکی جوولەکەیان هێناو گوتیان: ئایا فیسارە جوولەکە وای لێ کردوویت؟ ئەویش سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی کرد: ئا. کە ئەو وای لێ کردووم، جا کابرای جووەیان هێنا، وە پێی لە کارەکە ناو چووە ژێر**

---

[١] بخاری. حضومات: ٢٤١٣، ٢٧٤٦، ٥٢٥٩، ٦٨٧٦، ٦٨٧٧، ٦٨٧٩، ٦٨٨٤، ٦٨٨٥. مسلم. قسامة: ٤٣٤١. أبو داود. دیات: ٤٥٢٧. ترمذی. دیات: ١٣٩٤. نسائی. قسامە: ٤٧٥٦.

تاوانەکە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی دا لە نێوانی دوو بەردا سەری ئەویشیان شکاندو لەباتی کچۆڵەکە کوشتیانەوە(*). (ش/د/ت/ن).

٢٣٠٣- وَعنهُ أَنَّ ابْنَةَ النَّضْرِ لَطَمَتْ جَارِيَةً، فَكَسَرَتْ ثَنِيَّتَهَا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَمَرَ بِالْقِصَاصِ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٢].

دیسان گوتی: کچەکەی نەضر شەپازللەیەکی دابوو لە کچێ، ددانێکی پێشەوەی شکاندبوو، کە چوون بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کرد بە تۆڵە سەندن (ب/د/ش).

٢٣٠٤- وَعَنْهُ أَنَّ أُخْتَ الرُّبَيِّعِ أُمَّ حَارِثَةَ جَرَحَتْ إِنْسَانًا فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ. فَقَالَتْ أُمُّ الرَّبِيعِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُقْتَصُّ مِنْ فُلاَنَةَ؟ وَاللَّهِ لاَ يُقْتَصُّ مِنْهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سُبْحَانَ اللَّهِ يَا أُمَّ الرَّبِيعِ الْقِصَاصُ كِتَابُ اللَّهِ. قَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ لاَ يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَدًا. قَالَ: فَمَا زَالَتْ حَتَّى قَبِلُوا

---

(*) وەردە خەڵقەکەی نوێی کوردەواری
خوا هەریەکێکتان کا بەهەزاری
کۆرپەم! چووزەرەی کۆتەرەی هیوام
دەستم دامەنتان بگەنە فریام
نیوە گیانێکم گەر تێدا ماوە
بەتەمای نێوە ماوم بەپاوە
ئەویش بە قوربان گەردی بەرپێتان
سەریش بەردەباز ڕێگەی بێ ڕێتان
نێوەن نووری چاو، هێزن بۆ هەناو
کە نێوە نەمان، نەما بۆ کورد ناو

ئەم شیعرانە کۆمەڵێ شیعری جوانو ناسك بوون، لەپاش هەڵدانەوەی شۆڕش، لە پاش نشوستی یازدەی ئازار گوتراون، کاتێ زانیم وردە وردە پێشمەرگە لە چیاکان پەیدا بوونەتەوە، ئەم شیعرانەم گوت. - وەرگێڕ — ٢٠٠٧/٥/٥

(٢) بخاری. صالح: ٢٧٠٣، ٢٨٠٦، ٤٤٩٩، ٤٥٠٠، ٤٦١١، ٦٨٩٤.

الدِّيَةَ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

دیسان ئەو دەڵێ: ئوممو حاریسەی خوشكی روبەییع كەسێكی زامار كردبوو، بۆ داد پرسی چوونە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەشێ لە تۆڵەی ئەوەدا تۆڵە لە میش بسەندرێ بەڵام دایكی رەبیع گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆڵە لە فیسار دەسێنرێ؟ بەو خوایە ئومێد بەكەرەمی خودا، خوا حەزكا شتی وا نابێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سوبحانەڵلاّ! ئەی دایكی رەبیع! تۆڵە سەندن لەم حاڵەدا فەرمانی قورئانە كە نامەی خودایە، ئوممو رەبیعیش گوتی: بەو خودایە شتی وا نەبووەو نە دەبێ. گوتی: ئیتر ئەو ژنە هەروازی نەهێناو كۆڵی نەدا هەتا كە سوكاری ددان شكاوەكە بە خوێن رازی بوون‌و چەردەیێماڵیان لە خوێنی ددانەكەدا وەرگرت‌و وازیان لە تۆڵەسەندن هێنا ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەندێ لە بەندەكانی خودا ئەوەندە لەلای خودا نازدارو خۆشەویست‌و خاتر دارن ئەگەر بە ئومێدی لوتفی خودا سوێند لەسەر شتێ بخۆن، خودا سوێندیان ناخات‌و ئەو شتە بەدڵی ئەوان دەكا (ش).

٢٣٠٥- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ثِنْتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ. رَوَاهُ الخمسة نسأل الله تعالى الرشد والهداية. والله أعلى وأعلم[٤].

شەدادی كوڕی ئەوس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دوو شتم لە پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەر كردووە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ): خودا چاكەی لەسەر هەموو شتێ نووسیوە، وە فەرمانی كردووە كە هەموو شتێ

---

[٣] بخاری. تفسیر: ٤٥٠٢. مسلم. قسامة/ محاربین: ٤٣٥٠.

[٤] مسلم. صید: ٥٠٢٨. ریاض صالحین/٢ ز: ٧٤ ذ: ٩/ ٦٤٠ ل- ١٧٣. أبو داوُد. أضاحی: ٢٨١٥. ترمذی. دیات: ١٤٠٩. نسائی. ضحایا: ٤٤١٧.

بەڕێكو پێكیو لەسەر شێوەیەكی جوانو ڕەوا بكرێ جا كە وابوو، ئەگەر كەسێكتان لە تۆڵەی كەسێكی كوژراودا كوشتەوە، یابە حەددی شەرعی كوشتتان ئەوە لەسەر شێوەیەكی باش بیكوژنەوەو لەو كاتەدا بە نەزاكەت بن لە گەڵیاو ئەگەر داوای شتێكی كرد لە پێش كوشتنیدا بیدەنێو شایەتمانی پێ بێنن، تالەسەر ئیسلامەتی بمرێ وە هەروەها ئەگەر شتێكتان سەربڕی لەسەر شێوەیەكی باش سەری ببڕن، وەتیغەكەتان تیژ بكەنو پشووی كوشتییەكەتان بدەن وزیادە ئازاری مەدەن (ش/د/ت/ن – خودایان لێ ڕازی بێ).

## ٨٣) باسی دووەم: باسی خوێن دانو خوێن بایی

## الباب الثاني: في الدية

قال الله تعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ} (٢/١٧٨).

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی خاوەن باوەڕان! نووسراوە لەسەر یاسای كوشتنەوەی بكوژ،لەتۆڵەی ئازاددا بكوژی ئازاد دەكوژرێتەوە، هەروا لە تۆڵەی كۆیلەدا كۆیلەو لە تۆڵەی مێیینەدا مێ یینە. جا ئەگەر كوژراوەكە خۆی لە پێش گیان دەرچوونیا بكوژەكەی ئازاد كرد لە خوێنی خۆی، یایەكێ لە كەسوكاری كوژراو بكوژی ئازادكرد لە بەشەكەی خۆی لەو خوێنە، ئیتر نابێ بكوژرێتەوە، وە دەبێ بەپێی باوی ناوخۆیانو لەسەر یاسایەكی جوان خوێن وەربگرن، وە بكوژیش خوێنەكە بدات بە خاوەن خوێن بەچاكی، ئەم یاسای چاوپۆشیو بە خوێن ڕازیبوونە میهرەبانیو مەرحەمەتە لەلایەنی خوداوەو مایەی بارسوكییە بۆ ئێوە، دەی هەركەسێ لە پاش ئەمە دەست درێژی بكا، بەم ڕەنگە بچێت بكوژ بكوژێتەوە، وەیا ماڵدەر ماڵەكە نەدا، ئەوە لەلایەنی خوداوە سزایەكی گرانی پڕ ئێشو ئازاری هەیە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَمَن قَتلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ} (٩٢/٤).

**واته: خودای گەورە دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێكی تر بە هەڵە بكوژێ ئەوە لەسەری پێویستە كە بەندەیەكی موسوڵمان ئازاد بكا وە خوێنیش بدا بە خوێنڕەسی ئەو كوژراوە، مەگەر بیكەن بەبەخشش و وەری نەگرن.**

٢٣٠٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ فَإِنْ شَاءُوا قَتَلُوا وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ وَهِيَ ثَلاثُونَ حِقَّةً وَثَلاثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً وَمَا صَالَحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ، وَذَلِكَ لِتَشْدِيدِ الْعَقْلِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[1].

**لەعەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكییەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەر كەسێ بە ئارەزوو موسوڵمانێ بكوژێ ئەوە دەدرێتە دەستی خوێنڕەسەكانی كوژراوەكە ئیتر ئەوان ئارەزووی خۆیانە یا بكوژ دەكوژنەوە، یا خوێن وەردەگرن، خوێنباییش سەد وشترە لەسەر ئەم شێوەیە: سیی وشتری مێی سێ ساڵەو سیی وشتری مێی چوار ساڵەو چل وشتری ئاوسە، وە هەردوولایش لەسەر هەرچی ڕێك بكەون دروستە. ئەمەیش بۆیە وایە، هەتا خوێنبایی گران بێ و خەڵك سڵ لە خوێن ڕشتن بكەنەوە (ت- س/ح ئەبو داوود)**

٢٣٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فِي دِيَةِ الْخَطَإِ عِشْرُونَ حِقَّةً وَعِشْرُونَ جَذَعَةً وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ وَعِشْرُونَ بَنِي مَخَاضٍ ذُكُوراً. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[2].

---

[1] رواهُ الترمذى بسند حسن (شرحه).

[2] بسند ضعيف (شرحه).

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): خوێنی کوشتنی هەڵە (قەتلی خەطەء) سەد وشترە: بیست وشتری مێچکەی سێ ساڵەو بیست وشتری مێچکەی چوار ساڵەو بیست وشتری مێچکەی یەك ساڵەو، بیست وشتری مێچکەی دوو ساڵەو، بیست بەچکە وشتری نێری یەك ساڵە (د/ت/ن- سند ضعيف).

٢٣٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي عَدِيّ قُتِلَ فَجَعَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دِيَتَهُ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفاً أَيْ مِنَ الدَّرَاهِمِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ (لەبەنی عەدی) کوژرا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دوانزە هەزار درەمی دانا بە خوێنبایی بۆی (د/ت/ن- سند صالح).

٢٣٠٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ تعالى عَنهُم) قَالَ: كَانَتْ قِيمَةُ الدِّيَةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ثَمَانَمِائَةِ دِينَارٍ أَوْ ثَمَانِيَةَ آلاَفِ دِرْهَمٍ وَدِيَةُ أَهْلِ الْكِتَابِ يَوْمَئِذٍ النِّصْفُ مِنْ دِيَةِ الْمُسْلِمِينَ فَكَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ حَتَّى اسْتُخْلِفَ عُمَرُ رَحِمَهُ اللَّهُ فَقَامَ خَطِيبًا فَقَالَ أَلاَ إِنَّ الإِبِلَ قَدْ غَلَتْ. فَفَرَضَهَا عُمَرُ عَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفَ دِينَارٍ وَعَلَى أَهْلِ الْوَرِقِ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا وَعَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ وَعَلَى أَهْلِ الشَّاءِ أَلْفَيْ شَاةٍ وَعَلَى أَهْلِ الْحُلَلِ مِائَتَيْ حُلَّةٍ. قَالَ وَتَرَكَ دِيَةَ أَهْلِ الذِّمَّةِ لَمْ يَرْفَعْهَا. رَوَاهُ أبو داود والنسائي مرفوعا في البقر والشَّاءِ[٤].

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە لەباپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) بەهای خوێنبایی هەشت سەد لیرە بوو، یاخود هەشت هەزار درەم بوو، ئەوسایش خوێنی خاوەن نامەکان نیوەی خوێنی موسوڵمانان بوو، ئیتر ئەمە هەروا مایەوە هەتا عومەر کرا بە جێنشین جا عومەر هەڵسایەوە، دوانێکی دا، گوتی: بزانن کەوا وشتر

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

[٤] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

گران بووه، ئەنجا عومەر بڕیاری دا کە ئەوەی زێڕ دەدا لەباتی خوێن دەبێ هەزار لیرە بدا، وە ئەوەی زیو دەدا دەبێ دوانزە هەزار درەم بدا، وە ئەوەی ڕەشە ولاخ دەدا دەبێ دوو سەد سەربدا، وە ئەوەی بزن یا مەڕ دەدا دەبێ دوو هەزار سەربدا، وە ئەوەی جلو بەرگ دەدا دەبێ دوو سەد دەست (قات) بدا، وەلێ ئەندازەی خوێنبایی خاوەن پەیمانەکان (ئەهلی ذیمە) ی دەست لێ نەداو لێی پتر نەکرد (د- سند صالح- نەسائی بە مەرفوعی ریوایەتی کردووە لەسەرباسی (البقر والشّاء)

٢٣١٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: عَقْلُ شِبْهِ الْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ الْعَمْدِ وَلاَ يُقْتَلُ صَاحِبُهُوَبِهِ قَضَى عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ). رَوَاهُ أبو داود وأحمد[٥].

دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خوێن بایی کوشتنی نیمچە قەستیش هەر قورسە وەك خوێنبایی کوشتنی بە قەستی (قەتلی عەمد) بەلاّم جیاوازیی ئەوەندەیە لێرەدا بکوژ ناکوژێتەوە. عومەریش (خودای لێ رازی بێ) لەکاتی خۆیدا بەم شێوەیە بڕیاری دەدا (د- سند صالح- ئەحمەد).

٢٣١١- وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِي شِبْهِ الْعَمْدِ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ حِقَّةً وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ جَذَعَةً وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بَنَاتِ لَبُونٍ وَخَمْسٌ وَعِشْرُونَ بَنَاتِ مَخَاضٍ[٦].

عەبدوڵلاّ (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: خوێنبایی کوشتنی نیمچە بە ئارەزوو دەکاتە بیستو پێنج وشتری مێچکەی سێ ساڵو بیستو پێنج وشتری مێچکەی چوار ساڵو بیستو پێنج وشتری مێچکەی دوو ساڵو بیستو پێنج وشتری مێچکەی یەك ساڵ (د- سند صالح.

٢٣١٢- وَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِي شِبْهِ الْعَمْدِ ثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ حِقَّةً وَثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعٌ وَثَلاَثُونَ ثَنِيَّةً كُلُّهَا خَلِفَةٌ. رواهما أبو داود (بسندين صالحين)[٧].

---

[٥] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[٦] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: خوێنی کوشتنی نیمچە بە ئارەزوو دەکاتە سیی و سێ وشتری مێچکەی سێ ساڵ و سیی و سێ وشتری مێچکەی چوار ساڵ و سیی و چوار وشتری ئاوس (د- سند صالح).

٢٣١٣- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَلاَ إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٨].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاگادار بن کە خوێنی کوشتنی نیمچە بە ئارەزوو دەکاتە سەد وشتر، دەبێ چلیان بەچکەیان لە سکدا بێ، کوشتنی نیمچە بە ئارەزوویش وەك ئەوە کە کوشتنەکە بە قەمچی یا بەدار بێ واتە: بە ئامێرێ وا بیکوژێ کە بەزۆری لێدان بەو ئامێرە نەبێ بەهۆی کوشتن و لە هەمانکاتدا قەستی کوشتنی نەبێ، وەك لێدان بەقەمچی و شەپازللەو شتی وا (د- سند صالح-ن).

٢٣١٤- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ تَطَبَّبَ وَلاَ يُعْلَمُ مِنْهُ طِبٌّ فَهُوَ ضَامِنٌ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي والحاكم وصححه[٩].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەموێ: هەر کەسێ لافی پزیشکی لێ بداو خۆی بکا بە پزیشك و پزیشکیش نەزانێ ئەوە زامن و دەستەبەرە ئەگەر نەخۆشێکی تیمار کردو بوو بەهۆی مردنی، ئەوە خوێنی ئەو مردووە لە کەسوکاری ئەو خۆ بەپزیشك کردووە دەستێنرێ (د/ن/ حاکم:ص).

٢٣١٥- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: عَقْلُ الْمَرْأَةِ مِثْلُ عَقْلِ الرَّجُلِ حَتَّى يَبْلُغَ الثُّلُثَ مِنْ دِيَتِهَا. رَوَاهُ النسائي والدار قطني وصححه ابن خزيمة[١٠].

---

[٧] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[٨] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[٩] صحيح عند الحاكم.

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەندازەی خوێنی ئەندامی ژنیش وەك هی پیاوە، تا دەگاتە سێیەکی خوێنی پیاو بەلاّم کەلەوە تێپەڕی ئیتر خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە (ن/ داره قوطني/ ئیبنو خوزەیمە:ص).

٢٣١٦- وللبيهقيّ دِيَةُ الْمَرْأَةِ نِصْفُ دِيَةِ الرَّجُلِ[١١].

بەیهەقی ریوایەت دەکا (خودای لێ رازی بێ) حەزرەت دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ) خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە.

٢٣١٧- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: دِيَةُ عَقْلِ الْكَافِرِ نِصْفُ دِيَةِ عَقْلِ الْمُؤْمِنِ. رَوَاهُ أصحاب السنن وأحمد[١٢].

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خوێنبایی خوێنی بێ بڕوا (کافر) نیوەی خوێنبایی خوێنی موسوڵمانە. (د/ت/ن/ ئەحمەد- س/ح).

٢٣١٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا أَصَابَ الْمُكَاتَبُ حَدًّا أَوْ وَرِثَ مِيرَاثًا يَرِثُ عَلَى قَدْرِ مَا عَتَقَ مِنْهُ. وفي رواية: قَضَى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي الْمُكَاتَبِ يُقْتَلُ يُودَى بِمَا أَدَّى مِنْ كِتَابَتِهِ دِيَةَ الْحُرِّوَمَا بَقِيَ دِيَةَ الْمَمْلُوكِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر بەندەی نامە پێدراو (موکاتەب) خوێنڕەسی کەسێ بوو، یاکەلەپوورگری بوو، ئەوە خۆی چەندەی ئازاد بوو بێ بە ئەندازەی ئەوە خوێن دەگرێ، یاکەلەپوور دەگرێ. لەگێڕانەوەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای

---

[١٠] صحيح عند ابن خزيمة.

[١١] بسند ضعيف

[١٢] بسند حسن (شرحه).

[١٣] بسند حسن (شرحه).

لەسەربێ) بڕیاری دا ئەگەر هاتو بەندەیەکی نامە پێدراو کوژرا خوێنەکەی لەسەر ئەم شێوەیە دەدرێ، چەندەی لە پارەی نامەنووسی (کیتابەت)ەکەی دابوو ئەوەندەی وەك ئازاد خوێنی دەدرێ، وە ئەوەیشی لەوەمایەوە وەك بەندە خوێنی دەدرێ (د/ت/ن–س/ح).

٢٣١٩– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيًّا فِي رَمْيٍ يَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحِجَارَةٍ أَوْ ضَرْبٍ بِالسِّيَاطِ أَوْ ضَرْبٍ بِعَصًا فَهُوَ خَطَأٌ وَعَقْلُهُ عَقْلُ الْخَطَإِ وَمَنْ قُتِلَ عَمْدًا فَهُوَ قَوَدٌ وَمَنْ حَالَ دُونَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَغَضَبُهُ لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ[١٤].

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ کوێرانە لە نێواندا کوژرا لە شەڕە قەمچیو شەڕەتێڵاو شتی واداو کەس نەیدەزانی کێ کوشتوویەتی، ئەوە دادەنرێ بە کوشتنی نیمچە بەهەڵەو خوێنباییەکەی قورسە = موغەللەزە) وەك خوێنبایی کوشتنی هەڵە وایەو لەسەر بنەماڵەکەی ترە بەلاّم کەسێ بەقەستی بکوژرێ ئەوە تۆڵەی دەسەندرێو بکوژ لەباتی ئەو دەکوژرێتەوە، وە ئەوەی سەرپێچی لە مەبکاو ڕێگەی نەدا بەلەعنەتی خودا چێو رقو غەزەبی خودای لێبێ، فەرزو سوننەتیشی هەرگیز گیرا نەبێ! (د– سند صالح–ن).

٢٣٢٠– عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ غُلاَمًا لأُنَاسٍ فُقَرَاءَ قَطَعَ أُذُنَ غُلاَمٍ لأُنَاسٍ أَغْنِيَاءَ فَأَتَى أَهْلُهُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا أُنَاسٌ فُقَرَاءُ. فَلَمْ يَجْعَلْ عَلَيْهِ شَيْئًا. رواهما أبو داود (بسندين صالحين) والنسائي، نسأل الله الستر والتوفيق. والله أعلى وأعلم[١٥].

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کوڕێکی خێزانێکی هەژار گوێچکەی کوڕێکی خێزانێکی دەوڵەمەندی بڕیبوو جا کە هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا!

---

[١٤] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[١٥] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

ئێمە خێزانێکی هەژارین و کوڕەکەشمان هێشتا منالەو رەسیدە نەبووەو تەکلیفی لەسەر نیە ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هیچی دانەنا لەسەریان (د- سند صالح-ن).

## ٨٤) خوێنی بێچووله (جەنین - بەچکەی ناوسك = کۆرپەلە) دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە چ بەندە چ کەنیزەك بێ دەبێ : (دية الجنين غرة)

٢٣٢١/ ⬅ (ب-٢ز-١٩١ رقم/١٩٧٧[1]).

٢٣٢٢- وَعَنْهُ (أي أَبِي هُرَيْرَةَ) (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَةِ الجَانِيَةِ، وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ فَقَالَ حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَغْرَمُ مَنْ لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ. مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ. رواهما الخمسة[2].

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دووژنی هوزەیلی بوو بە شەڕیان یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریان و خۆی و سکەکەی کوشت، جا کە بۆ داد خوازیی دادیان بردە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بڕیاری دا: کە خوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یا کەنیزەك بێ دەبێ، وەبڕیاریشی دا کە خوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی سکەکەی لەسەر خوێنڕەسانی ژنە تاوانبارەکەیە نەك لەسەر ژنەکە خۆی. وە کەلەپووری ژنە کوژراوەکەشی دا بە منالەکانی و بەخزمەکانی تری جا حەمەلی کوڕەزای نابیغەی هوژەلیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من چی ببژێرم ئەمە

---

[1] تقدم برقم: ١٩٧٧/١ تسلسل/ ١٩١ مجلد٢.

[2] بخاری. دیات: طططب: ٥٧٥٩، ٥٧٦٠، ٦٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠. مسلم. قسامة: ٤٣٤٥، ٤٣٦٦، ٤٣٦٧. نسائی. قسامة: ٤٨٣٣. أبو داوُد. دیات: ٤٥٧٦. ترمذی. فرائض: ٢١١١.

نەچەشكەی ئاوو نانی كردووەو نە ورتەی لە دەم دەرهاتووەو نەنقەی لێوە هاتووە، شتی وا خوێنی نیە!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە بەم قسە قوتانەی داوا دەردەكەوێ كەلە دەستەی كوڵەنانیو كاهینانە! (ش/د/ت/ن).

## ٨٥) خوێنی ئەندامەكانی لەش : (دية الأطراف (أي أعضاء الجسم))

٢٣٢٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ، يَعْنِي الْخِنْصَرَ وَالإِبْهَامَ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ مُسلماً[١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمەو ئەمە یەكسانن‌و خوێنیان چون یەكە واتە: پەنجە تووتەو پەنجەكەڵە وەك یەكن (ب/د/ت/ن).

٢٣٢٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فِي دِيَةِ الأَصَابِعِ الْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ سَوَاءٌ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ لِكُلِّ أُصْبُعٍ. رواه الترمذي وصاحباه[٢].

دیسان گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خوێنی پەنجەی پێ‌و پەنجەی دەست چون یەكە: خوێنی هەر پەنجەیێ دەكاتە دە وشتر (ت-س/ص-د/ن).

٢٣٢٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْهُمْ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُقَوِّمُ دِيَةَ الْخَطَإِ عَلَى أَهْلِ الْقُرَى أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ وَيُقَوِّمُهَا عَلَى أَثْمَانِ الإِبِلِ فَإِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِي قِيمَتِهَا وَإِذَا رَخصَتْ نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا وَبَلَغَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَا بَيْنَ أَرْبَعِمِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِمِائَةِ دِينَارٍ أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ ثَمَانِيَةَ آلاَفِ دِرْهَمٍ وَقَضَى عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ وَعَلَى أَهْلِ الشَّاءِ أَلْفَيْ شَاةٍ وَقَالَ: الْعَقْلَ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى قَرَابَتِهِمْ فَمَا بَقِيَ

---

[١] بخاری. دیات: ٦٨٩٥

[٢] بسند صحيح (شرحه).

فَلِلْعَصَبَةِ. وَقَضَى فِي الأَنْفِ إِذَا جُدِعَ الدِّيَةَ كَامِلَةً وَإِنْ جُدِعَتْ ثَنْدُوَتُهُ فَنِصْفُ الْعَقْلِ (خَمْسُونَ مِنَ الإِبِلِ أَوْ عَدْلُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ أَوْ مِائَةُ بَقَرَةٍ أَوْ أَلْفُ شَاةٍ) وَفِي الْيَدِ إِذَا قُطِعَتْ نِصْفُ الْعَقْلِ وَفِي الرِّجْلِ نِصْفُ الْعَقْلِ وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الْعَقْلِ وَالْجَائِفَةُ مِثْلُ ذَلِكَ وَفِي الأَصَابِعِ فِي كُلِّ أُصْبُعٍ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ وَفِي الأَسْنَانِ فِي كُلِّ سِنٍّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ. رواه أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٣].

عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جاران نرخی خوێنی هەڵەی لەسەر خەڵكی دیهات دادەنا بە چوار سەد دیناری زێڕ، یا بەقەد ئەوە زیو، وەبەپێی گرانی و هەرزانیی وشتر بەهای خوێنی دادەنا: ئەگەر وشتر هەرزان بوایە بەهای خوێنی بەپارە كەم دەكردەوە، بەڵام ئەگەر وشتر گران بوایە بەهای خوێنی بەپارە زیاد دەكرد، وەبە سەرینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خوێنبایی لە نێوانی چوا سەد دینار تا هەشت سەد دینار بوو، یا بەقەد نرخی ئەوە زیو بوو كە دەیكردە هەشت هەزار درەم. وە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بڕیا ریشی دا: ئەوەی دەیەوێ بەرەشە وڵاخ خوێن بدا دەبێ دوو سەد سەر رەشە وڵاخ بدا، وە ئەوەی دەیەوێ بە وردە ئاژەڵ (مەڕو بزن) خوێن بدا دەبێ دوو هەزار سەر مەڕو بزن بدا وە فەرمووی: خوێنبایی دادەنرێ بەكەلەپوورو دابەشدەكرێ بەسەر میراتبەرانی كوژراوەكەدا بە پێی دوورو نزیكیی خزمایەتییەكەیان! وە هەرچی مایەوە (لەپشكی خاوەن بەشەكان) دەدرێ بە خزمی باوكی (عەصەبە = باوان). وە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بڕیاریشی دا: لووت (ئەگەر لەبن دا بڕا) خوێنەكەی دەكاتە خوێنێكی تەواوی خاوەنەكەی بەڵام ئەگەر گۆكەی بڕابوو دەكاتە نیو خوێنی خاوەنەكەی وە دەستیش ئەگەر قرتا دەكاتە نیو خوێن، وە هەروەها قا چیش ئەگەر قرتا دەكاتە نیو خوێن،وە ئەو زامەشی بگاتە پەردەی مێشك خوێنەكەی دەكاتە سێیەكی خوێنبایی، وە هەروەها هەر زامێ كە بگاتە ناو بۆشایی سەر یا

---

[٣] رَوَاهُ اَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

سـینگ یـا سـك، وە حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بڕیاریـشی دا: كـە خـوێنی هـەموو پەنجـەیێ دەكاتـە دە وشـتر، وە خـوێنی هـەموو ددانـێ دەكاتـە پێـنج وشتر (د — سند صالح— ن).

٢٣٢٦– وَفِي كِتَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ: مَنِ اعْتَبَطَ مُؤْمِنًا عَنْ بَيِّنَةٍ فَإِنَّهُ قَوَدٌ إِلاَّ أَنْ يَرْضَى أَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ وَأَنَّ فِي النَّفْسِ الدِّيَـةُ مِائَـةً مِـنَ الإِبِـلِ وَفِـي الأَنْفِ إِذَا أُوعِبَ جَدْعُهُ الدِّيَةُ وَفِي اللِّسَانِ الدِّيَةُ وَفِي الشَّفَتَيْنِ الدِّيَةُ وَفِي الْبَيْضَتَيْنِ الدِّيَةُ وَفِي الذَّكَرِ الدِّيَةُ وَفِي الصُّلْبِ الدِّيَةُ وَفِي الْعَيْنَيْنِ الدِّيَةُ وَفِي الرِّجْلِ الْوَاحِدَةِ نِصْفُ الدِّيَةِ وَفِي الْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ وَفِي الْجَائِفَةِ ثُلُثُ الدِّيَةِ وَفِي الْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَـشْرَةَ مِـنَ الإِبِـلِ وَفِي كُلِّ أُصْبُعٍ مِنْ أَصَابِعِ الْيَدِ وَالرِّجْلِ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ وَفِي السِّنِّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ وَفِي الْمُوضِحَةِ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ وَأَنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ وَعَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفُ دِينَارٍ. رواه النسائي وصاحباه[٤].

وەلـەو نامەیـەدا كـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) نـاردی بـۆ خـەڵكی یەمەن ئەمـەی تێدا بـوو: هەركەس لـە خۆیـەوە بـە قەستی موسوڵمانێكی بێ سووچ بكوژێو بەشایەتو بەڵگە ئیسپات ببێ لەسـەری ئـەوە دەكوژرێتـەوە، مەگـەر خـاوەن خوێنـەكان بـە خـوێن رازی بـن! خـوێنی هـەموو كەسـێكیش دەكاتە سەد وشتر، لووتیش ئەگەر بەتەواوی قرتا بوو یەك خوێنبایی تەواوی دەكەوێ، زمانیش ئەگەر بڕا خوێنێكی تـەواوی دەكـەوێ، هـەروەها هـەر دوو لێـو، هـەروەها هـەردوو هێلكـەی بـاتوو، وە هـەروەها چـووك، وە هـەروەها بـڕ بڕاگـە، وە هـەروەها هـەردوو چـاو، یـەك پـێش نیـو خـوێنی دەكـەوێ، وە ئـەو زامەیـشی بگاتـە پـەردەی مێـشك خوێنەكـەی دەكاتـە سـێیەكی خوێنبـایی، هـەروەها ئـەو زامەشـی كـە بگاتـە بۆشـایی سـەر یـا سـینگ یـا سك. وە ئـەو زامەشـی كـە تـوێخی سـەر ئێـسك بگوێزرێتـەوە (ئەلمونەققیلـە) خوێنەكـەی دەكاتە پازدە وشتر، خوێنی هەموو پەنجەیەكیش (چ هی دەست بێ چ هی پا)

---

[٤] سكت عنه الشارح.

دەكاتە دە وشتر، خوێنی هەموو ددانێكیش دەكاتە پێنج وشتر، ئەو زامەشی كە ئێسكی دەرخست بۆ دەكاتە پێنج وشتر، وە بێگومان كە پیاویش لە جیاتی ژن دەكوژرێتەوە، وە ئەو كەسەیشی كە زێڕی هەیەو دەیەوێ بە زێڕ خوێن بدا نەك بە وشتر دەبێ هەزار دیناری زێڕ بدا (ن/د/ت. رەزای خودایان لێبێ).

٢٣٢٧- وَعَنْهُ قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي الْعَيْنِ الْعَوْرَاءِ السَّادَّةِ لِمَكَانِهَا إِذَا طُمِسَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا وَفِي الْيَدِ الشَّلَّاءِ إِذَا قُطِعَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا وَفِي السِّنِّ السَّوْدَاءِ إِذَا نُزِعَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا. رواه النسائي و أَبُو دَاوُدَ[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بڕیاری داوە: چاوی كوێر ئەگەر گلێنەكەی مابوو، وە پڕ بە كالانەی چاو بوو، ئەگەر كەسێ تەقاندیی و قەلپووتی كرد ئەوە، سێیەكی خوێنی چاوێكی ساخی دەكەوێتە سەر واتە: چاو تەقیوەكە ئەگەر پیاو بوو شەشیەكی خوێنی یەك پیاو، كە دەكاتە شانزە وشترو دوو سێیەك، دەستێ گۆج بێ (ئەگەر كەسێ بیبڕێ) سێیەكی خوێنی دەستێكی ساخی دەكەوێتە سەر، ددانی رەشەوە بووش ئەگەر كەسێ بیخات سێیەكی خوێنی ددانی ساخی دەكەوێتە سەر (د/ن-س/صالح).

٢٣٢٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ خَمْسٌ. رواه الترمذي وصاحباه[٦].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو زامانە كە ئێسكیان دەردەكەوێ خوێنی هەر زامەی دەكاتە پێنج وشتر (ت/د/ن-س/ح).

## ٨٦) پاكانە (قەسامە): (القسامة)

٢٣٢٩- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ مُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ انْطَلَقَا قِبَلَ خَيْبَرَ فَتَفَرَّقَا فِي النَّخْلِ فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ فَاتَّهَمُوا الْيَهُودَ فَجَاءَ

---

[٥] بسند صالح (شرحه).

[٦] بسند حسن (شرحه).

أَخُوهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ وَابْنَا عَمِّهِ حُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَتَكَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي أَمْرِ أَخِيهِ وَهُوَ أَصْغَرُ مِنْهُمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَبِّرِ الْكُبْرَ (أَوْ قَالَ: لِيَبْدَإِ الأَكْبَرُ). فَتَكَلَّمَا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُقْسِمُ خَمْسُونَ مِنْكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ فَيُدْفَعُ بِرُمَّتِهِ. قَالُوا: أَمْرٌ لَمْ نَشْهَدْهُ كَيْفَ نَحْلِفُ، قَالَ: فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَوْمٌ كُفَّارٌ، قَالَ: فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ قِبَلِهِ. رواه الخمسة[1].

رافیعی کوڕی خەدیج (خودای لێ رازی بێ) گوتی: موحەییصەی کوڕی مەسعوودو عەبدوڵلای کوڕی سەهل دەچن بۆ خەیبەر، لەوێ بەناو باخە خورماکانا بڵاو دەبنەوە، وە عەبدوڵلایان دەکوژرێ، وە گومان دەخەنە سەر جوولەکەکان جا عەبدولڕەحمانی برای‌و دوو ئامۆزای (کە حووەییصەو موحەییصە بوون) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ)، جا عەبدولڕەحمان (کە لەوان بچووکتر بوو) ویستی باسی براکەی بکا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕێزی لە خۆت گەورەتر بگرە یا فەرمووی: باگەورە دەست پێ بکا، جا هەردوکیان باسی داستانی ئامۆزاکەیانیان کرد، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پەنجا کەس لە ئێوە سوێند بخۆن لەسەر پیاوێ لەوان، ئەو پیاوە پەت دەکرێ‌و دەدرێتە دەستان لە جیاتی کوژراوەکەتان بیکوژنەوە گوتیان: شتێ کە بەدیاریەوە نەبووبین ئێمە چۆن سوێندی لەسەر بخۆین! فەرمووی: (درودی خودای لەسەربێ) کەواتە جوولەکەکان پەنجا کەسیان سوێندتان بۆ دەخۆن‌و بەوە پاکانەتان بۆ دەکەن گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هۆزێکی بێ بڕوان‌و سوێندی ئەوانە کوا بایەخی هەیە جا پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) خوێنی کوژراوەکەی لە وشتری زەکاتدا. (ش/د/ت/ن).

---

[1] بخاری. جزية: ٣١٧٣، ٢٧٠، ٦١٤٣، ٦٨٩٤، ٧١٩٢. مسلم. قسامة: ٤٣١٨ — ٤٣٢٥. أبو داوُد. ديات: ٤٥٢٠، ٤٥٢١، ٤٥٢٣، ١٦٣٨. ترمذی. دیات: ١٤٢٢. نسائی. قسامة: ٤٧٢٤، ٤٧٢٥، ٤٧٢٦ — ٤٧٣٣.

## ٨٧) باسی سێیەم: باسی ئەوانە كە خوێنیان بە فیڕۆ دادەنرێ‌و خوێنیان نیە
## الباب الثالث: فيمن يهدر

٢٣٣٠- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ، فَنَـزَعَ يَـدَهُ مِنْ فَمِهِ، فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَـاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ، لاَ دِيَةَ لَكَ[1].

عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ دەستی پیاوێ دەگەزێ، ئەویش لە تاوانا كە دەستی خۆی رادەپسكێنێ لە دەمی كابرا دوو ددانی پێشەوەی كابرا لەگەڵ دەستیا دەكەون! جا بۆ دادخوایی و سكاڵا هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وەك نێرە وشتر گاز لە برای خۆتان دەگرن! خوێنت ناكەوێ (ش/د/ت/ن).

٢٣٣١- ⬅(ب-٢ ز- ١٧٣ل ـف٤)[2].

٢٣٣٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْـرِ إِذْنٍ فَخَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَلاَ قَوَدَ وَلاَ دِيَـةَ. رواه الشيخان والنسائي[3].

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر كەسێ (بەبێ ڕێگادان) تەماشای ناومالی كەسێ بكا، ئەویش بەپەلەپیتكە چەوێكی تێ بگرێ‌و چاوی قەلپووت بكا گوناهی ناگا. لە گێڕانەوەیەكا: نەتۆڵە (قەوەد) ی هەیەو نە خوێنی دەكەوێ (ش/ن. رەمزای خودایان لێبێ).

٢٣٣٣- وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّم) فَقَـالَ: يَـا رَسُـولَ اللّٰـهِ أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي قَالَ: فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ. قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَـاتَلَنِي قَـالَ:

---

[1] بخاری. دیات: ٢٩٧٣، ١٨٤٨، ٢٢٦٩، ٤٤١٧، ٦٨٩٣. مسلم. قسامة: ٤٣٤٣ — ٤٣٤٩. أبو داود. دیات: ٤٥٨٤. نسائی. قسامة: ٤٧٨٠، ٤٧٨١، ٤٧٨٢ — ٤٧٨٦. ترمذی. دیات. ١٤١٦.

[2] تقدم برقم: ١٩١٦/٤ مجلد/٢ تسلسل/١٧٣.

[3] بخاری. دیات: ٦٨٨٨، ٦٩٠٢. مسلم. آداب: ٥٦٠٨. نسائی. قسامة: ٤٨٧٦.

قَاتِلْهُ. قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي قَالَ: فَأَنْتَ شَهِيدٌ. قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ قَالَ: هُوَ فِي النَّارِ. رواه مسلم في الإيمان. والله أعلى وَأعلم[٤].

پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر پیاوێ هات ویستی ماڵم ببا (بەزۆر یا بەدزی) من چی بکەم؟ فەرمووی: مەیدەرێ گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر لەسەر ئەوەهات بەگژما؟ فەرمووی: تۆش بچۆرەوە بەگژیا گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر لەم حاڵەدا ئەو منی کوشت من جێگەم کوێیە؟ فەرمووی: تۆ شەهیدیت جێگەت بەهەشتە گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر من ئەوم کوشت ئەو جێگەی کوێیە؟ فەرمووی: جێگەی ناو ئاگری سووری دۆزەخە (م).

٢٣٣٤- ➡(ب-٢ز-١٧٥برقم:١٩٣٢/٢/تسلسل/١٧٥ مجلد/٢[٥].

## ٨٨) حوکمی وەرگەڕاو لە دینو ئاژاوە گێڕو لەرێ دەرچووەکان (ئەلخەواریج): حكم المرتد والساعي بالفساد (والخوارج)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ} (٢/٢١٧).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: هەرکەسێ لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە لە ئایینی ئیسلام و لەسەر کوفرو بێ بڕوایی بمرێ ئەوە ئەوانە هەموو کردەوەیەکی باشیان پووچ و بەتاڵ دەبێتەوە لەهەر دوو جیهاندا، وە دەبن بە یارو هاودەمی ئاگری دۆزەخ، وە تیا دەمێننەوە هەتا هەتایە.

و قَالَ تَعَالَى: {إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ } (٥/٣٣).

---

[٤] مسلم. إيمان: ٣٥٨ — ٣٦٠.

[٥] تقدم برقم: ١٨٨٩/٢ تسلسل/ ١٧٥ مجلد/٢.

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: پاداش و سزایێ نیە بۆ ئەو کەسانە کە لەگەڵ خودادا تێکهەڵدەچن و بەگژی پێغەمبەری خودادا دەچن و ئاژاوە دەگێڕن لەناو ولاتاو ئاشووب و خراپە بەرپا دەکەن لەسەر رووی زەوی، نیە پاداش و سزایەکی وا کە شایستەی ئەمانە بێ مەگەر ئەوە نەبێ کە بکوژرێن و بۆ پەندو عیبرەتیش بکرێن بە دارا، یاخود دەست و پێیان ببڕێ لەسەر شێوەی راست و چەپ، وە یاخود رەهەنەو شار بەدەر بکرێن و بەبێ پشوودان لەم شارەوە بۆ ئەو شا ر دەربەدەر بکرێن ئەمە تەنیا بۆ ئەوەیە کەلەم جیهانەدا بە پەندو ترۆو ریسوا بن، وەلێ سزاو ئەشکەنجەو دەردی سەری هەرە گەورە بۆ ئەم ستەمکارانە لەو جیهانە.

٢٣٣٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالْفَارِقُ لِدِينِهِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ. رواه الخمسة[1].

عەبدوڵلاّ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ کە شایەتمانی هێناو گوتی: شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو خودای تر نیەو موحەممەد پێغەمبەری خودایە، ئیتر ئەو موسوڵمانەی ئەمە بڵێ بە هیچ شتێ رشتنی خوێنی رەوا نابێ، مەگەر بەهۆی یەکێ لەم سێ شتەوە:

یەکەم: کەسێ کە کەسێ بکوژێ ئەوە دەکوژرێتەوە لە جیاتی ئەو، دووەم: بێوەی داوێنپیس، چ ژن، چ پیاو. سێیەم: کەسێ لە ئایینی خۆی هەڵبگەڕێتەوەو لە کۆمەڵەی موسوڵمانان جیا، ببێتەوە (ش/د/ت/ن).

٢٣٣٦- عَنْ عِكْرِمَةَ أَنَّ عَلِيًّا (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) حَرَّقَ قَوْمًا ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلاَمِ فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَقَتَلْتُهُمْ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) مَنْ بَدَّلَ

---

[1] بخارى. ديات: ٦٨٧٨. مسلم. قسامة: ٤٣٥١ – ٤٣٥٤. أبو داؤد. حدود: ٤٣٥٢. ترمذى. ديات: ١٤٠٢. نسائى. تحريم الدم: ٤٠٢٧، ٤٧٣٥.

دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ. وَلَمْ أُحرِّقْهُمْ لِقَوْلِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللّٰهِ. فَبَلَغَ ذَلِكَ عَلِيًّا فَقَالَ صَدَقَ ابْنُ عَبَّاسٍ. رواه الترمذي و أَبُو دَاوُدَ والبخاري (رضوان الله تعالى عليهم)[٢].

عیكریمە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ عەلی (خودای لێ رازی بێ) دەستەیەكی سووتاند كەلە ئیسلام وەرگەڕابوون، كە ئەمە گەیشتەوە بە ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئەگەر من بوومایە لە شوێنی عەلی دەمكوشتن، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ ئایینی خۆی گۆڕی بیكوژن. وە نەم دەسووتاند چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمووێ: بەسزای تایبەتی خودا كە برێتییە لە سزادان بە ئاگر كەس سزا مەدەن جا كە ئەم قسەیە گەیشتەوە بەعەلی گوتی: ئیبنو عەببا س راست دەكا (ت/د/ب).

٢٣٣٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَفَرٌ مِنْ عُكْلٍ، فَأَسْلَمُوا فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَأْتُوا إِبِلَ الصَّدَقَةِ، فَيَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَفَعَلُوا فَصَحُّوا، فَارْتَدُّوا وَقَتَلُوا رُعَاتَهَا وَاسْتَاقُوا، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ، ثُمَّ لَمْ يَحْسِمْهُمْ حَتَّى مَاتُوا. زاد في رواية: ثُمَّ أُلْقُوا فِي الحِرَّةِ يَسْتَسْتُونَ فَمَا سُقُوا حَتَّى مَاتوا. رواه الخمسة الا الترمذي[٣].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: تا قمێ لە هۆزی عوكل هاتنە خزمەتی حەزرەتو موسوڵمان بوونو پاش ماوەیێ هەوای مەدینەیان پێ نەكەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی فەرموو كە بچن بۆ دەرەوەی مەدینە بۆ ناو رانە وشترە زەكاتەكانو لەوێ لە گمێزو شیری وشترەكان بخۆن هەتا سكیان دەكەوێتە رێو لەو نەخۆشینەیە رزگار دەبن ئەوانیش ئاوایان كردو چاك بوونەوە، كەچی ڕۆژێ لەڕۆژان لە ئیسلام، وەردەگەڕێنو سەرەڕای

---

[٢] بخاری. استتابة المرتدين: ٦٩٢٢.

[٣] بخاری. وضوء: ٢٣٣، ١٥٠١، ٣٠١٨، ٤١٩٢، ٤١٩٣، ٤٦١٠، ٥٦٨٥، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧، ٦٨٠٢، ٦٨٠٣، ٦٨٠٤، ٦٨٠٥، ٦٨٩٩. مسلم. قسامة: ٤٣٣٠. أبو داوُد. حدود: ٤٣٦٤، ٤٣٦٥، ٤٣٦٦. نسائی. تحريم الدم: ٤٠٣٦ — ٤٠٣٩.

ئەوەیشە شوانەكەی پێغەمبەر زۆر بەبێ نەزاكەت دەكوژن، دەست و پێی دەبڕن و دڕك دەكەن بە چاویدا تا دەمرێ! ئینجا وشترەكانیش دەدەنە بەرو دەیان فڕێنن بۆ ولآتی خۆیان كاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەم كارەساتەی زانی كۆمەڵێ پیاوی نارد بە شوێنیاناو لەڕێ دەیانگرنەوەو دیلیان دەكەن و دەیانهێننەوە بۆ مەدینە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چاوەڕێی فەرمانی خودای كرد تا ئایەتی سیی و سێ لە سوورەتی (مائیدە) هاتە خوارەوە، كەلە سەرەتای ئەم باسەدا لە پێشەوە رابوورد ئەوجا بەپێی ئەم ئایەتە حەزرەت دەست و پای بڕین و بەبسماری سورەوە كراو چاوی رشتن، لە پاشیشا برینەكانی نەبرژاندنەوە تا مردن. لە گێڕانەوەیەكا ئەمەیشی هەیە:

ئینجا تووڕیان دانە ناو خڕە بەرداوییەكەوە لە دەرەوەی شار كەپێی دەگوترا ئەلحەڕە داوای ئاویان دەكرد، كەس ئاوی نەدەدانێ تا گیانیان دەرچوو دەڵێن: ئەم نامەردانە حەوت كەس بوون (ش/د/ن).

٢٣٣٨- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سَيَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ يَقُولُونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ الْبَرِيَّةِ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ فَإِنَّ فِي قَتْلِهِمْ أَجْرًا لِمَنْ قَتَلَهُمْ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه الشيخان والترمذي[٤].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە ئاخر زەمانا كۆمەڵێ پەیدا دەبن، هەرزەكارو منالكارو نەفامن، قورئان دەور دەكەنەوە، هەروەها فەرمایشتی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) كە چاكترینی نەوەی ئادەمە، بەلآم ئەوانە هەر بەدەم موسوڵمانن و باوەڕیان لە گەروویان رەت نابێ بۆ ناو دڵیان وەك چۆن تیرێ كە نیشان دەسمێ خێرا

[٤] بخاری. مناقب: ٣٦١١، ٥٠٥٧، ٦٩٣٠. أبو داوُد. السنة: ٤٧٦٧. نسائی. تحریم الدم: ٤١١٣.

لێی دەردەچێ ئەوانیش ئاوا خێرا لەئایین دەردەچن و لە ئیسلام پاش گەز دەبنەوە، جا لە هەر لاو لە هەرکوێ تووشی ئەوانە بوون بووارەیان مەدەن و بیانکوژن، بە راستی کەسێ یەکێ لەوانە بکوژێ لە ڕۆژی قیامەتا پادا شی گەورەی بۆ هەیە (ش/ت).

٢٣٣٩- قَالَ المؤلف (طيب الله ثراه) في شرحه: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) لمعاذ لما بعثه لليمن: أيما رجل إرتد عَنْ الإسلام فادعه فإن عاد (فبِها ونعمتُ) وإلاَّ فَاضرب عُنُقَهُ وأيُّما امرأةٍ إرتَدتْ عَنْ الإسلام فادعُها (إلى العودة إلى حظيرة الإسلام) فإن عادتْ وإلاَّ فاضربْ عُنُقها[٥].

دانەر (پڕ گۆڕەی پیرۆزی لە بۆن و بەرامەی بەهەشت بێ) لە شەرحەکەدا دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ موعاز دەنێرێ بۆ یەمەن دەفەرمووێ: هەر پیاوێکی موسوڵمان لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕا داوای لێ بکە کە بگەڕێتەوە بۆ باوەشی ئایینی ئیسلام جا ئەگەر گەڕایەوە باشە، ئەگینا بدە لە گەردنی، و هەروەها هەر ژنێکی موسوڵمانیش لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕا ئەویش هەروەها.

## ٨٩) کەسێ جنێو بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) بدا دەکوژرێ

## من سب النبي ﷺ يقتل

٢٣٤٠- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ يَهُودِيَّةً كَانَتْ تَشْتِمُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَتَقَعُ فِيهِ فَخَنَقَهَا رَجُلٌ حَتَّى مَاتَتْ فَأَبْطَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دَمَهَا[١].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ژنێکی جوولەکە جمێنی دەدا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) و قسەی پێ دەگوت ڕۆژێ پیاوێ دەست دەنێتە بینی و دەیتاسێنێ تا دەمرێ، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خوێنی بە فیڕۆ دانا (د-س/ صالح).

---

[٥] سكت عَن درجته الشارح.

[١] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

٢٣٤١- وَرُفِعَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلٌ أَعْمَى قَتَلَ أُمَّ وَلَدٍ لَهُ فَجَمَعَ لَهُ النَّبِيُّ النَّاسَ وَسَأَلَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللَّهِ كَانَتْ تَشْتِمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ فَنَهَيْتُهَا مِراراً وَزَجَرْتُهَا فَلَمْ تَسْمَعْ، فَوَضَعْتُ المِغْوَرَ فِي بَطْنِهَا وَقَتَلْتُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَلاَ اشْهَدُوا أَنَّ دَمَهَا هَدَرٌ. رواهما أَبُو دَاوُدَ بسندين صالحين[٢].

**پیاوێكی كوێریان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ دادپرسی تا مەحكەمەی بكا، لەبەر ئەوەی كە كەنیزەكێكی خۆیی كوشتبوو، كە منداڵیشی لێی هەبوو، كەپێی دەگوترێ، ئوممو لوەلەد، جا پێغەمبەر (دروودو صەلات و سەلامی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ) خەڵكەكەی لە دەوری كۆكردەوەو پرسیاری لێكرد. كابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم ژنە جنێوی بەتۆ دەداو قسەی پێ دەگوتیت، منیش چەند جار قەدەغەم لێ كردو پیا هەڵشاخامو ئاگادارم كردەوە كەشتی وا نەكا بەڵام گوێی پێم نەدا، بۆیە منیش تیغم نایە ورگیو كوشتم، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) دەسا ئێوە بەشایەت بن كە خوێنی ئەم ژنە پووچو بەتاڵە (د/س/صالح).**

## ٩٠) باسی چوا رەم: سزای دزیی و ئەو ئەندازەیە لە ماڵی دزراو كە دەبێ بەهۆی تۆڵەی دزیی

### الباب الرابع: في حد السرقة ونصابها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ } (٥/٣٨).

**خودای گەورە دەفەرموێ: دەستی پیاوی دزو دەستی ژنی دز لەسەر دزێتی ببڕن، چونكە ئەوە ئەو تۆڵەو سزایەیە كە خودا بڕیوێتییەوە بۆیان، تابێن بەپەند بۆ چاو ترساندی خەڵكی تریش.**

---

[٢] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

٢٣٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ (أي بيضة الطعام أو بيضة الحديد أي الخوذة من الحديد التي تقي رأس المحارب) فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نەفرین و لە عنەتی خودا لە دز کە ئەوەندە نەفسی سووکە لەسەر دزینی هێلکەیێ، یا بەهۆی دزینی گوریسێکەوە دەستی دەبڕن! (ش/د/ت/ن).

٢٣٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلاَّ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا. رواهما الخمسة[2].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەستی دز کاتێ دەبڕرێ کە بایی چارەکی دیناری زێڕ بدزێ، یا بایی زیاتر بدزێ (ش/د/ت/ن).

٢٣٤٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَطَعَ سَارِقًا فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ. رواه الثلاثة[3].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درووی خودای لەسەربێ) دەستی دزێکی بڕی، لەسەر دزینی قەڵغانێ کە بایی سێ درەم بوو! (ش/د- رەزای خودایان لێبێ).

٢٣٤٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَدَ رَجُلٍ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ دِينَارٌ أَوْ عَشْرَةُ دَرَاهِمَ. رواه أَبُو دَاوُدَ والنسائي[4].

---

[1] بخاری. حدود: ٦٧٩٢، ٦٧٩٣، ٦٧٩٤. مسلم. حدود: ٤٣٨٢. أبو داود. حدود: ٤٣٨٥. نسائی. قطع السارق: ٤٩٢٣.

[2] بخاری حدود: ٦٧٨٩، ٦٧٩٠، ٦٧٩١. مسلم. حدود: ٤٣٧٦. أبو داود. حدود: ٤٣٨٤. نسائی. قطع السارق: ٤٩٣٠، ٤٩٣٢.

[3] بخاری. حدود: ٦٧٩٥، ٦٧٩٦، ٦٧٩٧، ٦٧٩٨. مسلم. حدود: ٤٣٨٢.

[4] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

ئیبنـو عـەبباس (خودایـان لیٚ رازی بـیٚ) دەڵـیٚ: پیٚغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربیٚ) دەستی دزی دەبڕی لەسەر قەڵخانیٚ کە بایی دینـاریٚ دەبیٚ، یا بە درەم بایی دە درەم دەبیٚ! (د/س/ صالح –ن).

٢٣٤٦– وَسُئِلَ فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ تَعْلِيقِ الْيَدِ فِي الْعُنُقِ لِلسَّارِقِ أَمِنَ السُّنَّةِ هُوَ؟ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِسَارِقٍ فَقُطِعَتْ يَدُهُ ثُمَّ أُمِرَ بِهَا فَعُلِّقَتْ فِي عُنُقِهِ. رواه أصحاب السُّنن بسندٍ حسنٍ والله أعلى وَأعلم[٥].

پرسیا ر کرا لە فەضالەی کوڕی عوبەید (خودای لیٚ رازی بیٚ): ئەوە کەدەستی دز دەبڕن و لە پاشا هەڵی دەواسن بە ملیا، ئایا ئەمە سوننەتە یانا؟ گوتی: دزیٚکیـان هیٚنـا بـۆ لای پیٚغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربیٚ) جـا لەسـەر فـەرمانی حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) هـەم دەسـتیان بـڕیو هـەم دەسـتیان بـە بـڕاوی هەڵواسی بە ملیا بۆ پەندو چاو ترساندن (د/ت/ن–س/ح).

**٩١) هەندیٚ شتی وا ئەگەر ببریٚن نابن بەهۆی دەست بڕین: (ما لا قطع فيه)**

٢٣٤٧– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنِ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ فَقَالَ: مَنْ أَصَابَ بِفِيهِ مِنْ ذِي حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ وَمَنْ خَرَجَ بِشَيْءٍ مِنْهُ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلِهِ وَالْعُقُوبَةُ وَمَنْ سَرَقَ مِنْهُ شَيْئًا بَعْدَ أَنْ يُئْوِيَهُ الْجَرِينُ فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ. وَمَنْ سَرَقَ دُونَ ذَلِكَ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلِهِ وَالْعُقُوبَةُ. رواه أَبُو دَاوُدَ و أَحْمَدُ والنسائي[١].

عەبدوڵلاٰی کوڕی عەمر (خودایان لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پرسیار کرا لـە پیٚغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربیٚ) فـەرمووی: کەسـیٚ زۆر هـەژاربیٚ لـەو بـەرە بخـوا بەمـەرجیٚ کۆشی لیٚپڕ نەکاو پاشیلی لیٚ دانەگریٚ گوناهی ناگا، بەڵاٰم ئەگەر کەسیٚ لیٚی ببـا ئـەوە هـەم بەقـەد ئـەوەی پـیٚ دەبـژیٚریٚ و هـەم تۆڵەیـەکی ئاسـایی

---

[٥] لاحظ أخر الحديث.

[١] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

(عوقوبەیەکی موناسب)ی لێ دەستێنرێ، وەلێ بەروبووم ئەگەر کۆکرایەوەو برایە سەرخەرمانو کرا بە جێزو جۆخێن، ئەوسا لەوێ لێی بدزێ، وە ئەوەیشی کە دەیدزێ بایی قەڵخانێ ببێ ئەوە لەسەر ئەوە دەستی دەبڕێ، بەڵام ئەگەر لەوە کەمتر بوو ئەوە بەقەد ئەوەی پێ دەبژێررێو تۆڵەیێ ئاسایی لێ دەستێنرێو بەس (د-س/ صالح-ن،ئەحمەد- رەزای خودای گەورەیان لێبێ).

٢٣٤٨- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ[٢].

رافیعی کوڕی خەدیج (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەست نابڕێ لەسەر بەر بەسەر دارەوە، هەروەها لەسەر کرۆکی دارخومایش کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ جومار (د/ت/ن-س/صالح).

٢٣٤٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ وَلاَ مُنْتَهِبٍ وَلاَ مُخْتَلِسٍ قَطْعٌ[٣].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەستی گەنەکارو تالآنکەرو ماڵفڕێن نابڕێ (د/ت/ن-س/ص).

٢٣٥٠- عَنْ بُسْرِ بْنِ أَرْطَاةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: لاَ تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي الْغَزْوِ. روى هذه الثلاثة أصحاب السُّنن هُمْ (أَبُو دَاوُدَ والترمذي والنسائي[٤]).

بوسری کوڕی ئەرطات (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: خۆم ژنەوتم لە حەزرەت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): لەکاتی غەزادا دەستی دز نابڕێ نەبادا دزەکە را بکا بۆ ناو دوشمن (د/ت/ن-س/صالح).

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] رَوَاهُ أصحاب السُّنن بسند صحيح (شرحه).

[٤] رَوَاهُ أصحاب السُّنن بسند صالح (شرحه).

## ٩٢) باسی پێنجەم: باسی تۆڵە (حەدد)ی شەڕواڵپیسی
## الباب الخامس: في حد الزنا

قَالَ اللهُ جَلَّ شَأنُهُ: {الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ} (٢٤/٢).

خودای پایەگەورە دەفەرموێ: ژنی داوێنپیس و پیاوی داوێنپیس یەکی سەرو سەد داریان لێ بدەن، بە لێدانێکی ئاسایی، بە توولێ نە زۆر گەورەو نەزۆر بچووك، بەڵام لە جێگەی بەرێزو کوشندەیان مەدەن، میهرەبانی و بەزەیش نەتانگرێ بەرامبەر بەمانە، تا فەرمانی خودا زایە نەبێ، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خوداو بە ڕۆژی پاشە ڕۆژ، وە دەبێ کۆمەڵێ لە موسوڵمانان حازر بن لەکاتی سزاکەیاندا، تا بە تەواوی ببن بە پەند.

٢٣٥١- عَنْ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثًا لاَ يُحَدِّثُكُمُوهُ أَحَدٌ بَعْدِي، سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنَّ يُرْفَعَ الْعِلْمُ وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ، وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِلْخَمْسِينَ امْرَأَةً الْقَيِّمُ الْوَاحِدُ[1].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەخودا فەرموودەیێ دەگێڕمەوە بۆتان، کە لەپاش من کەس نەیگێڕێتەوە بۆتان: خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی قیامەت: کە بەرەبەرە زانین و عیلمی دینی هەڵدەگیرێ و نامێنێ و جەهل و نەزانی بە کاروباری ئایینی پەرە دەستێنێ و بڵاو دەبێتەوەو ئارەق بەزۆری و بەئاشکرا دەخورێتەوەو شەڕواڵپیسی دەبێ بەباوو ئاشکرا دەبێ، وە بەهۆی شەڕو شۆڕو ئاشووبەوە پیاو کەم دەبێ و ژن زۆر دەبێ، هەتا وای لێدێ کە پەنجا ژن تاکە یەك پیاو دەبی بەسەر پەرشتیان (ب/ت).

---

[1] بخاری. علم: ٨٠، ٨١، ٥٢٣٢، ٥٥٧٧، ٦٨٠٨.

**٢٣٥٢- عَنْ سَهْلٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **مَنْ تَوَكَّلَ لِي مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ وَمَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، تَوَكَّلْتُ لَهُ بِالْجَنَّةِ. رواهما البخاري والترمذي**[٢].

**سەهل** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر كەسێ زامنیی داوێن‌و زامنیی زمانی خۆیم بۆ بكا خۆم دەبم بە زامنی بەهەشت بۆی! (ب/ت- خودایان لێ رازی بێ).**

**٢٣٥٣- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يَأْمُرُ فِيمَنْ زَنَى وَلَمْ يُحْصَنْ جَلْدَ مِائَةٍ وَتَغْرِيبَ عَامٍ. رواه البخاري والنسائي**[٣].

**زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی** (خودای لێ رازی بێ) **دەڵێ: ژنەوتم لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی فەرموو، دەربارەی كەسێ كە داوێن پیسی بكا بەڵام ئەگەر پیاو بوو ژنی نە هێنابێ، وە ئەگەر كچ بوو شووی نەكردبێ فەرمانی فەرموو: كە یەكی سەرو سەد داریان لێ بدرێ‌و ساڵێكیش دوور بخرێنەوە لە شارەكەی خۆی (ب/ن).**

**٢٣٥٤- وَعَنْهُ إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْشُدُكَ اللَّهَ إِلاَّ قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللَّهِ. فَقَالَ الْخَصْمُ الآخَرُ وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ نَعَمْ فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَائْذَنْ لِي. فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ، وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)**: لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ (عليك)، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا. رواه الخمسة**[٤].

---

[٢] بخاری. حدود: ٦٨٠٧.

[٣] بخاری. حدود: ٦٨٣١.

[٤] بخاری. شروط: ٢٧٢٤، ٢٦٩٥، ٢٧٢٤، ٦٦٣٣، ٦٨٢٧، ٦٨٣٣، ٣٨٣٥، ٦٨٤٢، ٦٨٩٥، ٧١٩٣، ٧٢٥٨، ٧٢٦٠، ٧٢٧٨، ٢٧٢٥، ٢٦٤٩، ٢٦٩٦، ٢٧٢٥، ٦٦٣٤، ٦٨٢٨، ٦٨٣١، ٦٨٣٦، ٦٨٤٣، ٦٨٦٠، ٧١٩٤، ٧٢٥٩، ٧٢٧٩. مسلم. حدود: ٤٤١٠. أبو داود. حدود: ٤٤٤٥. ترمذی. حدود: ١٤٣٣. نسائی. آداب القضاة: ٥٤٢٥.

دیسان زەید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیکرد: ئەی رەوانەکراوی خودا! تووبیت و خودا ئەگەر بە پێی نامەی خودا کە قورئانە بڕیارم بۆ نەدەی! هاوداواکەیشی (کەوا دیار بوو لەو زرنگتربوو) گوتی: بەڵێ باشە، بە پێی نامەی خودا حوکم بکە لە نێوانمانا، وەرێگەیشم بدە تا من لە پێشا قسە بکەم. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەیدا گوتی: کوڕێکی من لەلای ئەمە رەنجبەر بوو، ژنەکەیی خراپ کردووە، بە منیان گوت: کە دەبێ کوڕەکەم سەنگەسار (رەجم) بکرێ، جا منیش لە تۆڵەی کوڕەکەمدا سەد سەر مەڕم دایە لەگەڵ کەنیزێکا، لە پاشا کاتێ لە زاناکانم پرسی گوتیان: کە کوڕەکەی من سەد داری حەددی لێ دەدرێ و ساڵێ دوور دەخرێتەوە، وە ژنەکەی ئەمیش بەردەباران دەکرێ.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی وا لەدەستا بەپێی فەرمانی نامەی خودا بڕیار دەدەم لە نێوانتانا: کە نیزەك سەد مەڕەکە دەدرێتەوە بە تۆ، کوڕەکەت سەد داری حەددی لێ دەدرێ و ساڵێکیش دوور دەخرێتەوەو رەهەنە دەکرێ. ئەی ئونەیس! تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆ لای ژنەکەی ئەمە ئەگەر هاتو چووە ژێری و دانی بە ئیشەکە دانا ئەوا بەردە بارانی بکە. جا کەئونەیس چوو بۆ لای، ژنەکە پێی لێ نا، ئەویش سەنگەساری کرد! (ش/دت/ن).

٢٣٥٥- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٥].

عوبادەی کوڕی صامت (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە من وەربگرن، لەمن وەربگرن ئەو ژنانە کەلە ئایەتی:

---

[٥] مسلم. حدود: ٤٣٩٠، ٦٠١٤، ٦٠١٥. أبو داوُد. حدود: ٤٤١٥، ٤٤١٦. ترمذی. حدود: ١٤٣٤.

والللاتی یأتین الفاحشه من نسائكم- دا، باس كراون خودا ئەم یاسایەو ئەم ڕێگەیەی بۆ دانان: كچ‌و كوڕ یەكی سەرو سەد داریان لێ دەدرێ‌و تا ماوەی ساڵێكیش شاربەدەر دەكرێن، ژن‌و پیاویش یەكی سەرو سەد داریان لێ دەدرێ‌و بەردەبارانیش دەكرێن تا دەمرن! (م/د/ت).

٢٣٥٦- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: قَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِالْحَقِّ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ فَكَانَ مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا فَرَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ وَإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوْ الاِعْتِرَافُ. رواه الخمسة[٦].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) لەسەر دوانگە (مینبەرە)كەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: بێگومان كە خودا موحەممەدی ناردووە لەگەڵ ئایینی ڕاستداو قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆی، ئایەتی بەردەبارانكردنی داوێنپیسان جاران ئایەتێ بوو لە قورئان كە ئەمە دەقەكەیەتی: (الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة) واتە: پیاوو ژنی سەرە ئەگەر زینایانكرد بەبێ چەندو چوون سەنگەساریان بكەن، ئێمە بە خودی خۆمان ئەو ئایەتی ڕەجمەمان خوێندوەو لە مەبەستەكەی تێ گەیشتووین هەرچەندە ئەم ئایەتە لە تیلاوەتدا نەسخ بۆتەوەو لەخوێندنەوەدا سڕاوەتەوەو لە قورئاندا نانووسرێ، بەڵام دەگەرو بڕشتەكەی هەر ماوەو هێشتا حوكمی پێ دەكرێ، بۆیە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) داوێنپیسانی بەردەباران دەكرد، ئەوەتانێ ئێمەیش لە پاش ئەو

---

[٦] بخاری. حدود: ٦٨٢٩، ٦٨٣٠، ٢٤٦٢، ٣٩٢٨، ٤٠٢١، ٧٣٢٣. مسلم. حدود: ٤٣٩٤. أبو داوُد. حدود: ٤٤١٨. ترمذی. حدود: ١٤٣٢.

بەردەبارانیان دەكەین، بەڵام دەترسم كە موسوڵمانان بكەونە چەرخێكەوە كەسێ پەیدا ببێ بڵێ: لە نامەی خودادا ئایەتی بەردەباران كردنی تیا نییە. جا بە نەكردنی ئەركی خودا لە قورئانا دایناوە لەسەریان تاوانبار دەبن‌و لەڕێگە دەردەچن! بێگومان كە بەردەبارانكردن فەرمانی نامەی خودایەو ڕاست‌و دروستە، وە ئەم فەرمان (حوكم)ە بۆ ئەو پیاوو ژنانەیە كەلەوەو پێش ژنیان هێنابێ‌و بەدەستیان گرتبێ، یاخود شوویان كردبێ‌و مێرد بەدەستی گرتبن، وەڵێ لەهەل‌و مەرجێكا كە بەڵگە هەبێ كە برێتیە لە چوار شایەتی نێرینەی دادپەروەر یا سك دیاری بدا، یا پێلێنان‌و چوونە ژێر لەكایەدا هەبێ[1] (ش/د/ت/ن — خودایان لێ رازی بێ).

٢٣٥٧- وَجَاءَ مَاعِزٌ الأَسْلَمِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ زَنَى. فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ جَاءَ مِنْ شِقِّهِ الآخَرِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ قَدْ زَنَى. فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ جَاءَ مِنْ شِقِّهِ الآخَرِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ قَدْ زَنَى. فَأَمَرَ بِهِ فِي الرَّابِعَةِ فَأُخْرِجَ إِلَى الْحَرَّةِ فَرُجِمَ بِالْحِجَارَةِ فَلَمَّا وَجَدَ مَسَّ الْحِجَارَةِ فَرَّ يَشْتَدُّ فَلَقِيَهُ رَجُلٌ مَعَهُ

---

[1] ئیمامی نەوەوی (غەرقی رەحمەتی خودابێ) لێرەدا دەفەرموێ: ئەمە دادەنرێ بە كەرامەت بۆ ئیمامی عومەر (خودای لێ رازی بێ) چونكە خەواریجەكان ئەم قسەیان دەكردو دەیان فلێتان: لەنامەی خودادا ئایەتی رەجمی تیا نیە. بەندەیش دەڵێم: بەڵام داخەكەم ئێستا ئەم جۆرە قسە هیچ‌و پووچە بووە بە باوو تەواو زۆر بووە، هەر تاوانبارەو تاوان دەكاو دەڵێ: گوایە شتی وا لە قورئاندا نیە، تەنانەت ئارەق خۆرەكانیش دەڵێن: لە قورئاندا نەگوتراوە كە ئارەق حەرامە! پەكوو لەم بێ شەرمییە! كە باوەڕ نەبوو شەرمیش نەبوو، كە شەرمیش نەبوو چی دەكەی بیكەو چی دەڵێی بیڵێ:

نیمـــان سەرچـــاوەی رەفتـــاری جوانـــە
تـــــاجی سەرســـــەری خـــــودا ناســـــانە
چـــاوی ڕۆشـــــنی رێگـــــەی ژیانـــە
جیـــــایی نێـــــوانی نێمـــــەو نەوانـــــە

-وەرگێڕ-

لَحْيُ جَمَلٍ فَضَرَبَهُ بِهِ وَضَرَبَهُ النَّاسُ حَتَّى مَاتَ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: هَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ لَهُ أَبِكَ جُنُونٌ؟ قَالَ: لاَ. وَفِي أخرى: لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أَوْ غَمَزْتَ أَوْ نَظَرْتَ. قَالَ: لاَ. قَالَ: أَحْصَنْتَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَمَرَ بِرَجْمِهِ. وفي رواية: فَاخْتَلَفَتْ فِيهِ الصَّحابَة فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَقَدْ تَابَ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ أُمَّةٍ لَوَسِعَتْهُمْ. رواه الخمسة ولفظه للترمزي[٧].

ماعیزی ئەسلەمی (رەزای خودای گەورەی لێبێ) هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد: کە داوێنپیسی کردووە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی نەدایەوە بەڵکوو رووی کرد بەولاوە سا بەڵکوو واز لەو قسەیە بێنێ بەڵام ئەو لەو لاوە چووە بەردەمیو عەرزیکردەوە: کە داوێنپیسی کردووە، دیسان حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی نەدایەوەو رووی لێ وەرگێڕایەوە، بەڵام ماعیز دیسانەوە رۆیشتەوە بەردەمیو عەرزی کردەوە: کەوا داوێنپیسی کردووە! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەری جاری چوارەمدا ئەمری فەرموو بردیان بۆلای خڕەبەرداوییەکە، کە پێی دەڵێن ئەلحەڕە، لەوێ بەبەرد بەردەبارانیان کرد، جا کە بەردەکان ئێشیان پێی گەیاند هەڵهاتو بەتوندیی رایکرد، جا پیاوێ نیشتە سەری شەویلاگەیەکی وشتری پێ بوو بەوە لێی داو خەڵکەکەیش لێیان دەدا هەتا مرد جا کە ئەمەیان عەرزی حەزرەت کرد فەرمووی: بریا وازتان لێ دەهێنا.

لەگێڕانەوەیەکا: فەرمووی پێی: ئەوە شێت بوویت؟ گوتی: نەء، لە گێڕانەوەیەکی تردا: فەرمووی: رەنگە هەر ماچت کردبێ یا نوقرچت لێ گرتبێ یا تەماشات کردبێ؟ گوتی: نەء تا پێی فەرموو: (هل نكتها؟ قال: نعم) ئەدیی گاوتە؟ گوتی: ئا، جا ئەوجا فەرمووی: ژنت هێناوە؟ گوتی: ئا هێناومە. جا ئەوسا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کرد سەنگە ساریان کرد.

---

[٧] بخاری. حدود: ٦٨٢٥، ٦٨٢٦، ٦٨١٥، ٧١٦٧. مسلم. حدود: ٤٣٩٦ – ٤٤٠٦. أبو داوُد. حدود: ٤٤٣٣. ترمذی. حدود: ١٤٢٧.

لەگێڕانەوەیەكا یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی ماعیزەوە بوون بە دوو دەستە، دەستەیەكیان دەیانگوت: رەنگ بێ پەشیمانیی گیرا نەبێ چونكە پەردەی خودای لەسەر خۆی هەڵداوەتەوە، نهێنیی خۆی بپۆشیبایە باشتر بوو، تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە پەشیمانی (تۆبە)یەكی وەهای كرد ئەگەر بێتو دابەش بكرێ بەسەر نەتەوەیەكی گەورەدا بەشی هەموویان دەكا پیرۆزی بێ تەوبەی بەراستی (ش/د/ت/ن، گفتەیٔ فەرموودەكە هی گێڕانەوەی تیرمیذییە).

٢٣٥٨- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُتِيَ بِيَهُودِيّ وَيَهُودِيَّةٍ قَدْ زَنَيَا إِلى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَانْطَلَقَ إِلَى يَهُودَ فَقَالَ: مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ عَلَى مَنْ زَنَى؟ قَالُوا: نُسَوِّدُ وُجُوهَهُمَا وَنُحَمِّلُهُمَا وَنُخَالِفُ بَيْنَ وُجُوهِهِمَا وَيُطَافُ بِهِمَا. قَالَ: فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ. فَجَاءُوا بِهَا فَقَرَءُوهَا حَتَّى إِذَا جَاءَتْ آيَةُ الرَّجْمِ سَتَرَهَا الَّذِى يَقْرَأُ بِيَدِهُ وَقَرَأَ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا فَقَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ وَهْوَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُرْهُ فَلْيَرْفَعْ يَدَهُ فَرَفَعَهَا فَإِذَا تَحْتَهَا آيَةُ الرَّجْمِ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَرُجِمَا. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُمَا فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَقِيهَا مِنَ الْحِجَارَةِ بِنَفْسِهِ[٨].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ پیاوێكی جوولەكەو ژنێكی جوولەكە شەروالپیسییان كردبوو، هێنایانن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆلای جولەكەكان فەرمووی: ئەگەر كەسێ داوێن پیسی بكا بەپێی تەورات ئێوە چی لێ دەكەن؟ گوتیان: رووی هەردوولایان رەش دەكەینو بەرووپشت سواری دوو وڵاخیان دەكەینو دەیانگێڕین بەناو دێدا تا ببن بە پەندو ریسوابن. فەرمووی: ئەگەر ڕاست دەكەن تەوراتەكە بێنن جا تەوراتەكەیان هێناو دەستیان كرد بە خوێندنەوەی تا گەیشتە سەر ئایەتی رەجمكردن، ئەوكەسەی كە دەیخوێندەوە ئەم ئایەتەی كر بەژێر دەستیەوەو

---

[٨] بخاری. مناقب: ٣٦٣٥، ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣. مسلم. حدود: ٤٤١٢ — ٤٤١٥. أبو داوُد. حدود: ٤٤٤٦. ترمذی. حدود: ١٤٣٦.

پەڕاندی و نەیخوێندەوە، بەڵكوو ئایەتەكانی پێش و پاشی ئەم ئایەتەی خوێندەوە، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام كە زانایەكی گەورەی جوولەكە بوو ئیسلام بوو بوو كە ئەوكاتە لە خزمەتی پێغەمبەردا بوو، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێی بفەرموو كە دەستی هەڵبڕێ، جا كە دەستی هەڵبڕی ئایەتەكە لەژێر دەستیا بوو. ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی فەرموو ژن و پیاوەكەیان سەنگەساركرد، ئیبنو عومەر گوتی: من خۆم یەكێك بووم لەوكەسانە كە بەردەبارانیان كردن، تەماشامكرد كە پیاوەكە خۆی دەدایە بەربەردەكان تا بەرژنەكە نەكەون! (ش/د/ت/ن).

٢٣٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا زَنَتِ الأَمَةُ فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا فَلْيَجْلِدْهَا (سَيِّدُهَا)، وَلاَ يُثَرِّبْ (أي لا يُعنّف ولا يُوبّخ)، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَلْيَجْلِدْهَا، وَلاَ يُثَرِّبْ، ثُمَّ إِنْ زَنَتِ الثَّالِثَةَ فَلْيَبِعْهَا، وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ. رواهما الخمسة. نسأل الله الستر والتوفيق لما يُحب ويرضى آمين[٩].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر كەنیزەك زینای كردو زیناكەی ئیسپات بوو، با خاوەنەكەی داری حەددی لێ بداو ئیتر سەر كۆنەی نەكاو هەموو كاتێ نەیداتەوە بەچاویا جا ئەگەر دیسان زینای كردەوە با دوو بارە داری حەددی لێ بداتەوەو ئیتر سەركۆنەی نەكاو هەموو كاتێ نەیداتەوە بەچاویا، بەلام ئەگەر بۆ جاری سێهەم زینای كردەوە ئیتر ئەگەر فرۆشتوویەتی بە پەتێكی موو با بیفرۆشێ. (ش/د/ت/ن).

---

[٩] بخاری. بیوع: ٢١٥٢، ٢١٥٣، ٢٢٣٣، ٢٢٣٤، ٢٥٥٥، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩. مسلم. حدود: ٤٤٢٠. أبو داوُد. حدود: ٤٤٧٠.

## ٩٣) حەددی شەرعی جێبەجێ ناکرێ لەسەر ژنی زەیستانو ژنی سکپڕ تا منداڵەکەیان نەبێو نەبووژێنەوە:

## لايقام الحد على النساء والحامل حتى تضع

٢٣٦٠- خَطَبَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَقِيمُوا عَلَى أَرِقَّائِكُمُ الْحَدَّ مَنْ أَحْصَنَ مِنْهُمْ وَمَنْ لَمْ يُحْصِنْ فَإِنَّ أَمَةً لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زَنَتْ فَأَمَرَنِي أَنْ أَجْلِدَهَا فَإِذَا هِيَ حَدِيثُ عَهْدٍ بِنِفَاسٍ فَخَشِيتُ إِنْ أَنَا جَلَدْتُهَا أَنْ أَقْتُلَهَا فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: أَحْسَنْتَ[1].

عەلی (خودای لێ خۆش نوود بێ) وتارێکیدا، گوتی: ئەی خەڵکینە! داری حەدد بدەن لەبەندەو کەنیزەکانتان، چ ژنو پیاو بن، چ کوڕو کچ بن، چونکە جارێکیان کەنیزەکێکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داوێنپیسی کردبوو، حەزرەت فەرمانی کرد بەمن کە داری حەددی لێ بدەم، کە زانیم تازە منداڵی بووە، ترسم لێ نیشت ئەگەر داری حەددی لێ بدەم لەوانەیە کە بیکوژمو جێبەجێ کردنی حەددەکەم دواخست، جا کەئەمەم عەرزی پێغەمبەرکرد فەرمووی: ئافەریم! (م/د/ت/ن).

٢٣٦١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهِيَ حُبْلَى مِنَ الزِّنَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ. فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلِيَّهَا فَقَالَ: أَحْسِنْ إِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ فَائْتِنِي بِهَا. فَفَعَلَ فَأَمَرَ بِهَا نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: تُصَلِّى عَلَيْهَا يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَقَدْ زَنَتْ؟ فَقَالَ: لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ وَهَلْ وَجَدْتَ تَوْبَةً أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. رواهما الخمسة إلاّ البخاري[2].

---

[1] مسلم. حدود: ٤٤٢٥، ٤٤٢٦، ترمذی. حدود: ١٤٤.

[2] مسلم. حدود: ٤٤٠٨. أبو داوُد. حدود: ٤٤٤٠.

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێکی جوهەینەیی زۆلێکی لەسکدا بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیکرد: ئەی رەهبەری خودا! شایانی حەددم حەددم لێ بدە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەقداریی ژنەکەی گازکردو فەرمووی: باش بەبۆیو چاك بە لەگەڵی، کە سکەکەی دانا ژنەکەم بۆ بێنە ئەویش ئاوای کردو فەرمایشتەکەی پێغەمبەری بەجێ هێنا، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی فەرموو ژنەکەیان بە جلەکانی خۆیەوە شەتەك دا هەتا لەکاتی سەنگە سارکردندا لەشی دەرنەکەوێ ئینجا فەرمانی کرد بەردەباران کرا، لە پاشا خۆی نوێژی مردووی لە سەری کرد، عومەریش پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە داوێن پیسی کردووە کەچی تۆ نوێژی لەسەر دەکەی! فەرمووی: بە راستی ئەمە تەوبەیەکی وەهای کردووە ئەگەر بێتو دابەشبکرێ بەسەر حەفتا کەس لە خەڵکی مەدینەدا بەشی هەموویان دەکا، تەوبە لەوە باشتر دەبێ چی بێ کە گیانی خۆیی بەخشی لەبەر رەزامەندیی خودای گەورە! (م/د/ت/ن).

## ٩٤) حوکمی هەتیوبازییو لاقەکردنی ئاژەڵو چوونەلای ژنی خۆیی (ژنی مەحرەم) : (حكم اللواط وإتيان البهائم والمحارم)

٢٣٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن (بسند ضعيف، ولفظ النسائي: لَعَنَ اللهُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر دیتان یەکێ پیشەکەی هۆزی لووط دەکا واتە: بە پاش سواری یەکێ بووە بکەرو بدەر هەردووکیان بکوژن (د/ت/ن-سند ضعیف) گفتەی (ن) بەپێی شەرحەکە ئاوایە: نەفرینی خودا لەو کەسە بێ، کە پیشەکەی هۆزی لووط دەکا: لەعنەتی خودا لە هەتیوباز.

---

[1] بسند ضعیف.

٢٣٦٣- وللترمذي: إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي عَمَلُ قَوْمِ لُوطٍ[٢].

تیرمیذی (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: شتێ کە مەترسی زۆری لێبکرێ بۆ ئۆمەتم و ترسی گەورەم لێی هەبێ پیشەی هۆزی لووتە (ت-س/ح).

٢٣٦٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ أَتَى بَهِيمَةً فَاقْتُلُوهُ وَاقْتُلُوهَا مَعَهُ. قُلْتُ: لأَبْنِ عَبَّاسٍ: مَا شَأْنُ الْبَهِيمَةِ؟ قَالَ: مَا أُرَاهُ قَالَ: ذَلِكَ إِلاَّ أَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يُؤْكَلَ لَحْمُهَا وَقَدْ عُمِلَ بِهَا ذَلِكَ الْعَمَلُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي (مرفوعاً وموقوفاً على ابن عبَّاسٍ ولذا كان ضعيفاً ولم يأخذ به الأئمة الأربعة فلا تقتلُ البهيمةُ ولا الفاعلُ بل يُعَزَّرُ بما يراه الحاكم)[٣].

دیسان گوتی: حەزرەت (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: کەسێ بڕواتە لای چوارپا (بەهیمە)یێ خۆی بکوژن و چوار پێکەیش لەگەڵیا بکوژن گوتم: بە ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ): چوار پێکە لە بەرچی؟ گوتی: وا دەزانم بۆیە وایفەرموو چونکە حەزناکا کە گۆشتی بخورێ لەگەڵ کردنی ئەوئیشە ناشیرینە لەگەڵیا (ئیمامی ئەبو داوودو ئیمامی تیرمیذی- خودایان لێ رازی بێ) ئەم فەرموودەیەیان جارێ بەمەرفووعی- واتە: تا سەر پێغەمبەر خۆی- و جارێ بە مەقووفی تاسەر ئیبنو عەبباس ریوایەت کردووە، جا لەبەرئەوە بە ضەعیف دادەنرێ، وە کەس لەچوار ئێمامەکان رەفتیان پێ نەکردووە، نە چارپاگێکە دەکوژرێ و نە چارپاکە، ئەوەندە هەیە فەرمانڕەوا چی بە باش بزانێ بەوە بکەرەکە تەمێ و سەرزەنشت دەکا. ئەمەی وا لەناو کەوانەکانا لە شەرحەکە وەرگیراوە).

٢٣٦٥- كَما رويا (أي الإمامان أَبُو دَاوُدَ والترمذي): عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: لَيْسَ عَلَى الَّذِى يَأْتِي الْبَهِيمَةَ حَدٌّ.

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] ضعيف.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: حەدد لەسەر کەسێ نیە کە بڕواتە لای گیانلەبەری چارپا (د/ت).**

٢٣٦٦- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقِيتُ عَمِّي وَمَعَهُ رَايَةٌ فَقُلْتُ لَهُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةَ أَبِيهِ فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ وَآخُذَ مَالَهُ.

**بەراء** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: مامەم ئالایەکی پێ بوو تووشی بووم گوتم: دەچیت بۆ کوێ؟ گوتی: پیاوێ باوەژنی خۆیی مارەکردۆتەوە، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **منی ناردووە بۆ لای کە بچم لە گەردنی بدەمو ماڵەکەیشی بە تالان ببەم (د/ت/ن-س/ح).**

٢٣٦٧- وَوَقَعَ عَلَى جَارِيَةِ امْرَأَتِهِ فَرُفِعَ إِلَى النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْكُوفَةِ فَقَالَ: لأَقْضِيَنَّ فِيكَ بِقَضِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَكَ جَلَدْتُكَ مِائَةً وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَحَلَّتْهَا لَكَ رَجَمْتُكَ بِالْحِجَارَةِ. فَوَجَدُوهُ قَدْ أَحَلَّتْهَا لَهُ فَجَلَدَهُ مِائَةً. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٦].

**پیاوێ چوو بووە لای کەنیزەکی ژنەکەی، هێنایان بۆ لای نوعمانی کوڕی بەشیر، بۆ دادخوایی، نوعمان لەو کاتەدا فەرمانڕەوای کووفە بوو، گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **خۆی چۆن بڕیاری داوە لە وێنەی ئەم مەسەلەیەدا منیش ئاوا بڕیار دەدەم بەسەر تۆدا: ئەگەر ژنەکەت لەوەوپێش حەڵاڵی کردبێ بۆت ئەوا لەم حاڵەتەدا تەنیا سەد داری حەددت لێ دەدەم، ئەگینا بە بەرد بەردەبارانت دەکەم کە تەماشایان کرد ژنەکەی حەڵاڵی کردبوو بۆی، جا لەبەرئەوە تەنیا سەد داری حەددیان لێ دا (د/ت/ن-سند مضطرب).**

---

[٦] فيه اضطراب.

## ٩٥) حەددی بوختیانو جمێنو جادووبازیی

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (٢٤/٥).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو كەسانەی كە بوختان دەكەن بۆ ئافرەتی پاكیزەی داوێنپاك، گەر چوار شایەتی دادپەروەریان راست كردەوە لەسەر ئەو كردەوە نالەبارە ئەوە باشە، ئەگینا هەشتا داریان لێ بدەن، وە لەپاش ئەوە ئیتر شایەتییان قەبووڵ مەكەن بۆ هیچ باسو خواسێ هەتا هەتایە، وە ئەوانە بە فاسیقو لەرێ دەرچوو دەناسرێن، ئەوانەیان نەبێ كە پەشیمان دەبنەوە لەو بوختیانەو لە دوای ئەوە كردەوەی خۆیان باش دەكەن، ئەوە بە راستی خوداوەندی گەورە تاوان بەخشو میهرەبانە.

٢٣٦٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاعْتَرَفَ أَنَّهُ زَنَى بِامْرَأَةٍ سَمَّاهَا لَهُ فَبَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَيها فَسَأَلَهَا، فَأَنْكَرَتْ فَجَلَدَهُ الْحَدَّ وَتَرَكَهَا. وفي رواية: وَكَانَ بِكْرًا فَجَلَدَهُ مِائَةً وَسَأَلَهُ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمَرْأَةِ فَعَجَزَ وَكَذَبَتْهُ فَجَلَدَهُ حَدَّ الْفِرْيَةِ ثَمَانِينَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[1].

سەهلی كوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ددانی پیانا كە لەگەڵ ژنێكا داوێنپیسی كردووە، وە ناوی ژنەكەیشی هێنا، پێغەمبەر ناردی بۆ لای ژنەكەو پرسیاری لێكرد، ژنەكە نەچووە ژێر شتی وا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داری حەددی لە پیاوەكەداو وازی لە ژنەكە هێنا. لە گێڕانەوەیەكا: پیاوەكە كوڕبوو واتە: بوخچەی نەكراوەبوو هێشتا ژنی نەهێنابوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەد داری حەددی لێ داو داوای لێ كرد بەڵگە لەسەر ژنەكە راست بكاتەوە، بۆی نەكرا، وە ژنەكەیش نەچووە ژێر شتی وا جا هەشتا داری تریشی لێ دا لەباتی حەددی بوختیان (د-سند صالح-ن).

---

[1] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

٢٣٦٩- وَ قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها): لَمَّا نَزَلَ عُذْرِى قَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ ذَلِكَ وَتَلاَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا نَزَلَ عَنِ الْمِنْبَرِ أَمَرَ بِالرَّجُلَيْنِ وَالْمَرْأَةِ فَضُرِبُوا حَدَّهُمْ. (والمحدودون هُم حسَّان بن ثابت ومصطح ابن أثاثة وحمنة بنت جحش). رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٢].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێ کە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە، کە باسی پاکیو داوێنپاکیی منیان تیایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەستا چووە سەر دوانگەو دوانێکی داو ئەو باسەی باسکردو ئایەتەکانی خوێندەوە بۆ خەڵکەکە، جا کە هاتە خوارەوە لە دوانگەکە فەرمانی فەرموو داری حەدیان دا لە هەردوو پیاوەکە کە حەسسانی کوڕی ثابیتو میسطەحی کوڕی ئوثاثە بوون وە هەروەها لە ژنەکەیش کە حەمنەی کچی جەحش بوو، ژن خوشکی پێغەمبەر بوو، چونکە خوشکی زەینەبی کچی جەحش بوو کە ژنی پێغەمبەر بوو (د/ت/ن-س/ح = ئیمامان ئەبو داوودو ترمیذیو نەسائی (رەزای خودایان لێبێ) بەسەنەدێکی حەسەن ئەم فەرمودەیەیان گێڕاوەتەوە).

٢٣٧٠- وللبخاري: مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ وَهْوَ بَرِىءٌ مِمَّا قَالَ، جُلِدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ[٣].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ بوختیان بکا بۆ بەندەی خۆی، بەڵام بەندەکە بێ تاوانو پاک بێ لەو قسەو بوختیانە ئەوە ئەو کەسە بوختیانکەرە لە رۆژی قیامەتا داری حەددی لێ دەدرێ (ب- خودای لێ رازی بێ).

٢٣٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ يَا يَهُودِيُّ فَاضْرِبُوهُ عِشْرِينَ وَإِذَا قَالَ يَا مُخَنَّثُ فَاضْرِبُوهُ عِشْرِينَ وَمَنْ وَقَعَ عَلَى ذَاتِ مَحْرَمٍ فَاقْتُلُوهُ. رَوَاهُ الترمذي بسند ضعيف[٤].

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] بخاری. محاربین: ٦٨٥٨. مسلم. أیمان: ٤٢٨٧.

[٤] ضعیف.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەگەر پیاوێ بە پیاوێکی تری گوت: ئەی جوولەکە! ئەوە بیس داری لێ دەن هەروەها ئەگەر پێشی گوت: ئەی سەرژنانی! ئەگەر کەسێکیش سوار ئافرەتێکی خۆیی (مەحرەم) بوو بیکوژن (ت–سند ضعیف).**

**٢٣٧٢– عَنْ جُنْدُبٍ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: حَدُّ السَّاحِرِ ضَرْبُهُ بِالسَّيْفِ. رَوَاهُ الترمذي والحاكم وصححَّه. نسأل الله الستر والتوفيق**[٥]**.**

**جوندوب** (خودای لێ رازی بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: حەددی جادووباز ئەوەیە بە شمشێر دەکوژرێ (ت/حاكم:ص).**

## ٩٦) باسی شەشەم: باسی حەددی ئارەقخۆر:

## الباب السادس: في حد شارب الخمر

**٢٣٧٣– عَنْ أَنَسٍ** (رَضيَ اللهُ عَنهُ) **أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **جَلَدَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ ثُمَّ جَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ. فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ وَدَنَا النَّاسُ مِنَ الرِّيفِ وَالْقُرَى قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِي جَلْدِ الْخَمْرِ؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا كَأَخَفِّ الْحُدُودِ. فَجَلَدَ عُمَرُ ثَمَانِينَ. رَوَاهُ الأربعة. وفي رواية: أُتِيَ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ (بِسَعْفَتَيْنِ) نَحْوَ أَرْبَعِينَ. ولفظ الترمذي: ضرب النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **الحدَّ بنعلَين أربعين.**

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی دەفەرموو ئارەق خۆریان بە پەلکە خورماو سۆل داریکاریی دەکرد، لە پاشا ئەبوبەکر لەکاتی جێنشینی خۆیدا چل داری بۆ بڕییەوە، کاتێ کە عومەر بوو بەجێنشین خەڵك بەهۆی ئەوەوە کە پەیوەندییەکی زۆریان پەیدا کردبوو لەگەڵ لادێو دێهاتا مەیخواردنەوە پەرەی سەندبوو جا بۆیە عومەر راوێژی بەهاوڕێیان کردو گوتی: لە بارەی داری حەددی مەیخواردنەوەوە ئێوە راتان**

---

[٥] صحيح عند الحاكم.

چییەو چی بە باش دەزانن؟ ئەو رەحمانی کوڕی عەوف گوتی: من رام ئەوەیە کە بەقەد سووکترین حەددی لێ بکەی کە حەددی بوختانە، کە هەشتا دارە ئینجا عومەر بۆ کەسێ ئارەق بخواتەوە هەشتا داری بۆ بڕییەوە (ش/د/ت) لە گێڕانەوەیەکا: کابرایەکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئارەقی زەقنەمووت کردبوو، بە دوو پەلکە خورما دەوری چل داری لێدا. گفتەی (ت): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە جووتێ سۆڵ حەددی لێدا، چل جاری پیا مالی.

٢٣٧٤- قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ قَالَ: اضْرِبُوهُ. قَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ فَمِنَّا الضَّارِبُ بِيَدِهِ، وَالضَّارِبُ بِنَعْلِهِ، وَالضَّارِبُ بِثَوْبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: أَخْزَاكَ اللَّهُ. قَالَ: لاَ تَقُولُوا هَكَذَا لاَ تُعِينُوا عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کابرایەکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خواردبوویەوە. فەرمووی: ئادەی لێی دەن ئیتر هەمان بوو بەدەستی لێی دەدا، هەمان بوو بە سۆڵەکەی، هەمان بوو بە جلەکەی، کە کابراکە رۆیی هەندێ کەس گوتیان: خوا رووزەردو شەرمەزارت کا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وا مەڵێن، مەبن بە کۆمەکی شەیتان لە سەری! (ب/د).

٢٣٧٥- كَانَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُسَمَّى عَبْدَ اللَّهِ، وَكَانَ يُلَقَّبُ حِمَارًا، وَكَانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، وَكَانَ قَدْ جَلَدَهُ فِي الشَّرَابِ، فَأُتِيَ بِهِ يَوْمًا فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ، فَقَالَ: بَعْضُ الْقَوْمِ: اللَّهُمَّ الْعَنْهُ مَا أَكْثَرَ مَا يُؤْتَى بِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لاَ تَلْعَنُوهُ، فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ إِلاَّ أَنَّهُ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ[٣]. رَوَاهُ البخاري (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ).

---

[٢] بخاری. حدود: ٦٧٧٧، ٦٧٨١.

[٣] بخاری. حدود: ٦٦٦٧٨٠.

بەسەرینیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پیاوێ هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بوو، نازناوی کەر (حیمار) بوو، جارو بار پێغەمبەری دەهێنایە پێکەنین، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گەلێ جار لەسەر مەیخواردنەوە دارکاریی دەکرد، ڕۆژێ هێنابوویان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەمری فەرموو دارکارییان کرد، هەندێ کەس گوتیان: لەعنەتی خودای لێبێ، چەندە بە زۆری دەیهێنن!! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نەفرین (لەعنەت)ی لێ مەکەن، دەسا بە خودا من ئاگام لێیەتی کە خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ (بوخاری).

٢٣٧٦- عَنْ أَبِي سَاسَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَأُتِيَ بِالْوَلِيدِ قَدْ صَلَّى الصُّبْحَ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ قَالَ: (وهو بَعْدُ سكرانُ) أَزِيدُكُمْ فَشَهِدَ عَلَيْهِ رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا حُمْرَانُ أَنَّهُ شَرِبَ الْخَمْرَ وَشَهِدَ آخَرُ أَنَّهُ رَآهُ يَتَقَيَّأُ، فَقَالَ عُثْمَانُ: مَا قَاءَ إِلاَّ بَعْدَمَا شَرِبَ فَقَالَ: يَا عَلِيُّ قُمْ فَاجْلِدْهُ. فَقَالَ عَلِيٌّ: قُمْ يَا حَسَنُ فَاجْلِدْهُ. فَقَالَ الْحَسَنُ: وَلِّ حَارَّهَا مَنْ تَوَلَّى قَارَّهَا فَقَالَ: يَا ابْنَ جَعْفَرٍ قُمْ فَاجْلِدْهُ. فَجَلَدَهُ وَعَلِيٌّ يَعُدُّ حَتَّى بَلَغَ أَرْبَعِينَ فَقَالَ: أَمْسِكْ. ثُمَّ قَالَ: جَلَدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَرْبَعِينَ وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ وَعُمَرُ ثَمَانِينَ وَكُلٌّ سُنَّةٌ وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود[٤].

ئەبو ساسان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە خزمەتی عوسماندا بووم کاتێ وەلیدیان هێنا بەسەرخۆشی بەرنوێژیی نوێژی بەیانی کرد بوو، کە دوو ڕکات دەکا دەڵێ: زیادیی دەکەم بۆتان، دوو پیاویش شایەتییان لێدا: یەکێکیان کە حومران بوو گوتی: ئارەقی خواردبووە، ئەوی تریشیان گوتی: منیش دیم کە دەڕشایەوە، عوسمانی برایشی گوتی: بۆیە ڕشاوەتەوە چونکە خواردوویەتییەوە: تا نەخواتەوە ناڕشێتەوە، ئینجا عوسمان گوتی: ئەی عەلی: هەڵسە دارکاریی بکە، عەلیش گوتی: ئەی حەسەن! هەڵسە دارکاریی بکە، حەسەن گوتی: کێ خۆشییەکەی دەنۆشێ با هەر ئەویش تاڵییەکەی بچێژێ! جا

---

[٤] مسلم. حدود: ٤٤٣٢. أبو داوُد. حدود: ٤٤٨٠، ٤٤٨١. ابن ماجه. حدود: ٢٥٧١.

عەلی گوتی: ئەی کوڕی جەعفەر! ئادەی تۆ هەڵسە دارکاریی بکە، جا کوڕەکەی جەعفەر دارەکانی لێ دەداو عەلیش دەیژماردن، هەتا بوون بە چل دار، عەلی گوتی: ئیتر بەسە، ئینجا گوتی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) چل داری لێ دەدا، ئەبو بەکریش هەروەها، بەڵام عومەر هەشتا داری لێ دەدا، ئەمانە هەمویان هەر سوننەتن و ڕێگەی شەرعن، وەلێ من بەش بەحاڵی خۆم چلەکەم پێ باشترە لەبەرئەوە کە ئەمە سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی (م/د).

## ٩٧) تەمێکردن (تەعزیر - سووککردن) بەلێدان و بە بەندکردن و بە ڕەهەنەکردن دەبێ : (التعزير بالضرب والحبس والنفي)

٢٣٧٧- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو بوردە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەگەر بۆ حەددی شەرعی ئەگینا لەسەر هیچ شتێکی تر لە دە دار، (جەڵدە) زیاتر لە کەس نادرێ (ش/د/ت/ن).

٢٣٧٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ضَرَبَ وَغَرَّبَ وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ ضَرَبَ وَغَرَّبَ وَأَنَّ عُمَرَ ضَرَبَ وَغَرَّبَ. رَوَاهُ الترمذي والحاكم وابن خزيمة وصححه[2].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: هەم پێغەمبەرو هەم ئەبوبکرو هەم عومەر بۆ تەمێکردن لە پیاو خراپیان دەداو سەرەرای ئەوەیشە شاربەدەریشیان دەکردن! (ت/حاکم/ئیبنو خوزەیمە:ص).

٢٣٧٩- حَبَسَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلاً فِي تُهْمَةٍ ثُمَّ خَلَّى عَنْهُ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[3].

---

[1] بخاری. حدود: ٦٨٤٨، ٦٨٤٩، ٦٨٥٠. مسلم. حدود: ٤٤٣٥. أبو داوُد. حدود: ٤٤٩١. ترمذی. حدود: ١٤٦٣.

[2] صحيح عند ابن خزيمة.

جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی لەسەر تۆمەتێ بەندکرد، لەپاشا بەری دا (د/ت/ن/س/ح).

٢٣٨٠- وَحَبَسَ النُّعْمَانُ بْنَ بَشِيرٍ قَوماً أُتِّهِمُوا بِسَرِقَةٍ أَيَّامًا ثُمَّ خَلَّى عَنْهُمْ مِنْ غَيْرِ ضَرْبٍ وَلاَ امْتِحَانٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٤].

نوعمانی کوڕی بەشیر تاقمێکی چەند ڕۆژێ حەپسکرد بە گومانی دزێتی، لەپاشا (بەبێ لێدانو بەبێ کێشمەکێش) بەرەڵای کردن! (د-س/صالح-ن).

٢٣٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ، وَالْمُتَرَجِّلاَتِ مِنَ النِّسَاءِ وَقَالَ: أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ. فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فُلاَنًا (أي أنجشة)، وَأَخْرَجَ عُمَرُ فُلاَنًا (أي ماتعاً). رَوَاهُ البخاري وقال المؤلف: (ض) في باب (يحرم التشبُّه بالغير والزور): رَوَاهُ الخمسة إلاَّ مسلماً[٥].

ئیبنو عەبباس (خودای گەورەیان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەعنەتو نەفرینی کردوە لە پیاوی ژنانیو لە ژنی کوڕانی، وە دەیفەرموو: مەهێڵن بێنە ماڵتان پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) فیسار (واتە: ئەنجەشە)ی شار بەدەرکرد، عومەریش فیسار (واتە: ماتیع)ی ڕەهەنەکرد (ب/د/ت/ن).

٢٣٨٢- وَ أُتِيَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِمُخَنَّثٍ قَدْ خَضَبَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ بِالْحِنَّاءِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَا بَالُ هَذَا؟ فَقالوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ يَتَشَبَّهُ بِالنِّسَاءِ. فَأُمِرَ بِهِ فَنُفِيَ إِلَى النَّقِيعِ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نَقْتُلُهُ؟ فَقَالَ: إِنِّي نُهِيتُ عَنْ قَتْلِ الْمُصَلِّينَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. والله أعلى وأعلم[٦].

---

[٣] بسند حسن (شرحه).

[٤] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[٥] بخاری. حدود: ٦٨٣٤.

[٦] سكت عنه الشارح.

پیاوێکی سەر ژنانییان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کابرا وەك ژن هەردوو دەستو هەردوو پێی خۆیی گرتبووە خەنە. فەرمووی: بۆ وای لەخۆی کردووە؟ عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لاسایی ژنان دەکاتەوە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی فەرموو، کابراکە رەهەنە کرا بۆ نەقیع. گوتیان: ئەی رەهبەری خودا! بۆ نەیکوژین! فەرمووی: قەدەغەم لێ کراوە لە کوشتنی نوێژکەران: کوشتنی نوێژکەران لەمن قەدەغەیە (درودی خودای لەسەربێ) خودای گەورە هەر خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ.

## ٩٨) نە لە دەمووچاو دەدرێو نە حەددیش لەناو مزگەوتا جێبەجێ دەکرێ: لا يضرب الوجه ولا يقام الحد في المسجد

٢٣٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَّقِ الْوَجْهَ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): ئەگەر لە کەسێکتان دا لە روخساری مەدەن (ش/د).

٢٣٨٤- عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ يُسْتَقَادَ فِي الْمَسْجِدِ وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ الأَشْعَارُ وَأَنْ تُقَامَ فِيهِ الْحُدُودُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[2].

حەکیمی کوڕی حیزام (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەدەدا کە لەناو مزگەوتا بکوژ بکوژێتەوە، یا هۆنراوەی تیا دەوربکرێتەوەو هەڵبەستی تیا بخوێنرێتەوەو شەڕە شیعری تیا بکرێ یا داری حەدد بدرێ لە کەسێ، یا حەددی تیا جێبەجێ بکرێ (د-سند صالح-ت).

---

[1] تقدم برقم: ١٩٩٧/٧ فی تسلسل/ ٢١مجلد/٣.

[2] بسند صالح (شرحه).

## ٩٩) مەرجەكانی جێبەجێكردنی حەدد: (شروط اقامة الحدود)

٢٣٨٥- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ عَلِيّاً (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِمَّا لَيْسَ فِي القُرْآنِ، وَقَالَ: ابْنُ عُيَيْنَةَ مَرَّةً مَا لَيسَ عِنْدَ النَّاسِ، فَقَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ مَا عِنْدَنَا إلاَّ مَا فِي القُرْآنِ، إلاَّ فَهْماً يُعْطَى رَجُلٌ فِي كِتَابِهِ وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ. قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: الْعَقْلُ وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وَأَنْ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ. رَوَاهُ الأربعة[1].

➡(ب- ١ز- ١٦ف ١ل- ٨٨) گێڕانەوەی ئێرە ئەمەیە: ئەبو جوحەیفە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیارمكرد لە عەلی: ئایا لەكن ئێوە كە كەسوكاری پێغەمبەرن، وەك هەندی كەس دەڵێن شتی وا هەیە كە بە تایبەتی هەر لەلای ئێوە هەبێ و لە قورئاندا نەبێ؟ جارێ لە جیاتی وشەی: كە لە قورئاندا گوتی: كە لەلای خەڵكی تر نەبێ؟ عەلی گوتی: بەوكەسە كە تۆمە دەتەقێنێ و شینی دەكاو هەموو كەسێ لە نەبوون دروست دەكا شتی وا لەلای ئێمە نیە، هەرچی لە قورئاندا نەبێ، لەلای ئێمەیش نیە، مەگەر تێگەیشتنێكی باش لە قورئان، ئەویش ئەگەر خودا بیدا بە پیاو، بەڵام تەنیا ئەم نووسراوەمان لەلا هەیە، گوتم: ئەم نووسراوە چی تیایە؟ گوتی: باسی خوێنداو بەردانی دیل و ئەوەیش كە موسوڵمان لە جیاتی بێ بڕوا (كافر) ناكوژرێتەو(ش/د/ت).

٢٣٨٦- عَنِ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ عَنِ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِرَجُلٍ قَتَلَ رَجُلاً فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَقَرَّ، فَسَلَّمَهُ لِوَلِيِّ المَقْتُولِ، فَذَهَبَ بِهِ وَفِي عُنُقِهِ نِسْعَةٌ يَجُرُّهَا فَلَمَّا أَدْبَرَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ فَبَلَغَ الوَلِيَّ مَقَالَةُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَعَفَا عَنْهُ. رَوَاهُ الخمسة الا البخاري[2].

---

[1] تقدم برقم: ١١٨/١ تسلسل/ ١٦ مجلد/ ١.

[2] مسلم. قسامة: ٤٣٦٣. أبو داوُد. ديات: ٤٤٩، ٤٥٠٠. نسئى. قسامة: ٤٧٣٧، ٤٧٣٨، ٤٧٣٩، ٤٧٤٠ — ٤٧٤٣.

عەلقەمەی کوڕی وائیل گوتی: باوکم گوتی: پیاوێ پیاوێکی کوشتبوو، هێنایان بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە لێی پرسی چووە ژێری، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) پیاوەکەی دایە دەست هەقداری کوژراوەکە، ئەویش بردی لەگەڵ خۆی کە بیکوژێتەوە، پەتی کوشتنەوەی لە مل دابوو، جا کە پیاوەکە پشتی هەڵکرد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بکوژو کوژراو هەردوو لایان جێگەیان ناو ئاگری دۆزەخە، جا کە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گەیشتەوە بە خوێنڕەسی کوژراوەکە لە کابرای پیاو کوژ خۆش بوو (م/د/ت/ن).

٢٣٨٧- ولأصحاب السُّنن: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ[٣].

ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی (رەزای خودای گەورەیان لێبێ) بە سەنەدێکی حەسەن دەگێڕنەوە کە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: کەسێ بەندەی خۆی بکوژێ دەیکوژینەوە لە جیاتی بەندەکەی وە کەسێ لووتی بەندەی خۆی ببڕێ لووتی دەبڕینەوە لەجیاتی ئەو.

٢٣٨٨- عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُقِيدُ الأَبَ مِن ابْنِهِ وَلاَ يُقِيدُ الإِبْنَ مِنْ أَبِيهِ. وفي رواية: لاَ تُقَامُ الْحُدُودُ فِي الْمَسَاجِدِ وَلاَ يُقْتَلُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ. رَوَاهُ الترمذي (بسند ضعيفٍ، ولكن أهل العلم كلُّهم عليه)[٤].

سوراقەی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (درودی خودای لەسەربێ) کوڕی لە جیاتی باوکی دەکوشتەوە، بەڵام باوکی لە جیاتی کوڕی خۆی نەدەکوشتەوە لە گێڕانەوەیەکا: نە لەناو مزگەوتا حەدد لە کەسێ دەدرێو نە باوكو دایك لە جیاتی مناڵیان دەکوژرێنەوە {تیرمیذی (خودای لێ رازی بێ) بە سەنەدێکی ضعیف ئەم حەدیسەی ریوایەت کردووە، بەڵام زاناکان هەموویان لەسەر ئەم رایەن، کە بنەچە (ئەصڵ) لەباتی وەچە (فەرع) ناکوژرێتەوە.

---

[٣] بسند حسن (شرحه).

[٤] ضعيف.

٢٣٨٩- ⟵تقدم برقم/١/٣٨٧/مجلد/١تسلسل/٥١.عَنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الَمجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن والبخاري موقوفاً[٥].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: قەڵەم، لەسەر ئەم سێ کەسە هەڵگیراوەو هەرچی بکەن بە تاوان دانانرێ: لە سەرخەوتوو تا خەبەری دەبێتەوە، وە لەسەر منداڵ هەتا رەسیدە دەبێ، وە لەسەر شێت تا چاك دەبێتەوە (د/ت/ن. بوخاریش بە مەوقوفی ریوایەتی کردووە).

٢٣٩٠- عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لامْرَأَةٌ أَكرَهَتْ على الزنا: اذْهَبِي فَقَدْ غَفَرَ اللّٰهُ لَكِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن مطولاً بسندٍ صحيحٍ[٦].

عەلقەمەی کوڕی وائیل گوتی: باوکم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێ بە زۆر ئیشی خراپیان لەگەڵ دا کردبوو، پێغەمبەر پێی فەرموو: بڕۆ تۆ خودا لێت خۆش بووە چونکو لە قورئانا دەفەرموێ: { وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (٢٤/٣٣).

واتە: کەسێ بە زۆری زۆرداریی داوێنپیسی بە ژن بکا خودا چاوپۆشی لە ژنەکە دەکا (د/ت/ن-س/ص).

٢٣٩١- وَاسْتُكْرِهَتِ امْرَأَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَدَرَأَ عَنْهَا الْحَدَّ وَأَقَامَهُ عَلَى الَّذِى أَصَابَهَا وَلَمْ يُذْكَرْ أَنَّهُ جَعَلَ لَهَا مَهْرًا. رَوَاهُ الترمذي. والله تَعَالَى أعلى وَأعلم. نسأل الله التوفيق لما يُحِبُّ ويرضى آمين[٧].

لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) ژنێ بە زۆر ئیشی خراپیان لەگەڵدا کردبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەددی لەسەر ژنەکە لابرد،

---

[٥] رَوَاهُ البخارى موقوفاً على علىّ قبل رقم: ٦٨١٥ فى الحدود فى باب: لا يرجم المجنون والمنونة.

[٦] صحيح.

[٧] بسند غريب ولكن مؤين بما قبله (شرحه).

بەلاَم حەددی لەو پیاوەدا کە چوو بووە لای، قسەبەر (راوی) باسی ئەوەی نەکرد کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مارەیی بۆ دانا یانا (ت-سند غەریب) خودای گەورە هەر بۆ خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ.

## ١٠٠) باسی حەوتەم: باسی تاوان پۆشینو لەتاوان خۆش بوون لەپێش ئەوەدا کە بگاتە لای پێشەواو فەرمانڕەوا:

## الباب السابع: في العفو والستر مالم يبلغ الإمام

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ} (٤٢/٤٠).

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: وە پاداشتی خراپە خراپەیە کە وەکو خۆی، بەلاَم ئەگەر کەسێ چاوپۆشی بکاو ئاشت بێتەوە لەگەلّ نەیارەکەیدا ئەوە پاداشێکی گەلێ گەورەی دەکەوێتە سەر خودای گەورە.

٢٣٩٢- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ أُصِيبَ بِقَتْلٍ أَوْ خَبْلٍ فَإِنَّهُ يَخْتَارُ إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِمَّا أَنْ يَقْتَصَّ وَإِمَّا أَنْ يَعْفُوَ وَإِمَّا أَنْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ، فَإِنْ أَرَادَ الرَّابِعَةَ فَخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ وَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري والترمذي.

ئەبو شورەیحی خوزاعی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ کەسێکی کوژرا، یا ئەندامێکی خۆی لەکار خرا، ئەوە خۆی سەر پشكو خاتر خۆیە لە کردنی یەکێ لەم سێ شتە: یا تۆڵە بستێنێ، یا تاوانبارەکە ببەخشێ یا خوێن وەربگرێ، بەلاَم ئەگەر داوای شتێکی تری کرد زیاد لەم سێ شتە ئەوە دەستی بگرنو مەیهێڵن، وە هەر کەسێ لە دوا ئەمە دەستدرێژیو ناهەقی بکا سزایەکی پڕ ئێشو بەسوێی بۆ هەیە[1] (د/ب/ن).

---

[1] تەماشای ئایەتەکەی سەرەتای باسی ژمارە سێی ئەم بەرگە بکە. -وەرگێڕ-

**٢٣٩٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رُفِعَ إِلَيْهِ شَيْءٌ فِيهِ قِصَاصٌ إِلاَّ أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٢].**

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: نەمدیوە کە مەسەلەیێ ببرێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ دادخوایی، کە تۆڵە سەندن (قیصاص)ی تیا بووبێ، نەمدیوە لە مەسەلەی وادا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لایەنی رێك کەوتنی نەگرتبێ و لە رووی، ئامۆژگارییەوە فەرمانی نەکردبێ بە لێبووردن و لێخۆشبوون (د-سند صالح-ن).**

**٢٣٩٤- وللترمذي: مَا مِنْ رَجُلٍ يُصَابُ بِشَيْءٍ فِي جَسَدِهِ فَيَتَصَدَّقُ بِهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهِ دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِهِ خَطِيئَةً[٣].**

**تیرمیذی دەگێڕێتەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەر پیاوێ جەستەی تووشی زیانێ ببێ و بیکا بەخێر واتە: تاوانبارەکە ببەخشێ مسۆگەر کە خودا لە جیاتی ئەوە هەم پایەیێ بەرزی دەکاتەوە و هەم گوناهێکی لێ هەڵدەوەرێنێ![١]**

---

[٢] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[٣] سكت عنه الشارح.

[١] ئەی دڵ پەژارەت لە رادە بەدەر
بۆیە وا هەڵەت پڕی کرد دەفتەر
ئازاری ئازار هەمووی بۆ تۆیە
هێشتا هەرباشە هۆشت لا خۆیە
خوێنەری هێژا هەڵە پۆشی کە
بەچاوی ئینصاف سەیری رۆژی کە
رۆژێ من و تۆ دەترسم دووربێ
کەهاتیش بەری شەبەقی سوور بێ

دەنکە دەنکە لەنوسینەوەکەدا هەڵەو کوژانەوەی تیادایە، جا بەم بۆنەیەوە ئەم شیعرانەی سەرەوەم گوت. -وەرگێڕ-

٢٣٩٥- وَجَاءَ مَاعِزٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَقَرَّ عِنْدَهُ بِالزِّنا أَرْبَعَ مَرَّاتٍ فَأَمَرَ بِرَجْمِهِ وَقَالَ: لِهَزَّالِ الَّذِى أَشَارَ عَلَيهِ بِالإِعتِرافِ: لَوْ سَتَرْتَهُ بِثَوْبِكَ كَانَ خَيْرًا لَكَ[٤].

ماعیز (خودای لێ رازی بێ) هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) چوار جار پێی لێنا کە شەروالپیسی کردووە، ئەوجا حەزرەت فەرمانی فەرموو سەنگەسارییان کرد، وە فەرمووی: بە هەزازال (کە ئەو تەکبیری بۆ ماعیز کردبوو کە پێ لە تاوانەکەی بنێ) پێی فەرموو: ئەگەر جلەکانی خۆتت بدایە بە سەریداو بتپۆشیبایە لەمەت زۆر باشتر بوو! (د-سند صالح-ن).

٢٣٩٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَقِيلُوا ذَوِى الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ إِلاَّ الْحُدُودَ. وفي رواية: تَعَافَوُا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ فَمَا بَلَغَنِى مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ. روى الثلاثة أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٥].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەددی شەرعی لێ دەرچێ لە وردەهەڵەی گەورە پیاوان چاوپۆشی بکەن. لە گێڕانەوەیەکا: لە ناو خۆتانا لە حەددی شەرعی خۆش بن و بەرلەوەی کە کارەکە بگاتە لای من کار بۆیەکتری ئاسان بکەن بەڵام هەر حەددێ کە گەیشتە لای من پێویستە جێبەجێ بکرێ (د-سند صالح-ن).

---

ئەم شیعرانە زۆر بوون بەبۆنەی کیمیابانی هەڵەبجەوە گوتراوە، کەلە ١٦ی مانگی ئازاردا بوو، بەڵام داخەکەم بەردەڵبەردو مەکتەبەو کتێب سووتان و بەرهەم لەناو بردن لەترسی دڕندەکانی بەعپ، هەمووی لەناودا. ڕۆژی من و خوێنەر بالفعل دوور بوو، وە دەریایێ خوێنی سووریی گەش لەپێناویدا ڕژا، جا خوابکا، بەهۆی إلحادو زەندیقی و بەربەرەڵاییەوە نەچینەوە سەر سفر، بەبێ گومان (کفر دەمانباتەوە سەرسفر) خوا پەنامان بدا لەشتی وا.

-وەرگێڕ ٢٠٠٧/٥/٧-

[٤] رَوَاهُ لأبو داود بسند صالح (شرحه).

[٥] رواهما أبُو داوُدَ بسندين صالحين (شرحه).

٢٣٩٧- وعَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ادْرَءُوا الْحُدُودَ عَنِ الْمُسْلِمِينَ مَا اسْتَطَعْتُمْ فَإِنْ كَانَ لَهُ مَخْرَجٌ فَخَلُّوا سَبِيلَهُ فَإِنَّ الإِمَامَ. لأَنْ يُخْطِئَ فِي الْعَفْوِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يُخْطِئَ فِي الْعُقُوبَةِ. رَوَاهُ الترمذي والحاكم والبيهقي[٦].

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: تا بۆتان دەکرێ حەدد لەکۆڵ موسوڵمانان بکەنەوە، ئەگەر چاری دەکرا بە کۆلکە بەهانەیێ حەدد لەسەر موسوڵمانە تاوانبارەکە لابەرن‌و وازی لێ بێنن، چونکە پێشەوا بە هەڵە لە کەسێ خۆش بێ ئەوە باشترە لەوە کە بە هەڵە تۆڵە لە کەسێ بستێنێ! (ت/حاکم/بەیهەقی. سەندی حاکم‌و بەیهەقی صەحیحە).

٢٣٩٨- وَعَنْهَا أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)؟ قَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟ ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: ثُمَّ أَمَرَ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ فَقُطِعَتْ يَدُهَا. رَوَاهُ الخمسة[٧].

دیسان گوتی: ژنێکی مەخزوومی دزیی کردبوو، قورەیش زۆر بە تەنگیەوە بوون، گوتیان: بەکێ بڵێین کە لە بارەیەوە لەگەڵ پێغەمبەردا قسەبکا؟ گوتیان: کێ پرکێشی ئەوە دەکا لە ئوسامە بەولاوە، کە خۆشەویستی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) جا کاتێ کە ئوسامە ئەوەی عەرزکرد فەرمووی: چۆن تکا دەکەی بۆ جێبەجێ نەکردنی حەددێکی

---

[٦] سند الحاكم والبيهقي صحيح ·ش

[٧] بخاری. أحاديث الأنبياء: ٣٤٧٥، ٣٧٣٣، ٢٦٤٨، ٣٧٣٢، ٣٧٣٣، ٤٣٠٤، ٦٧٨٧، ٦٧٨٨، ٦٨٠٠. مسلم. حدود: ٤٣٨٦. أبو داوُد. حدود: ٤٣٧٣. ترمذی. حدود: ١٤٣٠. نسائی. قطع السارق: ٤٩١٤.

شــەرعی کــە خــودا خــۆی داینــاوە؟ ئینجــا پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەربێ) هەســتایەوە داونێکــی فــەرموو، فــەرمووی: ئــەی خەڵکینــە! دەزانــن بۆچــی نەتــەوەکانی پــێش ئێــوە لــەناو چــوون؟ چــونکوو کاتــێ پیــاوێکی خانــەدان لــەناویانا دزی بکردایــە وازیــان لێ دەهێنــا، بــەڵام ئەگــەر لازەبوونێکیــان دزی بکردایــە حــەددیان لێ دەدا، ســوێندم بــە یــەزدانی پاك ئەگــەر فــاطیمــەی کــچی موحەممــەدیش دزی بکــا دەســتی دەبــڕم لــە گێڕانەوەیــەکا: ئینجــا فــەرمانی فەرموو دەستی ژنەکەیان بڕی (ش/د/ت/ن).

٢٣٩٩- وللنَّسائيّ: إِقَامَةُ حَدّ بِأَرْضٍ خَيْرٌ لأَهْلِهَا مِنْ مَطَرِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً. نسأل الله الستر والتوفيق لِماَ يُحِبُّ ويرضى. آمين[٨].

نەســائی (خــودای لێ رازی بــێ) دەگێڕێتــەوە: حــەزرەت (دروودی خــودای لەســەربێ) دەفەرموێ: جێبەجێکردنی حــەددێ لــە وڵاتــدا لــە بارانی چل شــەو باشترە بۆ دانیشتوانی ئەو وڵاتە.

## ١٠١) دوا وتار (پایانێ- خاتِمةٌ): حەدد برینتی گوناه دەکەوێ خاتمة: الحدود جوابر!

٢٤٠٠- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي مَجْلِسٍ فَقَالَ: أَلاَ تُبَايِعُونِي عَلَى أَلاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ تَسْرِقُوا وَلاَ تَزْنُوا وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالحَقِّ فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ وَمَنْ أَصَابَ شَيْئاً مِنْ ذلِكَ فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ أَصَابَ شَيْئاً مِنْ ذلِكَ فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذلِكَ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود. والله أعلم[١].

---

[٨] سكت عَنِ درجته الشارح.

[١] بخاری. إیمان: ١٨، ٣٨٩٢، ٣٨٩٣، ٣٩٩٩، ٤٨٩٤، ٦٧٨٤، ٦٨٠١، ٦٨٧٣، ٧٠٥٥، ٧١٩٩، ٧٢١٣، ٧٤٦٨. مسلم. حدود: ٤٤٣٦. ترمذی. حدود: ١٤٣٩. نسائی. بیعة: ٤١٧٢، ٤١٧٣، ٤١٨٩، ٤٢٢١، ٥٠١٧.

**عوبادەی کوڕی صامیت** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جارێ لە کۆڕێکا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، فەرمووی: پەیمان (بەیعەت)م بدەنێ لەسەر ئەوە کە هیچ هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکەن و دزی نەکەن و کەسێ کە خودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ نەیکوژن مەگەر لەسەر هەق. جا هەر کەسێ لە ئێوە ئەم پەیمانەی بردە سەر ئەوە پاداشی هەرە گەورەی دەکەوێتە سەر خودا، وە هەرکەسێ تووشی شتێ بوو لەمانە وە لە جیهاندا تۆڵەی ئەوەی لێ کرایەوە، ئەوە دەبێ بە کەفارەت بۆی و تاوانەکەی دەسرێتەوە، وە هەر کەسێ تووشی شتێ بوو لەوانە وە خودا بۆی پۆشی ئەوە کاری دەکەوێتە دەست خودا خۆی، جا ئەگەر حەزکا دەیبەخشێ و ئەگەر حەزکا سزای دەدا. لە گێڕانەوەیەکا: جا ئێمەیش لەسەر ئەوە پەیمانمان بەست لەگەڵیا (ش/ت/ن)[١].**

**قال المؤلف هنا: (عدد أحاديث كتاب الحدود ١٠٧ مائة و سبعة فقط). واتە: دانەر** (پرگۆڕی پیرۆزی لەبۆن و بەرامەی بەهەشتی بەرین بێ) **لەمێدا دەڵێ: ژمارەی فەرموودەکانی نامەی حوددود سەدو حەوت فەرموودەن.**

---

[١] پەروەردگارا! لەم جیهانەدا گەلێ تاوانی گەورە گەورەت بۆ ئەم بەندە تاوانبارەی خۆت پۆشیوە، سوپاسی ئەم نیعمەتە گەورەیە قەت بەمن تەواو نابێ، سا بەکەرەمی خۆت و لەبەر خاتری پێغەمبەرو پیرو مشایەخان لەو دنیاش تەریقمان مەکەرەوە پەردە لەسەر تاوانەکانمان هەڵمەدەرەوە:

بەندەی کەسێکم کەریمەو کارساز
پەیرەو کەسێکم لای خودا بەناز
دەروێش کەسێکم نازناوی شاباز
هەقمە بنازم پێیان وەک نازناز

-وەرگێڕ-

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی فەرمانڕەوایی (ئیمارەت)و دادوەریی (قەضاء)

(ئەم نامەیە پێنج بەش‌و دوا وتارێكە (پایانیكە))

## ١٠٢) بەشی یەكەم: باسی ئەوەی كەكێ ڕەواتر كەسە بە فەرمانڕەوایی

بسم الله الرحمن الرحيم

## كتاب الأمارة والقضاء (وفيه خمسة فصول وخاتمة)

## الفصل الأول: في بيان من هو أحق بالآمارة

٢٤٠١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لا يَزَالُ هَذَا الأَمْرُ فِي قُرَيْشٍ، مَا بَقِيَ مِنْهُمُ اثْنَانِ. رَوَاهُ الشيخان[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تا دووكەس لە قوڕەیش بمێنێ ئەم كارە واتە: فەرمانڕەوایی گشتی هی ئەوانە (ش).

٢٤٠٢- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: إِنَّ هَذَا الأَمْرَ فِي قُرَيْشٍ، لاَ يُعَادِيهِمْ أَحَدٌ إِلاَّ كَبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ عَلَى وَجْهِهِ، مَا أَقَامُوا الدِّينَ. رَوَاهُ البخاري[2].

موعاوییە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بیستوومە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: فەرمانڕەوایی هی قوڕەیشە، بە مەرجێ كە ئایینی ئیسلام ڕابگرن‌و بەپێی یاسا نامەی خوا بزانن. جا هەر كەسێ لەو ماوەیەدا بە ناڕەوا لەسەر خەلافەت گەڕیان پێ بكاو شەڕیان تێ بەستی لە سەری ئەوە مسۆگەر كە خودا لەسەر ڕوو لە ئاگری سووری دۆزەخدا دەیگەوزێنێ (ب- خودای لێ ڕازی بێ).

---

[1] بخاری. مناقب: ٣٥٠١. مسلم. إمارة: ٤٦٨١.

[2] بخاری. مناقب: ٣٥٠٠، ٧١٣٩.

٢٤٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: النَّاسُ تَبَعٌ لِقُرَيْشٍ فِي هَذَا الشَّأْنِ، مُسْلِمُهُمْ تَبَعٌ لِمُسْلِمِهِمْ، وَكَافِرُهُمْ تَبَعٌ لِكَافِرِهِمْ. وفي رواية: النَّاسُ تَبَعٌ لِقُرَيْشٍ فِي الخَيْرِ وَالشَّرِّ. رَوَاهُ مسلم[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەم بارەیەوە خەڵكانی تر پەیڕەوی قوڕەیشن: موسوڵمانیان هی موسوڵمانیان‌و بێ بڕوایان هی بێ باوەڕیان. لە گێڕانەوەیەكدا: خەڵكانی تر پەیڕەوانی قوڕەیشن لە چاكەو لە خراپەدا (م- خودای لێ رازی بێ).

٢٤٠٤- عَنْ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَزَالُ الإِسْلاَمُ عَزِيزًا إِلَى اثْنَيْ عَشَرَ خَلِيفَةً. ثُمَّ قَالَ كَلِمَةً لَمْ أَفْهَمْهَا فَقُلْتُ لأَبِي مَا قَالَ؟ فَقَالَ: كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي (قَالَ المؤلف (طيب الله تَعَالَى ثراه) في الشرح ما يلي: ورواه أَبُو دَاوُدَ في كتاب المهدي بلفظ: لاَيَزَالُ الدِّينُ قَائِماً حَتَّى يَكُونَ عَلَيْكُمُ اثْنَا عَشَرَ خَلِيفَةً كُلُّهُمْ تَجْتَمِع عليهم الأُمَّةُ ثُمَّ قَالَ: وهؤلاءِ الخلفاءُ الَّذين يعتز بهم الإسلام هم من أبي بكرٍ إلى عُمَر بنِ عبد العزيز (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) بعد حذف معاوية بن يزيد ومروان بن الحكم، فإن إماراتهما لم تصح ولم تطل مدتها[٤].

جابیری كوڕی سەموورە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەتا دوانزە جێنشین ئایینی ئیسلام هەرزاڵ دەبێ و لە شەوق‌و برەودا دەبێ ئینجا قسەیەكی فەرموو باش تێی نەگەیشتم، بە باوكم گوت: ئەوە فەرمووی چی؟ گوتی: فەرمووی: هەموویان لە هۆزی قوڕەیش دەبن (ش/ت) دانەر- پڕگۆڕەكەی لە نوورو بۆن‌و بەرامەی بەهەشتی بەرین بێ- دەڵێ لە شەرحەكەدا: ئەبو داوودیش (خودای لێ رازی بێ) گێڕاویەتەوە لە باسی- كتاب المهدی)دا بەم گفتەیە: ئەم ئایینە هەروا زاڵ‌و سەركەوتوو دەبێ، تا دوانزە كەس لەسەر ئێوە دەبن بە جێنشین، یەك لە دوای یەك

---

[٣] مسلم. إمارة: ٤٦٨٠.

[٤] بخارى. إمارة: ٧٢٢٢. مسلم. إمارة: ٤٦٨٧ — ٤٦٨٩.

میللەتی ئیسلام كۆدەبنەوە لە دەوریان‌و پشتیان دەگرن ئینجا دانەر دەڵێ: ئەم دوانزە جێنشینەی كە مایەی سەربەرزی‌و شانازی ئیسلامن لە ئەبو بەكرەوە دەست پێ دەكەن وە لە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزدا تەواو دەبن، (رەزای خودای گەورەیان لێبێ) بەڵام دەشێ موعاییەی كوڕی یەزیدو مەڕوانی كوڕی حەكەمیان لێ چەرت بكرێ چونكە فەرمانڕەوایی ئەم دووانە نە دروست بووەو نە ئەوەندەی خایاندووە!

٢٤٠٥- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُمْهَانَ عَنْ سَفِينَةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُم) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْخِلاَفَةُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ سَنَةً ثُمَّ مُلْكٌ بَعْدَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ سَفِينَةُ: أَمْسِكْ خِلاَفَةَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيّ. فَوَجَدْنَاهَا ثَلاَثِينَ سَنَةً. قَالَ سَعِيدٌ فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ بَنِي أُمَيَّةَ يَزْعُمُونَ أَنَّ الْخِلاَفَةَ فِيهِمْ. قَالَ: كَذَبُوا بَنُو الزَّرْقَاءِ بَلْ هُمْ مُلُوكٌ مِنْ شَرِّ الْمُلُوكِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن بسندٍ حَسَن. والله أعلم[٥].

سەعدی كوڕی جومهان گوتی: سەفینە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جێنشینی راست‌و دروست لەناو ئۆمەتی مندا تا ماوەی سیی ساڵە، لەپاش ئەوە دەبێ بە پادشایەتی ئینجا سەفینە گوتی: ئادەی ماوەی جێنشینی ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان‌و عەلی حلێب كە، جا كە حلێبمان كرد هەمووی كردیە سیی ساڵ، سەعید گوتی: پێیم گوت: خۆ فەرمانڕەواكانی بەنی ئومەیەیش خۆیان بە جێنشین دادەنێن؟ گوتی: بەنی ئومەییە نەتەوەی ژنە چاوشین درۆ دەكەن، ئەوانە پادشان خۆزیا، پادشا گەلێكی خاسیش دەبوون بەڵكو لە بەدترینی پادشایانن (د/ت/ن-س/ح).

## ١٠٣) نەویستنی فەرمانڕەوایی: (الزهد في الإمارة)

٢٤٠٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): يا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا،

---

[٥] حديث حسن.

وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئەوڕەحمانی كوڕی سەمورە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: ئەی ئەوڕەحمان! داوای فەرمانڕەوایی مەكە، چونكە ئەگەر لەسەر داواكردنی خۆت بەرپرسیی‌و سەركاریی وەربگری لێت دەبێ بە بار، وەلێ ئەگەر بەبێ ئەوە كە خۆت هەوڵی بۆ بدەی بكرێی بە فەرمانڕەوا ئەوا خودا زاڵت دەكا بە سەریا، ئەی ئەوڕەحمان! ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، وە لەپاشا تەماشایت كرد كە لەو شتە باشتر هەیە، ئەوە برێتی كەفارەتی سوێندەكەت بدەو ئەوە بكە كە بە باشتری دەزانی. (ش/د/ت/ن).

٢٤٠٧- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَرَجُلاَنِ مِنْ بَنِي عَمِّي فَقَالَ: أَحَدُ الرَّجُلَيْنِ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمِّرْنَا عَلَى بَعْضِ مَا وَلاَّكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ. وَقَالَ الآخَرُ مِثْلَ ذَلِكَ فَقَالَ: إِنَّا وَاللَّهِ لاَ نُوَلِّي عَلَى هَذَا الْعَمَلِ أَحَدًا سَأَلَهُ وَلاَ أَحَدًا حَرَصَ عَلَيْهِ. رَوَاهُ الثلاثة. ولفظ أبي داود: إِنَّ أَخْوَنَكُمْ عِنْدَنَا مَنْ طَلَبَهُ فَاعْتَذَرَ أَبُو مُوسَى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ: لَمْ أَعْلَمْ مَا جَاءَا لَهُ. فَلَمْ يَسْتَعِنْ بِهِمَا عَلَى شَيْءٍ حَتَّى مَاتَ (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٢].

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆم‌و دوو پیاو (لە ئامۆزاكانم) چووینە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێكیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بمانكە بە سەركاری شتێ لەو شتانە كە خودا سپاردوونی بە تۆو تۆی كردووە بە خاوەنیان، ئەویتریشیان هەمان قسەی كرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): بە خودا هەر كەسێ خۆی هەوڵ بدا بۆ ئەم ئیشە، یا سوور (حەریص) بێ لە سەری ئێمە ئەو كەسە ناكەین بە سەركاری ئەو كارە.

---

[١] بخاری. أيمان ونذور: ٦٦٢٢، ٦٧٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧. مسلم. أيمان: ٤٢٥٧. أبو داود. أيمان: ٣٢٧٧، ٣٢٧٨، ٢٩٢٩. ترمذی. نزور وأيمان: ١٥٢٩. نسائی. أيمان: ٣٧٩١ — ٣٧٩٣، ٣٧٩٨ — ٣٨٠٠.

[٢] بخاری. إجارة: ٢٢٦١، ٣٠٣٨، ٤٣٣٤، ٤٣٤٣، ٤٣٤٤، ٦١٢٤، ٦٩٢٣، ٧١٤٩، ٧٧٥٦، ٧١٥٧، ٧١٧٢. مسلم. إيمارة: ٤٦٩٤، ٤٦٩٥. أبو داود. أقضية: ٣٥٧٩، ٤٣٥٤. نسائی. طهارة: ٤.

(ش/د) گفتەی (د): ناپاكترین كەستان لەلای ئێمە كە بۆنی گزیو دزی لێبێ ئەو كەسەتانە كە خۆی هەوڵی بۆ بدا. جا ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) عوذر خواهی كردو گوتی: من نەمزانیوە كە ئەمانە بۆ ئەمە هاتوون، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا مرد ئەو دوو كەسەی نەكرد بە بەرپرس‌و سەرەوكاری هیچ شتێ.

٢٤٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الإِمَارَةِ، وَسَتَكُونُ نَدَامَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَنِعْمَ الْمُرْضِعَةُ وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە زۆر سوور (حەریص)ن لەسەر فەرمانڕەوایی‌و سەرداریی، وەلحاڵ ئەم شتە لە ڕۆژی قیامەتا پەشیمانیی لەدوایە، بەڵێ دایەنی چاكە بەلام لە شیر بڕینەوەكەی گەلێ ناخۆشە! (ش/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).

٢٤٠٩- وَقَالَ أَبُو ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِي فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى مَنْكِبِي ثُمَّ قَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ ضَعِيفٌ وَإِنَّهَا أَمَانَةٌ وَإِنَّهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ إِلاَّ مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا وَأَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ فِيهَا.رواه مسلم وأبو داود[٤].

ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بریا دەتكردم بە سەركاری سەركارێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی دا بە سەرشانماو فەرمووی: ئەی ئەبو ذەڕ! تۆ پیاوێكی لازەبوونی، وەلحاڵ ئەم ئیشەیش لە ڕۆژی قیامەتا هۆی تەریقی‌و پەشیمانییە، مەگەر بۆ كەسێ كە بە حەق پێی هەڵسێ‌و مافی خۆی بداتێ (م/د- خودایان لێ ڕازی بێ).

٢٤١٠- وللطبراني (على ما هو في الشرح): الإِمَارَةُ أَوَّلُهَا نَدَامَةٌ وَأَوسَطُهَا غَرَامَةٌ وَآخِرُهَا عَذَابٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٥].

---

[٣] بخاری. أحكام: ٧١٤٨.

[٤] مسلم. إمارة: ٤٦٩٦.

[٥] مسكوت عنه من الشارح.

لـە شـەرحەکەدا دەڵـێ: طـەبـەرانی دەگێڕێتـەوە: حـەزرەت (دروودی خودای لەسـەربێ) فەرمووێـەتی: سـەرەتای فـەرمانڕەوایی و ئاغایـەتی پەشـیمانییە، ناوەڕاستەکەی ماڵوێرانییـە، دوا دواییکەیـشی سـزایەکی قـورس و گرانـە لـە ڕۆژی قیامەتدا![1].

## ١٠٤) بەشی دووەم: باسی پەیمان بەستن (بەیعەت)و پەیمان بردنە سەر:
## الفصل الثاني: في البيعة والوفاء بها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا} (١٠/٤٨).

خـودای مـەزن فەرمووێـەتی: ئـەی پێغەمبـەری نـازدار! ئـەو کەسـانە کـە پەیمان دەبەستن لەگەڵ تۆدا ئەوە لە ڕاستیدا پەیمان لەگەڵ خودادا دەبەستن، دیارە کە دەستی خودا باڵا دەستی ئەوانە، جا ئـەو کەسـەی کە پەیمانەکەی هەڵوەشێنێتەوە و نەیباتـە سـەر ئـەوە زیـانی بـۆ خۆیـەتی و بـەس، بـەڵام هـەر کەسێ پەیمانی خودا بباتە سەر ئەوە خودا پاداشتی زۆرو گەورەی دەڕژێنـێ بە سەردا.

٢٤١١- عَنْ مُجَاشِعُ بْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جِئْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ أُبَايِعُهُ عَلَى الْهِجْرَةِ فَقَالَ: إِنَّ الْهِجْرَةَ قَدْ مَضَتْ لأَهْلِهَا وَلَكِنْ عَلَى الإِسْلاَمِ وَالْجِهَادِ وَالْخَيْرِ. رَوَاهُ مسلم[1].

---

[1] ئاغاو نۆکەری کە نێستـــا باوە
ڕەنگ و ڕێسی نوێی لەبەر کـــراوە
نۆکەر مەیموونەو لۆتییە ئاغـــای
سەمای پێ دەکا لەسەر هەر چار پای!
—وەرگێڕ—

[1] بخاری. جهاد: ٢٩٦٢، ٣٠٧٨، ٤٣٠٥، ٤٣٠٧، ٢٩٦٣، ٣٠٧٩، ٤٣٠٦، ٤٣٠٨. مسلم. إمارة: ٤٨٠٣، ٤٨٠٤.

**موجاشیعی كوڕی مەسعوود** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لەپاش ئازادكردنی مەككە چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **كە پەیمانی بدەمێ لەسەر كۆچكردن، فەرمووی: كۆچكردن بەسەر چوو، ئەوەی كۆچی كرد دەستی خۆی وەشاند! بەڵام پەیمانم بدەنێ لەسەر ئەوە كە خزمەتی ئیسلام بكەن‌و غەزابكەن‌و خەبات بگێڕن‌و لەكردنی خێرو چاكە دریغی نەكەن! (م).**

٢٤١٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عنهما) قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَيُلَقِّنُنَا فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: جاران كە پەیمانمان دەدا بە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لەسەر ئەوە پەیمانمان دەدایە كە لە قسەی دەرنەچین‌و فەرمانبەریی بكەین، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەینایە سەر دەممان كە بڵێین: ئەوەندەی كە لە تواناتانا هەیە (ش/د/ت/ن).**

٢٤١٣- عَنْ عُبَادَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ وَعَلَى أَثَرَةٍ عَلَيْنَا وَعَلَى أَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ وَعَلَى أَنْ نَقُولَ بِالْحَقِّ أَيْنَمَا كُنَّا لاَ نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لاَئِمٍ. وفي رواية: وعلى ألا ننازع الأمر أهله قَالَ: إلا أن تروا كفراً بواحاً عندكُمْ من الله فيه برهان. رَوَاهُ الشيخان والنسائي. تقدم الحديث في المجلد الأول في بداية مبحث : (الباب الخامس في البيعة): (ب-١ ز-٨)[٣].

**تكایە بۆ مانای ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر سەیری زنجیرە/٨ بەرگی یەكەم بەتەواوی بكە.**

٢٤١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ، كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وَإِنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي، وَسَيَكُونُ

---

[٢] بخارة. أحكام: ٧٢٠٢، مسلم. إمارة: ٤٨١٣. ترمذى. السيد: ١٥٩٣. نسائى. بيعة: ٤١٩٨.

[٣] تقدم فى رقم: ٥٧/٢ ورقم: ٥٨/٣ تسلسل/٨ مجلد أول.

خُلَفَاءُ فَيَكْثُرُونَ. قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: فُوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ فَالأَوَّلِ، أَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَإِنَّ اللّٰهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ. رَوَاهُ الشيخان[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جاران ئەوەی ئیسرائیل پێغەمبەران دەیان بردن بەڕێوەو سەرپەرشتی کارو باریان دەکردن، هەر کاتێ پێغەمبەرێ فەوتی دەکرد گورج پێغەمبەرێکی تر لە جێگەی دادەنیشت بەڵام ئاشکرایە کە لە پاش من پێغەمبەری تر نابێ، وەلێ جێنشین دەبن‌و زۆریش دەبن (نەك کەم) یاران گوتیان: جا فەرمانت بە چییە پێمان‌و ئەرکی سەرشانی ئێمە چییە لە گەڵیانا؟ فەرمووی: یەك لە دوای یەك پەیمانیان بدەنێ با هیچ کاتێ بێ ئیمام‌و بێ سەرۆك نەبن، وەلێ لە هەر چەرخێکا کێ لە پێش پێشەوە پەیمانتان دا پێی ئەوە جێنشینی ڕاستەقینەیە وە پەیمانەکەیشیان ببنە سەرو مافی خۆیانیان بدەنێ‌و لە فەرمانیان دەرمەچن! بێگومان کە ئەوانیش لەلای خوداوەند بەرپرسیارن دەرهەق بە ژێر دەستەکانیان کە خودا ئەوانی کردووە بە شوانیان (ش).

٢٤١٥- وَلِمُسْلِمٍ: إِذَا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ فَاقْتُلُوا الآخَرَ مِنْهُمَا[٥].

دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ) ئەگەر ڕێکەوت پەیمان درا بە دوو جێنشین دوایینەکەیان بکوژن (م).

٢٤١٦- (ب- ٢ز- ١٧٤ل ٢٦٥ف-٢)[٦].

٢٤١٧- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُعْرَفُ بِهِ يُقَالُ هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانٍ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٧].

---

(٤) بخاری. أحاديث الأنبياء: ٣٤٥٥. مسلم. إمارة: ٤٧٥٠.

(٥) مسلم. إمارة: ٤٧٧٦.

(٦) تقدم برقم: ٢/١٩٢٠ تسلسل/ ١٧٤ مجلد ثانی.

(٧) بخاری. جزية وموادعة: ٣١٨٦، ٣١٨٧. مسلم. جهاد: ٤٥٠٨.

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا هەموو ستەمگەرو بێ پەیمانێ ئالایەکی تایبەتی خۆی هەیە هەڵدەکرێ لە دیاری پێی دەناسرێتەوە دەڵێن: ئەمە نیشانەی ناپاکی‌و پەیمان شکێنیی فیسارە کەسە (ش/ت).**

**٢٤١٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) يُبَايِعُ النِّسَاءَ بِالْكَلَامِ بِهَذِهِ الآيَةِ {لاَ يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا} قَالَتْ: وَمَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ (صلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) يَدَ امْرَأَةٍ، إِلاَّ امْرَأَةً يَمْلِكُهَا. رَوَاهُ الشيخان[٨].**

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: هەموو جارێ پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **کە پەیمانی وەردەگرت لە ژنان بە زمان بە خوێندنی ئەم ئایەتە پەیمانی لێ وەردەگرتن کە دەفەرموێ:**

**{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (٦٠/١٢).**

**واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتێ کە ژنانی موسوڵمان هاتن بۆ لات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەوە کە: بەهیچ جۆرێ هاوبەش پەیدا نەکەن بۆ خوداو دزی نەکەن‌و داوێن پیسی نەکەن‌و منداڵی خۆیان نەکوژن، واتە: کچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەن‌و سك لەبار خۆیان نەبەن‌و بوختانی درۆ لە نێوان دەست‌و پای خۆیانا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن‌و بە درۆو ناحەق بیکەن بە منداڵی مێردەکانیان، وە لە کاری باش‌و هەموو بیرو باوەڕو خوو ڕەفتارێکی ناسراوی ئاییندا لە فەرمایشتی تۆ دەرنەچن‌و سەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن، ئەوە تۆیش پەیمانیان لەگەڵ بکە لەسەر ئەوە، وە داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە لە خودا، بە ڕاستی خودا تاوانبەخش‌و میهرەبانە عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بەقسە بە خوێندنی ئەم ئایەتە پەیمانی لە ژنان وەردەگرت، وە لەکاتی پەیمان‌و غەیری**

---

[٨] بخاری. طلاق: ٥٢٨٨. مسلم. إمارة: ٤٨١١، ٤٨١٢

پەیمانا دەستی نەدەنایە ناو دەستی هیچ ژنێ، مەگەر ژنێ كە حەلاڵی خۆی بووبێ (ش) (ب- ١ز- ٨ل- ٤٩ف- ٦) = رقم: ٦١/٦ تسلسل/٨ مجلد اول.

٢٤١٩- وَقَالَتْ أُمَيْمَةُ بِنْتُ رُقَيْقَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي نِسْوَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ نُبَايِعُهُ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نُبَايِعُكَ عَلَى أَنْ لاَ نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ نَسْرِقَ وَلاَ نَزْنِيَ وَلاَ نَأْتِيَ بِبُهْتَانٍ نَفْتَرِيهِ بَيْنَ أَيْدِينَا وَأَرْجُلِنَا وَلاَ نَعْصِيَكَ فِي مَعْرُوفٍ. قَالَ: فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ. قَالَتْ: قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا هَلُمَّ نُبَايِعْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: إِنِّي لاَ أُصَافِحُ النِّسَاءَ إِنَّمَا قَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ كَقَوْلِي لاِمْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ. رَوَاهُ النسائي والترمذي في السّير[٩].

ئومەیمەی كچی روقەیقە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ دەستەیێ ئافرەتی یاریدەدەران (ئەنصار) چووینە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) كە پەیمانی بدەینێ، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووینەتە خزمەتی تۆ پەیمانت دەدەینێ لەسەر ئەوە كە هیچ هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەكەین‌و دزی‌و حیزی نەكەین‌و زۆڵ نەخەینەوە بە دزی مێردەكانمانەوە وەك كاتی سەردەمی نەزانی ژن ئەگەر مێردەكەی نەزۆك بوویە لەژێرەوە، بە دزی مێردەكەیەوە خۆی لەگەڵ پیاوێكا رێك دەخست، تا زۆڵێكی ببێ‌و مێردەكەی لەبەر بێ منداڵی تەڵاقی نەدا! وە لە كردنی كاری باش‌و فەرمانە ناسراوەكاندا لە فەرمانی تۆ دەرنەچین.

فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەوەندەی كە لە تواناتانا هەیەو وزەتان پێی دەشكێ، ئومەیمە گوتی: گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا زۆر بە رەحم‌و میهرەبانن لەگەڵ ئێمەدا بۆیە تەكلیفی وامان لێ ناكەن كە لە بارماندا نەبێ دەیفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! دەستت بێنە بیخەرە ناو دەستمان با پەیمانت لەگەڵ ببەستین. فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) من لەگەڵ ئافرەتا تەوقە ناكەم، بە زاریش كە پەیمانتان بدەمێ چ لەگەڵ یەك ژندا قسە بكەم‌و چ لەگەڵ سەد ژندا قسە بكەم وەك یەكە (ن/ت).

---

[٩] سكت عنه الشارح.

## ١٠٥) بەگوێكردنی فەرمانڕەوا پێویستەو دروست نیە دەرچوون لە فەرمانی‌و یاخی بوون لێی: (تجب إطاعة ألأمير ويحرم الخروج علَيه)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ} (٤/٥٩).

**ئەی كەسانێ! كە باوەڕتان هێناوە بە گوێی خوداو پێغەمبەری خودا بكەن‌و لە فەرمانیان دەرمەچن، وە هەروەها بەگوێی خاوەن فەرمانەكانیشتان بكەن‌و لە قسەو فەرمانیان دەرمەچن، ئەوانەیان كە لە خۆتان بن.**

٢٤٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِى فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى أَمِيرِى فَقَدْ عَصَانِي. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[1].

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەركەسێ فەرمانبەریی من بكا ئەوە فەرمانبەریی خودا دەكا چونكە من هەموو شتێ لەسەر فەرمانی ئەو دەكەم وە هەركەسێ لەمن یاخی ببێ ئەوە لە خودا یاخی دەبێ، وە هەركەسێ فەرمانبەریی فەرمانڕەوای من بكا ئەوە فەرمانبەریی من دەكا، وە هەركەسێ لە فەرمانی فەرمانڕەوای من دەرچێ ئەوە لە فەرمانی من دەردەچێ (ش/ن).**

٢٤٢١- عَنْ ابنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ، فِيمَا أَحَبَّ أَوكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ. رَوَاهُ الخمسة[2].

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوی موسوڵمان لەسەریەتی كە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەر بێ‌و لە فەرمانی گەورەی خۆی دەرنەچێ، ئەو كارەی پێ خۆش بێ یانا، بە مەرجێ**

---

[1] بخارى. أحكام: ٧١٣٧، ٢٩٥٧. مسلم. إمارة: ٤٧٢٤ — ٤٧٢٨.

[2] بخارى. مغازى: ٤٣٤٠، ٢٩٥٥. مسلم. إمارة: ٤٧٤٠ — ٤٧٤٤. ترمذى. جهاد: ١٧٠٧.

فەرمانی پێ نەكرێ بە گوناهو خراپە، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێ كرا بە گوناهو خراپە ئەوە نابێ بەگوێی بكا (ش / د / ت / ن - خودایان لێ رازی بێ).

٢٤٢٢ - وللبخاري: اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ[٣].

بوخاری دەگێڕێتەوە كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەمیشە بە گوێی فەرمانڕەواكانی خۆتان بكەن‌و لە فەرمانیان دەرمەچن، ئەگەر چی بەندەیەكی ڕەشی حەبەشیش بێ، كە سەری بەقەد دەنكە مێووژێ بێ واخڕو ڕەش بێ (ب).

٢٤٢٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ أَسْمَعَ وَأُطِيعَ وَإِنْ كَانَ عَبْدًا مُجَدَّعَ الأَطْرَافِ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ أَسْوَدُ يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا. رَوَاهُ مسلم[٤].

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دۆستی خۆشەویستم پێغەمبەری نازدار (دروودی خودای لەسەربێ) ئامۆژگاری كردووم كە هەمیشە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەربم بۆ گەورەی شەرعیی خۆم ئەگەر چی لەژێر فەرمانی بەندەیەكی دەست‌و پابڕاویشدا بم! لە گێڕانەوەیەكا فەرمووی: گریمان كە فەرمانڕەواكەتان بەندەیەكی قولە ڕەشی دەست‌و پا قرتاویش بوو، بە مەرجێ بەپێی قورئان ڕەفتار بكا لە گەڵتانا، ئەوا بەگوێی بكەن‌و لە فەرمانی دەرمەچن (م).

٢٤٢٤- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَمَاتَ، إِلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. رَوَاهُ الشيخان[٥].

---

[٣] بخاری. أحكام: ٧١٤١.

[٤] مسلم. إمارة: ٤٧٣٢.

[٥] بخاری. فتن: ٧٠٥٣، ٧٠٥٤، ٧١٤٣. مسلم. إمارة: ٤٧٦٧، ٤٧٦٨.

ئیبنو عەبباس (خودایان لیٚ رازی بیٚ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: ئەگەر كەسیٚ شتیٚكی دی لە فەرمانڕەواكەی، وە ئەو شتەی بەدڵ نەبوو با ئەوە نەكا بە بەهانە بۆ هەڵكردنی بەیداخی یاخیٚتی‌و نەیكا بە بیانووی تیٚكدانی كۆمەڵەی موسوڵمانان، بەڵكو با ددان بە خۆیا بگریٚ، چونكە ئەوەی یەك بست لە كۆمەڵەی موسوڵمانان جیا ببیٚتەوە، وە بمریٚ ئەوە بە نەزانی‌و نەفامی دەمریٚ وەك مردنی سەردەمی نەزانی پیٚش ئیسلام (ش).

٢٤٢٥- ولمسلمٍ وأبي داود: إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نُقَاتِلُهُمْ قَالَ: لاَ مَا صَلَّوْا[٦].

ئیمامی موسلیم‌و ئیمامی ئەبو داوود: (رەزای خودای مەزنیان لیٚبیٚ) دەگیٚڕنەوە كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرموویەتی: رۆژیٚ دەبیٚ كار بەدەستانیٚ دەبن بە فەرمانڕەواتان چاك‌و خراپ تیٚكەڵ دەكەن، جا ئەوەی خراپەكەی پیٚ ناخۆش بیٚ ئەوە خۆی دەپەڕیٚنیٚتەوە، وە ئەوەی بەرهەڵستیی بكا ئەوە خۆی سەرفرازدەكا، بەڵام ماڵویٚران‌و هاوبەشی تاوان ئەو كەسانەن كە بەو خراپەیە قاییل دەبن‌و پەیڕەویی ئەوان دەكەن گوترا: ئەی پیٚغەمبەری خودا! ئایا نەچین بە گژیانا؟ فەرمووی: هەتا نویٚژ بكەن نەء!

٢٤٢٦- عَنْ حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا بِشَرٍّ فَجَاءَ اللَّهُ بِخَيْرٍ فَنَحْنُ فِيهِ فَهَلْ مِنْ وَرَاءِ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: هَلْ وَرَاءَ ذَلِكَ الشَّرِّ خَيْرٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: فَهَلْ وَرَاءَ ذَلِكَ الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: كَيْفَ؟ قَالَ: يَكُونُ بَعْدِي أَئِمَّةٌ لاَ يَهْتَدُونَ بِهُدَايَ وَلاَ يَسْتَنُّونَ بِسُنَّتِي وَسَيَقُومُ فِيهِمْ رِجَالٌ قُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الشَّيَاطِينِ فِي جُثْمَانِ إِنْسٍ. قُلْتُ: كَيْفَ أَصْنَعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَدْرَكْتُ ذَلِكَ؟ قَالَ: تَسْمَعُ وَتُطِيعُ لِلأَمِيرِ وَإِنْ ضُرِبَ ظَهْرُكَ وَأُخِذَ مَالُكَ فَاسْمَعْ وَأَطِعْ. وَفِي رِوَايَةٍ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ. فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلاَ إِمَامٌ قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ. رَوَاهُ الثلاثة[٧].

---

[٦] مسلم. إمارة: ٤٧٧٧، ٧٧٧٨، ٤٧٨٠. أبو داود. السنة: ٤٧٦٠، ٤٧٦١. ترمذي. فتن: ٢٢٦٥.

[٧] بخاري. مناقب: ٣٦٠٦، ٣٦٠٧، ٧٠٨٤.

حوذەیفە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەمەوبەر لە حاڵێکی خراپدا بووین‌و لە تاریکستانی سەردەمی نەزانیدا بووین ئێستاکەیش خوا دەرووی خێری لێ کردووینەتەوەو کەوتووین بەسەر ئەم خێرو خۆشییەدا جا ئایا لەپاش ئەم خێرە شەڕی تر دێ؟ فەرمووی: بەڵێ: گوتم: ئەی باشە لەپاش ئەو شەڕە خێری تر دێ؟ فەرمووی: بەڵێ: گوتم: ئەی لەپاش ئەو خێرەیش شەڕی تریش دێ؟ فەرمووی: بەڵێ: گوتم: چۆن؟ فەرمووی: لەپاش من چەند پێشەوایێ پەیدا دەبن نە بە شەریعەتی من ڕێ بەدێیی دەگەن‌و نە بە سوننەت‌و ڕەووشتی من ڕەفتار دەکەن، وە چەند پیاوێکی وایان تیا پەیدا دەبێ دڵیان دڵی شەیتانەو لەشیان لەشی مرۆڤانە! گوتم: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! ئەگەر فریای ئەو ڕۆژە کەوتم چی بکەم؟ فەرمووی: ئەگەر فریای ئەوا ڕۆژێ کەوتی بە قسەی فەرمانڕەوا بکەو فەرمانی بەجێ بێنە ئەگەرچی پشتیشت دارکاری بکرێ‌و ماڵیشت بە ناهەق بخورێ تۆ هەر لە فەرمانی ئەو دەرمەچۆ لە گێڕانەوەیەکا: لایەنی کۆمەڵی موسوڵمانان‌و لایەنی پێشەوای ئەوان بگرە گوتم: ئەی ئەگەر نەکۆمەڵ‌و نە پێشەوایان هەبوو چۆن؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) لەو تیپانە لە هەموویان کلا بە، تەنانەت ئەگەر هەر چارەت نەبوو باوەش بکە بە قەدی شێخەڵێکاو لەبن دارێکا ستار بگرە هەتا دوور لەوان لەسەر ئەوحاڵەیە مردن دەگاتە فریات[1]. (ش/د).

---

[1] کاکە! پێت بڵێم بەکوردی پەتی
ئەمرۆکە دنیا ئەمە حاڵێتی
گەر ئەهلی دنیای ڕازی بە بەمە
دەنا قسەی تۆ لای ئەوان پەشمە
گەر ئەهلی خودای سەرت کز بگرە
لەپەنایەکا سەرەی مەرگ بگرە!

-وەرگێڕ-

٢٤٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ وَفَارَقَ الْجَمَاعَةَ ثُمَّ مَاتَ، مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً وَمَنْ قُتِلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ يَغْضَبُ لِلْعَصَبِيَّةِ وَيُقَاتِلُ لِلْعَصَبِيَةِ فَلَيْسَ مِنْ أُمَّتِي وَمَنْ خَرَجَ مِنْ أُمَّتِي عَلَى أُمَّتِي يَضْرِبُ بَرَّهَا وَفَاجِرَهَا لاَ يَتَحَاشَى مِنْ مُؤْمِنِهَا وَلاَ يَفِي بِذِي عَهْدِهَا فَلَيْسَ مِنِّي[٨].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ لە فەرمانی فەرمانڕەوا دەرچێ‌و لە کۆمەڵ جیا بێتەوە لەپاشا لەسەر ئەو حاڵە بمرێ ئەوە بە نەزانی دەمرێ وەك مردنی سەردەمی نەزانی، وە کەسێ بکوژرێ لەژێر ئاڵای کوێرانەدا، کە ئاڵای کوێرانە ئەوەیە بەهەق‌و ناهەق لەسەر خزم‌و خوێشی خۆی هەڵبداتێ‌و لە پێناوی ئەوانا جەنگ بکاو گوێ بەهەق‌و ناهەق نەدا ئەوە لە ئۆمەتی من نیە، وە هەر کەسێ لە ئۆمەتم ڕاست بێتەوە لە ئۆمەتم‌و پەلاماری بداو کوێرانە خاس‌و خراپی داپڵۆسێ‌و بەهەر کەسێکا بگا تێی سرەوێنێ‌و شەلم کوێرم دەست لە موسوڵمانان نەپارێزێ‌و پەیمانی خاوەن پەیمانەکان کە پێیان دەگوترێ ئەهلی ذیمە نەباتە سەر، ئەوەیش لەمن نیە (م).

٢٤٢٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ خَلَعَ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ لَقِيَ اللَّهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ حُجَّةَ لَهُ وَمَنْ مَاتَ وَلَيْسَ فِي عُنُقِهِ بَيْعَةٌ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً[٩].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خودای لەسەربێ) هەر کەسێ پەیمان بدا بە فەرمانڕەوایێ‌و لەپاشا لە فەرمانی دەرچێ‌و دەست بکێشێتەوە لە بەگوێکردن (ئیطاعە)ی، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە دەگاتەوە بە دیداری خودا هیچ بەهانەیەکی ڕەوای نیە کە خۆیی پێ قوتار بکا لە ئۆباڵی ئەو پەیمان شکاندنە.

---

[٨] مسلم. إمارة: ٤٧٦٥. نسائی. تحريم الدم: ٤١٢٥.

[٩] مسلم. إمارة: ٤٧٧٠. نسائی. تحريم الدم: ٤١٢٦.

وە هەر كەسێ بمرێ بەبێ پەیمان بەستن لەگەڵ فەرمانڕەوای ئیسلامدا ئەوە بە نەزانی دەمرێ وەكی مردنی سەردەمی نەزانی (م. خودای لێ رازی بێ).

٢٤٢٩- عنْ عَرْفَجَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: إِنَّهُ سَتَكُونُ هَنَاتٌ وَهَنَاتٌ (أي شُرورٌ) فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ وَهْيَ جَمِيعٌ فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ كَائِنًا مَنْ كَانَ. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنْ أَتَاكُمْ وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ يُرِيدُ أَنْ يَشُقَّ عَصَاكُمْ أَوْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ فَاقْتُلُوهُ[10].

عەرفەجە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: گەلێ كارەسات روو دەدەن‌و گەلێ ئاژاوەو ئاشووب بەرپا دەبن، جا ئەگەر ئەم ئۆمەتی ئیسلامە یەك پارچە بوون‌و گێرە شێوێنێ ویستی لە یەكیان بكاو دوو بەرەكییان تێبخا ئەوە هەر كەسە هەبوو كوی لێ مەكەنەوە بە شمشێر داپاچن. لە گێڕانەوەیەكا: ئەگەر هەمووتان لە دەوری پیاوێ كۆبوونەوەو لەولاوە پیاوێكی تر پەیدا بوو ویستی یەكێتی‌و كۆمەڵەكەتان تێك بدا بیكوژن (م).

٢٤٣٠- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ فَقَالَ: لاَ مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاَتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ وَلاَ تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ. روى مسلم (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) هذه الخمسة[11].

عەوفی كوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێشەواو كاربەدەستە باشەكانتان ئەوانەن كە ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێ‌و ئەوان ئێوەیان خۆش دەوێ، هەم ئێوە دەعاو نزای باش بۆ ئەوان دەكەن‌و هەم ئەوان بۆ ئێوەی دەكەن! وە پێشەواو كاربەدەستە خراپەكانتان ئەوانەن كە هەم ئێوە رقتان لەوانەو هەم ئەوان رقیان لە ئێوەیە، وە هەر

---

[10] مسلم. إمارة: ٤٧٧٥. أبو داوُد. سنة: ٤٧٦٢. نسائي. تحريم الدم: ٤٠٣٢.

[11] مسلم. إمارة: ٤٧٨١.

دوولایـش (چ ئێـوەو چ ئـەوان) لەعنـەت‌و نـەفرین لـە یـەکتریی دەکـەن ئێـوە لـەوان‌و ئـەوان لـە ئێـوە گـوترا: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! تـاوی شمـشێریان لێ نەدەین؟ فـەرمووی: هـەتا نوێـژتان بـۆ بکـەن نـەء! کاتـێ کـارێ لەسـەر کـارێکی خۆتان پەسەند ناکەن ئەوە بێز لـەو کـارەی بکەنـەوەو بـەس، بـەڵام بەکـەمترین هۆ لە فەرمانیان دەرمەچن‌و دەست مەکێشنەوە لە بەگوێ کردنیان (م).

## ١٠٦) بەشی سێیەم: ئەرکی سەرشانی فەرمانڕەوا:

## الفصل الثالث: فيما يجب على الأمير

قَالَ الله تَعَالَى: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ } (١٦/٩٠).

خودای گەورە دەفەرموێ: خودا فەرمان دەدا بە میانەکاری‌و ئەمر دەکا بـە عەدالـەت‌و دادپـەروەری، وە فـەرمان دەکـا بـە چـاکەکردن، وە بـە بەشـدانی خـزم‌و خـوێش، وە بـەرگیری‌و جڵـەوگیری دەکـا لـە گفتـارو کـرداری خـراپ‌و ناپەسـەند، وە لـە ستـەمگەریی‌و دەسـتدرێژیی، خـودا ئامۆژگاریتـان دەکـا بـە هیوای ئەوە بیر بکەنەوە لە پاشە ڕۆژی خۆتان.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ } (٤٩/٩).

خـودای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: دادپـەروەربن، چـونکە بەراستی خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێ.

٢٤٣١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَلاَ كُلُّكُـمْ رَاعٍ وَ كُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالإِمَامُ الَّذِى عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهْوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى أَهْلِ بَيْتِ زَوْجِهَا وَوَلَدِهِ وَهْىَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَعَبْدُ الرَّجُلِ رَاعٍ عَلَى مَـالِ سَيِّدِهِ وَهْـوَ مَـسْئُولٌ عَنْـهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

---

[1] بخاری. جمعة: ٨٩٣، ٢٤٠٩، ٢٥٥٤، ٢٥٥٨، ٢٧٥١، ٥١٨٨، ٥٢٠٠، ٧١٣٨.

ئیبنو عومەر (خودایان لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: بزانن! ئیٚوە هەمووتان چاودیٚرو شوانن‌و هەمووتان بەبیٚ جیاوازی بەرپرسیارن لە ژیٚر دەست (رەعییەت)ەکانی خۆتان، پیٚشەوا (کە سەرۆکی هەموو خەڵکەکەیە) چاودیٚرەو شوانە، وە ئەو لەلای خودا بەرپرسیارە لەو هەموو خەڵکەی کە لەژیٚر دەستی دایەو وان لە چاودیٚری ئەوداو، بووە بە شوانیان، پیاو (لەناو ماڵی خۆیا) شوانەو چاودیٚرە، وە ئەو، بەرپرسیارە لە خواردەستەکانی خۆی، ژن (لە ناوماڵی میٚردەکەیا) شوانەو چاودیٚرە،وە ئەو بەرپرسیارە لە خیٚزان‌و منداڵی میٚردەکەی، وە کۆیلە شوانی ماڵی ئاغاکەیەتی‌و بەرپرسیارە لەو ماڵە، ئەدیی! ئیتر هەمووتان هەر شوانن‌و هەموتان بەپیٚی حاڵ بەرپرسیارن لە ژیٚر دەستەی خۆتان. (ش/د/ت/ن- خودایان لیٚ رازی بیٚ).

٢٤٣٢- وَدَخَلَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ زِيادٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَلَى مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ يَعُودَهُ فَقَالَ: أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا مِنْ وَالٍ يَلِي رَعِيَّةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَيَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لَهُمْ، إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ. رَوَاهُ الشيخان. وَفِي رِوَايَةٍ: مَا مِنْ عَبْدٍ اسْتَرْعَاهُ اللَّهُ رَعِيَّةً، فَلَمْ يَحُطْهَا بِالنَّصِيحَةِ، إِلاَّ لَمْ يَجِدْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ[٢].

مەعقیلی کوڕی یەسار نەخۆش بوو، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد (کە فەرمانڕەوای بەصرە بوو) چوو بۆ لای بۆ سەرخۆشی لیٚکردن، مەعقیل پیٚی گوت: گویٚ بگرە فەرموودەیەکی پیٚغەمبەرت بۆ بگیٚڕمەوە کە خۆم لیٚیم بیستووە دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربیٚ): هەر کاربەدەستیٚ ببیٚ بە گەورەی دەستەییٚ لە موسوڵمانان‌و گزی‌و ناپاکییان لیٚ بکاو لەسەر ئەو حاڵە دەوام بکا تا دەمریٚ ئەوە بیٚگومان کە خودا بەهەشتی لیٚ قەدەغە دەکا (ش) لە گیٚڕانەوەیەکا: هەر بەندەییٚ خودا بیکا بەسەر گەورەی کۆمەڵی‌و بە باشی‌و بە دڵسۆزی سەرەوکاریی کاروباریان نەکا، بیٚگومان کە ئەو بەندەیە بۆنی بەهەشت ناکا.

---

[٢] بخاری. احکام: ٧١٥٠، ٧١٥١. مسلم. ٣٦١ - ٣٦٣، ٣٦٤، ٤٧٠٦، ٤٧٠٧.

٢٤٣٣- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّمَا الإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَعَدَلَ، كَانَ لَهُ بِذَلِكَ أَجْرًا، وَإِنْ يَأْمُرْ بِغَيْرِهِ، كَانَ عَلَيْهِ مِنْهُ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێشەوای ئیسلام قەڵایە، موسوڵمانان لە دەوری پوورە دەدەن‌و لێی کۆدەبنەوەو لەگەڵیا جەنگ دەکەن لە دژی دوژمن، لە هەمان کاتا پشت‌و پەناشە بۆیان، جا ئەگەر فەرمانی کرد بە لە خودا ترسی‌و پێشەوایەکی دادپەروەر بوو ئەوە لە جیاتی ئەوە پاداشێکی گەورەی بۆ هەیە، ئەگەر، فەرمانیشی کرد بە شتێکی تر ئەوە شتێکی ترە (ش).

٢٤٣٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ شَيْخٌ زَانٍ وَمَلِكٌ كَذَّابٌ وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ[٤].

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا ئەم سێ کەسە خودا نە قسەیان لەگەڵ دەکاو نە تاریفیان دەکاو نە لە گوناه پاکیان دەکاتەوەو نە بەچاوی میهرەبانی تەماشایان دەکا، سەرەڕای ئەوەیش سزاو ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە:

یەکەم: پیری داوێنپیس.

دووەم: پادشای درۆزن.

سێیەم: هەژاری فیزنی خۆ بەزل زان.

٢٤٣٥- دَخَلَ عَائِذَ بْنَ عَمْرٍو (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ زِيَادٍ فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: إِنَّ شَرَّ الرِّعَاءِ الْحُطَمَةُ فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ

---

[٣] بخاری. مسلم. إمارة: ٤٧٤٩.

[٤] مسلم. إیمان: ٢٩٢.

مِنهُمْ. فَقَالَ لَهُ اجْلِسْ فَإِنَّمَا أَنْتَ مِنْ نُخَالَةِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: وَهَلْ كَانَتْ لَهُمْ نُخَالَةٌ إِنَّمَا كَانَتِ النُّخَالَةُ بَعْدَهُمْ وَفِي غَيْرِهِمْ(٥).

عائیذی كوڕی عەمر (خودای لێ رازی بێ) چوو بۆ لای عوبەیدوڵڵای كوڕی زیاد، پێی گوت: ئەی كوڕی خۆم! بۆ خۆم لە زاری پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): بەدترین شوان شوانی ران پسێنە: خراپترین كاربەدەست كاربەدەستی میللەت رەتێنە، جا ئامان سەد ئامان تۆ لەو شوانە ران پسێنكانە نەبیت! عوبەیدوڵڵایش پێی گوت: دانیشە، تۆش لەسەر كۆزەری یارانی موحەممەدیت (دروودی خودای لەسەربێ) عائیزیش (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەوان هەموو گەنمە قەندەهاری بوون كوا سۆس‌و سەركۆزەریان هەبوو؟ سۆس‌و سەركۆزەر لە دوا ئەوان‌و لە خەڵكی تردا هەبوو (م).

٢٤٣٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم قَالَ فِي بَيْتِي هَذَا: اللَّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَشَقَّ عَلَيْهِمْ فَاشْقُقْ عَلَيْهِ وَمَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ فَارْفُقْ بِهِ. روى الثلاثة مسلم (رضوان الله تعالى عليه)(٦).

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەمماڵەی مندا فەرمووی: ئەی خودایە! هەر كەسێ بوو بەسەروەركاری شتێ لە كاروباری گەلی ئیسلامی من‌و خراپ بوو بۆیان‌و سەخڵەتی كردن، تۆیش خراپ بە بۆ ئەوو سەخڵەتی بكە، وە هەر كەسێ بوو بە سەرەوكاری شتێ لە كاروباری گەلی ئیسلامی من‌و باش بوو بۆیان‌و دڵی پێیان سووتا، تۆیش باش بە بۆی‌و دڵت پێی بسووتێ (م).

٢٤٣٧- قَالَ عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ لِمُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُما) إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مَا مِنْ إِمَامٍ يُغْلِقُ بَابَهُ دُونَ ذَوِي الْحَاجَةِ وَالْخَلَّةِ وَالْمَسْكَنَةِ

---

(٥) مسلم. إمارة: ٤٧١٠.

(٦) مسلم. إمارة: ٤٦٩٩.

إِلاَّ أَغْلَقَ اللَّهُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ دُونَ خَلَّتِهِ وَحَاجَتِهِ وَمَسْكَنَتِهِ. فَجَعَلَ مُعَاوِيَةُ رَجُلاً عَلَى حَوَائِجِ النَّاسِ.رواه الترمذي وأبو داود[٧].

**عەمری كوڕی موڕە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی بە موعاوییە (خودای لێ ڕازی بێ): لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: هەر پێشەوایێ دەرگای خۆی دابخا لە هەژاران‌و داماوان‌و لەوانەی كە ئیش‌و كاریان پێی هەیە، بێگومان كە خودایش دەرگاكانی ئاسمان دادەخا لە ئاستی هەژاریی‌و ئیش‌و كاری ئەو. ئیتر موعاوییە پیاوێكی دانا بۆ جێبەجێ كردنی ئیش‌و كاری خەڵك. (ت-سند غریب-د).**

٢٤٣٨- ولأحمد وأبي داود والحاكم: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ صَاحِبُ مَكْسٍ[٨].

**ئیمامان ئەحمەدو ئەبو داوود بە سەنەدێكی صەحیح‌و حاكم، (خودایان لێ ڕازی بێ) دەگێڕنەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: باجگرو باجخۆر ناچنە بەهەشت.**

٢٤٣٩- (ب- ١ز- ١١٤ل- ٣٤٤ف- ٧)[٩].

٢٤٤٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قَالَ: إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللَّهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا. رَوَاهُ مسلم والنسائي[١٠].

**عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت دادپەروەران لە خزمەتی خودادان، وان لەسەر مەشخەڵی نور، وان لە دەستە ڕاستی خودای میهرەبانەوە، هەردوو دەستی خودایش هەر دەستە ڕاستە چونكە مەبەست ئەوەیە كە نازو**

---

[٧] رَوَاهُ الترمذى بسند غريب (شرحه).

[٨] رواه أبو داود بسند صحيح (شرحه).

[٩] تقدم برقم: ٦٨٩/٧ تسلسل/ ١١٤ مجلد أول.

[١٠] مسلم. إمارة: ٤٦٩٨. نسائي. آداب القضاء: ٥٣٩٤.

نیعمـەت‌و بـەهرەی خـودا رژاوە بەسـەریانا و بـوون بـە ژێرنـازو رەحمـەتی خوداوەو، ئەوەندە نازیان لێ گیراوەو ئەوەندە پایەو پلەی بەرزیان پێ خەڵات کـراوە ئـەگینا مەبەسـت ئـەوە نیـە کـە خـودا وەك ئێمـە دوو دەسـتی هەیـە، یـەکێکیان راسـت‌و یـەکێکیان چەپ دادپـەروەران ئەو کەسانەن کە بە هەق‌و عەداڵەت حوکم دەکەن‌و بڕیاری راست دەدەن‌و لەناو خاوو خێزان‌و کەس‌و کاری خۆیاندا دادپەروەرن‌و لەگەڵ ژێر دەستەی خۆیاندا بەدادن (م/ن).

٢٤٤١- وللترمذي: إِنَّ أَحَبَّ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَامٌ عَادِلٌ وَأَبْغَضَ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ وَأَبْعَدَهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَامٌ جَائِرٌ. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى آمين[١١].

حـــەزرەت (دروودی خـــودای لەســـەربێ) دەفـــەرموێ: لــــە رۆژی قیامـــەتا خۆشەویستترین کەس لەلای خوا کە لە هەموو کەسێ جێگەی لە خوداوە نزیکتر بێ پێشەوای دادپەروەرە، وە کەسێ کە خودا لە هەموو کەسێ زیاتر رقی لێی بێ‌و جێگەی لە هەموو کەسێ دوورتر بێ لە رەحمەتی خوداوە پێشەوای ستەمگرو زۆردارە! (ت-س/ح).

## ١٠٧) فەرمانڕەوا وەزیرو شالیارو کاربەدەستی باشی لێهاتوو هەڵدەبژێرێ‌و بەشی خۆیان مووچەو بەراتیان بۆ دەبڕێتەوە
## ينتقى الأمير الوزراء والولاة ولهم كفايتهم

قَالَ اللهُ تَعَالَى: حِكَايَةً عَنِ مُوسَى عَلَيْهِ وَعَلَى الأَنْبِيَاءِ الصَّلاة وَالسَّلام: {وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي هَارُون أَصى اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي، وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي، كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا، وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا، إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا} (٢٠/٢٩-٣٥).

خـودای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا فەرمایـشتەکەی مووسـامان بـۆ دەگێڕێتەوە، (دروودی خودا لەسەر مووساو هەموو پێغەمبەرەکانی تریش بێ) دەفەرموێ: مووسا

---

[١١] رَوَاهُ الترمذی بسند حسن (شرحه).

فەرمووی: خودایە! سینەم گوشادبکەو دڵم ڕۆشن‌و نوورانی بکەو کارم بۆ ئاسان بکەو ئەم گیروگرفتە کە لە زمانما هەیە لای ببە هەتا باش لەقسەم تێ بگەن، وە لە خانەوادەی خۆیشم یارمەتیدەرێ‌و راوێژکەرێکم بۆ دروست بکە، کە یارمەتیم بدا، ئەوەیش هاروونی برام بێ، تا بە تەوفیقی تۆ پشتم بگرێ‌و بیکە بە هاوبەش‌و هاوڕێم لە کاروباری پێغەمبەرایەتی‌و پەیام نێریدا، هەتا زۆر تەسبیحاتت بکەین‌و یا دوو زیکری تۆ بکەین بە زۆری، وە تۆ خۆت بینای بەحاڵمان.

٢٤٤٢– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِالأَمِيرِ خَيْرًا جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ صِدْقٍ إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهِ غَيْرَ ذَلِكَ جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ سُوءٍ إِنْ نَسِيَ لَمْ يُذَكِّرْهُ وَإِنْ ذَكَرَ لَمْ يُعِنْهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ خوداوەندی گەورە خواستی خێری بە فەرمانڕەوایێ هەبوو ئەوا وەزیرێکی باشی راستاڵی بۆ دادەنێ ئەگەر خۆی لە یادی نەبوو ئەو یادی دەخاتەوە، ئەگەر خۆشی لە یادی بوو ئەویش یارمەتی دەدا، بەڵام کاتێ خواستی خێری پێی نەبوو ئەوا وەزیرێکی خراپی بۆ دادەنێ، ئەگەر خۆی لە یادی نەبوو ئەویش نایخاتەوە یادی، ئەگەر خۆیشی لەیادی بوو ئەو یارمەتی نادا (د–سند صالح–ن).

٢٤٤٣– عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ضَرَبَ عَلَى مَنْكِبِهِ ثُمَّ قَالَ لَهُ: أَفْلَحْتَ يَا قُدَيْمُ إِنْ مُتَّ وَلَمْ تَكُنْ أَمِيرًا وَلاَ كَاتِبًا وَلاَ عَرِيفًا. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنَّ الْعِرَافَةَ حَقٌّ وَلاَ بُدَّ لِلنَّاسِ مِنَ الْعُرَفَاءِ وَلَكِنَّ الْعُرَفَاءَ فِي النَّارِ[2].

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

**میقدامی كوڕی مەهدیكەریب** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دای بەسەر شانماو فەرمووی: ئەی میقدام! ئەگەر لە ژیانتا نەبوویت بە فەرمانڕەواو نەبوویت بە میرزاو نەبوویت بە سەركار (عەریف) ئەوە كە مردیت بە راستی سەرفەرازیت! لە گێڕانەوەیەكا: سەركاریی كارێكی رەوایەو مەردووم ناچارن بەبێ سەركار هەڵناكەن بەڵام سەركاران لە ئاگردان (د-سند صالح).**

**٢٤٤٤- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ وَابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُم) السِّجِلُّ كَاتِبٌ كَانَ لِلنَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)**. روى الثلاثة أَبُو دَاوُدَ[٣].**

**ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتیان: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **میرزا (نووسەر = كاتب)ێكی هەبوو ناوی سیجیلل بوو (د-سند صالح).**

**٢٤٤٥- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ** (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُما) **عَنْ أَبِيهِ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **أَبِي وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: لَهُمَا يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا. رَوَاهُ الشيخان (عليهما الرحمة والرضوان)[٤].**

**سەعیدی كوڕی ئەبو بوردە** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: باوكم گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **كە باوكم‌و موعاذی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن، پێیانی فەرموو: كار ئاسان بكەن‌و مزگێنی بدەن بە خەڵك‌و خەڵك مەتەكێننەوە، وە لەناو خۆشتانا یەك بن‌و بێ گوێیی یەكتری مەكەن (ش).**

**٢٤٤٦- عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: مَنْ كَانَ لَنَا عَامِلاً فَلْيَكْتَسِبْ زَوْجَةً فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ خَادِمٌ فَلْيَكْتَسِبْ خَادِمًا فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَسْكَنٌ فَلْيَكْتَسِبْ مَسْكَنًا. قَالَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ أُخْبِرْتُ أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: مَنِ اتَّخَذَ غَيْرَ ذَلِكَ فَهُوَ غَالٌّ أَوْ سَارِقٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٥].**

---

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٤] بخاري. مغازي:.. مسلم. جهاد: ٤٥٠١.

[٥] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

موستەوریدی کوڕی شەدداد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بوو بەسەر کاری ئێمە با ژنێ بهێنێ و ئەگەر نۆکەری نەبوو با نۆکەرێ رابگرێ و ئەگەر خانووی نەبوو با خانوویێ بۆ خۆی پەیدا بکا ئەبو بەکر گوتی: بۆم باس کراوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەر کەسێ لەوە زیاتر هەڵبگرێ ئەوە گزیکارە یاخود فەرمووی ئەوە دزە! (د–سند صالح).

٢٤٤٧– عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ رِزْقًا فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ غُلُولٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم[٦].

بورەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی بیکەین بە سەرکاری کارێك و مووچەیەکمان بۆ بڕییەوە ئیتر هەر هەقی ئەو مووچەیەی هەیە، وە هەرچی تر ببا بۆ خۆی ئەوە گزیو دەست پیسی و ناپاکییە (د/حاکم).

٢٤٤٨– ➡ (ب–٢ ز–١٤٥ ف–٦)[٧].

## ١٠٨) دڵسۆزی بۆ فەرمانڕەوا: (الإخلاص للأمير)

٢٤٤٩– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ وَلاَ اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ، إِلاَّ كَانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ، بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، فَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ تَعَالَى. رَوَاهُ البخاري والنسائي[١].

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا هەر پێغەمبەرێکی رەوانە کردبێ وە هەر کەسێکی

---

[٦] سكت عنه الشارح.

[٧] تقدم برقم/ ١٧٦١/٦ تسلسل/ ١٤٥ مجلد ثاني.

[١] بخاري. أحكام: ٧١٩٨.

كردبێ بە جێنشین دوو تاقمە دەست‌و پێوەندی هەبووە: تاقمەیەكیان ڕێگەی چاكەی نیشان دەداو هانی دەدا لەسەر گرتنی ڕێگەی چاكە، وە تاقمەكەی تریان ڕێگەی خراپەی نیشان دەداو گاڵی دەدا لەسەر گرتنی ڕێگەی خراپە. پاك‌و پاكیزەیش تەنیا ئەو كەسەیە كە خودای گەورە بیپارێزێ‌و بە میهرەبانی خۆی لە خراپە دووری بگرێ (ب/ن).

٢٤٥٠- (ب- ١ز- ٢ل- ٢٣ف- ٩)[٢].

٢٤٥١- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنْ شَرَّ النَّاسِ ذُو الْوَجْهَيْنِ، الَّذِی يَأْتِی هَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ. رَوَاهُ الأربعة[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەدترینی ئەم خەڵكە پیاوی دوو رووە، كە لەلای ئەو قسەیێ دەكاو لەلای ئەو قسەیەكی تر دەكا (ش/د/ت- خودایان لێ ڕازی بێ).

٢٤٥٢- عَنْ أَبِی بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مَنْ أَهَانَ سُلْطَانَ اللّٰهِ فِی الأَرْضِ أَهَانَهُ اللّٰهُ. رَوَاهُ الترمذي في الفتن[٤].

ئەبو بەكرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو كەسەی كە خاوەن دەسەڵات (سوڵتان) ریسوا بكا، كە خودا لەسەر روی زەوی كردوویەتی بە خاوەن دەسەڵات، ئەوا خودایش ئەو سووك‌و ریسوا دەكا (ت-س/ح).

٢٤٥٣- عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَقَدْ وَضَعَ رِجْلَهُ فِی الْغَرْزِ: أَیُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ[٥].

---

[٢] تقدم برقم: ١١/٩ تسلسل/ ٢ مجلد اول.

[٣] بخاری. مناقب: ٣٤٩٣، ٣٤٩٦، ٣٥٨٨، ٣٤٩٤، ٦٠٥٨، ٧١٧٩. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٠٢، ٦٥٧٥.

[٤] رَوَاهُ الترمذی فی الفتن بسند حسن (شرحه).

[٥] بسند حسن .ش

**طاریقی كوڕی شیهاب** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **پێی نابووە ناو ئاوزەنگی لەو كاتەدا پیاوێ پرسیاری لێ كرد: چ خەبات‌و غەزایێ لە هەموان گەورەترە؟ فەرمووی: قسەی ڕەوا لە ڕووی گەورەی زۆردار! (ن/ت-س/ح).**

**٢٤٥٤- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **وَنَحْنُ تِسْعَةٌ فَقَالَ: أَنَّهُ سَتَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ مَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَيْسَ بِوَارِدٍ عَلَيَّ الْحَوْضَ وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ وَهُوَ وَارِدٌ عَلَيَّ الْحَوْضَ. رواهما النسائي والترمذي والله أعلى وَأعلم**[٦].

**كەعبی كوڕی عوجرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: نۆ كەس بووین پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لە ژوورەوە بوو، هاتە دەرەوە بۆ لامان فەرمووی: لەپاش من گەلێ فەرمانڕەوا پەیدا دەبن ئەوەی بڕوا بە فیشاڵ‌و درۆو دەلەسەیان بكاو پشتی زۆرو ستەمیان بگرێ ئەوە نە ئەو لە گەلی منەو نە من لە پشتی ئەوم، وە ڕێگەیشی نادرێ كە بێ بۆ لام بۆ سەر حەوزی كەوسەر، بەڵام ئەوەی باوەڕ بە فیشاڵ‌و درۆو دەلەسەیان نەكاو پشتی زۆرو ستەمیان نەگرێ، ئەوە ئەو لەمنەو منیش لەوم! وە لەسەر كارێزی كەوسەریش بە خۆشی‌و بە سەربەرزی دێ بۆ كنم! (ن/ت-س/ح).**

## ١٠٩) بەرتیل‌و دیاری بۆ كاربەدەست ناڕەوایە:
## تحرم الرشوة والهدية على الحاكم

**٢٤٥٥- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **رَجُلاً مِنَ الأَسْدِ يُقَالُ لَهُ ابْنُ اللُّتْبِيَّةِ عَلَى الصَّدَقَةِ فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: هَذَا لَكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **عَلَى الْمِنْبَرِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: مَا بَالُ**

---

[٦] بسند حسن (شرحه).

عَامِلٍ أَبْعَثُهُ فَيَقُولُ هَذَا لَكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي. أَفَلاَ قَعَدَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ أَوْ فِي بَيْتِ أُمِّهِ حَتَّى يَنْظُرَ أَيُهْدَى إِلَيْهِ أَمْ لاَ وَالَّذِي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَنَالُ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْهَا شَيْئًا إِلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى عُنُقِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ أَوْ بَقَرَةٌ لَهَا خُوَارٌ أَوْ شَاةٌ تَيْعِرُ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْنَا عُفْرَتَيْ إِبْطَيْهِ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ، مَرَّتَيْنِ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

ئەبو حومەید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی ئەسەدیی کرد بە سەرکاری سەر زەکات، ناوی ئیبنو للوتبییە بوو، کابرا کە هاتەوە گوتی: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بە دیاری بۆم هاتووە! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەرکەوتە سەر دوانگەو ڕاوەستاو ستایش‌و سوپاسی خودای کردو فەرمووی: ئەمە چی پێ دەڵێن! هەندێ سەرکار کە دەینێرم بۆ شوێنێ کە دێتەوە دەڵێ: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بە دیاری بۆم هاتووە، جا ئەگەر وایە ئەدیی بۆچی لە ماڵی بابی یا لە ماڵی دایکی دانانیشێت هەتا بزانێ کە دیاریی بۆ دێ یانا؟ بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بە دەستە ئەوەی لە ئێوە ناخونەك لەم ماڵە بداو چەپوکووپی لێ بکا ئەوە لە ڕۆژی دوایدا ئەو ناخونەکە دەنێ بە نەڕەی شانییەوەو دەیهێنێ بۆ دیوانی خودا، جا هەیە کە وشترێکی دزیوە دەیدا بە قەڵاندۆشکانیا، وشترەکە بە سەرشانیەوە دەبۆڕێنێ! وە هەیە ڕەشە وڵاخی دزیوە، ڕەشە وڵاخەکە دەقۆڕێنی، وە هەیە مەڕ یا بزنی دزیوە، جا مەڕەکە یا بزنەکە بە کۆڵییەوە دەباڕێنێ‌و بە تەواوی دەیکەن بە پەند!! ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەردوو دەستی بەرزکردەوە بە ڕادەیێ بۆرایی (خاڵ)ی هەردوو بنباڵی وە دەرکەوت وە دوو جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەی خودایە! ئەوا تۆ ئاگاداری، تۆ شایەت بە ئەوا من پێم ڕاگەیاندن (ش/د).

٢٤٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ذَاتَ يَوْمٍ فَذَكَرَ الْغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ ثُمَّ قَالَ: لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

---

[1] بخاري. جمعة: ٩٢٥، ١١٥٠، ٢٥٩٧، ٦٦٣٦، ٦٩٧٩، ٧١٧٤، ٧١٩٧. مسلم. إمارة: ٤٧١٥. أبو داوُد. خراج: ٢٩٤٦.

عَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَها حَمْحَمَةٌ (أي صوت وصهيل) فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ نَفْسٌ لَهَا صِيَاحٌ فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ فَكَتَمَنَا مِخْيَطًا فَمَا فَوْقَهُ كَانَ غُلُولاً يَأْتِي بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواهما مسلم وأبو داود[٢].

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **هەڵسایەوە دوانێکی بۆ داین، باسی ناخونەك‌و دەستپیسی لە ماڵی تالآنی کرد، وە ئەوەی بە تاوانێکی گەلێ زل دانا، وە فەرمووی:** (دروودی خودای لەسەربێ): **نامەوێ کە لە ڕۆژی قیامەتا بگەم بە یەکێکتان، وشترێ (بە بۆڕەبۆڕ) بە قەلآندۆشکانیەوە بێ، بێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام کەوە گرفتاری ئەم وشترە دزێتییە بووم، ڕزگارم کە لە دەستی منیش پێی دەڵێم: من دەستەڵاتی هیچم نیە کە بیکەم بۆت من لەکاتی خۆیدا پێم ڕاگەیاندوویت، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتا بگەم بە یەکێکتان ئەسپی (بە لووشکە لووشك) بە قەلآندۆشکانیەوە بێت، بێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام کەوە منیش دەڵێم: من دەسەڵاتی هیچم نیە کە بۆتی بکەم، من لەکاتی خۆیا پێم ڕاگەیاندووی، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتا بگەم بە یەکێکتان مەڕێ، یا بزنێ (بە باڕە باڕ) بەسەر نەڕەی شانیەوە بێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام کەوە، منیش دەڵێم: من دەسەڵاتی هیچم نیە کە بۆتی بکەم، من لەکاتی خۆیا پێم ڕاگەیاندوویت، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتا بگەم بە یەکێکتان کەسێ (بەهاتو**

---

[٢] بخاري. جهاد: ٣٠٧٣، ١٤٠٢، ٣٢٧٨، ٩٦٥٨. مسلم. إمارة: ٤٧١١.

هاوارو قیڕەقیڕ) بە قەڵاندۆشكانیەوە بێ بڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! فریام كەوە منیش پێی دەڵێم: من دەسەڵاتی هیچم نیە كە بیكەم بۆت، من لەكاتی خۆیدا پێم ڕاگەیاندووە، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتا بگەم بە یەكێكتان كاڵاو جل‌و بەرگ (بەخشەخش) بە قەڵاندۆشكانیەوە بێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام كەوە، منیش پێی دەڵێم: من دەسەڵاتی هیچم نیە كە بیكەم بۆتۆ، من لەكاتی خۆیدا پێم ڕاگەیاندووە، نامەوێ لە ڕۆژی قیامەتا بگەم بە یەكێكتان مردەماڵ‌و زێڕو زیو بە قەڵاندۆشكانیەوە بێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام كەوە منیش پێی دەڵێم: من دەسەڵاتی هیچم نیە كە بیكەم بۆتۆ، من لەدنیادا پێتم ڕاگەیاندووە لە گێڕانەوەیەكا: ئەی خەڵكینە! هەر كەسێكتان كران بە سەركاری ئێمە لەسەركارێ، وە بەقەد دەرزیەك یا زیاتر لەوكارەی لەئیمە شاردەوەو بەدزییەوە حەشاری دا بۆ خۆی ئەوە دادەنرێ بە دەست پیسی (غولل)وە لە ڕۆژی قیامەتا دەینێ بەسەر شانیەوەو دەیهێنێ بۆ مەیدان، بۆ پای هەق‌و حیساب، وە باش باش تەریق‌و ریسوا دەبێ، وەك خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: { وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (٣/١٦١). واتە: وە هەركەسێ دەست پیسی لە ماڵی تالانی بكاو لێی ببا بۆ خۆی لە ڕۆژی قیامەتا دەینێ بەسەر شانیەوەو دەیهێنێ بۆ مەیدانی حسیب‌و شەرمەزار دەبێ (م/د).

٢٤٥٧- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) إِلَى الْيَمَنِ فَلَمَّا سِرْتُ أَرْسَلَ فِي أَثَرِي فَرُدِدْتُ فَقَالَ: أَتَدْرِي لِمَ بَعَثْتُ إِلَيْكَ؟ لاَ تُصِيبَنَّ شَيْئًا بِغَيْرِ إِذْنِي فَإِنَّهُ غُلُولٌ وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِهَذَا دَعَوْتُكَ فَامْضِ لِعَمَلِكَ. رَوَاهُ الترمذي[٣].

موعاذی كوڕی جەبەل (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) منی كرد بە دەسەڵاتدارو ناردمی بۆ سەر یەمەن، كە كەوتمە ڕێ ناردی بە شوێنما، كە گەڕامەوە بۆ لای فەرمووی: دەزانی بۆچی ناردم بە

---

[٣] بسند حسن (شرحه).

شوێنتا؟ هەرچی بەبێ فەرمانی من ببەیت بۆ خۆت ئەوە دادەنرێ بە گزی‌و دەستپیسی ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: {مَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (١٦١/٣). ئینجا فەرمووی: بۆ ئەمە بانگم کردیتەوە ئیتر بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە (ت-ش/ح).

٢٤٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي فِي الْحُكْمِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد والترمذي بسندٍ صحيحٍ. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى. والله أعلى وأعلم[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) نەفرینی کردووە لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆر نەخوازەڵا لە دادگاو دادوەریدا (د/ئەحمەد/ت-س/ص).

وَفِي رِوَايَةٍ لأحمد عَلى ما هو في الشرح: لَعَنَ اللّٰهُ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ وَالرَّائِشَ الَّذِى يَمْشِي بَيْنَهُمَا:

لە گێڕانەوەیەکی ئیمامی ئەحمەددا (رەزای خودای لێبێ) حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: نەفرینی خودا لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆرو لە ناوەندیاریان کە دێ‌و دەچێ لە ناوەندیاناو دەکەوێتە ناوەندیان بۆ رێکخستنیان!

## ١١٠) فەرمانڕەوا هەقی هەیە کە کەسێکی بڕوا پێکراو بکا بە جێگری خۆی: للأمير إستخلاف الثقة

٢٤٥٩- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) امْرَأَةٌ فَكَلَّمَتْهُ فِي شَيْءٍ فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ وَلَمْ أَجِدْكَ، كَأَنَّهَا تُرِيدُ الْمَوْتَ، قَالَ: إِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ. رَوَاهُ الشيخان[١].

---

[٤] بسند صحيح.

[١] بخاری. أحكام: ٧٢٢٠. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٢٩.

جوبەیری کوڕی موطعیم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ژنێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) داوای شتێکی لێکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەیبوو، فەرمووی پێی: جارێکی تر وەرەوە. ژنەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر هاتمەوەو تۆم دەست نەکەوت بچم بۆ لای کێ؟ ژنەکە لەم پرسیارە مەبەستی ئەوە بوو ئەگەر هاتەوەو پێغەمبەر مردبوو بچێ بۆ لای کێ، فەرمووی: ئەگەر منت دەست نەکەوت بچۆ بۆ لای ئەبو بەکر (ش).

٢٤٦٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: قِيلَ لِعُمَرَ أَلاَ تَسْتَخْلِفُ؟ قَالَ: إِنْ أَسْتَخْلِفْ فَقَدِ اسْتَخْلَفَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي أَبُو بَكْرٍ، وَإِنْ أَتْرُكْ فَقَدْ تَرَكَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَثْنَوْا عَلَيْهِ فَقَالَ رَاغِبٌ رَاهِبٌ، وَدِدْتُ أَنِّي نَجَوْتُ مِنْهَا كَفَافًا لاَ لِي وَلاَ عَلَيَّ لاَ أَتَحَمَّلُهَا حَيًّا وَمَيِّتًا. رَوَاهُ الأربعة[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عومەر (ڕەزای خودای لێبێ) کاتێ پێکرا، پێیان گوت: جێنشینێ بۆ خۆت دانێ، گوتی: خۆ ئەگەر جێنشین بۆ خۆم دانێم جێگەی خۆیەتی، چونکە ئەبو بەکر، کە لەمن باشتربوو جێنشینی دانا بۆ خۆی، ئەگەر دایشی نەنێم هەر جێگەی خۆیەتی چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە گەلێ گەلێ لەمن باشتر بوو جێنشینی دانەنا بۆ خۆی. یارانیش ئافەرینیان کرد، ئەویش گوتی: ئومێدەوارم‌و ئومێدی هەرە گەورەم بە بەخششی خودایە، چونکە وەك مەلێکی بێ پەڕو باڵ‌و لانەو وەك ڕێبوارێکی بێ توێشەو جێگەو یانە، بەرەو ئاستانەی ئەو پەروەردگاری دادپەروەری دادوەری مەزنی میهرەبانە سەر دەنێمەوە، سا بەشکوو لە سێبەری میهرەبانی خۆیدا پەنام بدا وە مەترسیشم هەیە کە خوانەخواستە لە دادگای شاهانەی ئەو شاهنشا بێباکەدا روو زەردیم بەسەر بێ! خۆزگەم سەرو بەر قوتارم دەبوو لە دەست جیهان:، بەم ڕەنگە نەسوودی دەبوو بۆم‌و نە زیان!

---

[٢] بخاری. أحكام: ٧٢١٨ (٧٢١٧). مسلم. إمارة: ٤٦٩٠.

مەسەلەی فەرمانڕەواییش (هەم لە حاڵی ژیانمداو هەم لە حاڵی مردنمدا) ناگرمە ئەستۆی خۆم ئۆباڵی میللەت بە ملی خۆیان، خۆیان جێگە نشین هەڵبژێرن بۆ خۆیان (ش/د/ت- خودایان لێ رازی بێ).

٢٤٦١- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَصَمَنِي اللهُ بِشَيْءٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَمَّا هلَكَ كِسْرَى قَالَ: من اسْتَخْلَفُوا؟؟ قالُوا: ابْنَتَهُ. قَالَ: لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً. رَوَاهُ النسائي والبخاري والترمذي. نَسْأَلُ اللهَ التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وَأعلم[٣].

ئەبو بەكر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەكاتی رووداوی ئەلجەمەل (وقعەتلجەمەل)دا دوو دڵ بووم، دەمویست لەژێر ئاڵای عائیشەدا لە دژی عەلی جەنگ بكەم بەڵام خودا بەم وشەیە كە لە پێغەمبەرم بیستبوو پاراستمی، كە كیسرا كوژرا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كێیان داناوە لە شوێنی؟ گوتیان: كچەكەی خۆی. فەرمووی: گەلێ كە سەرگەورەیی خۆیان، بسپێرن بەژنێ قەت سەر ناكەون! (د/ب/ت).

## ١١١) بەشی چوارەم: باسی دادوەری (القضاء) خودا لەگەڵ دادوەر (قازی)ی دادپەروەردایە : (الفصل الرابع: في القضاء. الله مَعَ القاضِي العَادِلِ)

٢٤٦٢- (ب- ١ز- ١٥ل- ٨٦ف ٦)[١].

٢٤٦٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اللّٰهَ مَعَ الْقَاضِي مَا لَمْ يَجُرْ فَإِذَا جَارَ تَخَلَّى اللهُ عَنْهُ وَلَزِمَهُ الشَّيْطَانُ. رَوَاهُ الترمذي[٢].

عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا لەگەڵ دادوەردایە، هەتا دوور بێ لە ناڕەوایی،

---

[٣] بخاری. فضائل: ٤٤٢٥، ٧٠٩٩.

[١] تقدم برقم: ١١٥/٦ تسلسل/ ١٥ مجلد أول

[٢] بسند حسن (شرحه).

بەڵام کە دەستی کرد بە ناڕەواییکردن ئیتر خودا دەست بەردار دەبێ لێی‌و شەیتان دەیگرێتە خۆی (ت-س/ح).

٢٤٦٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنِ ابْتَغَى الْقَضَاءَ وَسَأَلَ فِيهِ شُفَعَاءَ وُكِلَ إِلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أُكْرِهَ عَلَيْهِ أَنْزَلَ اللَّهُ مَلَكًا يُسَدِّدُهُ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٣].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی خۆی هەڵپە بکا بۆ دادوەریی (قازێتی)و بەتکای تکاکار بیپچڕێ ئەوە تەنیا باڵ لێی دەمێنێتەوەو خودای گەورە هیچ یاریدەی نادا، بەڵام ئەوەی کە بە خۆشی خۆی نەیکا، بەڵکوو ناچاری بکەن کە ببێ بە قازی ئەوە خودای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەرەخسێنێ دەبێ بە ڕابەری‌و ڕاستیی نیشان دەدا (ت-س/ح-د).

٢٤٦٥- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ طَلَبَ قَضَاءَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى يَنَالَهُ ثُمَّ غَلَبَ عَدْلُهُ جَوْرَهُ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَمَنْ غَلَبَ جَوْرُهُ عَدْلَهُ فَلَهُ النَّارُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسندٍ صالحٍ. نَسْأَلُ اللهَ التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وأعلم[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ هەوڵ بدا کە ببێ بە قازی لەسەر موسوڵمانان، وە تێکۆشانەکەی سەربگرێ‌و ببێ بە قازی ئەوە ئەگەر عەداڵەت‌و دادپەروەریی زیاتر بوو لە زوڵم‌و زۆری ئەوە ئەو کەسەیە بەهەشتییە ئەگینا ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو ئەوە دۆزەخییە (د-سند صالح) لە خودای مەزن داوا دەکەین کە لەژێر پەردەی خۆیا پەنامان بداو نەنگ‌و عەیب‌و شورەییمان هەڵنەماڵێ‌و

[٣] رَوَاهُ الترمذى بسند حسن ٠ش

[٤] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح.

خۆی چی پێ خۆشە ئەوەمان بە نسیب بکا، ئامین خودایە! خودای گەورە هەر خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ.

## ١١٢) کۆکردن لە دادوەریی: (التورع عن القضاء)

٢٤٦٦- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْقُضَاةُ ثَلاثَةٌ وَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ وَاثْنَانِ فِي النَّارِ فَأَمَّا الَّذِي فِي الْجَنَّةِ فَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ، وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَجَارَ فِي الْحُكْمِ فَهُوَ فِي النَّارِ وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ[1].

ئیبنو بورەیدە لە باوکیەوە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: دادوەرە (قازییە)کان سێ دەستەن: دەستەیەکیان لە بەهەشتان و دوو دەستەیان لە دۆزەخدان، دەستەی بەهەشت ئەو پیاوانەن کە هەم هەق دەناسن و هەم رەفتاری پێ دەکەن، دەستەی یەکەمی دۆزەخیش ئەو پیاوەیە کە هەق دەناسێ وەلێ رەفتاری پێ ناکا و لەبڕیارو حوکم داندا ناڕەوایی و ناهەقی دەکا، ئەوە لە ئاگردایە، دەستەی دووەمی دۆزەخیش ئەو پیاوەیە کە بە نەزانی و بە نەفامی دادوەریی (قەزاوەت: قازێتی) دەکا لەناو خەڵکا (د/ت).

## ١١٣) دەستووروو یاسای دادوەریی : ((آداب القضاء)

٢٤٦٧- عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ أَبِي وَأَنَا بِسِجِسْتَانَ بِأَنْ لاَ تَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ. رَوَاهُ الخمسة[1].

---

[1] قالَ فيه أبُو داوُد: هذه أصح شيئ فى حديث إبن بريد (شرحه).

[1] بخارى. أحكام: ٧١٥٨. مسلم. أقضية: ٤٤٦٥، ٤٤٦٦. أبُو داوُد. أقضية: ٣٥٨٩. ترمذى. أحكام: ١٣٣٤. نسائى. آداب القضاء: ٥٤٢١، ٥٤٣٦.

ئەوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ کە لە سیجیستان (دادوەر: قازی) بووم باوکم نامەیەکی بۆ نووسیم، نوسیبووی: لەکاتی تووڕەییدا مەحکەمەی کەس مەکە، چونکە من بۆ ئەوە لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): دادپرس لەکاتی تووڕەییدا مەحکەمەی کەس نەکا (ش/د/ت/ن).

٢٤٦٨- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْيَمَنِ قَاضِيًا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُرْسِلُنِي وَأَنَا حَدِيثُ السِّنِّ وَلاَ عِلْمَ لِي بِالْقَضَاءِ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ سَيَهْدِي قَلْبَكَ وَيُثَبِّتُ لِسَانَكَ فَإِذَا جَلَسَ بَيْنَ يَدَيْكَ الْخَصْمَانِ فَلاَ تَقْضِيَنَّ حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ الآخَرِ كَمَا سَمِعْتَ مِنَ الأَوَّلِ فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يَتَبَيَّنَ لَكَ الْقَضَاءُ. قَالَ فَمَا زِلْتُ قَاضِيًا أَوْ مَا شَكَكْتُ فِي قَضَاءٍ بَعْدُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي بسندٍ حسنٍ[٢].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ناردمی بۆ یەمەن‌و کردمی بە قازییان، منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ من دەنێری، تۆ خۆت دەزانی کەمن لاوێکی بە تەمەن منداڵم‌و شارەزاییم لە دادوەریی دا نیە، فەرمووی: خودا دڵت شارەزا دەکا‌و زمانت ڕادەهێنێ[١] کاتێ کە هاوداواکان لە بەردەمتا دادەنیشن حوکم مەدەو خودسەر بڕیار مەدە تا لە دوەمیش وەکی یەکەم گوێ دەگری‌و لە قسەی هەردولا وەکی یەك حاڵی دەبێ، چونکە ئاوا باشتر ڕاستی‌و دروستی ڕووداوەکەت بۆ ڕوون دەبێتەوە.

---

[٢] ذكر السند فى نهاية الحديث نصاً.

[١] شێخی سەعدی دەفەرموی:

بزرگی بەعل استو نە بە ساڵ
دەوڵەمەندی بەدڵ استو نە بەماڵ

واتە: گەورەیی بەژیرییە بەساڵ نیە
دەوڵەمەندی بە دڵە بەماڵ نیە

-وەرگێڕ-

عەلی (خودای لێ رازی بێ) دەیگوت: ئیتر لەوساوە بووم بە دادوەر (بە قازی) تا ئێستا، یا گوتی: ئیتر لەوساوە لە دادوەریدا گومانم بۆ پەیدا نەبووە (د/ت-س/ح).

٢٤٦٩- قَالَ الشَّارِح (طَيَّبَ اللهُ ثراه): قَالَ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ): إِذَا أَتَاكَ أَحَدُ الْخَصْمَيْنِ وَقَدْ فُقِئَتْ عَيْنُهُ فَلاَ تَحَكُمْ لَهُ لَعَلَّ الآخَرِ قَدْ فُقِئَتْ عَيْنَاهُ. (رَضِيَ اللهُ عَنْ آلِ بَيتِ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّم)[٣].

شاریح (کە هەر موئەللیف خۆیەتی) پڕ گڵگۆکەی لە بۆن‌و بەرامەی بەهەشتی بەرین بێ دەڵێ: ئیمامی عەلی خودای لێ خۆش بێ دەڵێ: ئەگەر گریمان یەکێ لە دووهاوداوا کە هاتە لات، چاوێکی تەقی بوو خودسەر لە خۆتەوە بەبێ لێکۆڵینەوەو پەیجۆری حوکمی بۆ مەدەو هەقی مەدەرێ، کێ دەڵێ کە ئەوی تریان هەر دووچاوی دەرنەپۆقیوە! ڕەزای خودا لەسەر ئیمام‌و لەسەر گشت خانەوادەی حەزرەت بێ، (دروودی خودای لەسەربێ).

## ١١٤) بەڵگەو نیشانە لەسەر داواكارە داوالێكراویش (ئەگەر نەچووە ژێری) ئەوا سوێندی لەسەرە: (البينة على المدعي واليمين على من أنكر)

٢٤٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لاَدَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ[١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم خەڵکە ئەگەر بە قسەی رووت‌و بە داوای بێ بەڵگە داوای هەرچی بکەن‌و بیان درێتێ ئەوا گەلێ کەس بە ناڕەوا داوای سەروماڵی زۆر کەسی تر دەکەن وە وای لێ دێ دەبێ بە تێکەولێکەو بگرەو بەردەو کەس لە

---

[٣] من كلام الإمام علي (رضى الله عنه).

[١] بخاری. تفسیر: ٤٥٥٢، ٢٥١٤، ٢٦٦٨. مسلم. أقضية: ٤٤٤٥. أبو داود. أقضية: ٣٦١٩. ترمذی. أحكام: ١٣٤٢. نسائی. آداب القضاء: ٥٤٤٠.

سەرو ماڵی خۆی دڵنیا نابێ بەڵام بۆ ئەوەی کە نەبێ بە پاشا گەردانی، بەڵگە لەسەر داواکارە، تەنیا بۆ لابردنی گومان سوێند لەسەر داوالێکراوە! (م/د/ت/ن).

٢٤٧١- وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ وَرَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ الْحَضْرَمِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا قَدْ غَلَبَنِي عَلَى أَرْضٍ كَانَتْ لأَبِي. فَقَالَ الْكِنْدِيُّ هِيَ أَرْضِي فِي يَدِي أَزْرَعُهَا لَيْسَ لَهُ فِيهَا حَقٌّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لِلْحَضْرَمِيِّ: أَلَكَ بَيِّنَةٌ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: (فَلَكَ يَمِينُهُ)، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ فَاجِرٌ لاَ يُبَالِي بِمَا حَلَفَ لَيْسَ يَتَوَرَّعُ مِنْ شَىْءٍ. فَقَالَ: لَيْسَ لَكَ مِنْهُ إِلاَّ ذَلِكَ، فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ لِيَحْلِفَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لَئِنْ حَلَفَ عَلَى مَالِكَ لِيَأْكُلَهُ ظُلْمًا لَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ وَهُوَ عَنْهُ مُعْرِضٌ. رواهما الخمسة إلاّ البخاريّ[٢].

پیاوێکی حەضرەمەوتی‌و پیاوێکی کیندەیی هاتنە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کابرای حەزرەمەوتی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! زەوییەکی باوکم هەبوو ئەمە لێی داگیرکردووم‌و زەوتی کردووە بۆ خۆی، کابرای کیندەییش گوتی: زەوی زەویی خۆمەو وا بەدەستی خۆمەوەو خۆم دایدەچێنم‌و مافی ئەوی پێوە نیە. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) بە حەضرەمەوتییەکەی فەرموو: بەڵگەو نیشانەت هەیە؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دەبۆت هەیە کە سوێندی بدەی. گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە پیاوێکە بەدکارە، دەربەستی سوێند خواردن نایەت لە هیچ کۆناکاتەوە! فەرمووی: دەهەر مافی ئەوەندەت هەیە لەسەری کە سوێندی بدەیت.

جا کابراکە هەڵسا کە سوێند بخوا، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر سوێند بخوات لە سەرماڵی تۆ تا بە ناڕەوا بیخوات لە ڕۆژی قیامەتا کە دەگا بە خودا خودا لووتەلا دەبێ لێی‌و ڕووی نازی ناداتێ (م/د/ت/ن).

---

[٢] مسلم. إيمان: ٣٥٦. أبو داوُد. أيمان: ٣٢٤٥، ٣٦٢٣. نسائی. أحكام: ١٣١٤ بسند صحيح.

٢٤٧٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ، رَوَاهُ الترمذي[٣].

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڵگە لەسەر داواکارەو سوێندیش لەسەر داوالێکراوە واتە: شایەت‌و نیشانە لەسەر مووددەعییەو موددەعاعەلەیهیش ئەگەر نەچووە ژێری سوێندی لەسەرە (ت-سند ضعیف).**

## ١١٥) چۆنێتیی سوێند خواردن: (لفظ اليمين)

٢٤٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ لِرَجُلٍ حَلَّفَهُ: احْلِفْ بِاللّٰهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ مَا لَهُ عِنْدَكَ شَيْءٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي.

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی سوێند دەدا پێی فەرموو: سوێند بخۆ بەو خودایە کە لەو زیاتر خودای تر نیە: کە هیچی ئەو لەلای تۆ نیە (د/ن-سند صالح).**

## ١١٦) باسی شایەت: (بيان الشهود)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ} (٢٨٢/٢-).

**واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: وە دوو شایەتیش لە پیاوانی خۆتان ڕابگرن بە شایەت ئەگەر دوو پیاو نەبوون با پیاوێك‌و دوو ژن بن، بە مەرجێ موسوڵمان بن‌و لە وانەبن کە ئێوە لە کردارو ڕەفتاریان ڕازی بن، بۆیە دوو ژن لەباتی پیاوێ ڕەچاوکراوە نەبادا ژنێکیان ڕووداوەکەی لە بیربچێتەوە، لەو کاتەدا ژنەکەی تر ڕووداوەکەی دەخاتەوە بیری، وە نابێ‌و دروست نیە کە شایەتەکان کاتێ بانگ دەکرێن بۆ شایەتیدان شایەتییەکە نەدەن‌و لامنجی بکەن.**

---

[٣] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

٢٤٧٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ[١].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە سوێندی داواكارو بە شایەتێ بڕیاری بۆ داواكاردا (م/د/ت/ن).

٢٤٧٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضيَ اللهُ عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ؟ الَّذِى يَأْتِى بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا. رواهما الخمسة إلا البخاري[٢].

زەیدی كوڕی خالیدی ئەلجوهەنی (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەسا با پێتان بڵێم كە شایەتی باش كامەیە؟! ئەو شایەتەیە كە لە خۆیەوە بەبێ پێگوتن‌و ڕوو لێنان ئەو شایەتیی خۆی بدا (م/د/ت/ن).

٢٤٧٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَدَّ شَهَادَةَ الْخَائِنِ وَالْخَائِنَةِ وَذِى الْغِمْرِ عَلَى أَخِيهِ وَرَدَّ شَهَادَةَ الْقَانِعِ لأَهْلِ الْبَيْتِ وَأَجَازَهَا لِغَيْرِهِمْ. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ خَائِنٍ وَلاَ خَائِنَةٍ وَلاَ زَانٍ وَلاَ زَانِيَةٍ وَلاَ ذِى غِمْرٍ عَلَى أَخِيهِ. رَوَاهُما أَبُو دَاوُدَ والترمذي[٣].

عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكیەوە لە باپیریەوە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شایەتیی ئەمانەی قوبووڵ نەدەكرد: شایەتیی پیاوو ژنی ناپاك، شایەتیی كەسێ كۆنەقینی لە دلابێ‌و شایەتی بدا لە برای ئایینی خۆی هەروەها شایەتیی دەستوپێوەند بۆ خاوەن ماڵ، بەڵام دەستوپێوەند ئەگەر شایەتیی بۆ كەسێكی تر بدایە قوبووڵی دەكرد. لە

---

[١] مسلم. أقضية: ٤٤٧. أبو داود. أقضية: ٣٦٠٨، ٣٦٠٩.

[٢] مسلم. أقضية: ٤٤٦٩. ترمذي: شهادات: ٢٢٩٥، ٢٢٩٦، ٢٢٩٧. أبو داود. أقضية: ٣٥٩٦.

[٣] أبو داود بسند صالح (شرحه).

گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: شایەتیی پیاوو ژنی ناپاك‌و پیاوو ژنی شەڕواڵپیس دروست نیە (د-سند صالح-ت).

وزاد الترمذي: (على ماهو في الشَّرح): وَلاَ مَجْلُودٍ فِي حَدٍ، وَلاَ مجرَّبٍ فِي شَهَادَةٍ (أي مُتعوِّدٍ لها) وَلاَ ظَنِينٍ فِي وَلاَءٍ وَلاَ قَرَابَةٍ.

تیرمیذی (خودای لێ رازی بێ) ئەمەی پترە: هەروەها شایەتی ئەو کەسەیشی قوبووڵ نەدەکرد کە داری حەددی لێ درابێ، یاخود هی کەسێ کە شایەتیی کردبێ بە پیشە، یاخود هی کەسێ کە لەبەر ئاغایەتی‌و خزمەتکاری‌و خزمایەتی جێگەی گومان بێ.

٢٤٧٧- ولأبي داود: لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ بَدَوِيّ عَلَى صَاحِبِ قَرْيَةٍ. نَسْأَلُ الله التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وَأعلم[٤].

دەفەرموێ: شایەتیی دەشتەکی‌و کۆچەری لەسەر شاری‌و دێهاتی دروست نیە (د).

## ١١٧) هەڕەشەکردن لە شایەتی درۆ : (التحذير من شهادة الزور)

٢٤٧٨- عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) صَلاَةَ الصُّبْحِ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَامَ قَائِمًا فَقَالَ: عُدِلَتْ شَهَادَةُ الزُّورِ بِالإِشْرَاكِ بِاللَّهِ ثَلاَثَ مِرَارٍ ثُمَّ قَرَأَ {فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[١].

خورەیمی کوڕی فاتیك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەپاش نوێژی بەیانی هەڵسایەوەو لەسەر پێ راوەستاو سێ جار فەرمووی: شایەتیی درۆ هاوتای هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا دەکا ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

---

[٤] سكت عن درجته الشارح.

[١] بسند صحيح (شرحه).

{فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ- ٢٢/٣٠-٣١}.

واته: دەی خۆتان بپارێزن لە بەندەیی شتی پیس وەك بت‌و شتی وا، وە خۆتان بپارێزن لە واتەی درۆ، لە قسەی ناڕەوا لە شایەتیی درۆ، بەدڵێكی پاك‌و بێ گەردەوە روو بكەنە خوداو لابدەن لە كردەوەی خراپ، وە هاوبەش بۆ خودا بڕیار مەدەن (د/ت-س/ص).

٢٤٧٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ. قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ أَو قَوْلُ الزُّورِ. قَالَ: فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٢].

ئەبو بەكرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەدیی با پێتان بڵێم كە گەورەترین گوناهی گەورە چییە؟ گوتیان: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: هاوبەش بڕیاردان بۆ خوداو دڵڕەنجاندنی باوك‌و دایك حەزرەت لەم كاتەدا شانی دادابوو جا راست دانیشت‌و فەرمووی: وە شایەتیی درۆیان فەرمووی: وە واتەی درۆ گوتی: ئینجا ئەوەندە ئەم وشەیەی دووبارە كردەوە هەتا گوتمان: خۆزگا ئیتر بێ دەنگ دەبوو (ش/ت).

٢٤٨٠- وَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والترمذي. ولفظه: خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثَلاَثًا ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ مِنْ بَعْدِهِمْ يَتَسَمَّنُونَ وَيُحِبُّونَ السِّمَنَ يُعْطُونَ الشَّهَادَةَ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلُوهَا[٣].

---

[٢] بخاری. شهادات: ٢٦٥٤، ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٢٧٤، ٦٩١٩. مسلم. إیمان: ٢٥٥. ترمذی. بروصلة: ١٩٠١، ٢٢٩٩.

[٣] بخاری. شهادات: ٢٦٥٢، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٥٩، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤١٦، ٦٤١٧. ترمذی. مناقب: ٣٨٥٩.

**پرسیارکرا لە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **چ کەس باشە؟ فەرمووی:** (درودی خودای لەسەربێ) **چینی هاوچەرخی من، ئینجا چینی دوای ئەوان، ئینجا چینی دوای ئەوانیش، ئینجا هۆزێ پەیدا دەبن لە دوا ئەوان کۆناکەنەوە لە شایەتیی و سوێند خواردن و تێکەڵ و پێکەڵیان دەکەن بە سەریەکا (ب/د/ت)**
**گفتەی (ت): باشترین کەس چینی هاوچەرخی خۆمن، ئینجا چینی دوای ئەوان، ئینجا چینی دوای ئەوانیش، ئینجا چینی دوای ئەم سێ چینە، ئینجا لە دوائەمانە هۆزێ پەیدا دەبن، خۆیان قەڵەو دەکەن و حەزیان لە قەڵەوییە هێشتا کەس داوای لێ نەکردوون لە خۆیانەوە شایەتیی دەدەن.**

**٢٤٨١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُماعن النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: لَنْ تَزُولَ قَدَمُ شَاهِدِ الزُّورِ حَتَّى يُوجِبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ. رَوَاهُ ابن ماجه. نَسْأَلُ الله التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وَأعلم.**

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: پێی شایەتیی درۆ لە جێگەی خۆی نا بزوێ کە خودای گەورە ئاگری دۆزەخی بۆ مسۆگەر دەکا {ئیبنو ماجە** (خودای لێ رازی بێ) **سند صحيح}.**

## ١١٨) بەشی پێنجەم: باسی تێکۆشین (إجتهاد):
## الفصل الخامس في الإجتهاد

**قَالَ الله تَعَالَى: {وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَان فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ، فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا} (٢١/٧٨-٧٩).**

**خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: باسی داوودو سلێمانی کوڕی بکە، کە حوکمیان دەکرد لە مەسەلەی کشتێ لەو دەشتەدا کە ئاژەڵی هۆزێکی تێ بەرەڵا بووبوو ئێمە ئاگاداری حوکمی هەردوو لایان بووین و راستیی حوکمەکەمان نیشانی سلێماندا، وە بە هەردوو لایان حیکمەت و زانیاریمان داوە.**

٢٤٨٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ رَوَاهُ الخمسة[1].

عەمری كوڕی عاص (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دادپرس (حاكم) ئەگەر تێكۆشێ‌و باش وردبێتەوە بۆ گەیشتن بەهەق لە مەسەلەكەداو ئینجا بڕیارەكە دەركا ئەوە لەم حاڵەدا ئەگەر بڕیارەكەی ڕاست بوو ئەوە دوو پاداشی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر بڕیارەكەی هەڵەبوو ئەوە یەك پاداشی بۆ هەیە (ش/د/ت/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).

٢٤٨٣- لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ لَهُ: كَيْفَ تَقْضِي؟ فَقَالَ: أَقْضِي بِكِتَابِ اللَّهِ. قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتَابِ اللَّهِ. قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي. قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[2].

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كە موعاذی نارد بۆ یەمەن‌و كردی بە دادوەریان پێی فەرموو: چۆن حوكم دەكەی؟ گوتی: بەپێی ئەوەی كە لە نامەی خودادا هەیە حوكم دەكەم. فەرمووی: ئەی ئەگەر ئەو باسە سەربەخۆ لە نامەی خودادا نەبوو؟ گوتی: ئەگەر لەودا نەبوو بەپێی سوننەتی پێغەمبەری خودا حوكم دەكەم، فەرمووی: ئەی ئەگەر ئەو باسە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا نەبوو ئەوجا چۆن حوكم دەكەی؟ گوتی: لەم حاڵەدا تا دەتوانم بەرای خۆم تێ دەكۆشم بۆ دۆزینەوەی بڕیاری ڕاست لە ڕووداوەكەدا. جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سوپاس بۆ خودا كە ئاوا ڕێگەی ڕاست نیشانی فرستادەی پێغەمبەری خۆی دەدا (ت/د-سند صالح).

---

[1] بخاری. اعتصام: ٧٣٥٢. مسلم. أقضية: ٤٤٦٢. أبو داوُد. أقضية: ٣٥٧٤.

[2] بسند صالح (شرحه).

٢٤٨٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْها) أَتَى رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلاَنِ يَخْتَصِمَانِ فِي مَوَارِيثَ لَهُمَا لَمْ تَكُنْ لَهُمَا بَيِّنَةٌ إِلاَّ دَعْوَاهُمَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ بِشَيْءٍ فَلاَ يَأْخُذْهُ فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ، فَبَكَى الرَّجُلاَنِ وَقَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: حَقِّي لَكَ. فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَمَّا إِذْ فَعَلْتُمَا مَا فَعَلْتُمَا فَاقْتَسِمَا وَتَوَخَّيَا الْحَقَّ. ثُمَّ اسْتَهِمَا ثُمَّ تَحَالاَّ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنَّمَا أَقْضِي بَيْنَكُمَا بِرَأْيِي فِيمَا لَمْ يُنَزَّلْ عَلَيَّ فِيهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٣].

**ئوممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دوو پیاو هاتنە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەندێ کەلەپووریان هەبوو، لەسەری بوو بە ناکۆکییان، کەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، تەنیا داوای ڕووت نەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لەسەر قسەی ناڕەوای خۆی من شتێ بڕیار بدەم بۆی لە ڕاستیدا هی ئەو نەبێ، وەهی برایەکی ئایینی خۆی بێ بەوەنابێ بەهی ئەو، کەواتە با وەری نەگرێ، چونکە شتی وا بەو بڕیاردانەی منە کە لەسەر بەڵگەی ناڕەوای خۆی بووە نابێ بەهی خۆی بەڵکوو ئەوە پارچەیێ ئاگری ڕووتەو من بڕی دەدەم بۆی! ئیتر هەردوو پیاوەکە دەستیانکرد بەگریان‌و گوتیان بە یەکتریی: بەشەکەی منیش بۆ تۆ. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێیان: کەوای لێهات تا دەتوانن بەهەق بەشی بکەن‌و لەپاشا دەوی لێ بکەن‌و ئینجا، گەردنی یەکتریش ئازاد بکەن لە گێڕانەوەیەکا: چونکە بۆ شتێ (ئەگەر سرووشم بۆ نەیێ) من بەڕای خۆم بڕیار (حوکم) دەدەم لە بەینتانا (د-سند صالح).**

٢٤٨٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلَيْنِ ادَّعَيَا بَعِيرًا أَوْ دَابَّةً إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَيْسَتْ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ فَجَعَلَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَيْنَهُمَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي.

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دوو پیاو لەسەر وشترێ (یاخود لەسەر ولاخێ) داواچی بوون، كەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) كردی بەناو كۆییان (د/ن).

٢٤٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَرَضَ عَلَى قَوْمٍ الْيَمِينَ فَأَسْرَعُوا، فَأَمَرَ أَنْ يُسْهَمَ بَيْنَهُمْ فِي الْيَمِينِ أَيُّهُمْ يَحْلِفُ. رَوَاهُ البخاري.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێشنیاری كرد بۆ هۆزی سوێند بخۆن، ئەوانیش هەموویان پەلاماریان دا كە سوێند بخۆن، ئەویش فەرمانی فەرموو كە تیروپشك بكەن لەناوخۆیانا، تاكێ ناوی دەرچوو ئەوە سوێند بخوا (ب).

٢٤٨٧- وَعَنْهُ أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي مَتَاعٍ لَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اسْتَهِمَا عَلَى الْيَمِينِ مَا كَانَا أَحَبَّا ذَلِكَ أَوْ كَرِهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: إِذَا كَرِهَ الاثْنَانِ الْيَمِينَ أَوِ اسْتَحَبَّاهَا فَلْيَسْتَهِمَا عَلَيْهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي وأحمد.

دیسان ئەو گوتی: دوو پیاو لەسەر كاڵایێ هەرایان بوو، بۆ مەحكەمە هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وە كەسیان بەڵگەیان بە دەستەوە نەبوو لەسەر دروستی داواكەیان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كە هەردوو لا حەزیان لە سوێندە، یا حەزیان لە سوێند نیە با دەو لە سوێند بكەن. لە گێڕانەوەیەكا: ئەگەر هەردوولا حەزیان لە سوێند نەبوو، یا هەردوولا حەزیان لە سوێند بوو، با دەوی لێ بكەن (د-سند صالح-ن/ئەحمەد).

٢٤٨٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: بَيْنَما امْرَأَتَان مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا، جَاءَ الذِّئْبُ فَذَهَبَ بِابْنِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ لصَاحِبَتِهَا إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ أَنتِ. وَقَالَتِ الأُخْرَى: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ. فَتَحَاكَمَتَا إِلَى دَاوُدَ (عليه السلام)، فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى، فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ (عليهما السلام) فَأَخْبَرَتَاهُ. فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِّينِ أَشُقُّهُ بَيْنَهُمَا. فَقَالَتِ

الصُّغْرَى: لاَ تَفْعَلْ يَرْحَمُكَ اللَّهُ، هُوَ ابْنُهَا. فَقَضَى بِهِ لِلصُّغْرَى. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللَّهِ مَا سَمِعْتُ بِالسِّكِّينِ قَطُّ إِلاَّ يَوْمَئِذٍ، وَمَا كُنَّا نَقُولُ إِلاَّ الْمُدْيَةَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي. نَسْأَلُ اللهَ السِّتْرَ والتوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وَأعلم[٧].

دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ دووژن دوو کوڕی خۆیان پێ دەبێ، گورگێ لەولاوە دێ کوڕی ژنێکیان دەبا، ژنەکە بە هاوڕێکەی دەڵێ: گورگەکە کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەویش دەڵێ: نەء: کوڕەکەی تۆی بردووە، جا بۆ مەحکەمە دەچنە لای داوود (دروودی خودای لەسەربێ) داوودیش بڕیار دەدا: کە ئەو کوڕەی ماوە بۆ ژنە گەرەکە بێ، جا کە دێنە دەرەوە دەگەن بە سولەیمانی کوڕی داوود (دروودی خودای لەسەربێ) وە باسەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش دەفەرموێ: ئادەی چەقۆیەکم بۆ بێنن دەیکەم بە دوو لەتەوە بۆتان! جا ژنە بچکۆلەکە دەڵێ: نا، رەحمەتی خودات لێبێ وای لێ مەکە، کوڕی ئەوە، ئەویش کەڕوانی ژنە بچکۆلەکە سکی بە منالەکە دەسووتێ زانی کە منالی خۆیەتی جا لەبەرئەوە دایەوە بە ژنە بچکۆلەکە. ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەخودا ئەو رۆژە نەبێ ناوی چەقۆم نەبیستبوو، ئێمە جاران هەر دەمان گوت: سیکارد (ش/ن)[١].

---

[٧] بخارى. أحاديث الأنبياء: ٣٤٨٢.

[١] أن هذه القضية تصلح ان تكون نواة صالحة لما اصطلح عليه في يومنا هذا بمحاكم التمييز والنقض والاستئناف فيما اذا كان جميع شروط القضاء الاسلامي متوفرا في تلك المحاكم وكذلك تصلح ان تكون منارا يهتدى بنوره القضاة والحكام باستعمال الحيل اللطيفة والملاطفات والايهام وما شابه مما يخدم القضية للوصول الى معرفة باطنها فالتوصل الى اظهار الحق، وكل ذلك بعيدا عَن جو العنف واستخدام وسائل القهر لاجبار المتهم على الاعتراف بما اقترفت بداه عَن اضطرار وصغار، فالقضاء في الاسلام لا ثأرى، بل لاثأر في الاسلام كله، فالقضاء له غاية سامية ذات شقين أولهما عبادى يتعبد به العبد لله تعَالى لارضائه وجلب مرضاته، وثانيهما تربوي يتقصد به اجراء العدل وحمل الناس عليه واقناعهم بقبول الحق طائعين راضين ولوكان على أنفسهم. القضاء في الأسلام يرافقه الرفق والرأفة وتفارقه الخشونة والشدة اما التوغل في الحيل والتصلب

## ١١٩) دادپرس بۆی هەیە گومانبار (موتتەهەم) حەپس بكا: للحاكم حبس المتهم

٢٤٨٩- ➡ (ب- ٢ ز- ٢٨٢ برقم/ ٣/٢٣٨٠)[1].

٢٤٩٠- ➡ (ب- ٢ ز- ١٦٤ ژماره- ٦)[2].

## ١٢٠) بڕیاری دادپرس (قازی: دادوەر) ناڕەوا ناكا بە ڕەوا، واتە بە حوكمی قازی حەرام حەلاڵ نابێ: (حكم الحاكم لا يحلل الحرام (ولا يحرم الحلال))

٢٤٩١- ➡ (ب-٢/ز-٣٠٣ برقم:٣/٢٥٨٤ ل-٣١٣ ط/١). قَالَ هُنَا: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ فَأَقْضِي لَهُ نَحْوَ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْهُ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ[1].

---

مع العصاة والخطاة خاصة مع الاظناء والمتهمين والتجسس عليهم وتحسس أخبارهم وأسرارهم اما هذا فليس من الله ورسول الله في شيء، اذ أحد الاسس التي تقوم عليها بنية الاسلام التبشير بالتيسير وتسهيل الأمور وإغماض العيون ودرأ الحدود بالشبهات، لا التعسير ولا التنفير ولا جلب التهم بالحيل والشبهات ولكن هيهات فعل ما نقول، فقد فلت الأمر وفرط من الحق كثير وعم البلوى حتى التبس الأمر على بعض اهل العلم فحضوا على التقطيع والتصليب والتنكيل بكل من تزل قدمه، فكأنهم يحسبون الله تعالى مثيل رجال الأمن والمخابرات يراقب العبد على مضض ويرصد له بالمراصد وينصب له الكمائن حتى يوقعه في الشرك فليتذ بصب جام غضبه عليه، سبحان اله تعالى، وتعالى وهو الرحمن الرحيم أرحم الراحمين عن هذا علوا كبيرا.

- المترجم -

مستشفى كركوك العسكري - ١-رمضان ١٤٠٨هـ - ١٩٨٨/٤/١٨م

(١) تقدم برقم: ٣/٢٣٤٢ تسلسل/ ٩٧ مجلد/٣.

(٢) تقدم برقم: ٣/٢٣٨٠. تسلسل/ ١٦٤ مجلد ثاني.

(١) تقدم برقم: ٣/٢٥٨٤ تسلسل/ ٣٠٣ مجلد ٢.

ئوممو سەلەمە (خوداى لێ ڕازى بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: منیش هەر ئادەمیزادم وەك ئێوەو غەیبزان نیم جا ئێوە كە دێن بۆ لای من بۆ دادخوایی، بۆ مەحكەمە ڕەنگ بێ هەندێكتان لە هەنێكی ترتان باشتر لە بەڵگەسازی بزانێ‌و لە هاوداواكەی بەدەم‌و پلتر بێ، وە منیش بڕوای پێ دەكەم‌و بەپێی ئەوەی كە لەوی دەبیستم بڕیاری بۆ دەدەم، جا هەر كەسێ لەسەر بەڵگەی ناڕەوای خۆی من شتێ بڕیار بدەم بۆی وە لە ڕاستیدا هی ئەو نەبێ بەڵكوو هی برایەكی ئایینی خۆی بێ، ئەوە با ئەو شتە وەرنەگرێ، چونكە بەوە نابێ بە حەلاڵی، بەڵكوو ئەگەر ئاوا بە ساختە وەری گرت ئەوە لێی ڕوون بێ كە شتی وا پارچەیێ ئاگری ڕووتەو من بۆی بڕدەدەم! (ش/د/ت/ن).

٢٤٩٢– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ فَقَدْ ضَادَّ اللَّهَ وَمَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِلٍ وَهُوَ يَعْلَمُهُ لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَنْزِعَ عَنْهُ وَمَنْ قَالَ فِي مُؤْمِنٍ مَا لَيْسَ فِيهِ أَسْكَنَهُ اللَّهُ رَدْغَةَ الْخَبَالِ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ: وَمَنْ أَعَانَ عَلَى خُصُومَةٍ بِظُلْمٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسندٍ صالحٍ. نَسْأَلُ اللهَ التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وَأعلم[٢].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو كەسەی كە بە تكای ئەو حەددێ لە حەددەكانی خودا جێبەجێ نەكرێ ئەوە دوشمنایەتی لەگەڵ خودادا دەكا، وە ئەو كەسەی كە بە ناڕەوا لەسەر شتی ناهەق گەڕو تەشقەڵە دەكاو سوور دەشزانێ كە ئەوە ناڕەوایە ئەوە نوقمی ڕەق‌و غەزەبی خودایە تا وازی لێ دێنێ، وە ئەوەی كە قسەیەكی ناراست بۆ موسوڵمانێ هەڵدەبەستێ ئەوە خودا دەیخاتە ناو چڵپاوی زووخاوی دۆزەخییەكانەوە، تا لە ئۆباڵی ئەو قسە ناڕەوایەی خۆیە دەردەچێ، وە ئەوەی كە بە ناڕەوا لایەنی ناهەقی‌و گەڕو تەشقەڵە بگرێ ئەوە

---

[٢] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح.

شایانی رق‌و خەشمی خودا دەبیٚ‌و دەگەڕێتەوە بە باریٚ لە رق‌و ناڕەزایی خودای گەورەو مەزنەوە (د-س/صالح).

## ١٢١) دانانی ناو بژیکەر (حەکەم) دروستە

➡ب- ٢ز- ٢٣٩- ئایەتەکەی سەرەتای ئەم باسە کە ئایەتی(٣٥) بوو لە سوورەتی(٤).

٢٤٩٣- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا فَوَجَدَ المشترِي فِيهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ فَقَالَ لِلبائِعِ خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّي إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الأَرْضَ وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ. فَقَالَ الَّذِي شَرَى الأَرْضَ إِنَّمَا بِعْتُكَ الأَرْضَ وَمَا فِيهَا قَالَ: فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ فَقَالَ الَّذِي تَحَاكَمَا إِلَيْهِ: أَلَكُمَا وَلَدٌ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمَا: لِي غُلاَمٌ وَقَالَ الآخَرُ: لِي جَارِيَةٌ. قَالَ أَنْكِحُوا الْغُلاَمَ الْجَارِيَةَ وَأَنْفِقُوا عَلَى أَنْفُسِكُمَا مِنْهُ وَتَصَدَّقَا. رَوَاهُ البخاري ومسلم[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: پیاویٚ خانوویەکی کڕی لە پیاویٚکی تر، کڕیارەکە کووپەڵەییٚ زێڕی تیا دۆزییەوە، جا بە فرۆشیارەکەی گوت: زێڕەکە هی تۆیە، لیٚم وەربگرەوە، چونکە من تەنیا زەوییەکەم لەتۆ کڕیوە، خۆ زێڕەکەم لیٚ نەکڕیوی، ئەویش گوتی: من زەوییەکە خۆی‌و هەرچی تیادایە فرۆشتوومە بەتۆ زێڕەکە هی خۆتە من وەری ناگرمەوە فەرمووی: جا بۆ دادخوایی‌و ناوبژیکردن چوونە لای پیاویٚ‌و کردیان بە فەرمانڕەوا (حەکەم: ناوبژیکەر) پیاوەکە گوتی: ئایا منالٚتان هەیە؟ یەکێکیان گوتی: کوڕێکم هەیە، ئەوی تریشیان گوتی: منیش کچێکم هەیە، ئەویش گوتی: کەواتە کچەکە لە کوڕەکە مارە بکەن‌و زێڕەکەیش بۆ خۆتان خەرج بکەن بۆ مەسرەفی شایی وە خێریشی لیٚ بکەن ئیتر ئەوانیش وایانکرد (ش).

---

[١] بخاری. أحادیث الأنبیاء: ٣٤٧. مسلم. أقضیة: ٤٤٧٢. تقدم برقم: ٢٤٥١/٧. تسلسل/١١٨ مجلد/ ٣.

## ١٢٢) دوا وتار باسی ڕێككەوتن (صوڵح) : (الخاتمة في الصلح)

بسم الله الرحمن الرحيم

قَالَ اللهُ تَعَالَى: لاَّ خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلاَّ مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلاَحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتَغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا- ٤/١١٤}.

خودای گەورە دەفەرموێ: هیچ سوودێ نییە لە زۆر لە چپە چپ‌و واتە بن گۆشی ئەمانەدا، مەگەر چپەی ئەو كەسانە كە فەرمان دەكەن بە كردنی خێرێ یا بەكردنی چاكەیێ یا بە ڕێكخستنی ناو بەینی خەڵك، جا هەر كەسێ چپە بكا بۆ ئەم مەبەستانە وە لەبەر داوا خوازی ڕەزای خودا ئەوە پاداشێكی گەورەی پێ دەدەین.

٢٤٩٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الأَلَدُّ الْخَصِمُ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا لە هەموو كەسێ زیاتر ڕقی لە پیاوی شەڕانی شەڕفرۆشی ڕق ئەستوورە (ش/ن).

٢٤٩٥- عَنْ سَهْلِ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ قِتَالٌ بَيْنَ بَنِي عَمْرٍو، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَتَاهُمْ يُصْلِحُ بَيْنَهُمْ. رَوَاهُ البخاري والنسائيُّ[٢].

سەهلی ساعیدی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كرا كە هۆزی بەنی عەمر لە ناوخۆیانا شەڕیان بووە، ئەویش نوێژی نیوەڕۆی كردو چوو بۆ ناویان، تا میانەیان ڕێك بخاو ناوبژییان بكا (ب/ن).

---

[٢] بخاری. صالح: ٢٦٩٣، ٦٨٤، ١٢٠١، ١٢٠٤، ١٢١٨، ١٢٣٤، ٢٦٩٠، ٢٦٩٣، ٧١٩٠. مسلم. صلاة: ٩٤٨.

٢٤٩٦- عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَيْسَ الْكَاذِبُ مَنْ أَصْلَحَ بَيْنَ النَّاسِ فَقَالَ خَيْرًا أَوْ نَمَى خَيْرًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري[٣].

**ئوممو كولثوومی كچی عوقبە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بەو كەسە ناگوترێ درۆزن كە میانەی خەڵك رێك دەخاو قسەی باش لە نێوانیانا دێنێ‌و دەبا، با ئەو قسەیەش كە دەیكا ئەصلی نەبێ‌و خۆی بۆ سوودی گشتی دروستی بكا!** (د/ب).

٢٤٩٧- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ؟ قَالُوا: بَلَى يا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ فَإِنَّ فَسَادَ ذَاتِ الْبَيْنِ الْحَالِقَةُ رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي (بسندٍ صحيحٍ) وازدَ: لاَ أَقُولُ تَحْلِقُ الشَّعْرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ. نَسْأَلُ اللهَ السترَ والتوفيقَ آمين آمين والحمد لله رب العالمين[٤].

**ئەبو دەرداء** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەدیی با پێتان بڵێم كە پایەی چی كردەوەیێ لە پایەی رۆژوو نوێژو زەكات‌و خێركردن گەورەترە؟ گوتیان: ئادەی بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! رەوانەكراوی خودا! فەرمووی: رێك خستنی میانەی مەردوم‌و ئاشتكردنەوەی موسوڵمانان لەوانە خێری زیاترە، تێكدانی نێوانی خەڵكیش پاكۆی دین دەكاو ئایین بەرباد دەكا** (د/ت-س/ص) **گێڕانەوەی تیرمیذی ئەمەی زیاترە ناڵێم موو پاكۆ دەكا یا دەتاشێ، بەڵام دین پاكۆ ئەداو لە رەگ‌و ریشەوە لەبنی دێنێ.**

---

[٣] بخاری. صالح: ٢٦٩٢. مسلم. بروصلة: ٦٥٧٦. أبو داوُد. أدب:٤٩٢١،٤٩٢٠. ترمذی. بروصلة: ١٩٣٨.

[٤] رَوَاهُ الترمذی بسند صحیح (شرحه).

# نامەی سوێندو نەزر

(دوو باسو پاشەكییەكە)

## باسی یەكەم: باسی سوێند خواردن.

### ١٢٣) سوێند تەنیا بە ناوێ لە ناوەكانی خودای گەورە دەخورێو بەس:

### كتاب الآيمان والنذور (وفيه بابان خاتمة) : الباب الأول: في اليمين

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَوَرَبِّ السَّمَاء وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ – ٥١/٢٣}.

یەزدانی پاك دەفەرموێ: سوێند بە پەروەردگاری ئاسمانو زەوی ئەم باسو خواسە راسەو گومان نیە لە بوونیا، وەك چۆن قسەیێ كە خۆتان بیكەن گومانتان نیە لە كردنیا ئەمیش ئاوا.

وَقَالَ تَعَالَى: {فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ، عَلَى أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ – ٧٠/٤٠}.

خودای گەورە فەرموویەتی: سوێند دەخۆم بە پەروەردگاری هەموو خۆرهەڵاتو هەموو رۆژئاوایێ، ئێمە بەسانایی دەتوانین كە ئەوان لەناوببەینو لەباتی ئەوان گەلێكی باشی خاوەن باوەڕو داناو زاناو بە بەزەیی پەروەردە بكەین، ئێمە ئەوەی بمانەوێ دەیكەینو ئەو كەسەی بمانەوێ بیگۆڕین دەتوانینو نەكەس دەتوانێ لە دەستمان دەربچێو نەهیچ كارێ لە دەستی ئێمە دەردەچێ كاتێ ویستمان بیكەین.

٢٤٩٨– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: كَانَتْ يَمِينُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَا وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما[١].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كە سوێندی دەخوارد دەیفەرموو: نا، بە هەڵسووڕێنەری دڵان! (ب/د/ت/ن).

---

[١] بخاری. أیمان ونذور: ٦٦٢٨.

٢٤٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا اجْتَهَدَ فِي الْيَمِينِ قَالَ : وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي الْقَاسِمِ بِيَدِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٢].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سوێندی گەورەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەبوو دەیفەرموو: بەو کەسە کە گیانی ئەبول قاسمی بە دەستە: بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی وا لە دەستا (د-سند صالح).

٢٥٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحمَّدٍ بِيَدِهِ، لَتُنْفِقُنَّ كُنُوزَهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کە کیسرا نەماو لە ناوچوو ئیتر لەپاش ئەو کیسرای تر لە عێراق نابێ، کە قەیصەریش نەماو لە ناوچوو ئیتر لەپاش ئەویش قەیصەری تر لەشام نابێ. بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەستە گەنج و خەزنەی ئەم دووانە هەردوکیان لە رێگەی خوادا خەرج دەکرێن و دەبن بە تالانی بۆ موسوڵمانان (ب).

٢٥٠١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاًرواهما البخاري[٤].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی گەلی موحەممەد! بەیەزدانی پاك ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن زۆر دەگریان و کەم پێ دەکەنیان (ب).

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] بخاری. أیمان: ٦٦٢٨.

[٤] بخاری. أیمان: ٦٦٣١.

## ١٢٤) کەسێ بە شتێکی تر (جگە لە خودا) سوێند بخوات گوناهبار دەبێ:
## من حلف بغير الله فقدْ أثم

٢٥٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) أَدْرَكَ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) فِي رَكْبٍ وَهْوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَنَادَاهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): أَلاَ إِنَّ اللّٰهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللّٰهِ، أَو لِيَصْمُتْ. قَالَ عُمَرَ فوالله ما حلفت بها منذ سمعت رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) نهى عنها ذاكرا ولا آثراً[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گەیشت بە دەستەیێ سوار، عومەریان تیابوو، لەوکاتەدا عومەر سوێندی بە باوکی دەخوارد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بانگی لێکردن و فەرمووی: هۆشیاربن: کە خودای گەورەو مەزن قەدەغەی کردووە لە ئێوە کە سوێند بخۆن بە باوو باپیرتان، جا ئەو کەسەی کە دەیەوێ سوێند بخوا با یا سوێند بە خودا بخوا، یا بێ دەنگ بێ و سوێند بە شتی تر نەخوات. عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەخودا لەو ساوە کە ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بیستووە کە ئەمەی قەدەغە کردووە ئیتر هێشتا نەخۆم سوێندم پێیان خواردووەو نە لە دەمی کەسی تریشەوە سوێندی وام گێڕاوەتەوە (ش/د/ت/ن).

٢٥٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قَالَ: مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى. فَلْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ. وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ تَعَالَ أُقَامِرْكَ. فَلْيَتَصَدَّقْ[2].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا لەسەر عادەتی سەردەمی نەزانی گوتی: بەلات و بەعوززا، با بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، ئەو

---

[1] بخاری. ایمان: ٦٦٤٧.

[2] بخاری. تفسیر: ٤٨٦٠، ٦١٠٧، ٦٣٠١، ٦٦٥٠، ٤٨٥٩.

کەسەشی بە هاوڕێکەی بڵێ: وەرە باقومار بکەین با خێرێ بکا لە کەفارەتی ئەو قسە پیسەدا (ش/د/ت/ن).

٢٥٠٤- عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ مِلَّةِ الإِسْلَامِ فَهُوَ كَاذِبًا كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، وَلَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ رَمَى مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ. روى هذه الثلاثة الأصول الخمسة[٣].

ثابیتی کوڕی ضەحاك (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ سوێند بخوا بە میللەتێ غەیری میللەتی ئیسلام وەك ئەوە بڵێ: ئەگەر ناپاکی لە گەڵ خۆم بکەم جوولەکەبم، وە لەپاشا ناپاکی لێ بکا ئەوە وەك خۆی دەڵێ وایە بەو قسەیە کافر دەبێ، وە کەسێ بە شتێ خۆی بکوژێ لەناو ئاگری دۆزەخیشا دیسانەوە بەو شتەیە سزا دەدرێتەوە، نەفرین کردنیش لە موسوڵمان بە قەد کوشتنەکەی گوناهەو موسوڵمان چی لەعنەتی لێ بکەیتو چی بیکوژی چونیەکە، وە ئەو کەسەی بە موسوڵمانێ بڵێ: ئەی بێ بڕوا، ئەی کافر! ئەوە وەك بیکوژێ وایە (ش/د/ت/ن).

٢٥٠٥- وَسَمِعَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) رَجُلاً يَحْلِفُ لاَ وَالْكَعْبَةِ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي وأحمد[٤].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) بەرگوێی کەوت پیاوێ سوێندی دەخوارد دەیگوت: نا، بەکابە. ئیبنو عومەر گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: هەر کەسێ سوێند بخوا بە غەیری خودا ئەوە هاوەڵو هاوبەشی بۆ بڕیاردەدا (د/ت/ئەحمەد- سند حسن).

---

[٣] بخاری. أيمان: ٦٦٥٢، ١٣٦٣، ٤١٧١، ٤٨٤٣، ٦٠٤٧، ٦١٠٥، ٦٦٥٢. مسلم. إيمان: ٢٩٦ — ٣٠٠. أبُو داوُد. أيمان: ٣٢٥٧. ترمذی. أيمان: ١٥٢٧. نسائی. أيمان: ٣٧٧٩.

[٤] بسند حسن (شرحه).

٢٥٠٦- عَنْ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَلَفَ فَقَالَ إِنِّي بَرِىءٌ مِنَ الإِسْلاَمِ فَإِنْ كَانَ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ وَإِنْ كَانَ صَادِقًا فَلَنْ يَرْجِعَ إِلَى الإِسْلاَمِ سَالِمًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٥].

بورەیدە لە باوكیەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ سوێند لەسەر شتێ بخواو بڵێ بەشم لە ئاییني ئیسلام بڕابێ ئەمە وایەو واش نەبێ ئەوە وەك خۆی دەڵێ وایە، گریمان قسەكەشی راست بێ ئەم جۆرە سوێندە هەرباش نیە، چونكە سوێندخۆر لەم حاڵەتەدا بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە. سەر ئیسلامەتی! (د-سند صالح-ن).

## ١٢٥) سوێندی ماڵ وێرانكەر: (اليمين الغموس)

٢٥٠٧- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرو (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْكَبَائِرُ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الغمُوسُ. رَوَاهُ البخاري[١].

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گوناهە هەرە گەورەكان ئەمانەن: هاواڵ دانان بۆ خودا، وە دڵشكاندن و دڵڕەنجاندنی باوك و دایك، وە كوشتنی ئادەمیزاد بە ناڕەوا، وە سوێندی ناهەقی ماڵوێرانكەر كە سوێنخۆر لەناو ئاگری سووردا نوقم دەكا! (بخاری. رەحمەتی خودای لێبێ).

٢٥٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبَةٍ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ، أَوْ قَالَ أَخِيهِ لَقِيَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقَهُ {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ } إِلَى آخِرِ الآيَةَ. رَوَاهُ الخمسة (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُم)[٢].

---

[٥] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] تقدم برقم: ٢/٢٤٤٢. تسلسل/ ١١٧ مجلد/٣.

[٢] بخاری. مساقاة: ٢٣٥٦، ٢٤١٦، ٢٥١٥، ٢٦٦٦، ٢٦٦٩، ٢٦٧٣، ٢٦٧٦، ٤٥٤٩، ٦٦٥٩، ٦٦٧٦، ٧١٨٣، ٧٤٤٥ +٢٣٥٧، ٢٤١٧، ٢٥١٦، ٢٦٦٧، ٢٦٧٠، ٢٦٧٧، ٧١٨٤. مسلم. إيمان: ٣٥٣. أبو داوُد. أيمان ونذور: ٣٢٤٣. ترمذی. بيوع: ١٢٦٩.

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کەسێ بە درۆ سوێند بخوا تا بەو سوێندە درۆیە ماڵی پیاوێکی موسوڵمانی پێ بپچڕێ بۆ خۆی یا فەرمووی: ماڵی برایەکی ئایینی خۆیی پێ بپچڕێ بۆ خۆی ئەوە کاتێ کە دەگاتەوە بە دیداری خودا خودا تووڕەیە لێی، جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە:**

{إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ – ٣/٧٧}.

**واتە: ئەو کەسانە کە پەیمانی خوداو سوێندی خۆیان دەفرۆشن و بە بەهایەکی کەمی دنیایی دەیانگۆڕنەوە ئەوانە لە ڕۆژی پاشە ڕۆژدا بێ بەش و بارەن، وە خودای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکا، وە بەچاوی میهریشەوە تەماشایان ناکات و ڕووی خۆشیان ناداتێ وە پاکیان ناکاتەوەو تاریفیان ناکا، وە سزای سەخت و بەسوێشیان هەیە لە قیامەتا (ش/د/ت/ن– خودایان لێ ڕازی بێ).**

٢٥٠٩– عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ مَصْبُورَةٍ كَاذِبًا فَلْيَتَبَوَّأْ بِوَجْهِهِ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوەی سوێندی مەحکەمە بە درۆ بخوا با لەسەر ڕوو جێگەی خۆی بگرێ لەناو ئاگری دۆزەخدا (د–سند صلح).**

٢٥١٠– عنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَحْلِفُ أَحَدٌ عِنْدَ مِنْبَرِي هَذَا عَلَى يَمِينٍ آثِمَةٍ وَلَوْ عَلَى سِوَاكٍ أَخْضَرَ إِلاَّ تَبَوَّأَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ أَوْ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي.

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەرکەسێ لەلای ئەم مینبەرەی مندا بە ناڕەوا سوێند لەسەر شتێ بخوا، ئەگەرچی ئەو شتە پەلکە سیواکێکی تەڕیش بێ، ئەوە مسۆگەر جێگەی خۆی لە ئاگردا دادەمەزرێنێ یا فەرمووی: ئاگری دۆزەخ مسۆگەر دەکا بۆ خۆی (د–سند صالح–ن).**

٢٥١١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَسَأَلَ الطَّالِبَ الْبَيِّنَةَ فَلَمْ تَكُنْ لَهُ بَيِّنَةٌ فَاسْتَحْلَفَ الْمَطْلُوبَ فَحَلَفَ بِاللَّهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): بَلَى قَدْ فَعَلْتَ وَلَكِنْ قَدْ غُفِرَ لَكَ بِإِخْلاَصِ قَوْلِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي. نَسْأَلُ الله التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين. والله أعلى وَأعلم[٥].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: دوو پیاو بۆ دادخوازیی هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داوای بەڵگەی کرد لە داواکار، داواکار بەڵگەی نەبوو ئینجا داوای کرد لە داوالێکراو کە سوێند بخوا، ئەویش سوێندی بەم جۆرە خوارد: بەو خودایەی کە جگە لە خۆی خودای تر نیە ئەو ئیشەیەم نەکردووە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: با، کردوتە بەڵام ئەوەندە بەسۆزو دڵپاکیەوە وشەی (لا الـه الا الله)کەت گوت خودا لێت خۆشبوو لە گوناهی ئەم سوێندە درۆیە[١] (د- سند صالح-ن).

## ١٢٦) رقە بەرێو پێلێداگرتن لە سوێندا نابێ

## لا ينبغي اللجاج في اليمين

٢٥١٢- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وقال: وَاللَّهِ لأَنْ يَلِجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيْهِ. رَوَاهُ البخاري ومسلم والله أعلى وَأعلم. أعلى وأعلم[١].

---

[٥] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

(١) بەورشەی وشەی یەکتایی خـودا
خەرمانی تاوان بوو بە کاوو بـــا —وەرگێڕ—

[١] بخاري. أيمان ونذور: ٦٦٢٥، ٦٦٢٤، ٢٣٨، ٨٧٦، ٨٩٦، ٢٩٥٦، ٣٨٨٦، ٦٨٨٧، ٧٠٣٦، ٧٤٩٥.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: ئێمـە هەرچـەند لـە جیهانـدا دوائۆممـەتین بـەڵام لـە ڕۆژی قیامـەتا یەكـەمین، وە فـەرمووی: بـەخودا ئەگـەر كەسـێكتان لـە سەرشـتێ سـوێند لـە كەسوكاری بخواو لە پاشا وڕكی لێ بگرێو لێی پەشیمان نەبێتـەوە وەلحاڵ پەشیمانبوونەوە لـەو شـتە باشـتر بـێ ئـەوە بەوپێلێداگرتنـە گونـاهی زۆر تـر دەگا لە لای خودا، هەتا ئەوە كە سوێندەكەی بشكێنێ و ئەو كەففارەتە بدا كە خودا دایناوە بۆ سوێند (ب/م).

### ١٢٧) سوێندی بێ بایەخ= سوێندی بێ هوودە : (لغو اليمين)

٢٥١٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) فِي قَوْله تَعَالَى{لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّٰهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ } قالتْ: أُنْزِلَتْ فِي قَوْلِ الرَّجُلِ لاَ وَاللّٰهِ، وَبَلَى وَاللّٰهِ. رَوَاهُ البخاري[١].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئـەم ئایەتـە: {لاَ يُؤَاخِـذُكُمُ اللّـٰهُ بِـاللَّغْوِ فِـي أَيْمَانِكُمْ – ٢/٢٢٥}. واتە: خودا ناتـان گـرێو سزاتان نـادا بـەو سـوێندانە كە دێن بە دەمتانا بەبێ مەبەستو بەبێ ئەوە كە نیازی دڵی لەگەڵدا بێ، گوتی: ئـەم ئایەتـە لـە شـانی ئـەو كەسـانەدا هاتۆتـە خـوارەوە كـە لـەكاتی گفتوگـۆدا بەسـەردەمیانا دێـتو سـەرزارەكی دەڵـێن: نـە بـەخودا وا نیـە، بـەرێ بـە خـودا وایە (ب).

٢٥١٤- وَعَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: هُوَ كَلاَمُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِـهِ كَـلاَّ وَاللّٰهِ وَبَلَى وَاللّٰهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن حبان والبيهقي[٢].

دیـسان گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەربێ) فـەرمووی: سـوێندی بـێ هوودە (لە غوولئەیمان) وەك ئەوە پیاو لەماڵەوە بە دەمیا دێو دەڵـێ: نـە بـە خودا وانیە، بەرێ بەخودا وایە (د/ئیبنو ماجە/بەیهەقی).

---

[١] بخاري. الأيمان: ٦٦٦٣.

[٢] رَوَاهُ البخاري موقوفا، كما تقدم في رقم ١ = ٦٦٦٣ بخاري.

## ١٢٨) سوێند بەپێی نیازی سوێند دەرە نەك بەپێی نیازی سوێند خۆر: اليمن على نية المستحلف

٢٥١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ. وَفِي رِوَايَةٍ: يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ عَلَيْهِ صَاحِبُكَ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سوێند بەپێی نیازی سوێنددەرە لە گێرانەوەیەکا: سوێندی تۆ ئەی سوێندخۆر! هەر کەسێ هەی بەپێی نیازی هاوڕێکەتە کە سوێندت دەداو بەپێی ئەو سوێندە بڕوات پێدەکا (م/د/ت).

٢٥١٦- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ حَنْظَلَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا نُرِيدُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَمَعَنَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ فَأَخَذَهُ عَدُوٌّ لَهُ فَتَحَرَّجَ الْقَوْمُ أَنْ يَحْلِفُوا وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي فَخَلَّى سَبِيلَهُ فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّ الْقَوْمَ تَحَرَّجُوا أَنْ يَحْلِفُوا وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي قَالَ: صَدَقْتَ الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسندٍ صالحٍ وابن ماجه. والله أعلى وأعلم[٢].

سووەیدی کوڕی حەنظەلە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەرچووین کە بچین بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وائیلی کوڕی حوجوریشمان لەگەڵدا بوو، دوشمنێکی خۆی تووشی بوو گرتی. وائیل گوتی: من وائیل نیم، کابرایش گوتی: ئەمە ئەگەر ئەو نیە دەئێوە سوێند بخۆن. برادەران پڕکێشیان نەکرد کە سوێندی بۆ بخۆن، وەڵێ من سوێندم بۆ خوارد کە ئەمە برای منە. جا دوشمنەکەی بەرەڵای کرد، کاتێ چووینە خزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەم عەرزی کرد کە برادەران پڕکێشی ئەوەیان نەکرد کە سوێندی بۆ بخۆن کە ئەمە ئەو نیە، بەڵام من سوێندم بۆیخوارد کە ئەمە برای منە،

---

[١] مسلم. أيمان ونذور: ٤٢٦٠، ٤٢٥٩. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٥٥. ترمذى. أحكام: ١٣٥٤.

[٢] ذكر فى نهاية متن الحديث درجته.

فەرمووی: (درودی خودای لەسەربێ) ڕاستت گوتوە: موسوڵمان برای موسوڵمانە (د- سند صالح- ئیبنو ماجه).

## ١٢٩) ئەگەر لە دوا سوێندەوە گوتی خودا حەزکا (ان شاء الله) سوێندی ناکەوێ: (لا حنث مع الاستثناء)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا، إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا – ١٨/٢٣-٢٤}.

خودای گەورە دەفەرموێ: وە قەت مەڵێ بۆ شتێ کە دەتەوێ بیکەی من سبەینێ ئەو شتە دەکەم مەگەر لە هەمان کاتا بڵێیت: سبەینێ ئەو شتە دەکەم ئەگەر خودا بیەوێ، وە ئەگەر جارێ لە جاران لە بیرت دەرچوو کە لەگەڵ قەسەکەتا ناوی خواستی خودا ببەی‌و (ان شاء الله) بکەی‌و پاش ماوەیێ وە بیرت کەوتەوە ئەوە ناوی خواستی خودا ببە (ان شاء الله: ئەگەر خودا یار بێ: ئەگەر خوا مەیل بکا: ئەگەر خوا حەزکا: ئەگەر خوا خواستی هەبێ) بکە، وە بڵێ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! هیوام وایە کە خودای پەروەردگارم شارەزام بکا بۆ زانیاری ڕووداوو بەسەرهاتی پێشینان لەسەر شێوەیێ کە باشتر لە گێڕانەوەی (باسی ئەصحابوکەهف: یارانی ئەشکەوت) بێ بە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتیم.

٢٥١٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ : مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَقَدِ اسْتَثْنَى. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[١].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ لەسەر شتێ سوێند بخوا وە بڵێ: خودا حەزکا، ئیتر ئەوە ئەگەر ئەوشتەیش نەکا سوێندی ناکەوێ (د/ت/ن-س/ح).

٢٥١٨- وللنسائي وأبي داود: مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى فَإِنْ شَاءَ مَضَى وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حَنِثٍ[٢].

---

[١] بسند حسن (شرحه).

نەسائی ئەبو داوود (خودایان لێ رازی بێ) دەگێڕنەوە کە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: کەسێ کاتێ سوێند دەخوات (ان شاء الله: ئەگەر خوا حەزکا) بکا بەنیازی ئەوە کە خۆی سەرپشك بێ لەکردن یا نەکردنی ئەو کارەدا یا بەبێ نیاز، ئەوە ئیتر بە دەستی خۆیەتی هەوەسی هەبوو کارەکە دەکا، هەوەسی نەبوو نایکا، وە لەم حاڵەدا سوێندەکەشی ناکەوێ (ن/د–سند صالح).

٢٥١٩– عَنْ عِكْرِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ : وَاللّٰهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا وَاللّٰهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا وَاللّٰهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا. ثُمَّ قَالَ : إِنْ شَاءَ اللّٰهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: ثُمَّ سَكَتَ ثُمَّ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللّٰهُ ثُمَّ لَمْ يَغْزُهُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبيهقي وابن حبّان ولفظه: وَاللّٰهِ لأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا ثُمَّ سَكَتَ سَاعةً ثُمَّ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللّٰهُ[٣].

عیکریمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەخودا دەچم بۆ غەزای قوڕەیش، بەخودا دەچم بۆ غەزای قوڕەیش، بەخودا دەچم بۆ غەزای قوڕەیش پاشان دەفەرموێ: ان شاء الله: ئەگەر خوا حەزکا. لە گێڕانەوەیەکا: ئینجا بێ دەنگ دەبێ، لەپاشا دەفەرموێ: ئەگەر خوا حەزکا. لە دواییشا ناچێ بۆ غەزایان (د/بەیهەقی/ ئیبنو حەببان) گفتەی ئیبنو حەببان: سێ جار دەفەرموێ: بەخودا قوڕەیش غەزا دەکەم ئینجا تاوێ بێدەنگ دەبێ لەپاشا دەفەرموێ: ئەگەر خودا یاربێ.

## ١٣٠) باسی دووەم: باسی نەزر (فوتوو)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَا أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ – ٢/٢٧٠}.

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ مرسلاً هكذا ومنداً إلى ابن عباس عَنِ النبى (شرحه).

یەزدانی مەزن دەفەرموێ: هەر ماڵێ خەرجی بکەن بۆ خێر یا بۆ شەڕ، هەروەها هەر نەذرێ بکەن بۆ فەرمانبەریی خودا یا بۆ تاوانباری، ئەوە بە راستی خودا پێی دەزانێو هیچی لێ ون نابێ، وە کەسێ ماڵ خەرج بکا بۆ تاوانباری با باش بزانێ کە ستەمکارەو ستەمکاران یارمەتیدەریان نیە لە رۆژی قیامەتا.

وَ قَالَ اللهُ تَعَالَى: {ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ - ٢٩/٢٢}.

دیسان خوا دەفەرموێ: جا پاش سەربڕینی ئەو گیانلەبەرە چوارپێیانە لەسەر شێوەی قوربانی یا خێر ئیتر با ئیحرامداران هەرچی چڵكو پیسی هەیە پێیانەوە لای ببەنو تیغ بەکاربێنن بۆ تاشینی هەر موویێ پێویستی ببێ بە تیغ، وە هەر نەزرێ کردوویانە بۆ هەژاری مەککە پێیان بدەن، وە حەوت جار هەڵسووڕێن بەدەوری خانەی دێریندا، کە لە مێژەوە دروست کراوە بۆ ئەوە ببێ بە مەطافو هەڵسووڕەگاو جێگە تەواف بۆ بە جێهێنانی بەندەیی خودای گەورە.

وَ قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا، وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا} (٧٦-٨-٧).

ئەو پیاو چاکانە نەزری خێر دەبەنە سەرو دەترسن لە رۆژێ کە سیخناخە لە شەڕو ئێشو ئازاری ئەو رۆژە پرژو بڵاو دەبێتەوەو هەموو لا دادەگرێ، وە لەبەر خاتری خودا نانو ئاو دەدەن بە هەژارانو هەتیوانو دیلان، گەلێ جار وا دەبێ کە خۆشیان پێویستییان پێی هەیە وە یا حەزیان لێیەتی.

٢٥٢٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: إِنَّهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا، وَلَكِنَّهُ يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ[1].

---

[1] بخاری قدر: ٦٦٠٨ ٦٦٩٣. مسلم. نذر: ٤٢١٣. أبو داوَد. أيمان ونذور: ٣٢٨٧. نسائی. أيمان ونذور: ٣٨١٠، ٣٨١١، ٣٨١٢.

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی دەکرد لە نەزرکردن وە دەیفەرموو: چونکە نەزر هیچ چارەنووسێ ناگێڕێتەوە، بەڵام لە پیاوی رژدو چروکی پێ دەردەهێنرێ (ش/د/ت/ن).**

**٢٥٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: إِنَّ النَّذْرَ لاَ يُقَرِّبُ مِنِ ابْنِ آدَمَ شَيْئًا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ قَدَّرَهُ لَهُ وَلَكِنِ النَّذْرُ يُوَافِقُ الْقَدَرَ فَيُخْرَجُ بِذَلِكَ مِنَ الْبَخِيلِ مَا لَمْ يَكُنِ الْبَخِيلُ يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَ. رواهما الخمسة[٢].**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەو شتەی کە خودا نەینووسیبێ لە چارەی ئادەمیزاد بەشت نەزرکردن بۆی نابێ، بەڵام وا دەبێ نەزرەکە کە لەگەڵ چارەنووس یەك دەگرێو شتەکە روو دەداتو ئادەمیزاد وا دەزانێ کە ئەوە لەبەر نەزرەکەی ئەو رووی داوە جا بەهۆی ئەمەوەو لەسەر ئەم بنیاتە، شتی لە پیاوی پیسکەو چرووك پێ دەکێشرێتەوە، بەڵام ئەگەر وا نەبوایە ئەو پیسکەیە ئەو خێرو نەزرەی نەدەکرد (ش/د/ت/ن).**

**٢٥٢٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ. رَوَاهُ الخمسة الا مسلماً[٣].**

**عائیشە** (خودای گەورە لێ خۆش نوودبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: کەسێ نەزریکرد کە فەرمانبەریی خودا بکا ئەوە با نەزرەکەی بەجێ بێنێ، وە کەسێ نەزریکرد کە نافەرمانی خودا بکا ئەوە با نافەرمانی خودا نەکاو نەزرەکەی نەباتە سەر (ب/د/ت/ن).**

**٢٥٢٣- عنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. قَالَ عِمْرَانُ: لاَ أَدْرِى أَذَكَرَ اثْنَيْنَ أَوْ**

---

[٢] بخاری. قدر: ٦٦٩٤. مسلم. نذر: ٤٢١٩.

[٣] بخاری. نذر: ٦٦٩٦.

ثَلاَثَةً. بَعْدَ قَرْنِهِ، ثم يجيء قَوْمٌ يُنْذِرُونَ وَلاَ يُوفُونَ ويَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ، وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٤].

**عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرەباشەکانی ئێوە چینی هاوچەرخی منن، ئینجا چینی دوا ئەوان، عیمران گوتی: نازانم کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەپاش چینیی هاوچەرخی خۆی دووجار وشەی ئینجا چینی دوا ئەوانی فەرموو، یا سێ جاری فەرموو. ئینجا فەرمووی: لە پاشدا هۆزێ پەیدا دەبن نەزر دەکەن و نایبەنە سەر، وە گزیو فزی دەکەن و متمانەیان پێناکرێ، وە لە خۆیانەوە بەبێ ئەوەی کە کەس داوای شایەتییان لێ بکا شایەتی دەدەن، وە قەڵەوییان تیا پەیدا دەبێ (ب/ن).**

٢٥٢٤- وَجَاءَ رَجُلٌ الى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ الْفَتْحِ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ لِلَّهِ إِنْ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكَ مَكَّةَ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ رَكْعَتَيْنِ. قَالَ : صَلِّ هَا هُنَا ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ فَقَالَ: صَلِّ هَا هُنَا. ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ فَقَالَ : شَأْنَكَ إِذًا. زاد في واية:وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّداً بالْحَقِّ لَوْ صَلَّيْتَ هَا هنَا لأَجْزَأَ عَنْكَ صَلاَةً فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبيهقي والحاكم وصححه[٥].

**ڕۆژی گرتنی مەککە پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من فووتوو (نەزەر)م کردووە بۆ خودا ئەگەر تۆ بە پشتی خودا مەککەت گرت من دوو رکات نوێژ لە بەیتولمەقدیس بکەم. فەرمووی: لێرە ئەو نوێژە بکە بەڵام دیسان پیاوەکە پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە، ئەویش فەرموویەوە: لێرە واتە: لە مەسجیدولحەراما ئەو نوێژە بکە جا لە جاری سێهەما کە پیاوەکە هەمان پرسیاری لێ کردەوە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) کەواتە کەیفی خۆتە لە گێڕانەوەیەکا: ئەمەی زیاترە: بەو**

---

[٤] بخاری. نذر: ٦٦٩٥.

[٥] صحیح عند الحاکم.

کەسەی کە موحەممەدی رەوانە کردووە لەگەڵ ئایینی راستو دروستدا ئەگەر لێرە نوێژە (نەزرە)کەت بکەیت بڕێتیی ئەو نوێژەی بەیتولمەقدیست، دەکەوێ (د/بەیهەقی/حاکم:ص).

٢٥٢٥- وَأَتَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ. قَالَ : أَوْفِي بِنَذْرِكِ. قَالَتْ : إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا قَالَ : لِصَنَمٍ؟. قَالَتْ : لاَ. قَالَ : لِوَثَنٍ ؟. قَالَتْ : لاَ. قَالَ : أَوْفِي بِنَذْرِكِ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي بسندٍ صحيح[٦].

ئافرەتێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا!! من ئاه (نەذر= ئاد= فووتو= نەزر)م کردووە کە لە خزمەتتا دەف لێ بدەم. فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) ئاهەکەت بێنە جێ ژنەکە گوتی: ئاهیشم کردووە کە لە فیسارە شوێندا ئاژەڵێ سەربڕم. فەرمووی: بۆ بوت؟ گوتی: خەیر، فەرمووی: ئەی بۆ بت؟ گوتی: خەیر فەرمووی: دە ئاهەکەت جێبەجێ بکە (د/ت-س/ص).

## ١٣١) گێڕانەوە (قەزا)ی نەزری مردوو: (يقضى النذر عَنْ الميت)

٢٥٢٦- عنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُما) قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ الأَنْصَارِيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ قَبْلَ قَضَائِهِ. فقال رسول (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اقْضِهِ عَنْهَا. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەری پرسی (دروودی خودای لەسەربێ): دایکم نەزرێکی لەسەر بوو لە پێش ئەوەدا کە جێبەجێی بکا مرد؟ فەرمووی: دە بۆی بگێڕەرەوە (ش/د/ت/ن).

---

[٦] رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح.

[١] بخاری. أیمان ونذور: ٦٦٩٨، ٢٧٦٢، ٦٩٥٩. مسلم. نذر: ٤٢١١. أبو داوُد. أیمان ونذور: ٣٣٠٧. ترمذی. نذور: ١٥٤٦. نسائی. وصایا: ٣٦٦١، ٣٣٦٢، ٣٦٦٤، ٣٦٦٥، ٣٨٢٦، ٣٨٢٧.

٢٥٢٧- وَعَنْهُ أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ أُخْتِي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ وَقَدْ مَاتَتْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لَوْ كَانَ عَلَيْهَا دَيْنٌ أَكُنْتَ تَقْضِيهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَاقْضِ اللَّهَ فَهُوَ أَحَقُّ بِالقَضَاءِ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٢].

دیسان دەڵێ: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: خوشكم نەزری كردبوو كە حەج بكاو حەجی نەكردو مردیش؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): گریمان خوشكەكەت قەرزی خەڵكی لەسەر بێ دەیبژێریتەوە بۆی یانا؟ گوتی: بەڵێ دەیبژێرمەوە بۆی، فەرمووی: كەواتە قەرزی خودایش ببژێرەوە، چونكە دانەوەی قەرزی خودا لە دانەوەی قەرزی هەموو كەسێكی تر رەواترە (ب/ن).

٢٥٢٨- وَعَنْهُ أَنَّ امْرَأَةً رَكِبَتِ الْبَحْرَ فَنَذَرَتْ إِنْ نَجَّاهَا اللَّهُ أَنْ تَصُومَ شَهْرًا فَنَجَّاهَا اللَّهُ فَلَمْ تَصُمْ حَتَّى مَاتَتْ فَجَاءَتِ ابْنَتُهَا أَوْ أُخْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَمَرَهَا أَنْ تَصُومَ عَنْهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي. والله أعلى وأعلم[٣].

دیسان دەڵێ: جارێ ئافرەتێ سواری پاپۆڕ دەبێ ئاه دەكا ئەگەر خودا رزگاری بكا لەوەی‌و ئازاری دەریا یەك مانگ بە رۆژوبێ، جا خودا رزگاری دەكا، بەڵام دەمرێ‌و رۆژووەكە ناگرێ، جا كچێكی ئافرەتەكە (یا خوشكێكی) هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم باسەی لێی پرسی. فەرمووی: كە خۆی لەباتی ئەو بەرۆژوو بێ (د-سند صالح-ن).

## ١٣٢) نەزركردنی شتێ كە لە دەستی نەیێ دانامەزرێ، هەروەها گوناه نەزركردنیش : (لا نزر فيما لا يستطيع ولا نذر في معصية)

٢٥٢٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ : بَيْنَمَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَخْطُبُ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ فِي الشَّمْسِ فَسَأَلَ عَنْهُ فَقَالُوا : هَذَا أَبُو إِسْرَائِيلَ نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ

---

[٢] بخاری. نذر: ٦٦٩٩. مسلم. نذر: ٤٢١١.

[٣] بسند صالح (شرحه).

يَقْعُدَ وَلاَ يَسْتَظِلَّ وَلاَ يَتَكَلَّمَ وَيَصُومَ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مُرُوهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وتاری دەخوێند، پیاوێکی دی لەبەر هەتاوەکە راوەستابوو، پرسی: بۆچی ئەو پیاوە وا رەق راوەستاوە؟ عەرزیانکرد: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە، ئاھ (نەزر)ی کردووە کە بە پێوە لەبەر خۆر رەق راوەستێ و دانەنیشێ و نەچێتە بەر سێبەرو قسە نەکاو لە هەمان کاتدا بە رۆژووش بێ، فەرمووی: فەرمانی پێ بکەو لە زمانی منەوە پێی بڵێ: کە قسەبکاو بچێتە بن سێبەرو دابنیشێ بەڵام رۆژووەکەی تەواو بکا (ش/د/ت/ن).

٢٥٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَدْرَكَ شَيْخًا يَمْشِي بَيْنَ ابْنَيْهِ يَتَوَكَّأُ عَلَيْهِمَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَاشَأْنُ هَذَا؟ قَالَ ابْنَاهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَانَ عَلَيْهِ نَذْرٌ الْمَشْيِ إِلَى بَيْتِ اللهِ. فَقَالَ: ارْكَبْ أَيُّهَا الشَّيْخُ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكَ وَعَنْ نَذْرِكَ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[2].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گەیشت بە پیرەمێردێ خۆی دابوو بەسەرشانی دوو کوڕی خۆیدا بەلارە لارە دەرۆیشت، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەمە بۆ وا دەکا؟ کوڕەکانی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! نەذری لەسەرە کە بەپێ بڕوا بۆ خانەی خودا، فەرمووی: ئەی ئیختیار! سواربەو بە سواری بڕۆ، خودا هەوەجێی بە تۆو بە نەذری تۆ نیە! (م/د/ت).

٢٥٣١- وَقَالَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهما) نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ حَافِيَةً وَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاسْتَفْتَيْتُهُ فَقَالَ لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[3].

---

[1] بخاری. نذر: ٦٧٠٤.

[2] مسلم. نذر: ٤٢٢٤.

[3] مسلم. نذر: ٤٢٢٦. بخاری. ابواب العمرة: ١٨٦٦. أبو داوُد. أيمان ونذور: ٣٢٩٩. نسائی. إيمان ونذور: ٣٨٢٣.

**عوقبەی كوڕی عامیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: خوشكم ئاد (نەزر)ی كردبوو كە بەپێی پەتی بڕوا بۆ خانەی خودا، وە گوتی: بەمن كە بۆ ئەمە پرسی بۆ بكەم لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **جا كاتێ لێیم پرسی فەرمووی: با بە پیادەییش و بە سواریش بڕوا** (م/د/ت/ن).

**٢٥٣٢- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللّٰهِ وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ العبدُ**رواه الخمسة قي حديث طويل[٤].

**عیمرانی كوڕی حوصەین** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: نەزری گوناه دانامەزرێ، شتێكیش كەماڵی بەندە نەبێ نەزری دانامەزرێ** (ش/د/ت/ن-خودایان لێ ڕازی بێ).

**٢٥٣٣- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **أَنَّ أَخَوَيْنِ كَانَ بَيْنَهُمَا مِيرَاثٌ فَسَأَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ الْقِسْمَةَ فَقَالَ : إنْ عُدْتَ تَسْأَلُنِي عَنِ الْقِسْمَةِ فَكُلُّ لِي فِي رِتَاجِ الْكَعْبَةِ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): **إِنَّ الْكَعْبَةَ غَنِيَّةٌ عَنْ مَالِكَ كَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ وَكَلِّمْ أَخَاكَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يَقُولُ : لاَ يَمِينَ عَلَيْكَ وَلاَ نَذْرَ فِي مَعْصِيَةِ الرَّبِّ وَلاَ فِي قَطِيعَةِ الرَّحِمِ وَلاَ فِيمَا لاَ تَمْلِكُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي**[٥].

**سەعیدی كوڕی موسەییب** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: دوو برا كەلەپوورێكیان لە نێواندا هەبوو، یەكێكیان بەوی تریانی گوت: با بەشی بكەین، ئەویش گوتی: ئەگەر جارێكی تر داوای ماڵ بەشكردنم لێ بكەی هەرچی ماڵم هەیە نەزری كاعبە بێ! عومەریش** (خودای لێ ڕازی بێ) **پێی گوت: كەعبە هەوەجێی بە ماڵی تۆ نیە، كەفارەتی سوێندەكەت بدەو قسە لەگەڵ براكەتا بكە، بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (دروودی خودای لێبێ): **سوێندت ناكەوێ، وە نەزری گوناهو نەزری بڕینی ڕشتەی خزمایەتی و نەزری شتێ كە هی تۆ نەبێ دانامەزرێن** (د-سند صالح-ن).

---

[٤] مسلم. نذر: ٤٢٢١. أبُو داوُد. أيمان ونذور: ٣٣١٦.

[٥] رَوَاهُ أبُو داوُدَ بسند صالح (شرحه).

٢٥٣٤- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَنْ نَذَرَ نَذْرًا لَمْ يُسَمِّهِ فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا فِي مَعْصِيَةٍ فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا لاَ يُطِيقُهُ فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا أَطَاقَهُ فَلْيَفِ بِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي. ولفظه: كَفَّارَةُ النَّذْرِ إِذَا لَمْ يُسَمَّ كَفَّارَةُ يَمِينٍ[٦].

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەس نەزرێ بکا بەلام ناوی نەباو ئەندازەکەی دیاری نەکا یاخود نەزر بکا کە گوناە بکا، یاخود نەزرێکی وا بکا کە لە توانایا نەبێ ئەوە لەم حاڵەتانەدا تەنیا کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەرو بەس، بەلام ئەگەر کەسێ نەزرێ بکا کە لە توانایا هەبێ ئەوە با جێبەجێی بکا (د- مرفوعاً وموقوفا على ابن عباس-ت:س/ص) گفتەی (ت): کەفارەت (برێتی)ی نەزر ئەگەر ناوی نەبرێ وەك کەفارەتی سوێندە.

٢٥٣٥- وللنسائي: النَّذْرُ نَذْرَانِ فَمَا كَانَ مِنْ نَذْرٍ فِي طَاعَةِ اللَّهِ فَذَلِكَ لِلَّهِ وَفِيهِ الْوَفَاءُ وَمَا كَانَ مِنْ نَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ فَذَلِكَ لِلشَّيْطَانِ وَلاَ وَفَاءَ فِيهِ وَيُكَفِّرُهُ مَا يُكَفِّرُ الْيَمِينَ[٧].

نەسائی (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نەزر دوو جۆرە، هەر نەزرێ بۆ فەرمانبەریی خودا بێ ئەوە بۆ خودایە، وە دەبێ جێبەجێ بکرێ، وە هەر نەزرێ بۆ نافەرمانی خودابێ ئەوە بۆ شەیتانە، ە نابێ جێ بەجێ بکرێ. وە کەفارەتەکەی وەك کەفارەتی سوێند وایە.

---

[٦] رَوَاهُ الترمذی بسند حسن (شرحه).

[٧] سکت عنه الشارح.

## ١٣٣) كەسێ هەرچی ماڵی هەیە بیكا بە خێرو نەزر تەنیا سێ یەكێكی دادەمەزرێ بە نەزر : (من نذر التصدق بماله إنعقد الثلث)

٢٥٣٦- عَنْ كَعْبِ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَالَ: إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَـالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. رَوَاهُ الشيخان وأبو داود والنسائي وزاد: فقلتُ: إِنِي أمسك سهمي الّذي بخيبر[1].

كەعبی كوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) گـوتـی: بەشێك بـێ لـە تەوبەكـەم كـە هەرچـی مـاڵم هەیـە لێـی دەربچمو بیكـەم بـە خێـر بۆ خـوداو بـۆ پێغەمبـەری خودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وا باشە بۆ خۆت كە هەندێ لـە ماڵەكەت بهێڵێتـەوە بـۆ خـۆت (ش/د/ن) نەسـائی (خودای لێ رازی بێ) ئەمـەی پـترە: منیش گوتم: دە ئەو پشكەم كە لە خەیبەرە ئەوە دەهێڵمەوە بۆ خۆم.

٢٥٣٧- وَعَنْهُ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّم) أَوْ أَبُو لُبَابَةَ أَوْ مَنْ شَاءَ اللَّـهُ : إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَهْجُرَ دَارَ قَوْمِي الَّتِي أَصَبْتُ فِيهَا الذَّنْبَ وَأَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي كُلِّهِ صَـدَقَةً. قَالَ : يُجْزِئُ عَنْكَ الثُّلُثُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد[2].

دیسانەوە گوتی: بۆ خۆم عەرزی پێغەمبەرم كرد (دروودی خودای لەسەربێ) یـا گوتی: ئەبو لوبابە عەرزی كرد، یا گـوتی یـەكێكی تـر عـەرزیكرد:- بەشـێ بـێ لـە تەوبەكـەم كـە وڵاتـی هۆزەكـەم بـەجێ بێڵمو لـەو خاكـەی كـە ئـەو گوناهـەم لـەوێ تـووش بـووە رەو بكـەم، وە هەرچـی مـاڵم هەیـە لێـی دەرچمو بیكـەم بـە خێر. فەرمووی: سێیەكێكی برێتیی ئەوە دەكەوێ بۆت (د/ئەحمەد).

---

[1] بخاري. مغازي: ٤٤١٨، ٢٧٥٧، ٢٩٤٧، ٢٩٤٩، ٢٩٥٠، ٣٠٨٨، ٣٥٥٦، ٣٨٨٩، ٣٩٥١، ٤٦٧٣، ٤٦٧٦، ٤٦٧٧، ٤٦٧٨، ٦٢٥٥، ٦٦٩٠، ٧٢٢٥. مسلم. توبة: ٦٩٤٧.

[2] سكت عنه.

ولفظَ أَحْمَدُ على ماهو في الشرح: أَنَّ أَبَا لُبَابَةَ بْنَ عَبْدِ الْمُنذِرِ لَمَا تـابَ اللهُ عَلَيْـهِ قَالَ: يا رَسُولُ اللَّهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَهْجُرَ دَارَ قَوْمِي وأُسَـاكِنَكَ وَأَنْ أَنْخَلِـعَ مِـنْ مَـالِي صَدَقَةً لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلِرَسُولِهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): يُجْزِئُ عَنْكَ الثُّلُثُ.

**گفتـەی ئەحمـەد ئاوایـە: كـە خـودا تەوبـەی لـە ئەبولوبابـەی كـوڕی عەبدولمونزیر گیراكرد گوتی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): بەشـێ بـێ لـە تەوبەكەم كە لە ولآتی هۆزەكەم كۆچ بكەم‌و بێم لە خزمەتی تۆدا جێنشین ببم، وە لە هەرچی ماڵیشم هەیە دەربچم‌و بیكەم بە خێر بۆ خودای مەزن‌و گەورەو بۆ پێغەمبەری خودا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سـێیەكێكی بەست دەكا.**

٢٥٣٨- وَعَنْهُ قَالَ: إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي إِلَى اللَّهِ أَنْ أَخْرُجَ مِنْ مَالِي كُلِّهِ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ صَدَقَةً. قَالَ : لاَ. قُلْتُ : فَنِصْفَهُ؟ قَالَ : لاَ. قُلْتُ : فَثُلُثَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ : فَإِنِّي سَأُمْسِكُ سَهْمِي مِنْ خَيْبَرَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. نَسْأَلُ اللهَ التوفيقَ لما يحب ويرضى آمين[٣].

**دیسان گوتی: عەرزی پێغەمبەرم كرد (دروودی خودای لەسەربێ): بەشێك بێ لە تەوبەكـەم كـە لـە هەرچـی مـاڵم هەیـە دەربـچم‌و بیكـەم بـە خێـر بـۆ خـودا، فـەرمووی: هـەمووی نابێ گـوتم: دەنیـوەی؟ فـەرمووی: نیوەیـشی نابێ گـوتم: دەسـێیەكی؟ فـەرمووی: باشـە سـێیەكی دەبـێ گـوتم: دە ئـەو پـشكەم كـە لـە خەیبەرە ئەوە دەهێڵمەوە بۆ خۆم (د).**

## ١٣٤) دروستە لە سوێندو لە نەزر پەشیمان ببێتەوە، بەڵام دەبێ كەفارەتی بدات : (يجوز الرجوع في اليمين والنذر وعليه الكفارة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّـةَ أَيْمَـانِكُمْ وَاللَّـهُ مَوْلَـاكُمْ وَهُـوَ الْعَلِـيمُ الْحَكِيمُ – ٦٦/٢}.

---

[٣] سكت عنه الشارح.

خــودای گــەورە فەرموويــەتی بــە راســتی خــودا كردنــەوەی گرێــی سوێندەكانتانی بۆ داناون، واتە ئەوڕێیەی كە بە سوێند لە خۆتانی ببەستن بـە كـەفارەت دەتـوانن بیكەنـەوە، وە خـودای گـەورە كارسـازی ئێوەیـەو زانـاو دانایە.

٢٥٣٩- عنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ، فَوَافَقْتُهُ وَهْوَ غَضْبَانُ فَاسْتَحْمَلْنَاهُ فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ، وَتَحَلَّلْتُهَا. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئـەبوو مووسـا (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: دەسـتـەیەكی ئەشـعەری بـووین، چـووینە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) داوامـان لێیكـرد كـە وڵاخـی سواریمان بداتێ، وا ڕێكەوت لەوكاتەدا تووڕە بوو، بۆیـە سوێندی خـوارد كـە وڵاخمان نەداتێ. بەڵام لەوە دوا فەرمووی: بەخودا (خـودا یاربـێ) مـن سـوێند لەسەر هەرچی بخۆم وە لەپاشا بۆم دەربكەوێ بە بارێكی تردا باشترە، چـی باش بێ ئەوە دەكەمو كەفارەتی سوێندەكەم دەدەم (ش/د/ت/ن).

٢٥٤٠- ولمسلم: أَعْتَمَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ فَوَجَدَ الصِّبْيَةَ قَدْ نَامُوا فَأَتَاهُ أَهْلُهُ بِطَعَامِهِ فَحَلَفَ لاَ يَأْكُلُ مِنْ أَجْلِ صِبْيَتِهِ ثُمَّ بَدَا لَهُ فَأَكَلَ فَـأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيَأْتِهَا وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ[2].

موسـلیم (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتـەوە: جارێ پیـاوێ تـا تاریك دایـێ لـە خزمەتی پێغەمبەردا دەبێ، كە دەچێتەوە بۆ ماڵەوە دەڕوانێ مناڵـەكانی بـەبێ شێو سەریان ناوەتەوەو نووستوون، جا خێزانەكـەی نـانی بـۆ دێنـێ، ئـەویش

---

[1] بخاری. أيمان ونـذور: ٦٧١٨، ٦٦٢٣. مـسلم. أيمـان: ٤٢٣٩. أبـو داود. أيمـان ونـذور: ٣٢٧٦. نـسائی. أيمان ونذور: ٣٧٨٩.

[2] تقدم برقم: ٢٣٦٩/١. تسلسل/ ١٠٣ مجلد/٣.

لەبەر ئەوەی کە منداڵەکانی بەبێ شێو سەریان ناوەتەوە سوێند دەخوا کە نانەکە نەخوا، لەپاشا رای دەگۆڕێو نانەکە دەخوا، جا دەچێ بۆ لای پێغەمبەرو ئەمە باس دەکا بۆی، ئەویش (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ سوێندی خوارد لەسەر شتێو لەپاشا بۆی دەرکەوت کە بە بارێکی تردا باشترە با سوێندەکەی بخاتو چاکەکە بکات وە کەفارەت (برێتی)ی سوێندەکەی بدات.

٢٥٤١- ولمسلم والنسائي: وَإِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، إِلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي، وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ[٣].

موسلیمو نەسائی (رەزای خودای گەورەیان لێبێ) دەگێڕنەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: بەخوا من بەش بە حاڵی خۆم، خودا یاربێ لەسەر هەر شتێ سوێند بخۆمو لەپاشا بەبارێکی تردا بە باشتری بزانم سوێندەکەم دەخەمو ئەوە دەکەم کە بە باشتری دەزانمو کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم.

٢٥٤٢- ولمسلم والترمذي وأبي داود: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَفْعَلْ (أي ماظهر له أنّه خيرٌ)[٤].

موسلیمو تیرمیذیو ئەبو داوود (خودایان لێ رازی بێ) دەگێڕنەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ سوێندی خوارد لەسەرکردن یا نەکردنی شتێ، لەپاشا بۆی دەرکەوت کە بە بارێکی تردا چاکترە بابرێتی (کەفارەت)ی سوێندەکەی بداتو چاکەکە بکات.

٢٥٤٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٥].

---

[٣] مسلم. أيمان: ٤٢٣٩. راجع: ٢٥٠٢/١.

[٤] مسلم. ايمان: ٤٢٤٨. ترمذی. نذور أيمان: ١٥٣٠.

[٥] مسلم. نذر: ٤٢٢٩. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٣٢٣، ٣٣٢٤. ترمذی. نذور: ١٥٢٨.

**عوقبەی کوڕی عامیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کەفارەتی نەزریش وەك کەفارەتی سوێند وایە (م/د/ت/ن).**

## ١٣٥) دوا وتار: دیاریکردنی ئەندازەی بریتی (کەفارەت)ی سوێندو نەزر
## خاتمة في بيان كفارة اليمين والنذر

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ – ٥/٨٩}.**

**خودا ناتانگرێو سزاتان نادا بەو سوێندانە کە بەبێ مەبەست دێن بەسەر دەمتانا، بەڵام موحاسەبەتان دەکا لەسەر ئەو سوێندانە کە لەکانی دڵتانەوە دەردەچنو بەدڵ دایان دەمەزرێنن، جا کەفارەتی شکاندنی سوێندی بە دڵ دامەزراو ئەوەیە: کە خواردەمەنی دەهەژار بدەن، لە میانەی ئەو خواردەمەنییە کە دەیدەن بە ژنو منداڵی خۆتان یا بەرگو پۆشاکی دەهەژار بدەن لە میانەی ئەو بەرگو پۆشاکە کە دەیکەن بۆ خێزانی خۆتان، وە یاخود بەندەیێ ئازاد بکەن، جا ئەگەر یەکێ لەو سوێند کەوتوانە ئەوانەی دەس نەکەوت ئەوە پێویستە ڕۆژووی سێ ڕۆژ بگرێ بە نیازی بریتیی سوێندی کەوتوو، ئەوەی ڕوونمان کردەوە بۆتان کەفارەتی سوێندی کەوتووی ئێوەیە لەپاش سوێند خواردن، وە سوێندی خۆتان ئاگاداریی بکەن، لە شتی گرنگو بەنرخدا نەبێ سوێند مەخۆنو کە سوێندتان خوارد لەسەر شتێ" مەیشکێنن مەگەر بۆ ناچاریی، ئاوا خودای مەزن ئایەتەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە بۆتان، کە لەبارەی فەرمانەکانی شەریعەتو ئەحکامی دینی خوداوەن، هیوام وایە کە ئێوەش سوپاسی ئەم نیعمەتە گەورەیە بکەنو فێری ئەم ئایەتانە بننو ڕەفتاریان پێ بکەن.**

٢٥٤٤- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُدًّا وَثُلُثًا بِمُدِّكُمُ الْيَوْمَ فَزِيدَ فِيهِ فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[1].

سائیبی كوڕی یەزید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە سەرینیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مەن (صاع) موودێك و[1] سێیەكی موودێك بوو بە (موود)ی ئەمڕۆكەی ئێوە، جا لەسەردەمی عومەری كوڕی عەبدولعەزیزدا لێی زیادكرا (ب/ن).

٢٥٤٥- قَالَ نَافِعٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي زَكَاةَ رَمَضَانَ بِمُدِّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمُدِّ الأَوَّلِ، وَفِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ بِمُدِّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ البخاري[2].

نافیع (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) سەرفیطرەی رەمەزانی بە موودی پێشوو دەدا، كە موودی پێغەمبەر بوو، وە برێتی (كەفارەت)ی سوێندیشی هەر بە موودی پێغەمبەر دەدا (ب).

٢٥٤٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيُّمَا امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا كَانَ فَكَاكَهُ مِنَ النَّارِ يُجْزِئُ كُلُّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ وَأَيُّمَا امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ امْرَأَتَيْنِ مُسْلِمَتَيْنِ كَانَتَا فَكَاكَهُ مِنَ النَّارِ يُجْزِئُ كُلُّ عُضْوٍ مِنْهُمَا عُضْوًا مِنْهُ وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ مُسْلِمَةٍ أَعْتَقَتِ امْرَأَةً مُسْلِمَةً كَانَتْ فَكَاكَهَا مِنَ النَّارِ يُجْزِئُ كُلُّ عُضْوٍ مِنْهَا عُضْوًا مِنْهَا. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[3].

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوێكی موسوڵمان پیاوێكی موسوڵمان ئازاد بكا خۆشی لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەبێ، بەم شێوەیە لە جیاتیی هەر ئەندامێكی

---

[1] بخاری. كفارات الأيمان: ٦٧١٢.

[1] موود ئامێرێكی پێوانەیە لەشێوەی كەللە شەكر، لای سەرەوەی پانەو لای خوارەوەی تەسكە.

[2] بخاری. كفارة الأيمان: ٦٧١٣.

[3] رواه الترمذی بسند صحيح (شرحه).

ئازادکراوەکە ئەندامێکی ئازادکەرەکە لە ئاگر ئازاد دەبێ، وە هەر پیاوێکی موسوڵمان دوو ژنی موسوڵمان ئازاد بکا خۆشی لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەبێ بەم رەنگە لەباتی هەر ئەندامێکی ئەوان ئەندامێکی ئەم لە ئاگر ئازاد دەبێ، وەهەر ژنێکی موسوڵمان ژنێکی موسوڵمان ئازاد بکا خۆشی لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەبێ: بەم شێوەیە لە جیاتیی هەر ئەندامێکی ئەو ئەندامێکی ئەم لە ئاگر ئازاد دەبێ (ت-س/ص-د).

٢٥٤٧- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ لِي جَارِيَةٌ صَكَكْتُهَا صَكَّةً. فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَيَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقُلْتُ: أَفَلاَ أُعْتِقُهَا؟ قَالَ: ائْتِنِي بِهَا. قَالَ: فَجِئْتُ بِهَا قَالَ: أَيْنَ اللّٰهُ؟ قَالَتْ : فِي السَّمَاءِ. قَالَ : مَنْ أَنَا؟ قَالَتْ : أَنْتَ رَسُولُ اللّٰهِ. قَالَ : أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذى ومسلم[٤].

موعاوییەی کوڕی حەکەم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عەرزی حەزرەتم کرد (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی پێغەمبەری خودا! کەنیزەکێکم هەیە شەپازللەیەکم لێدا. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زۆری لەبەرگران بوو کە من شتی وا ناشایستەم کردووە، منیش عەرزیم کرد: کە وای لێهات بۆ ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: بیهێنە بۆم جا کە بردم بۆی، پێی فەرموو: خودا لە کوێیە؟ گوتی: لە ئاسمانە، فەرمووی: ئەی من کێم؟ گوتی: تۆ پێغەمبەری خودای، فەرمووی: ئازادی بکە، چونکە ئەمە موسوڵمانە (د/ت/م).

٢٥٤٨- وَجَاءَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِجَارِيَةٍ سَوْدَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ عَلَيَّ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً. فَقَالَ لَهَا : أَيْنَ اللّٰهُ؟ فَأَشَارَتْ إِلَى السَّمَاءِ بِأُصْبُعِهَا. فَقَالَ لَهَا : فَمَنْ أَنَا؟ فَأَشَارَتْ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَإِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ: أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد. نَسْأَلُ الله التوفيقَ، والله أعلم[٥].

---

[٤] مسلم. أيمان: ٤٢٧٧. أبُو دَاوُدَ. أدب: ٥١٦٦، ٥١٦٧. ترمذى. نذور وأيمان: ١٥٤٢.

[٥] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

پیاوێ کەنیزەکێکی ڕەشی هێنا بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! من لەسەرمە کە کەسێکی موسوڵمان ئازاد بکەم ئایا ئەمە ئازاد بکەم دەبێ یانا؟ جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: خودا لە کوێیە؟ کەنیزەکەکە پەنجەی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و بە ئیشارەت گوتی: خودا لە ئاسمانە ئینجا پێی فەرموو: ئەی من کێم؟ ئەویش ئیشارەتیکرد بۆ پێغەمبەرو ئینجا ئیشارەتیکرد بۆ ئاسمان واتە: تۆیش پێغەمبەری خودای جا فەرمووی: ئەمە موسوڵمانە ئازادی بکە (د–سند صالح– ئەحمەد).

لە خودای گەورەو سەروەر داوا دەکەین کە سڕمان بپۆشێ و کارمان بسازێنێ، وە هەرخودا بۆ خۆی گەلێ باش لە هەموو شتێ دەزانێ[1].

---

[1] نمێ لە دەریای رەحمەتی بێ پەی

لە پیاڵەی دڵم بە شاباش تێ کەی

دڵ دەبێ بە گوڵ دەم دەکاتەوە

بێ پەروا دەدڕێ پۆرگی خونچەکەی

جا ئازاد دەبێ لە دیلیی تاوان

دەبێ بە دەروێش دەسگیری قورئان

کەنارە دەگرێ لە کۆڕی شەیتان

دەبێ بە پەریی دەچێ بۆ ئاسمان

قومێ لە بادەی خوایی بنۆشی

هەتاکوو دەمری مەستی سەرخۆشی

بێ نیاز دەبی لە غەیری یەزدان

دنیاو چی تیایە بە پووش دەفرۆشی

ئای بۆ شا پیاوێ کە مەنکێشمان کا!

نەڵقەی بەندەیی لەلا گۆشمان کا

وە لە كۆتایی پاكنووس (موبیەضضە)كەیدا لەكاتی خۆیدا ئەم تێبینییەم بەبێ زیادو كەم نووسیوە، لە سایەی خوداوەجزمی سێیەم تەوا بوو، لە تەواوی سەعات هەشتو نیوی سەرلەبەیانی رۆژی (١٩٨٣/١٢/١٨) لە هۆدەكەی خۆما لە نەخۆشخانەی سەربازیی كەركووك لە شاری كەركووكی خۆشەویست. خودا بیپارێزێ لە دەردو بەڵاو چاوێنی.

ئێستاكەیش كە بە دەستی خۆم لە نووسینی جاری سێیەمی ئەم بەرگە دەبمەوە، كە ئەم جارەیان مەتنی حەدیسەكانیشم بە عەرەبی لەپێش تەرجەمە كوردییەكەوە نووسیوەتەوە لێرانەدا دەڵێم:

بە یارمەتی خودای گەورەو میهرەبان بەرگی سێیەمی تاجول ئوصول تەواو بوو، لە رۆژی (١٤٠٨/٧/٥ك بە رێكەوتی ١٩٨٨/٢/٢٣ز) لە هۆدەكەی خۆما لە نەخۆشخانەی سەربازیی كەركووك، لەشاری كەركووكی نازدارو خۆشەویست، خودا بیپارێزێ لە دەردو بەڵاو چاوێنیو چەپۆڵەی زاڵم. ئامین.

---

قوتارمـــان بكـــا لـــە بـــیری جیهـــان

لـە ناسـتانەی خـۆی زوو تووڵكیـێشمان كـا

١٩٨٨/٦/٥ – وەرگێڕ–

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی نەچیرو کوشتنو سەربڕاوەکان

## (چوار بەشو پاشە بەشێکە)

## ١) بەشی یەکەم: ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان دەخورێ:

## كتاب الصيد والذبائح (وفيه أربعة فصول وخاتمة)

## الفصل الأول: فيما يؤكل من الحيوان

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ – ٥/١}.

واتە: خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ئەی کەسانێ کە خاوەن باوەڕو ئیمانن! هەموو ئادو پەیمان بەستن (عەقد)ێکی خۆتان ببەنە سەر، حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە خواردنی گۆشتی ئاژاڵ، تەنیا هی ئەو گیانلەبەرانە نەبێ کە لە ئایەتی دواییدا باس دەکرێن بۆتان.

٢٥٤٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ دَجَاجًا. رواه البخاری والترمذي وَالنسائی[1].

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) گۆشتی مریشکی دەخوارد (ب/ت/ن).

٢٥٥٠- عَنْ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَوْ سِتًّا ، كُنَّا نَأْكُلُ مَعَهُ الْجَرَادَ[2].

ئیبنو ئەبو ئەوفا (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەوت غەزا – یا شەش غەزا – مان کرد لەگەڵ پێغەمبەر خۆی دا (دروودی خودای لەسەربێ) لەو غەزایانەدا لەگەڵ پێغەمبەردا کوللەمان دەخوارد (ش/د/ت/ن).

---

[1] بخاري: ذبائح وصيد: ٥٥١٧ ، ٣١٣٣ ، ٤٣٨٥ ، ٤٤١٥ ، ٥٥١٢ ، ٥٥١٨ ، ٦٦٢٣ ، ٦٦٤٩ ، ٦٦٧٨ ، ٦٦٨٠ ، ٦٧١٨ ، ٣٧١٩ ، ٦٧٢١ ، ٧٥٥٥ (تجريد/ ١٨٣٤ = بەرگی/ ٥ ل/١٣١ فتح/ ٥٥١٧.

[2] بخاري. ذبائح وصيد: ٥٤٩٥. مسلم. صيد ذبائح: ١٩٥٢ ، ٥٠١٩.

**٢٥٥١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا وَنَحْنُ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ ، فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغَبُوا ، فَأَخَذْتُهَا فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا ، فَبَعَثَ بِوَرِكَيْهَا – أَوْ قَالَ بِفَخِذَيْهَا – إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَبِلَهَا[٣].**

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە مەڕو ظەهران کەروێشکێکمان هەڵسان، پیاو گەل نیشتنە سەری تا ماندوو بوون بەڵام من نیشتمە سەری تا گرتم، ئینجا بردم بۆ ئەبو طەلحە، ئەبو طەلحە سەری بڕی و هەردوو سمتەکەی نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) – یا گوتی: هەردوو رانەکەی نارد بۆی – پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) وەری گرت[١] (ش/د/ت/ن).**

---

[٣] بخاري. هبة: ٢٥٧٢ ، ٥٤٨٩ ، ٥٥٣٥. مسلم. صيد وذبائح: ٥٠٢٢ أبو داود. أطعمه: ٣٧٩١. ترمذى. أطعمه: ١٧٨٩. نسائى. صيد: ٤٣٢٢.

[١] ئای دنیا صەلاحی کوڕم و کەژاڵی کچم منالّ بوون، ماڵمان لە ئازادی کەرکووك بوو، بۆ بێ تاقەتی دەچووینە لاشار، جاروباریش بۆ راوە سوێسکە دەچووین، ماوەیەکی زۆر چووین بەڵام یەك سوێسکەمان گرت. جارێ کاتی دروێنەی جۆ بوو، عەشاماتێکی زۆر لەو لاشارە بوون، کوڕوکاڵ بەچکە کەروێشکێکی سەگ پسێنکەیان هەڵسان، لای چۆڵییان لێ بڕییەوەو بەرەو ئێمە چنگ لەسەرشان هێنایان! منیش نیشتمە سەری و گرتم. ئێستاکە خەم و خەفەت ئەژنۆی شکاندووم و خۆم بووم بە نەچیری دەردو مەینەت، کیسەڵێ بنیشێتە سەرم دەمگرێتەوە، رەنگ بێ سەریشم ببڕێ – وەك کەروێشکەکەی ئیمامی ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) کەس نەڵێ بە کەسێکم: خۆت خۆش! پەروەردگار! خۆت دەزانی دڵم زامارە، ئەو شەطەحاتەم لێ نەگری کە لەتاو ئازاری دەردی خۆم گوتوومە:

هەق و کوردبیری و دیناری هەرسێ

نەبن بە باری شانی هیچ کەسێ!

هەق جاران تاڵ بوو ئێستاکە شۆڕە

پارێز گەرەکە گەر زەغتت زۆرە!

١٦ی رەمەزان ١٤٠٨ – ١٩٨٨/٥/٣

م/ك/ع. وەرگێڕ

٢٥٥٢- عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْتَ مَيْمُونَةَ فَأُتِيَ بِضَبٍّ مَحْنُوذٍ ، فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ فَقَالَ: بَعْضُ النِّسْوَةِ أَخْبِرُوا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا يُرِيدُ أَنْ يَأْكُلَ. فَقَالُوا: هُوَ ضَبٌّ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَرَفَعَ يَدَهُ ، فَقُلْتُ: أَحَرَامٌ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: لاَ، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ. قَالَ: خَالِدٌ فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْظُرُ[٤].

**خالیدی کوڕی وەلید** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا** (درودی خودای لەسەربێ) **چووین بۆ ماڵی مەیموونە کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، وە پووری من‌و ئیبنو عەبباس بوو بزنمژەیەکی برژاویان دانا بۆی، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەستی درێژکرد بۆی، ئافرەتێ گوتی: عەرزی پێغەمبەر بکەن کە ئەوە چییە کەوا خەریکە دەیخوا. ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بزنمژەیە، ئیتر پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەستی کێشایەوە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا بزنمژە حەرامە؟ فەرمووی: نەء حەرام نییە، بەڵام لە وڵاتی ئێمە نییە، لەبەر ئەوە دەبینم دڵم نایبات، خالید گوتی: جا من رام کێشا بۆ لای خۆم‌و لەبەر چاوی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەستم کرد بەخواردنی (ش/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).**

٢٥٥٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ وَأَذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ. روى هذه الأربعة الأصول الخمسة[٥].

---

[٤] بخاري. أطعمة: ٥٣٩١ ، ٥٤٠٠ ، ٥٥٣٧. مسلم. صيد وذبائح: ٥٠٠٩ ، ٥٠٠٨. أبو داود. أطعمة: ٣٧٩٤. نسائي. صيد وذبائح: ٤٣٢٧ ، ٤٣٢٨. ابن ماجه: صيد: ٣٢٤١.

[٥] بخاري. ذبائح: ٥٥١٠ ، ٥٥١١ ، ٥٥١٢ ، ٥٥١٦. مسلم. صيد وذبائح: ٤٩٩٧ ، ٤٩٨١ – ٤٩٩٦. نسائي. صيد ٤٣٣٨ ، ٤٣٥٠ ، ٤٣٤٩. أبو داود. أطعمة: ٣٧٨٨ ، ٣٨٠٨. ترمذى. أطعمة: ١٧٩٣.

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژی غەزای خەیبەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەوگیری کرد لە خواردنی گۆشتی کەری ماڵی، وەرێگەی خواردنی گۆشتی ماین‌و ئەسپی دا (ش/د/ت/ن–خودایان لێ ڕازی بێ).

٢٥٥٤– عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ نَحَرْنَا فَرَسًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَكَلْنَاهُ[٦].

ئەسماء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەدینە ئەسپێکمان سەربڕی‌و خواردمان (ش.خودایان لێ ڕازی بێ).

٢٥٥٥– عَنِ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ أَصَابَ حِمَارًا وَحْشِيًّا وَهُوَ حَلَالٌ فَأَتَى بِهِ أَصْحَابَهُ وَهُمْ مُحْرِمُونَ مِنْهُ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: لَوْ سَأَلْنَا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْهُ. فَسَأَلْنَاهُ فَقَالَ: قَدْ أَحْسَنْتُمْ. فَقَالَ: لَنَا « هَلْ مَعَكُمْ مِنْهُ شَيْءٌ؟ ». قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ: « فَاهْدُوا لَنَا ». فَأَتَيْنَاهُ مِنْهُ فَأَكَلَ مِنْهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ. رواه النسائي والبخاري[٧].

ئەبو قەتادە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) کەوتینە ڕێ، لە ڕێگە هاوڕێکانی ئیحرامی عەمرەیان دابەست لە ڕێگە من کەرەکێوییەکم کوشت، بەڵام من لە ئیحرامدا نەبووم جا بردم بۆ هاوڕێکانم – کە ئەوان لە ئیحرامدا بوون – هاوڕێکانم لێیان خوارد هەندێ کەسیان گوتیان: بۆ لەبارەی ئەمەوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەپرسین، جا کەلێمان پرسی فەرمووی: ئافەرین بۆ خۆتان، ئایا هیچی لێ ماوە لە لاتان؟ گوتمان: ئا، فەرمووی: دە بە دیاری بەشمان بدەن جا هەندێکیان لە گۆشتەکەی بۆیبرد، ئەویش لێی خوارد، لەوکاتەدا پێغەمبەر لە ئیحرامیشدا بوو (ن/ب).

---

[٦] بخاري. ذبائح: ٥٥١٠ ، ٥٥١١ ، ٥٥١٢ ، ٥٥١٩. مسلم. صيد وذبائح: ٤٩٩٩ ، ٥٠٠٠ + تجريد/ ٥ ل – ١٢٥ ژ: ١٨٣٢

[٧] بخاري. ذبائح: ٥٤٩٠ ، ٥٤٩١.

٢٥٥٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الضَّبُعِ، فَقَالَ: هُوَ صَيْدٌ وَفِيهِ كَبْشٌ إِذَا صَادَهُ الْمُحْرِمُ. رواه أصحاب السنن[٨]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە بارەی خواردنی گۆشتی کەمتیارەوە پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەمتیاریش دادەنرێ بە نەچیر کەوابوو گۆشتی دەخورێ ئەو کەسەشی کە لە ئیحرامدا بێ‌و ڕاوی کەمتیار بکاو بی کوژێ بەرانێکی تۆڵەی نەچیر: (فیدیە)ی دەکەوێتە سەر (د/ت/ن-س/ص).

٢٥٥٧- عَنْ بْنِ سَفِينَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَكَلْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَحْمَ حُبَارَى. رواه أبو داود والترمذي[٩]:

عەمری کوڕی سەفینە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەربێ) گۆشتی چێرگم خواردووە (د/ت-سند غریب).

٢٥٥٨- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ إِنْسَانٍ قَتَلَ عُصْفُورًا فَمَا فَوْقَهَا بِغَيْرِ حَقِّهَا إِلاَّ سَأَلَهُ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهَا». قِيلَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَمَا حَقُّهَا قَالَ: يَذْبَحُهَا فَيَأْكُلُهَا وَلاَ يَقْطَعُ رَأْسَهَا يَرْمِي بِهَا. رواه النسائي والشافعي والحاكم[١٠]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لە چۆلەکەیەکەوە بیگرە تا زیاتر بە ناڕەوا بکوژێ خودای گەورە موحاسەبەی دەکا لەسەری، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! بە ناڕەوا چۆن چۆنییە؟ فەرمووی: سەری ببڕێ‌و بیخوات، نەك سەری هەڵپچوڕقێنێ‌و فڕێی بدات! (ن/ش/ح).

---

[٨] بسند صحیح (شرحه).

[٩] بسند غریب (شرحه).

[١٠] سکت عنه الشارح ولم یبین درجته (مترجم).

٢٥٥٩- وَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ السَّمْنِ وَالْجُبْنِ وَالْفِرَاءِ. (أى حِمَارُ الوحش) فَقَالَ: الْحَلاَلُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ[١١]:

**بۆ خواردنی رۆن‌و پەنیرو کەرەکێوی لە پێغەمبەر پرسیارکرا ئەویش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەڵاڵ ئەوەیە کە خودا لە قوئانا (کە نامەی خۆیەتی) بە حەلاڵی داناوە، وە حەرام ئەوەیە کە خودا لە نامەی خۆیا کە قورئانە بە حەرامی داناوە، وە ئەوەشی کە باسی نەکردووە ئەوە لەو شتانەیە کە چاوپۆشی لێ کردووەو حەلاڵە (ت/د/حاکم).**

٢٥٦٠- وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَأْكُلُونَ أَشْيَاءَ وَيَتْرُكُونَ أَشْيَاءَ تَقَذُّرًا فَبَعَثَ اللَّهُ نَبِيَّهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنْزَلَ كِتَابَهُ وَأَحَلَّ حَلاَلَهُ وَحَرَّمَ حَرَامَهُ فَمَا أَحَلَّ فَهُوَ حَلاَلٌ وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَفْوٌ وَتَلاَ (قُلْ لاَ أَجِدُ فِيمَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا) عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ. رواهما الترمذي وأبو داود والحاكم[١٢]:

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران خەڵکی سەردەمی نەزانی گەلێ شتیان دەخواردو گەلێ شتی تریشیان نەدەخواردو قیزو بێزیان لێ دەکردنەوە، تا خودا پێغەمبەری خۆی رەوانەکردو قورئانی بۆ ناردە خوارەوە، وە حەلاڵ‌و حەرامی دانا، ئیتر هەرچی خودا بە حەلاڵی داناوە ئەوە حەلاڵە، وەهەرچی خودا بە حەرامی داناوە ئەوە حەرامە وە هەرچیش خودا ناوی نەبردووە ئەوە چاوپۆشی لێ کراوەو حەلاڵە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

---

[١١] صححه الحاكم (شرحه).

[١٢] صحيح عند الحاكم (شرحه).

{قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ – ٦/١٤٥}.

واتە: جاتۆ (ئەی پێغەمبەر!) جاڕ بدەو بڵێ: من لەو سرووشەدا کە لە خوداوە بۆم دێ نابینم کە شتێ حەرام بێ لەسە خۆراك خۆرێ، مەگەر ئەو شتە مردارەوە بوو بێ، یا خوێنێکی رژاو بێ، یا گۆشتی بەراز بێ، چونکی بەراستی ئەوە پیسە، یاخود گیانلەبەرێکی سەربڕاوی دوور لە یاسای ئیسلام بێ، بەم رەنگە لەکاتی سەربڕینیا ناوی غەیری خودای لەسەر برابێ (ت/د/حاکم- خودایان لێ رازی بێ).

## ٢) گیانلەبەری ئاویش دەخورێ وە مردارەوە بوویشی دەخورێ: ومنه حیوان البحر ومیتته

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ – ٥/٩٦}.

واتە: خودای مەزن دەفەرموێ: حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە نەچیری دەریاو خواردمەنی دەریا، تا ببێ بە خۆشی‌و لەززەت بۆ ئێوە، خواه لە ماڵەوە بن‌و نیشتەجێ بن یا رێبوارو کاروانی بن، وە خواه لە ئیحرام دا بن یا لە ئیحرام دا نەبن.

٢٥٦١- عَن جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَمِائَةِ رَاكِبٍ وَأَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ نَرْصُدُ عِيرًا لِقُرَيْشٍ فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الْخَبَطَ، فَسُمِّيَ جَيْشَ الْخَبَطِ وَأَلْقَى الْبَحْرُ حُوتًا يُقَالُ لَهُ الْعَنْبَرُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا بِوَدَكِهِ حَتَّى صَلَحَتْ أَجْسَامُنَا قَالَ: فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلاَعِهِ فَنَصَبَهُ فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ ، وَكَانَ فِينَا رَجُلٌ لَمَّا اشْتَدَّ الْجُوعُ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ ، ثُمَّ ثَلاَثَ جَزَائِرَ ، ثُمَّ نَهَاهُ أَبُو عُبَيْدَةَ. رواه الخمسة إلا الترمذي[1]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سێ سەد کەس بووین، ئەبو عوبەیدەی کوڕی حەرراح سەر لەشکرمان بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناردینی،

[1] بخاري. مغازی: ٤٣٦١ ، ٥٤٩٤. مسلم. صيد وذبائح: ٤٩٧٥ ، ٤٩٧٤ ، ٤٩٧٦ – ٤٩٨٠. نسائی. صيد: ٤٣٦٣.

منەی کاروانێکی قوڕەیشمان دەکرد، جا تووشی برسێتییەکی سەختی وابووین، کە لە تاوانا بەگەڵاکوتك گەڵا دارمان دەوەراندو دەمانخوارد! جا بۆیە ئەو سوپایەیان ناونا سوپای گەڵادار (جەیشولخەبەط) جا لەم کاتەدا دەریا نەهەنگێکی هەڵدایە دەرەوە، ناوی نەهەنگی ئاوی بوو، تاماوەی نیو مانگ لەو نەهەنگەمان دەخواردو خۆمان بە پیوەکەی چەور دەکرد،تا لەشمان باش بووەوە. گوتی: جا ئەبو عوبەیدە پەراسوویەکی لە پەراسووەکانی ئەو نەهەنگەی راست کردەوەو پەراسوویەکی تریشی بەرابەری راست کردەوەو نووکەکانی نووساندن بەیەکەوە لە چەشنی دوو لاشیپانەی دەروازە، جا ئەوەندە گەورەو بەرزبوو بە ئاسانی سواری وشتر بەژێریا دەڕۆیشت! پیاوێکمان تیابوو ئەوکاتەی کە برسێتی زۆری بۆ هێنایین سێ وشتری بۆمان سەربڕی، دیسانەوە سیانی تریشی سەربڕی، ئیتر ئەبو عوبەیدە نەیهێشت هی تر سەر ببڕێ (ش/د/ن–خودایان لێ رازی بێ).

٢٥٦٢– (ب – ١ ز – ٢١ ف – ١ ل – ١٠٢)(٢).

٢٥٦٣– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ. رواه ابن ماجه والحاكم وصححه(٣).

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دوو مرداروو دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراون، مردارەکان برێتین لە ماسیو لە کوللە، وە خوێنەکانیش برێتین لە جەرگو لە سپڵ (ئیبنو ماجە/ حاکم:ص).

---

(٢) تقدم برقم: ١٤٦/١ مجلد/ ١ تسلسل/٢١.

(٣) صحيح عند الحاكم (شرحه).

## ٣) بەشی دووەم: باسی ئەو گیانلەبەرانەی کە گۆشتیان ناخورێ:

## الفصل الثاني: فیما لا یؤکل من الحیوان

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ – ٥/٣}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: حەرام کراوە لەسەر ئێوە خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، وە خواردنی خوێنی ڕەوان، وە گۆشتی بەراز، وە خواردنی گۆشتی ئەو گیانلەبەرانەی کە لەکاتی سەبڕیندا ناوی غەیری خودایان لەسەر دێنن، وە خواردنی گۆشتی گیانلەبەری خنکاو، وە خواردنی گۆشتی گیانلەبەرێ کە لە ژێر لێداندا مردبێ، وە خواردنی گیانلەبەرێ کە هەڵدێرابێ، وە خواردنی گۆشتی گیانلەبەرێ کە لە شەڕە قۆچا مردبێ، وە خواردنی گۆشتی گیانلەبەرێ کە دڕندە لێی خواردبێ، مەگەر ئەوانەیان کەزوو فریایان بەکەون‌و لە پێش ئەوەدا کە گیانیان دەربچێ سەریان ببڕن، وە هەروەها حەرام کراوە لەسەرتان خواردنی گۆشتی ئەو گیاندارەی کە بۆ بتەکان سەربڕابێ.

٢٥٦٤– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْبَرَ أَصَبْنَا مِنَ الْقَرْيَةِ حُمُرًا فَطَبَخْنَاهَا فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلاَ إِنَّ اللّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْهَا فَإِنَّهَا رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَأُكْفِئَتِ الْقُدُورُ بِمَا فِيهَا وَإِنَّهَا لَتَفُورُ بِمَا فِيهَا. رواه الخمسة[١]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەو ڕۆژانە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) قەڵای خەیبەری گرت، چەند کەرێکمان دەست کەوت لە کەری گوندەکە، چێشتمان کرد لە گۆشتەکەیان، کەچی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جاڕی هەڵدا: ئاگاداربن! کە خوداو پێغەمبەری خودا ڕێگەی ئەوەتان

---

[١] بخاري. مغازی: ٤١٩٩ ، ٥٥٢٨. مسلم. صید وذبائح: ٤٩٩٥ ، ٤٩٩٦.

نـادەن کـە گۆشـتی گوێدرێـژ بخـۆن چـونکە ئـەوە پیـسەو شـەیتانە ئـیتر مەنجەڵەکانیان بە گۆشتەکەوە قلْپ کردەوە، هێشتا قوڵپە قوڵپیـان بـوو لەسـەر ئاگرەکە (ش/د/ت/ن).

٢٥٦٥- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ فَأَحِلُّوهُ وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِـنْ حَـرَامٍ فَحَرِّمُوهُ أَلاَ لاَ يَحِلُّ لَكُمُ الْحِمَارُ الأَهْلِيُّ وَلاَ كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ وَلاَ لُقَطَةُ مُعَاهِدٍ إِلاَّ أَنْ يَسْتَغْنِيَ عَنْهَا صَاحِبُهَا (وَلُقْطَةُ الْمُسْلِمِ كَذَلِكَ) وَمَنْ نَزَلَ بِقَوْمٍ فَعَلَيْهِمْ أَنْ يَقْرُوهُ فَإِنْ لَمْ يَقْرُوهُ فَلَهُ أَنْ يُعْقِبَهُمْ بِمِثْلِ قِرَاهُ (أي لـه أخـذ كفايتـه ولـو بـالقوة). رواه أبـو داود والترمذي[٢]:

میقـدامی کـوڕی مەعدیکەریبـە (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: ئاگـاداربن! کـە مـن هـەم قورئـانم پـێ دراوەو هـەم مانەنـدی قوئـانیش کـە برێتییـە لـە یاسـاو ئـاواو دەسـتووری، کـە ڕەووشـتی خۆمە. ئاگاداربن! کە هاکا پیاوی بێ ئاگـای وا پەیدا ببـێ بـە تێری‌و تەسـەلی لەسەر قەنەفە بەکەش‌و فشەوە پاڵی لێ بداتەوەو لە بـەرگێلی‌و نەشـارەزایی لـە ئـایین بـەهۆی سـك لەوەڕاندنـەوە بـە نـەزانی بڵـێ: قورئـان بگـرن‌و بـەس! جـا هەرچی لە قورئاندا حەڵاڵ کراوە ئەوە دابنێن بە حـەڵاڵ‌و هەرچـی لـە قورئانـدا حەرام کـراوە ئـەوە دابنـێن بـە حـەرام‌و ئـیتر هـەقتان بەسـەر سـوننەتەوە نـەبێ، بزانن کە قسەی وا زۆر پووچ‌و نابەجێیە. ئاگـاداربن! کـە گۆشـتی کـەری مـاڵی لە ئێوە حەرامە وە هەروەها هەر دڕندەیێ کە کەڵبەی هەبێ. وە هەروەها ماڵی دۆزراوەی پەیماندار (موعاهەد) واتـە: پـەیمان لەگـەڵ کـراو، لـە ئێـوە حەرامـە، مەگـــەر خاوەنەکـــەی بـــێ نیازبـــێ لێـــی، وە هـــەروەها مـــاڵی دۆزراوەی موسـوڵمانیش هـەمان حـوکمی هەیـە. وە هەرکەسـێ بـوو بـە میـوانی هـۆزێ

---

[٢] رواه أبو داود في لزوم السنة والترمذي بسند حسن (شرحه).

**پێویستە لەسەریان کە میوانداریی بۆ بکەن، ئەگینا ئەو کەسە خۆی بۆی هەیە کە بەقەد پێویستی خۆی بەشی میوانداریی خۆیان لێ بستێنێ (د/ت-س/ح).**

**٢٥٦٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ خَيْبَرَ عَنِ الْبِغَالِ وَالْحَمِيرِ وَلَمْ يَنْهَنَا عَنِ الْخَيْلِ. رواه أبو داود ومسلم[٣]:**

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە رۆژی غەزای خەیبەردا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **جڵەوگیریی لێ کردین لە خواردنی گۆشتی هێسترو گوێدرێژ، بەڵام گۆشتی ئەسپ‌و ماینی قەدەغە نەکرد لێمان (د/م).**

**٢٥٦٧- ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) القُنفُذ فَقَالَ: خَبِيثَةٌ مِنَ الْخَبَائِثِ. رواه أبو داود وأحمد[٤]:**

**لە خزمەتی پێغەمبەردا باسی ژیژوکرا، فەرمووی: پیسێکە لە پیسەکان (د/ئەحمەد- حدیث ضعیف).**

**٢٥٦٨- وَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الذِّئْبِ فَقَالَ: أَوَيَأْكُلُ الذِّئْبَ أَحَدٌ فِيهِ خَيْرٌ. رواه الترمذي وابن ماجه[٥]:**

**پرسیار کرا لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە بارەی خواردنی گۆشتی گورگەوە فەرمووی** (دروودی خودای لەسەربێ)**: کەسێ خێری لێ بوەشێتەوە گۆشتی گورگ ناخوات. (ت/ئیبنو ماجە - سند ضعیف).**

**٢٥٦٩- وَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُكَ لأَسْأَلَكَ عَنْ أَحْنَاشِ الأَرْضِ، مَا تَقُولُ فِي الثَّعْلَبِ قَالَ: وَمَنْ يَأْكُلُ الثَّعْلَبَ. رواه ابن ماجه[٦]:**

---

[٣] بخاري. مغازى: ٤٢١٩. مسلم. صيد: ٤٩٩٧ ، ٤٩٩٨ - ٥٠٠٠. أبو داود. أطعمة: ٣٧٨٨ ، ٣٨٠٨.

[٤] حديث ضعيف (شرحه).

[٥] بسند ضعيف (شرحه).

[٦] بسند ضعيف (شرحه).

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووم بۆلات لە بارەی جڕوجانەوەری سەرزەوییەوە پرسیارت لێ بکەم ئایا لە بارەی ڕێوییەوە چی دەفەرمووی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): جا کێ هەیە کە ڕێوی بخوات؟ (ت/ئیبنو ماجە-سند ضعیف).

٢٥٧٠- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الإِبِلِ وَيَقْطَعُونَ أَلْيَاتِ الْغَنَمِ فَقَالَ: مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ. رواه أبو داود[٧]:

ئەبو واقیدی ئەل-لەیثی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە کۆچی کرد بۆ مەدینە لەوەو پێش خەڵکی مەدینە دووگی وشتر یا دووگی مەڕیان بە زیندوویی شەق دەکردو بەزەکەی ناویان دەبڕی‌و دەیان برژاندو دەیان خوارد. جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو پارچەیەی کە لە ماڵاتی زیندوو دەیبڕن دادەنرێ بە گۆشتی مردار (د-س/ح).

٢٥٧١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْجَلاَّلَةِ وَأَلْبَانِهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: نَهى عَنِ الْجَلاَّلَةِ فِي الإِبِلِ أَنْ يُرْكَبَ عَلَيْهَا أَوْ يُشْرَبَ مِنْ أَلْبَانِهَا. رواه أصحاب السنن[٨]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خواردنی گۆشت‌و شیری گیانلەبەری پیسخۆی قەدەغە کردووە لە گێڕانەوەیەکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قەدەغەی کردووە کە سواری وشتری پیس خۆر ببن، یا لە گۆشت‌و شیری بخۆن (د/ت/ن-س/ح).

٢٥٧٢- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ. رواه الخمسة[٩]:

---

[٧] بسند حسن (شرحه).

[٨] بسند حسن (شرحه).

ئەبو ثەلعەبە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەر درندەیێ كە كەڵبەی هەبێ خواردنی گۆشتەكەیی قەدەغە كردووە (ش/د/ت/ن).

٢٥٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ. رواه مسلم وأبو داود. والله أعلم[١٠]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: هەر درندەیێ كە كەڵبەی هەبێ، یا هەر باڵندەیێ كە چنگو چرنووكی هەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خواردنی گۆشتەكەیی قەدەغە كردووە (م/د).

### ٤) هەروەها هەر گیانلەبەرێ كە كوشتنی قەدەغەبێ یا فەرمان كرابێ بە كوشتنی گۆشتی ناخورێ : (ومنه ما نهي عن قتله وما أمر بقتله)

٢٥٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ نَمْلَةً قَرَصَتْ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: أَفِي أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ. رواه الخمسة إلا الترمذي[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جارێ مێرووڵەیێ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەكان دەگەزێ، پێغەمبەرەكە فەرمان دەدا شارەمێرووڵەكە هەموو دەسوتێنن، جا خودا سرووش (نیگا)ی بۆ دەنێرێ: خۆ تۆ تاقە یەك مێرووڵە گەستتی كەچی یەك نەتەوەت لە نەتەوەكان سەرتۆپ سووتاند، كە حاڵیان وابوو تەسبیحاتو

---

[٩] بخاري. ذبائح: ٥٥٣٠ ، ٥٧٨٠ ، ٥٧٨١. مسلم. صيد: ٤٩٦٥ — ٤٩٦٨. أبو داود. أطعمة: ٣٨٠٢. ترمذي. أطعمة: ١٤٧٧. نسائي. صيد: ٤٣٣٦ ، ٤٣٥٣.

[١٠] مسلم. صيد: ٤٩٧٠. أبو داود. أطعمة: ٣٨٠٣.

[١] بخاري. جاهد: ٣٠١٩. مسلم. سلام: ٥٨١٠ — ٥٨١٢. أبو داود. أدب: ٥٢٦٦. نسائي. صيد: ٤٣٦٩.

سوپاس‌و ستایشی خودایان دەکرد (ش/د/ت) گفتەی ئەبو داود ئاوایە: پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکان لە بن شێخەڵێکا لادەدا، مێرووڵەیێ گازێکی لێ دەگرێ، ئەویش فەرمان دەدا بارگەکەی دەگوێزنەوە، ئینجا فەرمان دەکا شارەمێرووڵەکە دەسوتێنن، جا خودا سرووشی بۆ دەنێرێ: ئەوە بۆچی هەر ئەو مێرووڵەیەت، نەکوشتەوە: هذه الروایة من لفظ أبی داود في الشرح، ونصه: نزل نبي من الانبیاء تحت شجرة فلدغته نملة فأمر بجهازه فأخرج من تحته، ثم أمربها فأحرقت فأوحی الله إلیه فهلا نملة واحدة.

٢٥٧٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهي النّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَنْ أَكْلِ الهِرّ وَعَنْ أَكْل ثَمَنَهُ. رواه الخمسة إلا البخاری[٢]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەم خواردنی گۆشتی پشیلەی قەدەغە کردووەو هەم خواردنی بەهایشی (م/د/ت/ن).

٢٥٧٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنّ طَبِيبًا سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَنْ ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا فِي دَوَاءٍ فَنَهَاهُ عَنْ قَتْلِهَا. رواه أبو داود والنسائي وأحمد[٣]:

عەبدولڕەحمانی کوڕی عوسمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پزیشکێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)! ئایا دروستە بۆق بکرێتە ناو دەرمانەوە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەدا کە بیکوژێ (د/ن/ئەحمەد).

٢٥٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: نَهَي النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ: النَّمْلَةُ وَالنَّحْلَةُ وَالْهُدْهُدُ وَالصُّرَدُ. رواه أبو داود وأحمد[٤]:

---

[٢] مسلم. مساقاة: ٢٩٩١.

[٣] سکت عنه الشارح.

[٤] بسند صحیح (شرحه).

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **رێگەی کوشتنی ئەم چوار گیانلەبەرەی نەداوە: مێروولەو هەنگ‌و پەپووسلێمانکەو (صورەد[1]). (د/ئەحمەد-س/ص).**

**٢٥٧٨- قَالَ فِي الشَرحِ: وَلِلْبَيْهَقِيِّ: لاَ تَقْتُلُوا الضَّفَادِعَ فَإِنَّ نَقِيقَهَا تَسْبِيحٌ وَلاَ تَقْتُلُوا الْخَفَّاشَ فَإِنَّهُ لَمَّا خَرِبَ بَيْتُ الْمَقْدِسِ قَالَ: يَا رَبُّ سَلِّطْنِي عَلَى الْبَحْرِ حَتَّى أُغْرِقَهُمْ[٥]:**

**لە شەرحەکەدا دەڵێ: بەیهەقی** (خودای لێ رازی بێ) **ریوایەتی کردووە حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: بۆق مەکوژن، چونکە قرەی بۆق تەسبیحات‌و سوپاس‌و ستایشە وە شەمشەمە کوێرەیش مەکوژن، چونکە کە بەیتولمەقدیس وێرانکرا گوتی: پەروەردگارم! زاڵم بکە بەسەر دەریادا تا هەموویان لەناو دەریادا نوقم بکەم.**

**٢٥٧٩- عَنِ جَابِرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنَا النَبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَتْلِ الْكِلاَبِ حَتَّى إِنَّ الْمَرْأَةَ تَقْدَمُ مِنَ الْبَادِيَةِ بِكَلْبِهَا فَنَقْتُلُهُ ثُمَّ نَهَى عَنْ قَتْلِهَا وَقَالَ: عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ الْبَهِيمِ ذِى النُّقْطَتَيْنِ فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: لَوْلاَ أَنَّ الْكِلاَبَ أُمَّةٌ مِنَ الأُمَمِ لأَمَرْتُ بِقَتْلِهَا فَاقْتُلُوا مِنْهَا الأَسْوَدَ الْبَهِيمَ. رواه الخمسة إلا البخاري[٦]:**

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی پێمان کرد کە سەگ بکوژین، تەنانەت وای لێ هات ژن لە لادێوە سەگی خۆی دەهێنا بۆمان دەمان کوشت، لە پاشا جڵوگیری کرد لە کوشتنی، وە فەرمووی: سەگی رەشی سادەی چوار چاو قوتار مەکەن، کە دوو نیتکەی سپی وا بە ژوور چاویانەوە، چونکە ئەم جۆرە سەگە شەیتانن. لە گێڕانەوەیەکا: سەگیش هەر**

---

[1] رەنگ بێ بە کوردی (باشووکە)ی پێ بڵێن.

- وەرگێڕ - کەرکووک ١٩٨٤/٣/١٩

[٥] سکت عنه.

[٦] مسلم. مساقاة: ٣٩٩٦. أبو داود. صيد: ٢٨٤٦. ترمذى. أحكام: ١٤٨٨. نسائى. صيد: ٤٢٩.

نەتەوەیەکن لە نەتەوەکان ئەگینا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە فەرمانم دەدا بە کوشتنیان، بەڵام سەگی ڕەشی سادە بکوژن (م/د/ت/ن).

٢٥٨٠- عَنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَ بِقَتْلِ الْوَزَغِ وَسَمَّاهُ فُوَيْسِقًا. رواه الثلاثة[٧]:

سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی دەدا بە کوشتنی شەوگەرد (وەزغ) وە ناویشی نا: لە ڕێدەرچوو واتە فاسیق (ش/د).

٢٥٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَتَلَ وَزَغَةً فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّانِيَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً لِدُونِ الأُولَى وَإِنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً لِدُونِ الثَّانِيَةِ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٨]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بەیەکەم لێدان شەوگەردێ بکوژێ ئەوەندەو ئەوەندە خێرو چاکەی بۆ هەیە، وە ئەو کەسەی بە لێدانی دووەم بیکوژێ ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە بەڵام کەمتر لە جاری یەکەم، وە ئەو کەسەی بە لێدانی سێیەم بیکوژێ ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە بەڵام کەمتر لە جاری دووەم. (م/د/ت).

٢٥٨٢- ← (ب - ٢ ز - ٨٤ ل - ف -٤)[٩].

٢٥٨٣- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فُقِدَتْ أُمَّةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ يُدْرَى مَا فَعَلَتْ، وَإِنِّي لاَ أُرَاهَا إِلاَّ الْفَأْرَ إِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الإِبِلِ لَمْ تَشْرَبْ، وَإِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الشَّاءِ شَرِبَتْ. رواه الشيخان. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى... آمين[١٠]:

---

[٧] بخاري. بدء الخلق: ٣٣٠٦. مسلم. سلام: ٥٨٠٥. أبو داود. أدب: ٥٢٦٢.

[٨] مسلم. اسلام: ٥٨٠٧ ، ٥٨٠٨ ، ٥٨٠٩. أبو داود. أدب: ٥٢٦٣ ، ٥٢٦٤.

[٩] سبق برقم: ١٥١٣/٤ مجلد ثانى/ تسلسل/٨٤.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەرەیێ لە نەوەی ئیسرائیل بزربوون و بێ سەرو شوێن رۆیشتوون کەس نازانێ چییان بەسەر هاتووە، وەمن وا دەزانم کە بووبن بە مکشك وە ئەم مشکانەی ئێستا هەن لەو بەرە بابەن چونکە (مشك)یش وەکجوولەکە ئەگەر شیری وشتری بۆ دابنرێ نایخواتەوە بەڵام ئەگەر شیری مەڕی بۆ دابنرێ دەیخواتەوە. وەلێ وەکی لە (عەینی)دا باسکراوە: لە پاش ئەم فەرمایشتە روونکرایەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە شتی مەسخ کراو زاووزێ ناکا، وەچەی لێ ناکەوێتەوە، کەواتە ئەم مشکانەی ئێستا هەن لە وەچی ئەو بەرەبابە نین! (ش).

## ٥) ماری ماڵی ناوماڵ تا سێ جار هەڕەشەی لێ دەکرێ کە ماڵەکە چۆڵ بکا ئەگینا دەکوژرێ: (عوامر البيوت تنذر ثلاثا)

٢٥٨٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَطْمِسَانِ الْبَصَرَ ، وَيَسْتَسْقِطَانِ الْحَبَلَ. فَبَيْنَا أَنَا أُطَارِدُ حَيَّةً لأَقْتُلَهَا فَنَادَانِي أَبُو لُبَابَةَ: لاَ تَقْتُلْهَا. فَقُلْتُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ أَمَرَ بِقَتْلِ الْحَيَّاتِ. قَالَ: إِنَّهُ نَهَى بَعْدَ ذَلِكَ عَنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ، وَهِيَ الْعَوَامِرُ. وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَوْمًا عِنْدَ هَدْمٍ لَهُ فَرَأَى وَبِيصَ جَانٍّ فَقَالَ: اتَّبِعُوا هَذَا الْجَانَّ فَاقْتُلُوهُ. قَالَ أَبُو لُبَابَةَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَّانِ الَّتِي تَكُونُ فِي الْبُيُوتِ إِلاَّ الأَبْتَرَ وَذَا الطُّفْيَتَيْنِ فَإِنَّهُمَا اللَّذَانِ يَخْطِفَانِ الْبَصَرَ وَيَتَتَبَّعَانِ مَا فِي بُطُونِ النِّسَاءِ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنَّ بِالْمَدِينَةِ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ قَدْ أَسْلَمُوا فَمَنْ رَأَى شَيْئًا مِنْ هَذِهِ الْعَوَامِرِ فَلْيُؤْذِنْهُ ثَلاَثًا فَإِنْ بَدَا لَهُ بَعْدُ فَلْيَقْتُلْهُ فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنَّ لِهَذِهِ الْبُيُوتِ عَوَامِرَ فَإِذَا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْهَا فَحَرِّجُوا عَلَيْهَا ثَلاَثًا فَإِنْ ذَهَبَ وَإِلاَّ فَاقْتُلُوهُ فَإِنَّهُ كَافِرٌ. رواهما الأربعة[1]:

---

(١٠) بخاري. بدء الخلق: ٣٣٠٥ = تجريد/ ٥ل — ٤٥٨ ژ: ١٣٣٣. مسلم. زهد: ٧٤٢١.

(١) بخاري. بدء الخلق: تجريد/ ١٣٢٩ / ٣٢٩٧ ، ٣٣٩٩ ، ٣٣١٠ ، ٣٣١١ ، ٣٣١٢ ، ٣٣١٣ ، ٤٠١٦ ، ٤٠١٧. مسلم. سلام: ٥٧٨٦ ، ٥٧٨٧. أبو داود. أدب: ٥٢٢٥ ، ٥٢٥٣ ، ٥٢٥٥.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر مینبەر وتاری دەدا، گوێم لێبوو فەرمووی: گشت مارێ بکوژن، بە تایبەتی کوڵەوەیباب (ئەبتەر)و ئەو مارانەی کە دوو هێڵی رەش وەك هێڵی پەلکە خورما وا بەسەر پشتیانەوە، چونکە ئەم دوو جۆرە مارە ئاوی چاو دەبەن‌و سك لەباری ژن دەبەن ئەوەندە رەزایان گرانەو ئێسکیان قورس‌و رەزایان بێ رەزایە، تەنیا بە دیتنیان ئاوی چاو دەڕواو دادێ‌و کۆرپەلە لە باری ژن دەچێ. ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ مارێکم راو دەنا تا بیکوژم، لەوکاتەدا ئەبو لوبابە بانگی لێ کردم: مەیکوژە. گوتم: بۆچی؟ خۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کردووە بە کوژتنی مار، گوتی: ئاخر لەوەدوا کوشتنی ماری ناومالّی قەدەغەکردووە کە بەو مارانە دەڵێن: خێوی ناومالّ نەبادا جنۆکەی مالّی موسوڵمان بن. لە گێڕانەوەیەکا: رۆژێ ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) لەلای کاولەیەکی خۆی بوو، چاوی بە بریسکەی تیرەمارێ دەکەوێ، بە هاوڕێکانی دەڵێ: دوای کەون بیکوژن. ئەبو لوبابە دەڵێ: من لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: تیرە ماری ناو خانوو مەکوژن، بەلاّم کوڵەوەیباب بکوژن وە هەروەها ئەو مارانەیش کە دوو هێڵی رەش وەك هێڵی پەلکە خورما وا بەسەرپشتیانەوە، چونکە ئەم دوو جۆرە مارە ئاوی چاو دەبەن‌و سك لەباری ژن دەبەن. لە گێڕانەوەیەکا: دەستەیەك جنۆکە موسوڵمان بوون‌و لە مەدینە جێ گیربوون، جا ئەگەر کەسێ شتێکی دی لە ماری ناومالّ با هەتا سێ جار ئاگاداری بکاتەوەو قاوی بدا، ئیتر لەوە دوا ئەگەر بینییەوە با بیکوژێ چونکە ئەوە شەیتانە لە گێڕانەوەیەکا: ئەم مالاّنە خێویان هەیە، جا ئەگەر مارێکتان دی لەناو مالاّ سێ جار تەنگاوی بکەن‌و پەیمانی لێ بستێنن کە بڕوا جا ئەگەر رۆیشت ئەوە باشە، دەنا بیکوژن چونکە ئەوە بێ بڕوایەو کافرە (ش/د/ت).

٢٥٨٥- عَنْ أَبِي لَيْلَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُئِلَ عَنْ حَيَّاتِ الْبُيُوتِ فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُنَّ شَيْئًا فِي مَسَاكِنِكُمْ فَقُولُوا أَنْشُدُكُنَّ الْعَهْدَ الَّذِي

أَخَذَ عَلَيْكُنَّ نُوحٌ أَنْشُدُكُنَّ الْعَهْدَ الَّذِى أَخَذَ عَلَيْكُنَّ سُلَيْمَانُ أَنْ لاَ تُؤْذُونَا فَإِنْ عُدْنَ فَاقْتُلُوهُنَّ. رواه اصحاب السنن (بسند حسن)[٢]:

**ئەبو لەیلا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: بۆ ماری ناومالّ‌و ناو خانوو پرسیارکرا لە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرموی: ئەگەر وارێکەوت کە لەناو ماڵەکانتانا لەو مارانەتان دینی بڵێن: أنشدكن العهد الذي أخذ عليكن نوح أنشدكن العهد الذي أخذ عليكن سليمان ألا تؤذونا: توو ئەو پەیمانە کە نووح سەندوویەتی لێتان، توو ئەو پەیمانە کە سولەیمان سەندوویەتی لێتان ئەگەر ئازارمان بدەن. فەرموی: جا ئەگەر لەوە دوا هاتنەوە بەرچاوتان بیانکوژن (د/ت/ن-س/ح).**

٢٥٨٦- وَقَالَ عَبْدِ اللهِ (رَضِىَ اللهُ عَنْهُ) اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ كُلَّهَا إِلاَّ الْجَانَّ الأَبْيَضَ الَّذِى كَأَنَّهُ قَضِيبُ فِضَّةٍ. رواه أبو داود والترمذي. نسأل الله الستر والتوفيق آمين(٣):

**عەبدوڵلا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: هەموو مارێ بکوژن تیرەماری سپی نەبێ کە دەڵێی شیشی زیوە لەکاتی ڕۆیشتنا بەبێ قۆرت ڕێك‌و ڕاست دەکشێ! (د/ت-س/ح).**

## ٦) بەشی سێیەم: باسی نەچیرو ڕاوو شکار دەستووری گیانلەبەر سەربڕین:

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللّهُ فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ — ٥/٤}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ حەلاڵکراوە بۆ ئێوە هەموو خواردەمەنییەکی پاك‌و خۆش، وە نەچیری ئەو دڕندەو پەلەوەرە ڕاوکەرانە کە تالیمتان کردوون لەوەی کە خودا تالیمی ئێوەی کردووە، دەی**

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] بسند حسن (شرحه).

**بخۆن لە گۆشتی ئەو نەچیرەی كە گرتوویانە بۆ ئێوەو نەیانخواردووە، بەڵام لەكاتی بەرەڵڵاكردنی ئەو گیانلەبەرە راوكەرانەدا ناوی خودا ببەن (بسم الله) بكەن، وە یا ئەگەر بەزیندوویی گەیشتن بەو نەچیرانە سەریان ببڕنو (بسم الله)یان لەسەر بكەن، وە لە خودا بترسن، بەراستی خودا حسێبی تاوانباران بە پەلە دەكات.**

**٢٥٨٧-** عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اتَّخَذَ كَلْبًا إِلاَّ كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ صَيْدٍ أَوْ زَرْعٍ انْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ. رواه الخمسة: ← (ب – ٢ ز – ١٧١ ل – ف – ١)[1].

**٢٥٨٨-** ←(ب – ٢ ز – ١٧١ ل- ف-١)[2].

عَنْ عَدِىِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ صَيْدِ الْبَازِى قَالَ: مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَكُلْ. رواه الترمذي[3]:

**عەدی كوڕی حاتەم** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: بۆ ڕاوكردن بە باز پرسیارم كرد لە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەرچی دەگرێ بۆتۆ بیخۆ (ت-سند غريب).**

**٢٥٨٩-** وَعَنْه قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أُرْسِلُ الْكِلاَبَ الْمُعَلَّمَةَ فَيُمْسِكْنَ عَلَيَّ وَأَذْكُرُ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ فَكُلْ. قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ قَالَ: وَإِنْ قَتَلْنَ مَا لَمْ يَشْرَكْهَا كَلْبٌ لَيْسَ مَعَهَا. قُلْتُ: لَهُ فَإِنِّى أَرْمِى بِالْمِعْرَاضِ الصَّيْدَ فَأُصِيبُ فَقَالَ: إِذَا رَمَيْتَ بِالْمِعْرَاضِ فَخَزَقَ فَكُلْهُ وَإِنْ أَصَابَهُ بِعَرْضِهِ فَلاَ. رواه الخمسة[4]:

---

[1] سبق في رقم: ١٩٠٩/١ مجلد/ ٢ تسلسل/ ١٧١.

[2] سبق في رقم: ١٩٠٩/١ مجلد/ ٢ تسلسل/ ١٧١.

[3] بسند غريب (شرحه).

[4] بخاري. ذبائح: ٥٤٧٧. تجريد/١١٦/٥ ژ: ١٨٢٦/ ٥٤٧٥ ، ١٧٥ ، ٢٠٥٤ ، ٥٤٧٦ ، ٥٤٧٧ ، ٥٤٨٣ ، ٥٤٨٤ ، ٥٤٨٥ ، ٥٤٨٦ ، ٥٤٨٧ ، ٧٣٩٧. مسلم. صيد: ٤٩٤٩ – ٤٩٥٩. أبو داود. صيد: ٢٨٤٧. ترمذي. صيد: ١٤٦٥. نسائي. صيد: ٤٢٧٦ ، ٤٢٧٨ ، ٤٣١٦. ابن ماجه. صيد: ٣٢١٥.

دیسان گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من سەگی فێرە راوم هەیە كە دەیانكەمە نەچیر دەیگرن بۆ من، وە لەكاتی بەرەڵاكردنیشیاندا ناوی خودا دەهێنم، فەرمووی: كاتێ سەگی فێرەواری خۆتت بەرەڵا كردە گیانی نەچیرو ناوی خودات لێ هێنا ئیتر لە گۆشتی نەچیرەكە بخۆ ئەگەر بیشی كوژێ هەر لێی بخۆ، بەمەرجێ سەگی تری لەگەڵدا نەبێ كە كەسێ تر ڕەوانەی كردبێ. گوتم: من تیرەكوڵە (میعراض) دەگرمە نەچیرو دەیپێكم؟ فەرمووی: ئەگەر تیرە كوڵەت گرتە نەچیرو تێی هەڵچەقی‌و زاماری كرد ئەوە بیخۆ، ئەگینا ئەگەر لە سەرباری پانی ئەنگاوتی ئەوە مەیخۆ (ش/د/ت/ن).

٢٥٩٠- وللبخاري والترمذي: وَإِنْ رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، لَيْسَ بِهِ إِلاَّ أَثَرُ سَهْمِكَ، فَكُلْ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْمَاءِ فَلاَ تَأْكُلْ:

بوخاری تیرمذی (غەرقی رەحمە تی خودای گەورەبن) ریوایەت دەكەن: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر تەقەت لە نەچیرێ كرد، وە لەپاش یەك دوو رۆژ لەوەدوا دۆزیتەوەو بەس شوێنی تیرەكەی تۆی پێوە بوو ئەوا بیخۆ، بەلام ئەگەر كەوتبووە ناو ئاوەوە مەیخۆ نەبادا لە ئاوەكەدا خنكابێ (ب/ت).

٢٥٩١- وللبخاري وأبي داود: يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَقْتَفِي أَثَرَهُ الْيَوْمَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ ثُمَّ يَجِدُهُ مَيِّتًا وَفِيهِ سَهْمُهُ أَيَأْكُلُ قَالَ: يَأْكُلُ إِنْ شَاءَ اللهُ[٦]:

ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی ئەبو داوود (رەزای خودای مەزنیان لێبێ) ریوایەتیان كردووە: پرسیار كرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): كەسێ تەقە لە نەچیرێ دەكاو شوێنی هەڵدەگرێ‌و لەپاش دوو سێ رۆژ بە مردوویی دەیدۆزێتەوە، كە هێشتا تیرەكەی ئەوی پێوەیە لەم حاڵەدا چی بكا؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): خودا حەزكا دەیخوا.

٢٥٩٢- ولمسم وأبي داود: فِي الَّذِي يُدْرِكُ صَيْدَهُ بَعْدَ ثَلاَثٍ فَكُلْهُ مَا لَمْ يُنْتِنْ[٧]:

---

[٦] رَوَاهُ البخاري تعليقاً قبل رقم: ٥٤٨٧.

ئەبو ثەعلەبە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەگەر کەسێ لەپاش سێ رۆژ نەچیری خۆی دۆزییەوە چی بکا، فەرمووی: ئەگەر بۆگەنی نەکردبوو بیخۆ (م/د).

٢٥٩٣- وقال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ جَفَا وَمَنِ اتَّبَعَ الصَّيْدَ غَفَلَ وَمَنْ أَتَى السُّلْطَانَ افْتُتِنَ: رواه أصحاب السُّنن[٨]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ لە چۆڵەوانی دانیشێ بێ وێڵ دەبێ، کەسێکیش خوو بداتە راووشکار دەبەنگ دەبێ، کەسێکیش هاموشۆی فەرمانڕەوا (سولْتان) بکا سەرەنجام گیرۆدەو گرفتار دەبێ (د/ت/ن-س/ح).

٢٥٩٤- ولأبي داود (على ما هو في الشرح): وَمَا ازْدَادَ عَبْدٌ مِنَ السُّلْطَانِ دُنُوًّا إِلاَّ ازْدَادَ مِنَ اللَّهِ بُعْدًا إِلاَّ مَنْ عَصَمَهُ اللَّهُ[٩]:

ئەبو داوود (خودای لێ رازی بێ) وەك لە شەرحەکەدا دەڵێ، گێڕاویەتەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: بەندە هەتا لە خاوەن دەستەڵات‌و سوڵتانەوە نزیکتر بێتەوە مسۆگەر کە لە خوداوە دوورتر دەبێتەوە، مەگەر کەسێ کە خودا بۆ خۆی بیپارێزێ.

٢٥٩٥- وَرَأَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) رَجُلاً يَخْذِفُ فَقَالَ: لاَ تَخْذِفْ فَإِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ الْخَذْفِ أَوْ كَانَ يَكْرَهُ الْخَذْفَ وَقَالَ: إِنَّهُ لاَ يُصَادُ بِهِ صَيْدٌ وَلاَ يُنْكَى بِهِ عَدُوٌّ، وَلَكِنَّهَا قَدْ تَكْسِرُ السِّنَّ وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ. ثُمَّ رَآهُ بَعْدَ ذَلِكَ يَخْذِفُ فَقَالَ: لَهُ أُحَدِّثُكَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ نَهَى عَنِ الْخَذْفِ. أَوْ كَرِهَ الْخَذْفَ، وَأَنْتَ تَخْذِفُ لاَ أُكَلِّمُكَ كَذَا وَكَذَا. رواه الثلاثة. والله أعلى وأعلم[١٠]:

---

[٧] مسلم. صيد: ٤٩٦٢، ٤٩٦٣. أبو داود. صيد: ٢٨٦١. نسائي. صيد: ٤٣١٤.

[٨] بسند حسن (شرحه).

[٩] سكت الشارح عن درجته وكفى إعمالا للحديث احتجاج الشارح به.

[١٠] بخاري. ذبائح: تجريد/ ٥ ل — ١٢٠ ژ: ٥٤٧٩/١٨٢٨.

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (خودای لێ رازی بێ) دی کە پیاوێ بەلەپیتکە دەتەقێنێ، پێی گوت: پەلەپیتکە مەهاوێژە چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی ئەوەی نەداوە، یا حەزی لەوە نەبوو، وە دەیفەرموو: ئەوەنە نەچیری پێ راو دەکرێ‌و نە دوشمنی پێ کۆڵەوار دەکرێ، بەلاّم بە پێچەوانەوە دوور نیە کە ددانی کەسێ بشکێنێ یا چاوی دۆستێ کوێر بکا! جا ماوەیێ لەوەدوا دیسان عەبدوڵڵا پیاوەکەی دییەوە پەلەپیتکەی دەهاویشتەوە، جا پێی گوت: من فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەگێڕمەوە بۆ تۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی پەلەپیتکە هاویشتن نادا کەچی تۆ هەر وازناهێنی، جا کەوای لێهات ئەوەندەو ئەوەندە قسەت لەگەڵ ناکەم! (ش/د). خودای گەورە هەر بۆ خۆی زۆر باشی دەزانێ.

## ٧) سەربڕین: (الذبح)

٢٥٩٦- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّا لاَقُو الْعَدُوِّ غَدًا، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى فَقَالَ: اعْجَلْ أَوْ أَرِنْ مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللّٰهِ فَكُلْ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ. وَأَصَبْنَا نَهْبَ إِبِلٍ وَغَنَمٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ لِهَـٰذِهِ الإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَإِذَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا شَيْءٌ، فَافْعَلُوا بِهِ هَكَذَا. رواه الخمسة[1].

رافیعی کوڕی خەدیج (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە سبەینێ دەگەین بە دوشمن، وە چەقۆیشمان پێ نیە، ئایا بە لەتە قامیش‌و بە چەقۆی بەردین ئاژاڵ سەرببڕین؟ فەرمووی: گورج بە یا فەرمووی: دەست‌و بردی لێ کە تا لەژێر دەستتا مردار نەبێتەوە ئیتر بە هەرچی سەری دەبڕی باشە، بە مەرجێ فیچقە بەخوێن بکاو لەکاتی سەربڕیندا خوێنەکە

---

[1] بخاري. شركه: ٢٤٨٨. تجريد/ ٣/١٦٨ ژ: ١٠٧٧/ ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٨، ٥٥٠٣، ٥٥٠٩، ٦٠٥٥، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤. مسلم. أضاحى: ٥٠٦٥، ٥٠٦٦. ترمذى. احكام: ١٤٩٢. نسائى. صيد: ٤٣٠٨، ٤٤٢٢، ٤٤٢٣.

پەلەمیزکە ببەستێ، وە ناوی خودای لێ ببرێ، وە بەمەرجێ ئەو شتە ددان‌و نینۆك نەبێ ئەوە لێی بخۆ، پێشت بڵێم کە لەبەرچی دروست نییە شت بە ددان‌و بە نینۆك سەر ببڕێ چونکە ددان ئێسکەو ئێسکیش کوڵەو تیژ نیەو بەزۆری مرداری دەکاتەوە نینۆکیش چەقۆی حەبەشەییەکانە گوتی جا تالانی وشترو رانمان هێنا، وشترێ لە تالانیەکە تەرابوو، پیاوێ تیرێکی پێوەناو گلی دایەوە وە بەوتیرە مرد پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەندێ وشتر هەن سڵ‌و سرکن وەك جانەوەری کێوی سرك‌و تۆڕن جا ئەگەر شتی وا رووی داو چارتان نە دەکرد وەك ئەمە ئاوای لێ بکەن. (ش/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٢٥٩٧- وَكَانَتْ جَارِيَةً لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) تَرْعَى غَنَمًا بِسَلْعٍ، فَأُصِيبَتْ شَاةٌ مِنْهَا، فَأَدْرَكَتْهَا فَذَبَحَتْهَا بِحَجَرٍ، فَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: كُلُوهَا. رواه البخاري (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)[٢]:

رۆژێ کەنیزەکێکی کەعبی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) لە (سەلع) ران دەلەوەڕێنێ، مەڕێ لە رانەکە دەئەنگێورێ، کچەکەیش فریاری دەکەوێ‌و بە بەردێ سەری دەبڕێ کە ئەمەیان لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پرسی، فەرمووی، بیخۆن (ب).

٢٥٩٨- ولأبي داود: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ شَرِيطَةِ" الشَّيْطَانِ وَهِيَ الَّتِي تُذْبَحُ فَيُقْطَعُ الْجِلْدُ وَلاَ تُفْرَى الأَوْدَاجُ ثُمَّ تُتْرَكُ حَتَّى تَمُوتَ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَا تَكُونُ الذَّكَاةُ إِلاَّ فِي الْحَلْقِ وَاللَّبَّةِ قَالَ: لَوْ طَعَنْتَ فِي فَخِذِهَا لأَجْزَأَ عَنْكَ. رواه أصحاب السُّنن[٣]:

گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لە ملهەڵهێنانەوەی شەیتان، کە برێتییە لەوە چەرمی ملی گیاندارەکە هەڵ دەهێننەوەو پێست‌و

---

[٢] بخاري. ذبائح: ٥٥٠٥.

[٣] بسند غريب (شرحه).

گۆشتەکەی دەتەرەکێننەوە بەڵام شادەمارەکانی ناقرتێنن ئیتر وازی لێ دێنن تا دەمرێ‌و لەسەر ئەو حاڵە ئازارێکی زۆری دەبێ، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی سەربڕین دەبێ هەر لە ئاستی قوڕقوڕاگەو لە بۆتەقەی مل دابێ؟ فەرمووی: ئەگەر تیغێ بدەی لە رانیشی دەبێ (د/ت/ن–سند غریب).

## ٨) سەربڕینی گیانداری ئاوس بڕێتیی سەربڕینی بەچکەکەی ناوسکیشی دەکەوێ: (ذكاة الجنين بذكاة أمه)

٢٥٩٩– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَنْحَرُ النَّاقَةَ وَنَذْبَحُ الْبَقَرَةَ وَالشَّاةَ فَنَجِدُ فِي بَطْنِهَا الْجَنِينَ أَنُلْقِيهِ أَمْ نَأْكُلُهُ؟ قَالَ: كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ فَإِنَّ ذَكَاتَهُ ذَكَاةُ أُمِّهِ. رواه أبو داود وأحمد والترمذي. نَسألُ الله السترَ والتوفيق[1]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێ دەکەوێ کە وشتری مێنگەو مانگاو مەڕو بزن‌و شتی وا سەردەبڕین بە چکەیان لەناو سکدایە ئایا ئەو بەچکانە فڕێ بدەین یابیانخۆین؟ فەرمووی: ئەگەر ئارەزوو دەکەن بیان خۆن، چونکە سەربڕینی دایکەکەیان بڕێتیی سەربڕینی ئەوانیش دەکەوێ. (د/ئەحمەد/ت/س/ح).

## ٩) ناوی خودا هێنان‌و سەبڕینی پەسەند : (التسمية وإحسان الذبح)

٢٦٠٠– عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) أَنَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَوْمًا حَدِيثُو عَهْدٍ بِالْجَاهِلِيَّةِ يَأْتُونَنَا بِلُحْمَانٍ لاَ نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا أَمْ لَمْ يَذْكُرُوا أَفَنَأْكُلُ مِنْهَا فَقَالَ: سَمُّوا اللَّهَ وَكُلُوا. رواه أبو داود والبخاري والنسائي[1]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێ دەکەوێ هەندێ کەسی نۆ موسوڵمان کە هێشتا بە جوانی فێری یاساکانی

---

[1] بسند حسن (شرحه).

[1] بخاري. ذبائح: ٥٥٠٧.

ئیسلامەتی نەبوون رێ دەکەوێ ئەو جۆرە موسوڵمانانە گوشتمان بۆ دێنن نازانین کە ناوی خودایان لێ هێناوە یانا، جا ئایا لێی بخۆین یان نا؟ فەرمووی: خۆتان ناوی خودابێنن‌و بیخۆن (د/ب/ن).

٢٦٠١- ← (ب/٣ ز/٨٢ ل/ ف/٤)[٢].

٢٦٠٢- وَدَخَلَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ وَغُلاَمٌ مِنْ بَنِي يَحْيَى رَابِطٌ دَجَاجَةً يَرْمِيهَا، فَمَشَى إِلَيْهَا ابْنُ عُمَرَ فَحَلَّهَا، فَأَتَى بِهَا وَبِالْغُلاَمِ مَعَهُ فَقَالَ: ازْجُرُوا غُلاَمَكُمْ عَنْ أَنْ يَصْبِرَ هَذَا الطَّيْرَ لِلْقَتْلِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى أَنْ تُصْبَرَ بَهِيمَةٌ أَوْ غَيْرُهَا لِلْقَتْلِ. رواه الثلاثة. والله تعالى أعلى وأعلم[٣]:

جارێ ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) چوو بۆلای یەحیای کوڕی سەعید، تەماشای کرد کوڕێکی یەحیا مریشکێکی بەستۆتەوەو ناویەتەوە بە نیشانە، ئیبنو عومەر چوو مریشکەکەی کردەوەو لەگەڵ کوڕەکەدا بردنی بۆلای یەحیاو گوتی: تەمێی کوڕەکەتان بکەن کە ئەم باڵندەیە نەنێتەوە بە نیشانەو لەسەر ئەم شێوەیە نەیکوژێ، چونکە من بۆ خۆم لە پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەربێ) ژنەوتووە کە رێگەی نەدەدا کە ئاژەڵ بە نیشانە بۆ کوشتن بنرێتەوە (ش/د).

## ١٠) گۆشتی سەربڕاوی خاوەن نامەکان حەڵاڵە بۆ ئێمە:
## ذبائح أهل الكتاب حلال

٢٦٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) في قوله تعالى: (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) (وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) قَالَ: نُسَخَا، وَاسْتَثْنَى مِنْهَا ذَبِحَةَ أَهْلِ

---

[٢] سبق برقم: ٢٣٠٥/٤ تسلسل/٨٢ مجلد/٣.

[٣] بخاري. ذبائح: ٥٥١٣، ٥٥١٤.

الْكِتَاب بَقُولَه تَعَالَى: (وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ) رواه أبو داود[1]:

**لە گۆشتی ئەو گیانلەبەرانە بخۆن کە ناوی خودایان لەسەر دەبرێ لەکاتی سەبڕینیاندا وە لەشانی ئەم ئایەتەی تردا کە دەفەرموێ: {وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ – ١٢١/٦} واتە: لە گۆشتی ئەو گیانلەبەرانە مەخۆن کە لەکاتی سەبڕیندا ناوی خودایان لەسەر نەبرابێ ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **لەشانی ئەم دوو ئایەتەدا گوتی: ئەم دوو ئایەتە نەسخ بوو نەتەوەو دەگەریان نەماوە، ئەوەندە هەیە کە خودا خواردنی گۆشتی سەربڕاوی خاوەن نامەکانی لەم بڕیار (حوکم)ە جیاکردۆتەوە بەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ – ٥ / ٥}. واتە: خواردەمەنی ئەومیللەتانە کە لەکاتی خۆیاندا نامەیان پێ دراوە حەڵاڵە بۆ ئێوە[1] (د–سند صالح).**

---

[1] بسند صالح (شرحه).

[1] يقول العلامة الاستاذ الشيخ الملا محمد الكوّيي في تفسيره القيم باللغة الكردية الموسوم بحق وصدق بال (تفسیری کوردی لەسەر کەلامی خوداوەندی) الذي طبع منه حسب معلوماتي لحد الان القسم الأول، يقول عند تفسيره الآية الكريمة: (تلك أمة قد خلت لها ما كسبت ولكم ما كسبتم ولا تسألون عما كانوا يعملون) ما ترجمته بالنص: وا أسفا، أن بعضا ممن كانوا ينتسبون إلى علمائنا كانوا كلما وجدوا آية قرآنية كريمة تستشف روح الامة الناهضة ونور الحياة دسوا فيها (من فورهم) سما ذفافا قتالا، فقضى على روح الآية الكريمة الوهاجة فصارت جسما بلا روح ولا حركة كالظرف الفارغ، فأصيبت الامة من جراء ذلك بالشلل والحرمان والى الآن تسري آثار أقاويلهم القديمة الزائفة السيئة على السنة أمثالهم من علمائنا في عصرنا هذا إلى أعماق القلوب فتحدث فيها القبول والاستحسان. انتهى ما قاله الشيخ عليه الرحمة والرّضوان. واقول هنا متأثرا ومستنيرا برأي هذا الحبر النحرير ومنوها بفضل سبقه في هذا المضار الذي نخوضه معه أن شاء الله تعالى: أن مسألة النسخ – رغم ثبوته ووجوده في القرآن الكريم – هى أحدى هذه الدواهي الكبر، التي أصابت بآفتها السمية ودائها الذفاف قسطا كبيرا من الآيات الجليلة وأفرغتها

## ١١) حەوتمو ئەوەی دەستووره کەدەکرێ بۆ منداڵ:
## العقيقة وما يعمل للمولود

٢٦٠٤- عَنْ سَلْمَانَ بْنُ عَامِرٍ الضَّبِّيُّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَةٌ، فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى. رواه الخمسة إلا مسلماً[1]:

سولەیمانی کوڕی عامیری ئەل-ضیببی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەوتم بۆ کوڕ دەکرێ، کەواتە خوێنی بۆ بکەن، وە خوێنو خوڕو ئازارو لیمانو ئەمانەی لێ بکەنەوە (ب/د/ت/ن).

٢٦٠٥- عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ (رَضيَ أللهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ[2]:

---

من فحواها ومحتواها وقضت على مغزاها التشريعي وعديد من جوانب فوائدها الأخرى! فالنسخ الكيفي أو الاعتباطي أحدث شرما وثرما وخرما وخزما، دون رتق فتقه خرط القتاد. حتى بلغ الامر ببعضهم أن أجازوا النسخ في الاخبار! وربما لاتفه سبب وبأوهى دليل، كنسخ القرآن بخبر الآحاد! أليس من الأنكى الامر أن يتكلف سيدنا جبرائيل – عليه السلام – أن ينزل بآية من فوق سبع سموات من لدن رب العالمين على قلب عبده الحبيب محمد (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) ثم تنسخ قبل العمل بها، أو بعد نزولها بقليل أقول حاشاي أن أبلغ أبن عباس (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) علما ودينا وتقى وفضلا حتى أفند عليه أقواله الكريمة في التفسير والتحديث أو أنكر عليه حكمه بنسخ هاتين الآيتين الكريمتين، وحاشاي أن أكون بصدد التنديد بعلمائنا ومفسرينا – رضوان الله تعالى عليهم – أنا دون ذلك في نفسي والحمد الله على ذلك، وغاية ما أقوله أنا مع شيخي الكويي في نقده ذاك وحبذا الامر لو قام العلماء الاجلاء بجهود فردية وجماعية لصقل أصول الشريعة الغراء مما علق بها من غبار التقادم في جو هادىء بهيج يشيع فيه روح التفاهم والتناصر وبأسلوب شيق رائق يبشر بالتوفيق وما ذلك الخير ببعيد من مصابيح الاسلام أن شاء الله تعالي، ولقد ظهرت تباشيره وبوادره، ونرجو من الله تعالى أن يجعل فيها النفع العميم والسلام.

المترجم نوري فارس

١٩٨٨/٥/١٦ – ٢٩ رمضان ١٤٠٨.

[1] بخاري. عقيقة: ٥٤٧٢. تجريد/ ١٠١/٥ ژ: ١٨٢٤/ ٥٤٧٢ ، ٥٤٧١.

**ئوم کورزی ئەل-کەعبییە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: دوومەڕ، یا دوو بزن، کە بۆ قوربانی دەست بدەن دەکرێن بە حەوتم بۆ کوڕ، وە بۆ کچیش یەك مەڕ یا یەك بزن دەکرێ (د/ت/ن-س/ص).**

**٢٦٠٦- عَنْ سَمُرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: كُلُّ غُلَامٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ وَيُحْلَقُ وَيُسَمَّى رواهما أصحاب السُّنن[٣]:**

**لە سەموورەوە** (خودای لێ ڕازی بێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەموو کوڕێ ڕێگەی نادرێ کە تکاو شەفاعەت بکا بۆ باوك‌و دایکی ئەگەر بە منداڵی بمرێ هەتا حەوتمی بۆ نەکرێ، هەق وایە لە ڕۆژی حەوتەی دا حەوتمی بۆ سەبڕن‌و سەری بتاشن‌و ناوی بنێن (د/ت/ن-س/ص).**

**٢٦٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) **كَبْشًا كَبْشًا. رواه اصحاب السنن ولفظ الترمذي: عَقَّ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَنِ الْحَسَنِ بِشَاةٍ وَقَالَ: يَا فَاطِمَةُ احْلِقِي رَأْسَهُ وَتَصَدَّقِي بِزِنَةِ شَعْرِهِ فِضَّةً فَوَزَنَتْهُ فَكَانَ وَزْنُهُ دِرْهَمًا أَوْ بَعْضَ دِرْهَمٍ[٤]:**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بۆ حەسەن بەرانێك‌و بۆ حوسەین بەرانێکی کرد بە حەوتم بۆیان (د/ت/ن-س/ح) گفتەی (ت): پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **مەڕێکی بۆ حەسەن کرد بە حەتم، فەرموویشی: ئەی فاطیمە! سەری بتاشەو سەنگی مووەکەی زیوو ببخشەرەوە کە کێشامان مووەکە سەنگی درەمی زیو بوو، یا لە سەنگی درەمێکیش کەمتر بوو.**

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند حسن (شرحه).

٢٦٠٨- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: وُلِدَ لِي غُلامٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ وَدَفَعَهُ إِلَيَّ، قَالَ: وَكَانَ أَكْبَرَ أولادي. رواه الشيخان[٥]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کوڕێکم لە دایك بوو، بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر ناوی نا ئیبراهیم‌و بە دەنگی خورما مەلاشووی شیرین کرد، وە دووعاو نزای پیرۆزیی‌و خێردانەوەی بۆ کردو دایەوە دەستم. گوتی: ئەو کوڕە نۆبەرەی مندالەکانم بوو (ش/خودایان لێ رازی بێ).

٢٦٠٩- عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَذَّنَ بالصَّلاَةِ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ -حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ (رَضيَ اللهُ عَنهُمْ)-رواه أبو داود والترمذي وصححه[٦]:

ئەبو رافیع (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە فاطیمە حەسەنی کوڕی عەلی بوو (خودایان لێ رازی بێ) پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی بانگی نوێژی هەلّ دا بە کۆێچکەی دا (د/ت:ص).

٢٦١٠- عَنْ أَبِي بُرَيْدَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا وُلِدَ لأَحَدِنَا غُلاَمٌ ذَبَحَ شَاةً وَلَطَخَ رَأْسَهُ بِدَمِهَا فَلَمَّا جَاءَ اللَّهُ بِالإِسْلاَمِ كُنَّا نَذْبَحُ شَاةً وَنَحْلِقُ رَأْسَهُ وَنَلْطَخُهُ بِزَعْفَرَانٍ. رواه أبو داود بسند صالح. نسأل الله الحفظ من الزلل والغواية، والتوفيق للرشد والهداية[٧]:

ئەبو بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە سەردەمی نەزانی دا کە یەکێکمان کوڕێکی دەبوو مەڕێ یا بزنێکی سەر دەبڕی‌و بەخوێنەکەی سەری رەنگ دەکرد،

---

[٥] بخاري. عقيقة: تجريد/ ٥ / ١٠٠ ز: ١٨٢٢/ ٥٤٦٧ ، ٢٢٢ ، ٦٠٠٢ ، ٦٣٥٥. مسلم. آداب: ٥٥٨٠.

[٦] صحيح عند الترمذي.

[٧] بسند صالح.

جا کاتێ خودای گەورە ئەم ئایینی ئیسلامەی هێنا مەڕێکمان سەر دەبڕیو سەری منداڵەکەمان دەتاشیو گیراوەی زەعفەرانمان تێ دەگرت (د-سند صالح).

**١٢) فەرەعو عەتیرە: (الفرع والعتیرة)**

٢٦١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ. رواه الخمسة ) أقول -أنا المترجم- : وَزَادَ البخاري (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ، كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ، وَالْعَتِيرَةُ فِي رَجَبٍ. وَقَالَ مسلم (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) زَادَ ابْنُ رَافِعٍ فِي رِوَايَتِهِ وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ كَانَ يُنْتَجُ لَهُمْ فَيَذْبَحُونَهُ[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نە فەرەع هەیەو نە عەتیرە (ش/د/ت/ن) من کەوەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەم دەڵێم: ئیمامی بوخاری (خودای گەورەی لێ خۆشنوودبێ) ئەمەی لێ زیاکردووە: فەرەع یەکەم نۆبەرەی ئاژاڵە جاران سەریان دەبڕی بۆ بتەکانیان، وە عەتیرەیش کوشتی یەك بوو لە دەی یەکەمی مانگی رەجەبا بوو، ئیمامی موسلیمیش (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئیبنو رافیع، لە گێڕانەوەی خۆی دا ئەمەی لێ پتر کردووە: فەرەع یەکەم نۆبەرەی ئاژەڵ بوو سەریان دەبڕی.

٢٦١٢- وَقَالَ نُبَيْشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) نَادَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي رَجَبٍ فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: اذْبَحُوا لِلَّهِ فِي أَيِّ شَهْرٍ كَانَ وَبَرُّوا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَأَطْعِمُوا قَالَ: إِنَّا كُنَّا نُفْرِعُ فَرَعًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَمَا تَأْمُرُنَا قَالَ: فِي كُلِّ سَائِمَةٍ فَرَعٌ تَغْذُوهُ مَاشِيَتُكَ حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ ذَبَحْتَهُ فَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ عَلَى ابْنِ السَّبِيلِ فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ. رواه أبو داود والنسائي[2]:

نوبەیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ بانگی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد گوتی: ئێمە جاران لە نەزانیدا لە مانگی رەجەبدا کوشتییەکمان

---

[1] بخاري. عقيقة، تجريد/١٠١/٥ ذ: ٥٤٧٣/١٨٢٥ ، ٥٤٧٤ . مسلم. أضاحى: ٥٠٨٨.

[2] بسند صالح لأبى داود (شرحه).

دەکوشتەوە پێمان دەگوت عەتیرە، یا رەجەبانە، تۆ بۆ ئەمە فەرمانت بە چییە پێمان؟ فەرمووی: کە کوشتی دەکوژنەوە با بۆرەزای خودا بێ، ئیتر لەهەر مانگێکا سەری دەبڕن قەیدی نیە، هەمیشە چاکەی خوداتان لە بەرچاوبێ‌و لەبەر خاتری ئەو نانی هەژاران بدەن‌و خێرو خێرات بکەن! پیاوەکە گوتی: جاران لە نەزانیدا نۆبەرەی وشتریشمان دەکرد بەخێر، پێمان دەگوت فەرەع یا نۆبەرە بەخشین، تۆ بۆ ئەمە فرەمانت بە چییە پێمان؟ فەرمووی: نۆبەرەی ئەو وشترانە کە بەدەمی خۆیان دەلەوەڕێن لە دەرەوەو بە ئالیك‌و ئالفی ماڵەوە ناژین نۆبەرەکەیان دەکرێ بەخێر، بەم رەنگە ئاژەڵەکەت بەخێوی دەکا تا گەورە ەبێ‌و دەبێ بە وشتر ئەوساکە سەری دەبڕیت‌و گۆشتەکەی دەبەخشیتەوە بەسەر ریبواران‌و هەژارانا ئەمە بەراستی خێرێکی گەلێ جوانە (د-سند صالح).

٢٦١٣- عَنْ أَبِی رَزِینٍ لَقِیطِ بْنِ عَامِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ كُنَّا نَذْبَحُ ذَبَائِحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي رَجَبٍ فَنَأْكُلُ وَنُطْعِمُ مَنْ جَاءَنَا. فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ. رواه النسائي[٣]:

ئەبو رەزین – لەقیطی کوڕی عامیر – (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە جاران لە سەردەمی نەزانیدا لە مانگی رەجەبدا ئاژەڵێکمان سەر دەبڕی، هەم خۆمان لێمان دەخواردو هەم بەشی خەڵکی تریشمان لێی دەدا فەرمووی: ئەوە قەیدی نیە (ن).

٢٦١٤- وَقِيْل لِعَلِيٍّ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُ): أَخْبِرْنَا بِشَيْءٍ أَسَرَّهُ إِلَيْكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا أَسَرَّ إِلَيَّ شَيْئًا كَتَمَهُ النَّاسَ وَلَكِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ « لَعَنَ اللّٰهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللّٰهِ وَلَعَنَ اللّٰهُ مَنْ آوَى مُحْدِثًا وَلَعَنَ اللّٰهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيْهِ وَلَعَنَ اللّٰهُ مَنْ غَيَّرَ الْمَنَارَ. رواه مسلم. والله أعلى وأعلم[٤]:

---

[٣] قالَ المؤلف فى مقدمة شرحه على التاج (جميع ما فى المجتبى لنسائى صحيح عنده) (شرحه).

[٤] مسلم. أضاحى: ٥٠٩٦ ، ٥٠٩٧ ، ٥٠٩٨.

عەرزی عەلی کرا (خودای لێ رازی بێ): شتێکمان پێ بفەرموو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەنهێنی هەر بە تۆی فەرموو بێ، گوتی: هیچی وای بە پەنهانی بەمن نەفەرمووە کە ئەوشتەی لە خەڵکی تر شاردبێتەوە، بەڵام لە خۆیم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): لەعنەت و نەفرینی خودا لەو کەسە بێ کە شت سەر دەبڕێ بۆ غەیری خودا، وە نەفرین و لەعنەتی خودا لەو کەسە بێ کە پەناو داڵدەی بیدعەتکارێ دەدا کە کارێکی بێ شەرعی دەکا بەباو، وەنەفرین و لەعنەتی خودا لەو کەسە بێ کە لەعنەت و نەفرین لە باوك و دایکی خۆی دەکا یا ببێ بەهۆی ئەوە کە خەڵك نەفرینیان لێ بکا وە نەفرین و لەعنەتی خودا لەو کەسە بێ کە سنوورو تخووبی زەوی دەگۆڕێ (م).

## ١٣) بەشی چوارەم: باسی قوربانی

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ – ١٠٨/١-٢}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئێمە کەوثەرمان دا بەتۆ، کە جۆبارێکە لە بەهەشتا، یا خێرو بێری زۆرو بێ شومارە، وەکوو قورئان و پەیام و گەلی گەورەو هاوەڵ و یارانی باش و گەلێ خەلاتی گەورەی تر دەی نوێژ بکە بۆ خودای خۆت و قوربانی سەر ببڕە.

٢٦١٥– عَنْ مِخْنَفِ بْنِ سُلَيْمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا وُقُوفًا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَرَفَاتٍ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ « يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُضْحِيَةٌ وَعَتِيرَةٌ هَلْ تَدْرُونَ مَا الْعَتِيرَةُ؟ هِيَ الَّتِي تُسَمُّونَهَا الرَّجَبِيَّةَ. رواه أصحاب السُّنن[1]:

میخنەفی کوڕی سولەیم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لەکێوی عەرەفات وەستابووین لێیم ژنەوت دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! قوربانی و رەجەبانە هەموو ساڵێ لەسەر گشت خێزانێ

---

[1] بسند حسن (شرحه).

پێویستن، ئایا دەزانن کە رەجەبانە چییە؟ ئەوەیە کە ئێوە پێی دەڵێن کوشتیی رەجەب، یاخود مەولوودی رەجەب (د/ت/ن–س/ح).

٢٦١٦– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الأَضْحَى بِالْمُصَلَّى فَلَمَّا قَضَى خُطْبَتَهُ نَزَلَ مِنْ مِنْبَرِهِ وَأُتِيَ بِكَبْشٍ فَذَبَحَهُ بِيَدِهِ وَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ هَذَا عَنِّي وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي. رواه أبو داود والترمذي[٢]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جەژنی قوربان بوو لە نوێژگاکە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ لە وتارەکەی لێ بووەوە لە دوانگە (مینبەر)ەکەدا بەرزی بەرانێکیان بۆی هێنا بە دەستی خۆی سەری بڕی‌و فەرمووی: باسم الله والله أکبر: بەناوی خودا، خودا لە هەموو کەسێ گەورەترە ئەم قوربانییە لە جیاتی خۆم‌و لە جیاتی ئەو کەسانە لە ئۆمەتم کە قوربانی نەکەن (د–سند صالح – ت – سند غریب).

٢٦١٧– وَسُئِلَ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ الأُضْحِيَةِ أَوَاجِبَةٌ هِيَ؟ فَقَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْمُسْلِمُونَ. فَأَعَادَهَا فَقَالَ: أَتَعْقِلُ! ضَحَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْمُسْلِمُونَ. رواه الترمذي[٣]:

پرسیار کرا لە ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ): قوربان! ئایا قوربانی پێویست (فەرز)ە یانا؟ گوتی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) قوربانی دەکرد، هەروەها موسوڵمانانیش، کابرا پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، ئیبنو عومەریش گوتی: ئایا تێ دەگەی! من دەڵێم: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) قوربانی دەکرد، هەروەها موسوڵمانانیش واتە: ئەگەر پێویستیش نەبێ خێرێکی گەورەیە‌و سوننەتێکی دامەزراوە (ت–س/ص).

٢٦١٨– وَقَالَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أُمِرْتُ بِيَوْمِ الأَضْحَى عِيدًا جَعَلَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِهَذِهِ الأُمَّةِ قَالَ: رَجُلُ أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَجِدْ إِلاَّ مَنِيحَةً أُنْثَى أَفَأُضَحِّي بِهَا؟ قَالَ: لاَ

---

[٢] بسند غريب ولكن سند أبى داود صالح (شرحه).

[٣] بسند صحيح (شرحه).

وَلَكِنْ تَأْخُذُ مِنْ شَعْرِكَ وَتُقَلِّمُ أَظْفَارَكَ وَتَقُصُّ شَارِبَكَ وَتَحْلِقُ عَانَتَكَ فَذَلِكَ تَمَامُ أُضْحِيَتِكَ عِنْدَ اللَّهِ. رواه أبو داود والنسائي(٤):

پێغەمبەر فەرمووی: فەرمانم پێ کراوە کە ڕۆژی قوربان بکەم بە جەژن، خودا خۆی داینـاوە بۆ ئەم ئۆمەتـە پیاوێ گوتی: قوربان! پێم بفەرموو لـە حاڵێکا ئەگەر تەنیا یەك سەر مەڕم هەبوو، ئەویشم دابوو بە دۆخە بە هەژارێ کە شیرو دۆکەی بخوا جا ئایا ئەو مەڕەی لێ بسەنمەوەو بیکەم بە قوربانی یانا؟ فەرمووی: نەء، بەلام قژت کورت بکەرەوەو ناخونت بکەو سمێڵت بقرتێنەو بەرت بتاشە، ئیتر ئەمە دەبێ بە قوربانیبەکی تەواو بۆ تۆ لەلای خودا (د/ن).

٢٦١٩- وَسُئِل أبو أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَقَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ حَتَّى تَبَاهَى النَّاسُ فَصَارَتْ كَمَا تَرَى(٥):

پرسیار کرا لە ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (خودای لێ ڕازی بێ): ئایا بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) قوربانی چۆن بوو؟ گوتی: پیاو مەڕێ یا بزنێکی دەکرد بە قوربانی لەباتی خۆی‌و لە باتی خێزانی، ئیتر خۆشیان لێیان دەخواردو لێشیان دەبەخشییەوە، تا خەڵکەکە کردیان بە چاولێکەری‌و ئاوای لێ هاتووە کە دەیبینیت (ت-ص).

٢٦٢٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا عَمِلَ آدَمِيٌّ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ مِنْ إِهْرَاقِ الدَّمِ إِنَّهَا لَتَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقُرُونِهَا وَأَشْعَارِهَا وَأَظْلَافِهَا وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ اللَّهِ بِمَكَانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ مِنَ الأَرْضِ فَطِيبُوا بِهَا نَفْسًا. رواهما الترمذي(٦):

---

(٤) لاحظ ماجاء فی رقم: ٣ من تسلسل/ ١٢.

(٥) بسند صحیح (شرحه).

(٦) بسند حسن (شرحه).

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی:** هیچ کرەوەیەکی ئادەمیزاد بە قەد ئەوە لەلای خودا خۆشەویست و پەسەند نیە کە لە ڕۆژەکانی جەژنی قورباندا قوربانی بکا، لە ڕۆژی قیامەتا ئەو قوربانییە بە خۆی و بە شاخ و بەموو بەسمیەوە دێ و دادەنرێ لەناو تای خێری تەرازووی خێرو شەڕی قوربانیکەردا وە بەر لەوە کە خوێنەکەی بکەوێتە سەر زەوی خودا گیرای دەکا! کەوابوو ئێوەیش بەدڵێکی پاک و بێگەردەوە قوربانی بکەن (ت-ح).

٢٦٢١- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ عَجَّلَهُ لأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ. وَكَانَ قَدْ ذَبَحَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. فَقَالَ: اذْبَحْهَا - وَلَنْ تَجْزِيَ جَذَعَةٌ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ[٧]:

**بەراء** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی:** لەم ڕۆژەمانا یەکەم شت کە دەستی پێ بکەین ئەوەیە کە نوێژی جەژن دەکەین، ئینجا دەگەڕێینەوەو قوربانی سەردەبڕین، جا ئەوەی ئاوا بکا ئەوە یاساو سوننەتی ئێمەی پێکاوە، وەڵێ ئەوەی لە پێش نوێژدا قوربانی سەربڕێ ئەوە دانانرێ بە قوربانی و فڕی بەسەر قوربانییەوە نیە، بەڵکوو ئەوە گۆشتەو کردوویەتی بۆ کەس و کاری خۆی. ئەبو بوردە (خودای لێ ڕازی بێ) هینەکەی خۆی سەربڕیبوو، جا عەرزی حەزرەتی کرد: کاوڕێکم هەیە لە شەکێ باشترە ئایا دەبێ کە بیکەم بە قوربانی؟ فەرمووی: بیکە، بەڵام لەپاش تۆ کاوڕ بۆ کەسی تر دروست نییە، کاوڕی یەك ساڵانە بۆ قوربانی دەست نادا (ش/د/ت).

---

[٧] بخاري. عيدين: ٩٥١. تجريد/ ٤٧٧/١ ذ: ٥٠٠/ ٩٥١ ، ٩٥٥ ، ٩٦٥ ، ٩٦٨ ، ٩٧٦ ، ٩٨٣ ، ٥٥٤٥ ، ٥٥٥٦ ، ٥٥٥٧ ، ٥٥٦٠ ، ٥٥٦٣ ، ٦٦٧٣. مسلم. أضاحي: ٥٠٤٢ - ٥٠٤٩. أبو داوُد. أضاحي: ٢٨٠٠ ، ٢٨٠١. ترمذي. أضاحي: ١٥٠٨. نسائي. عيدين: ١٥٦٢ ، ١٥٦٩ ، ١٥٨٠ ، ٤٤٠٦ ، ٤٤٠٧. تحفة الأشراف: ١٧٦٩.

٢٦٢٢- وَعَنْهُ قَالَ: خَطَبَنَا النَّبِيُّ (صَلّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَوَجَّه قِبْلَتَنَا وَنَسَكَ نُسْكَنَا، فَلاَ يَذبح حتَّى يُصَلي. رواهما الأربعة[٨]:

دیسان بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی جەژنی قوربان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەپاش نوێژی جەژنەوە وتارێکی خوێندەوە بۆمان، فەرمووی: ئەوەی وەك ئێمە نوێژ دەکاو روو دەکاتە رووگەی ئێمەو بەپێی یاسای ئێمە قوربانی دەکا، دەبێ قوربانی سەر نەبڕێ تا لە نوێژی جەژن دەبێتەوە (ش/د/ت).

## ١٤) چی دەست دەدا بۆ قوربانی‌و چی دەست نادات:
## ما يجزيء من الاضحية وما لا يجزيء

٢٦٢٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ ضَحىّ النَّبِيُّ (صَلّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا. رواه الخمسة (رَضيَ اللهُ عَنْهُمْ)[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو بەرانی تەوی شاخداری کرد بە قوربانی بە دەستی خۆی سەری بڕین وە ناوی خودای هێناو ئەڵلاهو ئەکبەری کردو فەرمووی: بسم الله والله اکبر. وە قاچی دانا لەسەر لاملیان وە لەسەر لای چەپ پاڵی خستن‌و بە دەستی چەپی سەری گرتن‌و بە دەستی راستی چەقۆکەی گرت ئینجا سەری بڕین (ش/د/ت/ن).

٢٦٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّی اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ يَطَأُ فِي سَوَادٍ وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ فَأُتِيَ بِهِ لِيُضَحِّيَ بِهِ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ، فَفَعَلَتْ، ثُمَّ أَخَذَهَا وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ ثُمَّ ذَبَحَهُ ثُمَّ قَالَ:

---

[٨] تقدم تخريجه بمثل الحديث الذى قبله (مسلم: ٥٠٤٢).

[١] بخاري. أضاحى: ٥٥٦٥. مسلم. أضاحى: ٥٠٦٠. ترمذى. أضاحى: ١٤٩٤. نسائى. ضحايا: ٣٩٩.

بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ثُمَّ ضَحَّى بِهِ. رواه الخمسة إلا البخاري[٢]:

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کرد بەرانێکی شاخداریان بۆ هێنا، کە بیکا بە قوربانی، هەر چوار پەلی و دەمووچاوو ژێرسکی بەرانەکە بۆ رەڵووکێکی رەشباو بوو. فەرمووی: ئەی عائیشە! کێردەکە بێنە بە هەسانێ، بە بەردێ تیژی کە منیش فەرمانەکەیم بەجێ هێناو وام کرد، ئینجا کێردەکەی هەڵگرت و بەرانەکەی پاڵ خست و سەری بڕی و لەکاتی سەبڕینەکەیدا فەرمووی: باسم الله اللهم تقبل من محمد وآل محمد ومن أمة محمد: بەناوی خودا، ئەی خودا! ئەی پەروەردگارم! ئەم قوربانیبە قەبووڵ کە لە موحەممەدو لە خانەوادەی موحەممەدو لەگەڵ موحەممەد ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە بەرانەکەی کرد بە قوربانی (م/د/ت/ن).

٢٦٢٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْطَاهُ غَنَمًا يَقْسِمُهَا عَلَى صَحَابَتِهِ ضَحَايَا، فَبَقِيَ عَتُودٌ فَذَكَرَهُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ضَحِّ بِهِ أَنْتَ. رواه الخمسة[٣]:

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بڕکەیێ رانی داپێم، کە دابەشی بکەم بەسەر هاوڕێکانمدا بۆ قوربانی گێسکێ مایەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد (دروودی خودای لەسەربێ): گێسکێ ماوەتەوە، فەرمووی: ئەوەیش بکە بە قوربانی بۆ خۆت (ش/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٢٦٢٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَذْبَحُوا إِلاَّ مُسِنَّةً إِلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ. رواه مسلم وأبو داود والنسائي[٤]:

---

[٢] مسلم. اضاحی: ٥٠٦٤. أبو داوُد. أضاحی: ٢٧٩٢.

[٣] بخاري. وكالة: ٢٣٠٠ ، ٢٥٠٠. مسلم.

[٤] مسلم. اضاحی: ٥٠٥٥. أبو داوُد. أضاحی: ٢٧٩٧. نسائی. ضحایا: ٤٣٩٠.

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاژەڵی سەرە بکەن بە قوربانی، وەلێ ئەگەر دەستتان نە دەڕۆیشت کاوڕو کێسکیش بکەن (م/د/ن).

٢٦٢٧- ← (ب/٢ ز/١٠٩ ل/ ف/١)[٥].

٢٦٢٨- ← (ب/٢ ز/١٠٩ ل/ ف/٢)[٦].

٢٦٢٩- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصَابِعِي أَقْصَرُ مِنْ أَصَابِعِهِ وَأَنَامِلِي أَقْصَرُ مِنْ أَنَامِلِهِ فَقَالَ: أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي الأَضَاحِي: الْعَوْرَاءُ بَيِّنٌ عَوَرُهَا وَالْمَرِيضَةُ بَيِّنٌ مَرَضُهَا وَالْعَرْجَاءُ بَيِّنٌ ظَلْعُهَا وَالْكَسِيرُ الَّتِي لاَ تَنْقَى. رواه أصحاب السُّنن[٧]:

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بۆ خۆم لە تەنشتی پێغەمبەرەوە بووم (درودی خودای لەسەربێ) تەماشام کرد پەنجەو سەرپەنجەکانی من کورتترن لە پەنجەو سەرپەنجەکانی ئەو، لەوکاتەدا هەڵسایەوە دوانێکی دا بۆمان، فەرمووی: ئەم چوار شتە بەکاری قوربانی نایە: ئاژەڵی کوێری دیاریو ئاژەڵی نەخۆش کە نەخۆشییەکەی پێوە دیاربێو ئاژەڵی شەلی تەواو لەنگو ئاژەڵی لەڕكو لاوازی بێ مۆخ (د/ت/ن-ص).

٢٦٣٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالأُذُنَيْنِ وَلاَ نُضَحِّيَ بِعَوْرَاءَ وَلاَ مُقَابَلَةٍ وَلاَ مُدَابَرَةٍ وَلاَ خَرْقَاءَ وَلاَ شَرْقَاءَ. قَالَ: زُهَيْرٌ فَقُلْتُ لأَبِي إِسْحَاقَ أَذَكَرَ عَضْبَاءَ قَالَ: لاَ. قُلْتُ فَمَا الْمُقَابَلَةُ؟ قَالَ: يُقْطَعُ طَرَفُ الأُذُنِ. قُلْتُ فَمَا الْمُدَابَرَةُ؟ قَالَ: يُقْطَعُ مِنْ مُؤَخَّرِ الأُذُنِ. قُلْتُ فَمَا الشَّرْقَاءُ قَالَ: تُشَقُّ الأُذُنُ. قُلْتُ فَمَا الْخَرْقَاءُ؟ قَالَ: تُخْرَقُ أُذُنُهَا لِلسِّمَةِ. رواه أصحاب السُّنن (رَضِيَ اللهُ عَنهُمْ)[٨]:

---

[٥] تقدم برقم: ١٥٩٦/١ مجلد/٢ تسلسل/ ١٠٩.

[٦] تقدم برقم: ١٥٩٧/٢ مجلد/٢ تسلسل/ ١٠٩.

[٧] بسند صحيح (شرحه).

[٨] بسند صحيح (شرحه).

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردین کە سەرنجی چاوو گوێچکەی قوربانی بدەین، وە ئاژەڵی کوێرو قوتو کەڕیلەو گوێ کون تێ بوو گوێ داقەڵەشاویش نەکەین بە قوربانی. گوتم: ئاژەڵی قوت کامەیە؟ گوتی: ئەوەیە کە سەری گوێچکەی قرتابێ، گوتم: ئەی کەڕیلە کامەیە؟ گوتی: ئەوەتە کە لەبنا گوێچکەی خرپ کرابێ، گوتم: ئەی گوێ داقەڵشاو کامەیە؟ گوتی: ئەوەیە کە گوێچکەی تا بن داتلیشێنرابێ، گوتم: ئەی گوێ کون تێ بوو کامەیە؟ گوتی: ئەوەیە کە بۆنیشانەو دیاری کردن گوێی دەسمن یا یەکێ لەمانەی کە گوتمان دەیکەن لە گوێی بۆ ناسینەوە (د/ت/ن-س/ص).

٢٦٣١- وَعَنْهُ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُضَحَّى بِعَضْبَاءِ الأُذُنِ وَالْقَرْنِ. رواه أبو داود والترمذي. نسأل الله الستر والتوفيق. آمين[٩]:

دیسان عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی نەداوە کە ئاژەڵی گوێ قرتاوو شاخ شکاو بکرێن بە قوربانی (د/ت-س/ص).

## ١٥) پاشەکییەك، باسی ئاواو دەستووری قوربانیو باسی ئەوەیش کە دروستە لێی هەڵبگیرێ: (خاتمة في آداب الضحية وجواز أدخارها)

٢٦٣٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَبَحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الذَّبْحِ كَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ مُوجَأَيْنِ فَلَمَّا وَجَّهَهُمَا قَالَ: إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ عَلَى مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ اللّٰهُمَّ مِنْكَ وَلَكَ عَنْ مُحَمَّدٍ وَأُمَّتِهِ بِاسْمِ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ ذَبَحَ. رواه أبو داود وابن ماجه[١]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژی جەژنی قوربان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو بەرانی شاخداری تەوی خەساوی سەربڕیو کردنی بە

---

[٩] بسند صحيح (شرحه).

[١] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

قوربانی، لەوکاتەدا کە رووی کردنە قیبلە فەرمووی: إني وجهت وجهي للذي فطر السموات والارض (على ملة ابراهيم) حنيفا وما أنا من المشركين. إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لا شريك له وبذلك أمرت وأنا من المسلمين. اللهم منك ولك عن محمد وأمته باسم الله والله أكبر: من بەدڵێکی پاکەوە رووی خۆم دەکەمە ئەو کەسە کە ئەم ئاسمانانەو ئەم زەوییەی لە نەبوون دروست کردووە، من لەسەر ئایینە بێگەردەکەی ئیبراهیمم‌و، لە هەموو ئایین‌و بیرو باوەڕێکی پووچ‌و بەتاڵ لام داوەو بەریم، وە من بە هیچ جۆرێ لەو کاسانە نیم کە فرەخوان‌و هاوڕێ بۆ خودا بڕیار دەدەن، بێگومان نوێژو خواپەرستیم‌و ئاواو یاسای حەجکردنم‌و ژیانم‌و مردنم هەر بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیانەو بەدەستی ئەوەو پاداشم لای خۆیەتی، هیچ هاوبەشێکی نییەو من بەمە فەرمانم پێ کراوە کەوا بەدڵێکی ساف‌و بێگەردەوە بڵێم من یەکێکم لە موسوڵمانان، پەروەردگارم! ئەمە هی خۆتەو لەتۆوە خەڵات کراوە بەمن، وانیش پێشکەشی دەکەمەوە بەخۆت! دەیکەم بە قوربانی لەباتی موحەممەدو لەباتی گەلەکەی بەناوی خودا، خودا لە هەموو کەسێ گەورەترە ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سەری بڕی. (د-سند صالح - ئیبنو ماجه - خودایان لێ رازی بێ).

٢٦٣٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ فَإِذَا أُهِلَّ هِلاَلُ ذِي الْحِجَّةِ فَلاَ يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِهِ وَلاَ مِنْ أَظْفَارِهِ شَيْئًا حَتَّى يُضَحِّيَ. رواه الخمسة إلا البخاري[٢]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ دەیەوێ قوربانی بکا، کە مانگی نوێی قوربان هەڵهات ئیتر بانەمووی لەخۆی بکاتەوەو نەناخونی خۆی بکا، تا قوریانییەکەی دەکات (م/د/ت/ن).

---

[٢] مسلم. أضاحی: ٥٠٨٩ - ٥٠٩٣. أبو داود. أضاحی: ٢٧٩١. ترمذی. أضاحی: ١٥٢٣. نسائی. ضحایا: ٤٣٧٣، ٤٣٧٤، ٤٣٧٥.

٢٦٣٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَأْكُلْ أَحَدٌ مِنْ لَحْمِ أُضْحِيَّتِهِ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. رواه مسلم والترمذي[٣]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هیچ کەس (لە سێ رۆژ پتر) لە گۆشتی قوربانی خۆی نەخوات (م/ت).

٢٦٣٥- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ فَلاَ يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ وَفِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ. فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا فِي العَامِ الْمَاضِي؟ قَالَ: كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا. رواه الخمسة. والله أعلم[٤]:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کەسەی لە ئێوە قوربانی دەکا نابێ لە پاش سێ شەو لە گۆشتی ئەو قوربانییە لە ماڵیا بمێنێ جا لە ساڵی ئاییندەدا عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمساڵیش وەك پار بکەینەوە؟ فەرمووی: نەء، هەم خۆشتان لێی بخۆن‌و هەم بەشی خەڵکی تریشی لێ بدەن‌و هەم قایمە (ادخار)یشی لێ بکەن، پار بۆیەکە وام گوت چونکە پار ساڵکەی نەهاتی بوو، خەڵکەکە پەرۆش بوون‌و حاڵیان پەرێشان بوو ویستم کە ئێوەیش یاریدەیان بدەن‌و دەستگیرۆدەیی خەڵك بکەن! (ش/د/ت/ن).

---

[٣] مسلم. أضاحی: ٥٠٧٣. ترمذی. أضاحی: ١٥٠٩.

[٤] بخاري. أضاحی: تجرید/١٣٥/٥ ژ: ١٨٣٨/ ٥٥٦٩.

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی خواردەمەنیو خواردنەوە

(پێنج بەشو دوا وتارێكە)

## ١٦) بەشی یەكەم: نەریتو دەستووری خۆراكو نان خواردن.

## كتاب الطعام والشراب (وفيه خمسة فصول وخاتمة)

### الفصل الأول: في آداب الطعام

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ – ٢٣/ ٥١}.

خـودای گـەورە دەفـەرموێ: ئـەی پێغەمبـەرانی خـودا! بخـۆن لـە خواردەمەنی حەلاڵو پاك، وە كارو كردەوەی باش بكەنو ئاگاتان لە خۆتان بێ، بەراستی من ئاگام لە هەموو شتێ هەیە كە ئێوە دەیكەن.

{وَقَالَ تَعَالَى: وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ – ٣١/٧}.

دیسان یەزدانی مەزن دەفەرموێ: بخۆنو بخۆنەوە، بەڵام زیادە ڕەوی مەكەن، چونكی بە ڕاستی خودا خۆشی نایێ لەو كەسانە كە زیادە ڕەون.

٢٦٣٦– عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَرَأْتُ فِي التَّوْرَاةِ إِنَّ بَرَكَةَ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ. رواه ابو داود والترمذي[1]:

سەلمان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە تەوراتدا خوێندبوومەوە: كە دەست شۆردن لە پێش نانخوادن دا هۆی پیتو بەرەكەتیەتی، جا كە ئەمەم باسكرد بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەست شۆردن لە بەرو دوای خواردنی نانو خۆراك هۆی پیتو فەڕیەتی (د/ت–سند ضعيف).

٢٦٣٧– عَنْ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كُنْتُ غُلاَمًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ فَقَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا

[1] بسند صحيح (شرحه).

غُلاَمُ سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ. فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ. رواه الأربعة[٢]:

**عومەری كوڕی ئەبو سەلەمە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: منداڵ بووم لە لای پێغەمبەر بووم زڕكوڕی بووم، خۆی بەخێوی دەكردم. كە نانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بە ناو لەگەنەكەدا بە ئارەزووی خۆم. حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ڕۆڵە! ناوی خودابێنەو بیسمیللا بكەو بە دەستی ڕاستت بخۆو لەبەر دەمی خۆشتەوە بخۆ گوتی: ئیتر لەو ساوە تا ئێستا هەر بەو جۆرە نان دەخۆم! (ش/د/ت).**

**٢٦٣٨-** عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: الشَّيْطَانُ لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ. وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ قَالَ: الشَّيْطَانُ أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ. وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ. رواه مسلم وأبو داود والنسائي[٣]:

**جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاو كە دەچێتەوە بۆماڵەوە، ئەگەر لەكاتی چوونە ماڵو لەكاتی نان دانان دا ناوی خودا بێنێ ئیتر شەیتان دەڵێ: نەجێگەی شەوو نە شێوتان لێرە بۆ نەما، بەڵام ئەگەر لەكاتی چوونە ماڵدا یادی خودا نەكا شەیتان دەڵێ: جێگەی شەوتان دەست كەوت، جا ئەگەر لەكاتی نانخواردنیش دا دیسان یادی خودای نەكردەوە شەیتان دەڵێ: هەم جێگەی شەوو هەم شێوتان دەست كەوت[١] (م/د/ن).**

---

[٢] بخاري. أطعمة: ٥٣٧٦. تجريد/٥/٧٨ ژ: ١٨٠١ ، ٥٣٧٦ ، ٥٣٧٧ ، ٥٣٧٨. مسلم. أشربة: ٥٢٣٧.

[٣] مسلم. أشربة: ٥٢٣٠. أبو داود. أطعمة: ٣٧٦٥.

[١] واتە: بەزاری ئەم چەرخە ماڵەكە دەبێ بە ئوتێلو لوقنتەی شەیتان. - وەرگێڕ-

٢٦٣٩- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَ بِيَدِ مَجْذُومٍ فَأَدْخَلَهُ مَعَهُ فِي الْقَصْعَةِ ثُمَّ قَالَ: كُلْ بِسْمِ اللّٰهِ ثِقَةً بِاللّٰهِ وَتَوَكُّلاً عَلَيْهِ. رواه الترمذي وابو داود وابن ماجه[٤]:

دیسان گوتی: جاریٚ پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) لەگەڵ یاران دا خەریك بوو نانی دەخوارد لەوكاتەدا پیاویٚكی گول هات هەموو قیٚزیان لیٚ كردەوە، بەڵام پیٚغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربیٚ) دەستی كابرا گولەكەی گرت‌و بردیە سەر قاپەكەی خۆی‌و لەگەڵیا دەستی كرد بە نانخواردن فەرمووی: بخۆ بەناوی خودا، بە تەمای خودا: پشتەسوورم بە پاریٚزگاریی خوداو پشت‌و پەنام هەر خودایە (ت: غریب-د-سند صالح -ن).

٢٦٤٠- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا إِذَا حَضَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَعَامًا لَمْ نَضَعْ أَيْدِيَنَا حَتَّى يَبْدَأَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِنَّا حَضَرْنَا مَعَهُ مَرَّةً طَعَامًا فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ كَأَنَّهَا تُدْفَعُ فَذَهَبَتْ لِتَضَعَ يَدَهَا فِي الطَّعَامِ فَأَخَذَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهَا ثُمَّ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ كَأَنَّمَا يُدْفَعُ فَأَخَذَ بِيَدِهِ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَنْ لاَ يُذْكَرَ اسْمُ اللّٰهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الْجَارِيَةِ لِيَسْتَحِلَّ بِهَا فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا فَجَاءَ بِهَذَا الأَعْرَابِيِّ لِيَسْتَحِلَّ بِهِ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِي مَعَ يَدِهَا. رواه مسلم وابو داود والنسائي[٥]:

حوزەیفە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: جاران كە لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربیٚ) نانیان دادەنا بۆمان، دەستمان بۆی نەدەبرد هەتا پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) دەستی پیٚ نەكردایە، جاریٚ لە خزمەتی دابووین، نانیان دانا، لەوكاتەدا كچیٚ هات دەتگوت بەپاڵ دەیهیٚنن: كچەكە ویستی دەست ببا بۆ نانەكە، بەڵام پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) توند دەستی گرت‌و نەیهیٚشت، لە پاشا عەرەبیٚكی دەشتەكیش هات ئەویش دەتگوت بەپاڵ دەیهیٚنن ویستی لە نانەكە بخوا پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) دەستی ئەویشی گرت‌و

---

[٤] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح والترمذى بسند غريب (شرحه).

[٥] مسلم. أشربة: ٥٢٢٧ – ٥٢٢٩. أَبُو دَاوُدَ. أطعمه: ٣٧٦٦.

فەرمووی: هەر خواردەمەنی و نانێ ئەگەر ناوی خودای لەسەر نەبرێ شەیتان بە حەڵاڵی دەزانێ، ئەوە بۆیە لە پێشا ئەم كچۆڵەی هێنا تانانەكەی پێ حەڵاڵ بكا، بۆیە منیش دەستیم گرت، ئینجا ئەوە بوو لە پاشا ئەم عەرەبە دەشتەكییەی هێنا تا بەو حەڵاڵی بكا، ئەوەبوو دەستی ئەویشم گرت، بەو كەسە كە گیانی منی بە دەسە دەستی شەیتان وا لەناو دەستی ئەم كچۆڵەیەدا كە دەستی وا لەناو دەستی مندا (م/د/ن).

٢٦٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَإِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللَّهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ. رواه أبو داود والترمذي[٦]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كەنان دەخۆن ناوی خودا ببەن، ئەگەر لە سەرەتاوە لە بیرتان نەبوو وە ناوی خوداتان نەهێنا، كەی یادتان كەوتەوە بڵێن: باسم الله أوله وآخره: بە ناوی خودا لەبەرو دوایەوە: لە سەرەتاو لە كۆتاییەوە. (د/ت-ص).

٢٦٤٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ طَعَامًا فِي سِتَّةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَا إِنَّهُ لَوْ سَمَّى لَكَفَاكُمْ. رواه الترمذي وصححه[٧]:

دیسان ئەو گوتی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ شەش كەس لە هاوڕێكانی نانی دەخوارد، لەولاوە عەرەبێكی دەشتەكی هات نانەكەی كرد بە دوو پاروو خواردی! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەدی ئەم كابرایە ئەگەر ناوی خودای بهێنابایە نانەكە بەشی دەكردین! (ت:ص).

---

[٦] بسند صحيح (شرحه).

[٧] صحيح عند الترمذي.

٢٦٤٣- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسًا وَرَجُلٌ يَأْكُلُ فَلَمْ يُسَمِّ حَتَّى لَمْ يَبْقَ مِنْ طَعَامِهِ إِلاَّ لُقْمَةٌ فَلَمَّا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَالَ: مَا زَالَ الشَّيْطَانُ يَأْكُلُ مَعَهُ فَلَمَّا ذَكَرَ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ اسْتَقَاءَ مَا فِي بَطْنِهِ. رواه أبو داود والنسائي[٨]:

رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی دانیشتبوو، پیاوێكیش نانی دەخواردو، پیاوەكە ناوی خودای نەهێنا، تایەك پاروومایەوە، كە ئەو پارووەی برد بۆ دەمی لەوكاتەدا گوتی: بەناوی خودا چ لە پێشداو چ لە پاشدا. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێكەنیو فەرمووی: شەیتان لە سەرەتاوە هەر دەیخوارد لەگەڵیدا هەتا ناوی خودای هێنا ئیتر هەرچی لەسكیابوو هەمووی هەڵهێنایەوە! (د-سند صالح-ن).

٢٦٤٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٩]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كەشت دەخۆن بە دەستی راست بیخۆن، كە شتیشتان خواردەوە بە دەستی راستتان بیخۆنەوە چونكێ شەیتان بە دەستی چەپی شت دەخواتو دەخواتەوە! (م/د/ت).

٢٦٤٥- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَكَلَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشِمَالِهِ فَقَالَ: كُلْ بِيَمِينِكَ. فَقَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ قَالَ: لاَ اسْتَطَعْتَ مَا مَنَعَهُ إِلاَّ الْكِبْرُ. قَالَ: فَمَا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ. رواه مسلم[١٠]:

---

[٨] بسند صالح (شرحه).

[٩] مسلم. اشربته: ٥٢٣٣. أبو داود. أطعمة. ٣٧٧٦. ترمذی. أطعمة: ١٧٩٩.

[١٠] مسلم. أشربته: ٥٢٣٦.

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ لە خزمەتی حەزرەتتدا (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی چەپی نانی دەخوارد، پێی فەرموو: بە دەستی ڕاستت نان بخۆ گوتی: ناتوانم فەرمووی: دە هەرگیز نەتوانیت! كابرا بە درۆ گوتی ناتوانم لە ڕاستی دا دەعیەی نەهات كە بە گوێی پێغەمبەر بكا گوتی: جا نزاكەی پێغەمبەری لێ گیرا بوو ئیتر جارێكی تر ئەو دەستەیی بۆ نەبرا بۆ دەمی! (م).

٢٦٤٦- وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): مَا عَابَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ. رواه الثلاثة[١١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەرگیز خراپەی لە خواردن و نان نە دەگرت، ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بە دڵیشی نەبوایە وازی لێ دەهێنا (ش/د).

٢٦٤٧- عَنْ أَبِي جُحيفة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِي لاَ آكل مُتَّكِئاً. رواه الخمسة إلا مسلما[١٢]:

ئەبو جوحەیفە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من بە پاڵەوە شت ناخۆم (ب/د/ت/ن).

٢٦٤٨- وَقَالَ أَنَسُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُقْعِيًا يَأْكُلُ تَمْرًا. رواه الخمسة إلا البخاري[١٣]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) بە چیچكانەوە خورمای دەخوارد (م/د/ت/ن).

---

[١١] بخاري. مناقب: ٣٥٦٣ ، ٥٤٠٩ = تجريد/ ٨٢/٥ ژ: ١٨٠٧. مسلم. أشربة: ٥٣٤٨. أبو داود. أطعمة: ٣٧٦٧. ترمذي. بروصلة: ٢٠٣١.

[١٢] بخاري. أطعمة: ٥٣٩٧. تجريد/ ٨٢/٥ ژ: ١٨٠٦/ ٥٣٩٩ ، ٥٣٩٨.

[١٣] مسلم. أشربة: ٥٢٩٩. أبو داود. أطعمة: ٣٧٧١.

٢٦٤٩- وَقَالَ ابْن عُمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُما): نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ مَطْعَمَيْنِ: عَنِ الْجُلُوسِ عَلَى مَائِدَةٍ يُشْرَبُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ عَنْ الأَكْلِ وَهُوَ مُنْبَطِحٌ عَلَى وَجْهِهِ. رواه ابو داود والنسائي[١٤]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگە نادا کە لەسەر ئەم دوو شێوەیە نان بخورێ: دانیشتن لەسەر سفرەیێ کە ئارەق لەسەری بخورێتەوە، هەروەها خواردن بە راکشانەوە لە سەردەم (د/ن/حا:ص).

٢٦٥٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ الشُرْبَ قَائِمًا. فَقِيلَ: الأَكْلُ؟ قَالَ: ذَاكَ أَشَدُّ. رواه الترمذي ومسلم ولفظه: ذاك أشر أو أخبث[١٥]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگە نادات کە شت بە پێوە بخورێتەوە، گوترا: ئەی خواردن بە راوەستانەوە چۆنە؟ گوتی: خواردن خراپتر (ت/م) گفتەی (م: قەتادە گوتی: گوتمان بە ئەنەس ئەی خواردن بەسەر پێوە چۆنە؟ گوتی: ئەو بەدتر، یا گوتی: ئەو پیستر.

٢٦٥١- عَن ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلاَ يَأْكُلْ مِنْ أَعْلَى الصَّحْفَةِ وَلَكِنْ يَأْكُلُ مِنْ أَسْفَلِهَا فَإِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ مِنْ أَعْلاَهَا. رواه ابو داود والترمذي. ولفظه: إِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ وَسَطَ الطَّعَامِ فَكُلُوا مِنْ حَافَتَيْهِ وَلاَ تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهِ[١٦]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەنان دەخۆن لە تەوقە سەری دەورییەکەوە مەخۆن، بەڵکو لە تەنیشتیەوە بخۆن، چونکی پیتو فەڕ لە تەوقە سەرەکەیەوە دێتە خوارەوە

---

[١٤] ورواه الحاكم وصححه (شرحه).

[١٥] مسلم. أشربة: ٥٢٤٣. ترمذی. أشربة: ١٨٧٩.

[١٦] بسند صحيح (شرحه).

(د/ت–ص) گفتەی (ت): پیتو فەڕ لە ناوەڕاستی خۆراكەوە دێتە خوارەوە، جا لەبەر ئەوە لەم لاولاكەیەوە بخۆنو لە ناوەڕاستەكەیەوە مەخۆن!

٢٦٥٢– عَنْ عَمْرَو بْنَ أُمَيَّةَ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فِي يَدِهِ، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَلْقَاهَا وَالسِّكِّينَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. رواه الشيخان والترمذي[١٧]:

عەمری كوڕی ئومەییە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) شانی مەڕێكی بە دەستەوە بوو، بە چەقۆیێ پارچە پارچەی دەكردو دەیخوارد، لەو كاتەدا بانگیان كرد بۆ نوێژ، ئیتر گۆشتو چەقۆكەی داناو هەڵساو چوو بەرنوێژییەكەی بۆ كردن، بەڵام لەبەر خواردنی گۆشتەكە دەسنوێژی نەگرتەوە (ش/ت).

٢٦٥٣– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقْطَعُوا اللَّحْمَ بِالسِّكِّينِ فَإِنَّهُ مِنْ صَنِيعِ الأَعَاجِمِ وَانْهَسُوهُ فَإِنَّهُ أَهْنَأُ وَأَمْرَأُ. رواه أبو داود والترمذي[١٨]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە چەقۆو چنگاڵ گۆشت مەپچڕن لەكاتی خواردنی گۆشتدا چونكە ئەوە پیشەی بەڕانییەكانە، بەڵام بەقەپ بیكرێننەوە، چونكی وا خۆشترو نۆشترە (د/ت–سند ضعیف).

٢٦٥٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَأْكُلُ أَكْلاً كَثِيرًا، فَأَسْلَمَ فَكَانَ يَأْكُلُ أَكْلاً قَلِيلاً، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: « إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرَ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ. رواه الشيخان والترمذي[١٩]:

---

[١٧] بخاري. وضوء: تجريد/ ١٦٩/١ ز: ٢٠٨/ ٦٧٥ ، ٢٩٢٣ ، ٥٤٠٨ ، ٥٤٢٢ ، ٥٤٦٢. مسلم. حيض: ٧٨٨ – ٧٩١. ترمذى. أطعمة: ١٨٣٦.

[١٨] بسند ضعيف (شرحه).

[١٩] بخاري. أطعمة: ٥٣٩٣. تجريد/٨١/٥ ذ: ١٨٠٥ / ٥٣٩٣ ، ٥٣٩٥. مسلم. أشربة: ٥٣٤٢ ، ٥٣٤٧. ترمذى. أطعمة: ١٨١٩.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هەبوو زۆری دەخوارد كاتێ موسوڵمان بوو كە مخۆربوو، كە ئەمەیان عەرزی حەزرەت كرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): موسوڵمان كەمخۆرەو بە قەناعەتەو خواردنی بە پیتو فەرە بەڵام كافرو بێ بڕوا چاو برسییەو سكەڕۆو سكدڕاوەو خواردنی بێ پێتو فەرە بۆیە هەر دەخواو هەر تێر نابێ، وەك حەوت ورگی هەبێ وایە (ش/ت).

٢٦٥٥- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَافَهُ ضَيْفٌ وَهُوَ كَافِرٌ فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِحَلاَبِ شَاةٍ فَشَرِبَهُ ثُمَّ أُخْرَى فَشَرِبَهُ ثُمَّ أُخْرَى فَشَرِبَهُ حَتَّى شَرِبَ حِلاَبَ سَبْعِ شِيَاهٍ ثُمَّ أَصْبَحَ فَأَسْلَمَ فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشَاةٍ فَشَرِبَ حِلاَبَهَا ثُمَّ أَمَرَ بِأُخْرَى فَلَمْ يَسْتَتِمَّهَا فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمُؤْمِنُ يَشْرَبُ فِي مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَشْرَبُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ. رواه مسلم والترمذي[٢٠]:

دیسان گوتی: پیاوێكی بێ بڕوا (كافر) بوو بە میوانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانیكرد مەڕێكیان دۆشیو شیرەكەیان بۆیهێنا، ئەویش خواردیەوە، پاشان مەڕێكی تریشیان بۆ دۆشی ئەویشی خواردەوە، تا لەسەر ئەم حاڵە شیری حەوت مەڕی خواردەوە. بۆ سبەینێ پیاوەكە ئیسلام بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی كرد مەڕێكیان بۆ دۆشیو شیرەكەی مەڕی دووهەمیشیان دایێ، بەڵام بۆی تەواو نەكرا. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: موسوڵمان بۆ شت خواردنەوە یەك سكی هەیە بەڵام بێ بڕوا دەڵێی حەوت سكی هەیەو هەرحەوتیان پڕدەكا (م/ت).

٢٦٥٦- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ((رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَأْكُلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ وَيَلْعَقُ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يَمْسَحَهَا[٢١]:

---

[٢٠] مسلم. أشربة: ٥٣٤٧. ترمذي. أطعمة: ١٨١٩.

[٢١] مسلم. أشربة: ٥٢٦٤ — ٥٢٦٧. أبو داود. أطعمة: ٣٨٤٨.

كەعبی كوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەسێ پەنجە نانی دەخوارد، وە بەر لەوە كە دەستی بسڕێت دەیلێستەوە. (م/د/ت/ن).

٢٦٥٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ حَتَّى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمُ اللُّقْمَةُ فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذًى ثُمَّ لْيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ فَإِذَا فَرَغَ فَلْيَلْعَقْ أَصَابِعَهُ فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِى فِي أَىِّ طَعَامِهِ تَكُونُ الْبَرَكَةُ. وَفِي رِوَايَةٍ: وَأَمَرَنَا أَنْ نَسْلُتَ الْقَصْعَةَ قَالَ: فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ فِي أَىِّ طَعَامِكُمُ الْبَرَكَةُ. رواهما الخمسة إلا البخاري[٢٢]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شەیتان بۆ هەموو كارو بارێكتان دێتە لاتان، تەنانەت لەكاتی نان خواردنیشدا دێت بۆ لاتان، جا ئەگەر تیكەی كەسێكتان كەوتە خوارەوە با لە ئازارو شتی وا پاكی بكاتەوەو ئینجا بیخوات و نەیهێڵێتەوە بۆ شەیتان، كە لە نانخواردن لێبۆوە با پەنجەكانی بلێسێتەوە، چونكی كەس نازانێ كەپیت و بەرەكەتی خواردەمەنییەكەی بە كامەوەیەتی. لە گێڕانەوەیەكا: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانیشی پێ كردین كە دەورییەكەیش بە پەنجە دالێسین! وە فەرمووی: چونكە ئێوە نازانن كە پیت و بەرەكەتی خواردەمەنییەكەتان بە كامەوەیەتی (م/د/ت/ن).

٢٦٥٨- وَقَالَ سُوَيْدُ بْنُ النُّعْمَانِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى خَيْبَرَ، فَلَمَّا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ دَعَا بِطَعَامٍ، فَمَا أُتِيَ إِلاَّ بِسَوِيقٍ، فَلُكْنَاهُ فَأَكَلْنَا فَقَامَ إِلَى الصَّلاَةِ فَتَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا. رواه البخاري[٢٣]:

سووەیدی كوڕی نوعمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە حزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچووین و بەرەو خەیبەر ڕۆیشتین، كە گەیشتینە صەهباء

---

[٢٢] مسلم. أشربة: ٥٢٦٩.

[٢٣] تجريد بخاري. ٢٠٩/١٥٣ ، ٢١٥ ، ٢٩٨١ ، ٤١٧٥ ، ٤١٩٥ ، ٥٣٨٤ ، ٥٣٩٠ ، ٥٤٥٤ ، ٥٤٥٥.

داوای نانی کرد، کە نانەکەیان بۆی هێنا، برێتی بوو لە هەندێ قاووتو بەس، ئیتر قاووتەکەمان خواردو لەپاشا لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵسایین چووین بەلای نوێژەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوی لە دەمی خۆی راداو ئێمەیش ئاومان لە دەمی خۆمان راداو دەممان شۆرد بەلام دەسنوێژمان تازە نەکردەوە، بەهۆی قاووت خواردنەوە (ب).

٢٦٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا. رواه الخمسة إلا الترمذي[٢٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەنان دەخۆن دەستی خۆتان مەسڕن، هەتا خۆتان دەیلێسنەوە، یا یەکێکی تر بۆتانی دەلێسێتەوە (ش/د/ن).

٢٦٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَامَ وَفِي يَدِهِ غَمَرٌ وَلَمْ يَغْسِلْهُ فَأَصَابَهُ شَيْءٌ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ. رواه أبو داود والترمذي[٢٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ بە دەستی چەورو لینجەوە بخەوێو نەیشۆرێ ئەگەر تووشی شتێ بوو سەرکۆنەی کەس نەکا، سەرکۆنەی خۆی نەبێ (د/ت-ح).

٢٦٦١- وَقَالَ أَنَسٍ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُ): أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِتَمْرٍ عَتِيقٍ فَجَعَلَ يُفَتِّشُهُ يُخْرِجُ السُّوسَ مِنْهُ. رواه أبو داود وابن ماجه[٢٦]:

---

[٢٤] مسلم. أشربة: ٥٢٦٣. أبو داود. أطعمة: ٣٧٤٧. بخاري (تجريد): ١٨١٨/٥٤٥٦.

[٢٥] بسند حسن (شرحه).

[٢٦] سكت عن درجته الشارح.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: خورمایەكی كۆنیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیبژاردو دەنكە دەنكە كرمێو كەڕوودارەكانی لێ جیا ەكردەوە (د/ئیبنو ماجە).

٢٦٦٢- ← (ب/١ ز/٩٨ ل/ ف/١)[٢٧].

٢٦٦٣- وَقَالَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): تَعَشَّوْا وَلَوْ بِكَفٍّ مِنْ حَشَفٍ فَإِنَّ تَرْكَ الْعَشَاءِ مَهْرَمَةٌ. رواه الترمذي[٢٨]:

پێغەمبەر (درودو سلاوو سۆزی خودای مەزنی لەسەر بێ) دەفەرموێ: شێو بكەن ئەگەرچی بە لوێچێ خورمای قەسپیش بێ، چونكە شێو نەكردن پیریی دێنێ (ت).

## ١٧) بەشی دووەم: نەریتو دەستووری شت خواردنەوە:

## الفصل الثاني: في آداب الشرب

٢٦٦٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: شَرِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَائِمًا مِنْ زَمْزَمَ. رواه البخاري والترمذي ومسلم ولفظه: شَرِبَ مِنْ زَمْزَمَ مِنْ دَلْوٍ مِنْهَا وَهُوَ قَائِمٌ[١]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەراوەستانەوە لە ئاوی بیری زەمزەمی خواردەوە (ب/ت/م) گفتەی (م): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەراوەستانەوە بە سەتڵێ لە ئاوی بیری زەمزەمی خواردەوە.

---

[٢٧] تقدم برقم: ٥٨٦/١ مجلد أول تسلسل/٩٨.

[٢٨] سكت عَنِ درجته الشارح.

[١] بخاري. حج (تجريد): ١٦٣٧/٧٨٣ ، ٥٦١٧. مسلم. أشربة: ٥٢٤٨. ترمذى. أشربة: ١٨٨٢. نسائى. حج: ٢٩٦٤ ، ٢٩٦٥.

٢٦٦٥– وَأَتَى عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى بَابِ الرَّحَبَةِ بِمَاءٍ، فَشَرِبَ قَائِمًا فَقَالَ: إِنَّ نَاسًا يَكْرَهُ أَحَدُهُمْ أَنْ يَشْرَبَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَلَ كَمَا رَأَيْتُمُونِي فَعَلْتُ. رواه البخاري وأبو داود[٢]:

لەبەر دەرگای حەوشەی مزگەوتی كووفەدا ئاویان هێنا بۆ عەلی (خودای لێ رازی بێ) عەلی بەڕاوەستانەوە، ئاوەكەی خواردەوەو گوتی: هەندێ كەس حەز ناكەن بەراوەستانەوە شت بخۆنەوە، بەڵام من بە چاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوا وەك ئێستای من بەراوەستانەوە شتی خواردۆتەوە! (ب/د).

٢٦٦٦– وَأَرْسَلَتْ أُمُّ الْفَضْلِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَدَحِ لَبَنٍ وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ فَشَرِبَهُ. رواه البخاري[٣]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە كێوی عەرەفە وەستابوو ئوممو فەضڵ قاپێ شیری بۆ نارد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شیرەكەی وەرگرت‌و بەسەرپشتی وشترەكەیەوە خواردیەوە (ب).

٢٦٦٧– ولمسلمٍ وأبي داود والترمذي: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الشُّرْبِ قَائِمًا[٤]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەوگیریی دەكرد لە شت خواردنەوە بەراوەستانەوە (م/د/ت).

٢٦٦٨– عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَشْرَبُ قَائِمًا وَقَاعِدًا. رواه الترمذي وصححه[٥]:

---

[٢] بخاري (تجريد): ١٨٤٩/ ٥٦١٥ ، ٥٦١٦.

[٣] بخاري (تجريد): ٥٦١٧/١٨٥٠ ، ١٦٣٧ (رياض/٢ ل- ٢٦٧ ژ: ٧٦٢).

[٤] مسلم. أشربة: ٥٢٤٨.

[٥] صحيح عند الترمذى.

لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوە (ڕەزای خودای گەورەیان لێ بێ) گوتی: بە چاوی خۆم دیومە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەم بە دانیشتنەوەو هەم بە ڕاوەستانەوە شتی دەخواردەوە (ت:ص).

٢٦٦٩- ولمسلم: لاَ يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئْ[٦]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمووێ: كەستان بە پێوە شت مەخۆنەوە، ئەگەر لەبیرتان نەبوو، وە شتتان بە پێوە - خواردەوە خۆتان بڕشێننەوە! (م).

٢٦٧٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ النَّفْخِ فِي الشُّرَابِ. فَقَالَ رَجُلٌ الْقَذَاةُ أَرَاهَا فِي الإِنَاءِ؟ قَالَ: أَهْرِقْهَا. قَالَ: فَإِنِّي لاَ أَرْوَى مِنْ نَفَسٍ وَاحِدٍ؟ قَالَ: فَأَبِنِ الْقَدَحَ إِذًن عَنْ فِيكَ. رواه الترمذي وأبو داود[٧]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەیدەهێشت كە لەكاتی شت خواردنەوەدا فووی لێ بكرێ، پیاوێ گوتی: ئەی ئەگەر پووشكەیەكم بەسەر ئاوەكەوە لەناو جامەكەدا دی چۆن بكەم؟ فەرمووی: بە لێوی جامەكە بیڕێژە گوتی: باشە ئەی ئەگەر بەیەك بێن تێرم نەخواردەوە چی بكەم؟ فەرمووی: جامەكە لە دەمت دوور بكەرەوەو ئەوسا هەناسە بدەو دیسانەوە تێ هەڵچۆرەوە تا تێر دەخۆیتەوە (ت-ص-د).

٢٦٧١- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ. وَفِي رِوَايَةٍ : وردت في الشرح: نَهَى عَنِ الشُّرْبِ مِنْ ثُلْمَةِ الْقَدَحِ[٨]:

ئەبو قەتادە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كە شت دەخۆنەوە لەناو جامەكەدا هەناسە مەدەن (ش/د/ت). لە

---

[٦] مسلم. أشربة: ٥٢٤٧.

[٧] رواه الترمذى بسند صحيح (شرحه).

[٨] مسلم. اشربة: ٥٢٥٣ ، ٦١٤. بخاري. أطعمة: ٥٦٢٨.

گێڕانەوەیەکا کە لە شەرحەکەدا نووسراوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەوگیریی دەکرد لەوە کە لە ئاستی کەلایی شکاویی جامەوە شت بخۆرێتەوە.

٢٦٧٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلاَثًا وَيَقُولُ: إِنَّهُ أَرْوَى وَأَبْرَأُ وَأَمْرَأُ. قَالَ أَنَسٌ فَأَنَا أَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلاَثًا. رواهما الأربعة[9]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەسێ بێن دەیخواردەوە، وە دەیفەرموو: ئاوا پیاو باشتر تێراو دەبێو بێ دەردو خۆشتریشە ئەنەس گوتی: لەبەر ئەوە من خۆمیش بەسێ بێن شت دەخۆمەوە. (ش/د/ت - خودایان لێ رازی بێ).

٢٦٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَشْرَبُوا وَاحِدًا كَشُرْبِ الْبَعِيرِ وَلَكِنِ اشْرَبُوا مَثْنَى وَثُلاَثَ وَسَمُّوا إِذَا أَنْتُمْ شَرِبْتُمْ وَاحْمَدُوا إِذَا أَنْتُمْ رَفَعْتُمْ. رواه الترمذي[10]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: وەك وشتر بەیەك بێن بینی پێوەمەنێن، بەلأم بەدوو بێن یا بە سێ بێن شت بخۆنەوە، لە پێشەوە ناوی خودا بێنن و لە پاشیشەوە سوپاس و ستایشی خودا بکەن (ت-سند غريب).

٢٦٧٤- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شرب لبنا فَمَضْمَضَ منه وقال: إن له دسماً: رواه البخاري[11]:

---

[9] مسلم. أشربة: ٥٢٥٥. أبو داوُد. أشربة: ٣٧٢٧. ترمذى أشربة: ١٨٨٤. بخاري. أشربة: ٥٦٢٨ ، ٥٦٣١.

[10] بسند غريب يؤيده ما قبله (شرحه).

[11] بخاري (تجريد): ٢١١/١٥٥ ، ٥٦٠٩. أخرجه مسلم فى الحيض، باب نسخ الوضوء مِمَّا مسته النار رقم: ٣٥٨ (هامش تجريد).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ شیری خواردەوە، لە پاشا ئاوی لە دەمی ڕادا، فەرمووی: شیر چەورییو بەڵخی هەیە (ب).

٢٦٧٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ. رواه الأربعة[١٢]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی دەكرد لەوە كە دەمو هەنگڵی كوندەو مەشكە هەڵپێچ بكرێو ئینجا دەمی پێوە بنرێو ئاوی لێ بخورێتەوە (ش/د/ت).

٢٦٧٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُوَ يُحَوِّلُ الْمَاءَ فِي حَائِطِهِ فَقَالَ : إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي شَنٍّ وَإِلاَّ كَرَعْنَا. قَالَ: بَلَى عِنْدِي مَاءٌ بَاتَ فِي شَنٍّ. رواه أبو داود والبخاري وزاد: فَانْطَلَقَ إِلَى الْعَرِيشِ فَسَكَبَ مَاءً فِي قَدَحٍ، وَحَلَبَ عَلَيْهِ مِنْ دَاجِنٍ لَهُ، فَشَرِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ أَعَادَ، فَشَرِبَ صَاحِبُهُ[١٣]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ پیاوێ لە هاوڕێكانی چوون بۆ لای پیاوێ لە یاریدەدەران باخی ئاو دەدا، فەرمووی: ئەگەر ئاوی وات هەیە كە ئەم شەو لە كوندە دابوو بێ بۆمانی بێنە، ئەگینا خۆمان دەمی تێ دەنێینو بە دەم لە جۆگەكە دەخۆینەوە گوتی: بەڵێ ئاوی شەویی كوندەم هەیە (د/ب) بوخاری (خودای لێ ڕازی بێ) ئەمەی پترە: جا پیاوەكە چوو لە ساباتەكە جامێ ئاوی داكردو هەنێ شیری لە مەڕێكی دەستەمۆ تێ دۆشیو پێشكەشی پێغەمبەری كردو خواردیەوە، ئینجا جامێكی تریشی هێنا بۆ هاوڕێكەی، ئەویش ئەوەی خواردەوە.

---

[١٢] بخاري (تجريد): ٥٦٢٥/١٨٥١ ، ٥٦٢٦. مسلم. أشربة: ٥٢٣٩. أبو داود. أشربة: ٣٧٢٠. ترمذی. أشربة: ١٨٩٠.

[١٣] تجريد بخاري: ١٨٤٨/ ٥٦١٣ ، ٥٦٢١ (رياض/ ٢ ل- ٢٧١).

٢٦٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ وَعَنْ شِمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ، فَشَرِبَ، ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابِيَّ، وَقَالَ « الأَيْمَنَ الأَيْمَنَ ». رواه الأربعة[١٤]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جامێ شیراویان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوكاتەدا عارەبێكی دەشتەكی لەلای راستی پێغەمبەرەوە بوو (دروودی خودای لەسەربێ) وە ئەبو بەكریش لەلای چەپیەوە بوو، جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لێی خواردەوە جامەكەی دا بە عەرەبە دەشتەكییەكەو فەرمووی: لای راست لە پێشترە، لای راست لە پێشترە (ش/د/ت).

٢٦٧٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا. رواه أبو داود والترمذي وصححه[١٥]:

ئەبو قەتادە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاوگێڕ (لەناو كۆڕدا) خۆی لەپاش هەموویانەوە ئاو دەخواتەوە (د/ت:ص).

## ١٨) ستایشكردن لەپاش خواردنو خواردنەوە:
## الحمد عقب الأكل والشرب

٢٦٧٩- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قَالَ: الْحَمْدُ لِلّٰهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ، رَبَّنَا. رواه الخمسة إلا مسلما[١]:

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە پاش نانخواردن كە سفرەكە هەڵدەگیرا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: سوپاسو ستایشو

---

[١٤] بخاري. أشربة: ٥٦١٩. أبو داود. أشربة: ٣٧٢٦. مسلم. أشربة: ٥٢٥٧. ترمذي. أشربة: ١٨٩٣.

[١٥] صحيح عند الترمذي.

[١] تجريد بوخاري: ١٨٢٠/ ٥٤٥٨ ، ٥٤٥٩.

حەمدێكی زۆری پاكو پیرۆز بۆ خودای پەروەردگارمان، نەكەس جێگەی ئەو دەگرێتەوەو نە ئەوزاتە پشت گوێ دەخرێ، وە كەس نیە كە لە خودا بێ نیاز بێ، ئەو خوادی ئێمەیە (ب/د/ت/ن).

٢٦٨٠- وللبخاري (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ): الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مَكْفُورٍ[٢]:

بوخاری (خودای لێ رازی بێ) ریوایەت دەكا: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی لە پاش نان خوادرن: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلاَ مَكْفُورٍ: سوپاسو ستایش بۆ خودا كە هەر خۆی بەسو بەشمان دەكاو هەر خۆی تێراومان دەكا، نەكەس دەتوانێ جێگەی ئەو بگرێتەوە، نە كەس رادەی دەكەوێ كە نا سوپاسی ئەو زاتە بكا.

٢٦٨١- ولمسلم والترمذي: إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا[٣]:

ئیمامی موسلیمو ئیمامی تیرمیذی (خودای گەورە رازی بێ لێیان) دەگێڕنەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: خودا خۆشنوود دەبێ لە بەندەی خۆی بەوە: كە كاتێ شتێ دەخوا، یا شتێ دەخواتەوە سوپاسی خودای لەسەر بكا (م/ت).

٢٦٨٢- ولأصحاب السُّنن: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أطعمنا وأسقانا وجعلنا مسلمين[٤]:

ئیمامان ئەبو داودو تیرمیذیو نەسائی (خودای گەورە بەكەرەمی خۆی پاداشی باشی گەورەیان بداتەوە) دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە لێ دەبۆوە لە خواردنو خواردنەوە دەیفەرموو: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أطعمنا وأسقانا وجعلنا مسلمين.

---

[٢] تقدم تخريجه حديث الرقم: ٢٦٧٩/١.

[٣] مسلم. الذكر والدعاء: ٦٦٦٨.

[٤] سكت عنه الشارح.

سوپاس بۆ ئەو خودایە کە نانو ئاوی داوە پێمانو لە هەمان کاتا کردوینی بە موسوڵمان.

٢٦٨٣- ولأبي داود والنسائي: كَانَ إِذَا أَكَلَ أَوْ شَرِبَ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَ وَسَقَى وَسَوَّغَهُ وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجًا[٥] :

سوپاسو ستایش بۆ ئەو خودایەی کە نانو ئاومان دەداتیو لە هەمان کاتا ڕەهایان دەکاو دەروو و دەربازگەیان بۆ دەکاتەوە (د/ن).

٢٦٨٤- عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنِى هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ وَلاَ قُوَّةٍ. غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رواه الترمذي وأبو داود[٦]:

موعاذی کوڕی ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ لە پاش نانخواردن بڵێ: الحمد لله الذى أطعمنى هذا ورزقنيه من غير حول منى ولا قوة: سوپاس بۆ خودا کە بەم دەستەو سانیەی خۆمە ئەم خۆراکو ڕۆژییەی پێ داوم، فەرمووی: کەسێ لەپاش نانخواردن ئاوا بڵێ: خودا لە گوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ (ت-س/ح-د).

٢٦٨٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ. وَإِذَا سُقِيَ لَبَنًا فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ. فَإِنَّهُ لَيْسَ شَىْءٌ يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلاَّ اللَّبَنُ. رواه أَبُو دَاوُدَ والترمذي[٧]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەگەر یەکێکتان شتێکی خوارد بابڵێ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ: خودایە! پیتو بەرەکەتی تێخە بۆمانو لەمە باشترمان بدەرێو بەزیادی بکە. کاتێکیش کە شیر دەخۆنەوە بڵێن: اللَّهُمَّ

---

[٥] سكت عنه الشارح.

[٦] رَوَاهُ الترمذى بسند حسن (شرحه).

[٧] رَوَاهُ الترمذى بسند حسن (شرحه).

بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ: خودایە! پیتو فەڕی تێخەو بۆمانی زیاد کە چونکە جگە لە شیر هیچی تر بریی خواردنو خواردنەوە ناکەوێ (د/ت-س/ح).

## ١٩) دەفرو قاپو حاجەت: (الأواني)

٢٦٨٦- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلاَ تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَالدِّيبَاجَ، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ رواه الخمسة، وَفِي رِوَايَةٍ : مَنْ شَرِبَ فِي إِنَاءٍ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ فَإِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارًا مِنْ جَهَنَّمَ [1]:

حوذیفە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە حاجەتی زێڕو زیودا شت مەخۆنو مەخۆنەوە، وە ئاوریشمو دێباجیش لەبەر مەکەن، چونکە ئەمانە لە جیهانا بۆ ئەوانەو لە قیامەتا بۆ خۆمانە (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەسێ لە حاجەتی زێڕدا یا لە حاجەتی زیودا شت بخوا، یا شت بخواتەوە قلْپەقلْپ ئاگری دەۆزەخ دەڕژێنێتە ناوسکی خۆیەوە.

٢٦٨٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: غَطُّوا الإِنَاءَ وَأَوْكُوا السِّقَاءَ وَأَغْلِقُوا الْبَابَ وَأَطْفِئُوا السِّرَاجَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَحُلُّ سِقَاءً وَلاَ يَفْتَحُ بَابًا وَلاَ يَكْشِفُ إِنَاءً فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلاَّ أَنْ يَعْرُضَ عَلَى إِنَائِهِ عُودًا وَيَذْكُرَ اسْمَ اللَّهِ فَلْيَفْعَلْ فَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى أَهْلِ الْبَيْتِ بَيْتَهُمْ. رواه الأربعة. ولفظ أبي داود: أَغْلِقْ بَابَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَأَطْفِ مِصْبَاحَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَلَوْ بِعُودٍ تَعْرُضُهُ عَلَيْهِ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَأَوْكِ سِقَاءَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ [2]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەری قاپو حاجەت بنێنەوەو دەمبێنی کوندەو مەشکە ببەستنو دەرگا

---

[1] تجرید بخاري: ١٨٥٤/ ٥٦٣٤ ، ٥٦٣٠ ، ٥٦٣١. مسلم. لباس وزینة: ٥٣٦١. نسائی. زینة: ٥٣١٦.

[2] بخاري. أشربة: ٥٦٢١ ، ٥٦٢٢. مسلم. أشربة: ٥٢١٤ ، ٥٢١٨. تجرید: ١٨٤٦/ ٥٦٠٥ ، ٢٦٠٦ = بەرگی/٥ ل/١٤٤.

داخەنو چرابكوژێننەوە، چونكە شەیتان دەمبێنی كوندەو جەوەندەو مەشكە ناكاتەوەو دەرگای داخراو ناكاتەوەو سەری حاجەت هەڵناداتەوە، خۆ ئەگەر هەر هیچتان دەست نەكەوت چلێ دار لە سەرباری پانی لەسەر دەمی حاجەتەكە دانێنو ناوی خودا بێنن، گەلێ جاریش مشك چرا قلْپ دەكاتەوەو ماڵەكە دەسووتێنێ بەسەرخاوەنەكەیدا (ش/د/ت). گفتەی (د): دەرگاكەت داخەو ناوی خودا بێنە، چراكەت بكوژێنەوەو ناوی خودا بێنە، سەری حاجەتەكەت داپۆشەو ناوی خودا بێنە، دەمبێنی كوندەو مەشكەكەت ببەستەو ناوی خودا بێنە.

٢٦٨٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: غَطُّوا الإِنَاءَ وَأَوْكُوا السِّقَاءَ فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ لاَ يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ مِنْ ذَلِكَ الْوَبَاءِ. رواه مسلم[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەری قاپو حاجەت بنێنەوەو دەمبێنی كوندەو جەوەندەو مەشكەو شتی وا ببەستن، چونكی هەموو ساڵێ شەوێكی وای تیادایە كە پەتای تیا دەكەوێتەوە، ئەو پەتایە بەلای هەر دەفرێكا بڕوا كە سەری نەنرابێتەوە، وە بەلای هەرجەوەندەو خیگەیەكا بڕوا كە دەمبێنی نەبەسرابێ دەچێتە ناوی (م).

٢٦٨٩- ← (ب/١ ز/٢٣ ل/ ژ/١٥)[٤].

٢٦٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا عَلِمْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكَلَ عَلَى سُكُرُّجَةٍ قَطُّ، وَلاَ خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ قَطُّ، وَلاَ أَكَلَ عَلَى خِوَانٍ قَطُّ. قِيلَ لِقَتَادَةَ فَعَلَى مَا كَانُوا يَأْكُلُونَ؟ قَالَ: عَلَى السُّفَرِ. رواه البخاري والترمذي[٥]:

---

[٣] مسلم. أشربة: ٥٢٢٣.

[٤] تقدم تخريجه في رقم: ١٧٧/١٥ مجلد/ ١ تسلسل/ ٢٣.

[٥] بخاري: ٥٤١٥ تجريد/٥ ل/٨١ رقم: ١٨٠٢ م/٥٣٨٦، ٥٤٥٠.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: من ئاگام لێ بووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر قەرەوانەی رازاوە هەرگیز نانی نەخواردووە، یا لەسەر خوان (مێز) نانی نەخواردووە، یا نانی تیری بۆ نەكراوە، بە قەتادەیان گوت: ئەی لە سەرچی نانیان دەخوارد؟ گوتی: لەسەر سفرە (ب/ت).

٢٦٩١- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّا نُجَاوِرُ أَهْلَ الْكِتَابِ وَهُمْ يَطْبُخُونَ فِي قُدُورِهِمُ الْخِنْزِيرَ وَيَشْرَبُونَ فِي آنِيَتِهِمُ الْخَمْرَ. فَقَالَ: إِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَكُلُوا فِيهَا وَاشْرَبُوا وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا غَيْرَهَا فَارْحَضُوهَا بِالْمَاءِ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا. رواه الأربعة[٦]:

ئەبو ثەعلەبە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لە ولاتی شام دراوسێی خاوەن نامەكانینو لە ولاتی ئەوان داین، وەلحاڵ ئەوان لە مەنجەڵەكانیانا گۆشتی بەراز دەكوڵێننو لە قاپو حاجەتەكانیانا مەیو ئارەق دەخۆنەوە لەم حاڵەدا ئێمە چارمان چییە؟ فەرمووی: ئەگەر دەفرێكی ترتان دەست كەوت لەوەدا بخۆنو بخۆنەوە، بەڵام ئەگەر حاجەتی ترتان دەست نەكەوت بە ئاو پاك بیان شۆرنو ئیتر تیایاندا بخۆنو بخۆنەوە (د/ت/ش).

٢٦٩٢- وَقَالَ جَابِرٍ (رَضِيَ أَللَّهُ عَنْهُ): كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنُصِيبُ مِنْ آنِيَةِ الْمُشْرِكِينَ وَأَسْقِيَتِهِمْ فَنَسْتَمْتِعُ بِهَا فَلاَ يَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْنَا. رواه أبو داود[٧]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) كە دەچووین بۆ غەزا قاپو قاجاخو كوندەو ئەم جۆرە شتانەی بتپەرستەكانمان دەست دەكەوت وە بۆ خۆمان بەكارمان دەهێنا، پێغەمبەرش (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ ئەمە هیچ خراپەی لێ نەدەگرتین (د).

---

[٦] بخاري. أطعمة: ٥٤٩٦. أخرجه مسلم فى العيد (عينى/ ٢١ ص ٩٦).

[٧] سكت عنه الشارح.

٢٦٩٣- وَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ قُدُورِ الْمَجُوسِ فَقَالَ: أَنْقُوهَا غَسْلاً وَاطْبُخُوا فِيهَا. رواه الترمذي. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى آمين[٨]:

بۆ تیانجەو مەنجەڵی مەجووسیان پرسیار كرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پاك بە ئاو بیان شۆرنو شتیان تیا بكوڵێننو بیخۆن. (ت: حدیث مشهور).

## ٢٠) بەشی سێیەم: میوانداریو نان خواردن بە كۆمەڵی
## الفصل الثالث: في طعام الجماعة والضيافة

٢٦٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: طَعَامُ الاِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاَثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ. رواه الشيخان والترمذي[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نانی دوو كەس بەشی سێ كەس دەكا، وە نانی سێ كەس بەشی چوار كەس دەكا (ش/ت).

٢٦٩٥- ولمسلم والترمذي: طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الاِثْنَيْنِ وَطَعَامُ الاِثْنَيْنِ يَكْفِي الأَرْبَعَةَ وَطَعَامُ الأَرْبَعَةِ يَكْفِي الثَّمَانِيَةَ. رواه الأربعة[٢]:

موسلیمو تیرمیذی (خودایان لێ رازی بێ) دەگێڕنەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: نانی یەك كەس بەشی دوو كەس دەكا، وە نانی دوو كەس بەشی چوار كەس دەكا وە نانی چوار كەس بەشی هەشت كەس دەكا.

٢٦٩٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَفَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ طَعَامَهُ حَرَّهُ وَدُخَانَهُ فَلْيَأْخُذْ بِيَدِهِ فَلْيُقْعِدْهُ مَعَهُ فَإِنْ أَبَى فَلْيَأْخُذْ لُقْمَةً فَلْيُطْعِمْهَا إِيَّاهُ. رواه الأربعة[٣]:

---

[٨] رواه الترمذ وقال هذا حديث مشهور (شرحه).

[١] تجريدي بوخارى: ١٨٠٤/٥٣٩٢.

[٢] مسلم. أشربة: ٥٣٣٥ – ٥٣٣٩. ترمذى. أطعمه: ١٨٢٠.

**دیسان ئەبو هورەیرە** (خودای گەورەی لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: كاتێ كەسێكتان نۆكەرەكەی نانی بۆ دروست دەكاو گڕەو دوو كەڵی لێنانی نانەكەی لە كۆڵ دەكاتەوە، با ئەویش دەستی بگرێو لەگەڵ خۆی داینێ بۆنان خواردن جا ئەگەر خۆی نەیویست كە لەگەڵیا دابنیشێ، با پارووێ هەڵبگرێو بیداتێ (ش/د/ت).**

**٢٦٩٧– وَعَنْهُ قَالَ: قَسَمَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **تَمْرًا، فَأَعْطَى كُلَّ إِنْسَانٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ، فَأَعْطَانِي سَبْعَ تَمَرَاتٍ إِحْدَاهُنَّ حَشَفَةٌ، فَلَمْ يَكُنْ فِيهِنَّ تَمْرَةٌ أَعْجَبَ إِلَيَّ مِنْهَا، شَدَّتْ فِي مَضَاغِي. رواه البخاري والترمذي[٤]:**

**دیسان گوتی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **خورمای دابەش دەكرد بەسەرمانا، هەر كەسەی حەوت دەنكی دەداینێ، حەوت دەنكیشی دا بەمن، دەنكێكیان نابەكامو وشكەڵ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا لە هەموویان خۆشتربوو، چونكە نووسا بەمەلاشوومەوەو بە زەحمەت دەجوورا وەك ماجووم تا تاوێ جوویم، لەبەر ئەوە زۆر خۆش بوو لەلام (ب/ت).**

**٢٦٩٨– عَنْ ابْنَ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) **نَهَى النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَنْ يَقْرُنَ الرَّجُلُ بَيْنَ التَّمْرَتَيْنِ، حَتَّى يَسْتَأْذِنَ أَصْحَابَهُ. رواه الخمسة[٥]:**

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهیی دەكرد لەوە كە پیاو دوو دەنك خورما پێكەوە بخوا، مەگەر بە مەرجێ هاوڕێكانی رێگەی ئەوەی بدەن (ش/د/ت/ن).**

**٢٦٩٩– عن أنس** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قال: دعونا النبيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إلى منزلنا فجاء بأصحابه وكان يأمر بدخولهم للأكل عشرة عشرة. رواه البخاري مطولا[٦]:**

---

[٣] تقدم برقم: ٢٠٣١/٦ تسلسل/ ٢١ مجلد/٣.

[٤] بخاري. أطعمة: ٥٤١١ تجريد/ ٨٣/٥ ژ: ١٨٠٩/ ٥٤٤١ ، ٥٤١١ م.

[٥] بخاري. أطعمة: ٥٤٤٦ ، ٢٤٥٥. تجريد/ ٣ل- ١٥٨ ژ: ١٠٦٥/ ٢٤٥٥ ، ٢٤٨٩ ، ٢٤٩٠. مسلم. أشربة: ٥٣٠١ – ٥٣٠٢. أبو داود. أطعمة: ٣٨٣٤. ترمذي. أطعمة: ١٨١٤.

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: بۆ نانخواردن پێغەمبەرمان** (دروودی خودای لەسەربێ) **بانگكرد بۆماڵەوە، لەگەڵ هاوڕێكانیا تەشریفی هێنا، دەكەس دەكەس فەرمانی پێ دەكردن كە بچنە ژوورەوە بۆ نان خواردن (ب).**

٢٧٠٠- وَقَالَ جماعة: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَأْكُلُ وَلاَ نَشْبَعُ. قَالَ: فَلَعَلَّكُمْ تَفْتَرِقُونَ. قَالُوا نَعَمْ. قَالَ: فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ. رواه أبو داود وقال: إِذَا كُنْتَ فِي وَلِيمَةٍ فَوُضِعَ الأَكْلُ فَلاَ تَأْكُلْ حَتَّى يَأْذَنَ لَكَ صَاحِبُ الدَّارِ[٧]:

**كۆمەڵێ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە كە نان دەخۆین هەر دەخۆینو هەر تێر نابین؟ فەرمووی: رەنگ بێ بە جیا جیا نان بخۆن؟ گوتیان: بەڵێ وایە فەرمووی: بەكۆمەڵ نان بخۆنو ناوی خودای لێ بێنن، ئیتر پیتو فەڕی تێ دەكەوێ بۆتان! ئەبو داود** (خودای لێ رازی بێ) **بە سەنەدێكی صالح ئەم حەدیثەی ریوایەت كردووە، وە دەڵێ: كاتێ لەسەر شاییو شتی وا بووی كەنان دانرا مەخۆ هەتا خانە خۆێ فەرمووت لێ دەكات، ئەوسا دەست پێ بكە.**

٢٧٠١- عَن عبد الله بن بُسر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَصْعَةٌ يُقَالُ لَهَا الْغَرَّاءُ يَحْمِلُهَا أَرْبَعَةُ رِجَالٍ فَلَمَّا أَضْحَوْا وَسَجَدُوا الضُّحَى أُتِيَ بِتِلْكَ الْقَصْعَةِ وَفِيهَا الثَّرِيدُ - فَالْتَفُّوا عَلَيْهَا فَلَمَّا كَثُرُوا جَثَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ مَا هَذِهِ الْجِلْسَةُ؟ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ جَعَلَنِي عَبْدًا كَرِيمًا وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا عَنِيدًا ثُمَّ قَالَ: كُلُوا مِنْ جَوَانِبِهَا وَدَعُوا ذِرْوَتَهَا يُبَارَكْ فِيهَا. رواه أبو داود وابن ماجه[٨]:

**عەبدوڵڵای كوڕی بوسر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **قەرەوانەیەكی هەبوو ناوی غەڕاء بوو، بە چوار پیاو هەڵیان دەگرت، چێشتەنگاوێ – لەپاش كردنی نوێژی چێشتەنگاو – ئەو قەرەوانەیان پڕ كرد لە تریتو هێنایان، وە دەورەیان لێ دا، جا كە زۆر بوون جێگەكە**

---

[٦] بخاري. أطعمة: ٥٤٤٩.

[٧] بسند صالح (شرحه).

[٨] بسند صالح (شرحه).

تەنگەبەربوو، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بە چۆکاو لەسەر چۆك دانیشت، جا عارەبێکی دەشتەکی گوتی: ئەمە چۆن دانیشتنێکە؟ فەرمووی: خودا منی کردووە بە بەندەیەکی بەڕێز، وە نەیکردووم بە زەبردارێکی ملهوڕی سەرکەش! ئینجا فەرمووی: لەلاتەنیشتیەوە بخۆن، لەناوەڕاستیەوە مەخۆن، ئاوا پیتو بەرەکەتی تێ دەکەوێ (د-سند صالح- ابن ماجه).

٢٧٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ. رواه الأربعة[٩]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قەدرو ڕێزی میوانی خۆی بگرێ، وە هەر کەسێ باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە با سیلەی رەحمو مافی خوێشایەتی بەجێ بێنێ. لە گێڕانەوەیەکا: با قەدری دراوسێی خۆی بگرێ، وە هەرکەسێ باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دواڕۆژ هەیە با یا قسەی باش بکا، یاخود بێ دەنگ بێو قسە نەکا (ش/د/ت).

٢٧٠٣- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْكَعْبِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، جَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ. رواه أبو داود[١٠]:

ئەبو شورەیحی ئەل-کەعبی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قەدری میوانی خۆی بگرێ خەڵاتی میوان کە برێتییە لە مەسرەفی زیاد لە

---

[٩] تجريد/٥ ل/٢٠٩ ژ: ١٩٣٠ / ٦٠١٨ + ١٧٧٢ /٥١٨٥. مسلم. إيمان: ١٧٤.

[١٠] والكلمة الأولى منه للشيخين (شرحه).

ئاسایی بۆی شەوو رۆژێكە، وە میوانداریی هەتا سێ رۆژە، وە لە سێ رۆژ زیاتر خێرو بەخششە، وە دروست نیە كە میوان لە ماڵی خانەخۆێ دایكوتێ هەتا بێزاری دەكا (د).

٢٧٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَفْشُوا السَّلاَمَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَاضْرِبُوا الْهَامَ تُورَثُوا الْجِنَانَ. وَفِي رِوَايَةٍ: اعْبُدُوا الرَّحْمَنَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَأَفْشُوا السَّلاَمَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلاَمٍ. رواه الترمذي وصححه[١١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر فەرمووی: سەلام پەخش بكەنەوەو نان‌و خواردەمەنی بە مەردوم بدەن‌و لە شەڕا ئازابن‌و لە كەللەی سەری دوژمن بدەن تا چاو ترسێنیان بكەن، ئەگەر ئەمانە بكەن ئیتر چوونە بەهەشت بە شادی‌و خۆشی مسۆگەر دەكەن! لە گێڕانەوەیەكا: خودای گەورەو میهرەبان بپەرستن‌و بەندەگی هەر بۆ ئەو بكەن‌و نان‌و خواردەمەنی بە خەڵك بدەن‌و لە جەنگا خێرا بن‌و لە مێشكی دوشمن بدەن، ئیتر بە خۆشی‌و شادی دەچنە بەهەشت (ت:ص).

٢٧٠٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَنَعَ أَبُو الْهَيْثَمِ بْنُ التَّيْهَانِ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَعَامًا فَدَعَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابَهُ فَلَمَّا فَرَغُوا قَالَ: أَثِيبُوا أَخَاكُمْ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا إِثَابَتُهُ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا دُخِلَ بَيْتُهُ فَأُكِلَ طَعَامُهُ وَشُرِبَ شَرَابُهُ فَدَعَوْا لَهُ فَذَلِكَ إِثَابَتُهُ[١٢]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو هەیثەمی كوڕی تەیهان نانی دروست كردو پێغەمبەرو هاورێكانی بانگ كرد، كاتێ لە نانخواردن بوونەوە فەرمووی: پاداشی چاكەی ئەم برایەتان بدەنەوە عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن چۆنی پاداشی چاكەی بدەینەوە؟ فەرمووی: پیاو كە دەچنە ماڵی‌و نان‌و ئاوی

---

[١١] صحيح عند الترمذى.

[١٢] بسند صالح (شرحه).

دەخۆنو نمەكی دەكەن ئەگەر نزای خێری بۆ بكەن ئەوە پاداشی چاكەی دەدەنەوەو پیاوەتی ئەویان لە پێش چاوە (د-سند صالح).

٢٧٠٦- وأكل النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْد سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَجَاءَ بِخُبْزٍ وَزَيْتٍ فَأَكَلَ ثُمَّ قَالَ: أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ. رواهما أبو داود[١٣]:

گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەلای سەعدی كوڕی عوبادە نانو رۆن زەیتونی خوارد، جا كە دەستی هەڵگرت فەرمووی: هەمیشە رۆژوەوانان بەربانگ لە لاتان بكەنەوە، وە هەموو كاتێ پیاوچاكانو خاسان نانو ئاوتان بخۆن، وە بەر رەحمەتو نزای باشی فریشتەكان بكەون! (د-سند صالح).

## ٢١) بەشی چوارەم: باسی خواردەمەنی:

## الفصل الرابع: في المطعوم

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ – ٢/١٧٢}.

ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هەیە بە خودا! بخۆن لەو خواردەمەنییە باشو پاكانە كە ئێمە كردوومانن بە رزقو رۆژیی ئێوەو سوپاسی خودا بكەن، ئەگەر پەرستشو بەندەیی بۆ خودا دەكەن.

٢٧٠٧- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ خَيَّاطًا دَعَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِطَعَامٍ صَنَعَهُ، فَذَهَبْتُ مَعَه فَقَرَّبَ خُبْزَ شَعِيرٍ وَمَرَقًا فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ، فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ بَعْدَ يَوْمِئِذٍ. رواه الخمسة[١]:

---

[١٣] بسند صالح (شرحه).

[١] تجريد بخاري/ ٣ل – ٢٣ ژمارە/ ٩٥٠/ ٢٠٩٢ ، ٥٣٧٩ ، ٥٤٢٠ ، ٥٤٣٥ ، ٥٤٣٣ ، ٥٦٣٧ ، ٥٤٣٦ ، ٥٤٣٩. مسلم. أشربة: ٥٢٩٣ – ٥٢٩٥.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەرگدروویێ نانی دروست کرد، بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و بانگی کرد، گوتی: منیش لەگەڵ حەزرەتدا چووم، کە نانەکەی دانا برێتی بوو لە نانی جۆو مەرگەی کوولەکەو لەتکە گۆشت، سەرنجم دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەم لاولای لەگەنەکەوە کوولەکەکەی دەچنیەوەو دەیخوارد، ئیتر منیش لەو رۆژەوە هەتا ئێستا حەزم لە کوولەکەیە. (ش/د/ت/ن).

٢٧٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ. رواه الأربعة[٢]:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) فەریکە خورما (رووتاب)ی بە ترۆزییەوە دەخوارد وە فەرمووی: فێنکیی ترۆزیەکە گەرمیی خورماکە دەشکێنێ (ش/د/ت).

٢٧٠٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ الْبِطِّيخَ بِالرُّطَبِ فَيَقُولُ « نَكْسِرُ حَرَّ هَذَا بِبَرْدِ هَذَا وَبَرْدَ هَذَا بِحَرِّ هَذَا. رواه أصحاب السُّنن[٣]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاڵەکی بە رووتابەوە دەخواردو دەیفەرموو: گەرمیی ئەمەیان بەساردیی ئەمەیانو ساردیی ئەمەیان بە گەرمیی ئەمەیان دەشکێنین! (د/ت/ن-س/ح).

٢٧١٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَرِّ الظَّهْرَانِ وَنَحْنُ نَجْنِي الْكَبَاثَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ مِنْهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّكَ رَعَيْتَ الْغَنَمَ قَالَ: نَعَمْ وَهَلْ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَقَدْ رَعَاهَا. رواه الشيخان[٤]:

---

[٢] تجريد بوخارى/ ٥ ل — ٨٧ ژمارە/ ١٨١٥/ ٥٤٤٧ ، ٥٤٤٩. مسلم. أشربة: ٥٢٩٨.

[٣] بسند حسن (شرحه).

[٤] بخاري. أطعمة: ٥٤٥٢ ، ٥٤٥٣. تجريد/ ٤ ل- ٤٨ ژمارە/ ١٣٦٠ / ٥٤٥٣. مسلم. أشربة: ٥٣١٧.

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە مەڕولظەهران لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) بەری دار سیواكمان دەچنی فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): رەشەكەی بڕنن رەشەكەی خۆشە عەرزمانكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەڵێی رانت لەوەڕاندووە كەوا باشی لێ دەزانی فەرمووی: ئەدیی، بۆچی پێغەمبەر هەیە كە شوانی رانی نەكردبێ! (ش).

٢٧١١- وَأَخَذَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كِسْرَةً مِنْ خُبْزِ شَعِيرٍ فَوَضَعَ عَلَيْهَا تَمْرَةً وَقَالَ: هَذِهِ إِدَامُ هَذِهِ. رواه ابو داود والترمذي[٥]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كەرتێ نانی جۆی هەڵگرتو دەنكێ خورمای تێ خستو فەرمووی: ئەمە پێخۆری ئەمەیە (د-سند صالح-ت).

٢٧١٢- عَنِ ابْنَيْ بُسْرٍ السُّلَمِيَّيْنِ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالاَ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَدَّمْنَا زُبْدًا وَتَمْرًا وَكَانَ يُحِبُّ الزُّبْدَ وَالتَّمْرَ. رواه أبو داود وابن ماجه[٦]:

دوو كوڕە سەلەمییەكانی بوسر (خودایان لێ رازی بێ) گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ ماڵمان، كەرەو خورمامان بۆ دانا، خۆشی هەر حەزی لە كەرەو خورما بوو (د-سند صالح-ئیبنو ماجە).

٢٧١٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: بينا نحن عند النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جُلُوسٌ إِذْ أُتِيَ بِجُمَّارِ نَخْلَةٍ فَقَالَ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ لَمَا بَرَكَتُهُ كَبَرَكَةِ الْمُسْلِمِ. فَظَنَنْتُهُ النَّخْلَةَ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَقُولَ هِيَ النَّخْلَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. ثُمَّ الْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا عَاشِرُ عَشَرَةٍ أَنَا أَحْدَثُهُمْ فَسَكَتُّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هِيَ النَّخْلَةُ. رواه البخاري[٧]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە جاران لە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتبووین، كوڕۆكی

---

[٥] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

[٦] بسند صالح (شرحه).

[٧] بخاري. أطعمة: ٥٤٤٤.

دارخورمايان هێنا بۆی، فەرمووی: درەختێ لەناو دەرختەكان دا هەیە، وەك موسوڵمان بەپیتو فەڕە منیش هات بە دڵما كە ئەوە دارخورمایە، وە ویستم بڵێم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو درەختە دارخورمایە، بەڵام كە سەرنجم دا بەمنەوە دەكەس بووین، وە من لە هەمووشیان مناڵتر بووم، لەبەر ئەوە قسەم نەكرد، ئیتر خۆی فەرمووی:: ئەوە دارخورمایە! (ب).

٢٧١٤- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَتْ لَنَا عَجُوزٌ تَأْخُذُ أُصُولَ السِّلْقِ، فَتَجْعَلُهُ فِي قِدْرٍ لَهَا، فَتَجْعَلُ فِيهِ حَبَّاتٍ مِنْ شَعِيرٍ، إِذَا صَلَّيْنَا زُرْنَاهَا فَقَرَّبَتْهُ إِلَيْنَا، وَكُنَّا نَفْرَحُ بِيَوْمِ الْجُمُعَةِ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ، وَمَا كُنَّا نَتَغَدَّى وَلاَ نَقِيلُ إِلاَّ بَعْدَ الْجُمُعَةِ، وَاللَّهِ مَا فِيهِ شَحْمٌ وَلاَ وَدَكٌ. رواه البخاري (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ)[٨]:

سەهل (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: داپیرەیەكمان هەبوو، لاسكی سڵقی دەهێناو بەتۆزێ جۆوە لە مەنجەڵێكا لێی دەنا، كە نوێژی هەینیمان دەكرد، لە خزمەتی حەزرەتدا دەچووین بۆ لای، ئەویش ئەو سڵقاوەی بۆمان دادەنا ئێمەش دەمانخوارد لەبەر ئەمە حەزمان لە ڕۆژی هەینی بوو، بەخوا نەپیوو نە بەزیشی تێدا نەبوو كەچی چونكە بۆ پێغەمبەرو یارانی دەكرا زۆر لەلامان خۆش بوو ئەو سەردەمە لەپاش نوێژی هەینی نانی بەیانیمان دەخواردو ئەوجا پشوویەكمان دەداو سەر خەوێكمان دەشكاند! (ب).

٢٧١٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَأَلَ أَهْلَهُ الأُدُمَ فَقَالُوا: مَا عِنْدَنَا إِلاَّ خَلٌّ. فَدَعَا بِهِ فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ. رواه الخمسة إلا البخاري[٩]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ داوای پێخۆری لە خێزانی كرد، عەرزیان كرد: بەس سركەمان هەیە فەرمووی كە

---

[٨] بخاري. أطعمة: ٥٤٠٤.

[٩] مسلم. أشربة: ٥٣١٨ — ٥٣٢٣.

بیهێنن، جا دەستی كرد بە خواردنیو دەیفەرموو: سركە پێخۆری چاكە، سركە پێخۆری چاكە (م/د/ت/ن).

٢٧١٦- وعَنْهُ قَالَ: اَخَذَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى بيته فَقَالَ: هَلْ مِنْ غَدَاءٍ. فَقَالُوا: نَعَمْ. فَأُتِيَ بِثَلاَثَةِ أَقْرِصَةٍ فَأَخَذَ قُرْصًا فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَخَذَ قُرْصًا آخَرَ فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيَّ ثُمَّ أَخَذَ الثَّالِثَ فَكَسَرَهُ بِاثْنَيْنِ فَجَعَلَ نِصْفَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ وَنِصْفَهُ بَيْنَ يَدَيَّ ثُمَّ قَالَ: هَلْ مِنْ أُدُمٍ. قَالُوا: لاَ. إِلاَّ شَيْءٌ مِنْ خَلٍّ. قَالَ: هَاتُوهُ فَنِعْمَ الأُدُمُ هُوَ. رواه مسلم[١٠]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ بردیمیەوە بۆماڵەوەی، فەرمووی: بەرچا (غەداء = نانی بەیانی)مان بۆ بێنن عەرزیان كرد باشە، ئینجا سێ كولێرەیان بۆ هێنا، كولێرەیەكی هەڵگرتو لەبەردەمی خۆیا داینا و كولێرەیەكی هەڵگرتو لە بەردەمی منا دایناو كولێرەی سێهەمیشی كوت كردو نیوەی لە بەردەمی خۆیا داناو نیوەكەی تریشی لە بەردەمی منا دانا، ئینجا فەرمووی: ئایا پێخۆر هەیە؟ گوتیان: نەء، تەنیا تۆزێ سركە نەبێ، فەرمووی: بیهێنن سركە پێخۆری چاكە! (م).

٢٧١٧- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ. رواه الترمذي والحاكم وصححه[١١]:

عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە رۆن زەیتونەوە شت بخۆنو بیكەن بە پێخۆروە خۆشتانی پێ چەور بكەنو بۆ هەندێ نەخۆشی لەشتانی پێ بهەنوون چونكە لە درەختێكی پیرۆزو موبارەكە. (ت/حا:ص).

٢٧١٨- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَإِنَّ

---

[١٠] مسلم. أشربة: ٥٣٢٣.

[١١] صحيح عند الحاكم.

فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ. رواه البخاري والترمذي (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا)[١٢]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: زۆركەس لە پیاوان پیاوی تەواویان لێ دەرچووەو بوون بە پیاوی یەكی یەكی كەڵە مێرد، بەڵام: لە ژنان هەر مەریەمی كچی عیمرانو ئاسیەی ژنی فیرعەون ئافرەتی تەواو تەواویان لێ دەرچووە، وە باوو گەورەیی عائیشە لە چاو ژنانی تردا وەك باوو نایابی تریت وایە لەچاو خواردەمنیەكانی تردا (ب/ت).

٢٧١٩- ولأبي داود: كَانَ أَحَبُّ الطَّعَامِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الثَّرِيدَ مِنَ الْخُبْزِ وَالثَّرِيدَ مِنَ الْحَيْسِ[١٣]:

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زۆر زۆر حەزی لە نانو تریتو لە چنگاڵی كەشكو رۆن بە خورماوە بوو (د).

٢٧٢٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا اشْتَرَى أَحَدُكُمْ لَحْمًا فَلْيُكْثِرْ مَرَقَتَهُ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ لَحْمًا أَصَابَ مَرَقَةً وَهُوَ أَحَدُ اللَّحْمَيْنِ. رواه الترمذي (وَقَالَ المصنف – طيب الله تعالى ثراه- والحديث وإن كان ضعيفاً ولكن ورد من جهةٍ أخرى صحيحاً بلفظ: لاَ يَحْقِرَنَّ أَحَدُكُمْ شَيْئًا مِنَ الْمَعْرُوفِ وَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَلْقَ أَخَاهُ بِوَجْهٍ طَلِقٍ وَإِنِ اشْتَرَيْتَ لَحْمًا أَوْ طَبَخْتَ قِدْرًا فَأَكْثِرْ مَرَقَتَهُ وَاغْرِفْ لِجَارِكَ مِنْهُ[١٤]:

عەبدوڵڵای ئەلموزەنی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: یەكێكتان كاتێ گۆشت دەكڕی با ئاوی مەرگەكەی زۆر بكا، چونكە ئەگەر گۆشتیشی بەر نەكەوێ گۆشتاوی بەر دەكەوێ، گۆشتاویش

---

[١٢] بخاري. أطعمة: ٥٤١٨.

[١٣] سكت عن درجته الشارح.

[١٤] بسند ضعيف مع مراعاة ماجاء في نهاية الحديث (مترجم).

هەر بە گۆشت حلێبە (ت) دانەر (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە بۆنو بەرامەی بەهەشت بێ) لە شەرحەکەیدا دەڵێ: ئەم فەرموودەیە هەرچەند لاوازو بێ تینە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا لە لایەنێکی ترەوە بە ساغ (صەحیح)ی نەقڵ کراوە بەم گفتەیە: قەت چاکەو خێرکردن (با کەمیش بێ) بە چاوی سووك تەماشامەکەن، ئەگەر گریمان نەتان بوو کە خێرێ بکەن ئەوا لەتەك برای موسوڵمانی خۆتانا رووتان خۆش بێ، ئەی موسوڵمان! کاتێ گۆشت دەکرێت، کە لێی دەنێت کەمێ ئاوی مەرگەکەی زۆرکەو ئەسکوێێ دوانی لێ بنێرە بۆ دراوسێکەت.

٢٧٢١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ. رواه البخاري وأبو داود والترمذي[١٥]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەزی لە شیرینیو لە هەنگوین بوو (ب/د/ت).

٢٧٢٢- وَعَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا عَائِشَةُ بَيْتٌ لاَ تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ رواه مسلم وأبو داود والترمذي[١٦]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەوماڵەی کە خورمای تیا نەبێ، خەڵکەکەی برسین! (م/د/ت).

---

[١٥] بخاري. أطعمة: ٥٤٣١.

[١٦] مسلم. أشربة: ٥٣٠٤ ، ٥٣٠٥. أبو داود. اطعمة: ٣٨٣٠. ترمذي. أطعمة: ١٨١٥.

## ٢٢) لە ناچاری دا مردار دەخوریٚ: (تجوز الميتة للمضطر)

٢٧٢٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً نَزَلَ الْحَرَّةَ وَمَعَهُ أَهْلُهُ وَوَلَدُهُ فَوَجَدَ نَاقَةً ضَلَّتْ مَنْ صَاحِبِهَا وَكَانَ سَأَلَهُ إمساكها إنَّ وَجَدَهَا فَمَرِضَتْ فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ انْحَرْهَا. فَأَبَى فَنَفَقَتْ فَقَالَتِ اسْلُخْهَا حَتَّى نُقَدِّدَ شَحْمَهَا وَلَحْمَهَا وَنَأْكُلَهُ. فَقَالَ: حَتَّى أَسْأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلَهُ فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكَ غِنًى يُغْنِيكَ، قَالَ: لاَ. قَالَ: فَكُلُوهَا، قَالَ: فَجَاءَ صَاحِبُهَا فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ فَقَالَ: هَلاَّ كُنْتَ نَحَرْتَهَا؟ قَالَ: اسْتَحْيَيْتُ مِنْكَ. رواه أبو داود وأحمد[1]:

جابیری کوڕی سەموورە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پیاویٚ خوٚی‌و خیٚزانی لە ئەلحەڕە بەزیبوون، وشتریٚ بزر دەبیٚ خاوەنەکەی ئەم پیاوە رادەسپیٚریٚ: ئەگەر دوٚزیتەوە لەلای خوٚت گلی دەرەوە بوٚم، کاتیٚ دەیدوٚزیٚتەوە وشترەکە نەخوٚش دەکەویٚ، جا ژنەکەی پیٚی دەلٚیٚ: سەری بڕە، بەلاٚم ئەو قەبوولٚ ناکا تا مردار دەبیٚتەوە، ئینجا ژنەکە پیٚی دەلٚیٚ: دەی کەولٚی کە تا گوٚشت‌و پیوەکەی لەبەر خوٚر وشك بکەینەوە بە خویٚوەو بیکەین بە لەتکە گوٚشت یا بە قاورمە وە بیخوٚین. پیاوەکەش دەلٚیٚ: هەتا لە پیٚغەمبەر خوٚی (دروودی خودای لەسەربیٚ) نەپرسم شتی واناکەم، کە لیٚی دەپرسیٚ، دەفەرمویٚ (دروودی خودای لەسەربیٚ): ئەوەندەت دارایی هەیە کە بیٚ نیازت بکا؟ دەلٚیٚ: نەخەیر دەفەرمویٚ: دەبیخوٚن گوتی: جا کە خاوەنەکەی دیٚ پیٚی دەلٚیٚ، ئەویش دەلٚیٚ: کاشکی سەرت بڕیایە، دەلٚیٚ: شەرمم لەتوٚ کرد ئەگینا سەرم دەبڕی (د-سند صالح- ئەحمەد).

٢٧٢٤- عَنِ الْفُجَيْعِ الْعَامِرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا يَحِلُّ لَنَا مِنَ الْمَيْتَةِ؟ قَالَ: مَا طَعَامُكُمْ؟ قُلْنَا: نَغْتَبِقُ وَنَصْطَبِحُ. قَالَ: ذَاكَ (وَأَبِي) الْجُوعُ. فَأَحَلَّ لَهُمُ الْمَيْتَةَ عَلَى هَذِهِ الْحَالِ. رواه أبو داود[2]:

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] سكت عنه الشارح.

فوجەیعی عامیری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیم کرد: قوربان! کەی مردارەوەبوو حەلاڵ دەبێ بۆمان؟ فەرمووی: خۆراکتان چییە؟ گوتمان: ئێواران ژەمێ شیرو بەیانیان ژەمێ شیر – دەخۆینەوەو بەس! فەرمووی: بە گیانی بابم برسێتی هەروا دەبێ ئیتر لەسەر ئەم حاڵە مردارەوەبووی بۆ حەلاڵ کردن (د).

### ٢٣) هەندێ سەربزەی ناپەسند: (البقول المكروهة)

٢٧٢٥- ← (ب/١ ز/١١٨ ف/٢٠ ل/ ). وفي هذه الرواية: عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا – أَوْ قَالَ: – فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ. وَأُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا فَسَأَلَ فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ الْبُقُولِ فَقَالَ: قَرِّبُوهَا إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا فَقَالَ: كُلْ فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لاَ تُنَاجِي. رواه الخمسة ولفظه لأبي داود[1]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کەسەی کە سیر دەخوا، یا پیاز دەخوا با لە ئێمە دوور بگرێ یا فەرمووی: با دوور بگرێ لە مزگەوتەکەی ئێمەو لە ماڵی خۆی دانیشێ، جارێکیش تەبەقێکیان بۆ هێنا هەندێ سەوزەواتی لەسەر بوو، کە بۆنی سەوزەکە چوو بە سەریا پرسیاری کرد: ئەمە چییە، عەرزیان کرد فلانە سەوزەواتە فەرمووی: دای نێن بۆ ئەم پیاوە پیاوەکەش – کە یەکێك بوو لە هاورێیان – حەزی نەکرد بیخوات جا پێی فەرموو: تۆ بخۆ، چونکە من لەگەڵ کەسێ گوفتوگۆ دەکەم کە تۆ گوفتوگۆی لەگەڵ ناکەیت من لەگەڵ جوبرائیل قسە دەکەم (د/ش/ت/ن).

---

[1] تقدم تخريجه في رقم/٧٢٥ مجلد/١ تسلسل/١١٨.

٢٧٢٦- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَفَلَ تِجَاهَ الْقِبْلَةِ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَفْلُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَمَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الْبَقْلَةِ الْخَبِيثَةِ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا ثَلاَثًا. رواه ابو داود[٢]:

حوذیفە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ تف رۆبکا لە ئاستی رووگەی مزگەوت لە رۆژی قیامەتا کە دێ بۆ دیوانی خودا ئەو تفە بەناوچاویەوەیە، وە ئەوەیشی لەم سەوزە بۆگەنانە بخوات توخنی مزگەوتەکەی ئێمە نەکەوێ سێ جار وای فەرموو (د).

٢٧٢٧- وَقَالَ أَبُو أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ أَكَلَ مِنْهُ وَبَعَثَ بِفَضْلِهِ إِلَيَّ وَإِنَّهُ بَعَثَ إِلَيَّ يَوْمًا بِطَعَامٍ لَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ لِثُومٍ فِيهِ فَسَأَلْتُهُ أَحَرَامٌ هُوَ؟ قَالَ: لاَ وَلَكِنِّي أَكْرَهُهُ مِنْ أَجْلِ رِيحِهِ. رواه مسلم والترمذي[٣]:

ئەبو ئەییوب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە نانیان بۆ دادەنا، خۆی لێی دەخواردو ئینجا بەرماوەکەی خۆی دەنارد بۆ من، رۆژێ نانەکەی بۆ ناردم، بەڵام خۆی لێی نەخواردبوو، لەبەر ئەوەی کەسیری تیابوو، منیش عەرزیم کرد: ئایا سیر حەرامە؟ فەرمووی: نەء، بەڵام من لەبەر بۆنەکەی حەزم لێی نیە (م/ت).

٢٧٢٨- وَسُئِلَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) عَنِ أَكُلِ الْبَصَلِ فَقَالَتْ: آخِرَ طَعَامٍ أَكَلَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَعَامٌ فِيهِ بَصَلٌ. رواه أبو داود والنسائي[٤]:

بۆ خواردنی پیاز لە عائیشە پرسیارکرا، گوتی: دوا خواردەمەنی پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) کە خواردی پیازی تیابوو (د/ن).

٢٧٢٩- ورد في الشرح: ولأبي داود: مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلاَ يَقْرَبْنَا حَتَّى يَذْهَبَ رِيحُهَا[٥]:

---

[٢] بسند فيه شيئ مؤيد بما قبله (شرحه).

[٣] مسلم. اشربة: ٥٣٢٤.

[٤] سكت عنه الشارح.

لـە شـەرحەكەدا دەڵـێ: ئـەبو داوود (خـودای لێ رازی بـێ) دەگێڕێتـەوە لـە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: كەسێ لەم درەختەی خوارد، تا بۆنەكەی دەڕوا توخنمان نەكەوێ!

## ٢٤) بەشی پێنجەم: باسی شتی خواردنەوە:

## الفصل الخامس: في الشراب

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَـرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِلشَّارِبِينَ – ١٦/٦٦}.

خودای گەورە دەفەرموێ: لەماڵیاتو ئاژەڵیش پەندو عیبرەت هەیە بۆ ئێوەی هۆشمەند، تەماشا ناكەن ئەو شیرە پاكو خۆشو پاڵفتەو گەوارایە كە ئێوە دەیخۆنەوە لەچی پەیدا دەبێو چۆن پەیدا دەبێ، دیارە پەیدا دەبێ لەو سەخوڕە ترشاوە پیسە كە تێكەڵی خوێنو خوڕدەبێو لەپاشا بە قودرەتی خودای داناو زانا پاڵفتە دەبێو دەبێ بەو شیرە پاكو جوانە، كە نەسووراوی خوێنی پێوە هەیەو نەبۆنو بۆ ساری سەخۆری لێ دێ، پاكو رۆشنو سپیو بێگەردو خۆش.

{وَقَالَ تَعَالَى: يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَـا شَـرَابٌ مُّخْتَلِـفٌ أَلْوَانُـهُ فِيـهِ شِـفَاء لِلنَّـاسِ – ١٦/٦٩}.

خودای گەورە دەفەرموێ: لە سكی هەنگ دەر دەچێ خواردنەوەیێ، كە هەنگوینـە، چـەندە رەنـگو جـۆری هەیـە، كـە دەبـێ بـە شـیفاو چارە بـۆ گـەلێ دەردو ناساخیو نەخۆشین.

٢٧٣٠– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رُفِعْتُ إِلَى السِّدْرَةِ فَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ، نَهَرَانِ ظَاهِرَانِ، وَنَهَرَانِ بَاطِنَانِ، فَأَمَّا الظَّاهِرَانِ النِّيـلُ وَالْفُـرَاتُ، وَأَمَّـا

[٥] سكت عنه الشارح.

الْبَاطِنَان فَنَهَرَان فِي الْجَنَّةِ فَأُتِيتُ بِثَلاثَةِ أَقْدَاحٍ، قَدَحٌ فِيهِ لَبَنٌ، وَقَدَحٌ فِيهِ عَسَلٌ، وَقَدَحٌ فِيهِ خَمْرٌ، فَأَخَذْتُ الَّذِي فِيهِ اللَّبَنُ فَشَرِبْتُ فَقِيلَ لِي أَصَبْتَ الْفِطْرَةَ أَنْتَ وَأُمَّتُكَ[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە شەوی میعراجا درەختی سیدتولمونتەهایان نیشان دام کە دارمۆردێکی زۆر گەورەیەو زانستی فرێشتەکان تا ئەوێ بڕ دەکاو لەلای ئەو درەختە کۆتایی دێ چوار روبار لە بنیەوە هەڵ دەقوڵان، دوو رووباریان دیارەو ئاشکران، کە نیلو فوراتن، دوو رووباریشیان ونن، کە دوو زێی گەورەن وان لە بەهەشتا، وەسێ پیاڵەیان هێنا بۆم: پیاڵەیێ شیرو پیاڵەیێ هەنگوینو پیاڵەیێ مەی، منیش پیاڵە شیرەکەم وەرگرتو خواردمەوە، جا پێم گوترا: خۆتو گەل (ئۆمەت)ت ئایینی خودا کردتان پەسەند کردو رێو راست پەیتان بەرێی راستی خوایی برد! (ش).

٢٧٣١- وَأُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ، وَلَبَنٍ فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، ثُمَّ أَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، وَلَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ[٢]:

گوتی: ئەو شەوە کە پێغەمبەریان برد بۆ ئیلییا واتە: بۆ بەیتولمەقدیس لەوێ دوو پیاڵە خواردنەوەیان بۆ هێنا، پیاڵەیێ شیرو پیاڵەیێ مەی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) تەماشایان دەکاو پیاڵە شیرەکە وەر دەگرێ، جوبرائیلیش دەفەرموێ: سوپاسو ستایش بۆ خودا کە تۆی خستە سەر رێگەی راستی خۆی، ئەگەر پیاڵە مەیەکەت وەربگرتایە ئۆمەتت سەریان لێ دەشێواو گومڕا دەبوون (ش).

---

[١] مختصر صحيح البخاري (تجريد): ١٥١٣/ ٣٨٨٧ ، ٣٢٠٧ ، ٣٣٩٣ ، ٣٤٣٠. مسلم. إيمان: ٤١٥. ترمذی. تفسیر: ٣٣٤٦. نسائی. صلاة: ٤٤٧.

[٢] بخاري. احاديث الأنبياء: ٣٣٩٤ ، ٣٤٣٧ ، ٥٥٧٦. مسلم. إيمان: ٤٢٣. ترمذی. تفسیر: ٣١٣٠.

٢٧٣٢- وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): لَمَّا خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ مَرَرْنَا بِرَاعٍ وَقَدْ عَطِشَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَلَبْتُ لَهُ كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ. روى هذه الثلاثة الشَّيخان[٣]:

ئەبو بەكری صەدیق (خودای لێ رازی بێ) گوتی: كە لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەككەوە كۆچمان كرد بۆ مەدینە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەرێ تینووی بوو، تا تووشی شوانێ بووین، چووم پیاڵەیێ شیرم دۆشیو بۆیم برد، ئەویش خواردیەوە ئیتر دڵم حەسایەوە (ش).

٢٧٣٣- وَقَالَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَدَحِي هَذَا الشَّرَابَ كُلَّهُ الْعَسَلَ وَالنَّبِيذَ وَالْمَاءَ وَاللَّبَنَ. رواه مسلم والنسائي[٤]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئا بەم پیاڵەیەی خۆم هەموو جۆرە خواردنەوەیەكم دەرخواردی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داوە، وەكوو هەنگوینو خۆشاوو ئاوو شیرو ئەمانە (م/ن).

٢٧٣٤- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْخُلُ بَيْرُحَاءَ فَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ. رواه الشيخان والترمذي[٥]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەرۆیشت بۆ ناو باخی بەیروحا، كارێزێكی سازگاری تیا بوو لە ئاوەكەی دەخواردەوە (ش/ت).

٢٧٣٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ يُسْتَعْذَبُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَاءُ مِنْ بُيُوتِ السُّقْيَا. رواه أبو داود وأحمد[٦]:

---

[٣] بخاري. مناقب: ٣٦١٥ ، ٣٦٥٢ ، ٣٩٠٨ ، ٣٩١٧ ، ٢٤٣٩. مسلم. أشربة: ٥٢٠٦ ، ٧٤٣٨.

[٤] مسلم. أشربة: ٥٢٠٥.

[٥] تقدم برقم: ١٩٠٨/١ مجلد/ ٢ تسلسل/ ١٨٢.

[٦] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: جاران گەلێ جار لە كارێزی بەیتول سوقیاوە ئاوی شیرینیان دەهێنا بۆ خواردنەوەی پێغەمبەر** (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لەسەربێ) **(د-سند صالح-ئەحمەد).**

## ٢٥) ئەوەی لەبارەی ئارەقو مەیەوە هاتووە: (ما ورد في الخمر)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ - ١٦/٦٧}.

**هەیە بۆ ئێوە لەبەری داری خورماو داری مێودا پەندی شیرینو دەرسو عیبرەتی جوان، هەر وەكەوو لە گیانلەبەرانا ئەمە هەیە تەماشا دەكەن ئێوە لە بەری ئەم دارانە ئارەقو شەرابی مەستكەرو جۆرەها رزقو رۆزی جوانو نایابو خۆشیان لێ دروست دەكەن بۆ خۆتان، لە راستیدا لەم نازو نیعمەتە زۆرو جۆر بە جۆرانەدا بەڵگەی گەورەو نیشانەی جوان جوان هەیە لەسەر بوونو تەواناییو دانایی خودا، بە تایبەتی بۆ گەلێ كە هۆشیاربنو بۆ كەسێ كە كەسە!**

{وَقَالَ تَعَالَى: إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - ٦/٩٠}.

**خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی مائیدە لە ئایەتی ژمارە نەوەدا دەفەرموێ: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هێناوە! بزانن كە ئارەق خواردنەوەو یاری قومارو پەرستنی بتو بەكارهێنانی ئەزلام بۆ فاڵو دانە گرتنەوەو ئەمانەو خەریكبوون بە مانەوە كارێكی زۆر پیسو چەپەڵو گلاونو لە پیاوی ژێر ناوەشێتەوە بەڵكوو شتی وا پیشەی شەیتانو كارو ئیشی دەستەی ئەوە، كەوابوو تا زووتر لێیان دوور بكەونەوە درەنگە، سا بەشكوو رزگارو سەرفراز ببن.**

٢٧٣٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا عُبَيْدَةَ وَأَبَا طَلْحَةَ وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ مِنْ فَضِيخِ زَهْوٍ وَتَمْرٍ فَجَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ. فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: قُمْ يَا أَنَسُ فَأَهْرِقْهَا. فَأَهْرَقْتُهَا. رواه الثلاثة[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ مەییم دەگێڕا بەسەر كۆڕێكا، ئەبو عوبەیدەو. ئەبو طەلحەو ئوبەیی كوڕی كەعبیان تیا بوو، شەرابەكە لە هاڵەی خورماو لە خورما خۆی دروست كرا بوو، لەپڕ پیاوێ هات گوتی: ئارەق‌و مەی حەرام بوو، ئەبو طەلحەش گوتی: ئەی ئەنەس! هەڵسە بیڕێژە، ئیتر منیش رژاندم (ش/د).

٢٧٣٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى مِنْبَرِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، وَهْيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: الْعِنَبِ وَالتَّمْرِ وَالْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ، وَثَلَاثٌ وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يُفَارِقْنَا حَتَّى يَعْهَدَ إِلَيْنَا عَهْدًا: الْجَدُّ وَالْكَلَالَةُ وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. رواه الخمسة إلا الترمذي[٢]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: عومەر (خودای لێ رازی بێ) لەسەر دوانگەكەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وتارێكی خوێندەوە، گوتی: گومانی تێدا نیە كە ئارەق لەلایەنی خوداوە قەدەغە كراوە، لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆرتر ئارەق لەم پێنج شتە دروست دەكرێ: لە ترێ‌و لە خورماو لە گەنم‌و لە جۆو لە هەنگوێن، وە هەرچیش هەست‌و هۆش لاباو ئادەمیزاد سەرخۆش بكا ئەوە ئارەقە خۆزگەم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە پێش مەرگیا ئەم سێ شتەی بە تەواوی بۆمان روون دەكردەوە: پشكی باپیرەو، باسی كەلالەو، چەن بابەتێكی مەسەلەی سوود (ش/د/ن-خودایان لێ رازی بێ).

---

[١] بخاري. مظالم: ٢٤٦٤ ، ٤٦٢٠. مسلم. أشربة: ٥١٠٢. أبو داود. أشربة: ٣٦٧٦.

[٢] بخاري. أشربة: ٥٥٨٨ (٥٥٨٧).

٢٧٣٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَدِمَ وَفد عبد القيس عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلُوا عَنِ النَّبِيذِ فَنَهَاهُمْ أَنْ يَنْتَبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ وَالنَّقِيرِ وَالْمُزَفَّتِ وَالْحَنْتَمِ. رواه الخمسة[٣]:

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: وەفدەكەی خێڵی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە بارەی خۆشاو (نەبیذ)ەوە پرسیاریان لێ كرد، ئەویش رێگەی پێ نەدان كە لەم دەفرانەدا خۆشاو بكەن: لە كوولەكەی ئاوداو لە تەشپیو كۆتكەداو لە شتی رووكەش كراو بە زفتداو لە بەستوودا (ش/د/ت/ن–خودایان لێ رازی بێ).

٢٧٣٩- وَقِيْل لِإبْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) حَدِّثْنِي بِمَّا نَهَى عَنْهُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الأَشْرِبةِ بِلُغَتِكَ وَفَسِّرْهُ لَنَا بِلُغَتِنَا. قَالَ نَهَى النّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْحَنْتَمِ وَهِيَ الْجَرَّةُ وَعَنِ الدُّبَّاءِ وَهِيَ الْقَرْعَةُ وَعَنِ الْمُزَفَّتِ وَهُيَ الْمُقَيَّرُ وَعَنِ النَّقِيرِ وَهْيَ الَمطْلِيُّ بِالقَّارِ تُنْسَحُ (اي تَقشَّر) نَسْحًا وَتُنقَرُ نَقْرًا، وَأَمَرَ أَنْ يُنْتَبَذَ فِي الأَسْقِيَةِ. رواه مسلم والترمذي[٤]:

عەرزی ئیبنو عومەریان كرد: ئەو شتانەی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی كردووە لە خواردنەوەیان بە زمانی خۆتان پێمان بڵێو بە زمانی خۆشمان بۆمان واتاو راڤە بكە، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی دەكرد لە خواردنەوەی خۆشاوی ناو ئەم دەفرانە چونكە زۆر زوو دەترشێنو توند دەبنو دەبن بە ئارەق: بەستوو، واتە: كووپەڵە، كودیی واتە: كوولەكە، زفت دراو، واتە: شتێ بە زفت رووكەش كرابێ، كۆتكە، واتە: بنكی دارخورما كە توێكڵەكەی پاك دەكەنو ناوەكەی هەڵدەكۆڵن، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی كرد كە خۆشاو لە كوندەو جەوەندەو شتی وادا بكەن نەك لەو دەفرانەدا، چونكە ئەوانە

---

[٣] مسلم. أشربة ٥١٤٤٠ ، ٥١٤٤١ ، ٥١٥. نسائي. أشربة: ٥٦٥٤.

[٤] مسلم. أشربة ٥١٥٦ ، ١١٦ ، ١١٧.

شتیان زۆر زوو تێدا دەترشێ، دوور نیە كە سركەو خۆشاوو دۆشاوەكە ببن بەمەیو ئارەقو خاوەنەكەیان بەوە نەزانێ (م/ت).

٢٧٤٠- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نَهَيْتُكُمْ عَنْ ثَلاَثٍ وَأَنَا آمُرُكُمْ بِهِنَّ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا فَإِنَّ فِي زِيَارَتِهَا تَذْكِرَةً وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ الأَشْرِبَةِ أَنْ تَشْرَبُوا إِلاَّ فِي ظُرُوفِ الأَدَمِ فَاشْرَبُوا فِي كُلِّ وِعَاءٍ غَيْرَ أَنْ لاَ تَشْرَبُوا مُسْكِرًا وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الأَضَاحِي أَنْ تَأْكُلُوهَا بَعْدَ ثَلاَثٍ فَكُلُوا وَاسْتَمْتِعُوا بِهَا فِي أَسْفَارِكُمْ. رواه الخمسة إلا البخاري[٥]:

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من بە ئێوەم گوتبوو كە ئەم سێ شتە نەكەن، بەڵام ئێستە پێتان دەڵێم كە بەم شێوەیە بیان كەن، پێم گوتبوون كە نەچن بۆ دیدەنی گۆڕستان، بەڵام لەمەو لا بچن بۆ دینییان، چونكە بە راستی دیتنیی شوێنی وا پەندو ئامۆژگاریی تێدایە، وە پێم گوتبوون كە هەر لە دەفری چەرمیندا شت بخۆنەوە، بەڵام لەمەولا لە هەموو دەفرێكا شت بخۆنەوە بە مەرجی ئەوە كە شتی سەر خۆشكەر نەخۆنەوە، وە پێم گوتبوون كە لە پاش سێ رۆژ ئیتر لە گۆشتی قوربانی خۆتان نەخۆن، بەڵام لەمەولا لێی بخۆنو توێشووی رێگەو بانیشی لێ بكەن (م/د/ت/ن).

٢٧٤١- وَقَالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نَهَيْتُكُمْ عَنِ الظُّرُوفِ وَإِنَّ ظَرْفًا لاَ يُحِلُّ شَيْئًا وَلاَ يُحَرِّمُهُ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ. رواه مسلم والترمذي (رَضِيَ اللهُ تَعَالَ عَنْهُمَا)[٦]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: من بە ئێوەم گوتبوو كە لە هەندێ حاجەتدا شت مەخۆنەوە، بەڵام حاجەت خۆی لە خۆیا شت حەڵاڵو حەرام ناكا، ئەوەندە هەیە كە هەموو سەرخۆشكەرێ حەرامە (م/ت).

---

[٥] مسلم. أشربة: ٥١٧٥ ، ٥١٧٦ ، ٢٢٥٧ ، ٥١٧٧.

[٦] مسلم. أشربة: ٥١٧٦ ، ٢٢٧٥.

٢٧٤٢- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا): سُئِلَ النّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَـنِ الْبِتْـعِ وَهُوَ نَبِيذ العَسَل فَقَالَ: كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ. رواه الخمسة[٧]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گـوتـی: پرسـیـار کـرا لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ): بـەتـع حەرامـە یانـا؟ بـەتـع شـەرابی خـەڵکی یەمـەن بـوو لـە هـەنگوین دروسـت دەکـرا، فـەرمووی: هـەر خواردنـەوەیێ سەرخۆشـی ببەخـشێ و مـرۆڤ مەست بکات حەرامە ئێتر بەهەر ناوێ بێ ئەوە مەبەست نیە، عیللەتی تەحریم ئیسکارە، کە ئێسکار مەوجوود بوو حوکم مەوجوودە (ش/د/ت/ن).

٢٧٤٣- عَنْ طَارِقِ الْجُعْفِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَـأَلَ النَّبِـيَّ (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) عَـنِ الْخَمْرِ فَنَهَاهُ أَوْ كَرِهَ لَهُ أَنْ يَصْنَعَهَا فَقَالَ إِنَّمَا نَصْنَعُهَا لِلـدَّوَاءِ. فَقَـالَ: إِنَّـهُ لَـيْسَ بِـدَوَاءٍ وَلَكِنَّهُ دَاءٌ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٨]:

طاریقی ئەل-جوعفی (خودای لێ رازی بێ) گوتـی: عەرزی حەزرەتم کرد (دروودی خودای لەسەربێ): من ئارەق دروسـت دەکـەم، ئـەویش رێگـەی نـەدام - یا گـوتـی - حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی ناخۆش بوو کەشتی وا بکەم، منیش عەرزیم کـرد: خـۆ مـن بـۆ دەرمـانی دروسـت دەکـەم نـەوەك بـۆ خواردنـەوە؟ فـەرمووی: ئارەق دەرمان نیە بەڵکوو دەردە! (م/د/ت).

٢٧٤٤- عَنْ دَيْلَمِ الْحِمْيَرِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ النّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّا بِأَرْضٍ بَارِدَةٍ نُعَالِجُ فِيهَا عَمَلاً شَدِيدًا وَإِنَّا نَتَّخِذُ شَرَابًا مِنْ هَـذَا الْقَمْـحِ نَتَقَوَّى بِهِ عَلَى أَعْمَالِنَا وَعَلَى بَرْدِ بِلاَدِنَا. قَالَ: هَلْ يُسْكِرُ. قُلْتُ: نَعَمْ. قَـالَ: فَـاجْتَنِبُوهُ. قَالَ: قُلْتُ فَإِنَّ النَّاسَ غَيْرُ تَارِكِيهِ. قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَتْرُكُوهُ فَقَاتِلُوهُمْ. رواه ابو داود[٩]:

---

[٧] بخاري. وصنوء: ٢٤٢ ، ٥٥٨٥ ، ٥٥٨٦. ترمذی. أشربة: ١٨٦٣. أبُو داوُد. أشربة: ٣٦٨٢. نسائی. أشربة: ٥٦٠٧ — ٥٦١٠ ، ٢٣٨٦.

[٨] مسلم. اشربة: ٥١١٢. ترمذی. طب: ٢٠٤٦.

[٩] بسند صالح (شرحه).

دیلـەمی حیمیـەری (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: پرسـیارم كـرد لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیم كـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا ولاّتـی ئێمـە ساردەو بەزەبری باهوو كاری تیا دەكەین، وە جۆرە خواردنەوەیێ لەم گەنمە دروست دەكـەین، هـەم یارییـدەمان دەدا لەسـەر كردنـی ئـیشو كارمـانو هـەم چـاری ساردیی ولاّتەكەشمانی پـێ دەكـەین فـەرمووی: پیـاو سـەرخۆش دەكا یانـا؟ گوتم: ئا، سەرخۆشی دەكا. فەرمووی: توخنی مەكەون گوتم: ئـاخر خەڵكەكە دەسـتی لێ هـەڵناگرن، فـەرمووی: ئەگـەر هـەروازیان لێ نـەهێنا بـچن بـە گـژیانا (د–سند صالح).

٢٧٤٥– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَسْـكَرَ كَـثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ. رواه اصحاب السُّنن (بسندٍ حسنٍ)[١٠].

جـابیر (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: هەر شتێ زۆرەكەی خەڵك سەرخۆش بكا كەمەكەیشی حەرامە وەك زۆرەكەی (د/ت/ن–س/ح).

٢٧٤٦– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وَمَا أَسْكَرَ مِنْهُ الْفَرْقُ فَمِلْءُ الْكَـفِّ مِنْـهُ حَـرَامٌ. رواه ابـو داود والترمـذي بـسندٍ حسنٍ. والله أعلم[١١].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: هـەموو شتێكی سەرخۆشـكەر قەدەغەیـە، گریمـان شـتێ بـەپڕ ربـەیێ ئەوسـا خەڵك سەرخۆش بكا پڕیەك لوێچیش لەو شتە هەر حەرامە (د/ت–س/ح).

٢٧٤٧– ورد في الشرح: روى: لَنْ يَجْعَلَ اللهُ شِفَاءَ أُمَّتِي فِيمَا حَرَّمَ عَلَيْهَا[١٢].

---

[١٠] بسند حسن (شرحه).

[١١] بسند حسن (شرحه).

[١٢] سكت عن درجته الشارح.

لــە شــەرحەكەدا دەڵــێ: دەگێڕنــەوە: حــەزرەت (دروودی خــودای لەســەربێ) فەرموویــەتی: خــودای گــەورە هــەرگیز خۆشــەوەبوونو شــیفای گــەلی منــی نــە بەستووە بە شتی واوە كە خۆی قەدەغەی كردبێ لێیان.

## ٢٦) هەڕەشەكردن لەمەیخواردنەوە: (التحذير من شرب الخمر)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْـنَكُمُ الْعَـدَاوَةَ وَالْبَغْـضَاء فِـي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُـونَ. وَأَطِيعُـواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَاحْذَرُواْ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُـبِينُ – ٥/٩١ – ٩٢}.

خــودای گــەورە دەفــەرموێ: شــەیتانی لــەعین دەیــەوێ بــەهۆی ئــارەقو قومارەوە دوژمنایەتیو رقو كینەكاری بخاتە ناو ئێوەو تۆوی دووبەرەكیو ناكۆكی بچێنێ بە ناوتانا، وە رێگەی یادو ذیكری خوداو نوێـژتان لێ بگرێ، جا ئایا ئێوە ئیتر دەسبەردار دەبنو وازیان لێ دێنن، چونكە لە پاش ئەم روونكردنەوەیــە هــیچ بیانوویــەكتان نامێنــێ، هەمیــشە فەرمانبــەریی خــوداو فەرمانبــەریی پێغەمبــەری خــودا بكــەنو خۆتــان بپــارێزن لــە هۆكــانی ســزاو ئازاری هەردوو جیهان جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵكەن لەم فەرمانانەو بە گوێی پێغەمبەری خۆتان نەكەن ئەوە بزانن كە هەر خۆتان ماڵ وێرانو خانەخراپ دەبن، چونكە پێغەمبەری ئێمە هەر راگەیاندنی فەرمودەی خودای لە سەرە، كە بە شێوەیەكی رووناك روونی بكاتەوە بۆتانو بەس.

٢٧٤٨– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُّ مُـسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وَمَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا فَمَاتَ وَهُـوَ يُـدْمِنُهَا لَـمْ يَتُـبْ لَـمْ يَشْرَبْهَا فِي الآخِرَةِ. رواه الخمسة[1]:

---

[1] مسلم. أشربة: ٥١٨٦. أبو داوُد. أشربة: ٣٦٧٩. ترمذی. أشربة: ١٨٦١. نسائی. أشربة: ٥٥٩٨ – ٥٦٠١.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو سەرخۆش كەرێ ئارەقە، وە هەموو سەرخۆشكەرێ ناڕەوایە وە هەركەسێ لە جیهانا ئارەق بخواتەوەو فێری ببێو تا دەمرێ تەركی نەكاو تەوبەی لێ نەكا ئەوە لە بەهەشتا چەشكەی ناكات (ش/د/ت/ن).

٢٧٤٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْخَمْرَ وَشَارِبَهَا وَسَاقِيَهَا وَبَائِعَهَا وَمُبْتَاعَهَا وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ رواه أبو داود والترمذي (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا)[٢]:

دیسان ئەو (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەعنەتو نەفرینی خودا لە ئارەقو لە ئارەقخۆرو لە مەیگێڕو لە ئارەق فرۆشو لە ئارەق كڕو لەو كەسە دەیگوشێو دروستی دەكاو لەو كەسە بۆی دەگوشنو بۆی دروست دەكەنو لەو كەسە هەڵی دەگرێو لەو كەسە بۆی دەبەن (د-سند صالح - ت).

٢٧٥٠- وَقَدِمَ رَجُلٌ مِنْ جَيْشَانَ فَسَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ شَرَابٍ يَشْرَبُونَهُ بِأَرْضِهِمْ مِنَ الذُّرَةِ يُقَالُ لَهُ الْمِزْرُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوَمُسْكِرٌ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ : كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ إِنَّ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَهْدًا لِمَنْ يَشْرَبُ الْمُسْكِرَ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ أَوْ عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ. رواه مسلم والنسائي[٣]:

پیاوێ لە جەیشانەوە هات، لە پێغەمبەری پرسی: لە وڵاتی ئێمە شەرابێ هەیە پێی دەڵێن میزر، لە گەنمەشامی دروست دەكرێ، خەڵك دەیخۆنەوە فەرمووی: ئایا ئادەمیزاد سەرخۆش دەكا؟ گوتی: بەڵێ دەیكا، فەرمووی: هەموو سەرخۆشكەری حەرامە، خودای گەورەو مەزن پەیمانی داوە بە خۆی كە هەر كەسێ شتی سەرخۆشكەر بخواتەوە لە چڵپاوی

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] مسلم. أشربة: ٥١٨٥. نسائي. أشربة: ٥٧٢٥.

زووخاوی دەرخوارد بدات گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چڵپاوی زووخاو چییە؟ فەرمووی: ئارەقو چڵكی دۆزەخییەكانە یا فەرمووی: كێمو زووخاوی لەشی داهەزاوی دۆزەخییەكانە (م/ن).

٢٧٥١- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ شَرِبَ مُسْكِرًا بُخِسَتْ صَلاَتُهُ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ قِيلَ: وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: صَدِيدُ أَهْلِ النَّارِ وَمَنْ سَقَاهُ صَغِيرًا لاَ يَعْرِفُ حَلاَلَهُ مِنْ حَرَامِهِ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ. رواه أصحاب السُّنن[٤]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی ئارەق بخواتەوە تا چل رۆژ نوێژی گیرا نابێ، بەڵام ئەگەر تەوبە بكات خودا تەوبەی قەبووڵ دەكات، جا ئەگەر بۆجاری چوارەم تێ هەڵچووەوە ئەوە پێویست دەبێ لەسەر خودا كە لە چڵپاوی زووخاوی دەرخواردبدا. گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! چڵپاوی زووخاو چییە؟ فەرمووی: كێمو زووخاوو جەرەتاوی دۆزەخییەكانە. هەر كەسەیش ئارەق دەرخواردی منداڵێ بدات كە لەبەر منداڵی حەڵاڵو حەرام لە یەك جیا نەكاتەوە دەبێ بە ماف لەسەر خودا كە لە جەرەتاوی دۆزەخییەكان دەرخواردی ئەو كەسە بدات (د/ت/ن-س/ح).

٢٧٥٢- عَنْ أَبِي مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ، وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ (جبلٍ) يَرُوحُ الرَّاعِي عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ - يَعْنِي الْفَقِيرَ - لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا. فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ (يُهلكُهُم بليلٍ) وَيَضَعُ الْعَلَمَ (بأن يدكّه عليهم ويُوقعه على رؤسهم) وَيَمْسَخُ آخَرِينَ (ممّن لم يُهلكُهُم البيات) قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رواه البخاري وأبو داود[٥]:

---

[٤] بسند حسن (شرحه).

[٥] مختصر صحيح البخاري (التجريد الصريح): ١٨٤٢/٥٥٩٠ بەرگی/٥ ل - ١٤٠.

ئــەبو مالیــك (خــودای لێ رازی بــێ) گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەربێ) فەرمووی: پیاوگەلێ لە گەلی من پەیدا دەبن داوێن پیسی بە حەلاڵ دەزانن، وە هەر وائاورێشمو ئارەقو مەیو بادەو نەیو سازو سەمتوورو تفاقی بەزمو رەزم بە حەلاڵ دەزانن، هۆزگەلێكیش لە پاڵ كێوێكا هەڵ دەدەنو دە بەزن، شوانەكەیان ئێواران رانەكەیان دەباتەوە بۆیان لە پاش لەوەڕان، كەهەژارێ دێت داوای شتێكیان لێ بكا بۆ پێویستی خۆی پێی دەڵێن: سبەینێ وەرەوە بۆلامان! جا شەوێ خودا دەدات بە سەریاناو كێوەكە دادەنێ لە سەریان وە كەسانێكی تریشیان خودا بیچمییان دەگۆڕێو دەیان كات بە مەیموونو بەراز، وە هەتا رۆژی قیامەت ئەم جۆرە سزایە لەناو ئەم گەلەدا دەمێنێ! (ب/د).

٢٧٥٣- وَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا. رواه أبو داود والنسائي وابن حبّان وصححه[٦]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەو خودایە، كەسانێ لەم گەلی منە ئارەق دەخۆنەوە، بەڵام ناوێكی تری لێ دەنێن! (د/ن/ئیبنو حەببان:ص).

٢٧٥٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ وَنفَرٍ من الصَّحابة (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: من شرب الخمرة، فاجلدوه، ثم إن شرب فاجلدوة، ثم إن شرب فاجلدوه، ثم إن شرب فاقتلوه. وَفِي رِوَايَةٍ: فاضربوا عُنُقَهُ. رواه النسائي والترمذي[٧]:

ئیبنو عومەرو چەند كەسێكی تر لە هاوڕێیان (خودایان لێ رازی بێ) گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ مەیی خواردەوە، تا سێ جار هەموو جارێ داركاریی بكەن وە لە جاری چوارەمدا ئەگەر خواردیەوە بیكوژن لە گێڕانەوەیەكا: ئیتر بدەن لە گەردنی (ن/ت).

---

[٦] صححه ابن حبان.

[٧] منوخ (شرحه).

٢٧٥٥- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهَا أُمُّ الْخَبَائِثِ إِنَّهُ كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ خَلاَ قَبْلَكُمْ تَعَبَّدَ فَعَلِقَتْهُ امْرَأَةٌ غَوِيَّةٌ فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ جَارِيَتَهَا تَطْلُبُهُ لِلشَّهَادَةِ فَانْطَلَقَ مَعَ جَارِيَتِهَا فَجَعَلَتْ كُلَّمَا دَخَلَ بَابًا أَغْلَقَتْهُ دُونَهُ حَتَّى أَفْضَى إِلَى امْرَأَةٍ وَضِيئَةٍ عِنْدَهَا غُلاَمٌ وَبَاطِيَةُ خَمْرٍ فَقَالَتْ إِنِّي وَاللَّهِ مَا دَعَوْتُكَ لِلشَّهَادَةِ وَلَكِنْ دَعَوْتُكَ لِتَقَعَ عَلَيَّ أَوْ تَشْرَبَ مِنْ هَذِهِ الْخَمْرَةِ كَأْسًا أَوْ تَقْتُلَ هَذَا الْغُلاَمَ. قَالَ فَاسْقِينِي مِنْ هَذَا الْخَمْرِ كَأْسًا فَسَقَتْهُ كَأْسًا. قَالَ زِيدُونِي فَلَمْ يَرِمْ حَتَّى وَقَعَ عَلَيْهَا وَقَتَلَ النَّفْسَ فَاجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهَا وَاللَّهِ لاَ يَجْتَمِعُ وَالإِيمَانُ أَبَدًا إِلاَّ لَيُوشِكُ أَحَدُهُمَا أَنْ يُخْرِجَ صَاحِبَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ : لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنَّانٌ وَلاَ عَاقٌّ وَلاَ مُدْمِنُ خَمْرٍ. رواهما النسائي[٨]:

عوسمان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆتان بپارێزن لە مەی چونکە مەی هەوێنی هەموو خراپەیەکە. لە پێشینان پیاوێ دەبێ، ژنێکی حەیشەری دڵی تێی دەچێ، جا کارەکەرەکەی دەنێرێ بە شوێنیا، گوایە بانگی بکات بۆ شایەتی، جا کە لەگەڵیا دەچێو دەچنە ماڵەوە کارەکەرەکەدەرگاکانی یەکە بە یەکە لەسەر کلۆم دەدات، تا دەگاتە لای ئافرەتێکی شۆخو شەنگ منداڵێكو سوراحییەك مەیی لەلا دەبێ. ئینجا ژنەکە پێی دەڵێ: بە خودا بۆ شایەتیم بانگ نەکردوویت، بەڵکوو بۆ ئەمەم بانگ کردوویت: کە یا دەبێ سوارم ببیت، یا دەبێ پیاڵەیێ لەم ئارەقە بخۆیتەوە، یا دەبێ ئەم کوڕە بکوژیت! پیاوەکە دەڵێ: کەوایە پیاڵەیەکم لە مەیەکە بدەرێ چونکە لەلای وا دەبێ کە مەیەکە لە دوو تاوانەکانی تر ئاسانترە ژنەکەیش پیاڵەیی مەیی دەداتێ ئیتر هەر دەڵێ: بۆم تێکەنەوە، تا تەواو بەد مەست دەبێ، ئەوجا لە شوێنی خۆی نابزوێ تا سواری ژنەکەش دەبێو منداڵەکەش دەکوژێ. جا خۆتان دووربگرن لە ئارەقو شەراب، قەسەم بەزاتی خودا هەرگیزاو هەرگیز ئارەقو ئیمانو باوەڕ کۆ نابنەوە، ئەگەر کۆش ببنەوە بەرە بەرە یەکێکتان ئەوی تریان دەردەپەڕێنێ، لە گێڕانەویەکا: ئەم سێ کەسە ناچنە بەهەشت: کەسێ

---

[٨] سكت عنه اشارح.

چاكەیێ بكات بە منەت‌و نازەوە، كەسێ دڵی باوك‌و دایكی بڕەنجێنێ، كەسێ فێری ئارەق ببێ‌و ببێ بە ئارەق خۆر! (ن).

## ٢٧) كۆتایی - دروست نییە مەی بكرێ بەسركە

## خاتمة - الخمر لا تخلل

٢٧٥٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُئِلَ عَنِ الْخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلاًّ فَقَالَ «لاَ». رواه مسلم والترمذي[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیاركرا لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ): ئەگەر مەی بكرێ بە سركە حەڵاڵ دەبێ؟ فەرمووی: نەء. (م/ت-خودایان لێ رازی بێ).

٢٧٥٧- وَعَنْه أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ أَيْتَامٍ وَرِثُوا خَمْرًا قَالَ « أَهْرِقْهَا ». قَالَ أَفَلاَ أَجْعَلُهَا خَلاًّ قَالَ « لاَ ». رواه أبو داود بسندٍ صالحٍ[2]:

دیسان گوتی: ئەبو طەلحە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەری پرسی: چەند هەتیوێك هەن ئارەقیان بەمیرات بۆ جێماوە، چی لێ بكەین؟ فەرمووی: بیڕێژە. گوتی: ئەی نابێ بیكەم بە سركە؟ فەرمووی: نەء. (د-سند صالح).

## ٢٨) خۆشاو (نەبیذ) - بە مەرجێ پیاو سەرخۆش نەكا - حەڵاڵە:

## يباح النبيذ ما لم يسكر

٢٧٥٨- ← (ب - وفي هذه الرواية: دَعَا أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي عُرْسِهِ فَكَانَتِ امْرَأَتُهُ يَوْمَئِذٍ خَادِمَهُمْ وَهِيَ الْعَرُوسُ قَالَ سَهْلٌ

---

[1] مسلم. أشربة: ٥١١١. أبو داود. أشربة: ٣٦٧٥. ترمذي. بيوع: ١٢٩٤.

[2] سنده صالح.

تَدْرُونَ مَا سَقَتْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْقَعَتْ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ فِي تَوْرٍ فَلَمَّا أَكَلَ سَقَتْهُ إِيَّاهُ. رواه الشيخان[1]:

لەم گێڕانەوەدا: ئەبو ئوسەیدی ئەل-ساعیدی (خودای لێ رازی بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بانگ دەكا بۆ سەرزەماوەنەكەی خۆی، وە ژنەكەی - كە بووك دەبێ - ئەو خزمەتیان دەكا. سەهل گوتی: دەزانی كە ئەو ژنە ئەو رۆژە چی جۆرە خواردنەوەیەك دەرخواردی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەدات، هەر لە شەوەوە چەند دەنكێ خورما لە تەشپییەكی بەردینەدا دەخووسێنێ، وە لەپاش نان خواردن ئەو خۆشاوە دەدا بە پێغەمبەر دەیخواتەوە (ش).

٢٧٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كُنَّا نَنْبِذُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سِقَاءٍ يُوكَى أَعْلاَهُ وَلَهُ عَزْلاَءُ نَنْبِذُهُ غُدْوَةً فَيَشْرَبُهُ عِشَاءً وَنَنْبِذُهُ عِشَاءً فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[2]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران شەربەتو خۆشاومان لە ترێو خورماو مێوەی تر دروست دەكرد بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە جەوەندەیەكا دەمان خووساند، جەوەندەكەمان سەرەو ژوور هەڵ دەواسێو دەمەكەیمان بە دەمبێن دەبەست، جا لە هەنگڵەكەی خوارەوە، لێمان دادەكرد، جاری وا دەبوو سەر لەبەیانی دەمان خووساند شێوان دەیخواردەوە، وە رۆژی وا دەبوو شێوان دەمان خووساند سەر لە بەیانی دەیخواردەوە. (م/د/ت-خودایان لێ رازی بێ).

٢٧٦٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُنْقَعُ لَهُ الزَّبِيبُ فَيَشْرَبُهُ الْيَوْمَ وَالْغَدَ وَبَعْدَ الْغَدِ إِلَى مَسَاءِ الثَّالِثَةِ ثُمَّ يَأْمُرُ بِهِ فَيُسْقَى أَوْ يُهَرَاقُ. رواه مسلم وأبو داود والنسائي[3]:

---

[1] بخاري. إيمان ونذور: ٦٦٨٥ ، ٥١٧٦.

[2] مسلم. أشربة: ٥٢٠٠. أبو داوُد. أشربة: ٣٧١١. ترمذی. أشربة: ١٨٧١.

[3] مسلم. أشربة: ٥١٩٤ - ٥١٩٩. أبو داوُد. أشربة: ٣٧١٣. نسائی. أشربة: ٥٧٥٣ - ٥٧٥٥.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **جاران کە مێوژیان بۆ دەخووساند، هەتا ماوەی سێ ڕۆژهەر لێی دەخواردەوە، ئیتر فەرمانی دەکرد ئەوەی مابوو یا دەیانخواردەوە یا دەیانڕژاند (م/د/ن).**

**٢٧٦١- ولأبي داود والنسائي: كان ينبذ للنبيّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **في سقاء فإذا لم يجدوه نبذوا له في تورٍ من حجارةٍ. والله أعلم. نسأل الله الستر والتوفيق. آمين**[٤]**:**

**جاران لە خییگەدا شەربەتو خۆشاویان بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دروست دەکرد، جا ئەگەر دەفری چەرمینیان دەست نەکەوتایە لە کووچەڵەیەکی بەدین دا دروستیان دەکرد بۆی (د/ن)**[١]**.**

---

[٤] سكت عنه اشارح.

[١] دەفری زێڕو زیو، کوچەڵەی بەردین

سوێنەو گلێنە، هەم کاسەی دارین

ئەمانە هەموو دەفرن بۆ خۆراک

دەفری ڕەزای خوا دڵێکی نوورین!

کە دڵ ئاودرا بە شەرابی نوور

پێویستی نابێ بە سەرابی دوور

دڵی بێ ئاگاش لە سامی خودا

دێزەڵەی ڕەشە بۆ عەزابی سوور

-وەرگێڕ-

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی جلو بەرگ

(پێنج باسو دوا وتارێکە)

## ٢٩) باسی یەکەم: ئاورێشمو زێرو زیو بۆ پیاو دروست نین:

## كتاب اللباس وفيه خمسة أبواب وخاتمة:

## الباب الأول: في تحريم الحرير والذهب والفضة على الرجال

**٢٧٦٢- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَبِسَ الحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ. واه الخمسة إلا أبا داود[1]:**

**عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ لە پیاوان لەم جیهانەدا ئاورێشم لەبەربکا لەو جیهاندا لەبەری ناکا (ش/ت/ن).**

**٢٧٦٣- وَكَانَ حُذَيْفَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بِالْمَدَايِنِ فَاسْتَسْقَى، فَأَتَاهُ دِهْقَانٌ بِمَاءٍ فِي إِنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ فَرَمَاهُ بِهِ وَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَرْمِهِ إِلاَّ أَنِّي نَهَيْتُهُ فَلَمْ يَنْتَهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): الذَّهَبُ وَالْفِضَّةُ وَالْحَرِيرُ وَالدِّيبَاجُ هِيَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ. وَفِي رِوَايَةٍ : نَهَانَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نَشْرَبَ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَأَنْ نَأْكُلَ فِيهَا، وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ، وَأَنْ نَجْلِسَ عَلَيْهِ. رواهما الشيخان والنسائي[2]:**

**حوذیفە (خودای لێ رازی بێ) لە مەدائین بوو، داوای ئاوی خواردنەوەی کرد، ئاغا دێیەك لە حاجەتی زیودا ئاوی بۆ هێنا، حوذەیفە حاجەتەکەی لێ گرتو تێی گرتو گوتی: من بۆیە تێم گرت، چونکە من یەك دوو جار پێم گوتووە کە ئیتر وا نەکا کەچی ئەو هەروا دەکا. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زێرو زیوو ئاورێشمو دێباج ئەمانە لە جیهانا بۆ ئەوانو لە بەهەشتا بۆ**

---

(1) تجريد بخاري: ٥٨٣٤/١٨٩٦ ، ٥٨٢٨ ، ٥٨٢٩ ، ٥٨٣٠ ، ٥٨٣٥ = بەرگی/١٨٦/٥. مسلم. لباس/ ٥٣٧٧. نسائي. زينة: ٥٣٢٠.

(2) بخاري. أشربة: ٥٦٣. تجريد/١٩٠/٥ رقم: ١٨٩٧ ، ٥٨٣٧ + ٥٤٢٦/١٨١٣ = بەرگی/٥ ل - ٨٥.

ئێوەن. لە گێڕانەوەیەكا: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی نەداوین كە لە حاجەتی زێڕو زیودا شت بخۆینەوە، یا شتیان تێدا بخۆین، یا ئاورێشم‌و دێباج لەبەركەین، یا لەسەریان دابنیشین! (ش/ن).

٢٧٦٤- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَوْبُ حَرِيرٍ، فَجَعَلْنَا نَلْمُسُهُ، وَنَتَعَجَّبُ مِنْهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ : مَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ هَذَا. رواه الشيخان والترمذي والنسائي ولفظه: قَالَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَدَخَلَ عَلَيْهِ و وَاقِدُ بْنُ عَمْرِو ابْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ. كَانَ سَعْدٌ أَعْظَمَ النَّاسِ وَأَطْوَلَهُمْ. ثُمَّ بَكَى فَأَكْثَرَ الْبُكَاءَ وَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ إِلَى أُكَيْدِرَ صَاحِبِ دُومَةَ بَعْثًا فَأَرْسَلَ أُكَيْدِرُ إِلَيْهِ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ مَنْسُوجٍ فِيهَا الذَّهَبُ فَلَبِسَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَقَعَدَ فَلَمْ يَتَكَلَّمْ وَنَزَلَ فَجَعَلَ النَّاسُ يَلْمُسُونَهَا بِأَيْدِيهِمْ فَقَالَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذِهِ لَمَنَادِيلُ سَعْدٍ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْهَا[٣]:

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جبەیەكی ئاورێشمیان بە دیاریی بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هێنا، ئێمەیش دەستمان لێ دەخشان‌و پێمان سەیربوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەیرتان لەم جبەیە دێ؟ گوتمان: بەڵێ فەرمووی: دەستەسڕەكانی سەعدی كوڕی موعاذ لە بەهەشتا لەمە باشترە (ش/ت/ن) گفتەی (ن) ئاوایە: ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) هاتەوە بۆ مەدینە، واقیدی كوڕی عەمری كوڕی سەعدی كوڕی موعاذ هات بۆ لای، ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: سەعد پیاوێكی گەلێ گەورەو كەڵەگەت بوو، ئینجا ئەنەس دەستی كرد بە گریان‌و گەلێ گریا، وەگوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەستەیێ پیاوی نارد بۆ لای ئوكەیدیر، كە شای دەومەتولجەندەل بوو، ئوكەیدیریش جبەیەكی دێباجی بە زێڕ چنراوی نارد بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) لەبەری كردو چووە سەر دوانگەكەو پێیەوە دانیشت‌و هیچ قسەی نەكردو هاتە

---

[٣] بخاري. حدود: ٦٨٤٦ ، ٧٤١٦. مسلم. لعان: ٣٧٤٣.

خوارەوە، ئیتر خەڵكەكە دەستیان دەخشان لە جبەكەو لە لایان سەیرو بوو، ئەویش فەرمووی: ئەوە چییە سەیرتان لەم جبەیە دێ! دەسا بە خودا دەستە سڕەكانی سەعد لە بەهەشتا گەلێ لەمە نایابو جوانترن!

٢٧٦٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ فَصَلَّى فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ وَقَالَ « لاَ يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ. رواه الشيخان (والنسائي)[٤]:

عوقبەی كوڕی عامیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ← (ب/١ ز/٥٥ ف/٤ ل/ ).

٢٧٦٦- وَخَطَبَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بِالْجَابِيَةِ (مكانٌ بالشَّام) فَقَالَ: نَهَى نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ إِلاَّ مَوْضِعَ إِصْبَعَيْنِ أَوْ ثَلاَثٍ أَوْ أَرْبَعٍ. رواه الخمسة[٥]:

عومەر (خودای لێ رازی بێ) لە شام لە جابییە وتارێكی خوێندەوە گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی نەداوە كە ئاورێشم لەبەر بكرێ، مەگەر بۆ نەخش، ئەویش بەقەد جێگەی دوو سێ پەنجە یا سێ چوار پەنجە (ش/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٢٧٦٧- وَاشْتَرَى ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) مِنْ السُّوقِ ثَوْبًا شَامِيًّا فَرَأَى فِيهِ خَيْطًا أَحْمَرَ (من حريرٍ) فَرَدَّهُ فَسُئِلَتْ عَنْ ذِلكَ أَسْمَاءُ فَقَالَتْ: يَا جَارِيَةُ نَاوِلِينِي جُبَّةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْرَجَتْ جُبَّةَ طَيَالِسَةَ مَكْفُوفَةَ الْجَيْبِ وَالْكُمَّيْنِ وَالْفَرْجَيْنِ بِالدِّيبَاجِ. رواه أبو داود ومسلم وزاد: وَقَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَلْبَسُهَا فَنَحْنُ نَغْسِلُهَا لِلْمَرْضى مِنَّا يَسْتَشْفَى بِهَا[٦] :

جارێ ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) لە بازاڕ، كاڵایەكی شامیی كڕی كە تەماشای كرد تاڵێكی ئاورێشمی سووری تیادا بوو، جا لەبەر ئەوە دایەوە

---

[٤] بخاري. صلاة: تجريد/ ١ ل — ٢٥٢ رقم: ٢٣٩/ ٣٧٥ ، ٥٨٠. مسلم. لباس وزينة: ٥٣٩٤. نسائي. قبلة: ٧٦٩. تقدم برقم: ٤٠٨/٤ مجلد أول. تسلسل/ ٥٥.

[٥] مسلم. لباس وزينة: ٥٣٨٤. ترمذى. لباس: ١٧٢١.

[٦] مسلم. لباس وزينة: ٥٣٧٦. أبو داود: لباس: ٤٠٥٤. ترمذى. استئذان: ٢٨١٧.

بەسەر فرۆشیارەکەدا جا کە لەم بارەیە وە لە ئەسمایان پرسی، ئەسماء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئادەی کەنیشکە! جبەکەی پێغەمبەر خۆیم بۆ بێنە، کە جبەکەی هێنا لە قوماشێکی ئەستوور بوو، یەخەکەیو هەردوو سەر دەستەکەیو هەردوو چمکەکەی بە دێباج نەخشابوون، ئەسماء بەمە بەرپەرچی قسەکەی ئیبنو عومەری دایەوە (د/م) گێڕانەوەی موسلیم (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) ئەمەی پترە: جا ئەسماء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەی لەبەر دەکرد، بۆیە ئێمە دەیشۆرین بۆ نەخۆشو ئاوەکەی بۆ مووفەڕك دەدەینێ یا لێی دەپرژێنین تا پێی چاك ببێتەوە.

٢٧٦٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: إِنَّمَا نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الثَّوْبِ الْمُصْمَتِ مِنَ الْحَرِيرِ فَأَمَّا الْعَلَمُ مِنَ الْحَرِيرِ وَسَدَى الثَّوْبِ فَلاَ بَأْسَ بِهِ. رواه أبو داود والحاكم وصححه[٧]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەنیا رێگەی ئەوەی نەدەدا کە کالاو بەرگ ئاورێشمی پەتی بێ، بەلام نەخشو تانی کالا ئەگەر لە ئاورێشمیش بێ قەیدی نیە (د/حا:ص).

٢٧٦٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَخَّصَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ ابْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ لِحِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا. واه الثلاثة والنسائي[٨]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی عەبدورەحمانی کوڕی عەوفو زوبەیری کوڕی عەوامی دا کە ئاورێشم لەبەر بکەن، چونکە ئالۆشو خورووکەیێ لە لەشیانا هەبوو (ش/د/ت).

---

[٧] صحيح عند الحاكم.

[٨] بخاري. جهاد: تجريد/ ٣ ل – ٣٢٣ ژمارە/ ١١٩٩/ ٢٩١٩ ، ٢٩٢٠ ، ٢٩٢١ ، ٢٩٢٢ ، ٥٨٣٩. فتح الباری مسلم. لباس: ٥٣٩٦. أبو داود. لباس: ٤٠٥٦. نسائی. زینة: ٥٣٢٥ ، ٥٣٢٦.

٢٧٧٠- وَعَنْهُ أَنَّهُمَا شَكَوَا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْقَمْلَ فَرَخَّصَ لَهُمَا فِي قُمُصِ الْحَرِيرِ فِي غَزَاةٍ لَهُمَا. رواه مسلم والترمذي[٩]:

دیسان گوتی: ئەورەحمانی کوڕی عەوف‌و زوبەیری کوڕی عەوام لە غەزایەکا لە دەست ئەسپێ سکالایان لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) کرد، ئەویش ڕێگەی دان کە کراسی ئاورێشمین لەبەر بکەن (م/ت).

٢٧٧١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلاً بِبُخَارَى عَلَى بَغْلَةٍ بَيْضَاءَ عَلَيْهِ عِمَامَةُ خَزٍّ سَوْدَاءُ فَقَالَ: كَسَانِيهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رواه النسائي والحاكم وابو داود وَقَالَ: قَدْ لَبِسَ الْخَزَّ عِشْرُونَ أَوْ أَكْثَر مِنَ أَصْحَاب النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) [١٠]:

لە عەبدوڵلای کوڕی سەعدەوە لە باوکیەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لە بوخارا پیاوێکم دی، سواری هێسترێکی سپی بوو، مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو تانەکەی ئاورێشم بوو، دەیگوت: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە خەلاتی ئەم مێزەرەی لەسەر کردووم (ن/حاکم/ئەبو داوود) ئەبو داوود دەیشی گوت: پتر لە بیست کەس لە یارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئاورێشمی دوو ڕەنگ‌و تێکەڵاویان لەبەر دەکرد.

٢٧٧٢- عَنْ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَ حَرِيرًا فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ وَأَخَذَ ذَهَبًا فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي. رواه أصحاب السنن[١١]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێ) پارچەیێ ئاورێشمی بە دەستی ڕاستی هەڵگرت‌و پارچەیێ زێڕیشی بە

---

[٩] بخاري. جهاد: ٢٩٢٠م. ترمذی. لباس: ١٧٢٢.

[١٠] سكت درجته الشارح.

[١١] بسند صحيح (شرحه).

دەستی چەپی هەڵگرتو فەرمووی: ئەم دوو شتە لەسەر نێرینەی گەلی من حەرامن (د/ت/ن-ص).

٢٧٧٣- وَقَالَ: مُعَاوِيَةَ وَحَوْلَهُ نَاسٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ: أَتَعْلَمُونَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ؟ فَقَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ: وَنَهَى عَنْ لُبْسِ الذَّهَبِ إِلاَّ مُقَطَّعًا _أي قطعاً صغيرةً كالسن والأنف)؟ قَالُوا: اللَهُمْ نَعَمْ. رواه النسائي[١٢]:

جارێ موعاوییە دەستەیێ لە کۆچەرانو لە یاریدەدەرانی لە دەور بوو گوتی: ئایا ئاگاتان لێیەتی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لە پۆشینی ئاورێشم گوتیان: خودایە تۆ بە شایەد بە ئاگامان لێیەتی کە ئەمە وایە، گوتی: وە نەهیشی کردووە لە پۆشینی زێڕ مەگەر بۆ پارچە وەکی ددانو لووت گوتیان: خودایە! تۆ بەشایەت بە ئەمە وایە (ن).

٢٧٧٤- عَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ أَسْعَدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُصِيبَ أَنْفِي يَوْمَ الْكُلاَبِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَاتَّخَذْتُ أَنْفًا مِنْ وَرِقٍ فَأَنْتَنَ عَلَيَّ فَأَمَرَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَتَّخِذَ أَنْفًا مِنْ ذَهَبٍ. رواه الترمذي وصاحباه. (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ). نسأل الله التوفيق. آمين[١٣]:

عەرفەجەی کوڕی ئەسعەد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە سەردەمی نەزانی دا لە رۆژی رووداوی ئەل-کولاب دا لووتم پێکرا، جا منیش لووتێکم بۆ خۆم لە زییو دروست کرد، کەچی بۆگەنی کرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردم کە لووتێك بۆ خۆم لە زێڕ دروست بکەم (ت-س/ح-د/ن).

٢٧٧٥- قَالَ: فِي الشَرح: وَقَالَ: الترمذي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) : رُوِىَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّهُمْ شَدُّوا أَسْنَانَهُمْ بِالذَّهَبِ[١٤] :

---

[١٢] جميع ما فى المجتبى للنسائى صحيح عنده على ما جاء فى مقدمة شرحه غاية المأمول على التاج الجامع للرسول (مترجم).

[١٣] بسند حسن (شرحه).

[١٤] أثرٌ صحيح.

لە شەرحەكەدا دانەر – پر گۆڕەكەی لە نوری خودا بێ – دەڵێ: تیرمیذی (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لە چەن كەسێ لە خاوەن عیلمو زانستەكان دەگێڕنەوە كە ددانی خۆیان بە زێڕ قایم دەكردەوە.

### ٣٠) ئاوریشمو زێڕ بۆ مێینە دروستن : (يجوز الحرير والذهب للأناث)

٢٧٧٦– قَالَ: أَنَسُ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) رَأَيْتُ عَلَى أُمِّ كُلْثُومٍ – عَلَيْهَا السَّلاَمُ – بِنْتِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بُرْدَ حَرِيرٍ سِيَرَاءَ. رواه البخاري وابو داود والنسائي[1]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: كوڵەنجەیەكم دی لەبەر ئوممو كولثوومی كچی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئاورێشم، بە هێڵی قەوی قەوی نەخشابوو (ب/د/ن).

٢٧٧٧– عَنْ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُهْدِي لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُلَّةُ سِيَرَاءَ فَلَبِسْتُهَا فَعَرَفْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا إِنَّمَا بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُشَقِّقَهَا خُمُرًا بَيْنَ النِّسَاءِ. رواه الشيخان والنسائي[2]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستێ بەرگی بە دیاریی دا پێم، ئاورێشمی پەتی بوو، منیش لەبەرم كرد، كەچی تەماشام كرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تووڕە بوو، وە فەرمووی: خۆ من بۆ ئەوە بۆتم نەناردووە تا خۆت لەبەری بكەی، بۆیە بۆم ناردیت كە لەتلەتی بكەی بۆ سەرپۆش بۆ ژنەكان (ش/ن).

### ٣١) باسی دووەم: جۆرەكانی كاڵا
### الباب الثاني: في أنواع الملبوس

---

[1] بخاري. لباس: ٥٨٤٠. مسلم. لباس: ٥٣٧٨. أبو داود. لباس: ٤٠٤٣ نسائي. زينة: ٥٣١٣.

[2] بخاري. لباس: ٥٨٤٠. مسلم. لباس: ٥٣٨٧ تقدم تخريجه بمثل الحديث الذى قبله (الحديث ١/ تسلسل/٣٠.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَحكي قول يوسف عليه السلام لإخوته: اذْهَبُواْ بِقَمِيصِي هَـذَا فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ – ٩٣/١٢}.

**خودای گەورە کە قسەکەی یوسف دەگێڕێتەوە کە کردبووی بۆ براکانی (سەلامی خودایان لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم کراسی منە ببەن بۆ خزمەتی باوکم‌و بیهێنن بەسەر روخساریا ئیتر چاوەکانی خۆش دەبنەوەو وەکوو جاری جاران چاوی چاك دەبێتەوە، وە هەموو ژن‌و منداڵ‌و خاوو خێزانتان بار بکەن لە وڵاتی کەنعان‌و بیان هێنن بۆ میصر بۆ لای من.**

٢٧٧٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْقَمِيصُ. رواه أصحاب السنن[1]:

**ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ جل‌و بەرگ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە هەموو شتێ زیاتر حەزی لە کراس بوو (د/ت/ن–س/ح).**

٢٧٧٩- قَالَ: مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لابنِه المَسُور: يَا بُنَيَّ بَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَاءَته أَقْبِيَةٌ فَهُوَ يَقْسِمُهَا، فَاذْهَبْ بِنَا إِلَيْهِ، فَذَهَبْنَا فَوَجَدْنَاهُ فِي مَنْزِلِهِ، فَقَالَ: لِي يَا بُنَيَّ ادْعُه لِي فَأَعْظَمْتُ ذَلِكَ. فَقُلْتُ: أَدْعُو لَكَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا بُنَيَّ إِنَّهُ لَيْسَ بِجَبَّارٍ. فَدَعَوْتُهُ فَخَرَجَ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْ دِيبَاجٍ مُزَرَّرٌ بِالذَّهَبِ، فَقَالَ: يَا مَخْرَمَةُ هَذَا خَبَأْنَاهُ لَكَ. فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ. رواه الخمسة[2]:

**مەخرەمە گوتی بە میسوەری کوڕی: کوڕم! دەڵێن کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەندێ کەوای بۆ هاتووەو خەریکە دابەشیان دەکا با بڕۆین بۆ لای، کە چووین پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەماڵەوە بوو، باوکم گوتی: کوڕم! بچۆرە ژوورەوە بانگی بکە بۆم، منیش شتی وام بەلاوە ستەم بوو، گوتم: پێغەمبەر بانگ بکەم بۆ تۆ! گوتی: کوڕم! خۆ من مەبەستم ئەوە نیە کە**

---

[1] بسند حسن (شرحه).

[2] بخاري. هبة: تجريد/ ٣ ل- ١٩٦ رقم: ١١٠٨ / ٢٥٩٩ ، ٢٦٥٧ ، ٣١٢٧ ، ٥٨٠٠ ، ٥٨٦٢ ، ٦١٣٢. مسلم. زكاة: ٢٤٢٨. أبو داود. لباس: ٤٠٢٨. ترمذي. أدب: ٢٨١٨. نسائي. زينة: ٥٣٣٩.

له قەدری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەم بکەمەوە، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەرەو بێ هەوایە، خۆ زۆر دارو زەبردارنیە تا بە فیزو دەعیەو بە تەوس بێ‌و کەس نەوێرێ بانگی بکا، جا منیش چووم بانگم کردو پێغەمبەر هاتە دەرەوە بۆ لای باوکم، کەوایەکی دێباجی لەبەردابوو، بە دوگمەی زێڕ یەخەکەی داخرابوو، فەرمووی: ئەی مەخرەمە! ئەی مەخرەمە! ئەمەمان بۆ تۆ شاردۆتەوە! ئینجا کەواکەی داپێی. (ش/د/ت/ن).

٢٧٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْحِبَرَةَ. رواه الثلاثة والنسائي[٣]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە گشت جل‌و بەرگێ زیاتر حەزی لە لەبەرکردنی حیبەرە بوو. (ش/ن).

٢٧٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ. رواه الشيخان والنسائي[٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ پەشتەماڵی دەست نەکەوت کە بیگرێتەوە بە بەرکۆشیا بادەرپێ لە پێ بکا، وە کەسێ سۆڵی نەبوو با کاڵە (خوفف) لەپێ بکا (ش/ن).

٢٧٨٢- قَالَ: أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ جَبْذَةً شَدِيدَةً، أَثَّرَتْ فِي صَفْحَةِ عَاتِقِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي عِنْدَكَ.

---

[٣] بخاري. تجريد/ ٥ ل - ١٨٤ - ژ: ١٨٩٢/ ٥٨١٣ ، ٥٨١٢. مسلم. لباس وزينة: ٥٤٠٨. ترمذى. لباس: ١٧٨٢. نسائى. زينة: ٥٣٣٠.

[٤] بخاري. لباس: ٥٨٥٣.

فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ ضَحِكَ ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِالعَطَاءِ. رواه البخاري وأبو اود[٥]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ)، دەڕۆیشتم بەڕێدا، شاڵێکی نەجرانی پەراوێز ئەستووری بەسەرشانەوە بوو، عارەبێکی دەشتەکی پێی گەیشت یەخەی پۆشاکەکەی پێغەمبەری گرت‌و بە توندی وا رایکێشا لاملی حەزرەتی دابڕی! ئینجا پێی گوت: ئەی موحەممەد! لەم ماڵە کە هی خودایەو لەلای تۆیە بەشم بدە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) رووی تێ کردو بەدەمیەوە پێکەنی‌و فەرمانی کرد کە بەشی بدەن! (ب/د).

٢٧٨٣- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ بِبُرْدَةٍ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسَجْتُ هَذِهِ بِيَدِي أَكْسُوكَهَا. فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُحْتَاجًا إِلَيْهَا. فَخَرَجَ إِلَيْنَا وَإِنَّهَا إِزَارُهُ. فَجَسَّهَا رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اكْسُنِيهَا، قَالَ: نَعَمْ. فَجَلَسَ مَا شَاءَ اللهُ فِي الْمَجْلِسِ، ثُمَّ رَجَعَ فَطَوَاهَا، ثُمَّ أَرْسَلَ بِهَا إِلَيْهِ. فَقَالَ: لَهُ الْقَوْمُ مَا أَحْسَنْتَ، سَأَلْتَهَا إِيَّاهُ، وَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّهُ لاَ يَرُدُّ سَائِلاً. فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِتَكُونَ كَفَنِي يَوْمَ أَمُوتُ فَكَانَتْ كَفَنَهُ. رواه البخاري والنسائي[٦]:

سەهلی کوڕی سەعد (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئافرەتێ پارچەیێ شاڵی هێناو گوتی: ئەی رەوانەکراوی یەزدان! بەدڵ‌و بەداو بە دەستی خۆم ئەم پارچە شاڵەم چنیوە بۆ تۆ کە خۆت لەبەری بکەی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاتاجیی بە شاڵەکە هەبوو وەری گرت، رۆژێ ئەو شاڵەی کردبوو بە ئیزارو تەشریفی هات بۆ ناومان، جا پیاوێ لە پیاو گەل دەستی دا لە قوماشەکەی‌و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شاڵەم بدەرێ تا لەبەری بکەم، فەرمووی: باشە جا چەندە حەزی خودای لەسەر بوو ئەوەندە پێغەمبەر

---

[٥] بخاري. لباس: ٥٨٠٩.

[٦] بخاري. لباس: ٥٨٠٩. ٥٨١٠ (رياض/ ٢ ل — ١٣١ ژ: ٤/ ٥٦٤).

(درودی خودای لەسەربێ) لەناو كۆڕەكەدا مایەوە، لە پاشا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەوێ شاڵەكەی پێچایەوەو ناردی بۆی خزمانیش پێیان گوت: جوان نەبوو كە داوای ئەو شاڵەت لێ كرد ئەو خۆی ئاتاجیی پێی هەبوو، ئەوە بوو لەبەری كردبوو تۆ خۆت دەزانیت كە ئەو داواكار نائومێد ناكا كەواتە نە دەبوو داوات بكردبایە ئەویش گوتی: بەخودا بۆ ئەوەم داوا نەكردووە كە لەبەری بكەم وەك ئێوە وا دەزانن، بەڵام بۆ ئەوە داوایم كردووە كە ئەو ڕۆژەی دەمرم ببێ بە كفنم. وە سەهل گوتی: وەبوو بە كفنی‌و ئاواتەكەی هاتەدی، خۆزگەم بەخۆی! (ب/ن).

## ٣٢) لەبەركردنی جل‌و بەرگی خوری‌و موو شتی تریش دروستە: يجوز لبس الصوف والشعر وغيرهما

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِي لِلَّذِينَ آمَنُواْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ – ٣٢/٧}.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا، لە سوورەتی حەوتەمیدا كە سوورەتی ئەعرافە، لە ئایەتی سیی‌و دوودا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! ئەی خۆشەویست! تۆ بفەرموو: كێ حەرامی كردووە لەسەرتان ئەو زینەت‌و جوانی‌و زێبایی بەرگ‌و پۆشاك‌و خواردەمەنی‌و ڕۆژی یە، كە خودا دروستی كردوون لە نەبوون لەبەر خاتری بەندەكانی‌و بۆ ئاسایشی ئەوان؟ تۆ بڵێ: ئەمانە هەموو بۆ ئەوانەن كە لە جیهاندا خاوەنی باوەڕو ئیمانن، وە لە ڕۆژی قیامەتیشا بەتایبەتی هەر بۆ ئەوانە.

٢٧٨٤– عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي سَفَرٍ فَقَالَ: أَمَعَكَ مَاءٌ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ الإِدَاوَةَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ،

فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ: « دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. رواه الثلاثة[1]:

← (ب/١ ز/٢٩ ف/٤ ل/ ).

لە گێڕانەوەی ئێرەدا: بەراء (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: شەوێ لە سەفەرێكا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاوت پێیە؟ گوتم: ئا پێمە، جا لەوڵاخەكە دابەزیو دوور كەوتەوە تا لەبەر تاریكیی شەو لێم وون بوو، لە پاشا كە دەستی بە ئاوگەیاند هاتەوە، منیش لە جەوەندەیێ ئاوم كرد بە دەستیا جا روخسارو هەردوو دەستی خۆی شۆرد، جبەیەكی خوری لەبەردا بوو قۆڵەكانی تەسك بوون ویستی باڵی هەڵماڵێ، بەڵام لەبەر تەسكی قۆڵی جبەكە نەیتوانی باڵی لێوە دەربێنێ، جا لە ژێر جبەكەوە هەردوو قۆڵی خۆی دەرهێناو هەردوو باسكی خۆی شۆرد، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بە سەریدا منیش دانەویمەوە كە كاڵە (خوففە)كانی دابكەنم فەرمووی: لێیان گەڕێ، بە پاكی لەپێم كردوون ئینجا دەستی تەڕی هێنا بە سەریاندا (ش/د).

٢٧٨٥- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ غَدَاةٍ وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ مِنْ شَعَرٍ أَسْوَدَ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[2]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تەشریفی چووە دەرەوە، شاڵینەیەكی پێچابوو بە بەركۆشیەوە بەوێنەی كۆپانی وشتر نەخشابوو، لە مووی رەش دروست كرابوو (م/د/ت).

---

[1] بخاري. صلاة: ٣٦٣ ، ٢٠٦ ، ١٨٢. تجريد/ ات ١٥٨ رقم: ١٨٢/١٣٧ ، ٢٠٣ ، ٢٠٦ ، ٣٨٨ ، ٢٩١٨ ، ٤٤٢١ ، ٥٧٩٨ ، ٥٧٩٩.

[2] مسلم. لباس: ٥٤١٢ ، ٦٢١١. ابو داود. لباس: ٤٠٣٢. ترمذي. أدب: ٢٨١٣.

٢٧٨٦- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ وَكِسَاءً مِنَ الَّتِي يُسَمُّونَهَا الْمُلَبَّدَةَ - قَالَ: - فَأَقْسَمَتْ بِاللَّهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُبِضَ فِي هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ. رواه الاربعة[٣]:

ئەبو بوردە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چووم بۆ دێنیی عائیشە بۆ ماڵەوە، ئیزارێکی ئەستووری دەرهێنا لەو ئیزارانە کە لە یەمەن دروست دەکرێن لەگەڵ جلێکی تری پینەپیناویدا، ئینجا سوێندی خوارد بە خودا: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەکاتی گیان کێشاندا ئەم دوو جلکەی لە بەردا بوو (ش/د/ت).

٢٧٨٧- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ لِي أَبِي: يَا بُنَيَّ لَوْ رَأَيْتَنَا وَنَحْنُ مَعَ نَبِيِّنَا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ أَصَابَتْنَا السَّمَاءُ حَسِبْتَ أَنَّ رِيحَنَا رِيحُ الضَّأْنِ. رواه ابو داود والترمذي[٤]:

دیسان ئەو گوتی: باوکم گوتی پێم: کوڕم! جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) باران تەڕی کردین، ئەگەر دەتبینین لەسەر ئەوحاڵە وات دەزانی کە ئەوە بۆنی جلەخورییەکانی ئێمە نیە، بەڵکوو بۆنی مەڕ خۆیەتی! (د/ت-س/ص).

٢٧٨٨- وَقَالَ: عُتْبَةَ السُّلَمِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): اسْتَكْسَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَسَانِي خَيْشَتَيْنِ فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي وَأَنَا أَكْسَى أَصْحَابِي[٥]:

عوقبەی سولەمی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: داوای پۆشاکم کرد لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دوو پارچە جاوی دا پێم، کە لەبەرم کردن تەماشا دەکەم کە خۆم لە هەموو هاورێکانی ترم پۆشتە ترم! (د-سند صالح).

---

[٣] بخاري، فرض الخمس: ٣١٠٨ ، ٥٨١٨ = تجريد/ ٣ ل — ٣٨٦ رقم: ١٢٦٠.

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] بسند صالح (شرحه).

٢٧٨٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَهْدَى مَلِكُ ذِي يَزَنَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُلَّةً أَخَذَهَا بِثَلَاثَةٍ وَثَلَاثِينَ بَعِيرًا أَوْ ثَلَاثٍ وَثَلَاثِينَ نَاقَةً فَقَبِلَهَا[٦]:

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: شای ذییەزەن دەستێ بەرگی بەدیاریی نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بایی سیی و سێ وشتر بوو، یا بایی سیی و سێ وشترە مێنگە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەری گرت (د- سند صالح).**

٢٧٩٠- وَقَالَ: إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُ): اشْتَرَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُلَّةً بِبِضْعَةٍ وَعِشْرِينَ قَلُوصًا فَأَهْدَاهَا إِلَى ذِي يَزَنَ. روى الثلاثة أبو داود[٧]:

**ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قاتێکی کڕی بە بیست‌و ئەوەندە نۆبەنە وشتر، وە بە دیاری ناردی بۆ شای ذی یەزەن (د- سند صالح).**

٢٧٩١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُّنْيَا أَلْبَسَهُ اللَّهُ ثَوْبًا مِثْلَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تَلْتَهِبَ فِيهِ النَّارُ. رواه أبو داود والنسائي[٨]:

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ جل‌و بەرگی کەشخە بۆ ناوو شۆرەت لەبەر بکا لە رۆژی قیامەتا خودا هەمان جلی لەبەردەکاتەوەو ئینجا لە بەریا ئاگری تێ بەردەدا (د/ن).**

---

[٦] بسند صالح (شرحه).

[٧] بسند صالح (شرحه).

[٨] سكت عن درجته الشارح.

## ٣٣) ڕەنگی جلو بەرگ: (ألوان الثیاب)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: يَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا – ٣١/١٨}.

یەزدانی مەزن دەفەرمویٚ: خاوەن باوەڕەکان لە بەهەشتا چەند بەرگو پۆشاکیٚکی سەوزی جوان دەپۆشن کە لە ئاوریٚشمی ورشەدار دروست کراون، هەیانە تەنکەو بەریٚسمانی باریك تەنراوەو هەیانە ئەستوورەو بەریٚسی زبر چنراوە، وە بە ئاسوودەیی و بەبیٚوەیی پاڵ دەدەنەوە لەسەر قەنەفەو کورسی بەرزو بەریٚن، وە لەناو خۆیانا رائەبویٚرنو بە گوفتوگۆی شیرینو وتاری ناسكو نازدار کات دەبەنە سەر، بە راستی پاداشی باش هەر وادەبیٚو تەختو قەنەفەیش بۆ حەاونەوەو پاڵو پشتکردن لەوە جوانتر نابیٚ.

٢٧٩٢- عَنْ أَبِي رِمْثَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَأَيْتُ عَلَيْهِ بُرْدَيْنِ أَخْضَرَيْنِ. رواه اصحاب السنن[1]:

ئەبو ریمثە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: لە خزمەتی باوکمدا چووم بۆ خزمەتی پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) تەماشام کرد حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) دوو پارچە شاڵی سەوزی لەبەردا بوو (د/ت/ن-س/ح).

٢٧٩٣- عَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ بِشِمَالِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ يَوْمَ أُحُدٍ مَا رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. رواه البخاري ومسلم في الفضائل. وزاد: يَعْنِي جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ[2]:

سەعد (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: رۆژی غەزای ئوحود لەکاتی جەنگەی جەنگا لەلای چەپی پیٚغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربیٚ) دوو پیاوی جل سپیم دی لە دەوری حەزرەت شەڕیان دەکردو باسی حەزرەتیان دەکرد نە لەوە بەر ئەوپیاوانەم دەیبوو، وە نە لەوەپاشیش دیمنەوە! (ب/م) موسلیم (خودای گەورەی

---

[1] بسند حسن (شرحه).

[2] بخاري. مغازی. تجرید/ ٤ ل ٢٨١- رقم: ١٥٤٣ / ٤٠٤٥ ، ٥٧٢٦. مسلم. فضائل: ٥٩٦٠.

لێ خۆش نوود بێ) ئەمەشی پترە: واتە: جوبرائیل‌و میکائیل بوون، (دروودو سڵاوی خودایان لێ بێ).

٢٧٩٤- عَنْ أَبِي ذَرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ نَائِمٌ عَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ. رواه البخاري[٣]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خەوتبوو، جلی سپی لەبەردا بوو، لە پاشا کە چوومەوە بۆ خزمەتی لەخەو هەڵسابوو، فەرمووی: هەر بەندەیێ بڵێ: لا اله الا الله: هیچ خودایێ تر نیە مەگەر یەزدانی پاك هەربەندەیێ ئەم وشە پیرۆزەیە بڵێ‌و لە ئەنجاما لە سەرئیمان‌و باوەڕ بە خودا بمرێ مسۆگەر دەچێتە بەهەشت (ب).

٢٧٩٥- وَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ وَإِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الإِثْمِدُ يَجْلُو الْبَصَرَ وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ. رواه أصحاب السنن[٤]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جلك‌و بەرگی سپیش لەبەر بکەن، جلی سپی گەلێ جلێکی چاك‌و باشە بۆ ئێوە وە مردووشتانی تیا کفن بکەن، باشترین کلیش بۆ چاوی ئێوە سورمەیە: چاو رۆشن دەکاتەوە، برژانگیش دەڕوێنێ (د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ - س/ص).

٢٧٩٦- وَمَرَّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَحْمَرَانِ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَم يُرد عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه ابو داود والترمذي (رَضِيَ أللهُ تَعَالَى عَنهُمَا)[٥] :

---

[٣] بخاري. لباس: ٥٨٢٧.

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] بسند حسن (شرحه).

جارێ پیاوێ قاتێكی سووری لەبەردابوو، لەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) تی پەڕیو سڵاوی لێ كرد، كەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامەكەی نەسەندەوە لەبەر ئەوە كە حەزی لە جلی سوور نەبوو، یا لەبەر ئەوە كە كابرا فیزی پێوە دەكرد (د/ت–س/ح).

٢٧٩٧– عَنْ الْبَرَاءَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرْبُوعًا، وَقَدْ رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَحْسَنَ مِنْهُ. رواه البخاري وابو داود والترمذي[٦]:

بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێكی دەستە بوو نەقووچێكی ناقۆڵاو نە كورتەبنەیەكی بێ تام بوو جارێ دیم هستێ جلی سووری لەبەر دابوو، كەسم نەدیوە ئاوا جوان (ب/د/ت).

٢٨٩٨– وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) صُنِعَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بُرْدَةً سَوْدَاءَ فَلَبِسَهَا فَلَمَّا عَرَقَ فِيهَا وَجَدَ رِيحَ الصُّوفِ فَقَذَفَهَا. وَكَانَ تُعْجِبُهُ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ. رواه أبو داود والنسائي[٧]:

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: باڵا پۆشێكیان لە شاڵی رەش دروست كرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەری كرد، كە ئارەقی پێوەكرد بۆنی خورییەكەی چوو بە سەریا، ئیتر تووڕی دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خاوەنی هەستێكی ناسك بوو هەمیشە حەزی لە بۆنی خۆش بوو! (د/ن–س/ح).

٢٨٩٩– عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ. رواه الخمسة[٨]:

---

[٦] بخاري. لباس: ٥٨٤٨.

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٨] بخاري. لباس، تجريد/ ٥ ل- ١٩٠ رقم: ١٨٩٨/ ٥٨٤٦. مسلم. لباس: ٥٤٧٤. أبو داود. ترجل: ٤١٧٩. ترمذي. مناسك الحج: ٢٧٠٥ ، ٢٧٠٦ ، ٥٢٧١.

**ئەنـەس** (خـودای لێ ڕازی بێ) **گـوتی: پێغەمبـەری خـودا** (دروودی خـودای گـەورەی لەسەربێ) **نەهی دەكا لەوە كە پیاو نەك ئافەرت زەعفەران بدا لە خۆی یا بیدا لە جل‌و بەرگی خۆی بەڵام بۆ ژن هەردووڵا دروستە (ش/د/ت/ن).**

**٢٨٠٠- عَنْ عَلِيٍّ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) **عَـنِ التَّخَـتُّمِ بِالذَّهَبِ وَعَنْ لِبَاسِ الْقَسِّيِّ وَعَنِ الْقِرَاءَةِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَعَـنْ لِبَـاسِ الْمُعَـصْفَرِ. رواه الخمسة الا البخاري**[9]**:**

**عەلی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نـەهی لێ كـردم لەم شتانە: لە ئەنگوستیلەی زێڕ لە دەست كردن‌و، لە پۆشینی جل‌و بەرگی ئاورێشم‌و، لە خوێندنی قورئان لەناو ڕوكوع‌و سوجود چەمینەوەو كوڕنووش داو، لە جل‌و بەرگی عەصفەراناوی (م/د/ت/ن).**

**٢٨٠١- وَقَالَ: عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا): رَأَى عَلَيّ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ مِنْ ثِيَـابِ الْكُفَّـارِ. وَفِي رِوَايَـةٍ: فَقَـالَ: أُمُّـكَ أَمَرَتْكَ بِهَذَا؟ قُلْتُ: أَغْسِلُهُمَا. قَالَ: بَلْ أَحْرِقْهُمَا. رواه مسلم وانسائي: والله أعلم**[10]**:**

**عەبدوڵڵای كوڕی عـەمر** (خودایـان لێ ڕازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دوو جلكی عەصفەراناوی لەبەرما دی،، فـەرمووی: ئەمـە جل‌و بـەرگی كافرانە لە گێڕانەوەیەكا فەرمووی: دایكت پێی گوتویت كە ئەمـە لـە بەربكـەی چونكە ئەمە جلی ژنانـە؟ عـەرزیم كـرد: كەواتـە دەیـان شۆرم، فـەرمووی: نـەء بیانسووتێنە (م/ن).**

---

[9] مسلم. لباس: ٥٤٠٤ ، ١٠٧٦ ، ٥٤٠٥ ، ٥٤٠٦ ، أبـو داود. لبـاس: ٤٠٤٤ – ٤٠٤٦. ترمـذي. صلاة: ٢٦٤ ، ١٧٣٧. نسائی. تطبیق: ١٠٤٣ ، ١١١٨ ، ٥١٨٩ ، ٥١٩٠ ، ٥١٩٣ ، ٥١٩٤ ، ٥١٩٥ ، ٥١٩٦ ، ٥١٩٧ ، ٥٢٨٣ ، ٥٢٨٤ ، ٥٢٨٥ ، ٥٢٨٦.

[10] مسلم. لباس: ٥٤٠٣. نسائی. زینة: ٥٣٣٢.

## ٣٤) مێزەر و لفكەی مێزەر: (العمامة والعذبة)

٢٨٠٢- وَفِي هَذِهِ الرِّوَايَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ. رواه الخمسة الا البخاري[1]:

لەم گێڕانەوەدا: دەڵێ: ساڵی گرتن (فەتح: كردنەوە)ی مەككە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كە ڕۆیشتە ناو شاری مەككە مێزەرێكی ڕەشی بە سەرەوە بوو (م/د/ت/ن).

٢٨٠٣- ← (ب/١ ز/٦٦ ل/ ف/١)[2].

٢٨٠٤- وَعَنْهُ (أي عن عمرو بن حُريثٍ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ حَرْقَانِيَّةٌ. (أي لونُها كلون ما اخرقته النَّار). رواه النسائي[3]:

دیسان عەمری كوڕی حورەیث (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەرم دی (درودی خودای لەسەربێ) مێزەرێكی ڕەشباوی ڕەنگ سووتە مەرۆیی بەسەرەوە بوو (ن).

٢٨٠٥- وَقَالَ: رُكَانَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): صَارَعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَرَعَنِي وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: فَرْقُ مَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْمُشْرِكِينَ الْعَمَائِمُ عَلَى الْقَلاَنِسِ. رواه أبو داود والترمذي[4]:

روكانە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ زۆرانم گرت لەگەڵ حەزرەتدا (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ) ئەو منی دا بەزەویدا، وە لە دەمی خۆیشم ژنەوت دەیفەرموو: جیاوازیی نێوانی ئێمەو نێوانی بتپەرستەكان بەوەیە كە ئێمە لەسەر كڵاوەوە مێزەر دەبەستین! (د/ت-سند صالح).

---

[1] تقدم برقم: ٤٤٣/١ مجلد أول. تسلسل/٦٦.

[2] تقدم برقم: ١٧٠٨/٢ مجلد/ ٢ تسلسل/ ١٣١.

[3] تقدم تخريجه في رقم: ٤٤٣/١ في مجلد/١ تسلسل/٦٦.

[4] رواه أبو داود بسند صالح والترمذي بسند غريب (شرحه).

٢٨٠٦- وَقَالَ: عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ): عَمَّمَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَدَلَهَا بَيْنَ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي. رواه أبو داود[٥]:

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەدەستی خۆی مێزەری بەستەوە بۆم، چمکێکی لە پێشمەوەو ئەو چمکەکەی تری لە پشتمەوە شۆڕ کردەوە (د-سند صالح).

٢٨٠٧- ← (ب/١ ز/٦٦ ل/٢٣٦ ف/٢)[٦].

٢٨٠٨- ← (ب/١ ز/٦٦ ل/٢٣٦ ف/٣)[٧].

## لا باسێ: باسی ئەنگوستیلە، لە زێڕ دروست نیە، بەڵام لە زیو سوننەتە: (فصل في الخاتم: يحرم من الذهب، ويستحب من الفضة)

٢٨٠٩- عَنْ ابْنِ عَمَرَ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، جَعَلَ فَصَّهُ فِي بَطْنِ كَفِّهِ إِذَا لَبِسَهُ، فَاصْطَنَعَ النَّاسُ الخَوَاتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ، فَرَقِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمِنْبَرَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ اصْطَنَعْتُهُ، وَإِنِّي لاَ أَلْبَسُهُ. فَنَبَذَهُ فَنَبَذَ النَّاسُ. رواه الخمسة[١]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەنگوستیلەیەکی زێڕی بۆ خۆی دروست کرد، کە لە پەنجەی دەکرد نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی، ئیتر خەڵکیش چاویان لەو کردو گەلێ کەسی تریش ئەنگوستیلەی زێڕیان دا بە دروستکردن! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەرکەوتەسەر دوانگەو لە پاش سوپاس‌و ستایشکردنی خودای گەورە فەرمووی: هەرچەندە من خۆم ئەنگوستیلەیەکی زێڕم دروست کردبوو،

---

[٥] بسند صالح (شرحه).

[٦] تقدم برقم: ٤٤٣/٢ مجلد/١ تسلسل/٦٦.

[٧] تقدم برقم: ٤٤٤/٢ مجلد/١ تسلسل/٦٦.

[١] بخاري. إيمان ونذور: ٦٦٥١. مسلم. لباس: ٥٤٤٠. نسائي. زينة: ٥٣٠٥.

**بەڵام ئیتر لە دەستی ناکەم ئیتر پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئەنگوستیلەکەی خۆی فڕێ دا، ئینجا خەڵکەکەیش هەرکەسە ئەنگوستیلەکەی خۆی توڕدا (ش/د/ت/ن).**

٢٨١٠- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ وَقَالَ: « يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ ». فَقِيلَ لِلرَّجُلِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُذْ خَاتَمَكَ انْتَفِعْ بِهِ. قَالَ: لاَ وَاللَّهِ لاَ آخُذُهُ أَبَدًا وَقَدْ طَرَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رواه مسلم[٢]:

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە دەستی پیاوێکا ئەنگوستیلەیەکی زێڕی دی، ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی داکەندو تووڕی داو فەرمووی: ئەوە بۆ هەندێ کەس لە ئێوە دەچێ پەلاماری سکڵێ ئاگرێ سووردەداو خودسەر دەیکاتە دەستی! لە پاشا کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **تەشریفی برد خەڵکەکە بە پیاوەکەیان گوت: ئەنگوستیلەکەت هەڵبگرەوە، بە کەڵکی شتێکت دێ، گوتی: نا، بەخودا بڕای بڕای شتی واناکەم، شتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **تووڕی بداو من بچم هەڵی بگرمەوە شتی وا نەبووەو نە دەبێ** (م- رەزای خودای گەورەی لەسەربێ).

٢٨١١- وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ شَبَهٍ فَقَالَ: لَهُ: مَا لِي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ الأَصْنَامِ؟ فَطَرَحَهُ ثُمَّ جَاءَ وَعَلَيْهِ خَاتَمٌ مِنْ حَدِيدٍ فَقَالَ: مَا لِي أَرَى عَلَيْكَ حِلْيَةَ أَهْلِ النَّارِ؟ فَطَرَحَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ أَتَّخِذُهُ؟ قَالَ: اتَّخِذْهُ مِنْ وَرِقٍ وَلاَ تُتِمَّهُ مِثْقَالاً. رواه أصحاب السنن[٣]:

**زەلامێ ئەنگوستیلەیەکی مسی لە پەنجەدا بوو هات بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێی فەرمووی: ئەوە دەتبینم بۆنی بتت لێ دێ؟ زەلامەکەیش ئەو ئەنگوستیلەیەی فڕی داو جارێکی تر کەهاتەوە**

---

[٢] مسلم. لباس زينة: ٥٤٣٩.

[٣] بسند صالح (شرحه).

ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی لە دەستا بوو، فەرمووی: ئەوە دەبینم خشڵی دۆزەخییەکانت لە خۆت داوە!؟ ئەویش ئەویشی تووڕداو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی لە چی دروستی بکەم فەرمووی: لە زیو دروستی بکەو نەگاتە میسقاڵێکی تەواویش (د/ت/ن-سند صالح).

٢٨١٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى كِسْرَى وَقَيْصَرَ وَالنَّجَاشِيِّ. فَقِيلَ إِنَّهُمْ لاَ يَقْبَلُونَ كِتَابًا إِلاَّ بِخَاتِمٍ. فَصَاغَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَاتَمًا حَلَقَتُهُ فِضَّةٌ وَنَقَشَ فِيهِ: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ [٤]):

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ویستی کە نامە بنێرێ بۆ کیسراو بۆ قەیسەرو بۆ نەجاشی، کە ئیسلا ببن، عەرزیان کرد: هەر نامەیێ مۆر نەکرابێ ئەمانە وەری ناگرن، جا پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) ئەنگوستیلەیەکی داڕشت، ئەڵقەکەی زیوبوو، وە مۆری (محمد رسول الله)ی لێ هەڵکەند (ش/د/ت/ن).

٢٨١٣- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. وَقَالَ: لِلنَّاسِ. إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ وَنَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. فَلاَ يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ. رواهما الخمسة[٥]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوینی دروست کردو وشەی (محمد رسول الله)ی لێ نەخشاندو بە مەردومەکەی فەرموو: من ئەموستیلەیەکی زیوم دروست کرووە بۆ خۆم‌و ئەو مۆرەم لێ هەڵکەندووە: (محمد رسول الله: موحەمەد پێغەمبەری خودایە) ئیتر کەسی تر چاو لەمن نەکاو لەسەر ئەم مۆرە دروست نەکا (ش/د/ت/ن).

---

[٤] مسلم. لباس: ٥٤٤٩.

[٥] مسلم. لباس: ٥٤٤٥. بخاري. لباس: ٥٨٧٧ = تجرید/ ٥ ل- ١٩٣ رقم: ١٩٠٢/ ٥٨٧٧ سبق طرفه في رقم: ٥٨ — ٦٥ فتح = بەرگی/ ل- ٣٨ — تجريد بخاري.

٢٨١٤- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ نَقْشُ خَاتَمِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولُ سَطْرٌ، وَاللَّهِ سَطْرٌ. رواه الترمذي والبخاري[٦]:

هەر ئەو گوتی: نەخش (مۆر)ی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سێ دێربوو: (محمد) دێڕێك بوو لە خوارەوە بوو(رسول) دێڕێك بوو دێڕی ناوەڕاست بوو، (الله) دێڕێك بوو لە سەرەوە بوو. (ت/ب).

٢٨١٥- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ فِضَّةٍ وَكَانَ فَصُّهُ مِنْهُ. رواه الخمسة إلا مسلما[٧]:

دیسان گوتی: ئەموستیلەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەزیو بوو، وە نقێمەکەیشی لەخۆی بوو (ب/د/ت/ن).

٢٨١٦- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ. رواه الخمسة إلا البخاري[٨]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەنگوستیلەیەکی زیوی دەکردە دەستی راستی، نقێمەکەی لە بەردی حەبەشە بوو، نقێمەکەی دەکردە بەری لەپی (م/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٢٨١٧- وَعَنْهُ كَانَ خَاتِمُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي هَذِهِ. وَأَشَارَ إِلَى الْخِنْصَرِ مِنْ الْيُسْرَى. رواه مسلم والنسائي[٩]:

هەر ئەو گوتی: ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەم ئەنگوستەدابوو، واتە: لە پەنجە تووتەی دەستی چەپی دا بوو (م/ن).

٢٨١٨- وَكَانَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) يَتَخَتَّمَانِ فِي يَسَارِهِمَا. رواه الترمذي وصححه[١٠]:

---

[٦] بخاري. لباس: ٥٨٧٨.

[٧] بخاري. لباس: ٥٨٧٠.

[٨] مسلم. لباس: ٥٤٤٤. أبو داود. خاتم: ٤٢١٩. نسائي. زينة: ٥٢٣١ ، ٥٣٠٣.

[٩] مسام. مساجد: ١٤٤٦ ، ٥٤٥٦.

حەسەنو حوسەین (رەزای خودای گەورەیان لێ بێ). ئەموستیلەیان دەکردە دەستی چەپیان (ت:ص).

٢٨١٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: نَهَانِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي إِصْبَعِي هَذِهِ أَوْ هَذِهِ. وَأَوْمَأَ إِلَى الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِيهَا. رواه مسلم والترمذي والنسائي[١١]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەداوم کە ئەموستیلە بکەمە ئەم دوو، پەنجەیەم: ئەمەو ئەمە، واتە: قامکی ناوەڕاستو پەنجەی دۆشاو مژە (م/ت/ن).

٢٨٢٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ نَزَعَ خَاتَمَهُ. رواه الترمذي والنسائي[١٢]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە دەچوو بۆ ئاو دەست ئەموستیلەکەی دادەکەند لەبەر ئەوە کە ناوی خوداو پێغەمبەری لێ نووسرابوو (ت/ن-س/ح).

٢٨٢١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: اتَّخَذَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ فَكَانَ فِي يَدِهِ ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُمَرَ ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُثْمَانَ حَتَّى وَقَعَ مِنْهُ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ. رواه الثلاثة والنسائي[١٣]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەموستیلەیەکی زیوی دروستکرد، هەتا خۆی مابوو لە دەستی خۆیدا بوو، لە پاشا هەتا ئەبو بەکر مابوو لە دەستی ئەو دابوو لە پاشا هەتا عومەر مابوو

---

[١٠] صحيح عند الترمذي.

[١١] مسلم. لباس: ٥٤٥٩. بخاري. لباس: ٥٨٣٨. أبو داود. خاتم: ٤٢٢٥. ترمذي. لباس: ١٧٨٦. نسائي. زينة: ٥٣٩١ ، ٥٢٢٦ ، ٥٢٢٧ ، ٥٣٠١ ، ٥٣٠٢.

[١٢] بسند حسن (شرحه).

[١٣] بخاري. لباس: ٥٨٧٣. مسلم. لباس: ٥٤٤٣.

لە دەستی ئەویشدا بوو، لە پاشا لە دەستی عوسماندابوو، تا لە دەستی عوسماندا كەوتە ناو بیری ئەریسەوە (ت/د/ن).

## ٣٦) پێڵاو: (النعل)

٢٨٢٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا فِي غَزَاةٍ فَسَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اسْتَكْثِرُوا مِنَ النِّعَالِ فَإِنَّ الرَّجُلَ لاَ يَزَالُ رَاكِبًا مَا انْتَعَلَ. رواه مسلم وأبو داود[1]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە غەزایەكا بووین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێڵاو زۆركەن، چونكە پیاو ئەگەر پێڵاوی لەپێ دابێ بەسوارە حلێبە! (م/د-خودایان لێ رازی بێ).

٢٨٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ وَلْيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا. رواه الأربعة. وَفِي رِوَايَةٍ : إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَمْشِ فِي الأُخْرَى حَتَّى يُصْلِحَهَا[2]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ كە پێڵاو لەپێ دەكەن لە پێشا بیكەنە پێی راستتان، لەكاتی داكەندنیشدا لە پێشدا پێی چەپ داكەنن، بە شێوەیەكی گشتیش یا هەردوو تاكی پێڵاو لەپێكەن یا هەردوو تاكەكەی داكەنن (ش/د/ت) لە گێڕانەوەیەكدا: ئەگەر سەربەن واتە: چەرمی سەر پەنجەی تاكێ لە پێڵاوتان پچڕا بە تاكەكەی تریانەوە مەڕۆن هەتا پچڕاوەكە چاك دەكەنەوە.

---

[1] مسلم. لباس: ٥٤٦١.

[2] بخاري. لباس: ٥٨٥٦ ، ٥٨٥٥. مسلم. لباس: ٥٤٦٢. أبو داود. لباس: ٤١٣٦. ترمذي. لباس: ١٧٧٤.

٢٨٢٤- قَالَ: ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) رَأَيْت النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَلْبَسُ النِّعَالَ السبتِيَّةَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا. رواه الخمسة إلا الترمذي[٣]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دەدی (دروودی خودای لەسەربێ) سۆڵی چەرمی خۆشەكراوی بێ كوڵكو مووی لەپێ دەكرد، وە دەسنوێژی پێوە دەگرت، بۆیە منیش حەز دەكەم كە سۆڵی وا لەپێ بكەم چونكە بتپەرستەكان زۆرتر سۆڵی چەرمی خاویان لەپێ دەكرد (ش/د/ن).

٢٨٢٥- وَقَالَ: أَنَسٌ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) إِنَّ نَعْلَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ لَهَا قِبَالاَنِ. رواه الخمسة إلا مسلماً[٤]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سۆڵەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) لە پێشەوە دوو زوێڵ قایشیان پێوە بوو، پارچەیەكیان سەرێكی بەند كرابوو بە سەربەنی سۆڵەكەوەو ئەو سەرەكەی تری بەلووتی سۆڵەكەوەو دەكەوتە نێوانی پەنجەكەڵەو پەنجەكەی تەنیشتیەوە، وە پارچەكەی تریشیان هەروەها بوو، بەڵام ئەمیان دەكەوتە بەینی پەنجەی ناوەڕاسو پەنجەی براتووتەوە (ب/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٢٨٢٦- قَالَ: ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ أَللهُ عَنْهُمَا): مِنَ السُّنَّةِ إِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ أَنْ يَخْلَعَ نَعْلَيْهِ فَيَضَعَهُمَا بِجَنْبِهِ. رواه أبو داود[٥]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: وا سووننەتە پیاو كە دانیشت پێڵاوەكانی داكەنێو لە تەنیشتەوە دایان بنێ (د-سند صالح).

٢٨٢٧- عَنْ الْمُغِيرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَهْدَى دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُفَّيْنِ فَلَبِسَهُمَا. النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٦]:

---

[٣] بخاري. لباس: ٥٨٥١.

[٤] بخاري. لباس: ٥٨٥٧.

[٥] بسند صالح (شرحه).

**موغیرە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: دەحیەی کەلبی جووتێ کاڵە (خوفف)ی بە دیاریی هێنا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەپێی کردن (ت:ح).**

٢٨٢٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ عَلَى مُوسَى يَوْمَ كَلَّمَهُ رَبُّهُ كِسَاءُ صُوفٍ وَجُبَّةُ صُوفٍ وَكُمَّةُ صُوفٍ وَسَرَاوِيلُ صُوفٍ وَكَانَتْ نَعْلاَهُ مِنْ جِلْدِ حِمَارٍ مَيِّتٍ. رواهما الترمذي[٧]:

**عەبدوڵڵا لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەو رۆژە کە مووسا گوفتوگۆی کرد لەگەڵ خودادا سەردەرییەکی خوری‌و کڵاوێکی خوری‌و جبەیەکی خوری‌و شەرواڵێکی خوریی لەبەردابوو، وە جووتە سۆلەکەیشی لەچەرمی کەری تۆپیو بوو (ت:غریب).**

### ٣٧) پاکی‌و خاوێنی زۆر پەسەندن: (تستحب النظافة)

٢٨٢٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَأَى رَجُلاً شَعِثًا قَدْ تَفَرَّقَ شَعْرُهُ فَقَالَ: أَمَا كَانَ يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ. وَرَأَى رَجُلاً آخَرَ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ وَسِخَةٌ فَقَالَ: أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَا يَغْسِلُ بِهِ ثَوْبَهُ [١]:

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **هات بۆ لامان کابرایەکی قژگڤی سەر ئاڵۆسکاوی دی، قژەکەی فش‌و گیف بوو بۆوە فەرمووی: ئەدیی گوایە ئەم زەلامە شتێکی وای نیە کە قژی خۆیی پێ رێك بخات! کابرایەکی تریشی دی جلێکی چڵکنی لەبەردا بوو فەرمووی: ئەدیی گوایە ئەم کابرایە شتێکی وای نیە کە ئەم جلانەی پێ بشۆردایە (د-س/صالح-ن).**

---

[٦] حديث حسن (شرحه).

[٧] حديث غريب (شرحه).

[١] بسند صالح (شرحه).

٢٨٣٠- وَقَالَ: أَبُو الأَحْوَصِ (رَضيَ أَللهُ عَنْهُ): أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ثَوْبٍ دُون فَقَالَ: أَلَكَ مَالٌ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: مِنْ أَيِّ الْمَالِ؟ قُلْتُ: قَدْ أَتَانِيَ اللَّهُ مِنَ الإِبِلِ وَالْغَنَمِ وَالْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ. قَالَ: فَإِذَا أَتَاكَ اللَّهُ مَالاً فَلْيُرَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكَ وَكَرَامَتِهِ. رواهما أبو داود والنسائي[٢]:

ئەبولئەحوەص (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جلێكی خراپم لەبەردا بوو، چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ماڵو دارایيت هەيە؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: لەچی جۆرێكت هەيە؟ گوتم: لە وشترو لە رانو لە رەوگو لە بەندەم هەيە. فەرمووی: كە خودا ماڵو دارايی داوە پێت دەبا تۆيش نيشانەی ئەو نازو نيعمەتو قەدر گرتنەی خودات پێوە دياربێ! (د-سند صالح-ن).

٢٨٣١- وَقَالَ: رَسُول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ يُحِبُّ الطَّيِّبَ نَظِيفٌ يُحِبُّ النَّظَافَةَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ جَوَادٌ يُحِبُّ الْجُودَ فَنَظِّفُوا أَفْنِيَتَكُمْ وَلاَ تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ. رواه الترمذي بسندٍ حسنٍ. نسأل الله أن يطهرنا ظاهراً وباطناً[٣]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا بۆ خۆی پاكو بێگەردەو پاكیو بێگەردی خۆش دەوێ، خاوێنەو خاوێنی خۆش دەوێ، بەخشندەيەو بەخشندەيی خۆش دەوێ، سەخييەو سەخاوەتی خۆش دەوێ جا حەوشەو دەرماڵتان پاكو خاوێن رابگرنو چاو لە جوولەكە مەكەن (ت-س/ح).

## ٣٨) باسی سێيەم: دەستووری جلو بەرگ

## الباب الثالث: في آداب اللباس

٢٨٣٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ إِزَارِي

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] حسن عند الترمذي.

يَسْتَرْخِي، إِلاَّ أَنْ أَتَعَاهَدَ ذَلِكَ مِنْهُ. فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَسْتَ مِمَّنْ يَصْنَعُهُ خُيَلاَءَ. رواه الخمسة[1]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بۆ فیزو دەعیە جلی خۆی بەکێش بکاو لە زەوی بخشێنێ لە رۆژی قیامەتا خودا بە چاوی مەرحەمەت‌و میهرەبانی تەماشای ناکاورووی نازی ناداتێ ئەبو بەرکیش (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەر ی خودا! خۆ من لایەکی بەرکۆش (ازار)ە کەم شل دەبێ‌و شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر هەموو کاتێ ئاگام لێی بێ. فەرمووی: تۆ لەو کاسانە نیت کە شتی وا دەکەن بۆ فیزو دەعیە (ش/د/ت/ن).

٢٨٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي قَدْ أَعْجَبَتْهُ جُمَّتُهُ وَبُرْدَاهُ إِذْ خُسِفَ بِهِ الأَرْضُ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الأَرْضِ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ. رواه الشيخان[2]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ کابرایێ دەنازێ بە کاکۆڵ‌و جلەکانیەوەو فیزی پێوە دەکردن، لەپڕ لەو کاتەدا رۆچوو بە ناخی زەویدا، ئیتر هەتا رۆژی قیامەت هەڵ دەستێ ئەو کابرایە هەر قوڵتەقوڵت دادەچێ بە ناخی زەویداو هەر ناگاتە بنی تا تۆزێ ستاربگرێ (ش).

٢٨٣٤- وَعَنْهُ أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً يَجُرُّ إِزَارَهُ فَجَعَلَ يَضْرِبُ الأَرْضَ بِرِجْلِهِ وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْبَحْرَيْنِ وَهُوَ يَقُولُ جَاءَ الأَمِيرُ جَاءَ الأَمِيرُ. قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اللّٰهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا. رواه مسلم[3]:

---

[1] بخاري. لباس: ٥٧٨٤. مسلم. لباس: ٥٤٢٦ — ٥٤٢٨.

[2] بخاري. لباس: ٥٧٨٩. مسلم. لباس: ٥٤٣٣ — ٥٤٣٦.

[3] مسلم. لباس: ٥٤٣٠.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمانداری بەحرەین بوو، کابرایەکی دی جلەکەی خۆی بەکێش دەکردو قاچی دەکوتا بەزەویداو دەیگوت: فەرماندار هات فەرماندار هات! جا ئەبو هورەیرە کە ئەمەی دی گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بۆ فیزو دەعیەو رۆح زلی جلی خۆی بەکێش بکاو بیخشێنێ لە زەوی خودا بە چاوی میهرەبانی تەماشای ناکا! (م).

٢٨٣٥- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمَنَّانُ الَّذِى لاَ يُعْطِى شَيْئًا إِلاَّ مَنَّةً وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْفَاجِرِ وَالْمُسْبِلُ إِزَارَهُ. رواه الخمسة إلا البخاري[٤]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە رۆژی قیامەتدا ئەم سێ دەستەیە خودا قسەیان لەگەڵدا ناکا: منەتکەرێ کە هەرچی چاکەیێ دەکا دەیداتەوە بە چاودا، وە کەسێ شتومەکی فرۆتەنی بە سوێندی درۆ ساخ دەکاتەوە، وە کەسێ بۆ فیزو دەعیە داوێنێ جلی خۆی دەخشێنێ لە رێگەو بان (م/د/ت/ن).

٢٨٣٦- وَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كُلُوا وَاشْرَبُوا وَالْبَسُوا.وَتَصَدَّقُوا فِي غَيْرِ إِسْرَافٍ وَلاَ مَخِيلَةٍ [٥]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بخۆن و بخۆنەوەو جلو بەرگ بپۆشن و ماڵ ببەخشنەوەو خێرو خێرات بکەن، بەڵام لە هەموو ئەم حاڵانەدا بەبێ دەستبڵاویی و لە خۆبایی بوون! (ب).

٢٨٣٧- وَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): كُلْ مَا شِئْتَ وَالْبَسْ مَا شِئْتَ، مَا أَخْطَأَتْكَ اثْنَتَانِ سَرَفٌ أَوْ مَخِيلَةٌ. رواهما البخاري. رضوان الله تعالى عليه[٦]:

---

[٤] مسلم. إيمان: ٢٩٥. بخاري. مساقاة: ٢٢٤٠ ، ٧٠٠٨.

[٥] بخاري. لباس: تعليق ذكره في مستهل كتاب اللباس، قبل الرقم: ٥٧٨٣.

[٦] تعليق ذكره البخاري في مُستهَلِ كتاب اللباس قبل الرقم: ٥٧٨٣.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت لەچییە بیخۆ، وە حەزت لە چییە لەبەری بكە، بەڵام بە مەرجێ حەڵاڵ بێ‌و لەم دووشتە دوور بیت: لە دەستبڵاویی‌و لە فیزو دەعیە (ب– خ= بوخاری –** ڕەزای خودای گەورەی لەسەربێ).

**٢٨٣٨– عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: الإِسْبَالُ فِي الإِزَارِ وَالْقَمِيصِ وَالْعِمَامَةِ مَنْ جَرَّ مِنْهَا شَيْئًا خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه أبو داود والنسائي**[٧]:

**ئیبنـو عومـەر** (خودایـان لێ ڕازی بـێ) **لـە پێغەمبـەرەوە** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **دەفـەرموێ: شـۆڕكردنەوەی نادروسـت تـەنیا بـۆ بـەركۆش (ئیـزار)و كـراس‌و مێزەرەو بەس، جا هەر كەسێ بۆ فیزو دەعیە یەكێ لەم شتانە بە كێش بكا لە ڕۆژی قیامەتا خودا تەماشای ناكا (د–س/ص–ن).**

**٢٨٣٩– عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) **قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَفِي إِزَارِي اسْتِرْخَاءٌ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ ارْفَعْ إِزَارَكَ. فَرَفَعْتُهُ ثُمَّ قَالَ: « زِدْ». فَزِدْتُ فَمَا زِلْتُ أَتَحَرَّاهَا بَعْدُ. فَقَالَ: بَعْضُ الْقَوْمِ إِلَى أَيْنَ فَقَالَ: أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ. رواه مسلم**[٨]:

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **جلەكەم هەنێ شۆڕ بوو فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا! جلەكەت هەڵكێشە منیش كەمێك هەڵم كێشا، فەرمووی: زیاتریش منیش زیاترم كرد، ئیتر هەر چاوەڕوان بووم كە بزانم تاكوێ هەڵی بكێشم تا پیاوێ لە یاران گوتی: قوربان! هەتا كوێ؟ فەرمووی: هەتا نیوەی هەردوو لاق! (م).**

**٢٨٤٠– وَقَالَ: حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَخَذَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِعَضَلَةِ سَاقِي أَوْ سَاقِهِ فَقَالَ: هَذَا مَوْضِعُ الإِزَارِ فَإِنْ أَبَيْتَ فَأَسْفَلُ فَإِنْ أَبَيْتَ فَلاَ حَقَّ لِلإِزَارِ فِي الْكَعْبَيْنِ. رواه الترمذي والنسائي**[٩]:

---

[٧] رواه أبو داود بسند صحيح (شرحه).

[٨] مسلم. لباس: ٥٤٢٩.

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

**حوذیفە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ماسوڵکەی لاقمی گرت – یا گوتی: ماسوڵەی لاقی خۆی گرت – و فەرمووی: ئێرە دواشوێنی شۆڕی جل‌و بەرگە ئەگەر بەمە قاییل نابیت کەمێ خوارتیش قەیناکا ئیتر بەهەرحاڵ، بەڵام جل‌و بەرگ فڕی نیە بەسەر قاپەڕەقەڵەوە! (ت–س/ص–ن).**

**٢٨٤١– وَقَالَ: عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ): سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ عَنِ الإِزَارِ؟ فَقَالَ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ قَالَ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**: إِزْرَةُ الْمُؤْمِنِ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ وَلاَ خَرَجَ أَوْ لاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ مَا كَانَ أَسْفَلَ مِنْ الكَعْبِينْ فَهُوَ فِي النَّارِ. رواه ابو داود والبخاري والنسائي**[١٠]**:**

**عەبدولڕەحمان** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: بۆ ئەندازەی شۆڕی جل‌و بەرگ پرسیارم کرد لە ئەبو سەعید، گوتی: باش بوو لە کەسێکی شارەزات پرسی، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: شۆڕیی کاڵای پیاوی موسوڵمان هەتا نیوەی لاقە، لەوە خوارتریش هەتا سەرقاپەڕەقەڵەکان قەیدی نیە یا فەرمووی: گوناهی نیە، بەڵام ئەوەی لەخوار قولەپێوە بێ و بۆ فیزو دەعیەبێ جێگەکەی لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبێ! (د/ب/ن).**

**٢٨٤٢– عَنْ جَابِرِ بْنِ سُلَيْمٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلاً يَصْدُرُ النَّاسُ عَنْ رَأْيِهِ لاَ يَقُولُ شَيْئًا إِلاَّ صَدَرُوا عَنْهُ قُلْتُ مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قُلْتُ عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَرَّتَيْنِ. قَالَ: لاَ تَقُلْ عَلَيْكَ السَّلاَمُ. فَإِنَّ عَلَيْكَ السَّلاَمُ تَحِيَّةُ الْمَيِّتِ قُلِ السَّلاَمُ عَلَيْكَ. قَالَ: قُلْتُ أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**؟ قَالَ: أَنَا رَسُولُ اللَّهِ الَّذِى إِذَا أَصَابَكَ ضُرٌّ فَدَعَوْتَهُ كَشَفَهُ عَنْكَ وَإِنْ أَصَابَكَ عَامُ سَنَةٍ فَدَعَوْتَهُ أَنْبَتَهَا لَكَ وَإِذَا كُنْتَ بِأَرْضٍ قَفْرَاءَ أَوْ فَلاَةٍ فَضَلَّتْ رَاحِلَتُكَ فَدَعَوْتَهُ رَدَّهَا عَلَيْكَ. قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ اعْهَدْ إِلَيَّ. قَالَ: « لاَ تَسُبَّنَّ أَحَدًا ». قَالَ: فَمَا سَبَبْتُ بَعْدَهُ حُرًّا وَلاَ عَبْدًا وَلاَ بَعِيرًا وَلاَ شَاةً. قَالَ: وَلاَ تَحْقِرَنَّ شَيْئًا مِنَ الْمَعْرُوفِ وَأَنْ تُكَلِّمَ أَخَاكَ وَأَنْتَ مُنْبَسِطٌ إِلَيْهِ وَجْهُكَ إِنَّ**

---

[١٠] بخاري. لباس: ٥٧٨٧. تجريد/ ٥ ل- ١٨٤ ژ: ١٨١٩.

ذَلِكَ مِنَ الْمَعْرُوفِ وَارْفَعْ إِزَارَكَ إِلَى نِصْفِ السَّاقِ فَإِنْ أَبَيْتَ فَإِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِيَّاكَ وَإِسْبَالَ الإِزَارِ فَإِنَّهَا مِنَ الْمَخِيلَةِ وَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمَخِيلَةَ وَإِنِ امْرُؤٌ شَتَمَكَ وَعَيَّرَكَ بِمَا يَعْلَمُ فِيكَ فَلاَ تُعَيِّرْهُ بِمَا تَعْلَمُ فِيهِ فَإِنَّمَا وَبَالُ ذَلِكَ عَلَيْهِ رواه أبو داود[11]:

جابیر كوڕی سولەیم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: تەماشام كرد وا پیاوێ دیارە، ئەو خەڵكە چاویان لە دەمیەتی، هەرچی دەفەرمویێ ئەوان لە دەمی دەقۆزنەوەو جێبەجێی دەكەن. گوتم: ئەم پیاوە كێیە؟ گوتیان: ئەوە پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەربێ) منیش دوو جار گوتم: عليك السلام: لەسەر تۆبێ سڵاو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: مەڵێ عليك السلام، چونكە عادەت وایە سڵاو لە مردوو بەم شێوەیێ دەكرێ، بەڵام بڵێ: السلام عليك: سڵاو لەسەر تۆبێ گوتم: ئایا تۆ پێغەمبەری خودای؟ فەرمووی: بەڵێ من پێغەمبەری ئەو خودایەم كە كاتێ تووشی تەنگانەیێ دەبیت‌و هاواری بۆ دەبەیت دێت بە هاورتەوەو دەرووت لێ دەكاتەوە، وە كاتێ تووشی ساڵی نەهاتی دەبیت‌و هاواری لێ دەكەیت دێت بە هاوارتەوەو باران دەبارێنێ‌و شینایی سەوز دەكا بۆت، وە كاتێ لە شوێنێكی چۆڵدا یا لە بیابانێ وڵاخەكەت ون دەبێ‌و لێی دەپاڕێیتەوە وڵاخەكەت پێ دەداتەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئامۆژگاریم بكە، فەرمووی: جنێو بەكەس مەدە گوتی: ئیتر لەو ساكەوە تا ئێستا جمێنم بەكەس نەداوە، نە بە ئازادو نە بە بەندەو نە بە وشترو نە بە مەڕو نە بە هیچی تر فەرمووی: ئەوەی چاكە بێ قەت بە كەمی مەگرەو بە سووكی مەزانە، قسەكردن لەگەڵ برای خۆتا بەرووی خۆشەوە ئەویش هەر لە چاكەیە، جلەكانیشت هەتا نیوەی لاقت بێ، ئەگەر بەوە قاییل نابیت هەتا قاپەڕەقەڵەكان بێ، خۆت دوور بگرە لە شۆڕكردنەوەو بەردانەوەی جل‌و بەرگ چونكە شتی وا فیزو دەعیەو لەخۆ بایی بوونە، وە خودا خۆشی لە شتی وا نایێت، ئەگەر كەسێ جنێوێكی پێ دایت یا تانووتێكی لێ دایت وەلحاڵ جنێوو تانووتەكەی لە تۆدا هەبوو بەر پەرپەرچی مەدەرەوە بە جنێوو

---

[11] بسند صالح (شرحه).

تانووتێ کە لەودا هەبێ و تۆ ئاگات لێ بێ، ئیتر ئوباڵی ئەوە بە ئەستۆی ئەوە (د-سند صالح).

٢٨٤٣- وَقَالَتْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا): كَانَ كُمُّ يَدِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الرُّسْغِ[١٢]:

ئەسمائی کچی یەزید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سەر دەستی قۆڵی جلو بەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا مووچەی دەست بوو (د/ت/ن-س/ح).

٢٨٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِمَيَامِنِكُمْ. رواهما أصحاب السُّنن[١٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کەشت لەبەردەکەن و کاتێ دەسنوێژ دەگرن بەلای راستتان دەست پێ بکەن (د/ت/ن-سند صالح).

٢٨٤٥- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ (رَضيَ أللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَهْطٍ مِنْ مُزَيْنَةَ فَبَايَعْنَاهُ وَإِنَّ قَمِيصَهُ لَمُطْلَقُ الإِزَارِ فَبَايَعْنَاهُ ثُمَّ أَدْخَلْتُ يَدِي فِي جَيْبِ قَمِيصِهِ فَمَسِسْتُ الْخَاتَمَ. قَالَ عُرْوَةُ: فَمَا رَأَيْتُ مُعَاوِيَةَ وَلاَ ابْنَهُ قَطُّ إِلاَّ مُطْلِقِي إِزَارِهِمَا فِي شِتَاءٍ وَلاَ حَرٍ. رواه أبو داود والترمذي والبزار[١٤]:

موعاوییەی کوڕی قوڕە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: لەگەڵ دەستەیێ لە هۆزی موزەینە چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوێ بەیعەت و پەیمانمان لەگەڵدا کرد، لەوکاتەدا دوگمەی کراسەکەی دا خرابوون جا پاش پەیمان بەستنەکە دەستم کرد بە باخەڵی کراسەکەیداو دەستم دا لە مۆری پێغەمبەرایەتی کە بەناو شانیەوە بوو، کە لوویەکی سوور بوو، وەك دوگمەی پەردە کوللە وایوو، بەقەد هێلکەی کۆترێ دەبوو عورەوە

---

[١٢] بسند حسن (شرحه) {رياض/ ٢ ل- ٨٧ ز: ٢٩/ ٥١٩. ابو داود: ٤٠٢٧. ترمذي: ١٧٦٥}.

[١٣] بسند صالح (شرحه).

[١٤] بسند حسن (شرحه).

دەیگوت: موعاوییەو كوڕەكەی موعاوییە هەمیشە بەزستان‌و بە هاوین دوگمەی كراسیان دا نەدەخست لە خۆشی یادی ئەو دەمە پیرۆزە (د/ت/بەزا-س/ح).

٢٨٤٦- ورد في الشرح (أي غاية المأمول) : كَانَ ابْنَ عُمَرَ دَائِماً مَحْلُولَ الأَزْرَارِ وَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَحْلُولَ الأَزْرَارِ[١٥]:

لە شەرحی غایەتول مەئموولدا دەڵێ: گفتەی (لەفظ)ی بەززار ئاوایە: هەمیشە ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دوگمەی خۆیی دانەدەخست‌و دەیگوت: پێغەمبەرم دەدی (درودی خودای لەسەربێ) دوگمەكانی كراوە بوون.

## ٣٩) ستایشكردن لەكاتی جل پۆشینا: (الحمد عند اللبس)

٢٨٤٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْبًا سَمَّاهُ بِاسْمِهِ إِمَّا قَمِيصًا أَوْ عِمَامَةً ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ. قَالَ: أَبُو نَضْرَةَ فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا لَبِسَ أَحَدُهُمْ ثَوْبًا جَدِيدًا قِيلَ لَهُ تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللَّهُ تَعَالَى. رواه اصحاب السنن[١]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كە كاڵایەكی تازەی لەبەر دەكرد بە ناوی خۆیەوە ناوی دەهێنا وەك كراس، یا مێزەر، ئەمجا دەیفەرموو: خودایە! ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ ئەم پۆشاكەت بەمن بەخشیوە، داوات لێ دەكەم كە بەشم بدەیت لە خێری ئەم پۆشاكەو لە خێری ئەوشتەیش كە ئەم پۆشاكەی بۆ دروست كراوە، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەمەو لە شەڕی ئەو شتەیش كە ئەمەی بۆ دروست كراوە: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا

---

[١٥] أثرٌ مقبول.

[١] بسند صحيح (شرحه).

صُنِعَ لَهُ. لەوەپێش هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە کەسێکیان کاڵایەکی نوێی دەپۆشی پێیان دەگوت: بڕژیت تا دەیدڕیتو خودای گەورە تازەی دەکاتەوە بۆت (د/ت/ن–س/ص).

٢٨٤٨– ← (ب – ٣ ز – ٧٣ – ل – ف – ٦) وزاد هنا: وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: وَمَنْ لَبِسَ ثَوْبًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى كَسَانِى هَذَا الثَّوْبَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّى وَلاَ قُوَّةٍ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ[٢]:

لێرەدا ئەمەی پترە: خودا لە گوناهی لەوەبەریو لەوەپاشی خۆش دەبێ فەرمووی: وە کەسێ لەپاش پۆشینی کاڵا بڵێ: سوپاسو ستایش بۆ ئەو خودایە کە من بەم دەستەو سانیەی خۆمە ئەم پۆشاکەی داوە پێم: الحمد لله الذي كساني هذا الثوب ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة، ئیتر خودا لە گوناهی بەرودوای خۆش دەبێ.

٢٨٤٩– وَقَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى كَسَانِى مَا أُوَارِى بِهِ عَوْرَتِى وَأَتَجَمَّلُ بِهِ فِى حَيَاتِى ثُمَّ عَمَدَ إِلَى الثَّوْبِ الَّذِى أَخْلَقَ فَتَصَدَّقَ بِهِ كَانَ فِى كَنَفِ اللَّهِ وَفِى حِفْظِ اللَّهِ وَفِى سَتْرِ اللَّهِ حَيًّا وَمَيِّتًا. رواه الترمذي[٣]:

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم بیست (درووودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر کەسێ کاتێ کاڵایەکی نوێ لە بەردەکا بڵێ: سوپاس بۆ خودا کە ئەم بەرگەی پێم داوە، شەرمی خۆمی پێ دادەپۆشمو لە ژیانما خۆمی پێ دەرازێنمەوە: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى كَسَانِى مَا أُوَارِى بِهِ عَوْرَتِى وَأَتَجَمَّلُ بِهِ فِى حَيَاتِى: وە ئەمجا دەست بەرێ جلەکۆنەکەی ببەخشێ ئیتر ئەو کەسە بە زیندوییو بە مردوویی لە پەنای خودادا دەبێو خودا ئاگاداریی دەکاو لەژێر پەردەی خودادا دەپۆشرێ (ت: سند غريب).

---

[٢] تقدم برقم: ٦/ مجلد/ ٣ تسلسل/٧٣.

[٣] رواه الترمذي: بسند غريب (شرحه).

٢٨٥٠- عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِثِيَابٍ فِيهَا خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ صَغِيرَةٌ فَقَالَ: « مَنْ تَرَوْنَ نَكْسُو هَذِهِ ». فَسَكَتَ الْقَوْمُ قَالَ: « ائْتُونِي بِأُمِّ خَالِدٍ ». فَأُتِيَ بِهَا تُحْمَلُ فَأَخَذَ الْخَمِيصَةَ بِيَدِهِ فَأَلْبَسَهَا وَقَالَ: « أَبْلِي وَأَخْلِقِي ». وَكَانَ فِيهَا عَلَمٌ أَخْضَرُ أَوْ أَصْفَرُ فَقَالَ: « يَا أُمَّ خَالِدٍ هَذَا سَنَاهْ ». رواه البخاري وأبو داود. نسأل الله أن يجملنا بلباس العافية والتقوى آمين والله أعلم[٤]:

ئوممو خالیدی كچی خالید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چەند پارچەیێ جل دەهێنن بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پارچەیێ شاڵی ئاورێشمی رەشیان تیا دەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە رای ئێوە ئەمە بدەین بەكێ؟ یارانیش كەسیان قسەیان نەكردبوو، جا خۆی دەفەرموێ: ئوممو خالیدم بۆ بێنن جا ئوممو خالید هەڵدەگرن‌و دەیبەن بۆ خزمەتی، ئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی خۆی شاڵە رەشەكەی هەڵگرت‌و كردیە بەرم‌و فەرمووی پێم: أَبْلِي وَأَخْلِقِي، بژێت تاكۆنی دەكەیت‌و دەیدڕێتەوە گوتی: پارچە شاڵەكە نەخشی سەوزی پێوەبوو، یا گوتی: نەخشی زەردی پێوەبوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئوممو خالید! ئەمە (سەناه) سەناه بە زمانی حەبەشی واتە: جوانە (ب/د)[١].

---

[٤] بخاري. لباس: ٥٨٢٩.

[١]

بەرگێ خەڵاتی خوابێ بۆ بەندەی
لە هەردوو جیهان بیكا بە پەردەی
ناموس‌و نەنگ‌و گونای داپۆشێ
بیكەرە بەرمان، خودای بەخشندەی!
تاوانم هەموو فرەو قەبەو زل
نەوی لەژێریا پشت‌و شان‌و مل
بە كەرەمی خۆت نەك بە خاسیی من

## ٤٠) جلو بەرگی ژنان: (لباس النساء)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا – ٥٩/٣٣}.

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بڵێ بە ژنەكانتو بە كچەكانتو بە ژنەكانی موسوڵمانەكان: كە چارشێوو سەرپۆش بگرنەوەو سەرو سینگو بەرۆكی خۆتان داپۆشن چونكە بەم شێوە باشتر دەناسرێن كە كێنو چ كەسێكنو كە ئەوان ئافرەتی بە شانو بە حورمەتنو بۆ ئەوە ناشێن كە شەلاتیو سەرسەریەكان سەرەرێگەو لاكۆڵانیان لێ بگرن، ئیتر رزگاریان دەبێ لە ئازارو گەفینی ناپاكن، بزانن خودا تاوانبەخشو میهرەبانە ئەگەرنا وڵاتی شەلاتی وێران دەكرد.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ – ٣١/٢٤}.

---

بە شووڵی رەحمەت بمكوتە شل شل
شەنو كەوم كە، كاو كۆتەڵ بۆدەر
لەجیێز جیاوەكە قەڵاسو كۆزەر
سووری خەرمانم كەم بێ قەیناكا
چونكە بنەتۆو حوببی پێغەمبەر (د)
گیان بە قوربانی خۆیو خێزانی
هەم هاوڕێیانی گیانی بە گیانی
سەدجار دەرمكەن لە قاپی خۆیان
دڵ دەبەم دەیكەم بە دەركەوانی!

- وەرگێڕ -

م.ك.ع = مستشفى كركوك العسكرى، ١٩٨٨/٧/١٤

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بفەرموو بەو ژنانە کە خاوەن باوەڕن: بازێ چاویان بقونجێنن لە تەماشاکردنی نامەحرەم‌و شەرمگای خۆیان بپارێزن لە لەزەت پێ وەرگرتنی نارەواو نا شەرعی وەدەرنەخەن بۆ تەماشاکردنی نامەحرەم ئەو شتانە کە هۆی جوانی ئەوانە، ئەوانەیان نەبێ کە بە عادەت دەردەکەون، وە با سەرپۆشەکانیان بگەیەنن بە بەرۆکیان بۆ ئەوە کە مل‌و سنگیان داپۆشن، وە بە شێوەی تەئکید دەڵێمەوە هۆی جوانی خۆیاندەر نەخەن بۆ کەس ئەوانە نەبێ کە جیامان کردنەوە، مەگەر بۆ مێردەکانیان.

٢٨٥١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْها) قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلاَبِيبِهِنَّ) خَرَجَ نِسَاءُ الأَنْصَارِ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِهِنَّ الْغِرْبَانُ مِنَ الأَكْسِيَةِ. رواه أبو داود[1]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە ئایەتی (يدنين عليهن من جلابيبهن) هاتە خوارەوە ئافرەتانی یاریدەدەران کە لەماڵ دەهاتنە دەرەوە لەبەر لەچك‌و سەرپۆش دەتگوت قەلەڕەش بەسەر سەریانەوە نیشتۆتەوە ئاوا سەروملی خۆیان دادەپۆشی (د-س/صالح).

٢٨٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: يَرْحَمُ اللَّهُ نِسَاءَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) شَقَقْنَ - قَالَ: ابْنُ صَالِحٍ: أَكْثَفَ - مُرُوطِهِنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا. رواه ابو داود والبخاري[2]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رەحمەتی خودا لە ژنە کۆچەرە پێشینەکان بێ، کاتێ ئەم ئایەتەهاتە خوارەوە {وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ} چارۆکەو شاڵینەکانی خۆیانیان لەت لەت دەکردو دەیان کردن بە لەچك‌و سەرپۆش بۆ خۆیان (د/ب).

---

[1] بسند صالح (شرحه).

[2] رواه البخاري في التفسير (شرحه).

٢٨٥٣- وَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ وَهِيَ تَخْتَمِرُ فَقَالَ: « لَيَّةٌ لاَ لَيَّتَيْنِ »[٣]:

**جاریَ پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **تەشریفی چوو بۆ لای ئوممو سەلەمەی هاوسەری، لەوکاتەدا ئوممو سەلەمە** (خودای لێ رازی بێ) **لەچکی دەگرتەوە، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی پێی: یەك پێچ تێوەی ئاڵێنە نەك دوو پێچ! (د).**

٢٨٥٤- وَعَنْهَا أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) دَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَقَالَ: يَا أَسْمَاءُ إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ لَمْ يَصْلُحْ لَهَا أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلاَّ هَذَا وَهَذَا وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ. رواهما أبو داود[٤]:

**دیسان ئەو گوتی: ئەسمائی كچی ئەبو بەكر** (خودایان لێ رازی بێ) **جلێكی تەنكی لەبەردا بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **حەزرەت رووی لێ وەرچەرخانو فەرمووی: ئەی ئەسماء! ژن كە كەوتە بێنوێژیی ئیتر دروست نیە هیچ كوێیەكی دەربكەوێ، جگە لەمەو لەمە واتە: جگە لە روخسارو هەردوو دەستی (د).**

٢٨٥٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِ اللّٰهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: فَكَيْفَ يَصْنَعْنَ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ؟ قَالَ: يُرْخِينَ شِبْرًا. فَقَالَتْ: إِذًا تَنْكَشِفَ أَقْدَامُهُنَّ. قَالَ: فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعًا لاَ يَزِدْنَ عَلَيْهِ. رواه الترمذي وصاحباه. (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) وَعن جميع المُحدّثين والرُّواة. والله أعلم[٥]:

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر كەسێ بۆ فیزو دەعیەو ترِ زلی جلو بەرگی خۆی بەكێش بكا،**

---

[٣] سكت عن درجته.

[٤] سكت عن درجته.

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

لە ڕۆژی قیامەتا خودای گەورە بە چاوی بەزەیی تەماشای ناكاو ڕووی نازی ناداتێ ئوممو سەلەمەیش (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی ئافرەتان چی لە دامێنیان بكەن؟ فەرمووی: بستێ شۆڕی بكەنەوە. گوتی: ئاخر قاچیان دەر دەكەوێ. فەرمووی: دە یەك باڵ شۆڕی بكەنەوەو بەس (ت- س/ص-د/ن).

## ٤١) ڕاستو چەپ خۆشەتەكدان (صەمماء)و خۆشەتەكدان بە چیچكانەوە (ئیحتیباء) : (الصماء والاحتباء)

٢٨٥٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ. رواه الخمسة[1]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی كردووە لەوە كە مرۆڤ بەرەنگێ خۆی شەتەك بدا بە پارچە جلێ كە نەتوانێ دەستی لێوەی دەربێنێ وە لەوەیشە كە پیاو بە چیچكانەوە جلێ بئالێنێ بە خۆیەوە بەڵام هیچ نەدا بە شەرمگای خۆی دا. (ش/د/ت/ن).

## ٤٢) باسی چوارەم: باسی ڕەوشتە سروشتییەكان (سونەنولفیطرە: خووە خواییەكان) : (الباب الرابع: في سنن الفطرة)

٢٨٥٧- ← (ب - ١ ز - ٢٧ ف - ٥)[1].

٢٨٥٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وَفِّرُوا اللِّحَى، وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) إِذَا حَجَّ أَوِ اعْتَمَرَ قَبَضَ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَمَا فَضَلَ أَخَذَهُ. رواه الخمسة[2]:

---

[1] مسلم. لباس: ٥٤٦٦. بخاري. لباس: ٥٨١٩.

[1] تقدم برقم: ٢٢٥/٥ مجلد/١ تسلسل/ ٢٧.

[2] بخاري. لباس: ٥٨٩٢. مسلم. طهارة: ٦٠١.

ئیبنـو عومـەر (خودایـان لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: پێچەوانەی بتپەرستان‌و فرە خوایان بکەن بەم رەنگە ریش تەواو بهێڵنەوەو سمێڵ تەواو کورت بکەنەوە. ئیبنو عومەر خۆی وابوو، وە کاتێ دەچوو بۆ حەج یا بۆ عەمرە پڕ بە دەستی ریشی خۆی دەگرت‌و هەرچی لەوە پتر بوایە دەیکرد (ش/د/ت/ن).

٢٨٥٩- وَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ لَمْ يَأْخُذْ مِنْ شَارِبِهِ فَلَيْسَ مِنَّا. رواه الترمذي والنسائي[٣]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لە سمێڵی نەگرێ لە ئێمە نیە (ت-س/ص-ن).

٢٨٦٠- وَقَالَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ وَتَقْلِيمِ الأَظْفَارِ وَنَتْفِ الإِبْطِ وَحَلْقِ الْعَانَةِ أَنْ لاَ نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً. رواه الخمسة إلا البخاري[٤]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ قرتاندنی سمێڵ‌و کردنی ناخون‌و هەڵکەندنی مووی بن باڵ‌و تاشینی مووی بەر کاتمان بۆ دانراوە: کە لە چل شەو پتر دوایان نەخەین! (م/د/ت/ن).

٢٨٦١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تَخْتِنُ بِالْمَدِينَةِ فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ تُنْهِكِي فَإِنَّ ذَلِكَ أَحْظَى لِلْمَرْأَةِ وَأَحَبُّ إِلَى الْبَعْلِ. رواه أبو داود والطبراني والحاكم ولفظه: كَانَ بِالْمَدِينَةِ امْرَأَةٌ يُقَالُ لَهَا أُمُّ عَطِيَّةَ تَخْفِضُ الْجَوَارِي فَقَالَ: لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا أُمَّ عَطِيَّةَ اخْفِضِي وَلاَ تَنْهَكِي فَإِنَّهُ أَنْضَرُ لِلْوَجْهِ وَأَحْظَى عِنْدَ الزَّوْجِ[٥]:

ئوممو عەطییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێ - لە مەدینە - کچانی سوننەت دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: لەبنا خشتی

---

[٣] رواه الترمذی بسند حسن (شرحه).

[٤] مسلم. طهارة: ٥٩٨. أبو داود. ترجل: ٤٢٠٠. ترمذی. آدب: ٢٧٥٨ ، ٢٧٥٩. نسائی. طهارة: ١٤.

[٥] رواه أبو داود وضعفه. ولكن مؤيد بحديث الشيخين الفطرة خمس.

مەكەو هەندێ لەو زیادە گۆشتە بهێڵەرەوە چونكە وا خۆشترە بۆ ژنەكەش و بۆ مێردەكەش (د–ضعیف–طەبەرانی/حاكم) گفتەی حاكم ئاوایە: لە مەدینە ژنێ هەبوو ناوی ئوممو عەطییە بوو، كچانی سوننەت دەكرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئەی ئوممو عەطییە! سوننەتیان بكە، بەڵام لە بنا حشت مەیبڕەو لە كۆتەرەی مەدە، چونكە ئاوا ژنەكە زیاتر شەوقی دەبێ و پیاوەكەیش زیاتر كەیفی هەڵ دەستێ!

٢٨٦٢– ورد في الشَّرح: وقال أحمد: إنَّه (أي الختان) واجبٌ للذَّكر سُنَّةٌ للأنثى لحديث أحمد وغيره: الْخِتَانُ سُنَّةٌ لِلرِّجَالِ مَكْرُمَةٌ لِلنِّسَاءِ [٦]:

لە شەرحەكەدا دەڵێ: ئیمامی ئەحمەد (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ خەتەنەكردن بۆ نێرینە فەرزەو بۆ مێیینە سوننەتە، لەبەر ئەم حەدیثەی ئەحمەدو غەیری ئەحمەد كە دەفەرموێ: خەتەنەكردن بۆ پیاوان سوننەتەو بۆ ژنان دەستی قەدرو ڕێزو حورمەتە.

## ٤٣) باسی قژو داهێنانی قژ : (الشعر وترجيله (أي تسريحه))

٢٨٦٣– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ. رواه الخمسة إلا الترمذي[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار قژی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیدا لە هەردوو سەرشانی (ش/د/ن).

٢٨٦٤– وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ شُعَره (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى شحمة أذنيه. رواه ابو داود والنَّسائي[٢]:

---

[٦] سكت عن درجته.

[١] بخاري. لباس: ٥٩٠٣ ، ٥٩٠٤. مسلم. فضائل: ٦٠٢٢. نسائی. زينة: ٥٢٥٠.

[٢] سكت عنه الشارح.

**دیسان گوتی: گەلێ جار مووی سەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەتا نەرمەی هەردوو گوێچکەی بوو (د/ن).**

**٢٨٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ، وَكَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ أَشْعَارَهُمْ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءُوسَهُمْ، فَسَدَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَاصِيَتَهُ، ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ. رواه الخمسة[٣]:**

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بۆ هەرشتێ کە خودا فەرمانی پێ نەکردایە کە چۆن بکا حەزی دەکرد کە موافەقەی خاوەن نامەکان بکا، خاوەن نامەکانیش دەستووریان وابوو قژی خۆیانیان بە دەوری سەریانا شۆڕ دەکردەوە، بەڵام هاوبەشپەیداکەرەکان دەستووریان وابوو قژی خۆیانیان لە ناوەڕاستی سەریاندا دەکرد بە دوو بەشەوەو لایان دەدا بەم لاو بەو لای سەریاندا، جا لەپێش دا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر دەستووری خاوەن نامەکان پێشە سەری خۆی شۆڕ دەکردەوە بەبێ لەتکردن، بەڵام لە دواییدا قژی خۆی دەکرد بە دوو لەتەوەو لای دەدا بەم لاو بەو لای سەری دا (ش/د/ت/ن).**

**٢٨٦٦- ← (ب - ١ ز - ٣٢ ل - ١٥٤ ف - ٤). وَفِي هَذِهِ الرِّوَايَةِ: عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ فِي طُهُورِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَتَنَعُّلِهِ. وَسِوَاكِهِ. رواه الخمسة[٤]:**

**لەم گێڕانەوەدا: عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) تا بۆی بکرایە لە گشت کارو بارێکی خۆی دا حەزی لەوە بوو کە لای راست پێش بخات وەك دەستنوێژگرتنو خۆشۆردنو سەرداهێنانو موو شانەکردنو پێڵاو لە پێ کردنو سیواك کردن (ش/د/ت/ن).**

---

[٣] بخاري. مناقب: ٣٥٥٨. مسلم. فضائل: ٦٠١٦.

[٤] تقدم برقم: ٢٨١/٤ في مجلد/١ تسلسل/ ٣٢.

٢٨٦٧- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ التَّرَجُّلِ إِلاَّ غِبًّا. رواه أصحاب السنن[٥]:

عەبوڵلای كوڕی موغەففەل (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی دەكرد لە موو شانەكردنی زۆر مەگەر، ناو بەناو تا بۆ پاكیو خاوێنی بێو بۆ كەشخەییو شەوقو كەیف نەبێ (د/ت/ن-س/ص).

٢٨٦٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْقَزَعِ. قيل لابن عمر: وَمَا الْقَزَعُ؟ قَالَ: يُحْلَقُ بَعْضُ رَأْسِ الصَّبِيِّ وَيُتْرَكُ بَعْضٌ. رواه الخمسة إلا الترمذي[٦]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی دەكرد لە قۆچكە تاش، بە ئیبنو عومەریان گوت: قۆچەكەتاش چۆنە؟ گوتی: ئەوەتا كە سەری منداڵ هەندێكی بتاشرێو هەندێكی بهێڵرێتەوە (ش/د/ن).

٢٨٦٩- وَعَنْهُ قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَبِيًّا قَدْ حُلِقَ بَعْضُ شَعْرِهِ وَتُرِكَ بَعْضُهُ فَنَهَاهُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذَلِكَ وَقَالَ: احْلِقُوهُ كُلَّهُ أَوِ اتْرُكُوهُ كُلَّهُ. رواه أبو داود والنسائي[٧]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كوڕێكی منداڵی دی هەندێ لەسەری تاشرا بوو، هەندێكیشی نە تاشرابوو ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی لێ كردن لە شتی واو فەرمووی: یا هەمووی بتاشن یا هەمووی مەتاشن (د-سند صالح-ن).

---

[٥] بسند صحيح (شرحه).

[٦] بخاري. لباس: ٥٩٢٠.

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

٢٨٧٠- وَقَالَ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَتْ لِي ذُؤَابَةٌ فَقَالَتْ لِي أُمِّي: لاَ أَجُزُّهَا كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَمُدُّهَا وَيَأْخُذُ بِهَا. رواه أبو داود. والله أعلم[٨]:

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەوساکە پەلکێکم هەبوو دایکم دەیگوت پێم: نایقرتێنم، جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) درێژی دەکردو دەی گرت (د/ن-س/ص).**

٢٨٧١- قَالَ المؤلف في شرحه – طيب الله ثراه – أمَّا الأنثى فيحرم عليها حلق الرأس أو قصه لحديث النسائي: نَهَى أَنْ تَحْلِقَ الْمَرْأَةُ رَأْسَهَا[٩]:

**دانەر (پڕ گڵکۆکەی لە بۆن‌و بەرامەی بەهەشت بێ) لە شەرحەکەدا دەڵێ: سەرتاشینی مێینە، حەرامە، هەروەها بڕینەوەو هەڵپاچینی مووی سەری، لەبەر فەرموودەکەی نەسائی کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەداوە کە ژن سەری خۆی بتاشێ.**

### ٤٤) رەنگکردن‌و بۆیاخکردنی مووی سەروریش : (خضب الشعر)

٢٨٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ. رواه الخمسة[١]:

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جوولەکەو گاور مووی سەروڕیشی خۆیان بۆیە ناکەن، کەواتە بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئێوە بۆیەیان بکەن (ش/د/ت/ن).**

٢٨٧٣- وَأُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ (نبتٌ ابيض الزَّهر والثّمر) بَيَاضًا فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): غَيِّرُوا هَذَا بِشَيْءٍ وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ. رواه مسلم وَأبو داود[٢]:

---

[٨] سكت عنه ولكن مؤيد بحديث للنسائي نقله في الشرح (شرحه).

[٩] سكت عن درجة الحديث المستشهد به.

[١] بخاري. لباس: ٥٨٩٩. تجريد/ ١٩٥/٥ ز: ١٩٠٥ + ١٣٨٠/ ٣٤٦٢ {رياض/٤ ل- ٧٩ ز- ٢٩٢}.

رۆژی گرتنی مەککە، کە ئەبو قوحافەی باوکی ئەبو بەکری صەدیقیان هێنا سەروڕیشی وەك قارچك پاك سپی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم سپێتییە بە شتێ ڕەنگ بکەن بەلاّم بە ڕەنگی ڕەش ڕەشی مەکەن (م/د).

٢٨٧٤- وَسُئِلَ أَنَسٌ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَخَضَبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ إِلاَّ قَلِيلاً. وَفِي رِوَايَةٍ : إِنَّهُ لَمْ يَخْضِبْ وَلَوْ شِئْتُ أَنْ أَعُدَّ شَمَطَاتِهِ فِي لِحْيَتِهِ. رواه الشيخان والنسائي ولفظه: لَمْ يَخْضِبْ إِنَّمَا كَانَ الشَّمَطُ عِنْدَ الْعَنْفَقَةِ يَسِيرًا وَفِي الصُّدْغَيْنِ يَسِيرًا وَفِي الرَّأْسِ يَسِيرًا[٣]:

پرسیار کرا لە ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ): ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) مووی خۆی بۆیاخ دەکرد؟ گوتی: نەء، چونکە کەمێ نەبێ مووی سپی نەبوو بوو. لە گێڕانەوەیەکا: بۆیەی نەدەکرد، بە حاڵ ڕیشی سپی تێ کەوتبوو، ئەگەر ئارەزووم ببوایە ئەو چەند مووە سپییەکە لە ڕیشیا هەبوون دەمژماردن (ش/ن) گفتەی (ن): بۆیەی نە دەکرد، بەس تۆزێ بۆزی هەبوو بە چاڵی ژێر لێوی خوارووییەوەو تۆزێکیش بە هەردوو لا جانگیەوەو تۆزێکیش لەسەری دا هەبوو.

٢٨٧٥- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ وَيُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ بِالْوَرْسِ وَالزَّعْفَرَانِ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ. رواه أبو داود والبخاري والنسائي[٤]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سۆلی چەرمی خۆشەکراوی بێ کوڵك‌و مووی لەپێ دەکرد، وە ڕیشی

---

[٢] مسلم. لباس: ٥٤٧٥ ، ٥٤٧٦. أبو داود. ترجل: ٤٢٤٠. نسائی. زينة: ٥٠٩١.

[٣] بخاري. لباس: ٥٨٩٤. مسلم. فضائل: ٦٠٢٧ — ٦٠٢٩.

[٤] بخاري. لباس: ٥٨٥١.

خۆیی بە گیا زەعقەرانو گوڵە زەعفەران زەرد دەکرد، ئیبنو عومەریش هەمان شتی دەکرد (د/ب/ن).

٢٨٧٦- وَقَالَ أَبُو رِمْثَةَ (رَضيَ أَللهُ عَنْهُ): أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَأَبِي وَكَانَ قَدْ لَطَخَ لِحْيَتَهُ بِالْحِنَّاءِ[٥]:

ئەبو ریمثە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی باوکمدا چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دیم خەنەی گرتبووە ریشی (د/ت/ن-س/ح).

٢٨٧٧- عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَحْسَنَ مَا غُيِّرَ بِهِ هَذَا الشَّيْبُ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ. رواهما أصحاب السنن[٦]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باشترین شت کە مووی سپی نیشانەی پیریی پێ رەنگ بکرێ خەنەو وسمەیە (د/ت/ن-س/ص).

٢٨٧٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ بِالسَّوَادِ كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ لاَ يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ. رواه ابو داود والنسائي[٧]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ئاخر زەمانا دەستەیێ پەیدا دەبن بە رەنگی رەش مووی خۆیان رەنگ دەکەن، ریشیان وەك چیکلدانەی کۆتر لە دەوری چەناگەیان خڕ هەڵ دەدەنو گوپیان دەتاشن، گوایە چاو لە کافرەکان دەکەن ئەوانە بۆنی بەهەشت ناکەن (د- سند صالح-ن).

---

[٥] بسند حسن (شرحه).

[٦] بسند صحيح (شرحه).

[٧] بسند صالح (شرحه).

٢٨٧٩- وَسُئِلَت عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) عَنْ خِضَابِ الْحِنَّاءِ؟ فَقَالَتْ : لاَ بَأْسَ بِـهِ وَلَكِنِّى أَكْرَهُهُ فَإِنَّ حَبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَكْرَهُ رِيحَهُ[٨]:

لە عائیشە (خودای لێ رازی بێ) پرسیار كرا بۆ خەنە تێگرتن گوتی: قەیدی نیە، بەلام من حەزی لێ ناكەم چونكە خۆشەویستەكەم (دروودی خودای لەسەربێ) حەزی لە بۆنەكەی نەدەكرد (د-سند صالح) -ن).

٢٨٨٠- وَعَنْهَا قَالَتْ: أُوْمَأَتْ امْرَأَةٌ مِنْ وَرَاءِ سِتْرٍ بِيَدَهَا كِتَابٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَبَضَ يَدَهُ فَقَالَ: مَا أَدْرِى أَيَدُ رَجُلٍ أَمْ يَدُ امْرَأَةٍ قَالَتْ: بَلِ يَدُ امْرَأَةٌ. قَالَ: لَوْ كُنْتِ امْرَأَةً لَغَيَّرْتِ أَظْفَارَكِ بِالْحِنَّاءِ. رواهما أبو داود والنسائي. نسأل الله التوفيق آمين[٩]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ ژنێ لە پشتی پەردەوە نامەیەكی لە دەستابوو درێژی كرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی خۆی بردە دواوەو فەرمووی: نازانم كە ئەمە دەستی پیاوە یا دەستی ژنە؟ ژنەكە گوتی: نەء، دەستی ژنە، فەرمووی: ئەگەر وایە بۆ ناخونەكانت نەگرتۆتە خەنە (د-سند صالح-ن).

---

[٨] بسند صالح (شرحه).

[٩] بسند صالح (شرحه).

## ٤٥) قژ خستنە سەر قژو خاڵكوتانو شتی وا دروست نین:
## يحرم الوصل والوشم ونحوهما

٢٨٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ[١] :

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەعنەتو نەفرینی خودا لەو ژنە بێ کە قژ دەداتە دەم قژی تر بۆ ژنێکی ترو لەو ژنەش بێ کە دەیەوێ قژی تر بداتە دەم قژی خۆی، وە لەو ژنەش بێ کە خاڵ دەکوتێ بۆ یەکێکی ترو لەو ژنەش بێ کە خاڵی بۆ دەکوتن (ش/د/ت/ن).

٢٨٨٢- وَسَمِعْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَامُ حَجٍّ وَهُوَ عَلَى مِنْبَرٍ وَبِيَدِهِ قُصَّةٌ مِنْ شَعَرٍ فَقَالَ: أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، وَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ. رواهما الخمسة. وزاد الشيخان: مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ أَحَداً يَفْعَلُهُ إِلاَّ الْيَهُودَ وَسَمَّاهُ النَّبِيُّ زُوراً حين بلغه[٢]:

ئەو ساڵەکە موعاوییە حەجی کرد، لەسەر دوانگەکەی مەدینە شارەجوانو نازدارەکەی پێغەمبەر، گوڵێ مووی گرتبوو بەدەستیەوە وتارێکی خوێندەوەو گوتی: زاناکانتان لە کوێن؟ چۆن شتی وا ناڕەوا روو دەداو ئەوان دەنگ ناکەن؟ من خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوتووە (دروودی خودای لەسەربێ) کە رێگەی شتی وای نەدەداو دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): نەوەی ئیسرائیل ئەوکاتە سەریان تیاچوو کە ژنەکانیان فێری ئەم جۆرە شتانە بوون (ش/د/ت/ن) شەیخان (واتە: بوخاریو موسلیم غەریقی رەحمەتی خواد بن) ئەمەیان لەم فەرموودەیە پتر کردووە: لەمن وایە کە هەر جوولەکە شتی وا دەکەن گوتی: لە کاتی خۆی دا کە ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ناوی ناساختە.

---

[١] بخاري. لباس: ٥٩٤٧. مسلم. لباس: ٥٥٣٦.

[٢] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٦٨ ، ٥٩٣٢.

٢٨٨٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالنَّامِصَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ. فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ وَكَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ فَأَتَتْهُ فَقَالَتْ مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ فَقَالَ: عَبْدُ اللَّهِ وَمَا لِيَ لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَا وَجَدْتُهُ. فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ قَالَ: اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا) فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ فَإِنِّي أَرَى شَيْئًا مِنْ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الآنَ. قَالَ: اذْهَبِي فَانْظُرِي. قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ مَا رَأَيْتُ شَيْئًا. فَقَالَ: أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكِ لَمْ نُجَامِعْهَا. رواه الخمسة إلا الترمذي[٣]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی: لەعنەت‌و نەفرینی خودا لە خاڵکوت بێ‌و لەو ژنەش بێ کە بە ئارەزووی خۆی خاڵی بۆ دەکوتن‌و لە دەمو چاو هەڵگرو لەو ژنەش بێ کە دەموچاوی خۆی هەڵ دەگرێ‌و لەو ژنەش بێ کە بەبڕ بەندو زبرە ددانی خۆی باریك‌و تەنك‌و شاش دەکا بۆ جوانی، چونکە ئەمانە بەم دەستکاریەی خۆیان نەخش‌و نیگارو ڕەنگوڕیسی خودا دەگۆڕن، جا کاتێ ئەم قسەیە گەیشتەوە بە ئوممو یەعقووب کە ژنێکی قورئان خوێن بوو، وە لە خێڵی بەنی ئەسەد بوو، چوو بۆ لای عەبدوڵڵاو لەم لایەنەوە قسەی لەگەڵدا کرد گوتی: کەسێ کە پێغەمبەری خودا خۆی لەعنەت‌و نەفرینی لێ بکا من چۆن لەعنەت‌و نەفرینی لێ ناکەم! وە سەرەڕای ئەوەش ئەمە لەنامەی خوداش دا هەیە جا ژنەکە گوتی: من سەرتاپا قورئانم خوێندۆتەوە شتی وام تیادا نەدیوە، گوتی: ئەگەر بتخوێندبایە دەتدی، ئەدی ئەوە نیە خودای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا): واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر دەتانداتی

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٨٨٦ ، ٤٨٨٧ ، ٥٩٣٩ ، ٥٩٤٣ ، ٥٩٤٤ م، ٥٩٤٨. مسلم. لباس: ٥٥٣٨. أبو داود. ترجل: ٤١٦٩. ترمذي. أدب: ٢٧٨٢. نسائي. زينة: ٥١١٤ ، ٥٢٦٧.

لەماڵو لە ئەحكام وەری بگرنو ئەوەیش كە نەهی لە كردنی دەكا مەیكەنو وازی لێ بێنن – ٧/٥٩: ژنەكەش كە هیچی بۆ نەمایەوە گوتی: لەو باوەڕدام كە ئێستا ژنەكەی خۆت هەندێ لەم شتانە دەكا، عەبدوڵڵاش گوتی: دەبچۆ تەماشای بكە، ئەویش چوو بۆ لای ژنەكەیو تەماشای كردو هیچی نەدیو هاتەوە گوتی: هیچم نەدی، عەبدوڵڵایش گوتی: دیارە ئەگەر شتی وا بكا لەگەڵ من دا گوزەران ناكات (ش/د/ن).

٢٨٨٤– وَقَالَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ وَالإمام أَحْمَدُ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُمْ) لاَ بَأْسَ بِالْقَرَامِلِ. رواه أبو داود[٤]:

سەعیدی كوڕی جوبەیرو ئیمامی ئەحمەد (خودای گەورەیان لێ خۆش نوودبێ) دەڵێن: بە قەرمەل قەیدی نیە[١] (د).

٢٨٨٥– عَنْ أَبِي رَيْحَانَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ عَشْرٍ عَنِ الْوَشْرِ وَالْوَشْمِ وَالنَّتْفِ وَعَنْ مُكَامَعَةِ الرَّجُلِ الرَّجُلَ بِغَيْرِ شِعَارٍ وَعَنْ مُكَامَعَةِ الْمَرْأَةِ الْمَرْأَةَ بِغَيْرِ شِعَارٍ وَأَنْ يَجْعَلَ الرَّجُلُ فِي أَسْفَلِ ثِيَابِهِ حَرِيرًا مِثْلَ الأَعَاجِمِ أَوْ يَجْعَلَ عَلَى مَنْكِبَيْهِ حَرِيرًا مِثْلَ الأَعَاجِمِ وَعَنِ النُّهْبَى وَرُكُوبِ النُّمُورِ وَلُبُوسِ الْخَاتَمِ إِلاَّ لِذِي سُلْطَانٍ. رواه أبو داود والنسائي. نسأل الله الستر والتوفيق آمين والله أعلم[٥]:

ئەبو رەحمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم دە شتەی قەدەغە كردووە: رنینو شاشكردنی ددانو خاڵكوتانو قژڕنینەوەو مووی سپی بژاركردنو، راكشانی پیاو لە تەك پیاودا بە رووتیو راكشانی ژن لەگەڵ ژندا بەرووتیو ئەوەیش كە پیاو – وەكوو بەڕانییەكان – چاكو

---

[٤] وسكت عنه الشارح.

[١] قەرمەل وشەیەكی عەرەبییە، نازانم بە كوردی خۆمان چی پێ دەڵێن، كێ دەڵێ لە وڵاتی ئێمە هەیە، راڤەكاران دەفەرموون: گیایەكی نەرمی پەلك درێژە، ژنان دەیدەنە دەم قژیانو قژی خۆیانی پێ درێژ دەكەن. -وەرگێڕ- ١٩٨٤/٥/١٤

[٥] رواه أبو داود بسند ضعيف ورواه النسائي بسند صحيح (شرحه).

دامێن‌و سەرشانەی جلەکانی بگرێتە ئاورێشم‌و، تالاَن‌و بڕۆو، سواربوونی بڵنگ‌و ئەموستیلە لە دەست کردن، مەگەر بۆ پیاوی خاوەن دەستەلاَت‌و فەرمانڕەوا (د-سند ضعيف-ن-س/ص).

٢٨٨٦- قال المؤلف في شرحه غاية المأمول على متن تأليفه التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لا بأس بالوصل بالقرمل ونحوه كصوف وحريرٍ وكتان. فالضفائر من هذا لا شيء فيها لعدم الضرر وعليه بعض التابعين والليث وأحمد، وقال بعضهم: لا يجوز لعموم الأحاديث ولحديث مسلم: نهى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أن تصل المرأة بشعرها شيئاً. انتهى كلامة. عليه الرحمة والرضوان[٦]:

دانەری ئەم نامە پیرۆزە (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە ڕەحمەتی خودا بێ) لە شەرحەکەیدا دەڵێ: بارۆکەی قەرمەل‌و شتی وا، وەك خوری‌و ئاورێشم‌و کەتان قەیدی نیە. کەواتە: کەزی‌و پرچ لەم جۆرە شتانە قەیدی نیەو هیچی تیا بەستە نیە، چونکە کەس بەوە تەفرە ناخواو دەستە شکێن نابێ، ئەمە رای هەندێ لە تابیعییەکانەو رای ئیمامی لەیث‌و ئیمامی ئەحمەدە وەڵێ هەندێ لە زانایان دەڵێن: شتی وا دروست نیە چونکە فەرموودەکان هەموو گشتایەتی (عومووم) دەگەیەنن، وە لەبەر ئەو فەرموودەیەیش کە موسلیم (خودای لێ رازی بێ) گێڕاویەتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەداوە ژن شتی تر بداتە دەم قژی خۆی. قسەکەی دانەر تەواو، غەریقی (رەحمەتی خودای گەورە بێ)[١].

---

[٦] من أقوال العلماء وبيان لمذهب أحمد.

[١] گەورەم مامۆستای موسوڵمانی پاك!

دانـــەری تـــاجی چلـــچرای ڕوونـــاك،

دووعات بۆ دەکەین تا لەسەر خاکین

چاوەڕێی دووعاین کەچووینە ژێر خاك

ڕەحمەت لەو کەسەی کە بە خێری خۆی

وەك ئەم دووعایەی من دەیکەم بۆ تۆی

## ٤٦) زەنگ‌و زەنگۆڵەو پلْپلْە: (الجلاجل)

٢٨٨٧- دَخَلَتْ مَوْلاَةٌ للزُّبَيْرِ بِابْنَةٍ لَهُ عَلِيٌّ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَفِي رِجْلِهَا أَجْرَاسٌ فَقَطَعَهَا عُمَرُ ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ مَعَ كُلِّ جَرَسٍ شَيْطَانًا. رواه أبو داود ومسلم[1]:

كارەكەرێكی زوبەیر، كچۆڵەیەكی زوبەیری برد بۆ لای عومەر (خودایان لێ رازی بێ) كچۆڵەكە پاوانەی لەپێ دا بوو، عومەر (خودای لێ رازی بێ) پاوانەكەی پچڕی یەوەو گوتی: لە پێغەمبەرم بیست (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر زەنگۆڵەیەك شەیتانێكی پێوەیە! (د/م).

٢٨٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ وَلاَ جَرَسٌ. رواه الخمسة إلا البخاري[2]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: فریشتەكان هاوڕێتیی ئەو كاروانی‌و كۆمەڵانە ناكەن كە زەنگ یا سەگیان پێ بێ (م/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

٢٨٨٩- وَدُخِلَ عَلَى عَائِشَةَ بِجَارِيَةٍ وَعَلَيْهَا جَلاَجِلُ يُصَوِّتْنَ فَقَالَتْ: لاَ تُدْخِلْنَهَا عَلَيَّ إِلاَّ أَنْ تَقْطَعُوا جَلاَجِلَهَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ جَرَسٌ. رواه أبو داود بسندٍ حسنٍ[3]:

كچۆڵەیەكیان برد بۆ لای عائیشە پلْپلْەی پێوە بوو، خرنگەی دەهات، عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: مەیهێنن بۆ لای من، مەگەر پلْپلْەكانی

---

لە گۆڕا رەحمەت دەنێرن بۆمان

خوایە! تاج بكەی بە حەوسەد تاج بۆی

وەرگێڕ -١٩٨٨/٧/٢٠

[1] مسلم. لباس: ٥٥١٤.

[2] مسلم. لباس: ٥٥١٢.

[3] بسند حسن (شرحه).

بپێچرنەوە، چونكە بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەو ماڵەی زەنگی تیابێ فریشتەكان تێی ناچن (د–سند صالح).

٢٨٩٠– ولمسلم على ما هو في الشَّرح: الْجَرَسُ مَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ[٤]:

لە شەرحەكەدا دەڵێ: ئیمامی موسلیم (رەزای خوای گەورەی لە سەربێ) ریوایەت دەكا: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زەنگ بلوێری شەیتانە!

## ٤٧) چاولێكەریی كەسێ جیابێ لە تۆ دروست نیە، هەروەها ساختەكاری نادروستە: (يحرم التشبه بالغير والزور)

٢٨٩١– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ[١]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەعنەت‌و نەفرینی كردووە لە پیاوی ژنانی‌و لە ژنی كوڕانی (ب/د/ت/ن).

٢٨٩٢– ← (ب – ٣ ز – ل – ف – ه)[٢].

٢٨٩٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ. رواه أبو داود والنسائي[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەفرینی كردووە لەو پیاوە كە بەرگی ژنانە لەبەر دەكاو لەو ژنەش كە بەرگی پیاوانە لەبەر دەكا (د–سند صالح–ن).

٢٨٩٤– ولأبي داود والطبراني: مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ[٤]:

---

[٤] مسلم. لباس: ٥٥١٢ تقدم برقم/ ١ من هذا التسلسل.

[١] بخاري. لباس: ٥٨٨٥.

[٢] تجريد/ ٥/ ١٩٤ ز:١٩٠٣/٥٨٨٦، ٥٨٨٥، ٦٨٣٤. تقدم برقم: ٢٣٤٤/٥.

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لاسکایی دەستەیێ بکاتەوە خۆشی یەکێکە لەوان (د/طەبەرانی- س/ح).

٢٨٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا. رواه مسلم[٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دوو تاقم هەن دۆزەخین، من نەمدیون چونکە لە پاشی من پەیدا دەبن تاقمەی یەکەمیان جۆرە قەمچیەکی ریشوو داریان پێیە، وەك کلکی گا وایە، پێی لە خەڵکی دەدەن‌و دەبن بە کوتەك‌و داردەستی دەستی فەرماندارە ستەمکارەکان! تاقمەکەی تر ژنگەلێکن نیوەی لەشیان پۆشتەیەو ئەو نیوەکەی تری رووتە! هەم خەڵکی تر لە خشتە دەبەن‌و هەم خۆیان لە خشتە چوون، قژی سەریان بە بارۆکەو شتی وا وەك دووگی لاری وشتر ئاوا زل دەکەن، ئەم ژنانە نە رێگەیان دەکەوێتە بەهەشت‌و نە بۆن‌و بەرامە خۆشەکەی بەهەشت دێ بە سەریاندا، لەگەڵ ئەوەی کە بۆن‌و بەرامەی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە ساڵە رێ دەڕوات (م).

٢٨٩٦- وَقَالَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَكْرَهُ عَشْرَ خِلاَلٍ الصُّفْرَةَ وَتَغْيِيرَ الشَّيْبِ وَجَرَّ الإِزَارِ وَالتَّخَتُّمَ بِالذَّهَبِ وَالتَّبَرُّجَ بِالزِّينَةِ لِغَيْرِ مَحِلِّهَا وَالضَّرْبَ بِالْكِعَابِ وَالرُّقَى إِلاَّ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَعَقْدَ التَّمَائِمِ وَعَزْلَ الْمَاءِ عَنْ مَحِلِّهِ وَإِفْسَادَ الصَّبِيِّ غَيْرَ مُحَرِّمِهِ. رواه ابو داود والنسائي[٦]:

---

[٤] بسند حسن (شرحه).

[٥] مسلم. لباس: ٥٥٤٧ ، ٧١٢٣.

[٦] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەزی لەم دە شتە نەبوو: رەنگی زەردو رەنگی سوور لە خۆدان‌و، گۆڕینی نیشانەی پیریی بە رەش كردنی مووە سپییەكان یا بە هەڵكەندنیان‌و، بەكێش كردنی جل‌و بەرگ بەسەر زەویدا بۆ فیزو دەعیەو، كردنی ئەموستیلەی زێڕو، خۆ ئارایش دان‌و خۆرازانەوەیێ كە لە جێگەی خۆی دا نەبێ وەك ئەوە بۆ پیاوی بیانی خۆی ئارایش بداو، تاوڵەبازی‌و، نووشتەكردن، مەگەر بەو وشە پیرۆزانە بێ كە دەبن بە پەناگاو، چاوەزارو مووفەڕك هەڵگرتن‌و خۆ كێشانەوەی پیاو لەكاتی دورست بووندا تا ئاوەكە نەگاتە جێگەی خۆی‌و، شفتەژێ كە دەبێ بەهۆی خراپ بوونی شیری دایك بۆ مناڵەشیرە خۆرەكەی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەزی لەم دە شتە نەبوو بەڵام قەدەغەی نەكردن‌و بە حەرامی دانەنان! (د-سند صالح-ن).

## ٤٨) لێدان‌و داخكردنی روخسار دروست نیە
## يحرم ضرب الوجه ووسمه

٢٨٩٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ وَعَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ. رواه مسلم والترمذي[1]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قەدەغەی كردووە كە بدرێ لە روخساری گیاندار، یا روخساری گیاندار داخ بكرێ بۆ نیشانەكردن (م/ت).

٢٩٩٨- وَعَنْهُ قَالَ: مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِمَارٌ قَدْ وُسِمَ فِي وَجْهِهِ فَقَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الَّذِي وَسَمَهُ[2]:

---

[1] مسلم لباس: ٥٥١٦. ترمذي. جهاد: ٢٧١٠.

[2] مسلم. لباس: ٥٥١٨.

دیسان گوتی: لەلای پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) گوێدرێژێ رەت بوو، رووی داخکرابوو، فەرمووی: نەفرینی خودا لەو کەسە بێ کە داخی کردووە (م).

٢٩٩٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا وَلَدَتْ أُمِّي قَالَتْ لِي يَا أَنَسُ انْظُرْ هَذَا الْغُلاَمَ فَلاَ يُصِيبَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَنِّكُهُ. قَالَ: فَغَدَوْتُ فَإِذَا هُوَ فِي الْحَائِطِ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ جَوْنِيَّةٌ وَهُوَ يَسِمُ الظَّهْرَ الَّذِي قَدِمَ عَلَيْهِ فِي الْفَتْحِ[٣]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە دایکم منداڵەکەی بوو گوتی: ئاگات لەم کوڕە بێ هیچی توخن نەکەوێو هیچ نەخوا تا دەیبەیت بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) و مەلاشووی شیرین دەکا ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە چووم بۆ خزمەتی لە باخێکا بوو، سەردەرییەکی کێڕکێڕی جەونی لەبەردا بوو، خەریك بوو ئەو وشترانەی داخ دەکرد کە لەو فەتحەدا بۆی هاتبوون (م).

٢٩٠٠- وَعَنْهُ قَالَ: رَأَيْتُ فِي يَدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمِيسَمَ وَهُوَ يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ. روى الثلاثة مسلم. والله أعلم[٤]:

دیسان گوتی: دیم کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) داخێکی بە دەستەوە بوو، وشتری زەکاتی پێ داخ دەکرد (م).

## ٤٩) باسی پێنجەم: باسی ناوماڵو کەرەستەی ناوماڵ

## الباب الخامس: في أثاث البيت

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ الأَنْعَامِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ – صدق الله العظيم}.

---

[٣] مسلم. لباس: ٥٥٢٠ ، ٥٥٧٩. بخاري. عقيقة: ٥٤٧٠ ، ٥٨٢٤.

[٤] بخاري. زكاة. تجريد البخاري: ٧٢٤ = فتح: ١٥٠٢ ، ٥٥٤٢ ، ٥٨٢٤. مسلم. لباس: ٥٥٢٣.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی ژمارە (١٦)دا لە ئایەتی ژمارە (٨٠)ی ئەو سوورەتەدا دەفەرموێ: وە خودای گەورە جێگەی دانیشتن‌و هۆی ئاسایش‌و حەسانەوەی بۆ ئامادەکردوون لە خانووەکانتان، وە لە پێستی ئاژەڵیش خانووی گەڕۆك‌و سووکەڵەی وای بۆ دروست کردوون بە ئاسانی دەتوانن لەگەڵ خۆتانا بیانگێڕن لە ڕۆژی کۆچ کردن‌و هەوار بەهەوارداو لە ڕۆژی مانەوەو دانیشتنتان لەو دەشتەدا، هەروا دروستی کردووە بۆتان، واتە: خستویەتە ناو دڵ‌و دەروونتان، کە لە خوری‌و مووی بزن‌و مەڕو لە تووك‌و کورکی وشتر ڕایەخ‌و پێخەف‌و بەرگ‌و پۆشاك‌و شمەك دروست بکەن، وە ئەمانەتان بۆ کراوە تا کاتێ هاتی خاوەنەکەیان بێ.

٢٩٠١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَحْتَجِرُ حَصِيرًا بِاللَّيْلِ فَيُصَلِّى وَيَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ فَيَجْلِسُ عَلَيْهِ قَالَتْ : فَجَعَلَ النَّاسُ يَثُوبُونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيُصَلُّونَ بِصَلاَتِهِ حَتَّى كَثُرُوا. فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ خُذُوا مِنَ الأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَإِنَّ أَحَبَّ الأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ مَا دَامَ مِنْهَا وَإِنْ قَلَّ. رواه البخاري[1]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەسیرێکی هەبوو بەشەو دەیگێڕایەوەو دەیکرد بە هۆدەو نوێژو خودا پەرستیی تیا دەکردو، بە ڕۆژیش ڕایدەخست‌و لەسەری دادەنیشت، جا بەرە بەرە خەڵك لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گرد بوونەوەو لە پشتیەوە بە کۆمەڵی نوێژیان لەگەڵدا دەکرد، جا کە زۆر بوون ڕووی تێ کردن‌و فەرمووی: ئەی خەڵکینە! کارێ بکەن کە لە تواناتانا هەبێ، چونکە هەتا ئێوە وەڕس نەبن خودا وەڕس نابێ، وە خۆشەویستترین کردەوەش لەلای خودا ئەوەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری، ئەگەرچی کەمیش بێ (ب).

[1] بخاري. لباس: ٥٨٦١.

٢٩٠٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي يَنَامُ عَلَيْهِ أَدَمًا حَشْوُهُ لِيفٌ. رواه الأربعة[٢]:

**دیسان عائیشه** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: رایەخەکەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە لە سەری دەنووست چەرم بوو ناواخنەکەی ریشوو بوو (ش/د/ت).**

٢٩٠٣- وَعَنْهَا كَانَ وِسَادَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّتِي يَتَّكِئُ عَلَيْهَا مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ. رواه مسلم وأبو داود[٣]:

**دیسانەوە گوتی: پشتییەکەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە پاڵی پێوە دەدا لە چەرم بوو ناواخنەکەی ریشوو بوو (م/د).**

٢٩٠٤- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ، وَرَأَيْتُ بِلاَلاً أَخَذَ وَضُوءَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالنَّاسُ يَبْتَدِرُونَ الْوَضُوءَ، فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ شَيْئًا أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ. رواه البخاري والنسائي[٤]:

**ئەبو جوحەیفە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە خێوەتێکی سووری چەرم دابوو دیم کە بیلال ئاوی دەسنوێژەکەی پێغەمبەری پێ بوو، خەڵکەکەش ئەو ئاوەیان دەقۆستەوە بۆ مووفەرك، جا ئەوەی لە ئاوەکە خۆیی دەست بکەوتایە هەڵی دەسوی لە خۆی‌و ئەوەشی هیچی بەرنەکەوتایە لە تەڕیی دەستی هاوڕێکەی دەستی خۆی تەڕ دەکردو بۆ مووفەرك دەیسوی لە خۆی (ب/ن).**

٢٩٠٥- وَقَالَ أَبُو رِفَاعَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَخْطُبُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَجُلٌ غَرِيبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عَنْ دِينِهِ لاَ يَدْرِي مَا دِينُهُ

---

[٢] مسلم. لباس: ٥٤١٤ ، ٥٤١٥. ترمذي. زهد: ٢٤٦٩ ، ١٧٦١.

[٣] مسلم. لباس: ٥٤١٣.

[٤] بخاري. لباس: ٥٨٥٩.

فَأَقْبَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَرَكَ خُطْبَتَهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ فَأُتِيَ بِكُرْسِيٍّ قَوَائِمُهُ مِنْ حَدِيدٍ فَجَلَسَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللّٰهُ، ثُمَّ أَتَى خُطْبَتَهُ فَأَتَمَّهَا. رواه النسائي[5]:

**ئەبو ريفاعە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە گەیشتمە لای لەو کاتەدا وتاری دەخوێندەوە عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من پیاوێکی ئاوارەمو وێڵم لە ئایین، هاتووم کە فێری ببم! ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وازی لە وتارەکەی هێناو بەرەو من هات تا گەیشتە لامو کورسییەکی هێنا، پێچکەکانی ئاسن بوو لەسەری دانیشتو دەستی کرد بەشت فێرکردنی من لەو زانستو عیلمەی کە خودا فێری ئەوی کردبوو، لە پاشا چووەوە سەر وتارەکەیو تەواوی کرد (ن).**

٢٩٠٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ وَفِرَاشٌ لِامْرَأَتِهِ وَالثَّالِثُ لِلضَّيْفِ وَالرَّابِعُ لِلشَّيْطَانِ. رواه مسلم وأبو داود[6]:

**جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نوێنی یەکەم بۆ پیاو خۆیو- نوێنی دووەم بۆ ژنەکەیو، نوێنی سێیەم بۆ میوانو، نوێنی چوارەم بۆ شەیتان! (م/د).**

٢٩٠٧- وَعَنْهُ قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجْتَ قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَتَّخَذْتَ أَنْمَاطًا. قُلْتُ: وَأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ قَالَ: أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ. قَالَ جَابِرٌ: وَعِنْدَ امْرَأَتِي نَمَطٌ فَأَنَا أَقُولُ نَحِّيهِ عَنِّي. وَتَقُولُ قَدْ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّهَا سَتَكُونُ[7]:

**دیسان ئەو گوتی: کاتێ ژنم هێنا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: مافوورت هەیە؟ گوتم: مافوورم لە کوێ بوو؟ فەرمووی: دەسا مافوور لەمەولا پەیدا دەبێ جابیر گوتی: ئێستا کە ژنەکەم مافوورێکی هەیە،**

---

[5] كل ما في المجتبى للنسائي على ما في مقدمة التاج صحيح (مترجم).

[6] مسلم. لباس: ٥٤١٩. أبو داود. لباس: ٤١٤٢.

[7] مسلم. لباس: ٥٤١٦. بخاري. نكاح: ٥١٦١. أبو داود. لباس: ٤١٤٥. نسائي. نكاح: ٣٣٨٦.

کە پێی دەڵێم لەمنی دوور وەخە دەڵێ: خۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: لەمەولا پەیدا دەبێ (م/د/ت).

٢٩٠٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ عَنْ أَبِي طَلْحَةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ تَمَاثِيلُ. قَالَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ فسألتها عن هذا فَقَالَتْ: سَأُحَدِّثُكُمْ بِمَا فَعَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّهُ خَرَجَ فِي غَزَاتِهِ فَأَخَذْتُ نَمَطًا فَسَتَرْتُهُ عَلَى الْبَابِ فَلَمَّا قَدِمَ فَرَأَى النَّمَطَ عَرَفْتُ الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِهِ فَجَذَبَهُ حَتَّى هَتَكَهُ وَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَأْمُرْنَا أَنْ نَكْسُوَ الْحِجَارَةَ وَالطِّينَ. قَالَتْ: فَقَطَعْنَا مِنْهُ وِسَادَتَيْنِ وَحَشَوْتُهُمَا لِيفًا فَلَمْ يَعِبْ ذَلِكَ عَلَيَّ. رواهما مسلم وابو داود والترمذي[8]:

زەیدی کوڕی خالید گوتی: ئەبو طەلحە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: فریشتە ناچنە ناو ماڵێ کە سەگ یاخود پەیکەرو وێنەی تیا بێ. زەید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جا چووم بۆ لای عائیشە، وە بۆ ئەم باسە پرسیارم لێ کرد، گوتی: خۆم چیم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دیوە کە لەم بارەیەوە کردوویەتی بۆتانی دەگێڕمەوە، جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچوو بۆ غەزایێ، منیش قاڵیچەیەکم هێناو کردم بە پەردەی سەر دەرگاکە، کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی هاتەوەو قاڵیچەکەی دی روانیم روخساری گرژ بوو لە رووی دیاربوو پێی ناخۆش بوو، جا پەردەکەی راکێشاو دڕاندیو فەرمووی: خودا نەیفەرمووە پێمان کە جلو بەرگ بکەین بۆ بەردو قوڕ! عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئیتر دوو بەرگەپشتیمان لێی بڕیو بە ناواخنی ریشوودار ئاخنیمنەوە، وە بۆ ئەمەیان خراپەی لێم نەگرت (م/د/ت).

---

[8] بخاري. بدء الخلق: ٣٢٢٦ ، ٥٩٥٨. مسلم. لباس: ٥٤٨٤ — ٥٤٨٦. أبو داود. لباس : ٤١٥٣ ، ٤١٥٤ ، ٤١٥٥. نسائي. زينة: ٥٣٦٥.

٢٩٠٩- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَرْكَبُوا الْخَزَّ وَلاَ النِّمَارَ. وَفِي رِوَايَةٍ : لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا جِلْدُ نَمِرٍ. رواهما ابو داود والترمذي[٩]:

**موعاوییه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سواری سەرزینی ئاورێشمو سەرزینی پێستی پڵنگ مەبن لە گێڕانەوەیەکا: هەر کۆمەڵێ پێستی پڵنگیان تیابێ فریشتە هاوڕێییان ناکەن (د/ن).**

٢٩١٠- ومرَّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رِجَالٌ مِنْ قُرَيْشٍ يَجُرُّونَ شَاةً لَهُمْ كَالْحِمَارِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْ أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. قَالَ: يُطَهِّرُهَا الْمَاءُ وَالْقَرَظُ. رواه أبو داود والنسائي[١٠]:

**چەند پیاوێ لە قوڕەیش وەك كەلاكی كەر بەكێش بكەن ئاوا لاكی مەڕێكیان رادەكێشا كە لەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) رەت بوون فەرمووی: پێیان: كاشی كەوڵەكەیتان بگرتایەتەوە گوتیان: ئاخر ئەمە مردارەوەبووە، فەرمووی: ئاوو گڵاسەلەم پاكی دەكاتەوە (د/ن).**

٢٩١١- وَأَتِي النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ أَتَى عَلَى بَيْتٍ فَإِذَا قِرْبَةٌ مُعَلَّقَةٌ فَسَأَلَ الْمَاءَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا مَيْتَةٌ. فَقَالَ: دِبَاغُهَا طُهُورُهَا. رواه ابو داود والنسائي. ولفظه: دَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ دَعَا بِمَاءٍ مِنْ عِنْدِ امْرَأَةٍ قَالَتْ: مَا عِنْدِي إِلاَّ فِي قِرْبَةٍ لِي مَيْتَةٍ. قَالَ: أَلَيْسَ قَدْ دَبَغْتِهَا قَالَتْ: بَلَى. قَالَ: فَإِنَّ دِبَاغَهَا ذَكَاتُهَا[١١]:

**لە غەزای تەبوكا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چووە دیارماڵێ، كوندەیێ هەڵواسرابوو، داوای ئاوی كرد، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە هی پێستی مردارەوە بووە فەرمووی: خۆشەكردنەكەی پاكی دەكاتەوە!**

---

[٩] سكت عن درجته الشارح.

[١٠] سكت عن درجته الشارح.

[١١] سكت عن درجته الشارح.

(د/ن) گفتەی (ن) ئاوایە: لە غەزای تەبووكدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ژنێ داوای ئاوی خواردنەوەی كرد، ژنەكە گوتی: ئاو هەیە لەلام بەڵام لە كوندەیەكایە كە لە پێستی مردار دروست كراوە، فەرمووی: ئەی خۆشەت نەكردووە؟ گوتی: با، فەرمووی: دە خۆشەكردنەكەی لەباتی سەربڕینەكەی!

٢٩١٢- قَالَ أبو داود (رَضيَ اللّهُ عَنْهُ): الجلد إِذَا لَمْ يُدْبَغْ يُسَمَّى إِهَابًا فَإِذَا دُبِغَ سُمِّي شَنًّا وَقِرْبَةً[١٢]:

ئەبو داود (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێستە ئەگەر خۆشە نەكرابێ پێی دەگوترێ كەوڵ، بەڵام كاتێ خۆشە كرا پێی دەگوترێ كوندەو مەشكە!.

## ٥٠) وێنە نادروستەو فریشتە قەدەغە دەكا:
## التصوير حرام ويمنع الملائكة

٢٩١٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فِي الدُّنْيَا كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ. رواه الخمسة إلا أبا داود[١]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ لە جیهاندا وێنەیێ بكێشێ لە رۆژی قیامەتا زەبری لێ دەكرێ كە گیان بكا بە بەری دا وە بۆشی ناكرێ بە بەری دا (ش/ت/ن).

٢٩١٤- وَقَالَ أَبُو زُرْعَةَ (رَضيَ اللّهُ عَنْهُ): دَخَلْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) فِي دَارِ مَرْوَانَ فَرَأَى فِيهَا تَصَاوِيرَ فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ خَلْقًا كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً. رواه الشيخان[٢]:

---

[١٢] أثر صحيح.

[١] بخاري. بيوع، تجريد: ٩٩٤/ ٢٢٢٥ ، ٥٩٦٣ ، ٧٠٤٢ = بەرگی/٣ ل- ٦٥. مسلم. لباس: ٥٥٠٧. نسائی. زينة: ٥٣٧٣.

[٢] بخاري. لباس: ٥٩٥٣ ، ٧٥٥٩. تجريد/ ١٩١٣ = بەرگی ٥ ل — ١٩٨. مسلم. لباس: ٥٥٠٩ — ٥٥١٠.

ئەبو زورعە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا چووم بۆ ماڵی مەڕوان، ئەبو هورەیرە لەوێ چەند وێنەیەکی دی گوتی: ژنەوتم لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێ کە دەچێ دروستکراوێ دروست دەکا وەك دروستکراوانی من ئەگەر ئەوان راست دەکەن‌و درۆ ناکەن فەرموون با میرووچەیێ دروست بکەن، یا گەردیلەیێ دروست بکەن یا تۆمەیێ دروست بکەن، یا دەنکە جۆیێ دروست بکەن (ش).

٢٩١٥- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) دَخَلَ عَلَيّ رَسُولِ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لِي عَلَى سَهْوَةٍ لِي فِيهَا تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ هَتَكَهُ وَتَلَوَّنَ وَجْهُهُ وَقَالَ: يَا عَائِشَةُ أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ. قَالَتْ عَائِشَةُ فَقَطَعْنَاهُ فَجَعَلْنَا مِنْهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ[٣]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام، کولێنێکم هەبوو پەردەم پیادابوو، پەردەکە وێنەی پێوە بوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەی دی دڕی‌و رەنگی گۆڕاو رووی گرژ بوو، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەوانەی کە لەقیامەتا سزاو ئێش‌و ئازاریان لە هەموو کەس سەختترە ئەو کەسانەن کە دەیانەوێ، لاسکایی خودا بکەنەوەو لە شێوەی دروستکراوەکانی ئەو دروست بکەن عائیشە گوتی: ئیتر پەردەکەمان دادڕی‌و سەرینێ دوو سەرینمان لێی دروست کرد (ش).

٢٩١٦- وَعَنْهَا قَالَتْ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ سَفَرٍ وَقَدْ سَتَّرْتُ عَلَى بَابِي دُرْنُوكًا فِيهِ الْخَيْلُ ذَوَاتُ الأَجْنِحَةِ فَأَمَرَنِي فَنَزَعْتُهُ. رواهما الشيخان والنسائي[٤]:

دیسان گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەفەر گەڕایەوە، قاڵیچەیەکم کرد بوو بە پەردەو دابووم بەسەر دەرگاکەمدا، قاڵیچەکە وێنەی

---

[٣] بخاري. لباس: ٥٩٥٤. مسلم. لباس: ٥٤٩٤. نسائی. زینة: ٥٣٧١.

[٤] مسلم. لباس: ٥٤٨٩. بخاري. لباس: ٥٩٥٥.

مـاینی باڵـداری تیـابوو، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) فـەرمانی پـێ کـردم لـە دەرگاکەم کردەوە (ش/ن).

٢٩١٧- وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) فَقَالَ: إِنِّي أُصَوِّرُ هَـذِهِ الـصُّوَرَ فَأَفْتِنِي فِيهَا. فَقَالَ لَهُ ادْنُ مِنِّي. فَدَنَا مِنْهُ ثُمَّ قَالَ ادْنُ مِنِّي. فَدَنَا حَتَّى وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ قَالَ أُنَبِّئُكَ بِمَا سَمِعْتُ، سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: كُلُّ مُـصَوِّرٍ فِـي النَّارِ يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا فَتُعَذِّبُهُ فِي جَهَنَّمَ. وَقَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُـدَّ فَـاعِلاً فَاصْنَعِ الشَّجَرَ وَمَا لاَ نَفْسَ لَهُ. رواه مسلم[٥]:

جـارێ پیـاوێ هاتـە خزمـەتی ئیبنـو عـەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گـوتی: قوربان! من ئەم وێنانە دەکێشم، ئایا تۆ رەوایان دەبینی؟ ئەویش پێی گوت: لـێم وەرە پێـشەوە، پیاوەکـەش چـووە پێـشەوە بـۆ لای، گـوتی: وەرە پـێش تریش، پیاوەکەیش چووە پێشتر، ئینجا دەستی دانـا لەسـەر سـەری‌و گوتی: چـیم بیـستووە ئـەوەت پـێ دەڵـێم، بیـستم لـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفـەرموو: هـەموو، وێنـەگرێ لـە ئـاگری دۆزەخـدا دەبـێ، هەریـەکێ لـەو وێنانـەی کە لـە جیهانـدا دروسـتی کـردوون دەیکـەن بـە کەسـێ‌و دەیکـەن بـە کوڵکیـەوە لـەناو دۆزەخ دا ئەشـکەنجەو ئـازاری دەدا گـوتی: خـۆ ئەگـەر هـەر چارت نیـەو ئـەم ئیشە هەردەکەیت ئـەوا وێنـەی دارو درەخـت‌و ئـەم بابەتانـە دروست بکە، کە بێ گیانن‌و گیان لەبەرنین (م).

٢٩١٨- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ عَنْ أَبِي طَلْحَةَ (رَضِـيَ اللهُ تَعَـالَى عَنهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لاَ تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ الصُّورُ. قَالَ بُـسْرٌ: ثُمَّ اشْتَكَى زَيْدٌ بَعْدُ فَعُدْنَاهُ فَإِذَا عَلَى بَابِهِ سِتْرٌ فِيهِ صُورَةٌ فَقُلْتُ لِعُبَيْدِ اللَّهِ الْخَوْلاَنِيِّ رَبِيبِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلَمْ يُخْبِرْنَا زَيْدٌ عَنِ الصُّوَرِ يَوْمَ الأَوَّلِ فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ أَلَمْ تَسْمَعْهُ حِينَ قَالَ إِلاَّ رَقْمًا فِي ثَوْبٍ. رواه الخمسة[٦]:

---

[٥] بخاري. بيوع: ٢٢٢٥. راجع رقم (١) من هذا التسلسل.

[٦] بخاري. بدء الخلق: ٣٢٢٦ ، ٥٩٥٨. مسلم. لباس ٥٤٨٤. أبو داود. لباس: ٤١٥٣ ، ٤١٥٤ ، ٤١٥٥. نسائي. زينة: ٥٣٦٥.

لە بوسری کوڕی سەعیدەوە، لە زەیدی کوڕی خالیدەوە، لە ئەبو طەلحەوە (خودای گەورە لێیان خۆش نوود بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودو صەلاتو سەلامی خودای مەزنی لەسەربێ). دەفەرموێ: فریشتە ناچنە ناومالی کە وێنەی تیا بێ! بوسر گوتی: لە پاشا زەید نەخۆش کەوت ئێمەش چووین بۆ سەردانی، کە تەماشامان کرد پەردەیێ گیراوەتەوە بە دەرگاکەیەوە، وێنەی پێوە بوو منیش گوتم بە عوبەیدوڵلای زڕکوڕی مەیموونەی خێزانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ): ئەی ئەو رۆژە زەید خۆی باسی خراپی وێنەی بۆ نەکردین کەوابوو ئەم وێنانە چییە بەم پەردەیەوە؟ عوبەیدوڵلا گوتی: ئەی گوێت لێ نەبوو کە گوتی: مەگەر نەخشێ کە بە جل‌و بەرگەوەبێ (ش/د/ت/ن).

٢٩١٩- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) وَاعَدَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ فِى سَاعَةٍ يَأْتِيهِ فِيهَا فَجَاءَتْ تِلْكَ السَّاعَةُ وَلَمْ يَأْتِهِ وَفِى يَدِهِ عَصًا فَأَلْقَاهَا مِنْ يَدِهِ وَقَالَ: مَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلاَ رُسُلُهُ. ثُمَّ الْتَفَتَ فَإِذَا جِرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ سَرِيرِهِ فَقَالَ يَا عَائِشَةُ مَتَى دَخَلَ هَذَا الْكَلْبُ هَا هُنَا. فَقَالَتْ وَاللَّهِ مَا دَرَيْتُ. فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ. زَاد فِي رواية: ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَنَضَحَ بِهِ مَكَانَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَاعَدْتَنِى فَجَلَسْتُ لَكَ فَلَمْ تَأْتِ. فَقَالَ مَنَعَنِى الْكَلْبُ الَّذِى كَانَ فِى بَيْتِكَ إِنَّا لاَ نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ. رواه الثلاثة[7]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جوبرائیل (سڵاوی لەسەربێ) بەڵێن دەدا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە لەکاتێکی ناوبراودا بچێ بۆ لای، کاتی بەڵینەکە دێ کەچی جوبرائیل نایێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) داردەستێکی بە دەستەوەبوو داردەستەکەی هەڵداو فەرمووی: نەخوداو نە فروستادەکانی خودا لە بەڵێن‌و گفتی خۆیان پاش گەز نابنەوە کەواتە دەبێ هۆی چی بێ کەوا جوبرائیل لەکاتی بەڵێنەکەی دا نەهات؟ لە پاشا هەر کە ئاوڕی دایەوە تووتەڵە سەگێکی دی لەژێر تەختی نوستنەکەی خۆی دابوو،

---

[7] مسلم. لباس: ٥٤٧٨ — ٥٤٨٠. أبو داود. لباس: ٤١٥٧. نسائی. صید: ٤٢٩٤.

فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەم سەگە کەی هاتۆتە ئێرەوە؟ ئەویش گوتی بەخودا نازانم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری دا سەگەکە کرایە دەرەوە لە گێڕانەوەیەکا: ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوی هەڵگرت و پرژاندی لە جێگەکەی، ئیتر جوبرائیل هات، پێی فەرموو: تۆ گفتت دا پێم کە بێیت و من لەکاتی دیاریکراودا چاوەنواڕیم کردی کەچی نەهاتیت جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو سەگە نەیهێشت بێم کە لەماڵەکەتا بوو، چونکە سەگ و وێنە لەهەر ماڵێکا بن ئێمە تێی ناچین! (ش/د).

٢٩٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَأْذَنَ جِبْرِيلُ - عَلَيْهِ السَّلَامُ - عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ادْخُلْ. فَقَالَ: كَيْفَ أَدْخُلُ وَفِي بَيْتِكَ سِتْرٌ فِيهِ تَصَاوِيرُ فَإِمَّا أَنْ تُقْطَعَ رُءُوسُهَا أَوْ تُجْعَلَ بِسَاطًا يُوطَأُ فَإِنَّا مَعْشَرَ الْمَلَائِكَةِ لاَ نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ تَصَاوِيرُ. رواه النسائي وصاحباه (بسندٍ صحيحٍ)[٨]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) ڕوخصەت دەخوازێ لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە بچێتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: وەرە ژوورەوە ئەویش دەفەرموێ: جا چۆن بێمە ژوورەوە لە کاتێکا کە ئەو پەردەی لەناو ماڵەکەتا هەیە وێنەی پێوەیە، ئەوە یا دەبێ سەری وێنەکان بقرتێ، یا دەبێ بکرێن بەڕایەخ و ڕابخرێن لەژێر پێدا، چونکە ئێمە - کە کۆمەڵەی فریشتەین - ناچینە ناوماڵێ کە وێنە گەلێ تیا بێ! (ن/د/ت-س/ص).

٢٩٢١- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَكُنْ يَتْرُكُ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا فِيهِ تَصَالِيبُ إِلاَّ نَقَضَهُ. رواه البخاري وأبو داود. والله أعلم[٩]:

---

[٨] بسند صحيح.

[٩] بخاري. لباس: ٥٩٥٢.

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەرچی لەناو ماڵەکەی دا وێنەی پێوە بوایە وازی لێ نە دەهێنا تا کوێری نەکردایەتەوە! (ب/د).

٢٩٢٢- لأهمية هذا المبحث في يومنا هذا ننقل مايلي[١٠]:

١- قال المؤلف (رضوان الله عليه) في شرحه على التاج: فيه (أي في قوله إلا رقما في ثوب) جواز رقم الحيوان في الثوب، ويقاس عليه الصورة الفوتوغرافية (أي الصورة الشمسية أو التصوير الشمسي) إذا كانت لحاجةٍ وقال (رحمة الله تعالى عليه): وحاصل ما في المقام أنَّ تصوير الحيوان حرامٌ ولو نقشا ولو عضوا منه لأنه مضاهاةٌ لخلق الله تعالى بخلاف تصوير غير الحيوان فلا شيء فيه، أما الإقتناء ففيه تفصيلٌ، إن كانت الصورة مجسمةً كاملةً فهي حرامٌ وإن كانت ناقِصةً بحالٍ لا تعيش بها فلا، وإن كانت نقشاً فجائزةٌ مع الكراهية، وهذا كُلُّه في غير لُعبة الأطفال أما هي فجائزةٌ ولو مجسمةً كاملةً.

٢- وأقول (أنا المترجم): إنَّ ما تعارف عليه الناس اليوم من مثل السفور والتبرج واقتناءِ الصور الخلاعية الماجنة وتعاطي وارتياد الملاهى والمسارح ودور السينما والأماكن الغير المحتشمة والربا والقمار والخمور ومصافحة المرأة مع الرجل واختلائهما وإنتشار أنواع الحيل والدجل بين الكسبة أهل السوق إن كل هذا وغيره مما تعارف عليه الناس فيما بينهم وتعودوه وطبعوا عليه لدرجة ينكر على من ينكر عليهم إن كل هذا لا تأثير له في تغيير حكم التحريم الثابت في الشريعة بالكتاب والسنه، لأنَّ الإجماع على الباطل ليس في شيءٍ من الإجماع الشرعي، وأقول (وبالله تعالى توفيقي وعليه توكلي ورضاه غايتي وخدمة البلاد والعباد بغيتي ونُغْيَتِي): ليس كما يدعي الماديون والد هريون والزنادقة أن كل ما كان فيه مصلحة البشر فهو شرعهم

وقانونهم الطبيعي ولا التفات إلى ما سواه، إذ قال الله تعالى موضحا الغاية السامية من خلق الإنسان: وما خلقت الجن والإنس إلاَّ ليعبدون (٥١/٥٦) وقال العلماء (رضوان الله تعالى عليهم وجعلنا بكرمه ومنه من خدام تراب أقدامهم): إن الأصلح للبعد ليس بواجب على الله. أقول (وأعوذ بالله من أن أكون قائل زورٍ أو ناشر باطلٍ): إنَّ المتتبع اليقظ الفهم يلاحظ بحق: أنه كلما أسرف في حظ الجسد كان على حساب حظ الروح والعكس صحيحٌ كلا وجزءً، فعليه أستنتج مما تقدم في هذا المبحث ما يلي:

آ) اجتنب أيها المسلم ما استطعت من الصور والتصورير، فالمسلم التقي الورع الصالح الحاذق يتقي دوما مواضع التهم ويحاذر أن ينزلق في المزالق.

ب) لا بأس بالإستفادة الشرعية والقانونية من استخدام الصور الشمسية في المسائل الإدارية والفنية والعلمية والطبية الصرفة البحتة، ومنها ما يثبت على الهويات والأسناد، ومنها ما يطبع على الرقوق الشعاعية المختلفة الأنواع ولمختلف الأغراض الدنوية من علمية وطبية وجمالية، وليس منها بأي حال من الأحوال الأفلام السينمائية والتلفزيونية الحالية، لأنها دعوة صارخةٌ إلى تأليه الهوى وإلى العرى والتعري وإلقاء حجاب الحشمة وهتك ستُر الحياء ورمي الكلام على عواهنه وخلط الحلال بالحرام، والله العظيم إنني لأحمد الله واشكره على حلمه وصبره كيف لا يأمر السماء أن تقع على الأرض، وذلك عندما أشاهد ما تنشره تلك الدور الداعرة من أنواع الدعارة والميوعة والمجونة. أخي القاريء الكريم، لقد طال البحث، ولكن الأمر كما تعلم يستوجب ذلك، وحيث إن الغاية هي الإفادة الدينية ونفع الإسلام وأهله وهي حاصلةٌ بالنص العربي وبغية الإختصار المطلوب نكتفي من ترجمته بما يلي:

١- رەسم‌و وێنەگرتنی گیاندار حەرامەو ناڕەوایە، چونكە لاسكایی كاری خودایە، ئەمە لە پیاوی لە خودا ترسی باش ناوەشێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر قەبارەو بارستایی هەبێ.

٢- رەسم‌و وێنەگرتنی هەموو شتێ (گیانلەبەری لێ دەرچێ) دروستەو هیچی تیا بەستە نیە، ئەگەر چی موسوڵمان چەندە دەتوانێ خۆی بپارێزێ باشترە.

٣- دانان‌و هەڵواسینی وێنە ئەگەر تەواوو جەستە دار نەبێ‌و لەسەر شێوەیەكی وابێ كە خاوەنەكەی لەسەر ئەو شوێوەیە نەژی ئەوە حەرام نییەو دروستە، بەڵام یارۆچكەی مناڵان بارستە داریش بێ قەیناكا، واتە مجسَّمیش بێ قەیناكا، تەواویش بێ قەیناكا.

٤- وێنەی موعامەلاتی رەسمی لەبەر ناچاری قەیدی نیە، وێنەی یادگاریش بەربەندی ژمارە سێی ئەم تەرجەمەیە دەكەوێ.

٥- هەر وێنەیێ لەسەر هەر شێوەیێ بێ، وەهی هەر چشتێ بێ بە مەرجێ ببێ بە هۆی خراپەو ببێ بە هەوێنی بێ وێڵێ‌و بەمایەی پیسی‌و پۆخڵی كۆمەڵ‌و سەربكێشێ بۆ دوور كەوتنەوە لە رەزای خوداو پیاو بێ ئاگا بكا لە تەعەتی خودا ئەوە حەرامە.

٦- كورت‌و پوخت بەكوردی پەتی (هەر وێنەیێ سوودی رەوای ئایینی، یا ژیانی مرۆڤی تیادابێ رەوایە، دەنا نا). (وەرگێڕ)

### ٥١) دوا وتار: بۆنی خۆش زۆر پەسەندە : (خاتمة: يستحب الطيب)

٢٩٢٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ، وَيَزعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ. رواه الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ : مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ طِيبٌ فَلاَ يَرُدَّهُ فَإِنَّهُ طَيِّبُ الرِّيحِ خَفِيفُ الْمَحْمَلِ[1]:

---

[1] مسلم. ألفاظ: ٥٨٤٤. أبو داود. ترجل: ٤١٧٢. نسائى. زينة: ٥٢٧٤.

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بۆنی خۆشی نەدەدایە دواوە، لەبەر ئەمە ئەنەس خۆشی بۆنی خۆشی نەدەدایە دواوە! (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: کەسێ بۆنی خۆشی پێشکەش کرا با دەستی پێوە نەنێ، چونکە سەرەڕای بۆنە خۆشەکەی هەڵگرتنیشی ئاسان‌و خۆشە.

٢٩٢٤- وللترمذي: ثَلاَثَةٌ لاَ تُرَدُّ الوسائد، والطيب، واللبن[٢]:

تیرمذی دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەم سێ شتە نادرێتە دواوە: پشتی‌و بۆنی خۆش‌و شیر.

٢٩٢٥- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُكَّةٌ يَتَطَيَّبُ مِنْهَا. رواه أبو داود[٣]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ)، گوڵاودانێکی هەبوو لە گوڵاوەکەی دەدا لە خۆی (د).

٢٩٢٦- وللترمذي – على ما هو في الشرح – إِذَا أُعْطِيَ أَحَدُكُمُ الرَّيْحَانَ فَلاَ يَرُدَّهُ فَإِنَّهُ خَرَجَ مِنَ الْجَنَّةِ[٤]:

لە گێڕانەوەیەکا بە پێی شەرحەکە دەڵێ، تیرمزی دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر ڕێحانەو گوڵ‌و گیای بۆن خۆشیان دا پێتان ڕەتی مەکەنەوە، چونکە ئەوانە لە بەهەشتەوە هاتوون[١]!

---

[٢] سكت عنه الشارح.

[٣] سكت عنه الشارح.

[٤] سكت عن درجته الشارح.

[١] بەندە لە مەدحی شەهیدو وەسپی بۆنی خۆشا گوتوومە:

ڕێحانـــــــە ڕەشــــــە بۆیــــــە ڕەشپۆشــــــە

لەگـــــەڵ نەوەیـــــشا وا بـــــۆنی خۆشـــــە

تـــــا دەســـــتکیرانی خـــــۆیی پـــــێ ڕەش کـــــا

**٢٩٢٧- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا) طَيَّبْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِيَدَيَّ بِذَرِيرَةٍ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، لِلْحِلِّ وَالإِحْرَامِ[٥]:**

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە حەجولویداعا بە دەستی خۆم تۆزی زەریرەم دەدا لە جەستەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە تۆزێكی بۆن خۆش بوو لە هیندەوە دەهات هەم بۆكاتی ئیحرام شكاندنیو، هەم بۆ كاتی ئیحرام دابەستنی (ش).**

**٢٩٢٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عِنْدَ إِحْرَامِهِ بِأَطْيَبِ مَا أَجِدُ. رواهما الشيخان[٦]:**

**دیسان گوتی: لەكاتی ئیحرام دابەستنی پێغەمبەرا (دروودی خودای لەسەربێ) خۆشترین بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) (ش).**

**٢٩٢٩- وَعَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِأَطْيَبِ مَا يَجِدُ، حَتَّى أَجِدَ وَبِيصَ الطِّيبِ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ. رواه الخمسة[٧]:**

**لە گێرانەوەی ئێرەدا ئاوایە: دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران خۆشترین بۆنی خۆشم دەدا لەسەرو ریشو لەشی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەنانەت گەلێ جار ئەوەندە بە تۆخی لێم دەدا، بریقەی بۆ نەكەم دەدی بە سەرو ریشیەوە (ش/د/ت/ن).**

**٢٩٣٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: إِذَا اسْتَعْطَرَتِ الْمَرْأَةُ فَمَرَّتْ عَلَى الْقَوْمِ لِيَجِدُوا رِيحَهَا فَهِيَ كَذَا وَكَذَا (اي زانية) قَالَ قَوْلاً شَدِيدًا. رواه أصحاب السنن (بسند صحيح)[٨]:**

---

**كاتی سەردانی، گۆڕی بۆن خۆش كا**

**(وەرگێڕ)**

[٥] بخاري لباس: ٥٩٣٠. تجريد/٥/ ل-١٩٧ز: ١٩١١/ ٥٩٣٠ + ز: ٧٣٩/ ١٥٣٩ = بەرگی/ ٢ ل- ١٦٤. مسلم. حج: ٢٨٢٠.

[٦] بخاري. لباس: ٥٩٢٨. مسلم. حج: ٢٨٢١ — ٢٨٢٣.

[٧] بخاري. حج: ١٥٣٨. مسلم. حج: ٢٨٢٤. نسائي. مناسك الحج: ٢٦٩٣ ، ٢٦٩٤ ، ٢٦٩٥.

**ئەبو مووسا** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر ئافرەتێ گولاو لە خۆی بداو لەلای پیاوانەوە بڕوا تا بۆنی بچێ بەسەریانا ئەوە ئەو ئافرەتە واوا لێكراوە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **قسەیەكی زۆر توندو تیژی پێگوت واتە: پێی گوت داوێن پیسە (د/ت/ن-س/ص).**

**٢٩٣١- وَقَالَ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْعِشَاءَ فَلاَ تَمِسّ طَيِّبًا.** رواه النسائي وابو داود[٩]:

**پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: كاتێ كە ژنێ لە ئێوە دەچێ بۆ نوێژی خەوتنان بۆ جەماعەت با بۆنی خۆش لە خۆی نەدات‌و خۆی بۆن خۆش نەكا چونكە شەو جێگەی گومانە (ن/د).**

**٢٩٣٢- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ أللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ تَقْرَبُهُمُ الْمَلاَئِكَةُ جِيفَةُ الْكَافِرِ وَالْمُتَضَمِّخُ بِالْخَلُوقِ وَالْجُنُبُ إِلاَّ أَنْ يَتَوَضَّأَ.** رواه أبو داود[١٠]:

**عەمماری كوڕی یاسیر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەم سێ كەسە فریشتەی رەحمەت توخنیان ناكەون: كەلاكی كافرو، پیاوێ كە بۆنی ژنان لەخۆی بداو وەك ژن خۆی سوورو سپیاو بكا، لەشپیس تا دەسنوێژ دەگرێ (د-سند صالح).**

**٢٩٣٣- وَأَبْصَرَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **رَجُلاً مُتَخَلِّقًا، قَالَ: اذْهَبْ فَاغْسِلْهُ ثُمَّ اغْسِلْهُ وَلاَ تَعُدْ**[١١]:

---

[٨] حديث صحيح.

[٩] سكت عن درجته الشارح.

[١٠] بسند صالح (شرحه).

[١١] بسند حسن (شرحه).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی بەرچاو کەوت خەلووقی[1] لەخۆی دابوو، پێی فەرموو: بڕۆ باش باش بیشۆرەو جارێکی تر شتی وا مەکەرەوە (ت-س/ح).

٢٩٣٤- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ خَيْرَ طِيبِ الرَّجُلِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ وَخَيْرَ طِيبِ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ. رواهما الترمذي بسندين حسنين. نسأل الله أن يُجملنا بالتقوى والذكرى الحسنة[12]:

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: باشترین بۆنی خۆش بۆ پیاوان ئەو بۆنەیە کە بۆنەکەی دیاری بێو ڕەنگەکەی شاراوە بێ، وە باشترین بۆنی خۆش بۆ ژنان ئەوەیە کە ڕەنگەکەی دیاربێو بۆنەکەی شاراوەبێ (ت-س/ح).

دانەر (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نوورو ڕەحمەتی خودای مەزن بێ) لێرەدا دەڵێ: لە خودا داوا دەکەین بە بەرگی ڕازاوەو جوانی تەقواو ترسی خودا پۆشتەمان بکاتەوە، وە هەروەها کاڵای یادگاری جوانو ناوی باش بمانرازێنێتەوە. منیش دەڵێم: ئامین ئەی خودای میهرەبان! هەروەك دەڵێم لە پەسنی خۆیو تاجەکەی دا:

یادگاری جوانی، یادی مەردانی

ڕۆشنایی چاوی، مۆمی مۆمدانی!

(وەرگێڕ)

---

[1] خەلووق جۆرە بۆنێکی خۆشی ژنانەیە، لە زەعفەرانو شتی تر دەگیرێتەوە سوورباو دەنوێنێ. کەرکوك – م.ك.ع = مستشفى كركوك العسكرى - ١٩٨٤/٥/١٩ - وەرگێڕ -

[12] رواه الترمذي بسند حسن.

# نامەی پزیشکیو نووشتەو نزاو دۆعا

(ئەم نامەیە پێشەکییەكو چوار بەشو دوا وتارێکە)

## ٥٢) پێشەکیی لەبارەی خێرو بەهرەی نەخۆشیو ئارام گرتن لەژێر باری نەخۆشی دا:

## كتاب الطب والرمی (وفیه مقدمة وأربعة فصول وخاتمة)

## مقدمة في فضل الأمراض والصبر عليها

٢٩٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمٍّ وَلاَ حُزْنٍ وَلاَ أَذًى وَلاَ غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا، إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ. رواه الشيخان[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر شەکەتیو کفتیو نەخۆشیو پەژارەو خەمو خەفەتو ئێشو ئازارێ کە تووشی موسوڵمان دەبێ خودا دەیانکات بە سەرپۆشو پەردەو (کەففارەت)و برێتیی گوناهەکانی، تەنانەت دڕکێکیش کە لە شوێنێکی هەڵچەقێ دەبێ بە کەفارەتی گوناهێ. (ش).

٢٩٣٦- وَدَخَلَ شَبَابٌ مِنْ قُرَيْشٍ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) وَهِيَ بِمِنًى وَهُمْ يَضْحَكُونَ فَقَالَتْ: مَا يُضْحِكُكُمْ؟ قَالُوا: فُلاَنٌ خَرَّ عَلَى طُنُبِ فُسْطَاطٍ فَكَادَتْ عُنُقُهُ أَوْ عَيْنُهُ أَنْ تَذْهَبَ. فَقَالَتْ لاَ تَضْحَكُوا فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً فَمَا فَوْقَهَا إِلاَّ كُتِبَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ وَمُحِيَتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ. رواه مسلم (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) آمين[2]:

چەند لاوێکی قورەیشی بەدەم پێکەنینەوە لەمینا چوون بۆ لای عائیشە (خودای لێ رازی بێ) پێی گوتن: بۆچی پێ دەکەنن؟ گوتیان: فیسارەکەس قاچی لە گوریسی چادرێ هەڵکەوت خەریکبوو ئەستۆی بشکێ - یا وەخت بوو چاوی

---

[1] بخاري. مرضى تجريد/٥ م١٥٣ ز: ١٨٥٧ / ٥٦٤١ ، ٥٦٤٢. مسلم. بروصلة: ٦٥١٣ ، ٦٥٠٦ - ٦٥١٣ ترمذی. جنائز: ٩٦٦.

[2] مسلم. بر وصلة: ٦٥٠٦.

کوێر ببێ – عائیشە گوتی: پێمەکەنن، چونکە من لە پێغەمبەرم ژنەوتووە (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ تووشی هەرچی ئازارێ ببێو هەر ناخۆشیەك بێتەڕێی – لە تێ هەڵچەقینی دڕکێکەوە بیگرە هەتا زیاتر – خودا بەهۆی ئەوەوە پایەیەکی بەرزی دەداتێو گوناهێکیشی لێ هەڵ دەوەرێنێ (م).

٢٩٣٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُصِبْ مِنْهُ[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ کە خودا خواستی باشی پێی هەبێو بیەوێ تووشی خێر ببێ، تووشی ئێشو ئازاری دەکا (ب–خودایان لێ رازی بێ).

٢٩٣٨- وَقَالَ عَائِشَةَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهَا) مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشَدَّ عَلَيْهِ الْوَجَعُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواهما البخاري[٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: نەم دیوە کەسی تر وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوا ئازاری سەخت بێ (ب).

٢٩٣٩- وَقَالَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُ): دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يُوعَكُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا. قَالَ: أَجَلْ إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلاَنِ مِنْكُمْ. قُلْتُ: ذَلِكَ بِأَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ قَالَ: أَجَلْ ذَلِكَ كَذَلِكَ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا، إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا سَيِّئَاتِهِ، كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا. رواه الشيخان (عليهما الرحمة والرضوان)[٥]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەخۆش بوو چووم بۆ سەردانی، تایەکی گرانی لێ هاتبوو، عەرزیم کرد: ئەی

---

[٣] بخاري. مرضى: ٥٦٤٥.

[٤] بخاري. مرضى تجريد/ ١٥٤/٥ ذ: ١٨٦ / ٥٦٤٦ . مسلم. بروصلة:

[٥] بخاري. مرضى تجريد/ ٥/ ل- ١٥٥ ذ: ١٨٦١ / ٥٦٤٧ ، ٥٦٤٨ ، ٥٦٦٠ ، ٥٦٦٧. مسلم. بروصله: ٦٥٠٤.

پێغەمبەری خودا! تایەکی گران دایگرتوویت، فەرمووی: ئەدی وایە، من کە تا دام دەگرێ بەقەد دووپیاو لە ئێوە تا دام دەگرێ. گوتم: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە تۆ دووقات پاداشت بۆ هەیە، فەرمووی: بەڵێ ئەوە وایە، هەر موسوڵمانێ هەر ئێشو ئازارێکی بێتە رێ – لە درکێکەوە بیگری هەتا زیاتر – بەهۆی ئەوەوە خودا خراپەکانی دا دەپۆشێ، تا لە ئەنجاما موسوڵمان لە گوناه پاك دەبێتەوە وەك چۆن گەڵای درەختێ سەرپاك هەڵوەرێ ئاوا (ش).

٢٩٤٠– وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّمَا مَثَلُ الْمَرِيضِ إِذَا بَرَأَ وَصَحَّ كَالْبَرْدَةِ تَقَعُ مِنَ السَّمَاءِ فِي صَفَائِهَا وَلَوْنِهَا. رواه الترمذي[٦]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کە نەخۆش چاك دەبێتەوەو لە نەخۆشینەکەی هەڵدەسێتەوە، وەك چۆن دەنکە تەرزە کە لە ئاسمان دەبارێ بێ گەردەو رەنگی پاکە ئەویش ئاوا لە گوناه پاك دەبێتەوە (ت–خودای لێ رازی بێ).

٢٩٤١– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أُمِّ السَّائِبِ فَقَالَ: مَا لَكِ يَا أُمَّ السَّائِبِ تُزَفْزِفِينَ؟ قَالَتِ: الْحُمَّى لاَ بَارَكَ اللَّهُ فِيهَا. فَقَالَ: لاَ تَسُبِّي الْحُمَّى فَإِنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ كَمَا يُذْهِبُ الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ. رواه مسلم[٧]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ لای ئوممو سائیب،، فەرمووی: ئەی ئوممو سائیب! ئەوە چیتە وا هەڵ دەچۆقیت؟ گوتی: تام لێ هاتووە، خودا لێی هەڵپێچێ و پیتی بەرێ بەحەوادا، فەرمووی: جنێو بە تا مەدە چونکە تا گوناهی ئادەمیزاد لا دەبات وەك چۆن مووشەدەمە چڵكو ژەنگی ئاسن لا دەبات (م).

---

[٦] سكت عنه الشارح.

[٧] مسلم. البر والصلة: ٦٥١٥.

٢٩٤٢- وَعَادَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً مِنْ وَعَكٍ كَانَ بِهِ فَقَالَ: أَبْشِرْ فَإِنَّ اللَّهَ يَقُولُ هِيَ نَارِي أُسَلِّطُهَا عَلَى عَبْدِي الْمُذْنِبِ لِتَكُونَ حَظَّهُ مِنَ النَّارِ. رواه الترمذي[٨]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ چوو بۆ سەردانی پیاوێکی تادار پێی فەرموو: موژدەت لێ بێ کە خودا دەفەرموێ: تا ئاگری خۆمە، زاڵی دەکەم بەسەر بەندەی گوناهباری خۆما لە جیاتی بەشە ئاگری دۆزەخێ! (ت).

٢٩٤٣- عَنْ عَطَاءٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا): أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ لِي. قَالَ: إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ. فَقَالَتْ أَصْبِرُ. فَقَالَتْ: إِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا. رواه الشيخان[٩]:

عەطاء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) پێی گوتم: با ژنێکی بەهەشتیت پیشان بدەم، گوتم: ئادەی فەرموو، گوتی: ئەم ژنە رەشە هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد قوربان من فێم لێ دێو کاتێ پەرکەمەکە دەمگرێ گیانم دەردەکەوێ لە خودا بپارێرەوە بۆم پێی فەرموو: ئەگەر حەز دەکەی ددان بگرە بە خۆتاو ئۆقرە بگرەو بەهەشت بۆ تۆ، ئەگەر حەزیش دەکەی لە خودا دەپارێمەوە بۆت کە چاکت بکاتەوە! گوتی: باشە ئارام دەگرم لە ژێر باری خودادا وەلێ لەکاتی خوو لێ هاتنەکەدا لەشم دەردەکەوێ، لەخودا بپارێرەوە بۆم کە ئیتر لەوکاتەدا لەشم دەرنەکەوێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ ئەوە نزای بۆ کرد (ش).

---

[٨] سكت عن درجته الشارح.

[٩] بخاري. مرضى. تجريد بخاري: ١٥٥/٥ ژ: ١٨٦٢ / ٥٦٥٢. مسلم. بروصلة: ٦٥١٦.

٢٩٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى. قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ. رواه الشيخان هنا والترمذي في الزهد. نسأل الله أن يشفينا من الأمراض الجسميَّة والقلبية، آمين[١٠]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): خودای گەورە دەفەرموێ: كاتێ دووچاوە بەو شیرینیو نازدارییە لە بەندەی خۆمم سەندەوەو گیرۆدەی داوی كوێریم كردو ئەویش مەردانە لە ژێرباری تاقی كردنەوەی مندا ددانی گرت بە خۆی داو بە بەشی من رازی بوو، ئەوە منیش هەقی بۆ دەكەمەوەو لە باتی ئەو دووچاوە لە قیامەتا بەهەشتی دەدەمێ! (ش/ت).

## ٥٣) پاداشی ئارامیو ددان بە خودا گرتن لەكاتی تاعووندا
## أجر الصبر في الطاعون

٢٩٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمَبْطُونُ شَهِيدٌ، وَالْمَطْعُونُ شَهِيدٌ[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): كەسێ بەدەردی سك بمرێ شەهیدە، ئەوەی بە تاعوون بمرێ شەهیدە (ب).

٢٩٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الطَّاعُونِ فَأَخْبَرَهَا أَنَّهُ كَانَ عَذَابًا يَبْعَثُهُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ، فَجَعَلَهُ اللَّهُ رَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ، فَلَيْسَ مِنْ عَبْدٍ يَقَعُ الطَّاعُونُ فَيَمْكُثُ فِي بَلَدِهِ صَابِرًا، يَعْلَمُ أَنَّهُ لَنْ يُصِيبَهُ إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ، إِلاَّ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ الشَّهِيدِ. رواهما البخاري[٢]:

---

[١٠] بخاري. مرضى: ٥٦٥٣.

[١] بخاري. طب: ٥٧٣٣.

[٢] بخاري. طب: ٥٧٣٤.

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: لە بارەی تاعوونەوە پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، فەرمووی پێم: تاعوون جۆرە سزایەکە خودا دەینێرێ بۆ سەر ئەو کەسانەی کە خۆی ئارەزووی هەبێ، بەڵام خودا ئەم پەتایەی کردووە بە رەحمەتو بەهۆی شەهید بوون بۆ موسوڵمانان، ئیتر لەهەر وڵاتێ کە تاعوون دەکەوێتەوە، هەر بەندەیێ لە شارەکەی خۆیدا بمێنێتەوەو لەبەر باری خودادا ئارامو ئۆقرە بگرێو بە بەشی خودا رازی بێو پاداشی باشی خۆی لە خودا داوا بکا وە لە هەمان کاتدا بزانێ ئەوەی کە خودا لە چارەیی نە نووسیبێ قەت تووشی نابێ، ئەوە ئەو بەندەیە بەقەد پاداشی شەهیدێ پاداشی بۆ هەیە (ب).

٢٩٤٧- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): الطَّاعُونُ رِجْسٌ أَوْعَذَابٌ أُرْسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَوْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تاعوون وەێیکە یا فەرمووی: تاعوون سزایەکە خودا ناردی بۆ سەر نەوەی ئیسرائیل یا فەرمووی: ناردی بۆ سەر نەتەوەیێ لە نەتەوەکانی پێش ئێوە جا ئەگەر دنیابوو بیستتان کەوا تاعوون لە شوێنێ داکەوتووە ئێوە مەچن بۆ سەری بۆ ئەوێ، کاتێ لە شوێنێکیش داکەوت کە ئێوە لەوێ بوون ئەوە دەرمەچن لەوێو لە دەستی رامەکەن (ش/ت).

٢٩٤٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) خَرَجَ إِلَى الشَّامِ حَتَّى إِذَا كَانَ بِسَرْغَ لَقِيَهُ أَهْلُ الأَجْنَادِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ. فَقَالَ عُمَرُ لاِبْنُ عَبَّاسٍ: ادْعُ لِيَ الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ. فَدَعَوْتُهُمْ فَاسْتَشَارَهُمْ وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ فَاخْتَلَفُوا فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ

---

[٣] بخاري. طب: ٥٧٢٩ ، ٥٧٣٠. مسلم. سلام: ٥٧٤٥.

نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ. فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّى. ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِيَ الأَنْصَارَ فَدَعَوْتُهُمْ لَهُ فَاسْتَشَارَهُمْ فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ. فَقَالَ ارْتَفِعُوا: عَنِّى. ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ. فَدَعَوْتُهُمْ فَلَمْ يَخْتَلِفْ عَلَيْهِ رَجُلاَنِ فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ وَلاَ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ. فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ: إِنِّى مُصْبِحٌ عَلَى ظَهْرٍ )أى إِنِّي رَاجِعٌ إِلَى الْمَدِينَةِ فِي الصَّبَاحِ عَلَى رَاحِلَتِي) فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللَّهِ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ - وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُ خِلاَفَهُ - نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ إِلَى قَدَرِ اللَّهِ. أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ فَهَبَطْتَ وَادِيًا لَهُ عِدْوَتَانِ إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي مِنْ هَذَا عِلْمًا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ. قَالَ: فَحَمِدَ اللَّهَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ثُمَّ انْصَرَفَ. رواه الشيخان[٤]:

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: عومەر (خودای لێ رازی بێ) کەوتەرێو چوو بۆ شام، کە گەیشتە سەرغ لەوێ فەرمانداره‌کانی سەرگەورە شارەکانی شام، کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحو هاورێکانی بوون لەوێ هاتن بە پیریەوەو عەرزیان کرد: کەوا تاعوون لە شام بڵاوبۆتەوە، جا عومەر گوتی بەمن: کۆچکارە پێشینەکانم بۆ بانگ کە، منیش بانگم کردن، جا عومەر بۆ ئەم باسە راوێژی پێ کردن بەڵام قسەیان یەك نەبوو، هەندێکیان دەیان گوت: تۆ هاتووی بۆ کارێکی وا لەبەر ئەوە بە باشی نازانین کە نەچیو بگەڕێیتەوە، هەندێکی تریان دەیانگوت: تۆ هاوڕێیانی پێغەمبەرو خەڵکی تریشت لەگەڵ دایە، لەبەر ئەوە ئێمە بە باشی نازانین کە بیان بەیت بۆ ناو ئەم پەتایە، عومەریش گوتی: دەورم چۆڵ کەن، ئینجا بە منی گوت: یاریدەدەرانم بۆ**

---

[٤] بخاري. طب: ٥٧٢٩. مسلم. سلام: ٥٧٤٥.

بانگ کە، منیش بانگیانم کرد بۆی، راوێژی بەوانیش کرد، ئەوانیش وەك کۆچکاران قسەیان یەك نەبوو، جا بەوانیشی گوت، دەورم چۆڵ کەن، ئینجا گوتی: کێ لێرەیە، لە پیرەمێردانی قورەیش، ئەوانەی کە لەکاتی فەتحی مەککەدا کۆچیان کردووە، ئەوانەم بۆ بانگ کە، جا کە بانگم کردن سەرجەم گوتیان: ئێمە رامان وایە کە خەڵکەکە بگێریتەوە بۆ دواوەو نەیان بەیت بۆ ناو ئەم پەتایە، ئیتر عومەر جاڕی دا بەناو عەشاماتەکەدا: کە سبەینێ سەر لە بەیانی سوار دەبینو دەگەڕێینەوە بۆ مەدینە، ئەبو عوبەیدەیش گوتی: ئایا لە دەست چارەنووسی خودا هەڵدێن؟ عومەریش گوتی: ئەی ئەبو عوبەیدە! کاشکی کەسێکی تر ئەم قسەیەی بکردایە، عومەر حەزی نەدەکرد کە بێ دڵی ئەبو عوبەیدە بکا، ئینجا گوتی: بەڵێ، لە دەست چارەنووسی خودا رادەکەین بۆ لای چارەنووسی خودا خۆی! ئەدیی پێم بڵێ ئەگەر تۆ رانێ وشترت هەبێو بچیتە ناو دۆڵێکەوە کە دوو لاپاڵی هەبێ، لاپاڵێکیان بژوێنو ئەوەکەی تریان چەقەنو رەقەن بێ، جا ئەگەر ئەو رانە لە لاپاڵە بژوێنەکەدا بلەوەڕێنیت هەر بەچارە نووسی خودا نیەو ئەگەر لەلاپاڵە رەقەنکەش دا بیلەوەڕێنێت هەر بە چارەنووسی خودا نییە؟ گوتی: جا عەبدورەحمانی کوڕی عەوف هات بەسەردا – کە لەوەپێش لەوێ نەبوو، چوو بوو بۆ هەندێ ئیشی خۆی – ئەوهات گوتی: من شارەزاییم لەم باسە هەیە: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): کاتێ بیستتان کەوا تاعوون لە جێگەیێ بلاو بۆتەوە مەچن بۆ لای بۆ ئەوێ، کاتێ لەو جێگەیش بلاو بۆوە کە ئێوە لەوێن دەرمەچن لەوێو لە دەستی رامەکەن گوتی: ئیتر عومەری کوڕی خەططاب سوپاسو ستایشی خودای کردو گەڕایەوە بۆ مەدینەو سەفەرەکەی بڕیو نەچوو بۆ شام (ش).

## ٥٤) باسی جادوو بازی: (السحر)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى – ٢٠/٦٩}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: جادووگەر لەهەر شوێنێ بێو لە هەرکاتێکدا بێ بەرانبەر بە هەقو فەرمانی خودایی سەرناکەوێ.**

**٢٩٤٩-** عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّىْءَ وَمَا يَفْعَلُهُ حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ دَعَا ثُمَّ دَعَا ثُمَّ قَالَ: يَا عَائِشَةُ أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ جَاءَنِي رَجُلاَنِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَىَّ. فَقَالَ الَّذِى عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِى عِنْدَ رِجْلَىَّ أَوِ الَّذِى عِنْدَ رِجْلَىَّ لِلَّذِى عِنْدَ رَأْسِي مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ (أَى مَسْحُورٌ). قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ. قَالَ: فِي أَىِّ شَىْءٍ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ. قَالَ: وَجُبِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ. قَالَ فَأَيْنَ هُوَ قَالَ فِي بِئْرِ ذِى أَرْوَانَ. قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ ثُمَّ قَالَ: يَا عَائِشَةُ وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ. قَالَتْ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ أَحْرَقْتَهُ قَالَ: لاَ أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ. رواه الشيخان. نسأل الله السلامة[1]:

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: جوولەکەیەکی بەنی زورەیقی – کە ناوی لەبیدی کوڕی ئەعەصەم بوو – جادووی لە پێغەمبەر کردبوو، هەتا هەندێ جار شتی وا هەبوو پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەیکردبوو کەچی بە خەیاڵ وایدەزانی کە کردوویەتی! تا رۆژێکیان – یا شەوێکیان – پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **زۆر زۆر پاڕایەوە لە خودا کە ئەم وەیەی لە کۆڵ بخا لە پاشا فەرمووی: ئەی عائیشە! ئاگات لێیە کە خودا هات بە دەنگمەوەو چارەی دەردەکەمی پێ فەرمووم: دوو پیاو هاتن بۆ لام، یەکێکیان لەسەرینمەوە**

[1] مسلم. سلام: ٥٧٦٣ ، ٥٦٦٧. بخاري. طب: ٥٧٦٦.

دانیشتو ئەوی تریان لە پاییـنمەوە دانیشت، ئەوەیان کە لە سەرینمەوە بوو گوتی بەوەیان کە لە پاییـنمەوە بوو: یا فەرمووی: ئەوەیان کە لە پاییـنمەوە بوو گوتی بەوەیان کە لە سەرینمەوە بوو: ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ گوتی: جادووی لێ کراوە، گوتی: کێ جادووی لێ کردووە؟ گوتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، گوتی: لەچی دا؟ گوتی: لە شانەو لە کۆڵكو مووی دەمی شانە کە لەکاتی موو داهێناندا بەر دەبێتەوە، یا لەناو ددانەکانی شانەکەدا دەمێنێتەوەو لە کیف (قاوغ)ی هێشووی خورمای نێردا، گوتی: جا ئەوە لە کوێیە؟ گوتی: لەناو بیری ذی ئەروان دایە! عائیشە گوتی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ دەستەیێ لە یارانی خۆیدا چوون بۆ ئەوێ، لە پاشا کە گەڕایەوە فەرمووی: ئەی عائیشە! بەو خودایە ئاوەکەی دەڵێی لینجاوی خەنەیەو دارە خورماکانی دەڵێی سەرو گوێلاکی شەیتانن وا رەزاقورسو نالەبارن گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دەریت هێنا لە بیرەکە؟ فەرمووی: نەء، وەڵێ من خودا چاکی کردمەوەو حەزیشم نەکرد کە شەڕ بووروژێنم لە خەڵك، جا لەبەر ئەوە دەستوورم دا بیرەکەیان پڕ کردەوە(ش).

## ٥٥) زەهر: (السُمّ)

**٢٩٥٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا فَتِحَتْ خَيْبَرُ أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اجْمَعُوا لِي مَنْ كَانَ هُنَا مِنَ الْيَهُودِ. فَجُمِعُوا لَهُ، فَقَالَ لَهُمْ: إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ؟. فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ: مَنْ أَبُوكُمْ؟ قَالُوا : أَبُونَا فُلاَنٌ. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كَذَبْتُمْ، بَلْ أَبُوكُمْ فُلاَنٌ. قَالُوا : صَدَقْتَ وَبَرَرْتَ. فَقَالَ لَهُمْ: إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، يَا أَبَا الْقَاسِمِ وَإِنْ كَذَبْنَاكَ عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عَرَفْتَ فِي آبَائِنَا. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَمَنْ أَهْلُ النَّارِ؟ فَقَالُوا : نَكُونُ فِيهَا يَسِيراً ثُمَّ تَخْلُفُونَنَا فِيهَا. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اخْسَئُوا فِيهَا، وَاللَّهِ لاَ نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَداً. ثُمَّ قَالَ لَهُمْ : فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ

سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟ قَالُوا : نَعَمْ. قَالَ: هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هَذِهِ الشَّاةِ سُمًّا؟ قَالُوا : نَعَمْ. فَقَالَ: مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالُوا : أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كَاذِباً أَنْ نَسْتَرِيحَ مِنْكَ، وَإِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ. رواه البخاري[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: لەکاتی گرتنی قەلاّی خەیبەردا، مەڕێکی زەهراوییان دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) لێی خواردو دوایی فەرمووی: هەرچی جوولەکەیێ لێرە هەیە کۆیان بکەنەوە بۆم. کە کۆیان کردنەوە بۆی فەرمووی پێیان: من پرسیاری شتێکتان لیٚ دەکەم ئایا ئێوە راستم پیٚ دەڵێن؟ گوتیان: بەڵیٚ پێت دەڵێین، ئەی ئەبولقاسم! فەرمووی: کیٚ باوکی ئێوەیە؟ گوتیان: باوکی ئێمە فیسارە پیاوە، فەرمووی: درۆ دەکەن، بەڵکوو باوکی ئێوە فیسارە کەسە گوتیان: راست دەفەرمووی، قسەی تۆ تەواوە، فەرمووی: پرسیاری شتێکی ترتان لیٚ دەکەم ئایا راستم پیٚ دەڵێن؟ گوتیان: بەڵیٚ راستت پیٚ دەڵێین ئەی ئەبولقاسم! چونکە ئەگەر درۆت لەگەڵ بکەین تۆ بە درۆکەمان دەزانی، وەك چۆن بۆ مەسەلەکەی باوکمان پێت زانی، فەرمووی پێیان: کیٚ دۆزەخییە؟ گوتیان: ئێمە نەختیٚ لە دۆزەخدا دەبین، بەلاّم ئێوە لەپاش ئێمە تیادا دەمێننەوە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) پێی فەرموون: چغەتان لیٚ بیٚ دۆزەخ جێگەی ئێوەیە، بە یەزدانی پاك هەرگیز ئێمە لە پاش ئێوە لەویٚ نامێنینەوە ئینجا پێی فەرموون: ئەگەر شتێکی ترتان لیٚ بپرسم ئەمجارە راستیم پیٚ دەڵێن؟ گوتیان: بەڵیٚ، فەرمووی: ئایا زەهرتان کردۆتە ناو گۆشتی ئەم مەڕەوە کە ئێستا ئێمە لێمان خوارد؟ گوتیان: بەڵی تێمان کردووە، فەرمووی: چی ئەمەی پیٚ کردنو لەبەر چی؟ گوتیان: ویستمان تاقیت بکەینەوەو گوتمان: ئەگەر تۆ پێغەمبەری راستی نەبیتو پێغەمبەرە درۆزنەبیت ئەوا دەتکوژین بەم زەهرەو رزگار دەبین لە دەستت بەلاّم ئەگەر پێغەمبەری بەراستی بیت ئەوا ئەم زەهرە کارت لیٚ ناکاو زیانت پیٚ ناگەیەنیٚ (ب).

---

[1] بخاري. طب: ٥٧٧٧.

**٢٩٥١- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ امْرَأَةً يَهُودِيَّةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ فَأَكَلَ مِنْهَا فَجِيءَ بِهَا إِلَى النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ فَقَالَتْ: أَرَدْتُ لأَقْتُلَكَ. قَالَ: مَا كَانَ اللَّهُ لِيُسَلِّطَكِ عَلَى ذَاكِ. قَالَ: أَوْ قَالَ: « عَلَيَّ ». قَالَ قَالُوا أَلاَ نَقْتُلُهَا قَالَ: لاَ. قَالَ: فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). **رواه مسلم وأبو داود**[٢]:

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ژنێكی جوولەكە مەڕێكی زەهراوی دانا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ)، **هەندێكی لێ خوارد، ئینجا ژنەكەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بۆ مەسەلەی مەڕە زەهراوییەكە لێی پرسی، كە بۆچی ئەمەی كردووە، گوتی: ویستم كە بتكوژم، فەرمووی: خودا كارێكی وا ناكا كە ئەوە بە تۆ بكرێ یا فەرمووی: خودا شتی وا ناكا كە تۆ بەسەر مندا زاڵ بكا گوتیان: بۆ نەیكوژین؟ فەرمووی: مەیكوژن! ئەنەس گوتی: هەتا كاتی مەرگی حەزرەت ئەثەرو ماكی ئەو خواردنە زەهراوییە بە زمانە بچكۆلەو مەلاشووی پێغەمبەرەوە مابوو (م/د).**

**٢٩٥٢- عَنِ جَابِرٌ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ يَهُودِيَّةً مِنْ أَهْلِ خَيْبَرَ أَهْدَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **شَاةً مَسْمُومَةً فَأَكَلَ مِنْهَا وَأَكَلَ مَعَهُ رَهْطٌ مِنْ أَصْحَابِهِ ثُمَّ قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): **ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ، وَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ فَقَالَ لَهَا: أَسَمَمْتِ الشَّاةَ؟ قَالَتِ: مَنْ أَخْبَرَكَ ؟ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي هَذِهِ الذِّرَاعُ، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَا أَرَدْتِ إِلَى ذَلِكَ؟ قَالَتْ: قُلْتُ إِنْ كَانَ نَبِيًّا فَلَنْ يَضُرَّهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ نَبِيًّا اسْتَرَحْنَا مِنْهُ فَعَفَا عَنْهَا**[٣]:

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: ژنێكی جوولەكە، خەڵكی خەیبەر بوو، مەڕێكی زەهراویی دانا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پاش ئەوە كە پێغەمبەر خۆیو دەستەیێ لە یارانی لێیان خوارد فەرمووی پێیان: دەستتان بگرنەوەو**

---

[٢] بخاري. هبة: ٢٦١٧. مسلم. سلام: ٥٦٦٩.

[٣] رواه أبو داود في الديات.

مەخۆن ئینجا ناردی بە دوای ژنەكەداو فەرمووی پێی: ئایا زەهرت كردووە بەم مەڕەوە؟ ژنەكە گوتی: كێ پێی گوتیت؟ فەرمووی: ئەم دەستی مەڕە پێی گوتم! گوتی: ئا، پێمەوە كردووە فەرمووی: بۆ وات كرد؟ گوتی: گوتم ئەگەر پێغەمبەر بێ زیانی پێ ناگەیەنێ، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش نەبێ ئەوا رزگار دەبین لە دەستی، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لێی بوورد (د).

٢٩٥٣- وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ الْهَدِيَّةَ وَلاَ يَأْكُلُ الصَّدَقَةَ. فَأَهْدَتْ لَهُ يَهُودِيَّةٌ بِخَيْبَرَ شَاةً مَصْلِيَّةً (أي مشويَّةً بالنَّار) مَسْمُومَةً فَأَكَلَ مِنهَا وَأَكَلَ الْقَوْمُ فَقَالَ: ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ فَقَدْ أَخْبَرَتْنِي أَنَّهَا مَسْمُومَةٌ. فَأَرْسَلَ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ : فَسَأَلَهاَ مَا حَمَلَكِ عَلَى هَذَا. قَالَتْ: إِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ وَإِنْ كُنْتَ مَلِكًا أَرَحْتُ النَّاسَ مِنْكَ. فَأَمَرَ بِهَا فَقُتِلَتْ لِأَنَّهُ مَاتَ بَشْرُ بْنُ البَرَاءِ مَنْ أَكْلِهَا ثُمَّ قَالَ فِي وَجَعِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ «مَا زِلْتُ أَجِدُ مِنَ أَكْلَةِ خَيْبَرَ فَهَذَا أَوَانُ قَطَعَتْ أَبْهَرِى. رواهما أبو داود فى الديات والله أعلى وأعلم[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو: لە دیاریی دەخوارد بەڵام لەزەكاتی نەدەخوارد، جا لەخەیبەر ژنێكی جوولەكە مەڕێكی برژاوی زەهراوی بە دیاری بۆ هێنا، جا هەم پێغەمبەر خۆیو هەم یارانی هەندێ لەو مەڕەیان خوارد، لە گەرمەی خواردندا بوون حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەست بگرنەوە ئەم مەڕە دەڵێ پێم: كە زەهری پێوەكراوە! جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بەشوێن ژنە جوولەكەكەداو لێی پرسی: بۆ وات كرد؟ گوتی: ئەگەر پێغەمبەر بیت زیانت پێ ناگەیەنێ، ئەگەر پادشایش بیت ئەوا ئەم خەڵكە لە دەستت قوتار دەكەم! لە پاشا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەستووری دا ژنەكەیان كوشتەوە، چونكە بەو خواردنە بیشری كوڕی بەرائی پێ مرد، لە پاشدا لەو نەخۆشینەی حەزرەتدا كە وەفاتی تیا كرد، فەرمووی: هێشتاوەكوونێ

---

[٤] بخاري. مغازي: ٤٤٢٨.

هەست بە ئێشو ئازار دەكەم بەهۆی خواردنەكەی خەیبەرەوە هاكا كە بەندی دڵی پچڕاندم یا فەرمووی: هاكا تیرەی گازەرەی پشتی پساندم (د).

### ٥٦) سەردان لە نەخۆش سوننەتە: (عيادة المريض سنة)

٢٩٥٤- (ب – ٣ ز – ١٩٧ ف – ١). في هذه الرواية: عَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِشْتَكَيْتُ بِمَكَّةَ، فجائني النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعُودُنِي فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِي، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ عَلَى وَجْهِي وَبَطْنِي ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا وَأَتْمِمْ لَهُ هِجْرَتَهُ. قَالَ: فَمَا زِلْتُ أَجِدُ بَرْدَهُ عَلَى كَبِدِي فِيمَا يُخَالُ إِلَيَّ حَتَّى السَّاعَةِ. رواه البخاري وابو داود[1]:

لە گێڕانەوەی ئێرانەدا: سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە مەككە لە ساڵی حەجی ماڵئاواییدا نەخۆش كەوتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ سەردانم بەم بۆنەیەوە، دەستی دانا لەسەر تەوێڵم، ئینجا دەستی هێنا بەسەر دەموچاوو بەسەر سكماو ئینجا فەرمووی: ئەی خودایە! سەعد خۆشكەرەوەو كۆچ كردنەكەی تەواو بكە بۆی تا لە مەككە كە زێدی خۆی بوو نەمرێ سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هەتا ئێستاش هەروا هەست ئەكەم كە فێنكایی دەستی هەروا لەسەر جەرگو دڵم!! (ب/د).

٢٩٥٥- وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَجُلٍ (أَعْرَابِيّ) يَعُودُهُ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَقَالَ: كَلاَّ بَلْ حُمَّى تَفُورُ عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ، حتَّى تُزيره القُبُور قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَنَعَمْ إِذاً. رواه البخاري (رضوان الله عليه)[2]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ سەردانی پیاوێكی عەرەبی دەشتەكی نەخۆش، كە سەرخۆشی لێ كرد فەرمووی: قەیدی نیە خودا حەزكا كەففارەتی گوناهو پاكەوەكەری

---

[1] بخاري. وصية: تجريد/ ٢ ل – ٤٧ ز: ٦٢٢ / ١٢٩٥ ، مسلم. وصية: ٤١٨٥.

[2] بخاري. مرضى: ٥٦٥٦.

گوناهـە. پیاوەکـەیش گـوتی: نـەخێر، بەشـکوو ئەمـە لـەرزو تایـە ئـەم پـیرە ئیختیارە هەڵدەچۆقێنێو لـە کۆڵی نابێتـەوە تـا نەیخاتـە گـۆڕ!، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەواتە وەك تۆ دەڵێیت با وابێ (ب).

٢٩٥٦- وَكَانَ غُلَامٌ لِيَهُودَ يَخْدُمُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَرِضَ. فَأَتَاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعُودُهُ فَقَالَ: أَسْلِمْ. فَأَسْلَمَ. رواه البخاري وأبو داود ولفظه: فَقَعَدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ لَهُ: أَسْلِمْ. فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ لَهُ أَبُوهُ أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ. فَأَسْلَمَ فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَنْقَـذَهُ بِـى مِـنَ النَّارِ[٣]:

کوڕێکی جوولەکە هەبوو، خزمەتی پێغەمبەری دەکرد، کوڕەکە نەخۆش کـەوت، حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) چـوو بـۆ سـەردانیو پێـی فـەرمووی: ئیسلام ببە ئـەویش ئیسلام بـوو (ب/د) گفتـەی (د) ئاوایـە: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە سەرینیەوە دانیشتو پێی فەرموو: موسوڵمان ببە کوڕەکەیش سەیری باوکی کرد، باوکیشی پێی گوت: بەگوێی ئەبولقاسم بکە، جا ئەویش موسوڵمان بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هەڵسا فەرمووی: سوپاس بۆ خودا کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری کرد.

٢٩٥٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُـوَ مُسْتَنِدٌ إِلَيَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ. رواه البخاري[٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەکاتی سەرەمەرگا پێغەمبەر (دروودو سەلامی خودای لەسەربێ) لە باوەشما بوو، پاڵی دابوو پێمەوە، لـەو دەمـەدا گوێم لێـی بـوو دەیفـەرموو: خودایـە! لـێم خۆشـبەو میهرەبـانیم لەگەڵـدا بنوێنـەو بـەزەویت بێتـەوە پیامـاو بمبـەرەوە بـۆ لای یـاران ئـیتر هـەر ئـەم وشـەیەی دووبـارە دەکردەوە تا گیانی پاکی دەرچوو (ب).

---

[٣] {ریاض/ ٢ ل - ٣٤٠ ز: ١٤٤ ژ: ٩٠٠/٧ - بخاري: ١٣٥٦}.

[٤] بخاري. مرضى: ٥٦٧٤.

٢٩٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي. قَالَ يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلاَنًا مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي. قَالَ يَا رَبِّ وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلاَنٌ فَلَمْ تُطْعِمْهُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي. قَالَ يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ اسْتَسْقَاكَ عَبْدِي فُلاَنٌ فَلَمْ تَسْقِهِ أَمَا إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي. رواه مسلم (رضوان الله تعالى عليه)[٥]:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای گەورەی لەسەربێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای گەورەی لێ بێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژێ قیامەتا خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! من نەخۆش بووم کەچی تۆ نەهاتی بۆ سەردانم، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تۆیی کە خودای هەر دووجیهانی ئیتر من چۆن چۆنی بێم بۆ سەردانت؟ خودا دەفەرموێ: تۆ دەزانی کە کاتی خۆی فیسارە بەندەی من نەخۆش بوو، بۆچی سەرت لێ نەدا، ئەدی نەتدەزانی ئەگەر سەرت لێ بدایەو سەرخۆشیت لێ بکردایە لەوکاتەدا من لەوێ لەلای بووم. ئەی ئادەمیزاد! داوای نانو خۆراکم لە تۆکرد کەچی بەشت نەدام، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تۆیی کە خودای هەموو لایەکی ئیتر من چ رادەم هەیەو چۆن چۆنی نانو خۆراکت پێ بدەم؟! دەفەرموێ: تۆ دەزانی کە کاتی خۆی فیسارە بەندەم لە فیسارە ڕۆژدا لە جیهاندا داوای نانو خواردەمەنی لێ کردیت کەچی بەشت نەدا، ئەدیی نەتدەزانی ئەگەر بەشیت بدایە ئێستاکە پاداشی ئەوەت لەلای من هەبوو ئەی ئادەمیزاد! من توونیم بوو داوای ئاوم لێ کردی، کەچێ تۆ بەشت نەدام! دەڵێ: پەروەردگارا! تۆیێ کە خودای هەموانی من چ رادەم

---

[٥] ریاض/٢ ل/٣٣٧ ژمارە/٨٩٦/٣. مسلم:٢٥٦٩ = رقم: ٦٥٠١ حسب ترقيم شيخ خليل شيحا.

دەكەویو چۆنی ئاوت بدەمێ؟ دەفەرموێ: فیسارە بەندەی من لە جیهانا داوای ئاوی لێ كردیت، كەچی تۆ بەشیت نەدا، ئەدیی ئەگەر ئەو ئاوەت پێ بدایە ئێستا پاداشی باشی ئەو چاكەیەت لەلای من بوو! (م).

٢٩٥٩- ← (ب/١ ز/٢٠٠ ل/ ژ/٤ + ژ/١ + ژ/٢ + ف/٣ + ف/٥ + ف/٦ + ف/٨)[٦].

٢٩٦٠- ← (ب/١ ز/٢٠٠ ل/ ف/٧)[٧].

٢٩٦١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا دَخَلْتُمْ عَلَى الْمَرِيضِ فَنَفِّسُوا لَهُ فِي أَجَلِهِ فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَرُدُّ شَيْئًا وَيُطَيِّبُ نَفْسَهُ. رواه الترمذي وسبق نبذةٌ منها فى الجنائز) في المجلد الاول فى التسلسل – ٢٠٠) نسأل الله أن يشفي قلوبنا آمين. والله أعلم:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: كە دەچن بۆ لای نەخۆش لەبابەت ئاكامو ئەجەلەوە دڵخۆشی بدەنەوە وەك ئەوە بڵێن: باشیتو خوا حەزكا چاك دەبیتەوە هەرچەند كە ئەوە هیچ شتێ رەت ناكاتەوە بەڵام دڵی ئەو خۆش دەكا (ت)[١].

---

[٦] مجلد/١ تسلسل/٢٠٠ رقم:١٠٥٣/١و ١٠٥٤/٢ و ١٠٥٥/٣ و ١٠٥٦/٤.

[٧] مجلد/١ تسلسل/٢٠٠ رقم/١٠٥٩/٧.

[١] جارێ موسوڵمانێ چاوەڕوانی ئاكامی دەكرد بەچەن دەقێقەیێ لە پێش مەرگیا عەرزیم كرد: مەترسە لەمردن، هەموومان گیای مردنین! فەرمووی: حەیفت نەكرد وا دەڵێی، من دەرۆم بۆ خزمەتی خودای خۆمو دەچم بۆ دێنیی كۆڕی پێغەمبەرو یارانی، ئیتر دەبێ لەچی بترسم!. - وەرگێڕ -

## ٥٧) گوتەی کاتی تووشبوونی سەختیو ناخۆشی : (ما يقال في المصيبة)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ – ٢/١٥٦-١٥٧}.

تەفسیری ئەم ئایەتە لە پێشەوە رابورد: (ب/١ ز/١٩٨ ل/ ).

٢٩٦٢- ← (ب/١ ز/١٩٢ ل/٥٢٠ ف/٣ + ف/٤) وفي هذه الرواية: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَجَرَهُ اللَّهُ فِي مُصِيبَتِهِ وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا ». قَالَتْ فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ قُلْتُ كَمَا أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْلَفَ اللَّهُ لِي خَيْرًا مِنْهُ رَسُولَ اللَّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه الخمسة إلا البخاري ولفظ الترمذي في الدعوات: إِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَقُلْ (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) اللَّهُمَّ عِنْدَكَ احْتَسَبْتُ مُصِيبَتِي فَأْجُرْنِي فِيهَا وَأَبْدِلْنِي مِنْهَا خَيْرًا. فَلَمَّا احْتُضِرَ أَبُو سَلَمَةَ قَالَ اللَّهُمَّ اخْلُفْ فِي أَهْلِي خَيْرًا مِنِّي فَلَمَّا قُبِضَ قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) عِنْدَ اللَّهِ احْتَسَبْتُ مُصِيبَتِي فَأْجُرْنِي فِيهَا. فَتَقَبَّلُ الله منهما وعوضهما رَسُول اللهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[1]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): هەر بەندەیێ کە گرفتاری چورتمو وەیێ دەبێ بلێ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا: ئێمە هەموو دەسنێژی خوداین، لاریمان نیە لە ئاستی فەرمانی، وە لەو دنیا دیسانەوە دەچینەوە بەر دیوانی خۆی، ئەی خودای من! پاداشی باشو مزی چاکم پێ بدە لە هۆی ئەم موصیبەتو مەینەتە کە تووشم بووە، وە تۆڵەم بۆ بکەرەوە بە باشتر لەمە، ئیتر مسۆگەر کە خودا لەسەر ئەو چورتمو موصیبەتە پاداشی باشی دەداتەوە، وە بەشتێکی باشتریش شوێنی ئەوەی بۆ پڕ دەکاتەوە

---

[1] مسلم. جنائز: ٢١٢٣ – ٢١٢٥. أبو داود. جنائز: ٣١١٥. ترمذي. جنائز: ٩٧٧. نسائي. جنائز: ١٨٢٤.

ئوممو سەلەمە گوتی: من بۆ خۆم كە كاتێ ئەبو سەلەمەی مێردم كۆچی دوایی كرد ئەو گوتەیەم گوت كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ كرم كە لە كاتی وادا، بیبێلێم، ئەوە بوو كە خودا جێگەی ئەبو سەلەمەی بۆ پڕكردمەوە بە پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) كە گەلێ – گەلێ لە ئەبو سەلەمە باشتر بوو ئەوە بوو كە لە دوای مەرگی ئەبو سەلەمە شووم كرد بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) (م/د/ت/ن) گفتەی (ت): كاتێ كە یەكێكتان تووشی قۆرتێ بوو با بلێ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ عِنْدَكَ احْتَسَبْتُ مُصِيبَتِي فَأْجُرْنِي فِيهَا وَأَبْدِلْنِي مِنْهَا خَيْرًا: ئێمە هەمووماڵو موڵكی خوداینو خۆی خاوەنمانە، وەك چۆن لەسەرەتاوە دەسنێژی خۆی بوون لە ئەنجامیشا خوانا‌خوا بەبێ دەستەڵاتی دەچینەوە بەر دەستی، ئەی خودای خۆم! پاداشی باشی ئەم قۆرتو موصیبەتەی كە بەسەرم هاتووە هەر لە تۆ داوا دەكەمو بەس، بە میهرەبانی خۆت بێ بەشم مەكەو پاداشم بدەرەوە لە سەریو رەنجەڕۆم مەكەوە لە جیاتی ئەوە تۆڵەیەكی چاكترم بۆ بكەرەوە جا ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) لەسەرە مەرگا گوتی: اللهم اخلف أهلي خيرا مني: ئەی خودایە! جێگەی من پڕ بكەرەوە بۆ كەسو كارەكەم بە كەسێ كە لەمن باشتربێ بۆیان، وە كاتێ كە ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گیان دەسپێرێ ئوممو سەلەمەش دەڵێ: انا لله وانا اليه راجعون عند الله أحتسب مصيبتي، فأجرني فيها. ئیتر ئەوەبوو كە خوداش نزاكەیانی گیراكردو تۆڵەی بۆكردنەوەو جێگەی ئەبو سەلەمەی بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پڕكردەوەو ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) لەپاش مەرگی ئەبو سەلەمە شووی كردەوە بە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ)و شادبوو بە نازناوی دایكی موسوڵمانان.

## ٥٨) بەشی یەكەم: باسی ئەوەی كە خۆتیماركردنو بەكار هێنانی دەرمان دروستە: (الفصل الأول: في جواز التداوي)

٢٩٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً. رواه البخاري ومسلم ولفظه: لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا هەر دەردێكی ناردبێ چارەشی بۆ ناردووە! (ب/م) گفتەی (م): گشت دەردێ دەرمانێكی هەیە، جا هەركاتێ دەرمانەكە دەردەكەی پێكا یاخود هەركاتێ دەرمانی دەردەكە دۆزرایەوەو پێی دەرمان كرا ئیتر بە فەرمانی خودای گەورەو سەروەر نەخۆشە كە چاك دەبێتەوە.

٢٩٦٤- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِهِمُ الطَّيْرُ فَسَلَّمْتُ ثُمَّ قَعَدْتُ فَجَاءَ الأَعْرَابُ مِنْ هُنَا وَهَا هُنَا فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَتَدَاوَى؟ قَالَ: تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ الْهَرَمُ. رواه أصحاب السنن بسند صحيح[٢]:

ئوسامەی كوڕی شەریك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) یارانی لە خزمەتیا كشو مات دانیشتبوون، جا سڵاوم كردو دانیشتم، ئیتر عارەبی دەشتەكی لەم لاولاوە دەهاتنو دەیانگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا خۆمان تیماربكەین یانا؟ فەرمووی: خۆتان تیمار بكەنو ئەگەر نەخۆش كەوتن دەرمان بەكار بێنن چونكە خودا هەر دەردێكی دانابێ دەرمانیشی بۆ داناوە، تەنیا یەك دەرد نەبێ كە پیرییە، دەردی پیری دەرمانی نیە تەنیا چاری ئەوەیە كەروو لە خودا بێو پیری ئاخر خێربێ! (د/ت/ن-س/ص).

---

[١] مسلم. سلام: ٥٧٠٥. بخاري. طب: ٥٦٧٨.

[٢] حديث صحيح.

٢٩٦٥- وَسُئِلَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِيْلَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ رُقًى نَسْتَرْقِيهَا وَدَوَاءً نَتَدَاوَى بِهِ وَتُقَاةً نَتَّقِيهَا هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللّٰهِ شَيْئًا؟ قَالَ « هِيَ مِنْ قَدَرِ اللّٰهِ. رواه الترمذي بسند صحيح[٣]:

پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیان کرد: ئەی رەوانەکراوی یەزدانی! ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو ئایا ئەم نوشتەو دۆعایانەی کە دەیان کەینو ئەم دەرمانانەی کە خۆمانیان پێ دەرمان دەکەینو ئەم پارێزو ترو تفاقانەی کە خۆمانیان پێ دەپارێزین ئایا ئەمانە هیچ لە چارەنووسی خودایی رەت دەکەنەوە؟ فەرمووی: ئەمانەخۆشیان بەشێکن لە چارەنووسی خودایی کەواتە سوودیان هەیەو رەزای شەریعەتیان لەسەرە (ت-س/ص).

٢٩٦٦- وَقَالَ سَعْدِ بْنِ اَبِی وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) مَرِضْتُ فَعَادَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا عَلَى فُؤَادِي فَقَالَ: إِنَّكَ رَجُلٌ مَفْئُودٌ ائْتِ الْحَارِثَ بْنَ كَلَدَةَ أَخَا ثَقِيفٍ فَإِنَّهُ رَجُلٌ يَتَطَبَّبُ فَلْيَأْخُذْ سَبْعَ تَمَرَاتٍ مِنْ عَجْوَةِ الْمَدِينَةِ فَلْيَجَأْهُنَّ بِنَوَاهُنَّ ثُمَّ لِيَلُدَّكَ بِهِنَّ. (أي لِيَدُقَّهُنَّ بنواهن ثم يسقيك إياهن). رواه أبو داود[٤]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ رازی بێ) گوتی: نەخۆش بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ هەواڵپرسیم، دەستی دانا لە نێوانی هەردوو مەمکما، لەناو دڵمەوە هەستم بەفێنکی دەستی کرد، فەرمووی: تۆ، نەخۆشی دڵت هەیە بچۆ بۆ لای حاریثی کوڕی کە لەدەی ثەقەفی، ئەو پیاوە دەستی پزیشکی هەیە با حەوت دەنك خورما - لە خورمای عەجوەی مەدینە - بێنێو بەناوکەکەیانەوە ورد - ورد بیان کوتێو بیان کات بە رینگاوو، دەرخواردتی بدات (د).

---

[٣] حديث صحيح.

[٤] سكت عن درجته الشارح.

## ٥٩) پارێز سەرچاوەی هەموو دەرمانێکە: (الحمية رأس الدواء)

**٢٩٦٧- عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ الأَنْصَارِيَّةِ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) وَلَنَا دَوَالِي مُعَلَّقَةٌ فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ مِنْهَا وَقَامَ عَلِيٌّ لِيَأْكُلَ فَطَفِقَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ لِعَلِيّ: مَهْ إِنَّكَ نَاقِهٌ فَكَفَّ عَلِيٌّ، قَالَتْ: وَصَنَعْتُ شَعِيرًا وَسِلْقًا فَجِئْتُ بِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا عَلِيُّ أَصِبْ مِنْ هَذَا فَهُوَ أَنْفَعُ لَكَ. رواه ابو داود والترمذي[١]:**

**ئوممو مونذیری ئەنصارییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام، عەلیشی لەگەڵدا بوو، هێشووە خورمامان هەبوو بەدارەکەوە هەڵواسرابوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵسا لێی خوارد، عەلیش هەڵسا کە بخوا، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: مەکە، تۆ تازە لە نەخۆشی هەڵساویتەوە! ئیتر عەلی دەستی هەڵگرت. گوتی: جۆو سلقم بۆ دروست کردنو دامنا بۆیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عەلی! لەمە بخۆ، ئەمە بۆ تۆ باشترە (د/ت).**

**٢٩٦٨- وَقَالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذَا أَحَبَّ اللّٰهُ عَبْدًا حَمَاهُ الدُّنْيَا كَمَا يَظَلُّ أَحَدُكُمْ يَحْمِي سَقِيمَهُ الْمَاءَ[٢]:**

**پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ خودا بەندەیەکی خۆش ویست دەیپارێزێ لە جیهان وەك چۆن ئێوە پارێز بە نەخۆشی خۆتان دەکەن لە ئاو (ت-س/ح).**

**٢٩٦٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ فَإِنَّ اللّٰهَ يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ. رواهما الترمذي بسندين حسنين[٣]:**

---

[١] سكت عنه الشارح.

[٢] رَوَاهُ الترمذى بسند حسن.

[٣] رَوَاهُ الترمذى بسند حسن

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) لە پیٚغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەربیٚ) دەفەرمویٚ: بە زۆر نانو ئاو دەرخواردی نەخۆش مەدەن، چونکە نەخۆش خوا خۆی نانو ئاوی دەداتیٚ! (ت-س/ح).

٢٩٧٠- قال المؤلف (رضوان الله عليه في الشرح): وأحسن ما ورد في الحمية قول النّبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أصل كل داءٍ البردة. وقال: البردة بالتّحريك إدخال الطّعام على الطّعام[٤]:

دانەر (ڕەزای خودای لەسەربیٚ) لەشەرحەکەیدا دەڵیٚ: نایابترین فەرموودەیێ لە بابەت پاریٚزەوە ئەو فەرموودەی حەزرەتە کە دەفەرمویٚ: ترخەکردنو ئینتەلا سەرچاوەی هەموو دەردیٚکە.

## ٦٠) بەشی دووەم: باسی پزیشکایەتیو طیببی پیٚغەمبەر (درووودی خودای لەسەربیٚ) یەکیٚ لەوانە هەنگوینو داخکردن بە ئاگرو خویٚن بەردانە:

## الفصل الثاني: في الطب النبوي منه العسل وكي النار والحجامة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ - ١٦/٦٩}.

لە سکی میٚشەهەنگ شەرابیٚ دەردەچیٚ کە پیٚی دەگوتریٚ هەنگوین، بۆ خواردنو خواردنەوە دەشیٚو چەن ڕەنگو جۆری جیاجیای هەیە، دەیش بیٚ بە دەرمانو چارەسەر بۆ گەلیٚ دەردو ناساخیو دەبیٚ بە شیفا بۆ مەردوم.

٢٩٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الشِّفَاءُ فِي ثَلاَثَةٍ فِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٍ بِنَارٍ، وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ. رواه البخاري[١]:

---

[٤] رَواهُ الترمذي بسند حسن.

[١] بخاري. طب: ٥٦٨٠.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زۆرتری کات شیفاو چابوونەوە بە سێ شت دەبێ: بە نەشتەری کەڵەشاخگرو نـژدار، وە بە شەربەتی هەنگوێنو هەروەها بە هەموو دەرمانێکی ڕەوانی باشو بەداخکردن بە ئاگر، بەڵام من حەز لە داخکردن ناکەم بۆ ئوممەتم (ب).

٢٩٧٢- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ – أَوْ يَكُونُ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ – خَيْرٌ فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ تُوَافِقُ الدَّاءَ، وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ. رواه الثلاثة[٢]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر شتێ لەم دەرمانانەی ئێوە خێریان تێدا بێ یا فەرمووی: خێریان پێوەبێ ئەوە لە نەشتەری کەڵەشاخ داو لە نژداری نژداراو لە شەربەتی هەنگویناو لە پیاچزان بە ئاگردا لەم سێ شتە تانا خێرو شیفا هەیە، کاتێ کە دەردەکە بپێکنو دەرمانی ئەو دەردەبن، وە من خۆم بەش بە حاڵی خۆم حەز بە داخکردنی خۆم ناکەم (ش/د).

٢٩٧٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) اَنَّ رَجُلاً أَتَى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ أَخِي يَشْتَكِي بَطْنُهُ. وفي لفظ: اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، ثُمَّ أَتَاه الثَّالِثَةَ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، ثُمَّ أَتَاه الثَّانِيَّة فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلاَّ اسْتِطْلاَقًا. فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ اسْقِهِ عَسَلاً، فَسَقَاهُ فَبَرَأَ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: براکەم سکی دێشێ؟ لە گفت (لەفظ)ێکدا: گوتی: سکی دەچێ؟ فەرمووی: هەنگوێنی بدەرێ پاشان دووبارە هاتەوە لایو دیسان فەرموویەوە: هەنگوینی بدەرێ لە جاری سێیەمدا کە هاتەوە خزمەتی عەرزکرد: هەنگوینم

---

[٢] بخاري. طب: ٥٦٨٣ ، ٥٦٨٢ ، ٥٧٠١ ، ٥٧٠٤. مسلم. سلام: ٥٧٠٧.

[٣] بخاري. طب: تجريد/ ٥ ل- ١٦٤ رقم: ١٨٧٢ / ٥٦٨٤ ، ٥٧١٦. مسلم. السلام: ٥٧٣١ ، ٥٧٣٢. ترمذي. طب: ٢٠٨٢.

داین، كەچی زیاتر رەوانی دەكا؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): خودا راست دەكا كە لە قورئاندا دەفەرموێ أفیه شفاء للناس: لە هەنگوێندا شیفاو دەرمان هەیە وە سكی براكەت درۆ دەكا، كەوابوو هەنگوینی دەرخوارد بدە ئینجا هەنگوینی دایەوە پێیو سكی چاك بووەوە (ش/ت).

٢٩٧٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رُمِيَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فِي أَكْحَلِهِ فَحَسَمَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ بِمِشْقَصٍ ثُمَّ وَرِمَتْ فَحَسَمَهُ الثَّانِيَةَ. رواه مسلم وابو داود[٤]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: تیرێ لە رەگی حیاتی سەعدی كوڕی موعاذ، كە لە باڵیابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەدەستی خۆی بە پەیكانێكی پانكۆڵە داخی كرد، پاشان دەستی سەعد پەناما، وە دووبارە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داخی كردەوە (م/د).

٢٩٧٥- وَعَنْهُ قَالَ: رُمِيَ أُبَيٌّ يَوْمَ الأَحْزَابِ عَلَى أَكْحَلِهِ فَكَوَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه مسلم والترمذي (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا)[٥]:

دیسان جابیر (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: رۆژی غەزای خەندەك تیرێ دای لە رەگی ژیانی باڵی ئوبەیی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەداخ داخی كرد (م/ت).

٢٩٧٦- وَعَنْهُ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) طَبِيبًا فَقَطَعَ مِنْهُ عِرْقًا ثُمَّ كَوَاهُ عَلَيْهِ. رواه مسلم وابو داود[٦]:

دیسان جابیر (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پزیشكێكی نارد بۆ تیماركردنی ئوبەییی كوڕی كەعب پزیشكەكە دەمارێكی ئوبەیی بڕیو لە پاشا دەمی دەمارەكەی بە داخێكی سوورەوە كراو داخ كرد (د/م).

---

[٤] مسلم. سلام: ٥٧١٢. أبو داود. طب: ٣٨٦٤.

[٥] مسلم. سلام: ٥٧١١.

[٦] مسلم. سلام: ٥٧٠٩.

٢٩٧٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْكَيِّ فَاكْتَوَيْنَا فَمَا أَفْلَحْنَا وَلاَ أَنْجَحْنَا. رواه أبو داود والترمذي[٧]:

عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەوگیریی دەكرد لەخۆ داخكردن لەكاتی نەخۆشی دا كەچی ئێمە خۆمان داخكرد، وەلێ هیچمان سەوز نەكرد عیمران مەیاسیری بوو بە ئاگر دەیسووتان (د/ت).

٢٩٧٨- وَقَالَ أبو داود: (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَ عِمْرَانُ هَذَا يَسْمَعُ تَسْلِيمَ الْمَلاَئِكَةِ فَلَمَّا اكْتَوَى انْقَطَعَ عَنْهُ فَلَمَّا تَرَكَ الكَيَّ رَجَعَ إِلَيْهِ التَسْلِيمُ. نسأل الله الشفاء آمين[٨]:

ئەبو داوود (خودای گەورەی لێ خۆش نوود بێ) دەیگوت: لە پێشدا ئەم عیمرانە فریشتە دەهاتن بۆ دیدەنی‌و سڵاویان لێ دەكرد بە گوێچكەی خۆی سڵاوەكەیانی دەبیست، جا كە خۆی داخ دەكا فریشتەكان دەتەكێنەوە لێی وە كاتێ وازدێنێ لە خۆ داخكردن سەر لەنوێ وەك جاران فریشتەكان سڵاوی لێ دەكەنەوە.

## ٦١) شوێن‌و كاتی كەڵەشاخ گرتن : (موضع الحجامة وزمنها)

٢٩٧٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ فِي رَأْسِهِ مِنْ شَقِيقَةٍ كَانَتْ بِهِ. رواه الخمسة إلا أبا داود[١]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئیحرام دا بوو، كاتێ كەڵەشاخی لەسەری خۆی گرت، چونكە ژانەسەرێكی

---

[٧] سكت عنه الشارح.

[٨] أثر صحيح مرويٌ عَن أبي داود.

[١] بخاري. طب: ٥٦٩٥.

**لەگەڵدا بوو، گەڵی جار لایی لە سەری دەئێشا، پێی دەگوترێ شەقیقە (ش/ت/ن).**

**٢٩٨٠- عَنْ سَلْمَى خَادِمِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: مَا كَانَ أَحَدٌ يَشْتَكِي إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَعًا فِي رَأْسِهِ إِلاَّ قَالَ: احْتَجِمْ. وَلاَ وَجَعًا فِي رِجْلَيْهِ إِلاَّ قَالَ: اخْضِبْهُمَا[٢]:**

**سەلمای كارەكەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەر بێو رەزای خودایش لەسەر ئەو) دەیگوت: هەر كەسێ لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سكاڵای حاڵی بكردایە لە دەست ژانەسەر دەیفەرموو: كەڵەشاخ بگرە، وە هەر كەسەش لە دەست ژانی پا، سكاڵای بكردایە دەیفەرموو: خەنەی تێ بگرە (د).**

**٢٩٨١- عَنْ أَبِي كَبْشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْتَجِمُ عَلَى هَامَتِهِ وَبَيْنَ كَتِفَيْهِ وَهُوَ يَقُولُ « مَنْ أَهْرَاقَ مِنْ هَذِهِ الدِّمَاءِ فَلاَ يَضُرُّهُ أَنْ لاَ يَتَدَاوَى بِشَىْءٍ لِشَىْءٍ. رواهما أبو داود[٣]:**

**ئەبو كەبشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەریو لە نێوشانی كەڵەشاخی دەگرت، دەشی فەرموو: هەر كەسێ خوێنی ئەم شوێنانە بەر بدات ئیتر ئەگەر بە هیچ بۆ هیچ خۆی تیمار نەكا قەی ناكا (د).**

**٢٩٨٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْتَجِمُ فِي الأَخْدَعَيْنِ وَالْكَاهِلِ وَكَانَ يَحْتَجِمُ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ. رواه أبو داود والترمذي بسند حسن[٤]:**

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە دوو رەگەكەی لامل كە بەعەرەبی پێیان دەڵێن: (ئەخدەعان)و لە نێوشانی**

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

[٤] سند حسن.

كەڵەشاخی دەگرت وە دەستووری وابوو لە حەڤدەو نۆزدەو بیستو یەكی مانگا كەڵەشاخی لەخۆی دەگرت (د/ت).

٢٩٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ احْتَجَمَ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ كَانَ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ[٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ لە حەڤدەو لە نۆزدەو لە بیستو یەكی مانگا كەڵەشاخ لە خۆی بگرێ دەبێ بەشیفاو چارەی هەموو دەردێ بۆی! (د).

٢٩٨٤- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْهَى عَنِ الْحِجَامَةِ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ وَيَقُول: أَنَّهُ يَوْمُ الدَّمِ وَفِيهِ سَاعَةٌ لاَ يَرْقَأُ. رواهما أبو داود[٦]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەوگیریی دەكرد لە خوێن بەردان لە رۆژی سێشەمەدا، دەیفەرموو: چونكە سێ شەم رۆژی خوێن جمانە، یاخوێن رژانە، وە كاژێرێكی تێدایە خوێنی تیا ناوەستێتەوە (د).

٢٩٨٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ أَنَّهُ لَمْ يَمُرَّ عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ إِلاَّ أَمَرُوهُ أَنْ مُرْ أُمَّتَكَ بِالْحِجَامَةِ[٧]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) باسی ئەو شەوەی دەكرد بۆمان كە بردبوویان بۆ ئیسراو میعراج فەرمووی: لەلای هەر دەستەیێ فریشتەوە دەرۆیشتم دەیانفەرموو پێم: بفەرموو بە ئوممەتت كە كەڵەشاخ بگرن (ت-س/ح).

٢٩٨٦- وَقَالَ عِكْرِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) غِلْمَةٌ ثَلاَثَةٌ حَجَّامُونَ فَكَانَ اثْنَان مِنْهُمْ يُغِلاَّن عَلَيْهِ وَعَلَى أَهْلِهِ وَوَاحِدٌ يَحْجُمُهُ وَيَحْجُمُ أَهْلَهُ. قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نِعْمَ الْعَبْدُ الْحَجَّامُ يُذْهِبُ الدَّمَ وَيُخِفُّ

---

[٥] سكت عن درجته الشارح.

[٦] سكت عن درجته الشارح.

[٧] رَوَاهُ الترمذي بسند حسن.

الصُّلْبَ وَيَجْلُو عَنِ الْبَصَرِ وَفِي رِوَايَةٍ: مَا مَرَّ عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ لَيْلَةَ أُسْرِىَ بِى إِلاَّ قَالُوا عَلَيْكَ بِالْحِجَامَةِ يَا مُحَمَّدُ. روهما الترمذي بسندين حسنين[8]:

عەكرەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئیبنو عەبباس (خوادیان لێ رازی بێ) سێ بەندەی هەبوون، كەڵەشاخ گر بوون، دوانیان بە كەڵەشاخگریی كەسابەتیان دەكردو پوولو پارەیان پەیدا دەكرد بۆ گوزەرانی خۆیو خێزانی، ئەوەكەی تریشیان كەڵەشاخگری خۆیو خێزانی بوو. گوتی: ئیبنو عەبباس گوتی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: بەندەی كەڵەشاخگر بەندەی چاكە، هەم خوێنی پیس لادەباو هەم ژانی پشت سووك دەكاو هەم بەری چاو رۆشن دەكاتەوە لە گێڕانەوەیەكا: بەلای هەر دەستە فریشتەیەكا رەت دەبوو پێیان دەفەرموو: كەڵەشاخ لە خۆتان بگرن! (ت-س/ح).

## ٦٢) یەكێكی تریان دەرمانی رەشكەیە : (ومنه الحبة السوداء)

٢٩٨٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِى الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ مِنَ السَّامِ. رواه الشيخان والترمذي ولفظه: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ السَّامَ، وَالسَّامُ الْمَوْتُ[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): رەشكە دەرمانی هەموو دەردێكی پێوەیە جگە لە مەرگ (ش/ت) گفتەی (ت): رەشكە بە كاربێنن، چونكە مەرگی لێ دەرچێ دەرمانی هەموو، دەردێكی ترە مەبەست لە مەرگ (السام) مردنە.

٢٩٨٨- وَدَخَلَ ابْنُ أَبِى عَتِيقٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى مَرِيضٍ فَقَالَ: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الْحُبَيْبَةِ السُّوَدَاءِ، فَخُذُوا مِنْهَا خَمْسًا أَوْ سَبْعًا فَاسْحَقُوهَا، ثُمَّ اقْطُرُوهَا فِى أَنْفِهِ بِقَطَرَاتِ زَيْتٍ فِى هَذَا الْجَانِبِ وَفِى هَذَا الْجَانِبِ، فَإِنَّ عَائِشَةَ حَدَّثَتْنِى أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

[8] رَوَاهُ الترمذي بسند حسن.

[1] بخاري. طب: ٥٦٨٨. مسلم. السلام: ٥٧٢٨. ترمذي. طب: ٢٠٤١.

يَقُولُ: إنَّ فِى هَذِهِ الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إلاَّ مِنَ السَّامِ. قُلْتُ: وَمَا السَّامُ؟ قَالَ: الْمَوْتُ. رواه البخاري[٢]:

ئیبنو ئەبی عەقیق (خودای لێ رازی بێ) چوو بۆ سەردانی نەخۆشێ گوتی: پێنج دەنك، یا حەوت دەنك یا پتر بە مەرجێ تاك بێ رەشكە بێننو بیكوتنو لەگەڵ چەن دلۆپێ رۆن زەیتووندا بی تكێننە ناو هەردوو كونە لووتی، چونكە عائیشە گێڕایەوە بۆم: كە لە پێغەمبەری ژنەوتووە دەیفەرموو: مەرگی لێ دەرچێ سیاوڵە دەرمانی هەموو دەردێكی پێوەیە عەرزیم كرد: مەرگ چییە؟ گوتی: مرگ واتە: مردن! (ب).

## ٦٣) یەكێكی تریان عوودی هیندییە : (ومنه العود الهندي)

٢٩٨٩- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ. يُسْقطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ. وَفِي رِوَايَةٍ : دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِابْنٍ لِي قَدْ أَعْلَقْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ فَقَالَ: عَلاَمَهْ تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذَا الْعِلاَقِ عَلَيْكُنَّ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْعَطُ مِنَ الْعُذْرَةِ وَيُلَدُّ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ. رواه الثلاثة. والله أعلم[١]:

ئوممو قەیسی كچی میحصەن (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): عوودی هیندی بەكاربێنن چونكە حەوت دەرمانی پێوەیە: بەم شێوەیە بەكار دەهێنرێ: دەیكوتنو بە رۆن زەیتوونەوە، یا رۆنەكەی دەگرن بۆ دوومەڵی مەلاشووی مناڵ دەیتكێننە ناو كونەلووتی، وە رۆنەكەشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە. لە گێڕانەوەیەكا: كوڕێكی خۆمم پێ بوو دومەڵ لەناو قوڕگی دەرچوو بوو، بە زەبری پەنجە

---

[٢] بخاري. طب: ٥٦٨٧.

[١] بخاري. طب: ٥٦٩٢ ، ٥٧١٣ ، ٥٧١٥ ، ٥٧١٨. تجريد/ ٥ ل- - ١٦٥ رقم: ١٨٧٤ / ٥٦٩٢. مسلم. السلام: ٥٧٢٦. أبو داوُد طب: ٣٨٧٧.

دوومەڵەکەم تەقاند، کە چووومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بۆچی بەزەبری پەنجە دوومەڵی گەرووی منالّتان دەتەقێننو ئازارێکی زۆریان دەدەن. بە عوودی هیندی واتە: بە قوسط کە رۆنێکە بۆ دەرمانی دەرد، دەرمانی بکەن، ئەم عوودی هیندی (دارە هیندی)یە دەرمانی حەوت دەردە: بۆ دومەڵی گەرووی منالّ دەیتکێننە ناو کونە لووتی، وە ئاوەکەشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە (ش/د).

## ٦٤) یەکێکی تریان دەرمانکردنە بە دەمی نەخۆشەوە: یا دەرمانکردنە ناو لووتی: یەکێکی تریشیان دەرمانی رەوانییە: ومنه اللدود والسعوط والمشي

٢٩٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: لَدَدْنَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَرَضِهِ فَأَشَارَ إِلَيْنَا لاَ، فَقُلْنَا كَرَاهِيَةُ الْمَرِيضِ لِلدَّوَاءِ. فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: أَلَمْ أَنْهَكُمْ أَنْ تَلُدُّونِي. قُلْنَا: كَرَاهِيَةَ الْمَرِيضِ لِلدَّوَاءِ. فَقَالَ: لاَ يَبْقَى أَحَدٌ فِي الْبَيْتِ إِلاَّ لُدَّ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلاَّ الْعَبَّاسَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَشْهَدْكُمْ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە نەخۆشینەکەی پێغەمبەردا (درووود و سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەرمانمان دەکرد بە دەمیەوە، لەلاوە بە زۆر، ئەویش کارەکەی ئێمەی بە دڵ نەبوو، ئیشارەتی بۆ دەکردین کە شتی وا نەکەین، ئێمەش گوتمان: بۆیە وانیشان دەدا چونکە نەخۆش حەزی لە دەرمان نیە، بەڵام کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: ئەوە من نەمگوت کە بە زۆر دەرمان مەکەن بە دەممەوە لە لاوە! گوتمان: بۆیە بە گوێمان نەکردی لە دڵی خۆمانا گوتمان: نەخۆش حەزی لە دەرمان نیە فەرمووی: دەبێ لە تۆڵەی ئەوەدا کەواتان لەمن کرد ئەوەی لەم هۆدەیە دایە لە بەرچاوی من بە زۆرو بەنابەدڵ دەرمان بکرێ بە دەمیەوە لەلاوە تەنیا عەبباس نەبێ، چونکە لەوکاتەدا ئەوتان لەگەڵ نەبوو

[1] بخاري. مغازی: ٤٤٥٨ ، ٥٧٠٩ ، ٥٧١٠ ، ٥٧١١ ، ٦٦٨٦ ، ٦٨٩٧. مسلم. سلام: ٥٧٢٥.

تەنانەت لە بەرسوێندەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئوممولموئمینین مەیموونە بە ڕۆژووش بوو بەڵام دەرمانیان بە زۆر کرد بەلادەمیەوەو دەرخواردیان دا. (ش/ت–بەرشەپۆلی ڕەحمەتی خوا کەون).

٢٩٩١– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَعَطَ. رواه ابو داود والشيخان ولفظ الشيخين: احْتَجَمَ وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ وَاسْتَعَطَ[٢]:

← (ب – ٢ ز – ١٤٦ ل – ف – ٣) لە گێڕانەوەی ئێرانەدا: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەرمانی دەتکانە لووتی خۆی (د/ش) گفتەی شەیخەین ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەڵەشاخی لە خۆی دەگرتو کرێشی دەدا بە کەڵەشاخگرەکە، وە دەرمانیشی دەتکانە ناو کونەلووتی خۆی.

٢٩٩٢– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ خَيْرَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ السَّعُوطُ وَاللَّدُودُ وَالْحِجَامَةُ وَالْمَشِيُّ. رواه الترمذي بسند حسن. والله أعلم[٣]:

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باشترین شت کە ئێوە دەرمانی خۆتانی پێ دەکەن سەعووطو لە دوودو کەڵەشاخ گرتنو دەرمانی ڕەوانییە (ت–س/ح). (سەعووطو لە دوود بە دوودەرمان دەگوترێن نازانم بە کوردی چییان پێ دەگوترێ – وەرگێڕ).

---

[٢] تقدم برقم: ٣/١٧٦٦ مجلد/ ٢ تسلسل/ ١٤٦.

[٣] تقدم برقم.

**٦٥) هەندێکی تریان خورمای عەجوەیە، یا دوومەڵانە:** (ومنه العجوة والكمأة)

٢٩٩٣- عَنْ عَامِرَ بْنَ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ أَبِيه عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ. رواه الثلاثة والنسائي[1]:

**عامیری کوڕی سەعد** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: باوکم** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر کەسێ بە یانیان لەسەر خورێنی حەوت دەنك خورمای (عەجوە) بخوات، ئیتر ئەو رۆژە نە زەهرو نەجادوو زیانیان نابێ بۆی (ش/د/ن). راڤەکاران دەڵێن: عەجوە جۆرە خورمایەکە حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **بە دەستی خۆی لە مەدینە ناشتوویەتی (وەرگێڕ).**

٢٩٩٤- عَنْ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ. رواه الشيخان والترمذي وزاد: وَالْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ[2]:

**سەعیدی کوڕی زەید** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: دوومەڵان لە چەشنی ئەو گەزۆیە کە دەباری بۆنەوەی ئیسرائیل وە ئاوەکەی دەرمان (شفاي)ە بۆ چاو (ش/ت) ئیمامی تیرمذي** (خودای لێ رازی بێ) **ئەمەی پترە: خورمای عەجوەش هی بەهەشتەو دەرمانە بۆ زەهر[1].**

---

[1] بخاري. أطعمة: ٥٤٤٥ ، ٥٧٦٨ ، ٥٧٦٩ ، ٥٧٧٩. مسلم. أطعمة: ٥٣٠٧. أبو داوُد. طب: ٣٨٧٦.

[2] بخاري. تفسير: ٤٤٧٨ ، ٤٦٣٩ ، ٥٧٠٨. مسلم. أشربة: ٥٣١٠. ترمذي. طب: ٢٠٦٧.

[1] ئیمامی نەوەوی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نوورو رەحمەت بێ) لە سەرەتای بەرگی چواردەهەمی شەرحی صەحیحی موسلیمدا لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: لەم چەرخەی ئێمەدا منو زۆر کەسی تر بە چاوی خۆمان دیمان کە شێخی راستو دروستو موبارەك شێخ کە ماڵی کوڕی عەبدوڵڵای دیمەشقی بەراستی کوێر بوو بوو وە چاوی یەك تۆز بینایی نەمابوو، جا بە ئاوی رووتی دوومەڵان چاوی خۆی دەرِشت وە خودا چاکی کردەوەو چاوی پێدایەوە، ئەم ئاوی دومەڵانەی بۆیە

٢٩٩٥- وَقَالَ اَبُو هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَخَذْتُ ثَلاَثَةَ أَكْمُؤٍ أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا فَعَصَرْتُهُنَّ فَجَعَلْتُ مَاءَهُنَّ فِي قَارُورَةٍ فَكَحَلْتُ بِهِ جَارِيَةً لِي فَبَرَأَتْ. رواه الترمذي والله أعلم:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سێ دەنك دوومەڵانم هێنا – یا گوتی: پێنج یا حەوت دەنكم هێنا – وە گوشیمنو ئاوەكەیانم كردە شووشەیەكەوە كەنیزەكێكم هەبوو بەو ئاوە چاویم رشت، چاوی چاك بۆوە (ت).

## ٦٦) یەكێكی تریان ئاوە بۆ تادارو بۆ كەسێ كە چاوی پیس كاری لێ كردبێ: ومنه الماء للمحموم والمعين

٢٩٩٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ فَأَبْرِدُوهَا بِالْمَاءِ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: تا لە هاڵاوی دۆزەخە بە ئاوفێنكی بكەنەوە (ش/ت).

٢٩٩٧- وَكَانَتْ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) إِذَا أُتِيَتْ بِالْمَرْأَةِ قَدْ حُمَّتْ تَدْعُو لَهَا، أَخَذَتِ الْمَاءَ فَصَبَّتْهُ بَيْنَهَا وَبَيْنَ جَيْبِهَا وَقَالَتْ كَانَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُنَا أَنْ نَبْرُدَهَا بِالْمَاءِ. رواه البخاري[2]:

دەستووری ئەسمای كچی ئەبو بەكر (خودایان لێ رازی بێ) وابوو كاتێ ژنێكی تاداریان دەهێنا بۆ لای، لەكاتی تا لێ هاتنەكەدا، تا دوعای بۆ بكا، دەچوو ئاوی دەهێناو لە یەخەیەوە دەیكرد بە باخەڵیا بۆ سەرلەشی، وە دیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی كردووە پێمان كە تادار بە ئاو فێنك بكەینەوە! (ب).

---

بەكارهێنا بوو چونكە – باوەری بەم فەرموودەیە هەبوو، وە بە تەمای پیتو فەرو بەرەكەتەكەی بوو، بۆیە خودایش چاكی كردەوە. فەرموودەكەی شێخی نەوەوی تەواو. (وەرگێڕ)

[1] بخاري. بدء الخلق: ٣٢٦٤. مسلم. سلام: ٥٧١٥.

[2] بخاري. طب: ٥٧٢٤. مسلم. سلام: ٥٧٢١. ترمذي. طب: ٢٠٧٤.

٢٩٩٨- عَنْ ثَوْبَانُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمُ الْحُمَّى فَإِنَّ الْحُمَّى قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ فَلْيُطْفِئْهَا عَنْهُ بِالْمَاءِ فَلْيَسْتَنْقِعْ نَهْرًا جَارِيًا لِيَسْتَقْبِلَ جَرْيَةَ الْمَاءِ فَيَقُولُ بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ وَصَدِّقْ رَسُولَكَ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ فَلْيَغْتَمِسْ فِيهِ ثَلاَثَ غَمَسَاتٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي ثَلاَثٍ فَخَمْسٌ وَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي خَمْسٍ فَسَبْعٌ فَإِنْ لَمْ يَبْرَأْ فِي سَبْعٍ فَتِسْعٌ فَإِنَّهَا لاَ تَكَادُ تُجَاوِزُ تِسْعًا بِإِذْنِ اللَّهِ تَعَالَى. رواه الترمذي:

ثەوبان (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: ئەگەر یەکیٚ لە ئیٚوە تا دایگرت با تاکەی بە ئاو سارد بکاتەوەو بە ئاو بیکوژێنیٚتەوە، چونکە تا پارچەیەکە لە ئاگر گەرمیش بە ساردی چار دەکریٚ، با تادار سیٚ رۆژ لەپاش نویٚژی بەیانی بەر لە گزنگی هەتاو بچیٚتە ناو چەمیٚکی رەوانەوەو روو بکاتە رەوانی ئاوەکەو بەرەو هاتنی ئاوەکە بیٚو بلیٚ: بسم الله اللهم اشف عبدك وصدق رسولك: ئەی خوایە! ئەم بەندەی خۆتە چاك بکەرەوەو تەواو خۆشی بکەرەوەو فەرموودەکەی پیٚغەمبەرەکەی خۆت بە راست بگیٚرە. ئینجا سیٚ جار خۆی لە ئاوەکە هەلبکیٚشیٚو خۆی تیا نوقم بکا، جا ئەگەر بە سیٚ رۆژ چاك نەبۆوە با بیکا بەپیٚنج رۆژ، ئەگەر بە پیٚنجیش چاك نەبۆوە با بیکا بە حەوت رۆژ، ئەگەر بە حەوتیش هەر چاك نەبووە با بیکا بە نۆ رۆژ، ئیتر بەفەرمانی خودای گەورە لە نۆ رۆژ رەت نابیٚ (ت).

٢٩٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ تَعَالَى وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعَيْنُ حَقٌّ. رواه الأربعة وزاد مسلم والترمذي: وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا – وَبَيَان الغُسْلِ فِي حَدِيْث أحمد والنسائي وابن حبّان كالآتي: يغسل العائن وجهه ويديه إلى المرفقين ومن سرته إلى أسفل جسمه ويوضع الماء في قدح ويُصب على المعين على رأسه وظهره ثم يكفأ القدح فيبرأ بإذن الله[٤]:

---

[٤] مسلم. طب: ٥٦٦٦، ٥٦٦٥. بخاري. طب. باب: العين حق: ٥٧٤٠.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: چاوی پیس راستەو هەیە (ش/د/ت) ئیمامی موسلیمو ئیمامی تیرمیـذی (غـەرقی بـەحری رەحمـەتی خـوادبنو نەیەنـە دەرێ) ئەمـەیان پـتر کـردووە: ئەگـەر گریمان شتی وابووایە کە دەست پێشکەریی لە چارەنووسی خودایی (قەزاو قـەدەر) بکردایـە چـاوی پـیس دەسـت پێـشکەریی لێ دەکـردو دەیئـەنگاوت چونکە چاوی پیس ئەوەنـدە کاریگـەرە جا ئەگـەر دنیا بـوو کەسـێ بـوو بـە چاوتانەوەو داوایان لێ کردن کە خۆتان بشۆرن بۆیان ئەوە خۆتان بشۆرنو لە پاشا ئاوی خۆشۆردنەکەتان بکەن بەسەر ئەو کەسەدا کە بووە بە چاوتانەوە، تاخودا شیفای بدا..

دەسـتووری ئـەم خۆشـۆردنەش بـەپێی ئـەم فەرموودەیـەی دواوە، کـە ئەحمـەدو نەسـائییو ئیبنـو حـەببان (رەزای خوایـان لێ بـێ) گێراویانەتـەوە ئاوایـە: چاوپیـسەکە دەموچـاویو هـەردوو دەسـتی هـەتا هـەردوو ئانـشکیو لەشـی لـەناوکی بـەرەو خـوار تـا خـوارەوە دەشـۆرێو ئـەو ئـاوە چۆڕاوەیە دەکەنـە قاپێکـەوەو دەیکـەن بەسـەر سـەرو پشتی ئـەو کەسـەدا کـە بـووە بـە چاویەوە، پاشـان قاپەکـە دەمـەونخوون دەکەنـەوە، ئیتر بـە فـەرمانی خـودا چاوینیی بـە چاوەبووەکە خۆشو چاك دەبێتەوە.

٣٠٠٠- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ فَيَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ. رواه ابو داود.

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: جـاران عـادەت وابـوو: دەسـتووریان دەدا بە چاوپیسەکە دەسنوێژی دەگـرت ئینجـا بـە چاوەوە بووەکـە لـەو ئـاوە خـۆی دەشۆری (د-خودای لێ رازی بێ).

٣٠٠١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى فِي بَيْتِهَا جَارِيَةً فِي وَجْهِهَا سَفْعَةٌ فَقَالَ: اسْتَرْقُوا لَهَا، فَإِنَّ بِهَا النَّظْرَةَ. رواه الشيخان[٦]:

[٦] بخاري. طب: ٥٧٣٩. مسلم. سلام: ٥٦٨٩.

**ئوممو سەلەمە** (خودای لیّ رازی بێ) **گوتی: جاریّ پیّغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە مالّی من بوو، کچۆلّەیەکی دی خەرکانە لە دەمو چاوی هاتبوو، فەرمووی: چاوەزاری بۆ بکەن، ئەمە بووە بە چاوەوە! (ش).**

٣٠٠٢- وَقَالَتْ أَسْمَاءَ بِنْتَ عُمَيْسٍ (رَضيَ أللّٰهُ عَنْهَا): يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ وَلَدَ جَعْفَرٍ تُسْرِعُ إِلَيْهِمُ الْعَيْنُ أَفَأَسْتَرْقِي لَهُمْ فَقَالَ « نَعَمْ فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ. رواه الترمذي ومسلم[٧]:

**ئەسمای کچی عومەیس** (خودای لیّ رازی بێ) **گوتی: ئەی پیّغەمبەری خودا! مندالّەکانی جەعفەر بەرچاوینو زوو دەبن بە چاوەوە ئایا چاوەزارو نووشتەیان بۆ بکەم؟ فەرمووی: ئا بۆیان بکە، لە راستیدا گریمان شتی وا بووایە کە دەست پیّشکەریی لە سەرنقیشت (قەدەر- چارەنووس = قەزاو قەدەر = خوانووس) بکردایە ئەوا چاوی پیس دەست پیّشکەریی لیّ دەکردو دەستی خۆی لیّ دەوەشاند! (ت/م).**

## ٦٧) هەندیّکی تریان فرنیو مەحلەبیو کلە

٣٠٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللّٰهُ عَنْهَا) أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا فَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النِّسَاءُ، ثُمَّ تَفَرَّقْنَ، إِلاَّ أَهْلَهَا وَخَاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُبَّتْ عَلَى ثَرِيدٍ ثُمَّ قَالَتْ كُلْنَ مِنْهَا فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ، تَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ. رواه الشيخان (رَضيَ أللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمَا)[١]:

**عائیشە** (خودای لیّ رازی بێ) **کاتیّ کەسیّکی دەمرد، ژنان کە لیّی کۆ دەبوونەوە کاتیّ کە بلاّوەیان لیّ دەکردو دەمایەوە کەسو کارو دەستوو پیّوەندەکەی خۆی، دەستووری دەدا پڕ دیزەییّ پەلّوولەیان دەکردو دەیان**

---

[٧] مسلم. سلام: ٥٦٩٠.

[١] بخاري. أطعمة: ٥٤١٧ ، ٥٦٨٩. مسلم. سلام: ٥٧٣٠. ترمذي. طب: ٣٠٣٩م.

کرد بەسەر تریتدا، ئینجا بە ژنەکانی دەگوت: لەمە بخۆن، چونکە من خۆم ژنەوتوومە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: پەڵووڵە بەری دڵی نەخۆش دەگرێو ناوسکی دەحەوێنێتەوەو خەمو خەفەتیش هەنێ سووك دەکا! (ش).

٣٠٠٤- وَعَنْهَا كَانَتْ تَأْمُرُ بِالتَّلْبِينِ لِلْمَرِيضِ وَلِلْمَحْزُونِ عَلَى الْهَالِكِ، وَكَانَتْ تَقُولُ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ التَّلْبِينَةَ تُجِمُّ فُؤَادَ الْمَرِيضِ، وَتَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ. رواه البخاري (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)[٤]:

دیسان لە عائیشەوە (خودای لێ رازی بێ) دەستووری دەدا کە محەللەبی بدەن بە نەخۆشو بە خەمبارێ کە کەسێکی دەمرێ، دەیگوت: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): فرنی بەری دڵی نەخۆش دەگرێو هەناوی تی دێنێتەوەو خەمو خەفەتیش هەنێ دەرەوێنێتەوە. (بوخاری – هەزار هەزار رەحمەتی لێ بێ).

٣٠٠٥- وَعَنْهَا قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَخَذَ أَهْلَهُ الْوَعْكُ أَمَرَ بِالْحَسَاءِ فَصُنِعَ ثُمَّ أَمَرَهُمْ فَحَسَوْا مِنْهُ وَكَانَ يَقُولُ: إِنَّهُ لَيَرْتُو فُؤَادَ الْحَزِينِ وَيَسْرُو عَنْ فُؤَادِ السَّقِيمِ كَمَا تَسْرُو إِحْدَاكُنَّ الْوَسَخَ بِالْمَاءِ عَنْ وَجْهِهَا. رواه الترمذي.

دیسان گوتی: جاران کە کەسێکی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) تا دایدەگرت، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری دەدا ئاردەوایان دروست دەکردو دەیفەرموو پێیان کە لێی بخۆن، وە دیەفەرموو: ئاردەواو شۆرباو بەری دڵی خەمبار دەگرێو خەمی دڵی نەخۆش لادەبا، وەك چۆن ئافرەتێ لە ئێوە چڵکی دەموچاوی بەئاو بشۆری ئاوا (ت).

٣٠٠٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: إِنَّ خَيْرَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الإِثْمِدُ فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ. رَوَاهُ أصحاب السنن. وزاد الترمذي: وَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُكْحُلَةٌ يَكْتَحِلُ بِهَا عِنْدَ النَّوْمِ ثَلاثًا فِي كُلِّ عَيْنٍ[٤]:

---

[٤] بخاري. طب: ٥٦٨٩ ، ٥٦٩٠.

← (ب – ٢ ز – ٨٨ ل –ف – ٤) لێرانەدا ئەمەی پترە: تیرمیذی (خودای لێ رازی بێ) ئەمەی پترە: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کلدانێکی هەبوو لەکاتی خەوتندا چاوی خۆی لێ دەڕشت، هەرچاوەی سێ کلچێوکی پیا دەهێنا.

## ٦٨) هێندێکی دیکەیان ڕۆن زەیتوونو سینەمەکییە

٣٠٠٧– عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَنْعَتُ الزَّيْتَ وَالْوَرْسَ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ[١]:

زەیدی کوڕی ئەرقەم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆن زەیتوونو وەرس (گیازەعفەران)ی دەنواند بۆ چارەی نەخۆشی پالوو (ت–ص).

٣٠٠٨– وَعَنْهُ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نَتَدَاوَى مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ بِالْقُسْطِ الْبَحْرِيِّ وَالزَّيْتِ[٢]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری دەدا پێمان کە بۆ نەخۆشی پالوو بە قوسطی بەحریو ڕۆن زەیتوون خۆمان دەرمان بکەین (ت–ص).

٣٠٠٩– عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَأَلَهَا: بِمَ تَسْتَمْشِينَ. قَالَتْ: بِالشُّبْرُمِ. قَالَ: حَارٌّ جَارٌّ. قَالَتْ: ثُمَّ اسْتَمْشَيْتُ بِالسَّنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْ أَنَّ شَيْئًا كَانَ فِيهِ شِفَاءٌ مِنَ الْمَوْتِ لَكَانَ فِي السَّنَا. روى الترمذي هذه الثلاثة:

ئەسمای کچی عومەیس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پرسی لێم: بەچی سکی خۆت رەوان دەکەی؟ عەرزیم کرد: بە

---

[٤] بسند حسن.

[١] بسند حسن.

[٢] بسند غريب.

(شـوبروم؟) فـەرمووی: ئـەوە زۆر گـەرمو كەسـكونە گـوتی: لـەوە پـاش بـە سینەمەكی خۆم رەوان دەكرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر مردن دەرمانی ببوایە سینەمەكی دەبوو بە دەرمانی (ت–سند غریب) شوبروم بـەری گیایەكـە وەك دەنكـە نـۆك وایـە، دەكولـێ و ئاوەكـەی بـۆ دەرمـان دەخوێتەوە – وەرگێڕ).

## ٦٩) یەكێكی تریان شیرو گمێزی وشترە

٣٠١٠– (سبق في رقم: ٣/ مجلد/٣ تسلسل/٨٨)[1].

٣٠١١– وَقَالَ الْحَجَّاجَ لأَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) حَدِّثْنِي بِأَشَدِّ عُقُوبَةٍ عَاقَبَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَدَّثَهُ بِهَذَا. (أي بهذا الحديث الذي سبق الرقم السابق) فَبَلَغَ الْحَسَنَ (البصريَّ تحديث أنسٍ بهذا الحديث لهذا الظَّالم) فَقَالَ: وَدِدْتُ أَنَّهُ لَمْ يُحَدِّثْهُ بَهَذَا. رواه البخاري والترمذي[2].

حـەججاج گـوتی بـە ئەنـەس (خـودای لێ رازی بـێ): سـەخترین تۆڵـەیێ کـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سزای كەسێكی پێ دابێ، چی بوو پێمی بڵێ؟ ئەنەسیش ئەم فەرموودەیەی كە لە پێشەوە رۆیشت گێڕایەوە بۆی، جا كە ئەم باسو خواسە گەیشتەوە بە شێخ حەسەنی بەصری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: خۆزگەم ئەمەی نەدەگێڕایەوە بۆی چونكە ئەم كابرایە ستەم كارە بە تـڕە بەهانەیێ رێ بۆ خۆی خۆش دەكا (ب).

٣٠١٢– وَسُئِلَ ابْنِ شِهَابٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ أَلْبَانَ الأُتُنِ (أنثى الحمير) أَوْ مَرَارَةَ السَّبُعِ أَوْ أَبْوَالَ الإِبِلِ. قَالَ: قَدْ كَانَ الْمُسْلِمُونَ يَتَدَاوَوْنَ بِهَا، فَلاَ يَرَوْنَ بِذَلِكَ بَأْسًا. رواه البخاري (رَضيَ اللهُ عَنهُ) والله أعلم[3].

---

[1] بخاري. طب: ٥٦٨٥.

[2] بخاري. طب: ٥٧٨١.

[3] بخاري. طب. ٥٧٨٠، ٥٧٨١.

بۆ تیمارکردن بە شیری ماکەرو زراوی دڕندەو گمیزی وشتر لە ئیبنو شەهاب پرسیار کرا گوتی: لە راستیدا جاران موسوڵمانان ئەمانەیان بۆ دەرمان بەکار دەهێنا، وە بەخراپیشیان دانەدەنا! (ب-رەحمەتی لێ بێ).

## ٧٠) یەکێکی تریان سووتووە بۆ برینو زام : (ومنه الرماد للجروح)

٣٠١٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كُسِرَتْ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْبَيْضَةُ، وَأُدْمِيَ وَجْهُهُ، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، كَانَ عَلِيٌّ يَخْتَلِفُ بِالْمَاءِ فِي الْمِجَنِّ، وَفَاطِمَةُ تَغْسِلُ عَنْ وَجْهِهِ الدَّمَ، فَلَمَّا رَأَتْهُ يَزِيدُ عَلَى الْمَاءِ عَمَدَتْ إِلَى حَصِيرٍ فَأَحْرَقَتْهَا وَأَلْصَقَتْهَا عَلَى الجُرحِ فَرَقَأَ الدَّمُ. رواه البخاري والترمذي[1]:

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە رۆژی هەراکەی ئوحوددا کە خوودەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەری دا شکاو خوێن بە دەموچاویا هاتە خوارەوەو ددانە چوارینە (روباعییە)کەی لە ریزی لای راستی لە خوارەوە شکا، عەلی لە قەڵغانێکا ئاوی دەهێناو فاطیمەیش خوێنەکەی دشۆری، جا فاطیمە (خودای لێ رازی بێ) کە روانی خوێنەکە بە ئاوەکە زۆر تر دەبێ، چوو پرزۆڵێ حەسیری هێناو سووتاندیو کردی بە سووتوو، وەنای لە سەر زامەکە، ئیتر خوێنەکەی وەستایەوە (ب/ت).

## ٧١) هەندێکی تریان خەیارو روطابە بۆ قەڵەوبوون، یا ترۆزیو روطابە: ومنه القثاء والرطب للسمنة

٣٠١٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أَرَادَتْ أُمِّي أَنْ تُسَمِّنَنِي لِدُخُولِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ أَقْبَلْ عَلَيْهَا بِشَيْءٍ مِمَّا تُرِيدُ حَتَّى أَطْعَمَتْنِي الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ فَسَمِنْتُ عَلَيْهِ كَأَحْسَنِ السِّمَنِ. رواه أبو داود والنسائي.

---

[1] بخاري. طب: ٥٧٢.

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دایکم گەلێ هەوڵی دا لەگەڵما کە تۆزێ قەڵەوم بکاتەوە تا بە بووکی بم بەن بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەڵام هیچ سوودی نەبوو بۆمو قەڵەو نەبووم تا ترۆزیی و خورمای تازەی دەرخوارد دام، ئیتر زۆرباش پێی قەڵەو بووم (د/ن).

**٧٢) تیمارکردن بەشتی حەرام دروست نیە: (لا يجوز التداوي بالحرام)**

٣٠١٥- ← (ب-٤ ز-٢٥ ف-٨ ل-٨٧ چ/١)[1].

٣٠١٦- ← (ب-٤ ز-٤٩ ف-٣ ل-١٦ چ/١)[2].

٣٠١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الدَّوَاءِ الْخَبِيثِ. رواه ابو داود والترمذي.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی تیمارکردن بە دەرمانی پیسی نەدەدا (د/ت).

٣٠١٨- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ الدَّاءَ وَالدَّوَاءَ وَجَعَلَ لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءً فَتَدَاوَوْا وَلاَ تَدَاوَوْا بِحَرَامٍ.

ئەبو دەردا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا هەم دەردو هەم دەرمانی داناوە، وە هەر دەردێ دەرمانێکی بۆ داناوە، کەواتە خۆتان دەرمان بکەن، بەڵام بە شتی حەرام خۆتانم دەرمان مەکەن! (د).

٣٠١٩- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا أُبَالِي مَا أَتَيْتُ إِنْ أَنَا شَرِبْتُ تِرْيَاقًا أَوْ تَعَلَّقْتُ تَمِيمَةً أَوْ قُلْتُ الشِّعْرَ مِنْ قِبَلِ نَفْسِي. رواهما أبو داود. والله أعلى وأعلم:

---

[1] مجلد/٤ ل/٨٧ چاپی یەکەم. ژمارە/٢٧٤٣ چاپی دووەم.

[2] مجلد/٤ ل/١٦ چاپی یەکەم. ژمارە/٢٥٧٧ چاپی دووەم.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەگەر من تریاق بخۆمو نووشتە هەڵبگرمو خۆم شیعرو هەڵبەست دابنێم ئیتر هەرچی خراپەی تریش هەیە بیکەم دەربەست نایەم (د).

## ٧٣) بەشی سێیەم: باسی نووشتەو دۆعا

## الفصل الثالث: في الرقى

٣٠٢٠- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا نَرْقِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَرَى فِي ذَلِكَ فَقَالَ: اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ. رواه مسلم وأبو داود[1]:

عەوفی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران لەسەر دەمی نەزانیدا دۆعاو نووشتەمان دەکرد، جا عەرزی پێغەمبەرمان کرد (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ ئەم بابەتە تۆ چی دەفەرمووی؟ فەرمووی: ئەو نووشتەو دۆعایانەی دەیانکەن کامانەن نیشانمیان بدەن، هەر دۆعاو، نوشتەیێ قسەوباسی شیرکو بتپەرستیی تیا نەبێو بۆنی فرە خوایی لێ نەیێ قەی ناکا (م/د).

٣٠٢١- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: لَدَغَتْ رَجُلاً مِنَّا عَقْرَبٌ وَنَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرْقِي؟ قَالَ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَنْفَعَ أَخَاهُ فَلْيَفْعَلْ[2]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، دوو پشکێ دای بە پیاوێکمانەوە، کابرایێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نوشتەی بۆ بکەم؟ فەرمووی: هەر کەسێکتان دەتوانێ سوود بە برادەرێکی خۆی بگەیەنێ با دریغی لێ نەکا (م).

---

[1] مسلم. سلام: ٥٦٩٦. أبو داود. طب: ٣٨٨٦.

[2] مسلم. سلام: ٥٦٩١.

٣٠٢٢- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ لِي خَالٌ يَرْقِي مِنَ الْعَقْرَبِ فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ نَهَيْتَ عَنِ الرُّقَى وَأَنَا أَرْقِي مِنَ الْعَقْرَبِ. فَقَالَ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَنْفَعَ أَخَاهُ فَلْيَفْعَلْ. رواهما مسلم[٣]:

دیسان گوتی: لالەیەکەم هەبوو دۆعای دووپشکی دەکرد، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات عەرزی کرد: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! ئەی پێغەمبەری یەزادنی پاك! تۆ نووشتەو دۆعات قەدەغە کردووەو منیش نووشتەی دووپشك دەکەم؟ فەرمووی: هەر کەسەتان چەندە، دەتوانێ سوودی هەبێ بۆ برای ئایینیی خۆی باسوودی هەبێ بۆی (م).

٣٠٢٣- وَقَالَتْ الشِّفَاءُ بِنْتُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا عِنْدَ حَفْصَةَ فَقَالَ لِي « أَلاَ تُعَلِّمِينَ هَذِهِ رُقْيَةَ النَّمْلَةِ كَمَا عَلَّمْتِيهَا الْكِتَابَةَ. رواه أبو داود وأحمد والحاكم وصححه[٤]:

شیفای کچی عەبوللا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: من لەلای حەفصە بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام، فەرمووی پێم: بۆچی نووشتووی مێکوتەش فێری ئەمە ناکەی وەك فێری نووسینت کردووە* (د/ئەحمەد/حاکم:ص).

٣٠٢٤- وكانت نساء العرب ترقي مرض النَّملة بهذه الكلمات: العروس تحتفل وتختضب وتكتحل وكُلُّ شيءٍ تفتعل غير ألاَّ تعصي الرَّجُل. رواه أبو داود.

---

[٣] مسلم. سلام: ٥٦٩٣.

[٤] صحيح عند الحاكم.

* ئەمە دەلیلو بەڵگەیەکی زۆر بەهێزو ڕۆشنە لەسەر ئەوە کە دروستە ژن فێری خوێنەواریيو نووسینو خوێندنەوە ببێ، بەڵکوو سوننەتە چونکە ئەوەتە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەزای لەسەرەو تەقدیری کردووە، لە ڕاستی دا ڕەفتاری شیرین لە ئافرەتا پەسەندە نەك نەخوێندەواريو بێ سەوادی. (وەرگێڕ)

جاران ژنانی عەرەب بەم وشانە نوشتەی نەخۆشی مێكوتە (نەملە)یان دەكرد: (العروس تحتفل وتختضب وتكتحل وكل شيء تفعل غير ألا تعصى الرجل): بووك ئاهەنگ دەگێڕێ‌و، خەنەبەندان‌و سوورو سپیاو دەكا، چاویش دەرێژێ، هەرچی تری بەدڵ بێ دەیكا، بەس بێ گوێیی مێردی ناكا! (د) وەك لە حەدیسەكەی پێش ئەم حەدیسەوە دەردەكەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەزای لەسەر ئەم نوشتەی مێكوتەیە هەبوە، بۆیە منیش بە دۆعام داناو دەقە عەرەبییەكەیم لەگەڵ دا نووسی (وەرگێڕ).

٣٠٢٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَخَّصَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَيْنِ وَالْحُمَةِ وَالنَّمْلَةِ. رواه الأربعة[٦]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی داوین كە چاوەزارو دەمبەستی مارو دووپشك‌و جڕو جا نەوەری زەهرداروو نوشتەی مێكوتە بكەین (ش/د/ت-خودایان لێ ڕازی بێ).

## ٧٤) وشەكانی دۆعاو نوشتی: (كلمات الرقى)

٣٠٢٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: لِثَابِتٍ حِيْنَ قَالَ لَهُ اشْتَكَيْتُ: أَلاَ أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ بَلَى. قَالَ: اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ مُذْهِبَ الْبَاسِ اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا. رواه الأربعة[١]:

ثابیت گوتی: بە ئەنەس (خودایان لێ ڕازی بێ): نەخۆشم، ئەویش گوتی: بابە دۆعاكەی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) دۆعات بۆ بكەم، گوتی: بفەرموو، ئەنەس گوتی: (اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ مُذْهِبَ الْبَاسِ اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا): ئەی خودای من! ئەی پەروەردگاری هەر چی ئادەمیزادە! ئەی لابەری ئێش‌و ئازار! شیفای بدەو خۆش‌و چاكی بكەرەوە،

---

[٦] مسلم. سلام: ٥٦٨٨. ترمذي. طب: ٢٠٥٦ ، ٢٠٥٧.

[١] بخاري. مرضى: ٥٦٧٥ ، ٥٧٤٣ ، ٥٧٥٠. مسلم. سلام: ٥٦٧١ — ٥٦٧٥.

شیفادەری بەراستی هەر خۆتیتو خۆشبوونەوە هەر بە دەستی تۆیە، بێجگە لە تۆ شیفادەری تر نیە ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێ دەرمانو نوشتی پارە ناکا شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەردێ نەهێڵێ! (ش/د/ت–خودایان لێ رازی بێ).

٣٠٢٧– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَوِّذُ بَعْضَ أَهْلِهِ، يَمْسَحُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ أَذْهِبِ الْبَاسَ، اشْفِهِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا. رواه الشيخان[٢]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە دوعای بۆیەکێ لە کەسو کاری خۆی دەکرد، دەستی راستی دەهێنا بەسەر جەستەی نەخۆشەکەداو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ أَذْهِبِ الْبَاسَ، اشْفِهِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَمًا) (ش).

٣٠٢٨– وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اشْتَكَى مِنَّا إِنْسَانٌ مَسَحَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ قَالَ: أَذْهِبِ الْبَاسَ... إِلَى آخِرِهُ، فَلَمَّا مَرِضَ وَثَقُلَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ لأَصْنَعَ بِهِ نَحْوَ مَا كَانَ يَصْنَعُ فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ يَدِي ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَاجْعَلْنِي مَعَ الرَّفِيقِ الأَعْلَى. قَالَتْ فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا هُوَ قَدْ قَضَى. رواه مسلم[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو، کاتێ کەسێ لەئێمە ئازارێکی ببوایە دەستی راستی دەهێنا بە شوێنی ئازارەکەداو دەیفەرموو: (أَذْهِبِ الْبَاسَ.. إِلَى آخِرَهُ) جا کاتێ خۆی نەخۆش کەوتو دەردەکەی گران بوو دەستیم گرت تا لەسەر شێوەی جارانی خۆی ئەو دۆعایەی بۆ بکەم کە ئەو جاران دەیکرد بۆ ئێمە کەچی دەستی خۆی لە دەستم راپسکاند، لە پاشا فەرمووی: خودایە لێم خۆشبەو شادم کە بە دیداری هاوڕێی هەرە پایەبڵندو بمبەرەوە بۆ ناو یارانی ئەنجومەنی بالاّ

---

[٢] بخاري. مرضى: ٥٦٧٥. مسلم. سلام: ٥٦٧٣.

[٣] مسلم. سلام: ٥٦٧٨ ، ٥٦٧١.

(مەلەئولئەعلا) کە وان لە پەنای خۆتا ئیتر کە سەرنجمدا روانیم وا گیانی پاکی سپاردو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا (م).

٣٠٢٩- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ إِذَا اشْتَكَى إِنْسَانُ الشَّيْءُ مِنْهُ أَوْ كَانَتْ بِهِ قَرْحَةٌ أَوْ جَرْحٌ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِإِصْبَعِهِ هَكَذَا وَوَضَعَ سُفْيَانُ سَبَّابَتَهُ بِالأَرْضِ ثُمَّ رَفَعَهَا. بِاسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا. رواه الثلاثة والنسائي[٤]:

دیسان گوتی: ئەگەر کەسێ ئێشێ، ئازارێکی ببوایە، یاخود برینێ یا زامێکی پێوە بوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە پەنجەی ئاوای دەکردو ئینجا هەڵی دەگرتەوەو دەیفەرموو: ئیمامی نەوەوی (خوداپایە بەرزی کا) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەنگوشتی شایەتمانی بە تفی خۆی تەڕ دەکردو دەینایە سەر خاکو پەنجەی هەندێ خۆڵی پێوە دەلکا، ئەوجا پەنجەی بە خۆڵو تەڕاییەکەی دەمیەوە دەهێنا بەسەر شوێنی ئازارەکەداو لەو کاتەدا ئەم نزایەی دەخوێندو دەیفەرموو: بِاسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا: بە بەرەکەتی ناوی خودای گەورە دۆعات بۆ دەکەم، ئەمە خاکی زەوی خۆمانە لەگەڵ تەڕایی دەمی موسوڵمانێ لە خۆمان، بە فەرمانی پەروەردگارمان دەبێ بە چارەو دەرمان بۆ نەخۆشمان (ش/د/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٣٠٣٠- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ إِذَا اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَقَاهُ جِبْرِيلُ قَالَ بِاسْمِ اللَّهِ يُبْرِيكَ وَمِنْ كُلِّ دَاءٍ يَشْفِيكَ وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ وَشَرِّ كُلِّ ذِي عَيْنٍ. رواه مسلم[٥]:

دیسان گوتی: جاران ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئێشێ، ئازارێکی هەبوایە، جوبرائیل (سەلامو دروودی خودای مەزنی لەسەربێ) نزای بۆ دەکرد، دەیفەرموو: بِاسْمِ اللَّهِ يُبْرِيكَ وَمِنْ كُلِّ دَاءٍ يَشْفِيكَ وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ وَشَرِّ كُلِّ ذِي عَيْنٍ: بەناوی خودا، خۆی خۆشت دەکاتەوە، وە لە هەموو دەردێ شیفات

---

[٤] بخاري. طب: ٥٧٤٥ ، ٥٧٤٦. مسلم. سلام: ٥٦٨٣. أبو داود. طب: ٣٨٩٥.

[٥] مسلم. سلام: ٥٦٦٣.

دەداو چارەی هەموو نەخۆشینێكت بۆ دەكا، وە لە زیانی ئەو حەسوودانەی كە حەسوودی بە خەڵك دەبەن پەنات دەدا، وە لە زیانی هەموو چاوپیسانێ بە دورت دەگرێ! (م).

٣٠٣١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ. قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ اللَّهُ يَشْفِيكَ بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ. رواه مسلم والترمذي[٦]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) هاتە لای حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: نەخۆشیت؟ فەرمووی: بەڵێ پێی فەرموو: بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ اللَّهُ يَشْفِيكَ بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ: بە پیرۆزی ناوی خودا نزات بۆ دەكەم، كە پەنات بدات لە ئێشو ئازاری هەموو شتێ كە ئازارت دەدا، وە بت پارێزێ لە زیانی هەموو كەسێ، وە بێچاوێنی بی لە چاوی پیسی حەسوود! خودا شیفات دەداو چارەی دەردت دەدا، بە پیرۆزی ناوی خودا نوشتەو دۆعات بۆ دەكەم (م/ت-خودایان لێ رازی بێ).

٣٠٣٢- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَعًا يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ أَسْلَمَ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ وَقُلْ بِاسْمِ اللَّهِ. ثَلاثًا. وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ أَعُوذُ بِاللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي ولفظهما: أَتَيْتَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِي وَجَعٌ قَدْ كَادَ يُهْلِكُنِي فَقَالَ: امْسَحْهُ بِيَمِينِكَ سَبْعَ مَرَّاتٍ وَقُلْ أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ ». قَالَ فَفَعَلْتُ ذَلِكَ فَأَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مَا كَانَ بِي فَلَمْ أَزَلْ آمُرُ بِهِ أَهْلِي وَغَيْرَهُمْ[٧]:

عوسمانی كوڕی ئەبولعاص (خودایان لێ رازی بێ) عەرزی پێغەمبەری كرد (دروودی خودای لەسەربێ): كە ئەوەتی موسوڵمان بووم ئازارێ لە جەستەمدا پەیدا

---

[٦] مسلم. سلام. ٥٦٦٤، ٥٦٦٣.

[٧] مسلم. السلام: ٥٧٠١. أبو داود. طب: ٣٨٩١. ترمذي. طب: ٢٠٨٠.

بووه، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: دەستت دانێ لەسەر ئەو شوێنەی لەشت كە دێشێو سێ جار بڵێ: بِاسْمِ اللّٰهِ، وە حەوت جار بڵێ: أَعُوذُ بِاللّٰهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ: پەنا دەگرم بە خوداو بە تەوانایی ئەو لە زیانی ئەم ئازارەی كە هەستی پێ دەكەمو مەترسیم لێی هەیە (م/د/ت) گفتەی (د)و (ت) ئاوایە: ژانێكم لەگەڵ دابوو، ئەوەندەی نەمابوو كە بمكوژێ، جا چوومە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەوت جار دەستی راستتی بەسەردا بهێنەو هەموو جارێ لەگەڵیا بڵێ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللّٰهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ: پەنا دەگرم بە گەورەییو دەستەلاتو تەوانایی خودا لە زیانی ئەم ئێشەی كە هەستی پێ دەكەم گوتی: كە ئەوەم كرد ئیتر خودا ئەو ژانەی لەكۆڵ خستم، ئیتر منیش لەوساوە كەسو كاری خۆمو خەڵكی تریش رادەسپێرم كەوا بكەن.

٣٠٣٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُعَلِّمُهُمْ مِنَ الْفَزَعِ كَلِمَاتٍ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ. وَكَانَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرٍو يُعَلِّمُهُنَّ مَنْ عَقَلَ مِنْ بَنِيهِ وَمَنْ لَمْ يَعْقِلْ كَتَبَهُ فَأَعْلَقَهُ عَلَيْهِ. رواه أبو داود والترمذي والحاكم وأحمد — ولفظ الترمذي على ما هو في الشرح — ومن لم يبلغ منهم كتبها في صكٍّ ثم علقها في عنقه[8]:

عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكیەوە لە بابایەوە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ چاری تۆقینو ترسان ئەم وشانەی فێر دەكردین: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەكانی خودا كە هیچ خەوشو كەمو كووڕییەكیان نیە لە خەشمو عەزەبی خۆیو لە زیانو وەزەنو شەڕی بەندەكانیو لە سیخورمەدانو ختەدانی شەیتانان بۆ ئەوەی هەڵم بدەنو لە

---

[8] رواه أصحاب السنن بسند حسن (تاج/ ٥ ص ١٣٧ حاشية رقم: ٨) — مترجم.

خشتەم ببەن وە پەنا دەگرم بە خودا لەوەیش کە بە هیچ جۆرێ شەیاتینی توخنم بکەوێ! دەستووری ئیبنو عەمر (خودایان لێ رازی بێ) وابوو ئەم وشانەی فێری ئەو کوڕانەی خۆی دەکرد کە فامیان کردبۆوە، ئەوانەشیان کە هێشتا فامیان نەکردبۆوە دینووسین و دەیکرد بە نوشتەو دەیکردە ملیان! (د/ت/حاکم/ئەحمەد) گفتەی (ت): ئەوانەشیان کە رەسیدە (بالَق) نەبووبوون لە پسوولەیێ دەینووسی و دەیکردە گەردنیان!.

٣٠٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ يَقُولُ: أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ ثُمَّ يَقُولُ: كَانَ أَبُوكُم (إِبْرَاهِيمُ) يُعَوِّذُ بِهِمَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ عَلَيْهِمُ السَّلاَمُ.
رواه أبو داود والترمذي بسند صحيح[٩]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دۆعای بێچاوێنی و نزای ئاگاداریو چاوەزاری بۆ حەسەن و حوسەین (درووددو صەلاتو سەلام لەسەر باپیرەیان و نەنکیان و باوكو دایكیان و خۆیان بێ) بەم شێوەیە دەکرد دەیفەرموو: أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ: لە پەنای وشە تەواوەکانی خودا دابن، دوور بن لە زیانی هەموو شەیتانێ، وە خودا بتانپارێزێ لە وەزەنی هەموو مارو مێرووو گەزندەیێ، وە بێچاوێنی بن لە هەموو چاوێکی پیسی تاوانبار وە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: بابە گەورەشتان ئیبراهیم لەکاتی خۆی دا بەم وشانە دوعای حیفظو چاوەزاری دەکرد بۆ ئیسماعیل و ئیسحاق (دروودی خودایان لەسەربێ) (د/ت-س/ص).

٣٠٣٥- وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لُدِغْتُ اللَّيْلَةَ فَلَمْ أَنَمْ حَتَّى أَصْبَحْتُ. قَالَ: مَاذَا؟ قَالَ: عَقْرَبٌ. قَالَ: أَمَا إِنَّكَ لَوْ قُلْتَ حِينَ

---

[٩] سنده صحيح.

أَمْسَيْتَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ تَضُرَّكَ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ. رواه أبو داود والنسائي بسند حسن[١٠]:

پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شەو شت دای پێمەوە ئیتر لە تاو ئێشی تا بەیانی نەنووستم. فەرمووی: چی پێوەی دای؟ گوتی: دوو پشك فەرمووی: ئەدیی ئەگەر لەکاتی ئێوارەدا بتگوتبایە: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خودا لە زیانی ئەوەی کە خودا خۆی دروستی کردووە ئەگەر ئەم نزایەت بخوێندبایێ مەگەر حەزی خودای لەسەر بوایە دەنا زیانی نەدەبوو بۆت (د/ن–س/ح).

٣٠٣٦– وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَلِّمُهُمْ مِنَ الْحُمَّى وَمِنَ الْأَوْجَاعِ كُلِّهَا أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللّٰهِ الْكَبِيرِ أَعُوذُ بِاللّٰهِ الْعَظِيمِ مِنْ شَرِّ كُلِّ عِرْقٍ نَعَّارٍ وَمِنْ شَرِّ حَرِّ النَّارِ. رواه الترمذي. والله أعلى أعلم.

جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یارانی خۆی فێر دەکرد کە بۆتاو هەموو ئازارێکی تریش بڵێن: (بِسْمِ اللّٰهِ الْكَبِيرِ أَعُوذُ بِاللّٰهِ الْعَظِيمِ، مِنْ شَرِّ كُلِّ عِرْقٍ نَعَّارٍ وَمِنْ شَرِّ حَرِّ النَّارِ): بە پیرۆزی ناوی خودای گەورە، پەنا دەگرم بە خودای مەزن، لە شەڕو ئێشو ئازاری ئەو دەمارانە کە دەکەونە پل لێدانو فرتە فرت، وە لە شەڕو ئێشو ئازاری گەرمایی ئاگری تاو تێ (ت–رەزای خودای لێ بێ).

### ٧٥) نوشتەکردن بە ئایەتی قورئان دروستە! هەروەها دروستە سەر قەڵەمانەشی لەسەر وەربگیرێ! : (الرقية بالقرآن وجواز الاجرة عليها)

٣٠٣٧– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ. وَفِي رِوَايَةٍ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ

---

[١٠] سنده صحيح.

بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ عَنْهُ بِيَدِ نَفْسِهِ لأَنَّهَا كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْ يَدِي. رواه الثلاثة[1]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران کەسێکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە نەخۆش دەکەوت، ئەم سوورەتانەی بەسەردا دەخوێند: سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و سوورەتی (قل أعوذ برب الناس)و سوورەتی (قل هو الله) لە پاشا بە تەڕایی دەمی پفی لێ دەکرد، لە گێڕانەوەیەکا: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە خۆی نەخۆش دەکەوت سوورەتی (قل هو الله)و سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و سوورەتی (قل أعوذ برب الناس)ی بەسەر خویدا دەخوێندو لە پاشا بە تەڕیی دەمی پفی لە خۆی دەکرد، بەڵام لەو نەخۆشییەدا کە تیادا وەفاتی کرد کە نەخۆش کەوت، من خۆم سوورەتەکانم بەسەریدا دەخوێندو ئینجا بە تەڕایی دەمم فووم لێ دەکرد، وەلێ دەستی پێغەمبەر خۆێم هەڵ دەگرتو دەمهێنا بەسەر جەستەی خۆیدا، لەبەر ئەوەی کە دەستی ئەو گەلێ گەلێ لە دەستی من بەپیتو فەڕو بەرەکەتتر بوو! (ش/د).

٣٠٣٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَعَوَّذُ مِنَ الْجَانِّ وَعَيْنِ الإِنْسَانِ حَتَّى نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا. رواه الترمذي (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) بسند حسن[2]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە پێشدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نزای پاراستن (دۆعای حیفظ)و دۆعای چاوەزاری لەشەڕی شەیاطینیو لە وەزەنی چاوی پیسی مەردوم دەکرد بۆ خۆی، بەڵام کاتێ سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و سوورەتی (قل أعوذ برب الناس) هاتنە خوارەوە ئیتر کاری بەم دوو سوورەتە دەکردو کاری بەوانی تر نەما (ت-س/ح).

---

[1] بخاري. فضائل القرآن: ٥٠١٦. مسلم. سلام: ٥٦٧٩. أبو داود. طب: ٣٩٠٢.

[2] سنده صحيح.

٣٠٣٩- وَعَنْهُ أَنَّ رَهْطًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْطَلَقُوا فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا فَنَزَلُوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ، فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لاَ يَنْفَعُهُ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاَءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا بِكُمْ لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ يَنْفَعُ صَاحِبَكُمْ فَأَتَوْهُمْ، فَقَالُوا: إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ فَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ فَلَمْ يَنْفَعَهُ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ شَيْءٌ فَقَالُوا: فَقَالَ: بَعْضُهُمْ: نَعَمْ إِنِّي وَاللهِ لَرَاقٍ وَلَكِنِ وَاللهِ لَقَدِ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً. فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنَ الغَنَمِ فَانْطَلَقَ فَجَعَلَ يَتْفُلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ الحَمدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين. فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَانْطَلَقَ يَمْشِي مَابِهِ قَلَبَةٌ، قَالَ: فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمُ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ. فَقَالُوا اقْتَسِمُوا فَقَالَ الَّذِي رَقَى: لاَ تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ، فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا. فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرُوا لَهُ، فَقَالَ: وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ (وفي رواية: مذكورة في الشرح: قال حقٌ ألقي في روعي، قال) أَصَبْتُمُ اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ. وَفِي رِوَايَةٍ فَكَرِهَ بَعْضَهُمَ ذَلِكَ وَقَالُوا: أَخَذْتَ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ أَجْرًا. حَتَّى قَدِمُوا الْمَدِينَةَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخَذَ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ أَجْرًا. فَقَالَ: إِنَّ أَحَقَّ مَاأَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْراً كِتَابُ اللهِ عزَّ وَجلَّ. رواه الخمسة (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ)[٣]:

**دیسان ئەو** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: دەستەیێ لە یارانی پێغەمبەر** (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو یارانی) **دەچن بۆ سەفەرێ، دەڕۆن تا شەوێ لەلای خێڵێ عەرەبدا لا دەدەن، دەیانەوێ بە میوان قەبووڵیان بکەن بەڵام خێڵە کە رازی نابنو دایان ناکەنو میوانداریيان پێ ناکەن، جا ئاغای خێڵەکە شت پێوەی دەدا، وە لە گڵو گۆی دەخات، وە بە زۆر شت هەوڵی لەگەڵ دەدەن بەڵام سوودی نابێ بۆی، تا هەندێکیان دەڵێن: بۆ ناچن بۆ ناو ئەم کاروانییە کە لێرەدا لایان داوە، سا بەشکوو چارەیێ لەلای کەسێکیان هەبێ، جا دەڕۆن**

---

[٣] بخاري. إجارة: تجريد: ١٠٠٦/ ٢٢٧٦ ، ٥٠٠٧ ، ٥٧٣٦ ، ٥٧٤٩. مسلم. سلام: ٥٦٩٧. أبو داود. طب: ٣٩٠٠ ، ٣٤١٨. ترمذي. طب: ٢٠٣٦ ، ٢٠٦٤.

بۆلایانو دەڵێن: سەرخێڵەکەمان شت پێوەی داوەو بە زۆر شت هەوڵمان لەگەڵی داوە، بەڵام سوودی نیە بۆی، ئایا لەلای کەسێ لە ئێوە چارەیێ نیە؟ یەکێکیان دەڵێ: با، بە خودا من دۆعای گەزندە دەکەم، بەڵام بەخودا چونکە ئێمە داوای میواندریمان لێ کردن کەچی ئێوە داتان نەکردینو رازی نەبوو، منیش دۆعاتان بۆ ناکەم تا سەرقەڵەمانەێیکمان بۆ دانەنێن. ئینجا رێ دەکەون لەسەر بڕکەیێ پەز، ئیتر ئەویش لەگەڵیان دەچێ بۆ لای سەرخێڵەکەو لەوێ سوورەتی (الحمد لله رب العالمين) دەخوێنێ بەسەریاو کەمێ تفی لێ دەدا وە هەتا حەوت جار لە پێشا فاتیحا دەخوێنێو ئینجا بە تەڕایی دەمی پفی لێ دەکا ئیتر شت پێوەدراوە کە وەك وشترێ لەپەت بەربێ دەستو پای کرایەوەو هەستا کەوتە گەڕو یەك دەنك پەلە قاژەو پەلەفرتیو پەلە پڕووسکێی نەما، گوتی: ئیتر ئەو سەرقەڵەمانەی کە لەسەری پێکهاتبوون بە تەواویی دایان پێیان، جا هەندێ کەسیان گوتیان: دەی بادابەشی بکەین لەناو خۆمانا، بەڵام دۆعاگۆکە گوتی: دابەشی مەکەن تا دەچینەوە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و راستی رووداوەکەی عەرز دەکەین، هەتا بزانین ئەو فەرمانی بەچییە پێمان، جا کە هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و ئەمەیان بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: چۆنت زانی کە ئەوە دۆعایە گوتی: شتێکی راست بوو خودا خستیە ناو دڵمەوە، فەرمووی: باشتان کردووە، دەی دابەشی بکەنو پشکێکیش بۆ من دابنێن لەگەڵ خۆتانا تا بە تەواویی دڵنیا بن کە حەڵاڵە. لە گێڕانەوەیەکا: هەندێ کەسیان ئەمەیان بەدڵ نەبوو، وە دەیان گوت: تۆ لەسەر نامەی خودا کرێت وەرگرتووە، تا کاتێ هاتنەوە بۆ مەدینە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە لەسەر نامەی خودا کرێی وەرگرتووە؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رەواترین شت کە کرێی لەسەر وەربگرن قورئانی پیرۆزە کە نامەی خودای گەورەو سەروەرە (ش/د/ت/ن).

٣٠٤٠– عَنْ خَارِجَةَ بْنِ الصَّلْتِ التَّمِيمِيِّ عَنْ عَمِّهِ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) قَالَ: أَقْبَلْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَرَرْنَا عَلَى حَيٍّ مِنَ الْعَرَبِ فَقَالُوا إِنَّا أُنْبِئْنَا

أَنَّكُمْ جِئْتُمْ مِنْ عِنْدِ هَذَا الرَّجُلِ بِخَيْرٍ فَهَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ دَوَاءٍ أَوْ رُقْيَةٍ فَإِنَّ عِنْدَنَا مَعْتُوهًا فِي الْقُيُودِ قَالَ: فَقُلْنَا نَعَمْ. قَالَ: فَجَاءُوا بِمَعْتُوهٍ فِي الْقُيُودِ. فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً كُلَّمَا خَتَمْتُهَا أَجْمَعُ بُزَاقِي ثُمَّ أَتْفُلُ عَلَيْهِ فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ قَالَ: فَأَعْطَوْنِي جُعْلاً فَقُلْتُ لاَ حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسأَلْتُهُ فَقَالَ: كُلْ فَلَعَمْرِي مَنْ أَكَلَ بِرُقْيَةِ بَاطِلٍ لَقَدْ أَكَلْتَ بِرُقْيَةِ حَقٍّ. رواه أبو داود بسند صالح[٤]:

خاریجەی کوڕی صەلتی ئەل-تەمیمی لە مامەیەوە (خودای گەورە لێیان خۆش نوود بێ) گوتی: لەلای پێغەمبەر بووین (دروودی خودای لەسەربێ) کە گەڕاینەوە لە ڕێ بەلای خێڵێ عەرەبدا ڕەت بووین، گوتیان: هەواڵمان زانیوە کە ئێوە بەخێرو خۆشی لەلای ئەو پیاوەوە دێنەوە، ئایا دەرمانێ، نوشتەیێ، دۆعایەکتان لەکن هەیە بۆ شێت باش بێ؟ گوتمان: بەڵێ هەیە جا شێتێکیان هێنا لە کۆتو زنجیردا بوو، منیش سێ ڕۆژی تەواو هەم تاقی بەیانیو هەم تاقی ئێوارێ سوورەتی فاتیحام بەسەردا دەخوێند، وە گشت جارێ کە سوورەتەکەم تەواو دەکرد تفی خۆمم لێ دەدا، ئیتر شێتەکە وەکوو وشترێ کە لەپەت بەربێ ئاوا دەستو پای کرایەوەو ڕزگاری بوو، ئینجا سەرقەڵەمانەیان دا پێم، منیش گوتم: نایخۆم تا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەپرسم، جا کە لێم پرسی، فەرمووی: بیخۆ، بە گیانی خۆم ئەگەر خەڵکی سەرقەڵەمانەی نوشتەی هیچو پووچ بخۆن تۆ سەرقەڵەمانەی نوشتەیەکی ڕاستو دروست دەخوێت (د-سند صالح).

---

[٤] سند صالح.

## ٧٦) بەشی چوارەم: ئەفسانەو قسەی هەڵبەستی پڕوو پووچی سەردەمی نەزانی بایەخیان نییە. نەخۆشی لە خۆیەوە ناتەنێتەوە، نوقلآنەی خراپو بەدبینی کاریگەریو تەئسیریان نییە: لەگەڵ ئەوەشدا پارێزو دووور بینی سەلامەتترە

## الفصل الرابع: في نفي مزاعم الجاهلية لا عدوى ولا طيرة: والاحتياط أسلم

٣٠٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ عَدْوَى وَلاَ هَامَةَ وَلاَ نَوْءَ وَلاَ صَفَرَ. رواه الثلاثة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (سڵاوو دروودی لەسەر بێ) دەفەرموێ: نە نەخۆشی تەنینەوە هەیەو نە (هامە) هەیەو نە هیچ بە دەست ئەستێرەو بورج هەیەو نە مانگی سەفەر بەدبوومی هەیە[1] (ش/د).

---

[1] تجريد بخاري رقم: ١٨٧٩ = ٥٧٠٧ فتح، ٥٧١٧ ، ٥٧٥٧ ، ٥٧٧٠ ، ٥٧٧٣ ، ٥٧٧٥. مسلم. سلام: ٥٧٤٩ — ٥٧٥٧.

[1] هامە هەندێ دەڵێن کوندەبووە، بەڵام زاناگەورەکان دەفەرموون: هامە ئەفسانەیەك بووە دەڵێ: گوایە ئێسکی کوژراو دەبێ بە مەلێكو هەمیشە دەقیژێنێ هەتا کەسوکارەکەی تۆڵەی دەستێنن!.

بەندە لێرەدا قسەیەکم هەیە دەمەوێ بیکەم، لە مێژەوە لە دڵما بوو، بەڵام لەترسی وشکەسۆفیانو مەلای نامەلای وەك خۆم پرکێشیم نەدەکرد کە بی درکێنم، قسەکەشم ئەمەیە:

١- قورئان فەرمایشتی خودایەو دوورە لە هەڵەو شتی وا، لەکاتی بێویستدا دەبێ موراجەعەی زاناگەورەکانو تەفسیرە گەورەکان بکرێ، وە نابێ گوێ بە قسەی هەندێ کەس بدرێ کە شارەزاییەکی ئەو تۆیان نییە، مەرج نییە هەموو مەلایێ هەموو شتێ بزانێ، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (رب حامل فقه ليس بفيقة).

٢- هەرشتێ کە چەسپاو سابت بوو حەدیسەو فەرموودەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوە راستەو دروستەو لەسەر سەرو لەسەر چاوانە، بەڵام زۆر شت هەیە دەدرێنە پاڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەلێ لە راستی دا قسەی ئەو نییە، یا ئەگەر فەرموودەی ئەویش بێ واتاو رافەیەکی تایبەتی هەیە، کەم تا زۆرێ جۆرە جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ رواڵەتو دیمەنی دەرەوەی فەرموودەکەدا ئەمەیش حەدیس شوناسەکان بە باشی دەیزانن. جا ئەوی لێرەدا من بە دڵسۆزی لە برای موسوڵمانی خۆم داوا دەکەم ئەم دوو خاڵەیە:

**٣٠٤٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ عَدْوَى وَلاَ غُولَ وَلاَ صَفَرَ. رواه مسلم وأبو داود[٢]:**

**جابیر (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نە نەخۆشی تەنینەوە لە خۆیەوە هەیە (چونكە لە راستی دا ئەو نەخۆشییەكە دەتەنێتەوە لەمەوە بۆ ئەو بەپێی چارەنووسو فەرمانی خودایە) وە نە حۆلی بیابان هەبوون (ووجود)ی هەیە، وە نەمانگی موحەڕەم دەبێ بە مانگی صەفەر (م/د).**

---

یەكەم: شتێ كە بەدیمەنو رواڵەت لەگەڵ راو قسەی پزیشكو پسپۆرو زانای ئاسمانیو زانایانی سرووشت رێك نەكەوێو بۆنی دژایەتییان لێ بێ تۆ لەخۆتەوە لایەكیان بەدرۆ دامەنێو بەپێی حاڵ رەفتار لەگەڵ هەردوولایان بكە، باوەڕت بە فەرمایشتە ئایینییەكان هەبێو دەركی مەبەستی راستەكییان هەواڵەی عیلمی خودا كەو بیدەرە دەست زانایانی ئایین، لە هەمان كاتا ئامۆژگاریو تاقیكراوە سرووشتیو زانیارییەكان – ئەگەر گەیشتبوونە پلەی بەڵگە نەویستو یەقین – پشت گوێ مەخە، ئەوەش بزانە كە عیلمو دین دوو برای دوانەی دایكو باوكی رێكو پێكنو قەت ناكۆكیو دوشمنایەتییان لە نێواندا نییە وە لەو قسەیە درۆتر نییە كە گوایە: عەقڵو دین دوژمنی یەكدین! بەڵكوو عەقڵو دین برای یەكدین، دۆستی یەكترین.

خاڵی دووەم: گەلێ شتی پڕوو پووچ كراوون بە حەدیسو فەرمایشتو گەلێ لە خوێندەوارە ساویلكەكان بەبێ سێو دوو كرن دەیانقۆزنەوەو بە نەزانی بڵاویان دەكەنەوە بەناو موسوڵمانانا، تەنانەت گەلێ لەبێ دینو خودا نەناسەكان دەیانكەن بە بەڵگەو بیانوو تەعنو تانووتیان پێ لە دینو ئەهلی دین دەدەن. كەواتە:

گەرتۆ ژیریو خاوەن بیری بگرە ئایین
رەفتی پێ بكە شان بەشانی عیلمو زانین
بەرەو بەهەشت، بەرەو جیهانێكی بەرین
بفڕە وەك مەل بە دوو شاباڵی عیلمو دین

(وەرگێڕ)

[٢] مسلم. سلام: ٥٧٥٧.

**٣٠٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ عَدْوَى وَلاَ صَفَرَ وَلاَ هَامَةَ ». فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا بَالُ إِبِلِي تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ فَيُخَالِطُهَا الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَهَا فَيُجْرِبُهَا كُلَّهَا فَقَالَ: فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ[٣]:**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: نە نەخۆشی تەنینەوە هەیەو نە مانگی موحەڕەم دەبێ بە مانگی صەفەرو نە کوندەبوو بەدبوومە، عارەبێکی دەشتەکی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! وا دەبێ کە وشترەکان لەناو لمدان لەبەر گورجو گۆڵیو پاکیو پوختی دەڵێی ڕەوە ئاسکن، چ دەردیان نییە، کەچی کە وشترێکی لاوەکی گەڕیان تێکلاو دەبێ هەموویان گەڕ دەکا، ئەی ئەوە بۆ وایە؟ فەرمووی: ئەی باشە نەخۆشییەکە لە کێوە تەنییەوەو گەیشت بە یەکەم وشتر!! (ش/د).**

**٣٠٤٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ:لاَ تُورِدُوا الْمُمْرِضَ عَلَى الْمُصِحِّ. رواهما الثلاثة[٤]:**

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: نەخۆش مەکەنە ناو ساخەوە، نەبادا ساخەکانیش نەخۆش بکەون (ش/د).**

**٣٠٤٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَلاَ هَامَةَ وَلاَ صَفَرَ، وَفِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ. رواه البخاري في الجذام[٥]:**

**دیسان لەوەوە** (خودای لێ رازی بێ) **حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: نە نەخۆشی تەنینەوە لە خۆیەوە هەیەو نە نوقلانەی خراب هەیەو نە پێ ڕەشیو بەدقوومی هەیەو نە (هامە) هەیەو نە پاشخستنی موحەڕەم بۆ کاتی صەفەرو پێشخستنی صەفەر بۆ کاتی موحەڕەم هەیەو نە ماری وا هەیە لەناو سکا کە ناوی صەفەر بێو لەکاتی برسێتیدا ئازاری ئادەمیزاد بداو لە**

---

[٣] مسلم. سلام: ٥٧٤٩. تقدم برقم: ١٠٢٨/٣ مجلد/١ تسلسل/١٩٥.

[٤] مسلم. سلام: ٥٧٥٢، ٥٧٥٣.

[٥] بخاري/ تجريد/١٨٧٩ تقدم في تسلسل/٧٦ رقم/٣٠٤١/١.

ویشەوە بتەنێتەوە بۆ یەکیکێ تر، لەگەڵ ئەوەیشە هەتا بۆت دەکرێ لە گولیش پارێز بکەو لەبەری هەڵبێ وەك چۆن لە ترسا لەبەر شێر هەڵ دەێی!
(ب) پوختەی قسەی ساخ ئەمەیە: ئەفسانەو قسەی کۆنی سەردەمی نەزانی، بێ بایەخە، هەموو شت لە بنەڕەتدا بە دەست خودا خۆیەتی، بەڵام بەپێی یاسای ئاسایی و بەپێی حاڵو عادتو باوو بەراورد دەبێ بۆ ئیحتیاطو دوور بینی خۆت لە دەردو نەخۆشی بپارێزی نەبادا تۆش تووش ببی، بە تایبەتی لە نەخۆشیی خراپ وەکوو گولی و گەڕی. ئەمە پوختەی فەرموودەی ئیمامی نەوەوییە، لەم شوێنەدا، (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودابێ). (وەرگێڕ)

٣٠٤٦- وَكَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ فَارْجِعْ. رواه مسلم. نسأل الله السلامة. آمين:

وەفدەکەی ثەقیف کە هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی گولیان تیا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یەکێکی نارد بۆ لای: کەوا هەر لێرەوە لە دوورەوە پەیمانمان بەست لەگەڵ تۆ، ئیتر بگەڕێرەوە (م) خودا بمانپارێزێ لە هەموو دەردو بەڵایێ (ئامین).

## ٧٧) ئەگەر شوومیو بەدبوومی گریمان هەبێ تەنیا لەم سێ شتەدا هەیەو بەس : (إن كان شؤم ففي ثلاث)

٣٠٤٧- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاَثٍ: فِي الْفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالدَّارِ. رواه الأربعة ولفظ أبي داود: لاَ هَامَةَ وَلاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ وَإِنْ تَكُنِ الطِّيَرَةُ فِي شَيْءٍ فَفِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ وَالدَّارِ[1]:

---

[1] بخاري. نكاح: ٥٠٩٣ ، ٥٠٩٥. مسلم. سلام: ٥٧٦٥ — ٥٧٧٣.

**ئیبنــو عومــەر** (خودایـان لێ رازی بـێ) **گــوتی: پێغەمبــەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فـەرمووی: نـە نەخۆشـی تەنینـەوە هەیـەو نـە نوقلانـەی خـراپ بایـەخی هەیـە، شوومیو بەدبوومیش ئەگەر هەبێ لەم سێ شتەدا هەیە:**

**یەکەم: ماینو ئەسپ.**

**دووەم: ژن.**

**ســـێیەم: خـــانوو. (ش/د/ت) گفتـــەی (د): هامـــە نییـــە، بەدفـــەڕیو بەدقوومی نیە، گریمان بەد فەڕیو بەد قوومی ئەگەر هەبێ لـە شتێك دا ئەوا ماینو ژنو خانوو بۆی هەیە!**

**٣٠٤٨- وَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي دَارٍ كَثِيرٌ فِيهَا عَدَدُنَا وَكَثِيرٌ فِيهَا أَمْوَالُنَا فَتَحَوَّلْنَا إِلَى دَارٍ أُخْرَى فَقَلَّ فِيهَا عَدَدُنَا وَقَلَّتْ فِيهَا أَمْوَالُنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): **ذَرُوهَا ذَمِيمَةً. رواه أبو داود بسند صالح. نسأل الله التوفيق لما يرضيه آمين[٢]:**

**پیـاوێ هـات گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئێمـە لەمـەوپێش لەخانوویەکا بووین خۆشمـان زۆر بووینو ماڵیشمان زۆر بوو، بەڵام ئەوەتی گواسـتوومانەتەوە بـۆ خانوویـەکی تـر هـەم خۆشمـان کـەم بـووینو هـەم ماڵیـشمان کـەم بـووە. فـەرمووی:** (دروودی خـودای لەسـەربێ): **کـەوا ناپەسـەندە لـە لاتـانو دڵتـان لێـی هەڵکـەوتووە چـۆڵی بکـەن تـا لـەم دوودڵـیو دڵەڕاوکێیـە رزگارتان ببێو لە خانوویەکی تردا بە ئاسوودەیی دانیشن (د-س/صالح).**

## ٧٨) نوقلانەی باش فرەباشە: (ما أحسن الفال الحسن)

**٣٠٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَـالَ: لاَ طِيَـرَةَ وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ الصَّالِحُ، الْكَلِمَةُ الْحَسَنَةُ. رواه الثلاثة[١]:**

---

[٢] سنده صالح.

[١] تجريد بخاري. رقم: ١٨٨٥ = فتح: ٥٧٥٤ ، ٥٧٥٥. مسلم. سلام: ٥٧٥٩ — ٥٧٦٣.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نوقلانەی خراپ بایەخی نیە، باشترین نوقلانەیش نوخشە لێدانە، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! نوخشە لێدان وەکوو چی؟ فەرمووی: وەك ئەوە دەتانەوێ کارێ بکەن، لەکاتی نیازی کردنەکەیا وشەیەکی باش بەرگوێتان بکەوێ. لە گێڕانەوەیەکا: نوقلانەی خراپ تەئسیری نییە، بەلام حەزی لە نوخشەو نوقلانەی باشە، کە برێتییە لە وشەیێ باش، لە قسەیەکی خێر (ش/د) لەکاتی گوفتوگۆی رێکەوتنی حودەیبییەدا کە سوهەیل بوو بە رابەری بتپەرستەکانو هات بۆ ناو موسوڵمانەکان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ناوەکەی سوهەیلی کرد بە نوقلانەی باشو فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): قد سهل لكم من أمركم: وا تۆزێ ئیشەکەتان بۆ ئاسان بوو بۆیە فەرمووی: تۆزێ چونکە سوهەیل واتە تۆزێ ئاسان! (وەرگێڕ).

٣٠٥٠- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَمِعَ كَلِمَةً فَأَعْجَبَتْهُ فَقَالَ: أَخَذْنَا فَأْلَكَ مِنْ فِيكَ. رواه أبو داود وأبو نعيم:

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وتەیەکی ژنەوت لە کەسێ وتەکەی بەدڵ بوو پێی فەرموو: لەم قسە خێرەی خۆت نوقلانەی باشمان بۆ لێ دایت (د/ئەبو نەعیم).

٣٠٥١- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَتَطَيَّرُ مِنْ شَيْءٍ وَكَانَ إِذَا بَعَثَ عَامِلاً سَأَلَ عَنِ اسْمِهِ فَإِذَا أَعْجَبَهُ اسْمُهُ فَرِحَ بِهِ وَرُئِيَ بِشْرُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ وَإِنْ كَرِهَ اسْمَهُ رُئِيَ كَرَاهِيَةُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ وَإِذَا دَخَلَ قَرْيَةً سَأَلَ عَنِ اسْمِهَا فَإِنْ أَعْجَبَهُ اسْمُهَا فَرِحَ بِهَا وَرُئِيَ بِشْرُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ وَإِنْ كَرِهَ اسْمَهَا رُئِيَ كَرَاهِيَةُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ. رواه أبو داود والنسائي (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا).

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەهۆی هیچ شتێکەوە نوقلانەی خراپی لێ نەدەدا، بەلام کە سەرکارێکی دەنارد بەلایەکا لە ناوەکەی دەپرسی جا ئەگەر ناوەکەی بە دڵی بوایە ئەوا کەیفی پێی دەهاتو رووی گەش دەبۆوە، ئەگەر ناوەکەی بەدڵی نەبوایە ئەوا لە رووی دیار بوو،

وە کاتێ دەشچووە ناو گوندێکەوە لە ناوەکەی دەپرسی، جا ئەگەر ناوەکەی بەدڵی بوایە ئەوا کەیفی پێی دەهاتو رووی گەش دەبۆوە، ئەگینا لە رووی دیاربوو کە ناوەکەی بەدڵ نیە (د/ن).

٣٠٥٢- وَذُكِرَتِ الطِّيَرَةُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَحْسَنُهَا الْفَأْلُ وَلاَ تَرُدُّ مُسْلِمًا فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ لاَ يَأْتِي بِالْحَسَنَاتِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَاتِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ. رواه أبو داود وأحمد. قال الامام النووي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) رواه أبو داود بإسناد صحيح –المترجم[٤]:

لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) باسی نوقلانەکرا، فەرمووی: نوخشەو نوقلانەی باش فرە باشە، نوقلانەی خراپیش کۆڵ بە موسوڵمان ناداو پەکی کاری ناخا، جا ئەگەر تووشی شتێ بوون لەم بابەتەو نوخشەی باش نەبوو بەلاتانەوە ئەوە گوێی پێ مەدەنو بەوە لە نیازی باشو لە کاری خێر پەشیمان مەبنەوەو بۆ دڵنیایش ئەم دۆعایە بخوێننو بڵێن: (اللَّهُمَّ لاَ يَأْتِي بِالْحَسَنَاتِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَاتِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ): پەروەردگارا! ئەی خودای من! چاکەو خراپە هەمووی بە دەستی خۆتە، هەر خێرێ تۆ نەیدەی نابێو هەر شەڕێ تۆ لە کۆڵی نەخەی لە کۆڵ ناکەوێ! وە ئەوەی حەزی تۆی لەسەرنەبێ نابێ، هێزو تەوانایی هەر بە دەستی تۆیە (د-س/ص-ئە).

٣٠٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الطِّيَرَةُ شِرْكٌ الطِّيَرَةُ شِرْكٌ ثَلاَثًا وَمَا مِنَّا إِلاَّ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ. رواه أبو داود والترمذي وصححه[٥]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوقلانەی خراپ خوویەکی بتپەرستییە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار

---

[٤] بإسناد صحيح.

[٥] صحيح عند الترمذي.

ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە، ئینجا فەرمووی: هەمووشمان لە دڵەوە نوقڵانە لێ دەدەینو شتی وا دێ بە دڵماندا بەڵام بەهۆی تەوەککولو پشت بەستن بە خودا، خودا ئەو ئەندیشەو خەیاڵانە لەکۆڵ دەخا (د/ت:ص).

٣٠٥٤- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعْجِبُهُ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَةٍ أَنْ يَسْمَعَ يَا رَاشِدُ يَا نَجِيحُ. رواه الترمذي، والله أعلم.

جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە دەچوو بۆ کردنی کارێ ئەگەر لەوکاتەدا ئەم جۆرە وشانەی بەرگوێ بکەوتایە پێی خۆش بوو، وەك (یا راشد: ئەی شارەزا!)و وەك (یا نجیح: ئەی سەرکەوت!) (ت).

## ٧٩) باسی کاهینیو کوڵەنانیو دانەگرتنەوە (الخط)و رەمڵ گرتنەوە (الطرق). (الكهانة والخط والطرق)

٣٠٥٥- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى نَبِيُّ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَمَهْرِ الْبَغِيِّ وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ. رواه البخاري والترمذي[1]:

ئەبو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەهای سەگو کرێی حیزو وەڵیفەتو سەرقەڵەمانەی کوڵەنانی (کاهن)ی قەدەغە کردووە (ب/ت).

٣٠٥٦- وَقَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): سَأَلَ أُنَاسٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ: لَيْسُوا بِشَيْءٍ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا.قَالَ: تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ، فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ قَرَّ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ. رواه الشيخان[2]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چەن کەسێ لە بارەی کولانانیو کاهینانەوە لە پێغەمبەریان پرسیار کرد فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): هیچ

---

[1] تجريد بخاري: ١٨٨٦ = فتح: ٥٧٥٨، ٥٧٥٩ . ٥٧٦٠، ٥٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠.

[2] بخاري. طب: ٧٦٢٠، ٦٢١٣، ٧٥٦١.

نین گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جاروبار قسەكەیان راست دەردەچێ، ئەی ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەو قسە راستە ئەوەیە كە جندۆكە گوێ هەڵ دەخەن بۆ گوفتوگۆی فریشتەكانو لە دەمی ئەوانی دەڕفێنن، ئینجا وەك مریشكێ بلێ قرت ئاوا دەیچپێنن بە گوێی برادەرەكەیاندا، جا ئەوانیش لە گیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوە دەنێن! (ش).

٣٠٥٧- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلٌ أَنْصَارِيٌّ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُمْ بَيْنَمَا هُمْ جُلُوسٌ لَيْلَةً مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رُمِيَ بِنَجْمٍ فَاسْتَنَارَ فَقَالَ: لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَاذَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا رُمِيَ بِمِثْلِ هَذَا؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ كُنَّا نَقُولُ وُلِدَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ عَظِيمٌ وَمَاتَ رَجُلٌ عَظِيمٌ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِنَّهَا لاَ يُرْمَى بِهَا لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ وَلَكِنْ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى اسْمُهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا سَبَّحَ حَمَلَةُ الْعَرْشِ ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ السَّمَاءِ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ التَّسْبِيحُ أَهْلَ هَذِهِ السَّمَاءِ الدُّنْيَا ثُمَّ قَالَ: الَّذِينَ يَلُونَ حَمَلَةَ الْعَرْشِ لِحَمَلَةِ الْعَرْشِ مَاذَا قَالَ: رَبُّكُمْ فَيُخْبِرُونَهُمْ مَاذَا قَالَ: فَيَسْتَخْبِرُ بَعْضُ أَهْلِ السَّمَوَاتِ بَعْضًا حَتَّى يَبْلُغَ الْخَبَرُ هَذِهِ السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَتَخْطَفُ الْجِنُّ السَّمْعَ فَيَقْذِفُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ وَيُرْمَوْنَ بِهِ فَمَا جَاءُوا بِهِ عَلَى وَجْهِهِ فَهُوَ حَقٌّ وَلَكِنَّهُمْ يَقْرِفُونَ فِيهِ وَيَزِيدُونَ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێكی یاریدەدەر (واتە: ئەنصاری) لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆیگێڕامەوە گوتی: شەوێ لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتبووین، لەو كاتەدا ئەستێرەیێ كشاو شەوقی دەدایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێیان: لە سەردەمی نەزانیدا ئەگەر ئەستێرە بكشایە دەتانگوت چییە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن، ئێمە دەمانگوت: ئەم شەو پیاوێكی گەورە لە دایك دەبێ، یا پیاوێكی گەورە دەمرێ! پێغەمبەر (دروودی

---

[٣] مسلم. سلام: ٥٧٨٠. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٢٤

خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو ئەستێرەیە کە دەکشێ لەبەر ئەوە نیە کە یەکێ دەمرێ یا یەکێ لە دایك دەبێ، بەڵام پەروەردگارمان (ناوی پیرۆزی هەمیشە هەر بەرزو بلندبێ) کاتێ کە بڕیاری کارێ دەدا دەست بەجێ هەڵگرانێ تەختو بارەگای خوداوەندیی (حەمەلەتولعەرش) دەست دەکەن بە تەسبیحاتکردن بۆ خوداو لە شکۆو گەورەیی ئەو کردگارە مەزنو گەورەیە دێنە جومبوشو ستایشو سوپیاسی دەکەن ئینجا خەڵکی ئاسمان (کەوان لە خوار ئەوانەوە) ئەوانیش دەست دەکەن بە تەسبیحاتکردن بۆ خودا، ئیتر دەستە لەدوا دەستەو چین لەدوا چین دەست دەکەن بە تەسبیحاتکردن، هەتا دەنگی تەسبیحاتکردن دەگا بە خەڵکی ئاسمانی هەرە خواروو، کە ئەم ئاسمانەی ئێمەیە ئینجا ئەوانەی کە لە خوار فریشتە هەڵگرەکانی تەختو بارەگای خوادوەندییەوەن بە فریشتە هەڵگرەکانی تەختو بارەگا دەڵێن: ئەوە پەروەردگاری ئێوە چی فەرموو؟ ئەوانیش چی فەرموو بوو بەوانی دەڵێن جا یەك لەدوا یەكو دەستە بە دەستە خەڵکی ئاسمانەکان هەواڵ لە یەکتری دەپرسن تا سەرەنجام ئەو هەواڵە دەگا بە خەڵکی ئاسمانی هەرە خواروو، ئیتر لەوێ جنۆکە گوێ هەڵ دەخەن تا ئەو هەواڵە بدزن لە خەڵکی ئاسمانی خواروو، وە بیفڕێنن بۆ کوڵەنانیو کاهینەکانی دۆستیان، جا لەم کاتەدا فریشتەکان ئەو ئەستێرەیان تێ دەگرن، جا هەرقسەو هەواڵێ کە بە شێوەی خۆی دەیهێنن ئەوە راستو دروستە، بەڵام خۆشیان درۆو دەلەسەی تری پێوە دەنێنو لێی زیاد دەکەن! (ش/ت).

٣٠٥٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اقْتَبَسَ عِلْمًا مِنَ النُّجُومِ اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنَ السِّحْرِ زَادَ مَا زَادَ. رواه أبو داود وأحمد.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی کە بابەتێ لە زانستیی ئەستێرەشوناسیی فێر دەبێ ئەوە بابەتێ لە زانینی جادووبازیی فێر دەبێ، ئیتر چەند بابەت لە ئەستێرە شوناسی فێر ببێ

مەعنای وایە كە ئەوەندە بابەت لە جادوو بازی فێر بووە، زۆر بێ زۆرو كەم بێ كەم (د/ئەحمەد).

٣٠٥٩- عَنْ بَعْضِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِين (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُنَّ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً. رواه مسلم وأحمد ولفظه: مَنْ أَتَى عَرَّافاً أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٥]:

یەكێ لە هاوسەرەكانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی بڕوا بۆ لای فاڵچیو لەبارەی شتێكەوە پرسیاری لێ بكاو بەختی لەلا بگرێتەوە ئەوە نوێژی چل شەوی گیرا نابێ! (م/ئە) گفتەی ئەحمەد: ئەوەی بڕوا بۆ لای فاڵگرەوە (عەڕاف)ێك، یا بۆ لای كوڵەنانییەك وە بڕوا بە قسەی بكا كە گوایە بە درۆی خۆی بەهۆی هەندێ شتەوە شتی نادیار دەزانێ ئەوە باوەڕی نییە بەو قورئانەی كە هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ).

٣٠٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَتَى كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ أَوْ أَتَى امْرَأَتَهُ حَائِضًا أَوْ أَتَى امْرَأَةً مِنْ دُبُرِهَا فَقَدْ بَرِئَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه أصحاب السنن.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ بچێ بۆ لای كاهین (كوڵەنانی)و باوەڕ بە قسەی بكا، یاخود لەكاتی بێنوێژییدا بڕواتە لای ژنی خۆی، یاخود بە پاش بڕواتە لای ژنی خۆی ئەوە فڕی بەسەر شەریعەتو دینو ئایینی موحەممەدەوە نامێنێ! (د/ت/ن).

٣٠٦١- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُمُورًا كُنَّا نَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ كُنَّا نَأْتِي الْكُهَّانَ. قَالَ: « فَلاَ تَأْتُوا الْكُهَّانَ ». قَالَ: قُلْتُ كُنَّا نَتَطَيَّرُ.

---

[٥] مسلم. سلام: ٥٧٨٢.

قَالَ: ذَاكَ شَيْءٌ يَجِدُهُ أَحَدُكُمْ فِي نَفْسِهِ فَلاَ يَصُدَّنَّكُمْ قُلْتُ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَخُطُّونَ؟ قَالَ: كَانَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ يَخُطُّ فَمَنْ وَافَقَ خَطَّهُ فَذَاكَ. رواه مسلم وأبو داود[٧]:

**موعاوییەی كوڕی حەكمی سولەمی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! لە سەردەمی نەزانیدا هەندێ شت هەبوون دەمانكردن، وەك ئەوەی دەچووین بۆلای كاهینانو بۆ هەندێ شت پرسو رامان پێ دەكردن فەرمووی: ئیتر هاموشۆیان مەكەن. گوتم: نوقلانەشمان لێ دەدا، فەرمووی: ئەوەشتێكەو دێ بە دڵتاناو خووو عادەتتان پێیەوە گرتووە، بەڵام بایەخی نییەو دەربەستی مەیەنو لە بڕیاری باشی خۆتان ساردتان نەكاتەوە. گوتم: ئەی پیاوی وامان هەیە بە رەمڵ دانە دەگرنەوە؟ فەرمووی: پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەكانیش بە رەمڵ دانەی دەگرتەوە، جا ئەوەی دانەگرتنەوەكەی رێكی ئەوەبێ كە ئەو پێغەمبەرە دەیكرد ئەوە دروستە، ئەگینا دروست نیە، ئێستاش كەس نازانێ كە ئەو پێغەمبەرە دانەو رەمڵی چۆن گرتۆتەوە كە وابێ بۆ كەس دروست نیە لافی ئەوە لێ بدا (م/د/ن).**

٣٠٦٢- عَنْ قَبِيصَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: الْعِيَافَةُ وَالطِّيَرَةُ وَالطَّرْقُ مِنَ الْجِبْتِ. رواه أبو داود بسند صالح.

**قەبیصە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: بەخت گرتنەوەو نوقلانە لێدانو رەمڵ گرتنەوە لە بتپەرستین (د- سند صالح)**

**{كەهانە واتە: كاهینی = كوڵەنانێتی، مامۆستا مەلا كەریمی بیارە (خودا سەربەرزی هەردوو جیهانی بفەرموێ) لە پێناسە (تەعریف)ی كاهین دا دەڵێ}:**

**كاهن كەسێكە خاوەن ریازەت**

**خۆی نازار دەدا بێ رێی شەریعەت**

---

[٧] مسلم. سلام: ٥٧٥٦ ، ١١٩٩، أبو داود. صلاة: ٩٣٠ ، ٣٢٨٢ ، ٣٩٠٩. نسائی. سهو: ١٢١٧.

خط: دانە گرتنەوە بە رەمڵ یا بە نووسین لەپاش ژماردنی ناوی خۆیو ناوی دایکیو رۆژی پرسیارو.. تد بە حیسابی جومەل طرق: رەمڵ گرتنەوە، زۆر جۆری هەیە، عراف: کاهین، یا فاڵگرەوە = بەختگرەوە، طیرە – تطیر: نوقڵانەی خراپ وەك ئەوە ئەگەر کەروێشك هات بە پیرتەوە خراپە، بەڵام رێوی باشە یا کۆتر بەدقوومە لەماڵا، یا کوندەبوو قەشو نەگبەتە عیافە: بەخت گرتنەوە بە ناوو دەنگو رەنگی باڵندەو مەل، دەڵێن: وەك قەلەرەش قراندی، کوندەبوو بەسەر هەر ماڵێکا بخوێنێ وێران دەبێ، رێوی هاتووە بە پیریەوە کەروێشك کولۆڵە، کۆتر نیشانەی ئاشتییە. ئەم جۆرە قسانە هەمووی قسەی هیچو پووچە. بەڵام ئەگەر مەبەست تەمسیلو تەشبیەو تەعریضو کینایەو رەمزو نیشانەو مەجاز بێ ئەوە قەیدی نییە – وەرگێڕ–.

## ٨٠) کۆتاییەك: لە هەمووی باشتر تەوەککولو پشت بەستن بەخوایە:
## خاتمة: الأفضل التوكل على الله

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا – ٦٥/٣}.

خودای گەورە دەفەرموێ: وە هەر کەسێ پشت بە خودا ببەستی ئیتر بۆ هەموو شتێ تەنیا خودای بەسە، بە راستی خودا هیچی لە دەست دەرناچێو زۆر بە کارامەیی هەموو کارو فرمانێکی خۆی بەجێ دێنێ، وە بۆ هەموو شتێ ئەندازەو کێشێکی داناوە.

٣٠٦٣– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا فَقَالَ: عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ فَجَعَلَ يَمُرُّ النَّبِيُّ مَعَهُ الرَّجُلُ وَالنَّبِيُّ مَعَهُ الرَّجُلاَنِ، وَالنَّبِيُّ مَعَهُ الرَّهْطُ، وَالنَّبِيُّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، وَرَأَيْتُ سَوَادًا كَثِيرًا سَدَّ الأُفُقَ فَرَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ أُمَّتِي، فَقِيلَ هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ. ثُمَّ قِيلَ لِي انْظُرْ. فَرَأَيْتُ سَوَادًا كَثِيرًا سَدَّ الأُفُقَ فَقِيلَ لِي انْظُرْ هَكَذَا وَهَكَذَا. فَرَأَيْتُ سَوَادًا كَثِيرًا سَدَّ الأُفُقَ فَقِيلَ هَؤُلاَءِ أُمَّتُكَ، وَمَعَ هَؤُلاَءِ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ ». فَتَفَرَّقَ النَّاسُ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَهُمْ، فَتَذَاكَرَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى

اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا أَمَّا نَحْنُ فَوُلِدْنَا فِي الشِّرْكِ، وَلَكِنَّا آمَنَّا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَلَكِنْ هَؤُلاَءِ هُمْ أَبْنَاؤُنَا، فَبَلَغَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: هُمُ الَّذِينَ لاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَكْتَوُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ. فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « نَعَمْ ». فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا؟ فَقَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ. رواه الشيخان والترمذي. ولفظ مسلم: فَقَالَ: رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ. فَقَامَ آخِر فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: سَبَقَكَ بَهَا عُكَاشَةُ[1]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەماڵ دەرچوو هات بۆ ناومان، فەرمووی: لەخەوما نەتەوەکانم پێ نیشاندران و رانوێنران بۆم، تەماشام کرد پێغەمبەری وا هەبوو کە رەت دەبوو بە بەردەمما یەك پیاوی لەگەڵدا بوو وە هەموو گەلەکەی برێتی بوو لەو تاقە زەلامە! وە پێغەمبەری واش هەبوو تاقە دوو پیاوی لەگەڵدا بوون، وە پێغەمبەری وا هەبوو یەکی چەن کەسێکیان لەگەڵدا بوو، هەتا پێغەمبەری واش هەبوو کەسی لەگەڵدا نەبوو، بەڵام تارمایی و رەشایی عەشاماتێکی زۆرم دی تا چاوبڕکا ئاسۆیان داپۆشیبوو، هیوام وابوو کە ئەوانە ئۆمەت و گەلی من بن، بەڵام گوترا: ئەمە مووساو گەلی مووسایە، ئینجا پێم گوترا: تەماشاکە، کە تەماشامکرد تارمایی عەشاماتێکی زۆرم دی، هەتا چاو بڕکا ئاسۆی داگرتبوو، دیسان گوترایەوە پێم: تەماشای ئەملاولای خۆشت بکە، جا کە تەماشام کرد تا چاو بڕبکا بە راست و بە چەپا تارمایی عەشاماتێکی زۆر گەورە ئاسۆی داگرتبوو گوترا پێم: ئەمە نەتەوە (ئوممەت)ی تۆن، حەفتا هەزار کەسیان لەگەڵدایە بەبێ لێ پرسینەوە دەچنە بەهەشت! جا لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) باسی ئەو حەفتا هەزار کەسەیان بۆ بکا کە کێن و کێ نین و چ کارەن خۆی رۆیشەوە بۆ ماڵەوەو یارانیشی

---

[1] بخاري. طب: ٥٧٠٥ = تجريد/ ٥ ل- ١٦٨ رقم: ١٨٧٦/ ٥٧٠٥ ، ٣٤١٠ ، ٥٧٥٢ ، ٦٤٧٢ ، ٦٥٤١. مسلم. إيمان: ٥٢٦. ترمذي. زهل: ٢٤٤٦.

بڵاوەیان لێ کرد، لە ناوخۆیاندا کردیان بە مقۆ - مقۆو گوتیان: ئێمە هەر چەند باوەڕمان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئێمە لە سەردەمی فرە خودایی (شرك)دا لەدایك بووین رەنگ بێ ئەوانە ئێمە نەبین، بەڵکوو ئەوانە لە نەتەوەی ئێمە دەبن! جا کە ئەم وتو وێژەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن کە نوقڵانەی خراپ لێ نادەنو نووشتەناکەنو لەبەر نەخۆشی خۆیان داخ ناکەن، بەڵکوو هەمیشە بۆ جێبەجێ بوونی کارو فرمانیان پشت دەبەستن بە لوتفو کەرەمی خوداو بەس! جا عوککاشەی کوڕی میحصەن (خودای لێ رازی بێ) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا من لەم دەستەیەم یانا؟ فەرمووی: ئا، تۆ لەوانی جا یەکێکی تریش هەڵسا گوتی: ئەی من لەوانم یانا؟ فەرمووی: وەکاشە دەست پێشکەریی لێ کردیو بۆ خۆی بردی (ش/ت) گفتەی (م): پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نزام بۆ بکە کە خودا بمکا بە یەکێ لەوانە، فەرمووی: خودایە! بیکە بە یەکێ لەم تاقمەیە پیاوێکی تریش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە خودا بپارێرەوە بۆ منیش کە بمکا بە یەکێ لەوان، فەرمووی: وەکاشە دەست پێشکەریی لێ کردیو ئەم بەهرە باشەی برد بۆ خۆی.

٣٠٦٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ، فَقَالَتْ امْرَأَتُه زَيْنَب: كَيْفَ هَذَا وَاللهِ لَقَدْ كَانَتْ عَيْنِي تَقْذِفُ (بالدُّموع) فَكُنْتُ أَخْتَلِفُ إِلَى فُلاَنِ الْيَهُودِيِّ فَيَرْقِيهَا فَتَسْكُنُ. قَالَ: ذَلِكَ عَمَلُ الشَّيْطَانِ كَانَ يَنْخُسُهَا بِيَدِهِ فَإِذَا رَقَاهَا كَفَّ عَنْهَا إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكِ أَنْ تَقُولِي مَاكَانَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولَ: أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً. رواه أبو داود وابن ماجه.

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نوشتەو چاوەزاروioووفەڕكو نوشتەی چەورو شیرینی لە رەفتاری سەردەمی بتپەرستین. زەینەبی ژنی عەبدوڵڵاش (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئەمە چۆن

چۆنییە؟ سا بەخودا من جاران چاوم ئاوی دەکرد، هەموو جارێ کە دەچووم بۆ لای فیسارە جوولەکە کە دۆعای بەسەردا دەخوێند ئیتر چاوم چاك دەبۆوە، عەبدوللا گوتی: ئەوە ئیشی شەیتان خۆی بووە، دەستی ژەندووە بە ناوچاوتا هەتا چاوت گل بکاو بچی بۆ لای ئەو جوولەکەیە، ئیتر کە جووەکە نوشتەی بۆ کردووەو بەسەریا خوێندووە شەیتان وازی لە چاوت هێناوە ئاوەها بەم شێوەیە هەردوولا گەلەکۆمەیان لە تۆ کردووە، تا لەخشتەت بەرنو بیرو باوەڕت تێك بدەن! بەلام تۆ بۆ ئەوە تەنیا ئەمەت بەس بوو کە وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی دەیفەرموو بتگوتبایە: (أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً). (د/ئیبنو ماجە).

← (ب-٤ ز-٧٤ ف-١ + ف-٢ = رقم: ٣٠٢٦/١ و ٣٠٢٧/٢).

٣٠٦٥- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اكْتَوَى أَوِ اسْتَرْقَى فَقَدْ بَرِئَ مِنَ التَّوَكُّلِ[٣]:

موغیرەی کوڕی شوعبە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بۆ چارە سەری نەخۆشین خۆی داخ بکا یا نوشتە بکا فڕی بەسەرتەوە ککولو پشت بە خودا بەستنەوە نامێنێ! (ت-س/ص).

٣٠٦٦- عَنْ عِيسَى بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي مَعْبَدٍ الْجُهَنِيِّ أَعُودُهُ وَبِهِ حُمْرَةٌ فَقُلْنَا: أَلاَ تُعَلِّقُ شَيْئًا قَالَ: الْمَوْتُ أَقْرَبُ مِنْ ذَلِكَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : مَنْ تَعَلَّقَ شَيْئًا وُكِلَ إِلَيْهِ. رواهما الترمذي والله أعلم.

عیسای کوڕی عەبدورڕەحمان (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو میعبەدی جوهەنی نەخۆش بوو، بای سووری بوو چووم بۆ سەردانی، پێم گوت: بۆ نوشتەیێ، مووفەڕکێ هەڵناگری؟ گوتی: مردن لەوە نزیکترە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی نوشتەو مووفەڕكو شتی وا هەڵبگرێ دەسپێدرێ بەو شتانەو لەژێر چاودێریی خودا دەردەچێ! (ت).

---

[٣] بسند صحيح.

# نامەی پێغەمبەرایەتی‌و پەیامنێریی‌و رەهبەریی (النبوة والرسالة)

**(ئەم نامەیە هەشت بەش‌و پایانێکە)**

**كتاب النبوة والرسالة. (وفيه ثمانية فصول وخاتمة)**

## ٨١) بەشی یەکەم: باسی گەورەیی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر

## الفصل الأول: في فضائل النبي ﷺ

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّيْنَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُواْ أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُواْ وَأَنَاْ مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ – ٣/٨١}.

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! باسی ئەوە بکە کە خودای گەورە ئادوپەیمانی کردووە لەگەڵ پێغەمبەرەکانا‌و پەیمانی لێ وەرگرتوون کە هەرکاتێ نامە (کیتاب)‌و زانست (علیم)م پێدان لە پاشا یەکێ لە پێغەمبەران (دروودو صەلات‌و سەلامی خودای گەورە لەسەر هەموویان بێ) هات بۆ لاتان کە باوەڕدارە بەوەی لەلای ئێوە هەیە لە ئایین‌و خودا پەرستیی راست‌و دروست دەبێ بە پێویستی بزانن کە لە دژی نەبن‌و سەرپێچی لە فەرمانی نەکەن‌و باوەڕی پێ بکەن‌و بەقەی تەواناو بەپێی حاڵ‌و بارو دۆخی خۆتان یارمەتی بدەن. جا خودا فەرمووی پێیان: ئایا ئیقرارتان کرد بەمەی کە پێم گوتن‌و ئادو پەیمانی منتان لەسەر ئەمە وەرگرت؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ ئیقرارمان کرد.. جا خودا فەرمووی: دەی شایەتی بدەن‌و ئەم باس‌و خواسە بەخەڵك بڵێن‌و جاڕ بدەن بەناو گەلانی خۆتانا کە ئێمە ئادو پەیمانێکی ئاوامان لەگەڵ خودادا کردووە، تا ئەوانیش رەفتی پێ بکەن، وە منیش لەگەڵ ئێوەدا دەبم بە شایەت لەسەر ئەمە.

٣٠٦٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بُعِثْتُ مِنْ خَيْرِ قُرُونِ بَنِي آدَمَ قَرْنًا فَقَرْنًا، حَتَّى كُنْتُ مِنَ الْقَرْنِ الَّذِي كُنْتُ فِيهِ. رواه البخاري[1]:

---

[1] بخاري، المناقب: ٣٥٥٧.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: چـەرخ بـە چـەرخو پـشت بـە پـشت بـە پـاكیو باشـی هاتوومەتـە خوارەوەو باو باپیرم لە هەموو سەردەمێكا لە باشترین چینی ئادەمیزادی ئەو سـەردەمە بـوون تـا گەیـشتوومەتە ئـەم چـەرخەی خـۆم كـە خـودا ڕەوانـەی كردوومو كردوومی بە پێغەمبەر! (ب).

٣٠٦٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا سَيِّدُ وَلَـدِ آدَمَ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ. رواه مـسلم وابـو داود والترمـذي ولفظه: أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ وَبِيَدِي لِوَاءُ الْحَمْدِ وَلاَ فَخْرَ وَمَا مِنْ نَبِـيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِوَاهُ إِلاَّ تَحْتَ لِوَائِي وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ وَلاَ فَخْرَ[٢]:

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لـە ڕۆژی قیامەتا من سەرگەورەی سەرجەم نەوەی ئادەمم، وەیەكەم كەسیشم كە دەمـی گۆڕم بۆ دەكرێتەوەو لـە گـۆڕ دێمـە دەرەوە، وە یەكـەم تكا كاریـشم، وە یەكـەم كەسیشم كە لـەلای خودای گـەورە تكـام گـیرا دەبـێ! (م/د/ت) گفتـەی (ت): لـە ڕۆژی قیامەتا من سەر گەورەی نەوەی ئادەمم، وە ئـالای سـوپاسو سـتایشو سەروەریم بە دەستەوەیەو پێشینانو پاشینان سوپاسـم دەكـەن، وە مەبـستم لەكردنی ئەم قسەیەش شـانازیو خۆهەڵكێشان نییـە، بـەڵكوو مەبەسـتم لەمـە بـەیانی حاڵـە، وە لـەو ڕۆژەدا هـەموو پێغەمبـەرەكان لـە ئادەمـەوە بیگـرە هـەتا ئەوانی تریان هـەموویان سـەرجەم لـە ژێـر ئـاڵای مـن دان، وە مـن یەكـەم كـەس دەبم كـە خـاك (گـۆڕ) دەم دەكاتـەوە بـۆمو لـە گـۆڕ دەردەچـم، وە مەبەسـتم لـەم قـسەیەش بـاس كردنـی چاكەی خودایـە بەسـەمنەوەو بـەیانی حاڵـە، ئـەگینا مەبەستم بەخۆوە نازین نیە.

٣٠٦٩- وَقَالَ: رَسُولَ اللهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ كُنْتُ إِمَامَ النَّبِيِّينَ وَخَطِيبَهُمْ وَصَاحِبَ شَفَاعَتِهِمْ غَيْرُ فَخْرٍ. رواه الترمذي.

---

[٢] مسلم. فضائل: ٥٨٩٩. أبو داود. السنة: ٤٦٧٣.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کە ڕۆژی قیامەت هات خۆم دەبم بە پێشەواو دەمراستی پێغەمبەرەکان، وە سەردەقی شەفاعەتو تکا کردنیش خۆم دەیشکێنم! وە مەبستیشم شانازیو بەخۆوە نازین نیە، بەڵکوو مەبەستم سوپاسی خودایەو تەحەدووث بە نازو نیعمەتو بەهرەی ئەو دەکەم (ت).

٣٠٧٠- عَنْ وَاثِلَةَ بْنَ الأَسْقَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ. رواه مسلم والترمذي[٤]:

واثیلەی کوڕی ئەسقەع (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا لەناو هەموو وەچەی ئیسماعیلدا کینانەی هەڵبژاردووە کە یەکێك بووە لە باپیرە گەورەکانم، وە لەناو نەوەی کینانەیشدا هۆزی قورەیشی هەڵبژاردووە، وە لەناو هۆزی قورەیشیشدا کوڕانی هاشم (بەنی هاشم)ی بە پەسەن کردووە وە لەناو کوڕانی هاشمیش دا منی پەسەند کردووە! (م/ت).

٣٠٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ، إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ هَلاَّ وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ. رواه الشيخان والترمذي[٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: داستانی منو داستانی پێغەمبەرەکانی پێش من وەك داستانی پیاوێ وایە، خانوو بەرەیێ هەڵبخاو لە هەموو لایەنێکەوە زۆر بەجوانی

---

[٤] مسلم. فضائل: ٥٨٩٧. ترمذي. مناقب: ٣٦٠٥ ، ٣٦٠٨.

[٥] بخاري. مناقب: ٣٥٣٤. مسلم. فضائل: ٥٩١٨ — ٥٩٢٢. ترمذي. أمثال: ٢٨٦٤. تجريد/ ٤ ل — ٩٨ رقم: ١٤٠٩ / ٣٥٣٥.

دروستی بکاو بە باشی بیرازێنێتەوە، تەنیا شوێنی تاقە یەك خشت نەبێ، کە لە گۆشەیەکا چۆڵ بێ، دەستە دەستە خەڵك بەناویا بسووڕێنەوەو بڵێن: چەندە جوانە! خۆزگە ئەم خشتەش دادەنراو شوێنەکەی ئاوا چۆڵ نەدەبوو فەرمووی: دەی من ئەو خشتەمو ئەو چۆڵییەم پڕ کردۆتەوەو بووم بە دواترین پێغەمبەر ئیتر لە پاش من پێغەمبەری تر نابێ! (ش/ت).

٣٠٧٢- وَعَنْهُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَتَى وَجَبَتْ لَكَ النُّبُوَّةُ؟ قَالَ: وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالْجَسَدِ[٦]:

دیسان گوتی: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەکەیەوە پێغەمبەرایەتیت پێ خەڵات کراوە؟! فەرمووی: هێشتا ئادەم جەستەبوو، گیان نەکرا بوو بە بەریا! (ت-س/ص)

٣٠٧٣- وَقَالَ: الْعَبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ قُرَيْشًا جَلَسُوا فَتَذَاكَرُوا أَحْسَابَهُمْ بَيْنَهُمْ فَجَعَلُوا مَثَلَكَ كَمَثَلِ نَخْلَةٍ فِي كَبْوَةٍ مِنَ الأَرْضِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اللّٰهَ خَلَقَ الْخَلْقَ فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِهِمْ مِنْ خَيْرِ فِرَقِهِمْ وَخَيْرِ الْفَرِيقَيْنِ ثُمَّ تَخَيَّرَ الْقَبَائِلَ فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ قَبِيلَةٍ ثُمَّ تَخَيَّرَ الْبُيُوتَ فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ بُيُوتِهِمْ فَأَنَا خَيْرُهُمْ نَفْسًا وَخَيْرُهُمْ بَيْتًا[٧]:

ئیبنو عەبباسی مامەی پێغەمبەر، (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! قوڕەیش دانیشتبوون لەناو خۆیاندا سەرجەلەی خۆیانیان دەخوێندەوە، تۆیان دانا بە دارخورمای سەری کۆڵان! فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوان بۆ خۆیان دەڵێن، خودای گەورە کە ئەم بوونەوەرەی دروستکرد لە هەرە باشەکەیان رەگەزو بنەچەی منی دروستکرد، لە باشترین چینو تیپی ئەوان منی دروستکرد، وە لە دوو تیپەکەیش لە هەرە باشەکەیان منی دروست کردووە کاتێ کە هۆزەکانی بۆڵ بژێرکردو پاكو پیسیکردن منی

---

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح.

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

**خستە باشترین هۆزیانەوە، وە کاتێ کە بنەماڵەکانی پاكوپیسکرد، منی خستە باشترین بنەماڵەوە، جا بەم پێیە من خۆم لە خۆیان باشترمو بنەماڵەکەشم پشتاوپشت هەر سەر دەستە بوون! (ت-س/ح).**

**٣٠٧٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا أَوَّلُ النَّاسِ خُرُوجًا إِذَا بُعِثُوا وَأَنَا خَطِيبُهُمْ إِذَا وَفَدُوا وَأَنَا مُبَشِّرُهُمْ إِذَا أَيِسُوا لِوَاءُ الْحَمْدِ يَوْمَئِذٍ بِيَدِي وَأَنَا أَكْرَمُ وَلَدِ آدَمَ عَلَى رَبِّي وَلاَ فَخْرَ[٨]:**

**ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کە مەردوم زیندوو دەکرێنەوە من یەکەم کەسم کە لە گۆڕ دەردەچم، وە کە دەڕۆن بۆ خزمەتی پەروەردگاریان من قسەکەرو دەمڕاستیانم، وە کاتێ ئالۆزییو پەرێشانیی ڕۆژی دوایی زۆریان بۆ دێنێو شپرزەیان دەکاو لەبەر بێ کەسی نا ئومێد دەبن لەو کاتە ناسكو شلۆقەدا خۆم فریایان دەکەوم مژدەیان بۆ دەبەمو خۆشیو شادییان تێ دەخەم لەو ڕۆژە گرنگەدا خۆم شا سواری ئەومەیدانەمو ئالای سەربەرزیو سوپاسو حەمدم بە دەستەوەیە! وە من بەرێزترین نەوەی ئادەمم لەلای پەروەردگارم، بە فەخر نەبێ (ت-س/ح).**

**٣٠٧٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ وَمَا نَفَضْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الأَيْدِي وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا[٩]:**

**دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گەیشتە مەدینە هەرچی لە مەدینەدا بوو شەوقی دایەوەو ڕووناك بۆوە، ئەو ڕۆژەیش کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچی دوایی کرد هەرچی تیابوو تاریك بوو، وە هێشتا دەستمان هەڵ**

---

[٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح.

نەگرتبوو لە ناشتنی تەرمەکەی کە دڵمان گۆڕاو دڵمان چووە جێیەکی تر! (ت–س/ص).

٣٠٧٦– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: جَلَسَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْتَظِرُونَهُ، فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا دَنَا مِنْهُمْ سَمِعَهُمْ يَتَذَاكَرُونَ، فَتَسَمَّعَ حَدِيثَهُمْ فَإِذَا بَعْضُهُمْ يَقُولُ عَجَباً إِنَّ اللَّهَ اتَّخَذَ مِنْ خَلْقِهِ خَلِيلاً، فَإِبْرَاهِيمُ خَلِيلُهُ. وَقَالَ: آخَرُ مَاذَا بِأَعْجَبَ مِنْ (وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً) وَقَالَ: آخَرُ فَعِيسَى كَلِمَةُ اللَّهِ وَرُوحُهُ. وَقَالَ: آخَرُ وَآدَمُ اصْطَفَاهُ اللَّهُ. فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ فَسَلَّمَ وَقَالَ: قَدْ سَمِعْتُ كَلاَمَكُمْ وَعَجَبَكُمْ أَنَّ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلُ اللَّهِ وَهُوَ كَذَلِكَ، وَمُوسَى نَجِيُّهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، وَعِيسَى رُوحُهُ وَكَلِمَتُهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، وَآدَمُ اصْطَفَاهُ اللَّهُ تَعَالَى وَهُوَ كَذَلِكَ، أَلاَ وَأَنَا حَبِيبُ اللَّهِ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا حَامِلُ لِوَاءِ الْحَمْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، تَحْتَهُ آدَمُ فَمَنْ دُونَهُ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يُحَرِّكُ غَلَقَ الْجَنَّةِ وَلاَ فَخْرَ، فَيَفْتَحُ اللَّهُ فَيُدْخِلُنِيهَا وَمَعِي فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَكْرَمُ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ عَلَى اللَّهِ وَلاَ فَخْرَ[١٠].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: چەن کەسێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر خۆیو ڕەزای خودا لە یارانی بێ) دانیشتبوون چاوەڕێیان دەکرد پێغەمبەر کە هاتەدەرەوە چوو بۆ لایان کە لێیان نزیك بۆوە بەرگوێی کەوت کەوا خەریکی گوفتوگۆنو هەندێکیان دەڵێن: سەیرە! خودای گەورەو مەزن لەناو هەموو دروستکراوانی خۆیدا ئیبراهیمی هەڵبژاردووەو کردوویەتی بە خەلیلو گرتوویەتی بەدۆستی خۆی، وە هەندێکی تریان دەڵێن: چی لەوە عەجایەبو سەیرترە کە خودا بە قسەکردن قسەی لەگەڵ مووسادا کردووە! وە هەندێکی تریان دەڵێن: عیسایش بە یەك وشەی خودا خۆی پەیدا بووەو گیانێکی پاك بووەو لە لایەنی خوداوە ناردراوە بۆ مەریەم، وە هەندێکی تریان دەڵێن: خودا ئادەمی بە دانسقە هەڵبژاردووە! ئینجا پێغەمبەر (دروودی

[١٠] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

خـودای لەسـەربێ) ڕۆیـشتە ناویـانو سـڵاوی لێ کـردنو فـەرمووی: گـوێم لـە قسەکانتان بوو، لەوەیش کە لەچی سەیرو عەجەب ماون، ڕاستە کە ئیبراهیم دۆستی خودایەو ئەمە خۆی وایەو گومانی تیا نییە، ڕاستیشە کە مووسا هاورازو هاو دەنگی خودابووەو ئەمە خۆی وایە، وە ڕاستیشە کە عیسا گیانێکی پاك بووە لە لایەنی خوداوەو بە یەك وشەی ئەو پەیدابووە لە مەریەم بەبێ بابو ئەمە خۆی وایە، ڕاستیشە کە ئادەم بە دانسقە خودا خۆی بەگەنی کردووەو ئەمە خۆی وایە، بەڵام هۆشیار بن – بەشانازیو فەخر نەبێ – منیش خۆشەویستی خودام، لە ڕۆژی قیامەتا خۆم شاسواری مەیدانی مەحشەرمو ئاڵای حەمدو ستایش هەڵ دەگرم، بەفەخر نەبێ، وە من خۆم یەکەم تکا کارمو یەکەم کەسیشم کە تکام گیرا دەبێ لە ڕۆژی قیامەتا، بە فەخر نەبێ، وە من یەکەم کەس دەبم کە ئەڵقەڕێزی دەرگای بەهەشت رادەوەشێنمو خودا دەرگا دەکاتەوە بۆمو دەمباتە ناوی، وە هەژارانی موسوڵمانانیش لەگەڵمادێنە ژوورەوە! بە فەخر نەبێ، وە من سەروەری پێشینانو پاشینانم بە فەخرو بە خۆ هەڵکێشان نەبێ! (ت–سند غريب).

٣٠٧٧– وَقَالَ: عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمٍ (رَضيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ) مَكْتُوبٌ فِي التَّوْرَاةِ صِفَةُ مُحَمَّدٍ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ – عليه السَّلام – وَيُدْفَنُ عِيسَى مَعَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). روى الترمذي هذه الستة[11]:

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ناونیشانی موحەممەدو ناونیشانی عیسای کوڕی مەریەم لە تەوراتا نووسراوە، وە عیسائیش لە مەدینە دەنێژرێ لە پاڵ موحەممەددا (دروودی خودایان لێ بێ) (ت–س/ح).

٣٠٧٨– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ فِي يَدِهِ لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ وَلاَ يَرَانِي ثُمَّ لأَنْ يَرَانِي أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُمْ. رواه مسلم. والله أعلم[12]:

---

[11] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) لــە پـێغەمبــەرەوە (درودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: بـەو کەسـە کـە گیـانی موحەممـەدی بـە دەسـە کـە خـۆی کەسـی هەموو کەسە ئێوە دەکەونە رۆژێکی واوە حەز دەکەن کە سەرو ماڵی خۆتـان بەخت کەنو لەباتی ئەوە یەك دەم من ببینن، ئیتر لەوە دواش نەم بینن بەو تاقە چاوپێکەوتنە قاییل دەبن (م).

## ٨٢) لە دایکبوونی پێغەمبەرو ناوەکانیو سەرجەلەی پیرۆزی (دروودی خودای لەسەر)

## مولد النبي ﷺ ونسبه وأسماؤه

٣٠٧٩- عَنْ قَيْسِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: وُلِدْتُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْفِيلِ[1]:

قەیسی کـوڕی مەخرەمـە (خودای لێ رازی بێ) دەڵـێ: مـنو پـێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ساڵی عامولفیلدا لەدایك بووین (ت-س/ح).

٣٠٨٠- وَسَأَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ قُبَاثَ بْنَ أَشْيَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) أَأَنْتَ أَكْبَرُ أَمْ رَسُولُ اللَّهِ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكْبَرُ مِنِّي وَأَنَا أَقْدَمُ مِنْهُ فِي الْمِيلَادِ وُلِدَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْفِيلِ وَرَفَعَتْ بِي أُمِّي عَلَى الْمَوْضِعِ قَالَ: وَرَأَيْتُ خَرْءَ الْفِيلِ أَخْضَرَ مُحِيلاً. رواهما الترمذي بسند حسن[2]:

عوسمـانی کـوڕی عـەففان لـە قوباسـی کـوڕی ئەشـیەمی کـوڕی لـەیثـی پرسـی (خودایان لێ رازی بێ) کـە تـۆ گـەورەتری یـا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ)؟ گوتی: ئەو لەمن گەورەترە لە قەدرو رێزا، بەڵام من لەو بەتەمەنترمو لە پێش ئەودا لەدایك بووم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە ساڵی فیل (عامولفیل)دا لە دایك بووە، بەڵام من ئەو ساڵە وابووم دەم فامی، دایکم هەڵی گرتمو

---

[12] مسلم. فضائل: ٦٠٨٢.

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[2] رواه الترمذي بسند حسن

بردمی، وە جێگەی فیلەکانی پێ نیشان دام ئەوەم لەیاد ماوە کە پیسایی فیلەکانم دی وەك شیاکە سەوز هەڵگەڕابوو (ت–س/ح).

٣٠٨١– أَمَّا نَسب النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَهُوَ مُحَمَّدُ (صَلَّى اللَّـهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ هَاشِمِ بْنِ عَبْدِ مَنَافِ بْنِ قُصَيِّ بْنِ كِلاَبِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤَيِّ بْنِ غَالِبِ بْنِ فِهْرِ بْنِ مَالِكِ بْنِ النَّضْرِ بْنِ كِنَانَةَ بْنِ خُزَيْمَةَ بْنِ مُدْرِكَةَ بْنِ إِلْيَاسَ بْنِ مُضَرَ بْنِ نِزَارِ بْنِ مَعَدِّ بْنِ عَدْنَانَ. رواه البخاري[٣]:

سەرجەلەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەیە: موحەممد (دروودی خودای لەسەربێ) کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی عەبدولموطەلیب، کوڕی هاشم، کوڕی عەبدو مەناف، کوڕی قوصەی، کوڕی کیلاب، کوڕی مورە، کوڕی کەعب، کوڕی لوئەی، کوڕی غالیب، کوڕی فیهر، کوڕی مالیك، کوڕی نەضر، کوڕی کینانە، کوڕی خوزەیمە، کوڕی مودریکە، کوڕی ئیلیاس، کوڕی موضەر، کوڕی نیزار، کوڕی موعەدد، کوڕی عەدنان. (ب– بچێتە بەهەشتیو نەیتە دەرێ).

٣٠٨٢– عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِي خَمْسَةُ أَسْمَاءٍ أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِي الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ. رواه الشيخان والترمذي.[٤]:

جوبەیری کوڕی موطعیم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من پێنج ناوم هەیە: من ناوم موحەممەدە من ناوم ئەحمەدە، من ناوم قەلاچۆکەرە، واتە: ئەو کەسەم کە خودا بەهۆی منەوە کوفرو بێ باوەڕیی قەلاچۆ دەکاو قڕی تێ دەخا، من ناوم کۆکەرەوەیە واتە: ئەو کەسەم کە هەموو نەوەی ئادەم کۆ دەکرێنەوەو بەشوێنما دێنو دەچین بۆ

---

[٣] تجريد بخاري/ ٤ ل – ١٩٥؛ (رباب مبعث النبيّ) قبل الرقم؛ ١٥٠٥/ ٣٨٥١ مباشرة.

[٤] بخاري. تجريد: ٤ ل – ٩٦ رقم؛ ١٤٠٦ / ٣٥٣٢ ، ٤٨٩٦. اخرجه مسلم في الفضائل، باب في أسماء النبى (ص) رقم؛ ٢٣٥٤ )تجريد/ ٤/ ٩٦ – كوردى).

مەحشەرو گردەبینەوە لە دەشتێ کۆبوونەوە، من ناوم پاشەبەرەیە، واتە: دواهەمین پێغەمبەرم (ش/ت).

٣٠٨٣- وَقَالَ: أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَمِّي لَنَا نَفْسَهُ أَسْمَاءً فَقَالَ: « أَنَا مُحَمَّدٌ وَأَنَا أَحْمَدُ وَالْمُقَفِّى وَالْحَاشِرُ وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ. رواه مسلم[٥]:

ئەبو مووسای ئەشعەری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەندێ لە ناوەکانی خۆی باس دەکرد بۆمان دەیفەرموو: من ناوم موحەممەدە، وە ناوم ئەحمەدە، وە ناوم دواهەمینە، چونکە دوایین پێغەمبەرم، وە ناوم کۆکەرەوەیە، وە ناوم پێغەمبەری تەوبەیە وە ناوم پێغەمبەری رەحمەتە (م–خودایان لێ رازی بێ).

## ٨٣) بەشی دووەم: باسی نیشانەکانی جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر

## الفصل الثاني: في أوصاف جسمه الشريف ﷺ

٣٠٨٤- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَبْعَةً مِنَ الْقَوْمِ، لَيْسَ بِالطَّوِيلِ وَلاَ بِالْقَصِيرِ، أَزْهَرَ اللَّوْنِ لَيْسَ بِأَبْيَضَ أَمْهَقَ وَلاَ آدَمَ، لَيْسَ بِجَعْدٍ قَطَطٍ وَلاَ سَبْطٍ رَجِلٍ، أُنْزِلَ عَلَيْهِ وَهُوَ ابْنُ أَرْبَعِينَ، فَلَبِثَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ يُنْزَلُ عَلَيْهِ وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعَرَةً بَيْضَاءَ[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی صەلاتو سڵاوی خودای گەورەی لێ بێ) پیاوێکی دەستەی ناوەندی بوو: نە زۆر درێژو نە زۆر کورت بوو، رەنگی سپیو سوور بوو، بەڵام نەك سپییەکی سادەی بێ تام، سەوزەیش نەبوو، قژیشی نەلوولێکی کرژبوو، وە نە خاوەێکی تەواو خاویش بوو، کە (وەحی) سرووشی بۆ هات تەمەنی چڵ ساڵ بوو، دە ساڵ مایەوە لە مەککە، لەو

---

[٥] مسلم. فضائل: ٦٠٦١.

[١] مسلم. فضائل: ٦٠٤٧ — ٦٠٥٧. ترمذي. مناقب: ٣٦٥٠.

ماوەیەدا سرووشی بۆ دەهات، وە لە مەدینەش دە ساڵی تر مایەوە لەوێش هەروەها، وە کاتێ کە گیانی پاکی سپارد هەمووی بیست مووی سپی لەسەرو ریشیا نەبوو (ش/ت).

٣٠٨٥- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً مَرْبُوعًا بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواهما الشيخان والترمذي[٢]:

بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی باڵا ناوەندی بوو، سینگی پان بوو، قژە سەری زۆرو پڕ بوو، دەیدا لە نەرمەی گوێچکەی! جارێ دیم دەستێ جلی سووری لە بەردابوو، هەرگیز لە ژیانی خۆما شتێکم نەدیوە کە ئاوا وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جوانو نازدار بێ (ش/ت).

٣٠٨٦- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَ النَّاسِ وَجْهًا وَأَحْسَنَهُمْ خَلْقًا لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ وَلاَ بِالْقَصِيرِ. رواه الشيخان[٣]:

دیسان گوتی: روخساری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە هەموو کەسێ جوانتربوو، شێوەی تا بڵێی شیرین بوو، رەوشتو رەفتاریشی بۆ جوانیو شیرینی وێنەی نەبوو، باڵای کەڵەگەت بوو، بەڵام قووچێکی بێ تام نەبوو، هەروەها کورتە باڵاش نەبوو (ش).

٣٠٨٧- وَسُئِلَ الْبَرَاءُ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ): أَكَانَ وَجْهِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِثْلَ السَّيْفِ؟ قَالَ: لاَ، بَلْ مِثْلَ الْقَمَرِ. رواه البخاري والترمذي[٤]:

پرسیار کرا لە بەراء (خودای لێ رازی بێ): ئایا دەموچاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەك شمشێر ئاوا بریقەدارو درێژ بوو؟ گوتی: نەء بگرە لەوەش

---

[٢] بخاري. مناقب: ١٤١٨ = تجريد/ ٤ ل ١٠٤ = ٣٥٥١ ، ٥٨٤٨ ، ٥٩٠١ فتح الباری. مسلم. فضائل: ٦٠١٨ — ٦٠٢٠.

[٣] تجريد/ ٤ ل — ١٠٣ ز: ١٤١٦ / ٣٥٤٩. مسلم. فضائل ٦٠٢٠.

[٤] تجريد/ ٤ ل — ١٠٥ ز: ١٤١٨ م/ ٣٥٥٢ فتح الباری + مسلم. فضائل: ٦٠٣٧.

گەلێ جوانتر بوو وەك مانگی چواردە وەها پانو پڕو رووناكو گەش بوو! (ب/ت).

٣٠٨٨- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ رَجُلٌ رَآهُ غَيْرِي. قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ فَكَيْفَ رَأَيْتَهُ؟ قَالَ: كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحًا مُقَصَّدًا. رواه مسلم وأبو داود وفي لفظٍ له: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبْيَضَ مَلِيحًا إِذَا مَشَى كَأَنَّمَا يَهْوِي فِي صَبُوبٍ[٥]:

ئەبو طوفەیل (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەسەر رووی زەوی جگە لە خۆم كەسی ترنەماوە كە پێغەمبەری دیبێ (دروودی خودای لەسەربێ) گوتیان: تۆ كە دیوتە چۆن بوو؟ گوتی: سوورو سپییەكی نازداری شێوە شیرین بوو، لەشو لارێكی ناسكو نازداری رێكو پێكی ئاسایی هەبوو (م/د) لە گفتێكی (د)دا: بە چاوی خۆم پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەربێ) دیوە، سوورو سپییەكی ناسكو نازداربوو، لەكاتی رۆیشتندا دەتگوت: لەبەرەو خواركەوە دادەپەڕێ!

٣٠٨٩- وَقَالَ: جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَلِيعَ الْفَمِ أَشْكَلَ الْعَيْنَيْنِ مَنْهُوسَ الْعَقِبِ. رواه مسلم والترمذي[٦]:

جابیر كوڕی سەموورە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەمی گەورەبوو، چاوی قەویو نەخشینو جوانو بوو، پاژنەی پێی كەم گۆشت بوو (م/ت).

٣٠٩٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالطَّوِيلِ وَلاَ بِالْقَصِيرِ شَثْنَ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ ضَخْمَ الرَّأْسِ ضَخْمَ الْكَرَادِيسِ طَوِيلَ الْمَسْرُبَةِ إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤًا كَأَنَّمَا انْحَطَّ مِنْ صَبَبٍ لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ[٧]:

---

[٥] مسلم. فضائل: ٦٠٢٥ ، ٦٠٢٦.

[٦] مسلم. فضائل: ٦٠٢٤.

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

**عەلی** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) **نە قووچ بوو نە کورت بوو، دەستو پێی قەوی قەوی بوون سەرو کەللەی قەوی بوو، سەرچەمگەکانی قەوی بوون مووی سەرسینگی وەك کلافە تا خوارەوە قەتارەی بەستبوو، لەکاتی ڕۆییندا کە دەڕۆیشت کەمێ بە بەرا دەینواند: دەتگوت لە سەرەو خوارکەوەدا دەپەڕێ! نەبەر لە پێغەمبەرو نە لەپاش پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **کەسم نەدیوە لە شێوەی ئەو وا جوانو قەڵەم ڕێك بێ! (ت-س/ص).**

**٣٠٩١- وَكَانَ عَلِيٌّ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **إِذَا وَصَفَ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لَمْ يَكُنْ بِالطَّوِيلِ الْمُمَغَّطِ وَلاَ بِالْقَصِيرِ الْمُتَرَدِّدِ وَكَانَ رَبْعَةً مِنَ الْقَوْمِ وَلَمْ يَكُنْ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ وَلاَ بِالسَّبِطِ وَلَمْ يَكُنْ بِالْمُطَهَّمِ وَلاَ بِالْمُكَلْثَمِ وَكَانَ فِي الْوَجْهِ تَدْوِيرٌ أَبْيَضُ مُشْرَبًا إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ كَأَنَّمَا يَمْشِي فِي صَبَبٍ. وَإِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ مَعًا بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ أَجْوَدُ النَّاسِ كَفًّا وَأَشْرَحُهُمْ صَدْرًا. وَأَصْدَقُ النَّاسِ لَهْجَةً وَأَلْيَنُهُمْ عَرِيكَةً. وَأَكْرَمُهُمْ عِشْرَةً. مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ. وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ. يَقُولُ نَاعِتُهُ: لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ**[٨]**:**

**عەلی** (خودای لێ ڕازی بێ) **کە ناونیشانی پێغەمبەری هەڵ دەدا دەیگوت: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **نە قووچێکی درێژ داهوڵ بوو وە نەکورتە بنەیەکی کوڵەبنە بوو. پیاوێکی بالا بەرزی مام ناوەندی بوو، قژەکەی نە زۆر لوولو نەزۆر کرژ بوو وەك قژی قولەڕەشەکان چۆنە ئاوا نەبوو وەلێ خاوێکی بێ تامیش نەبوو، لە شیشی گۆشتن نەبوو، دەموچاویشی گووپن نەبوو! بەلام ڕوومەتی پان بوو، ئەمە تەختی ڕوومەتی بوو، سپیکارێکی سوورو سپی بوو، کە دەڕۆیشت پێی هەڵ دەگرت وەك لە سەربەرەو ژێرەوە داپەڕێ وابوو کە ئاوڕی دەدایەوە بە تەواوی ڕووی تێ دەکردی، مۆری پێغەمبەرایەتی بەناوشانیەوە بوو، خۆی دواهەمین پێغەمبەربوو، هەتا بڵێی دەست بەخێرو سەخی بوو، هەتا بڵێی دڵو دەروونی گەورە بوو، ڕاستگۆو**

---

[٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه)

قسه راستی وەك خۆی نەبوو، بۆ نەرمو نیانیش وێنەی نەبوو، چەندە بڵێی رووخۆشو رەفتار شیرین بوو لەگەڵ خەڵکا. ئەوەی لەناکاو دەیدی یەکسەر سامی لێ دەکرد، بەڵام ئەوەی ناسیاریی لەگەڵ بگرتایە دەچووە دڵیەوە خۆشی دەویست! ئەوەی بیەوێ باسی ناونیشانی ئەو بکا کورتو پوخت دەڵێ: نەبەر لە خۆیو نە لە پاش خۆی کەسی ترم نەدیوە وێنەی ئەو ئاوا شێوەی شیرین بێو رەفتاری جوان بێ (درووددو سڵاوی خودای لەسەربێ) (ت–س/ح).

٣٠٩٢– وَقَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ): مَا رَأَيْتُ شَيْئاً أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مِشْيَتِهِ كَأَنَّمَا الأَرْضُ تُطْوَى لَهُ وَإِنَّا لَنُجْهِدُ أَنْفُسَنَا وَإِنَّهُ لَغَيْرُ مُكْتَرِثٍ. روى هذه الثلاثة الترمذي. والله أعلم[٩]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کەسم نەدیوە کە لە رۆیشتندا وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوا جوان بڕوا بەڕێدا، دەتگوت تەنگی زەوی بۆ دەکێشرێ، ئێمە کە لە خزمەتیا دەڕۆیشتین – بۆ ئەوەی پێ بەپێی ئەو دەرچین – تەواو خۆمان شەکەت دەکردو خێرا دەڕۆیشتین، کەچی ئەو هەر دەربەستیش نەبوو (ت–سند غریب).

## ٨٤) مووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) : (شعر النبي ﷺ)

٣٠٩٣– عَنْ قَتَادَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ لأَنَسٍ: كَيْفَ كَانَ شَعَرُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ شَعَرًا رَجِلاً لَيْسَ بِالْجَعْدِ وَلاَ السَّبِطِ بَيْنَ أُذُنَيْهِ وَعَاتِقِهِ. رواه الشيخان والترمذي[١]:

قەتادە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: بە ئەنەسم گوت: مووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چۆن بوو؟ گوتی: قژە سەرەکەی کەمێ لوول بوو، نە زۆر کرژو نە زۆر خاو بوو، هەتا لای گوێچکەو ناوشانی دەهات (ش/ت).

---

[٩] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١] بخاري. لباس: ٥٩٠٥. فتح = تجريد/ ٥ ل – ١٩٥ ز: ١٩٠٦. مسلم. فضائل: ٦٠٢١.

٣٠٩٤- ← (ب – ٣ ز – ٤٣ ف – ٣ – + ف – ١ + ف – ٢). وزاد هنا: وَفِي رِوَايَةٍ: إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ. رواه الخمسة إلا الترمذي[٢]:

لێرەدا ئەمەی پترە: لە گێڕانەوەیەکا: هەتا ئاستی نیوەی گوێی دەهات (ش/د/ن).

٣٠٩٥- ← (ب – ٣ ز – ٤٣ ف – ٣)[٣].

٣٠٩٦- عَنْ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ شَمِطَ مُقَدَّمُ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ وَكَانَ إِذَا ادَّهَنَ لَمْ يَتَبَيَّنْ وَإِذَا شَعِثَ رَأْسُهُ تَبَيَّنَ وَكَانَ كَثِيرَ شَعْرِ اللِّحْيَةِ فَقَالَ: رَجُلٌ وَجْهُهُ مِثْلُ السَّيْفِ؟ قَالَ: لاَ بَلْ كَانَ مِثْلَ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ وَكَانَ مُسْتَدِيرًا. رواه مسلم (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ)[٤]:

جابیری کوڕی سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێشەسەرو چاڵی چەناگەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەنێ بۆزبوو بوون، بەڵام کە چەوری دەکرد پێوەی دیار نەبوو، بەڵام کە سەری دەژاکا مووە سپییەکان دەردەکەوتن، مووی ڕیشی پڕبوو، پیاوێ گوتی: ڕووی وەك شمشێر ئاوا بریقە دارو درێژ بوو؟ گوتی: نەء، بەڵکوو وەك خۆرو مانگ وا خڕو گەشو جوان بوو! (م).

## ٨٥) بۆنی پێغەمبەر درووی خودای لەسەر زۆر خۆش بوو: (طيب رائحة النبي ﷺ)

٣٠٩٧- عَنْ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا شَمِمْتُ عَنْبَرًا قَطُّ وَلاَ مِسْكًا وَلاَ شَيْئًا أَطْيَبَ مِنْ رِيحِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ مَسِسْتُ شَيْئًا قَطُّ دِيبَاجًا وَلاَ حَرِيرًا أَلْيَنَ مَسًّا مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه الأربعة[١]:

---

[٢] تقدم تخريجه في/٢٨٦٥. مجلد/ ٤ تسلسل/٤٣ تحت رقم: ٣ /٢٩٦٥ ورقم: ٢٨٦٣/١ ورقم: ٢٨٦٤/٢.

[٣] تقدم برقم: ٢٨٢٩/٣ ز: ٤٣ مجلد/٤.

[٤] مسلم. فضائل: ٦٠٣٧.

[١] تجريد بوخاری: ١٤٢٤ = فەتح: ٣٥٦١ ، ٥٦٩. مسلم. فضائل: ٦٠٠٧.

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەرگیزاو هەرگیز بۆنی هیچ شتێکم نەکردووە (نە عەنبەرو نە میسكو نە هیچی تر) کە بۆنی لە بۆنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆشتر بووبێ، وە هەرگیز دەستم لە هیچ شتێ نەداوە (نە دیباجو نە ئاورێشمو نە شتی تر) کە وەك جەستەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئاوا نەرمو شلو ناسكو نازدار بێ (ش/د/ت).

٣٠٩٨- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْهَاجِرَةِ إِلَى الْبَطْحَاءِ فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى فَقَامَ النَّاسُ فَجَعَلُوا يَأْخُذُونَ يَدَيْهِ، فَيَمْسَحُونَ بِهَا وُجُوهَهُمْ، قَالَ: فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ، فَوَضَعْتُهَا عَلَى وَجْهِي، فَإِذَا هِيَ أَبْرَدُ مِنَ الثَّلْجِ، وَأَطْيَبُ رَائِحَةً مِنَ الْمِسْكِ. رواه البخاري[٢]:

ئەبو جوحەیفە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: قرچەی نیوەڕۆ بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ بەطحاء، کە پادەشتێکی لماوییە، لەوێ دەسنوێژی گرتو نوێژی کرد، خەڵکەکەش هەڵسان، دەستەکانی پێغەمبەریان دەگرتو دەیان سوین لە ڕووی خۆیان بۆ پیرۆزییو مووفەڕکی منیش دەستیم گرتو هێنام بە دەموچاوی خۆما، تەماشام کرد دەستی لە بەفرفێنك ترو بۆنی لە بۆنی میسك خۆشتر بوو! (ب- ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

٣٠٩٩- وَقَالَ: جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَاةَ الأُولَى (أي الظّهر) ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَهْلِهِ وَخَرَجْتُ مَعَهُ فَاسْتَقْبَلَهُ وِلْدَانٌ فَجَعَلَ يَمْسَحُ خَدَّيْ أَحَدِهِمْ وَاحِدًا وَاحِدًا وَأَمَّا أَنَا فَمَسَحَ خَدِّي، قَالَ: فَوَجَدْتُ لِيَدِهِ بَرْدًا أَوْ رِيحًا كَأَنَّمَا أَخْرَجَهَا مِنْ جُؤْنَةِ عَطَّارٍ[٣]:

جابیری کوڕی سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) نوێژی نیوەڕۆم کرد، ئینجا ئەو ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوەیو منیش

---

[٢] تجرید بوخاری: ١٤١٩ = فەتح: ٣٥٥٣ + ١٨٧/١٤٠ بەرگی/ ١ ل — ١٦١ + بەرگی/ ١ ل — ٣٠٨ رقم (٢٩٧ — ٢٩٥). مسلم. سترة الصلاة: ٥٠٣ (تجرید/٤ ل — ١٠٥ — هامش رقم/٨٧).

[٣] مسلم. فضائل: ٦٠٠٦.

**لەگەڵیا چوومەوە، جا منداڵان هاتن بە پیریەوە، پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربێ) **یەکە یەکە دەستی دەهێنا بە روومەتیانا، دەستی هێنا بە روومەتی منیشا. گوتی: دەستی وا فێنكو بۆنی وا خۆش بوو دەتگوت كردوویەتی بە قوتووی گوڵاو فرۆشا، یا لە شووشەی گوڵاوی هەڵكێشاوە (م).**

٣١٠٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: عِنْدَنَا فَعَرِقَ وَجَاءَتْ أُمِّي بِقَارُورَةٍ فَجَعَلَتْ تَسْلُتُ الْعَرَقَ فِيهَا فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ؟ قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا وَهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ. رواهما مسلم[٤]:

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **هات بۆ ماڵمان لەوێ سەرخەوی نیوەڕۆی شكان، كە خەوی لێ كەوت ئارەقی دەردا، جا دایكم شووشەیەكی هێناو بە دەستی ئارەقەكەی دادەلێسایە ناوی، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **خەبەری بۆوە، فەرمووی: ئەی دایكی سولەیم! ئەوە چی دەكەی؟ گوتی: ئەمە ئارەقی تۆیە، دەیكەینە ناو گوڵاوی خۆمانەوە، ئەم لە گوڵاو گەلێ بۆنی خۆشترە (م).**

## ٨٦) چۆنێتی قسەكردنی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر : (كلام النبي ﷺ)

٣١٠١- عَنِ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتْ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَكُنْ يَسْرُدُ الْحَدِيثَ مِثْلَ سَرْدِكُمْ. رواه الشيخان والترمذي وزاد: وَلَكِنَّهُ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ بَيْنَهُ فَصْلٌ يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ[١]:

---

[٤] مسلم. فضائل: ٦٠٠٦.

[١] (رياض/ ٢ ل – ٢٠٨ ژ: ٦٩٧/٢ – ابو داود/ ٤٨٣٩) + (تجريد/٤ ل – ١١٠ ژ: ١٤٢٧/ ٣٢٦٧ ، ٣٥٦٨ + ١٤٢٧ م/ ٣٥٦٨ ، ٣٥٦٧).

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەك ئێوە لە قسەکرندا بە پەلە نەبوون، وە ئاوا نەیدەدا بەسەریەکا (ش/ت) تیرمذي ئەمەی زیاترە: بەڵام ئەو (دروودی خودای لەسەربێ) قسەی بە شێنەیی بوو، بواری دەدا، بە شێوەیەکی وا قسەی دەکرد ئەوی لەلای دادەنیشت لەبەری دەکرد.

٣١٠٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لأَحْصَاهُ. رواه البخاري وأبو داود[٢]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وا لەسەر خۆو بە شێنەییو بەروونی فەرمایشتی دەفەرموو، ئەگەر کەسێ قسەکانی بژماردایە وشە بە وشە دەیژمارد! (ب/د).

٣١٠٣- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ كَلاَمُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَلاَمًا فَصْلاً يَفْهَمُهُ كُلُّ مَنْ سَمِعَهُ[٣]:

دیسانەوە گوتی: قسەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) راستو دروستو رەوان بوو، بێ پێچو پەنا بوو، ئەوی گوێی لێ دەبوو بە باشی تێی دەگەیشت (د).

٣١٠٤- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ فِي كَلاَمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَرْتِيلٌ أَوْ تَرْسِيلٌ. رواهما ابو داود في الأدب.

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هێدیو شێنەییو لەسەر خۆو بەجێ بوو وەك گۆو دەنکە مرواری لەناو رشتەی مرواریدا وابوو قسەی بەنقام بوو، دانە دانە بوو وەك برنجی سەدری چۆن ددان دەکێشێو دانە دانە دەوەستێ ئاوا قسەکانی رێكو پێكو دانە — دانەو جوان بوون (د).

---

[٢] بخاري. مناقب: ٣٥٦٧ ، ٣٥٦٨ فةتح = ١٤٢٧ تجريد/٤ ل — ١١٠.

[٣] (رياض/٢ ل — ٢١٨ رقم: /٦٩٧. ابو داود: ٤٨٣٩).

**٣١٠٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعِيدُ الْكَلِمَةَ ثَلاَثًا لِتُعْقَلَ عَنْهُ. رواه الترمذي والبخاري وأحمد (رضوان الله تعالى عليهم)[٥]:**

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە گوتەیەکی دەفەرموو، سێ جار دووبارەی دەکردەوە، هەتا بە باشی لێی تێ بگەن (ت/ب/ئە-خودایان لێ ڕازی بێ).**

## ٨٧) چۆنێتیی پێکەنینی پێغەمبەر ﷺ : (ضحك النبي ﷺ)

**٣١٠٦- قِيلَ لِجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَكُنْتَ تُجَالِسُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: نَعَمْ كَثِيرًا كَانَ لاَ يَقُومُ مِنْ مُصَلاَّهُ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ الصُّبْحَ أَوِ الْغَدَاةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ قَامَ وَكَانُوا يَتَحَدَّثُونَ فَيَأْخُذُونَ فِي أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ فَيَضْحَكُونَ وَيَتَبَسَّمُ. رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه مسلم[١]:**

**گوترا بە جابیری کوڕی سەموورە: ئایا تۆ لەناو کۆڕی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەربێ) دانیشتووی؟ گوتی: بەڵێ نەك کەمیش زۆر دانیشتووم، کە نوێژی بەیانی دەکرد ئیتر لە جێگە نوێژەکەی خۆیدا دادەنیشت تا خۆر دەکەوت، ئەوجا هەڵدەسا یارانیش لە دەوری دادەنیشتنو دەستیان دەکرد بە گوفتوگۆو باسی سەردەمی نەزانییان دەگێڕایەوەو وا دەبوو پێدەکەنین، پێغەمبەریش زەردەخەنەیێ دەیگرت (م).**

**٣١٠٧- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَوِيلَ الصَّمْتِ قَلِيلَ الضَّحِكِ. رواه الإمام أحمد.**

**دیسان دەڵێ (خودای لێ ڕازی بێ): پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زۆر بێ دەنگو کەمدوو بوو، کەمیش پێ دەکەنی! (ئە).**

---

[٥] (ریاض/٢ ل – ٢١٧ رقم: ٦٩٦/١. بخاري: ٩٤) + (تجريد/ ١ ل – ١٠٤ ژ: ٩٤/٨١ ، ٩٥ ، ٦٢٤٤.

[١] مسلم. مساجد: ١٥٢٣ ، ٥٩٨٩. أبو داود. صلاة: ١٢٩٤. نسائي. سهو: ١٣٥٧.

٣١٠٨- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ فِي سَاقَيْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُمُوشَةٌ وَكَانَ لاَ يَضْحَكُ إِلاَّ تَبَسُّمًا وَكُنْتُ إِذَا نَظَرْتُ إِلَيْهِ قُلْتُ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ وَلَيْسَ بِأَكْحَلَ[٣]:

دیسان گوتی: هەردوو لاقی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەمێ بارێك بوون، بەزەردەخەنەیش نەبوایە پێ نەدەکەنی، کە تەماشایت دەکرد لە تۆ وابوو کە چاوی ڕێژراوە، بەڵام چاوی نەرێژرابوو بەڵکوو خۆی ئەکحەل بوو، واتە: چاورەشی بێ سورمە، چاوڕەشیەکەی زکماك بوو. (ت-س/ص).

٣١٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواهما الترمذي[٤]:

عەبدوڵڵای کوڕی حاریث (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کەسی ترم نەدیوە کە وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وا زۆر دەمی بەزەردەخەنەوە بێ (ت-س/ح).

٣١١٠- ورد في الشرح: وَفِي رِوَايَةٍ (أي للحديث المذكور آنفاً): تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ. فَمَا كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَضْحَكُ إِلاَّ تَبَسُّمًا، وَمَا كَانَ يُقهقه لحديث: «لاَ تُكْثِرُ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ»[٥]:

لە شەرحەکەدا دەڵێ: لە گێڕانەوەیەکدا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زەردەخەنە بەدەم برای ئایینی خۆتەوە خێرو صەدەقەیە. وە دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەر بە زەردەخەنە پێ دەکەنی، وە نەیدەدا لە قاقای پێکەنین لەبەر ئەم فەرموودەیە کە دەفەرموێ: زۆر پێ مەکەنە، چونکە پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ.

٣١١١- وورد في الشرح: وَفِي رِوَايَةٍ (اي للحديث الثاني من هذا المبحث): كان النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قليل الكلام قليل الطّعام.

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

لـە شـەرحەكەدا دەڵـێ (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ): لـە گێڕانەوەیـەكا: دەڵـێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) نە دوو (كەمدوو: كەم قسە)و كەم خۆر بوو.

## ٨٨) نوستنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) : (نوم النبي ﷺ)

٣١١٢- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يُحَدِّثُنَا عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِىَ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ مَسْجِدِ الْكَعْبَةِ جَاءَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ قَبْلَ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ، وَهُوَ نَائِمٌ فِي مَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَقَالَ: أَوَّلُهُمْ أَيُّهُمْ هُوَ فَقَالَ: أَوْسَطُهُمْ هُوَ خَيْرُهُمْ وَقَالَ: آخِرُهُمْ خُذُوا خَيْرَهُمْ. فَكَانَتْ تِلْكَ، فَلَمْ يَرَهُمْ حَتَّى جَاءُوا لَيْلَةً أُخْرَى، فِيمَا يَرَى قَلْبُهُ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَائِمَةٌ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ وَكَذَلِكَ الأَنْبِيَاءُ تَنَامُ أَعْيُنُهُمْ وَلاَ تَنَامُ قُلُوبُهُمْ، فَتَوَلاَّهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ[1]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) باسی ئەو شەوەی دەگێڕایەوە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەسجیدولحەرامەوە دەبرێ بۆ ئیسرا، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەناو مەسجیدول حەرامدا لە ناوەندی حەمزەی مامیو جەعفەری ئامۆزای دا خەوتبوو، ئاگای لە ئیسراو میعراج نەبوو، چونكە هێشتا سرووشی لەم بارەیەوە بۆ نەهاتبوو، لەو شەوەدا سێ فریشتە دێنە سەری، یەكەمیان دەڵێ: كامەیان خۆیەتیو موحەممەدە؟ ناوونجییەكەیان دەڵێ: باشەكەیان خۆیەتی، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: دەی باشەكەیان ببەن بۆ میرعاج بۆ ئاسمان، ئیتر ئەو شەوە هەر ئەوەندە ڕوودەداو هیچی تر ناكەن، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نایان بینێتەوە تا شەوێكی تر دێنەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوكاتەدا بەدڵ دەبینیو بەچاو دەخەوێ، وە دڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەمیشە وریا بووە، قەت دڵی خەوی لێ نەدەكەوت، چونكە پێغەمبەران هەموویان هەروان: بەچاو دەخەون بەڵام بەدڵ وریان! ئیتر ئەم جاری دواییە جوبرائیل خۆی سەرەوكاری حەزرەت دەكاو دەیبا بۆ ئاسمان (ش).

---

[1] بخاري. ماقب: ٣٥٧٠ ، ٤٩٦٤ ، ٥٦١٠ ، ٦٥٨١ ، ٧٥١٧ (تجريد/ ٤ ل — ١١٠ رقم: ١٤٢٨. مسلم. إيمان/ ١٦٢ = ٤١٢).

٣١١٣- ← (ب-١ ز-١٨٢ ل- ف-٥)[٢].

٣١١٤- ← (ب-١ ز-١٨١ ف-٨ + ز- ١٨٢ ل-ف-٦ + ز-١٨٤ ف-١ + ف-٢ + ب-٤ ز-٨٥ ف-٤)[٣].

## ٨٩) داستانی شەقکردنی سینگی پێغەمبەر درروودی خودای لەسەر

## شق صدر النبي ﷺ

٣١١٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَاهُ جِبْرِيلُ وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ فَأَخَذَهُ فَصَرَعَهُ فَشَقَّ عَنْ قَلْبِهِ فَاسْتَخْرَجَ الْقَلْبَ فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ عَلَقَةً فَقَالَ: هَذَا حَظُّ الشَّيْطَانِ مِنْكَ. ثُمَّ غَسَلَهُ فِي طَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ بِمَاءِ زَمْزَمَ ثُمَّ لأَمَهُ ثُمَّ أَعَادَهُ فِي مَكَانِهِ وَجَاءَ الْغِلْمَانُ يَسْعَوْنَ إِلَى أُمِّهِ - يَعْنِي ظِئْرَهُ - فَقَالُوا إِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ قُتِلَ. فَاسْتَقْبَلُوهُ وَهُوَ مُنْتَقِعُ اللَّوْنِ. قَالَ: أَنَسٌ وَقَدْ كُنْتُ أَرَى أَثَرَ ذَلِكَ الْمِخْيَطِ فِي صَدْرِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ مسلم في المعراج. نسأل الله التوفيق. آمين. والله أعلم[٤]:

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەربێ) لەناو منالاّندا یاری دەکا لەو ماوەیەدا کە لەلای دایە حەلیمەی دایەنی دەبێ لەوکاتەدا جوبرائیل (درروودی خودای لەسەربێ) دێ بۆ لای لەگەڵ چەند فریشتەیەکی تردا، کە لە شێوەی مرۆڤدا خۆیان نیشان دەدەن جا جوبرائیل پێغەمبەر دەگرێو دەیدا بە زەویداو سینگی لەت دەکاو دڵی دەردێنێو پارچەیەکی وەك زالووی لێ دەردێنێو دەفەرموێ: ئەمە بەشی شەیتان بوو بە تۆوە ئەوا لامان بردو ئیتر شەیتان نائومێد بوو لە فریو دانی تۆ، ئینجا جوبرائیل دڵی**

---

[٢] تقدم برقم: ٩٨٢/٥ ز:١٨٢ مجلد الأول.

[٣] تقدم برقم: ٩٧٢/٨ ز: ١٨١ مجلد اول ورقم ٩٧١/٦ ورقم: ٩٦٥/١ ورقم: ٩٦٦/٢ ورقم: ٣١٠٠/٤ ز:٨٥ مجلد الرابع:

[٤] مسلم. إيمان: ٤١١. تجريد/ ٤ ل — ١١٠ ز: ١٤٢٨ / ٣٥٧٠ ، ٤٩٦٤ ، ٥٦١٠ ، ٦٥٨١ ، ٧٥١٧..

حەزرەت، لە تەشتێکی زێڕدا، بە ئاوی زەمزەم دەشۆڕێتەوە، پاشان قەپاتی دەکاتەوەو دەیخاتەوە شوێنی خۆی.

کوڕەکانیش بە راکردن دەڕۆن بۆ لای دایکی پێغەمبەر – واتە: بۆ لای دایەنەکەی دەڵێن: موحەممەد کوژرا! جا ئەوانیش بە شەڵەژاری دەچن بە هاواریەوە، دەڕوانن وا رەنگی هەڵبزرکاوە. ئەنەس دەیگوت: زۆر جاران شوێنی ئەو شەق کردنەم دیوە بە سینگی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) وەك خەت وابوو، شوێنی تەقەڵەکان لەسەر سینگی رێچکەیان بەستبوو (م).

## ٩٠) بەشی سێیەم: باسی رەفتارە شیرینەکانی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر

## الفصل الثالث: في أخلاق النبي ﷺ

٣١١٦– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاحِشًا وَلاَ مُتَفَحِّشًا. وَقَالَ: إِنَّ مِنْ خِيَارِكُمْ أَحَاسِنَكُمْ أَخْلاَقًا. رواهما الشيخان. وَفِي رِوَايَةٍ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَ النَّاسِ خَلْقًا[1]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە گەورە کچی ناوپەردە بە شەرمو بە حورمەتتر بوو، ئەگەر حەزی لەشتی نەبوایە بە روویا دەمانزانی لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەرزەگۆو هەرزە نەبوو، دەشی فەرموو: هەرە باشەکانی ئێوە ئەو کەسانەتانن کە خوو و رەفتاریان زۆر جوانو شیرینە! (ش) لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە هەموو کەس خوو و رەفتاری جوانتر بوو.

٣١١٧– تقدم برقم: ٢٦٤٦/١١ مجلد رابع تسلسل/ ١٦[2]).

---

[1] بخاري. أدب: ٦١٢٩ ، ٦٢٠٣. مسلم. مساجد: ١٤٩٨ ، ٥٥٨٧ ، ٥٩٧١. ترمذي. صلاة: ٣٣٣ ، ١٩٨٩.

[2] تقدم برقم: ٢٦٤٦/١١ مجلد/٤ تسلسل/١٦.

٣١١٨- عَنْ عَطَاءٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو: أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي التَّوْرَاةِ. قَالَ: أَجَلْ، وَاللّٰهِ إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ بِبَعْضِ صِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا، وَحِرْزًا لِلأُمِّيِّينَ، أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ الْمُتَوَكِّلَ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلاَ غَلِيظٍ وَلاَ سَخَّابٍ فِي الأَسْوَاقِ، وَلاَ يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ، وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللّٰهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ. وَيَفْتَحُ بِهَا أَعْيُنًا عُمْيًا، وَآذَانًا صُمًّا، وَقُلُوبًا غُلْفًا. رواه البخاري[٣]:

عەطاء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر: نیشانەی پێغەمبەری خۆمان (دروودی خودای لەسەربێ) لە تەوراتا چییە پێم بڵێ؟ گوتی: بەڵێ باشە، بە خودا ناونیشانی لە تەوراتیشدا وەك ئەو ناونیشانەی وایە کە لەم ئایەتەی قورئاندا باس کراوە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا – ٤٦/٣٣}. واتە: ئەی پێغەمبەری پایە بەرز! بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە بە شایەتو بە مژدەدەرو بە ترسێنەر. لەگەڵ بازێ زیادەی تردا کە دەفەرموێ: وە تۆمان کردووە بە قەڵاو سەنگەر بۆ نەتەوەیەکی بێ، سەوادو نەخوێندەوار کە گەلی عەرەبن‌و ناویان بە نەخوێندەوارو بێ سەواد دەرکردووە تۆ بەندەو فروستادەو ڕەهبەرو پێغەمبەری منی، خۆم ناوم ناوی: پشت ئەستوور بە خودا: پشت بەستوو بە خودا (موتەوەککیل) ئەو پێغەمبەرە مرقن‌و مۆن‌و دڵرەق نیە، وە لەناو بازاڕا دەنگی دەرناچێ بەسەر خەڵکا ناقیژێنێ، وە بەرپەرچی خراپە بە خراپە ناداتەوە، بەڵکوو چاوپۆشی دەکاو لێ بووردنی هەیە، وە خودا نایباتەوە بۆ لای خۆیو نایمرێنێ هەتا ئەو میللەتە لارەی پێ ڕاست نەکاتەوە کە لە ئاینە ڕاستەکەی ئیبراهیم لایان داوە بۆ فرەخوایی، ئەمەیش بە گوتنی وشەی (لا اله الا الله) جا بەم وشەیە چاوانی کوێری پێ دەکاتەوەو گوێیانی کەڕی پێ

[٣] بخاري. تفسير: ٤٨٣٨.

بـەردەداو دلانــی مـۆرکراو بـە پـەردەی بـێ گـوێیی پـێ روون‌و وریـاو والآ دەکاتەوە! (ب–رەزای خوای لێ بێ). ئیمامی عەینی – غەرقی رەحمەتی خـودا بێ) دەڵێ: تەواوی ئەم ئایەتە کە لە سوورەتی (الاحزاب) دایە ئەمەیە: {وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا}: واتـە: وە حاڵـت وابێ بەردەوام ببـە بـە بانگکەرو دووبـەرەی ئـادەمیزادو جنۆکـە بـانگ بکـە بۆ لای ئـایینی خـودا، بـە فـەرمانی خۆی‌و لەسەر رێپێدانی خۆی، وە حاڵت وابێ کە ببی بە چرایەکی رووناك بۆ رۆشـن کردنـەوەی رێگـەی راسـت ئیمـامی بوخـاری‌و خـاوەنی تـاج – نـوقمی دەریـای میهرەبـانی خـودا بـن – بـۆ راڤـەکردن‌و تەفـسیری ئایـەتی هەشـتەمی سـوورەتی فـەتح ئـەم فـەرمووودەیان لـەویش گێڕاوەتـەوە وە مەبەسـتیان لەمـە تەفسیرو راڤەکردنی ئایەتێکـە بە ئایـەتێکی تـری وەك خـۆی، بەڵام مامۆسـتا مەلا کەریمی بیارە (خودا پایەبەرزی کا) لـە هـەمان شـوێن ئـەم فەرموودەیـەی نـەقڵ کـردووە، وە والـە قەڵـەمی داوە کـە مەبـست لـەم ئایەتـە ئایەتەکـەی هەشتەمی سوورەتی فەتحە (وەرگێڕ).

٣١١٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئاً قَطْ فَقَالَ: لاَ[٤]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هەرگیز نەبووە کەشتێ لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) داوا بکرێ‌و بڵێ: نا! (م).

٣١٢٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَنَمًا بَيْنَ جَبَلَيْنِ فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ فَأَتَى قَوْمَهُ فَقَالَ: أَىْ قَوْمِ أَسْلِمُوا فَوَاللَّهِ إِنَّ مُحَمَّدًا لَيُعْطِى عَطَاءً مَا يَخَافُ الْفَقْرَ. فَقَالَ: أَنَسٌ إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيُسْلِمُ مَا يُرِيدُ إِلاَّ الدُّنْيَا فَمَا يُسْلِمُ حَتَّى يَكُونَ الإِسْلاَمُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا[٥]:

---

[٤] مسلم. فضائل: ٥٩٧٢.

[٥] مسلم. فضائل: ٥٩٧٤.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: مێگەلێ ئەوەندە زۆربوو لەبەینی دوو شاخا بوو، پیاوی داوای ئەو رانەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، پێغەمبەر بە خەلاتی دای پێی، جا پیاوەکە کاتێ رۆیشتەوە ناو هۆزەکەی گوتی: ئەی خزمینە! تا زووە ئیسلام بن، سوێندم بە یەزدانی پاك موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) بە چەشنێ خەلات دەدات و بەخشیش دەبەخشێ وا دیارە لەبەر ئەوەی کە پشتی بە خودای خۆی ئەستوورە مەترسی لە هەژاری نیە. ئەنەس دەیگوت: گەلێ جار وا دەبوو پیاو هەبوو، کە موسوڵمان دەبوو، لە پێشدا بۆ پڕو پاتاڵو پڕوپیتی جیهان ئیسلام دەبوو، بەلام هەر لەگەڵ ئیسلام دەبوو ئیتر وا ئەم ئیسلامەتییە دەچووە ناو دڵیەوە ئیسلامی خۆشتر دەویست لە هەموو ماڵو موڵكو سامانی دنیا (م).

٣١٢١- وَقَالَ: صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُ): وَاللَّهِ لَقَدْ أَعْطَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حُنَيْنٍ مَا أَعْطَانِي، وَإِنَّهُ لأَبْغَضُ النَّاسِ إِلَيَّ، فَمَا بَرِحَ يُعْطِينِي حَتَّى لَأَنَّهُ لَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ. روى مسلم هذه الثلاثة[٦]:

صەفوانی کوڕی ئومەییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە خودا لە هەموو کەس زیاتر رقم لە پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا رۆژی غەزای حونەین، کە ئەوە بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەو هەموو خەلاتەی دامێ لە سێ جارا سێ سەد حوشتری دایێ ئیتر خەلات لەسەر خەلاتو بەخشش لەسەر بەخشش دەیدا پێم، تا وای لێ هات کە لە هەموو کەسێ زیاتر خۆشم دەویست! (م).

٣١٢٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَ النَّاسِ وَكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ وَكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَانْطَلَقَ نَاسٌ قِبَلَ الصَّوْتِ فَتَلَقَّاهُمْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَاجِعًا وَقَدْ سَبَقَهُمْ إِلَى الصَّوْتِ وَهُوَ

[٦] مسلم. فضائل: ٥٩٧٦. ترمذي. زكاة ٦٦٦.

عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ فِي عُنُقِهِ السَّيْفُ وَهُوَ يَقُولُ: لَمْ تُرَاعُوا لَمْ تُرَاعُوا. رواه الشيخان[٧]:

ئەنەس (خودای لێ خۆش نوود بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە هەموو کەسێ چاکتر بوو، وە لە هەموو کەسێ بەخشندە تر بوو، وە لە هەموو کەسێ ئازا تر بوو، شەوێ شاری مەدینە شەڵەژاو مەردوم هەموو تۆقین جا کە چەند کەسێ بەرەو ئەو دەنگە چوون کە بوو بوو بەهۆی شپرزە بوونی خەڵکی شارەکە لەولاوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەرەنگاریان بوو، دەگەڕایەوەو دەیفەرموو: مەشەڵەژێن، مەشەڵەژێن تومەز پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) لە پێش ئەواندا بە سواری ئەسپێکی پشت رووتی ئەبو طەلحە چوو بوو بۆ سۆراخکردنی دەنگەکە، کە بەمان گەیشت شمشێرەکەی لە ملی دا بوو، دەگەڕایەوە بەرەو شارو دەیفەرموو مەترسێن مەترسێن) (ش–خودایان لێ رازی بێ).

٣١٢٣– وَعَنْهُ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ، فَأَخَذَ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِي، فَانْطَلَقَ بِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَنَسًا غُلاَمٌ كَيِّسٌ، فَلْيَخْدُمْكَ. قَالَ: فَخَدَمْتُهُ فِي السَّفَرِ وَالْحَضَرِ عَشْرَ سِنِينَ، وَاللهِ مَا قَالَ: لِي لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا هَكَذَا وَلاَ لِشَيْءٍ لَمْ أَصْنَعْهُ لِمَ لَمْ تَصْنَعْ هَذَا هَكَذَا. رواه الأربعة[٨]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە کۆچی فەرموو بۆ مەدینە، ئەبو طلحە (کە باوە پیارەم بوو) دەستی گرتمو بردمی بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەنەس کوڕێکی ژیرو زرنگە، با خزمەتت بکا، گوتی: ئیتر دە سالی رەبەق (چ لە ماڵەوەو چ لە

---

[٧] بخاري. جهاد: ٢٨٢٠ ، ٢٩٠٨ ، ٣٠٤٠ ، ٣٨٦٦ ، ٦٠٣٣. تجريد/٣/٣٠٩ رقم: ٢٨٥٧/١١٨٠ ، ٢٨٢٠ ، ٢٨٧٢ ، ٢٨٦٦ ، ٢٨٦٧ ، ٢٩٠٨ ، ٢٩٦٨ ، ٢٩٦٩ ، ٣٠٤٠ ، ٦٠٣٣ ، ٣٢١٢. مسلم. فضائل: ٥٩٦١. ترمذي. جهاد: ١٩٨٧.

[٨] بخاري. وصايا: ٢٧٦٨ ، ٦٩١١. مسلم. فضائل: ٥٩٦٨.

ئۆغرو سەفەردا) من خزمەتی ئەو زاتەم کردووە، بە خودا چیم کردبێو چیم نەکردبێ نەیفەرمووە پێم: بۆ ئەمەت وا کردووە، یا بۆ ئەوەت وا نەکردووە! (ش/د/ت–خودایان لێ رازی بێ).

٣١٢٤- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا فَأَرْسَلَنِي يَوْمًا لِحَاجَةٍ فَقُلْتُ لَهُ: وَاللّٰهِ لاَ أَذْهَبُ. وَفِي نَفْسِي أَنْ أَذْهَبَ لِمَا أَمَرَنِي بِهِ نَبِيُّ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَخَرَجْتُ حَتَّى أَمُرَّ عَلَى صِبْيَانٍ وَهُمْ يَلْعَبُونَ فِي السُّوقِ فَإِذَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ قَبَضَ بِقَفَايَ مِنْ وَرَائِي فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقَالَ: يَا أُنَيْسُ أَذَهَبْتَ حَيْثُ أَمَرْتُكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ أَنَا أَذْهَبُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَذَهَبْتُ[٩]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە هەموو کەس خووی شیرینتر بوو، ڕەفتاری تا بڵێی جوان بوو ڕۆژێ ناردمی بۆ کارێ، پێم گوت: بە خودا ناچم" بەڵام لە دڵەوە نیازم هەبوو کە بچم بۆی، جا ڕۆیشتم لەرێ تووشی تاقمێ منداڵ بووم، یارییان دەکرد لەناو بازاڕدا، کاتێکم زانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە پشتەوە پشتەملی گرتم، کە سەیرم کرد پێ دەکەنی، فەرمووی: نەسەکە! چوویت بۆ ئەوەی کە پێم گوتیت؟ منیش گوتم: بەڵێ، وا دەڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا! ئینجا چووم. (م/د).

٣١٢٥- وَعَنْهُ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَرْحَمَ بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ إِبْرَاهِيمُ مُسْتَرْضِعًا لَهُ فِي عَوَالِي الْمَدِينَةِ فَكَانَ يَنْطَلِقُ وَنَحْنُ مَعَهُ فَيَدْخُلُ الْبَيْتَ وَإِنَّهُ لَيُدَّخَنُ وَكَانَ ظِئْرُهُ قَيْنًا فَيَأْخُذُهُ فَيُقَبِّلُهُ ثُمَّ يَرْجِعُ. قَالَ: عَمْرٌو فَلَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ إِبْرَاهِيمَ ابْنِي وَإِنَّهُ مَاتَ فِي الثَّدْيِ وَإِنَّ لَهُ لَظِئْرَيْنِ تُكَمِّلاَنِ رَضَاعَهُ فِي الْجَنَّةِ[١٠]:

دیسان گوتی: کەسم نەدیوە کە ئاوا وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە زەیی بێتەوە بە خێزانا، گوتی: لە گوندێ لە گوندەکانی دەوروبەری

---

[٩] مسلم. فضائل: ٥٩٧٠. أبو داود. أدب: ٤٧٧٣.

[١٠] مسلم. فضائل: ٥٩٨٠ ، ٥٩٧٩. تجريد/ ٢ ل — ٥١ رقم: ٦٢٦/ ١٣٠٣ ، ١٣٠٤.

مەدینە، ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) درابوو بە دایەن، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەچوو بۆ لای، ئێمەیش لە خزمەتیا دەچووین، مێردی دایەنەکەی – واتە: باوکە شیرییەکەی – ئاسنگەربوو، ئاسنگەریی دەکرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە دەچووە ژوورەوە ماڵەکە پڕبوو، لە دووکەڵو بۆ چڕووكو خانووەکە قانگ درابوو جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئیبراهیمی هەڵ دەگرتو تێر – تێر ماچی دەکردو بۆنی دەکردو ئینجا دەگەڕایەوە، کاتێ کە ئیبراهیم مرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیبراهیم کوڕی منە، مەمکەخۆرەبوو کە مرد، لەبەر ئەوە لە بەهەشتا دوو دایەنی هەیە مەمکی دەدەنێ هەتا لە مەمك دەبڕێتەوە! (ش/د/ت).

٣١٢٦– وَعَنْهُ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ وَهُوَ يَكِيدُ بِنَفْسِهِ بَيْنَ يَدِي رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَدَمَعَتْ عَيْنَاه، فَقَالَ: تَدْمَعُ الْعَيْنُ وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا وَاللهِ يَا إِبْرَاهِيمُ إِنَّا بِكَ لَمَحْزُونُونَ. رواهما الأربعة[١١]:

دیسان گوتی: ئیبراهیم گیانی دەدا لە باوشی پێغەمبەردا بوو (درودی خودای لەسەربێ) چاوم لێ بوو ئەسر بە چاوەکانی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) هۆن هۆن دەهاتە خوارەوە، جا فەرمووی: چاو فرمێسك دەرێژێو دڵ خەمو پەژارە دەچێژێ وەلێ ئەوەی رەزای خوداوەندمانی لەسەر نەبێ بەزارمانا نایێ، سوێند بە یەزدانی پاك – ئەی رۆڵەی شیرینم! ئەی ئیبراهیم! – ئێمە لەبەر مەرگی تۆ گەلێ خەمگینو خەمبارین ← (ب ١ ز – ١٩٧ – ف ١). = بەرگی/ ١ ژمارە: ١/١٠٣٥ زنجیرە ١٩٧.

٣١٢٧– وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حاد حَسَنُ الصوت اسمه أنجشة فمرَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَسُوقُ الإِبِلَ بِالْزَّوْجَات الطَّاهِرات فَقَالَ: لَهُ: رُوَيْدًا يَا أَنْجَشَةُ لاَ تُكْسِرِ الْقَوَارِيرِ. رواه الشيخان[١٢]:

---

[١١] تقدم تجريجه فى الحديث السابق عيله مباشرة.

[١٢] بخاري. أدب. مسلم. فضائل: ٥٩٩٠ ، ٥٩٩١ ، ٥٩٩٢ ، ٥٩٩٣ ، ٥٩٩٤ ، ٥٩٩٥.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وشترەوانێکی دەنگ خۆشی هەبوو، ناوی ئەنجەشە بوو، جاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تووشی بوو، بە هۆرە بە دەنگە خۆشەکەی وشترەکانی ژێر هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەری لێ دەخوڕیو وشترەکان بە تەکان دەڕۆیشن، جا پێی فەرموو: ئەی ئەنجەشە! تۆزێ هێواش باریان شووشەیە مەیشکێنە واتە: ئافرەت وەك مینا ناسکە، بەرگەی ئەم خێراییەیە ناگرێ![(١)] (ش = شەیخان: بوخاریو موسلیم. خودایان لێ ڕازی بێ).

٣١٢٨- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلَّى الْغَدَاةَ جَاءَ خَدَمُ الْمَدِينَةِ بِآنِيَتِهِمْ فِيهَا الْمَاءُ فَمَا يُؤْتَى بِإِنَاءٍ إِلاَّ غَمَسَ يَدَهُ فِيهَا فَرُبَّمَا جَاءُوهُ فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ فَيَغْمِسُ يَدَهُ فِيهَا[(١٣)]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە نوێژی بەیانی دەکرد، ئیتر ڕاژەکەرانو ئاو کێشەکانی مەدینە حاجەتو دەفرەکانیان بە ئاوەکەوە دەهێنا بۆی ئەویش بۆ مووفەڕك دەستی پیا دەکردن، گەلێ جار بەیانیان زۆر ساردبوو، بەڵام هەر دەستی دەکرد بەناو ئاوەکەداو نائومێدی نەدەکردنو دڵی ڕادەگرتن (م).

٣١٢٩- وَعَنْهُ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْحَلاَّقُ يَحْلِقُهُ وَأَطَافَ بِهِ أَصْحَابُهُ فَمَا يُرِيدُونَ أَنْ تَقَعَ شَعْرَةٌ إِلاَّ فِي يَدِ رَجُلٍ[(١٤)]:

بەرگی دوو، زنجیرە/١١١ ژمارە/ ٢/١٦٠٤).

---

[(١)] ئافرەت مینایە بەرگە ناگرێ
بەردی تێ گری خۆڕاناگرێ
هاڕە دەکاتو هاروهاج دەبێ
وا چاکە کە پیاو دڵی ڕاگرێ - وەرگێڕ -

[(١٣)] مسلم. فضائل: ٥٩٩٦.

[(١٤)] مسلم. فضائل: ٥٩٩٧.

**دیسان گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) سەرتاش سەری دەتاشی، یارانی خەرمانەیان لێ دابوو، هەر تەڵە موویەك بەر دەبۆوە، یاران دەیان قۆستەوەو دەکەوتە ناو دەستی یەکێکیانەوە! (م).**

٣١٣٠- وَعَنْهُ أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً فَقَالَ: يَا أُمَّ فُلَانٍ انْظُرِي أَيَّ السِّكَكِ شِئْتِ حَتَّى أَقْضِيَ لَكِ حَاجَتَكِ. فَخَلاَ مَعَهَا فِي بَعْضِ الطُّرُقِ حَتَّى فَرَغَتْ مِنْ حَاجَتِهَا. روى مسلم هذه الثلاثة[١٥]:

**دیسان گوتی: ژنێ هەبوو لەکاتی خۆیدا شانەکار – ماشیطەی دایکە خەدیجەی ژنی پێغەمبەر بوو – تۆزێ هۆشی تەواو نەبوو، جارێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمانێکی نهێنیم پێت هەیە، فەرمووی: ئەی دایکی فیسار! کوێت پێ خۆشە بچۆ بۆ ئەوێ تا بێم کارەکەتت بۆ جێبەجێ بکەم ئیتر لە سەرەرێیەکا دوو بەدوو کۆبوونەوە هەتا ژنەکە ئێشەکەی تەواو بوو نهێنییەکەی خۆی عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کرد (م).**

٣١٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ أَحَدُهُمَا أَيْسَرُ مِنَ الآخَرِ إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ. وَمَا انْتَقَمَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِنَفْسِهِ إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ. رواه الثلاثة[١٦]:

**عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەگەر خۆی بکرایە بە سەرپشك لە نێوانی کردنی دوو کارا، کە کارێکیان لەوی تریان ئاسانتر بوایە، هەمیشە ئاسانەکەیانی هەڵ دەبژارد، بە مەرجێ ئەو کارە گوناه نەبوایە، ئەگینا لە هەموو کەس زیاتر لێی دوور دەکەوتەوە، هەرگیزیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەقو تۆڵەسەندنێ کە پەیوەندی تایبەتی بە خودی خۆیەوە هەبوایە نەیدەسەندو کابرای دەبەخشی مەگەر**

---

[١٥] مسلم. فضائل: ٥٩٩٨. أبو داود. أدب: ٤٨١٩..

[١٦] مسلم. فضائل: ٥٩٩٩. بخاري. مناقب: ٣٥٦٠ ، ٦١٢٦ ، ٦٧٨٦ ، ٦٧٥٣. تجريد/٤ ل – ١٠٨ رقم: ١٤٢٣.

کەسێ قەدرو ڕێزی شەریعەتی خودای گەورەو مەزنی بشکاندایە، ئەوە تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەند (ش/د).

٣١٣٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) شَيْئًا قَطُّ بِيَدِهِ وَلاَ امْرَأَةً وَلاَ خَادِمًا إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ وَمَا نِيلَ مِنْهُ شَيْءٌ قَطُّ فَيَنْتَقِمَ مِنْ صَاحِبِهِ إِلاَّ أَنْ يُنْتَهَكَ شَيْءٌ مِنْ مَحَارِمِ اللّٰهِ فَيَنْتَقِمَ لِلّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ. رواه مسلم وأبو داود[١٧]:

دیسان عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەرگیزاو هەرگیز پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە دەستی خۆی لە هیچی نەدەدا، نە لەژنو لە نۆکەرو نە لە کەسی تر، مەگەر لەکاتی غەزادا لە کەسێکی دابێ، هەرچیشی تووش دەبوو بەهۆی کەسێکی ترەوە قەت تۆڵەی لەو کەسە نەدەسەند بەڵام ئەگەر کەسێ ڕێزی شەریعەتی خودای بشکانبایە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەم حاڵەدا بە باشی تۆڵەو هەقی خودای گەورەو مەزنی دەستاند (م/د).

٣١٣٣- وَعَنْهَا قَالَتْ: صَنَعَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) أَمْرًا فَتَرَخَّصَ فِيهِ فَبَلَغَ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِهِ فَكَأَنَّهُمْ كَرِهُوهُ وَتَنَزَّهُوا عَنْهُ فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَقَامَ خَطِيبًا فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ بَلَغَهُمْ عَنِّي أَمْرٌ تَرَخَّصْتُ فِيهِ فَكَرِهُوهُ وَتَنَزَّهُوا عَنْهُ فَوَاللّٰهِ لأَنَا أَعْلَمُهُمْ بِاللّٰهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً. رواه مسلم والله أعلم[١٨]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جارێ کارێکی کرد بەپێی ڕوخصەت بە ئاسانی گرتی، چەند کەسێکیش لە یارانی کە ئەوەیان بیستەوە پێیان ناخۆش بوو، وە بەو ئەندازە شەو تاعەتەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کردبووی پێی ڕازی نەبوون، جا کە ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵسایەوە دوان (خوتبە)یەکی دا، فەرمووی: هەندێ پیاو بیستوویانەتەوە کە من کارێکم کردووەو بەپێی ڕوخصەتی خودا بە ئاسانی گرتوومە، کەچی ئەوان بەوە ڕازی نابنو ئەوەیان پێ ناخۆش بووە، ئەمە

---

[١٧] مسلم. فضائل: ٥٩٩٩ — ٦٠٠٥.

[١٨] مسلم. فضائل: ٦٠٦٢. بخاري. أدب: ٣١٠١ ، ٧٣٠١. تجريد بوخاری/ ٥ ل — ٣ ژ: ١٧٤٣ / ٥٠٦٣.

لەبەرچی؟ دەسا سوێندم بە یەزدانی پاك من لەوان باشتر لە خودا دەترسمو لەوانیش زیاتر خودا دەناسم (م).

## ٩١) دڵسۆزی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر بۆ ئۆمەتی خۆی

## شفقة النبي ﷺ على الأمة

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – صدق الله العظيم – ٩/١٢٨}.

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی حازرانی رۆژ! بە راستی هاتووە بۆلای ئێوە لە لایەنی خوداوە، پێغەمبەرێ کە لە رەگەزی خۆتانە، زۆر ناخۆشو گرانە لەسەر دڵی ئەگەر ئێوە تووشی رەنجو ئازارو گیرو گرفت بێن زۆر بە پەرۆشە بۆ ئێوە، بۆ هەموو موسوڵمانێ زۆر دڵسۆزو میهرەبانە.

٣١٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا. رواه الشيخان والترمذي[١٩]:

لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەرێ نزاو پاڕانەوەیەکی تایەبەتی خۆی هەیە، کە خودا گیرای دەکالێ، هەموو پێغەمبەرەکانی تر نزاکەی خۆیانیان بە زوویی لە دنیادا کردووەو گیرا بووە، وەلێ من نزاکەی خۆمم هەڵگرتووە بۆ رۆژی قیامەت، لەوێ تکای پێ دەکەم بۆ ئوممەتم، ئیتر ئەوەی لە ئوممەتم لەسەر ئیمانو باوەڕی راست بمرێو هیچ هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکا – خودا حەزکا – ئەوە ئەو کەسە بەر ئەم تکاو شەفاعەتەی منە دەکەوێ! (ش/ت).

---

[١٩] بخاري. دعوات: ٦٣٠٤ ، ٦٣٠٥ ، ٧٤٧٤. مسلم. إيمان: ٤٩٠ ، ٤٨٦ – ٤٩٧. ترمذي. دعوات: ٣٦٠٢.

**٣١٣٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو** (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **تَلاَ قَوْلَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي إِبْرَاهِيمَ ( رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي) الآيَةَ. وَقَالَ: عِيسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ ( إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي. وَبَكَى فَقَالَ: اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ - عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ - فَسَأَلَهُ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِمَا قَالَ. وَهُوَ أَعْلَمُ. فَقَالَ اللَّهُ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلاَ نَسُوءُكَ**[٢٠]:

**عەبدوڵلای کوڕی عەمر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە ئیبراهیم تیادا دەفەرموێ: {رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - ٣٦/١٤}: خودایە! ئەو بتانەو ئەم خودا درۆینانە خەڵکێکی گەلێ زۆریان گومڕاو سەرگەردان کردووە، دەی هەر کەسێ کە پەیڕەوی من دەکا ئەوە لە منەو لە دەستەی منە، وە ئەوەی لەمن یاخی دەبێ ئەوە بەرەو رووی خۆتی دەکەمەوەو تۆیش تاوانبەخشو میهرەبانیو لێی خۆش دەبێ یاسزای دەدەی ئەوە کەیفی خۆتەو فەرموودەکەی عیساشی خوێندەوە کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ - ١١٨/٥}. خودایە! کەس باڵا دەستی تۆ نیە، ئەمانە هەرچەند تاوان بارن، بەڵام بەندەو عەبدی خۆتن، ئەگەر سزاو ئازاریان بدەی ئەوە رەوایە بۆ تۆ، ئەگەر بە کەرەمو لوتفی خۆت تاوانیان بپۆشی ئەوە لە گێتی دیارە کە تۆ تەواناو داناو کار دروستیتو موڵك موڵکی خۆتەو بەندە بەندەی خۆتە، چی لێ دەکەی دەیکەی، کەس مافی رەخنەی نییە ئینجا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **هەردوو دەستی خۆی بەرزکردەوەو فەرمووی: ئەی خودایە! رەحم بکە بە ئۆمەتم، پەروەردگاری من! بەزەییت بێتەوە بە گەلەکەمدا ئینجا دەستی کرد بە گریان، جا خودای گەورەو سەروەر فەرمووی**

---

[٢٠] مسلم. إيمان: ٤٩٨.

بە جوبرائیل: ئەی جوبرائیل! بچۆ بۆ لای موحەممەد (هەرچەند خودای تۆ خۆشی باشتر دەزانێ) بچۆ لێی بپرسە کە لە بەرچی دەگریت؟ جا جوبرائیل هات لێی پرسی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێی گوت (دیارە کە خودا خۆی باشتر حاڵەکە دەزانێ) ئەوجا خودا فەرمووی: ئەی جوبرائیل! بڕۆ بۆ لای موحەممەد پێی بڵێ: کە خودا دەفەرموێ خەفەت مەخۆ ئێمە دەربارەی ئۆمەتت ڕازیت دەکەینو لە بارەی ئۆمەتتەوە قەت دڵت ناشکێنین! (م).

٣١٣٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَرَادَ رَحْمَةَ أُمَّةٍ مِنْ عِبَادِهِ قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا فَجَعَلَهُ لَهَا فَرَطًا وَسَلَفًا بَيْنَ يَدَيْهَا وَإِذَا أَرَادَ هَلَكَةَ أُمَّةٍ عَذَّبَهَا وَنَبِيُّهَا حَيٌّ فَأَهْلَكَهَا وَهُوَ يَنْظُرُ فَأَقَرَّ عَيْنَهُ بِهَلَكَتِهَا حِينَ كَذَّبُوهُ وَعَصَوْا أَمْرَهُ. رواهما مسلم في كتاب الإيمان[٣]:

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە ئەگەر خواستی خێرو نیازی باشی هەبێ بە نەتەوەیێ لە بەندەگانی خۆی ئەوە لە پێش خۆیانەوە گیانی پێغەمبەرەکەیان دەکێشێو دەیکا بە بەرایی و پێشەنگیانو لە پێش ئەوانەوە ڕەوانەی دەکا تا لە بەهەشتا پێشوازییان لێ بکا، بەڵام ئەگەر خودا ویستی نەتەوەیێ لە ناوبدا ئەوە لە ژیانی پێغەمبەرەکەیانا لە ناویان دەبا، وە بەوە چاوو دڵی ئەو پێغەمبەرە ڕۆشن دەکاتەوە، لەسەر ئەوەی کە بە درۆیان دەخستەوەو بێگوێییان دەکرد (م– نوقمی میهرەبانی خودا بێ).

## ٩٢) بەشی چوارەم: نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) یەکێکیان مۆری پێغەمبەرایەتییە کە بەناوشانیەوە بووە:

## الفصل الرابع: في إعلام نبوته ﷺ منها خاتم النبوة

٣١٣٧- عَنْ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ،

---

[٣] مسلم. فضائل: ٥٩٢٣.

ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلِ زِرِّ الْحَجَلَةِ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

**سائیبی کوڕی یەزید** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پوورم بردمی بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خوشکەزایەم نەخۆشە، پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەستی هێنا بە سەرماو دۆعاو نزای پیتو فەڕی بۆ کردم ئینجا دەسنوێژی گرتو لە ئاوەچۆڕی دەسنوێژەکەیم خواردەووە، ئەوجا لە پشتیەوە ڕاوەستامو سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد، کە بە ناوشانیەوە بوو، وەك دوگمەی پەردەکوللە وابوو، یاخود وەك هێلکەی کەو وابوو (ش/ت).**

٣١٣٨- عَنْ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ خَاتِمًا فِي ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَأَنَّهُ بَيْضَةُ حَمَامٍ. رواه مسلم والترمذي ولفظه: كَانَ خَاتَمُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي بَيْنَ كَتِفَيْهِ غُدَّةً حَمْرَاءَ مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ[2]:

**جابیری کوڕی سەموورە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: مۆرێکم بینی بەپشتی پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **وەك هێلکەی کۆتر وابوو (م/ت) گفتەی (ت): مۆرەکەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە بەناو شانیەوە بوو لوویەکی سوور بوو، بەقەد هێلکەی کۆترێ دەبوو.**

٣١٣٩- عَنْ عَاصِمٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَكَلْتُ مَعَهُ خُبْزًا وَلَحْمًا - أَوْ قَالَ: ثَرِيدًا - قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ أَسْتَغْفَرَ لَكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: نَعَمْ وَلَكَ ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ (وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ) قَالَ: ثُمَّ دُرْتُ خَلْفَهُ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ عِنْدَ نَاغِضِ كَتِفِهِ الْيُسْرَى جُمْعًا عَلَيْهِ خِيلاَنٌ كَأَمْثَالِ الثَّآلِيلِ. رواه مسلم[3]:

---

[1] بخاري. وضوء: ١٩٠ ، ٣٥٤٠ ، ٣٥٤١ ، ٥٦٧٠ ، ٦٣٥٢.تجريد/ ١ ل — ١٦٢ ژ: ١٤١/ ١٩٠.

[2] مسلم. فضائل: ٦٠٣٨ ، ٦٠٣٩.

[3] مسلم. فضائل: ٦٠٣٨ ، ٦٠٣٩.

عاصم لە عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیسەوە (خوا لێیان رازی بێ) گوتی: خۆم پێغەمبەرم دیوە (درودی خودای لەسەربێ) وە نانو گۆشتیشم لەگەڵیدا خواردووە، یا گوتی نانو تریتم لەگەڵدا خواردووە، عاصم گوتی پێیم گوت: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پاڕاوەتەوە بۆت؟ گوتی: بەڵێ، وە بۆ تۆیشو بۆ هەموو موسوڵمانێکی تریش پاڕاوەتەوە، ئەوجا بۆ شایەتیی قسەکەی خۆی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ – ١٩/٤٧}. داوای لێ بووردنو تاوان پۆشی لە خودا بکە بۆ خۆتو بۆ هەموو موسوڵمانێ بۆ نێرو مێیان. عەبدوڵڵا گوتی: ئینجا لە پشتیەوە سووڕامەوە چاوم کەوت بە مۆری پێغەمبەرایەتی، بەناوشانیەوە بوو، لە شێوەی دەستی نووقاودا بوو، خاڵێکی زۆری پێوەبوو لە چەشنی وردەبالووکە! (م).

## ٩٣) نیشانەیەکی تریان ئەوە بوو بوحەیرای راهیب (کە پیاوێکی سۆفیلکەو زانایەکی مەسیحی بوو) هەواڵی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری راگەیاند:

### ومنها إخبار الراهب برسالته ﷺ

٣١٤٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجَ أَبُو طَالِبٍ إِلَى الشَّامِ وَمَعَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي أَشْيَاخٍ مِنْ قُرَيْشٍ فَلَمَّا أَشْرَفُوا عَلَى الرَّاهِبِ هَبَطُوا فَحَلُّوا رِحَالَهُمْ فَخَرَجَ إِلَيْهِمُ الرَّاهِبُ وَكَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ يَمُرُّونَ بِهِ فَلاَ يَخْرُجُ إِلَيْهِمْ وَلاَ يَلْتَفِتُ. إِلَيْهِم فَجَاءَ الراهِبُ وَهُمْ يَحُلُّونَ رِحَالَهُمْ فَصَارَ يَتَخَلَّلُهُمُ الرَّاهِبُ حَتَّى جَاءَ فَأَخَذَ بِيَدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: هَذَا سَيِّدُ الْعَالَمِينَ هَذَا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ يَبْعَثُهُ اللَّهُ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ. فَقَالَ: لَهُ أَشْيَاخٌ مِنْ قُرَيْشٍ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا فَقَالَ: إِنَّكُمْ حِينَ أَشْرَفْتُمْ مِنَ الْعَقَبَةِ لَمْ يَبْقَ شَجَرٌ وَلاَ حَجَرٌ إِلاَّ خَرَّ سَاجِدًا وَلاَ يَسْجُدَانِ إِلاَّ لِنَبِيٍّ وَإِنِّي أَعْرِفُهُ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ أَسْفَلَ مِنْ غُضْرُوفِ كَتِفِهِ مِثْلَ التُّفَّاحَةِ. ثُمَّ رَجَعَ فَصَنَعَ لَهُمْ طَعَامًا فَلَمَّا أَتَاهُمْ بِهِ وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رِعْيَةِ الإِبِلِ – قَالَ: أَرْسِلُوا إِلَيْهِ فَأَقْبَلَ وَعَلَيْهِ غَمَامَةٌ تُظِلُّهُ فَلَمَّا دَنَا مِنَ الْقَوْمِ وَجَدَهُمْ قَدْ سَبَقُوهُ إِلَى فَيْءِ الشَّجَرَةِ فَلَمَّا جَلَسَ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَالَ فَيْءُ الشَّجَرَةِ عَلَيْهِ فَقَالَ الرَّاهِبُ: انْظُرُوا إِلَى فَيْءِ الشَّجَرَةِ مَالَ عَلَيْهِ. قَالَ:

فَبَيْنَمَا هُوَ قَائِمٌ عَلَيْهِمْ وَهُوَ يُنَاشِدُهُمْ أَنْ لاَ يَذْهَبُوا بِهِ إِلَى الرُّومِ فَإِنَّ الرُّومَ إِذَا رَأَوْهُ عَرَفُوهُ بِالصِّفَةِ فَيَقْتُلُونَهُ فَالْتَفَتَ فَإِذَا بِسَبْعَةٍ قَدْ أَقْبَلُوا مِنَ الرُّومِ فَاسْتَقْبَلَهُمْ فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكُمْ؟ قَالُوا جِئْنَا أَنَّ هَذَا النَّبِيَّ خَارِجٌ فِي هَذَا الشَّهْرِ فَلَمْ يَبْقَ طَرِيقٌ إِلاَّ بُعِثَ إِلَيْهِ بِأُنَاسٍ وَإِنَّا قَدْ أُخْبِرْنَا خَبَرَهُ بُعِثْنَا إِلَى طَرِيقِكَ هَذَا فَقَالَ: هَلْ خَلْفَكُمْ أَحَدٌ هُوَ خَيْرٌ مِنْكُمْ؟ قَالُوا إِنَّمَا أُخْبِرْنَا خَبَرَهُ بِطَرِيقِكَ هَذَا. قَالَ: أَفَرَأَيْتُمْ أَمْرًا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَهُ هَلْ يَسْتَطِيعُ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ رَدَّهُ؟ قَالُوا: لاَ. قَالَ: فَبَايَعُوهُ وَأَقَامُوا مَعَهُ قَالَ: أَنْشُدُكُمُ اللَّهَ أَيُّكُمْ وَلِيُّهُ قَالُوا أَبُو طَالِبٍ فَلَمْ يَزَلْ يُنَاشِدُهُ حَتَّى رَدَّهُ أَبُو طَالِبٍ وَبَعَثَ مَعَهُ أَبُو بَكْرٍ بِلاَلاً وَزَوَّدَهُ الرَّاهِبُ مِنَ الْكَعْكِ وَالزَّيْتِ. رواه الترمذي بسند حسن[1]:

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو طالیب پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ خۆی دەباو لەگەڵ چەن کەسێ لە پیرانی قورەیش دەچن بۆ سەفەری شام، کە دەگەنە لای سۆفیلکەکە، کە ناودارە بە بوحەیرای ڕاهیب، لەوێ دادەبەزنو باردەخەن، جارانی پێشووتر کە لەو شوێنەدا لایان دەدا ڕاهیبەکە نەدەهات بۆ لایانو نە گوێی پێ دەدان، بەڵام ئەم جارە دێ بۆ لایان، کە دەگاتە جێ کاروانەکە کە هێشتا هەر خەریکی بارخستن بوون!! جا دەسووڕێتەوە بە ناویانا، تا دەگاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەستی دەگرێو دەڵێ: ئەمە سەروەری عالەمە ئەمە سەرگەورەی جیهانە، ئەمە پێغەمبەری خودای هەردوو جیهانە، ئەمە خودا دەیکا بە پێغەمبەرو دەیکا بە مایەی خۆشیو ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانیان جا گەورە پیاوانی قورەیش پێیان گوت: تۆ ئەمە چۆن دەزانی؟ گوتی: کە ئێوە لە یاڵەکەوە سەرکەوتن دارو بەرد نەما کە کوڕنووش (سەجدە) بۆ ئەم کوڕە نەبا، دارو بەردیش بەس بۆ پێغەمبەران کوڕنووش دەبەن، وە دیسان من بەو نیشانە شا دەیناسم کە مۆری پێغەمبەرایەتی وا بەخوار، کڕ کڕۆچکەی دەفەی شانیەوە، ئەوەندەی سێوێ دەبێ ئەوسا سەیری مۆرەکەی کردو بە تەواوی دڵنیا بوو ئینجا

[1] رواه الترمذي بسند حسن.

سۆفیلکەکە گەڕایەوە بۆ جێگەکەی خۆی نانی بۆ دروستکردن، جا کە نانەکەی هێنا بۆیان لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەلای وشترەکان دەبێ، دەیان لەوەڕێنێ.

دەڵێ: بنێرن بە شوێنیا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات پەڵەیێ هەور بەسەر سەریەوە بوو سێبەری بۆ دەکرد، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نزیك بۆوە تەماشای کرد پیاوەکان لە سێبەری شێخەڵەکەدا دانیشتوونو جێگەی ئەو نابێتەوە، ئیتر لەولاوە دانیشت، بەڵام هەر لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشت ئیتر گورج سێبەری شێخەڵەکە بایدایەوە بۆ سەر ئەو! راهیبەرکە گوتی: سەیرکەن چۆن سێبەری شێخەڵکە بایدایەوە بۆ سەر ئەو گوتی: راهیبەکە لە دیاریان راوەستابوو ئامۆژگاری دەکردن کە نەیبەن بۆ رۆم، چونکە ئەگەر بیبەن بەو ناونیشانەیە دەیناسنەوەو دەیکوژن لەم کاتەدا ئاوڕێکی دایەوە سەیری کرد وا حەوت کەس لە رۆمەوە هاتن، جا خۆی چوو بە پیریانەوەو گوتی: بۆچی هاتوون؟

گوتیان: هاتووین چونکە ئەو پێغەمبەرە لەم مانگەدا لە ماڵ دەردەچێ، رێگەو بان نەماوە کە دەستەیەکی بۆ رەوانە نەکرابێ ئێمەش – کە هەواڵی ئەومان وەرگرتووە – رەوانە کراوین بۆ ئەم رێگەی تۆیە سا بەشکوو لایەکمان تووشی ببێو بیکوژین! گوتی: لە دوا ئێوەوە کەسی تر هەیە کە لە ئێوە چابوکتر بێو رەوانە کرابێ بۆ هەڵسان بەم کارە گلاوە؟ گوتیان: نەء، بەڵکوو ئێمەیان بە تایبەتی هەڵبژاردووە بۆ ئەم رێگەی تۆیە، گوتی: پێم بڵێن کارێ خودا ئەگەر بڕیاری بدا ئایا کەسی تر دەتوانێ رەتی بکاتەوە؟ گوتیان: نەء. گوتی: جا پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەرداو مانەوە لەلای. راهیبەکە گوتی: سوێندتان دەدەم بە خودا کێتان کار بە دەستی ئەم کوڕەن؟ گوتیان: ئەبو طالیب، ئیتر وازی لێ نەهێنا تا ئەبو طالیب پێغەمبەری گێڕایە دواوە،

**ئەبو بەرکیش بیلالی لەگەڵ پێغەمبەردا ناردەوە[1]، ڕاهیبەکەیش کولیچەو ڕۆن زەیتوونی دانێ! (ت-س/ح).**

[1] تێبینی: دەربارەی ئەم حەدیسە زانایانی حەدیس چەند ڕایەکیان هەیە:

١- ئیمامی جەزەری فەرمویەتی ئیسنادەکەی ڕاستەو پیاوانێ کە ئەم حەدیسەیان گێڕاوەتەوە بڕوا پێ کراوی حەدیسن، بەڵام ڕستەی (وبعث معه أبو بكر بلالا) بەشێکی ئەم حەدیسە نیە تەنانەت بڕێ پێیان وایە ئەمە وەهمو سەر لێ تێکچوونە، چونکە ئەوکاتە پێغەمبەر تەمەنی دوانزە ساڵ بووە ئەبو بەکریش بە دووساڵو شتێك لە پێغەمبەر بچوکتر بووە بیلالیش ئەوکاتە هەر لە دایك نەبووە.

٢- خاوەنی کتێبی (میزان الاعتدال) ئەم حەدیسەی بەلاوە ناڕاستە دەفەرموێ بەڵگە لەسەر ناڕاستی حەدیسەکە ڕستەی (وبعث معه أبو بكر بلال)ە چونکە ئەو کاتە ئەبو بەکر منداڵ بووەو (بیلال)یش هەر لە دایك نەبووە.

٣- ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ ئەم حەدیسە زەعیفە چونکە ڕستەی (وبعث معه أبو بكر بلالا) تێدایە خۆ ئەو کاتە ئەبو بەکر منداڵ بووەو بیلالیشی نەکڕیوە.

٤- ئیمامی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەفەرموێ: پیاوانێ کە ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە هەموویان بڕوا پێ کراون بەڵام ڕستەی (وبعث معه أبو بكر بلالا) بە نەزانی لەلاوە تێهەڵکێشی ئێرە کراوەو مودرەجە، ئەبێ ڕستەی حەدیسێکی تر بێ کەوتبێتە ئێرە.

٥- ئیبنو القیم الجوزی: دەفەرموێ: ئەو ڕستەیەی کە لە کتێبی تیرمیزیدا دەفەرموێ: (وبعث معه أبو بكر بلال) هەڵەیەکی ئاشکرایەو گومان لە هەڵەیی دا نیە چونکە ئەوکاتە بیلال هەر لەدایك نەبووە ئەگەر لە دایکیش بووبێ منداڵێکی ساوا بووە لەگەڵ مامی پێغەمبەر نەبووە هەروەها لەگەڵ ئەبو بەرکیش نەبووە.

٦- ئیمامی بەززازیش لە موسنەدی خۆی دا ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە بەڵام ڕستەی (وبعث معه ابو بكر بلالا)ی نەگوتووە بەڵکوو نوسیویەتی (وأرسل معه عمه رجلا).

بۆ زیادە زانیاری سەیری کتێبی تحفة الاحوذی بشرح جامع الترمذی للامام أبی العلی محمد بن عبدالرحمن بن عبد الرحیم المبارکفوری ج ١٠ / ٩٠ — ٩٤ بکە.

## ٩٤) نیشانەیەكی تریان: بەردو دار سڵاویان لێ دەكرد (دروودی خودای لەسەر)

## ومنها تسليم الحجر والشجر عليه ﷺ

٣١٤١- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي لأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ. رواه مسلم والترمذي وَلفظه: إِنَّ بِمَكَّةَ حَجَرًا كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ لَيَالِيَ بُعِثْتُ إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ[1]:

جابیری كوڕی سەمووره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەردێ هەیە لە مەككە دەیزانم بەرلەوە كەبكرێم بە پێغەمبەر ئەو بەردە سڵاوی لێ دەكردم، ئێستاش دەزانم كام بەردەیە (م/ت) گفتەی (ت): بەردێ هەیە لە مەككە لەو شەوانەدا كە كرام بە پێغەمبەر سڵاوی لێ دەكردم، ئێستاش بە باشی ئەو بەردە دەزانم.

٣١٤٢- وَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّةَ فَخَرَجْنَا فِي بَعْضِ نَوَاحِيهَا فَمَا اسْتَقْبَلَهُ جَبَلٌ وَلاَ شَجَرٌ إِلاَّ وَهُوَ يَقُولُ السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. رواه الترمذي.

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە مەككە لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچووین بۆ شوێنێ، لە رێگە تووشی هەر شاخو هەر درەختێ دەبوو، بە زمانێكی رەوان دەیگوت: سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خودا! (ت).

## ٩٥) نیشانەیەكی تریان ئەوە بوو جنۆكەو بانگەوازكەران هەواڵی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەریان رادەگەیاند (دروودی خودای لەسەر)

## ومنها إخبار الجن والهواتف بالنبي ﷺ

٣١٤٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: مَا سَمِعْتُ عُمَرَ لِشَيْءٍ قَطُّ يَقُولُ إِنِّي لأَظُنُّهُ كَذَا. إِلاَّ كَانَ كَمَا يَظُنُّ، بَيْنَمَا عُمَرُ جَالِسٌ إِذْ مَرَّ بِهِ رَجُلٌ جَمِيلٌ فَقَالَ: لَقَدْ أَخْطَأَ ظَنِّي، أَوْ إِنَّ هَذَا عَلَى دِينِهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، أَوْ لَقَدْ كَانَ كَاهِنَهُمْ، عَلَيَّ الرَّجُلَ،

---

[1] مسلم. فضائل: ٥٨٩٨.

فَدُعِيَ لَهُ، فَقَالَ: لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ اسْتُقْبِلَ بِهِ رَجُلٌ مُسْلِمٌ، قَالَ عُمَرُ: فَإِنِّي أَعْزِمُ عَلَيْكَ إِلاَّ مَا أَخْبَرْتَنِي. قَالَ: كُنْتُ كَاهِنَهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ. قَالَ: فَمَا أَعْجَبُ مَا جَاءَتْكَ بِهِ جِنِّيَّتُكَ؟ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا يَوْمًا فِي السُّوقِ جَاءَتْنِي أَعْرِفُ فِيهَا الْفَزَعَ، فَقَالَتْ أَلَمْ تَرَ الْجِنَّ وَإِبْلاَسَهَا وَيَأْسَهَا مِنْ بَعْدِ إِنْكَاسِهَا وَلُحُوقَهَا بِالْقِلاَصِ وَأَحْلاَسِهَا قَالَ: عُمَرُ صَدَقْتَ، بَيْنَمَا أَنَا عِنْدَ آلِهَتِهِمْ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ بِعِجْلٍ فَذَبَحَهُ، فَصَرَخَ بِهِ صَارِخٌ، لَمْ أَسْمَعْ صَارِخًا قَطُّ أَشَدَّ صَوْتًا مِنْهُ يَقُولُ يَا جَلِيحْ، أَمْرٌ نَجِيحْ رَجُلٌ فَصِيحْ يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. فَوَثَبَ الْقَوْمُ قُلْتُ لاَ أَبْرَحُ حَتَّى أَعْلَمَ مَا وَرَاءَ هَذَا الصَّرِخِ ثُمَّ نَادَى يَا جَلِيحْ، أَمْرٌ نَجِيحْ، رَجُلٌ فَصِيحْ، يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَقُمْتُ فَمَا نَشِبْنَا أَنْ قِيلَ هَذَا نَبِيٌّ ظَهَرَ. رواه البخاري في الفضائل في إسلام عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وحشرنا في زمرته آمين. والله أعلم[1]:

ئیبنو عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هەرگیز نەبووە کە لە عومەر ببیستم کە بە شتی بڵێ: وا دەزانم ئەم شتە وایەو ئەو شتە وا نەبووبێ، جارێ عومەر دانیشتبوو، پیاوێکی جوان کە ناوی سەوادی کوڕی قاریب بوو لە لایەوە رەت بوو، عومەر گوتی: یا من زەینم بە هەڵەدا چووە یا ئەم پیاوە هێشتا لەسەر ئایینە کۆنەکەیەتی، یا لەکاتی خۆیدا ئەمە کوڵەنانی (کاهین)یان بووە، ئادەی بیهێنن بۆم! جا پیاوەکەیان بانگ کرد بۆی، کە هات قسەکەی پێشووی پێی گوت، ئەویش گوتی: قەت نەمدیوە کە پیاێکی موسوڵمان وەك ئەمڕۆی من تانووتی لێ بدرێ. عومەر پێی گوت: تا راستیم پێ نەڵێیت یەخەت بەر نادەم، گوتی: راستییەکەی لە سەردەمی نەزانیدا من کوڵە نانی هۆزەکەم بوم عومەر گوتی: سەیر ترین شت کە جنۆکەکەت هەواڵی ئەوەی بۆ هێنابی چی بوو؟ گوتی: رۆژێ لە بازاڕ بووم، جنۆکەکەم هات بۆ لام سەیرم کرد تەواو شڵەژاوەو گوتی: سەیر ناکەی کە جنۆکە چۆن ورەیان بەرداوەو لە ئاسمانەوە چۆن سەرەو خوار راونراون بە شووڵەئاگرو لەبەر ئەوە نائومێد بوون و لە نائومێدییدا شوێن ئایینە پووچەکەی عەرەبەکان کەوتوون، کە بە وشترداری ناسراون. عومەر گوتی: راست دەکەی، منیش جارێ لەلای خودا

[1] بخاري. مناقب: ٣٨٦٦.

درۆینەکانیان بووم، لەو کاتەدا کابرایێ گوێرەکەیەکی هێناو سەری بڕی بۆ بتەکان، جا لەپڕ یەکێ قیراندیو گوتی: ئەی دوژمنی خودا! تۆ تازە خەریکی چیت، باوی بتپەرستی بە سەرچوو، چونکە وا کاری ئەو پیاوە سەری گرت، پیاوێکی رەوانبێژە بە ئاشکرا دەڵێ: لا اله الا الله: جا پیاوەکان راپەڕینو لە ترسانا هەڵهاتن، بەڵام من گوتم: جووڵە ناکەم تا نەزانم ئەم دەنگە چی بوو کە لە غەیبەوە هات، جا دیسان هاواری لێ هەڵسایەوەو گازی کردەوە: ئەی دوشمنی خودا! ئەی بتپەرستی گوێرە کە سەربڕ! کاری ئەو پیاوە سەری گرت، ئەو پیاوە رەوانبێژە بە ئاشکرا دەڵێ: لا الە الا الله: تاقە یەك خودا هەیە کە ناوی ئەڵڵایە ئیتر منیش هەڵسام، ئیتر ئەوەندەی نەبرد کە قاو بڵاو بۆوە: ئەوە پێغەمبەرێ پەیدا بووە، ناوی موحەممەدە (ب).

## ٩٦) بەشی پێنجەم: باسی سرووش (وحی)و پێغەمبەرایەتی (نبوة) و پەیامنێری (رسالة).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الأمُورُ}.
(صدق الله العظيم)-٤٢/٥٢-٥٣.

واتە: یەزادنی مەزن قەرموویەتی: وەك چۆن لەمەو پێش سرووشمان نارد بۆ پێغەمبەرەکانی تر ئاواش ئەم قورئانەمان ناردووە بۆ تۆ، کە وەك رۆحو گیان وایە، دڵو دەروون رۆشنو رووناك دەکاتەوە لە پێش ئەم قورئانەدا تۆ نەت دەزانی قورئان چییەو بیرو باوەڕو یاسا چییە، بەڵام ئەوە بوو ئەم قورئانەمان کرد بەچرایەکی رۆشنی پڕ تەودارهەر کەسەمان مەبست بێ لە بەندەگانی خۆمان دڵو چاوو مێشكو دەروونی بە تیشکی ئەوچرای خوداییە رووناك دەکەینەوە، وە بە راستی تۆ رابەرێکی باشو راستو دروستیو خەڵك شارەزایی دەکەی بۆ سەر رێگەی راست، بۆ سەر چەقی ئەو

شەقامو شارێ راستە کە خودای هەموو ئاسمانەکانو هەموو زەوی خۆی هەڵی بژاردووە بۆ بەندەباشەکانی خۆی. زۆر باش بزانن کە سەرەنجامی هەموو کارێ هەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوەو هەموو شتێ دەچێتەوە بەر دەستی خۆی!

## ٩٧) سرووش چۆن دەهاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر)

## كيف كان الوحي ينزل على النبي ﷺ

٣١٤٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُا) أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ - وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ - فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ:، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ . قَالَتْ: عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنهُا) وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ، فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا. رواه الشيخان والترمذي[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حاریسی کوڕی هیشام پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: سرووشت چۆن بۆ دێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): گەلێ جار بەوێنەی زرنگەی زەنگ بۆم دێ ئەم جۆرەیان سەختترین شێوەیەتی لە کنم، جا کە فریشتەی سروش، یا سرووشەکە خۆی بەرم دەدا ئیتر هەرچی گوتووە دێتەبەرمو باش باش دەیزانمو لێی تێ دەگەم وە زۆر جارانیش فریشتەکە واتە: جوبرائیل لە شێوەی پیاوێکا وەك دەحیەی کەلبی خۆی دەردەخا بۆمو قسەم لەگەڵ دەکاو هەرچی دەفەرموێ وەری دەگرمو دێتە بەرم عائیشە گوتی: بە خودا خۆم پێغەمبەرم دیوە، لە رۆژی

---

[1] مسلم. فضائل: ٦٠١٣. تجريد بخاري/١ل-١١ رقم: ٢/٢ ، ٣٢١٥.

سەرماو سۆڵەدا کە سرووش دەهاتە خوارەوە بۆی، لەو کاتەدا کە بەری دەدا چۆڕاوگەی ئارەق بە ناوچەوانی دا خوڕخوڕ دەهاتە خوارەوە! (ش/ت).

٣١٤٥- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ كُرِبَ لِذَلِكَ وَتَرَبَّدَ وَجْهُهُ[٢]:

عوبادەی کوڕی صامیت (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە سرووش دەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی پەرۆش دەبوو، وە رووی کرژ دەبوو رەنگی دەگۆڕا (م).

٣١٤٦- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ نَكَسَ رَأْسَهُ وَنَكَسَ أَصْحَابُهُ رُءُوسَهُمْ فَلَمَّا اِنْجَلَى عَنْهُ رَفَعَ رَأْسَهُ. رواهما مسلم[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ کە سرووشی بۆ دەهات سەری دادەنەواند، یارانیشی سەری خۆیانیان دادەنەواند، کاتێ فەرامۆشی بۆ دەهات ئەوجا سەری خۆی بەرز دەکردەوە (م).

## ٩٨) بەرایی سرووش : (أول نزول الوحي بالنبوة والرسالة)

٣١٤٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ - وَهُوَ التَّعَبُّدُ - اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ، فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: اقْرَأْ. قَالَ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ. قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقُلْتُ مَا أَنَا

---

[٢] مسلم. فضائل: ٦٠١٤ ، ٤٣٩٠ — ٤٣٩٣ ، ٦٠١٥. أبو داوُد. حدود: ٤٤١٥ ، ٤٤١٦. ترمذي. حدود: ١٤٣٤.

[٣] مسلم. فضائل: ٦٠١٥.

بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِى خَلَقَ * خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ ). فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) فَقَالَ: زَمِّلُونِى زَمِّلُونِى. فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ: لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِى. فَقَالَتْ خَدِيجَةُ كَلاَّ وَاللَّهِ مَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِى الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ. فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ – وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِى الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِىَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِىَ – فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ يَا ابْنَ عَمِّ اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ. فَقَالَ: لَهُ وَرَقَةُ يَا ابْنَ أَخِى مَاذَا تَرَى فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَبَرَ مَا رَأَى. فَقَالَ: لَهُ وَرَقَةُ هَذَا النَّامُوسُ الَّذِى نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَالَيْتَنِى فِيهَا جزعاً لَيْتَنِى أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَوَمُخْرِجِىَّ هُمْ؟ قَالَ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِىَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِى يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّىَ وَفَتَرَ الْوَحْىُ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

**عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە سەرەتاوە کە سرووش دەستی پێکرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خەونی باش بوو، لە خەودا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەر خەونێکی دەدی بە وێنەی شەبەقی بەیان دەهاتەدی، لە پاشا بەرە بەرە حەزی لە تەنهاییو گۆشەگیریی و خەڵوەکێشان بوو، جا دەستدەکا بە خەڵوەکێشان لە ئەشکەوتی جیراء دا، وە لەوێ هەموو جارێ چەند شەوێ بە ژمارە دەمایەوەو لێ دەبڕا بۆ خودا – واتە خودا پەرستیی دەکرد – وە لەو ماوەیەدا تاسەو ئەڵهای کەسو کاری نەدەکردو نەدەچووە بۆ لایان، وە بۆ ئەمەش توێشەی لەگەڵ خۆیا دەبرد، ئینجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خەدیجەو سەر لەنوێ توێشەی ئەوەندەی تریشی دەکردەوەو، دەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، جا هەتا ماوەیێ لەسەر ئەم حاڵە دەوامی کرد تا**

---

[1] بخاري. بدء الوحى: ٣ ، ٣٣٩٠ ، ٤٩٥٣ ، ٤٩٥٥ ، ٤٩٥٦ ، ٤٩٥٧ ، ٦٩٨٢. مسلم. إيمان: ٤٠١.

لەپڕ لە ئەشکەوتی حیراءدا بەم شێوەیە سرووشی بۆ دێ: فریشتەکە دێتە لایو دەفەرموێ پێی: بخوێنە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گوتم: من خوێندەوار نیم فەرمووی: جا فریشتەکە گرتمیو گوشیمی بە سینگی خۆیەوە تا هێزی لێ بڕیم، ئیتر بەری دامو فەرمووی: بخوێنە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گوتم: چی بخوێنم خۆ من خوێنەوار نیم، دیسان گرتمیو گوشیمییەوە بە خۆیەوە تاووزەم لێ بڕاو تەواو شەکەت بووم، دیسان بەری دامەوەو فەرموویەوە: بخوێنە گوتمەوە: من خوێندەوار نیم، دیسانەوە بۆ جاری سێیەم گرتمیو گوشیمی بە خریەوە تا وزەم لێ بڕایەوە، ئەوجا بەری دامەوەو فەرمووی: {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ}. بخوێنە بە یارمەتیو پیرۆزی ناوی پەروەردگاری خۆتەوە، کە هەموو شتێ ئەو دروستی کردووە، مرۆڤی دروست کردووە لە تنۆکی خوێنو لە پارچەیێ خوێن پارەکە لە تنۆکێ تۆمەوە پەیدا دەبێ، بخوێنەو بزانە کە خودای تۆ خودایەکی وایە کە لە هەموو کەسێ بەخشندە ترە. ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەم ئایەتانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو سام دای دەگرێو دڵێ دەلەرزێو دەڕواتەوە بۆلای خەدیجەی کچی خووەیلید، کە یەکەم ژنی بوو دەفەرموێ: دام پۆشن – دامپۆشن ئەوانیش دای دەپۆشن تا ترسو سامەکەی دەنیشێتەوە، ئەوسا ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ خەدیجەو دەفەرموێ: بە خودا مەترسیم لە خۆمکرد کە بمرم ئەوەندە سامێ گرانم لێ نیشت خەدیجەش (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: دووربا شتی وا مەفەرموو، بە خودا هەرگیز خودا شتی وا ناکاو تۆ ریسواناکا، چونکە تۆ پیاوێکی خزم دۆستیو خزمەتی خزمو خوێش دەکەیتو پیاوی کۆڵیو دەسەوسان دەگریتە مل خۆتو باری ئازاری خەڵك دەخەیتە سەرشانی خۆتو داڵدەی بێ نەوایان دەدەیتو شتی وا دەبەخشی بە خەڵك بە هەموو کەسێ نابەخشرێو میوانداریی بە میوان دەکەیو یاریدەی لێ قەوماوان دەدەی، یارمەتی مەردوم دەدەیو پیاوەتیو مەردایەتیو کۆمەکیت کردووە بە پیشەو بە ئەرکی سەرشانی خۆت. ئەوجا خەدیجە لەگەڵیا دەچێ بۆ لای

وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا، کە ئامۆزای خەدیجە بووە، وە لە سەردەمی نەزانی دابوو بووبە مەسیحی، وە نووسینی عیبرانی دەزانی ئەوەندەی خودا حەزکا، ئینجیلی بە عیبرانی دەنووسیەوە، خۆی پیرەمێردێکی ئیختیار بوو کوێر بوو بوو، جا خەدیجە پێی دەڵێ: ئامۆزا! گوێ لە برازاکەت بگرە بزانە دەڵێ چی، وەرەقەش پێی دەڵێ: ئەی کوڕی برام! ئادەی پێم بڵێ چی دەبینیت؟ پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) چی دیبوو بۆی دەگێڕێتەوە، وەرەقە پێی دەڵێ: ئەمە هەمان فریشتەیە کە ئەمیندارو پیرۆزە، کە لەکاتی خۆیا خودا ناردبووی بۆ لای مووساو بۆ لای عیسا، ئەوە جوبرائیلە ئەمینداری سرووشە خۆزگەم لەکاتی ئاشکرابوونی پێغەمبەرایەتیی تۆدا من گەنج دەبووم، خۆزگەم ئەو سەردەمە من دەمام!" بریا نە دەمردم تا ئەو ڕۆژەی کە گەلەکەت لە مەککە دەرت دەکەن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بۆچی خزمانی من لە مەککە دەرم دەکەن؟ دەڵێ: بەڵێ، چونکە هەر پیاوێ داوایەکی وەك ئەم داوایەی تۆی هێنا بێ، مسۆگەر گێچەڵیان پێ کردووەو دوژمنایەتیان تێ بەستووە، ئەگەر من فریای ئەو ڕۆژەت دەکەوتم، یارمەتییەکی زۆر باشم دەدای، ئیتر وەرەقە ئەوەندەی نەبرد کە مردو بە ڕەحمەتی خودابوو، وە سرووش تاماوەی سێ ساڵ کپ بوو، وە نەهات بۆ پێغەمبەر (ش/ت).

٣١٤٨- وَقَالَ جَابِر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ فَقَالَ: فِي حَدِيثِهِ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ بَصَرِي فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ( يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ) وَهِيَ الأَوْثَانُ قَالَ ثُمَّ حَمِيَ الْوَحْيُ وَتَتَابَعَ. رواه الشيخان[1] والترمذي[2]:

---

[1] لە لەفزی بوخاریدا حەدیسی یەكو دوو یەك حەدیسن بەڵام لە موسلیمدا دوو حەدیسن. بۆیە منیش کردم بە دوو. (وەرگێڕ)

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) باسی ئەو ماوەیەی دەگێڕایەوە کە سرووش بڕان بوو، سرووش نەدەهات بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوا بەرێوەم دەرۆم لە پڕ دەنگێکم بەرگوێ کەوت لە ئاسمانەوە، کە چاوم هەڵ بڕی ڕوانیم وا ئەو فریشتەیەی کە لە ئەشکەوتی حیراء هات بۆ لام، لەسەر کورسییەك دانیشتووە لە بەینی ئاسمانو زەویدا، ئیتر منیش لێی تۆقیمو گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو گوتم: دام پۆشن دام پۆشن، جا لە پاشا خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنذِرْ. وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ. وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ. وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ – ٧٤/١–٥}. ئەی ڕەهبەرێ کە خۆت بە نیوێنی ناو ماڵ پێچاوەتەوە! هەڵسە تێکۆشە، کەی کاتی نووستنو پاڵکەوتنە، ڕاپەڕە ئەو خەڵکە بێ ئاگایە بێدار کەرەوەو لە سزاو تۆڵەی خودا بیان ترسینە، تەنیا خودای خۆت بە گەورە بگرەو ڕێزی بگرەو هەر ئەو بە خودای گەورەی خۆت بزانەو هەرگیز هاوبەشی بۆ پەیدا مەکە، وەجلو بەرگی خۆت پاكو تەمیز ڕابگرە، وە وەك هەمیشەو تاسەر واز لە بتو بتکاری بێنە، یا دەست لە گوناە، هەڵگرە ئیتر لەوە بە دوا سرووش بە گەرمی دەهاتو پەیتا پەیتا بەرودوا دەهاتە خوارێ (ش/ت).

٣١٤٩– عَنْ يَحْيَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. فَقُلْتُ: أَوِ اقْرَأْ. قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. فَقُلْتُ أَوِ اقْرَأْ قَالَ: جَابِرٌ أُحَدِّثُكُمْ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ شَهْرًا فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي نَزَلْتُ فَاسْتَبْطَنْتُ بَطْنَ الْوَادِي فَنُودِيتُ فَنَظَرْتُ أَمَامِي وَخَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ أَحَدًا ثُمَّ نُودِيتُ فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا جِبْرِيلُ عَلَى الْعَرْشِ فِي الْهَوَاءِ فَأَخَذَتْنِي رَجْفَةٌ شَدِيدَةٌ فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ دَثِّرُونِي.

---

(٢) بخاري. بدء الوحى: ٣، ٤٩٢٢ ، ٤٩٢٣ ، ٤٩٢٥ ، ٤٩٥٣ ، ٣٢٣٨ ، ٦٢١٤. مسلم. إيمان: ٤٠٤. ترمذي. تفسير: ٧٠ ، ٣٣٢٥.

فَدَثِّرُونِي فَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ). رواه مسلم[٣].

یەحیا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پرسیم لە ئەبو سەلەمە: کام سوورەتەی قوئان لە پێشدا هاتۆتە خوارەوە؟ گوتی: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ} گوتم: گوتم: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ} یاخود (اقرأ)؟ گوتی: بۆخۆم پرسیم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا: کام سوورەتە لە پێشدا هاتووە؟ گوتی: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ} گوتم: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ} یاخود (إِقْرأ) جابیر گوتی: من پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چی فەرمووە بە ئێمە من ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە، فەرمووی: ماوەی مانگێ لە ئەشکەوتی حیرادا خەڵوەم دەکێشاو خوا پەرستیم دەکرد، کە خەڵوەکەمم تەواو کرد لە چیاکە دابەزیم، تا گەیشتمە ناو شیوەکە، ئەوەندەم زانی یەکێ بانگم دەکا، منیش سەیری ئەم لاو لاو بەردەمو پشتو ڕاستو چەپی خۆمم کرد کەچی کەسم نەدی، دیسان یەکێ بانگی لێ کردمەوە، کە تەماشام کردەوە دیسان کەسم نەدی، هەمدیسانەوە یەکێ بانگی لێ کردمەوە، ئەمجارە کە سەرم بەرز کردەوە تەماشام کرد وا جوبرائیل لەسەر تەختێکە وا بە حەواوە! ئیتر لەرزێکی گران دایگرتمو بە دەم لەرزەوە چوومەوە بۆلای خەدیجەو گوتم: دام پۆشن، ئەوانیش دایان پۆشیمو هەندێ ئاویان پیادا کردم، ئینجا خودای گەورەو سەروەر ئەمەی ناردە خوارەوە: يا أيها المدثر. قم فانذر. وربك فكبر. ووثابك فطهر. (م/خودای لێ ڕازی بێ).

## ٩٩) تەمەنی پێغەمبەرو ماوەی پەیامەکەی (دروودی خودای لەسەر)

## عُمر النبي ﷺ ومُدة رسالته

٣١٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بُعِثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَرْبَعِينَ سَنَةً، فَمَكُثَ بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحَى إِلَيْهِ، ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ أي إِلَى الْمَدِينَةِ

---

[٣] بخاري. بدء الوحی: ٣. مسلم. إيمان: ٤٠٤.

فَهَاجَرَ إليها وَأَقَامُ بَهَا عَشْرَ سِنِينَ، وَمَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَـلاَثٍ وَسِـتِّينَ سَـنَةً. رواه الـشيخان والترمذي[1]:

ئیبنـو عـەبباس (خودایـان لێ رازی بێ) گـوتـی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) تەمەنی چل ساڵ بوو کە بوو بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جا لە مەککە سیازدە ساڵ مایەوە، لەو ماوەیەدا نیگا (وەحی)ی بۆ دەهات، ئەوجا خودا فەرمانی پێ کرد کە لەمەککەوە کۆچ‌و رەو بکا بۆ مەدینە، ئیتر کۆچی کرد بۆ ئەوێ‌و لەوێش دە ساڵ مایەوە، کە مردیش تەمەنی شەست‌و سێ ساڵ بوو (ش/ت).

٣١٥١- وَعَنْهُ قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ ابْنُ خَمْـسٍ وَسِـتِّينَ سَنَةً. رواه مسلم والترمذي[2]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە وەفاتی کردوو ئەمری هەقی بەجێ هێنا بە ساڵی لە دایك بوونیەوەو بە ساڵی مردنیەوە تەمەنی دەیدا لە شەست‌و پێنج ساڵ (م/ت).

٣١٥٢- وَقَالَ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ وَأَبُو بَكْرٍ وَهُوَ ابْنُ ثَـلاَثٍ وَسِـتِّينَ وَعُمَـرُ وَهُـوَ ابْـنُ ثَـلاَثٍ وَسِـتِّينَ. رواه مسلم[3]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گـوتـی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) کە خودا بردیەوە بۆلای خۆی تەمەنی شەست‌و سێ ساڵ بوو، ئەبو بەکریش هەر شەست‌و سێ ساڵ ژیا، عومەریش هەر شەست‌و سێ ساڵ تەمەنی بوو (م).

٣١٥٣- وَقَالَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) تُوُفِّيَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُـوَ ابْـنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ سَنَةً[4]:

---

[1] بخاري. مناقب: ٣٥٤٧ ، ٣٥٤٨ ، ٥٩٠٠. تجريد/٤ ل – ١٠٢ ژ: ١٤١٥. مسلم. فضائل: ٦٠٤٢.

[2] مسلم. فضائل: ٦٠٤٤. ترمذي. مناقب: ٣٦٥٠ ، ٣٦٥١.

[3] مسلم. فضائل: ٦٠٤٥. بخاري. مناقب: ٣٥٣٦ ، ٤٤٦٦.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: تەمەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە وەفاتی کرد شەستو سێ ساڵ بوو (م/ت).

٣١٥٤- وَقَالَ جَرِيرٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): كُنَّا قُعُودًا عِنْدَ مُعَاوِيَةَ، فَذَكَرُوا سِنِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ سَنَةً وَمَاتَ أَبُو بَكْرٍ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ وَقُتِلَ عُمَرُ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ وَأَنَا ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّين. رواهما مسلم والترمذي[٥]:

جەریر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە لای موعاوییە دانیشتبووین باسی تەمەنی پێغەمبەریان دەکرد (دروودی خودای لەسەربێ) موعاوییە گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە خودا بردیەوە بۆ لای خۆی تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو، ئەبو بەرکیش کە مرد هەر تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو، عومەریش کە کوژرا هەر تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو، منیش ئێستا تەمەنم شەستو سێیە (م/ت).

## ١٠٠) بەشی شەشەم: باسی ئیسرا واتە: شەوڕەوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر)

## الفصل السادس: في الاسراء

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ – ١/١٧}.

خودای مەزن دەفەرموێ: پاکیو بێ نەنگیو بێ عەیبی بۆ ئەو خودایەیە کە شەو ڕەوی کرد بە بەندە خۆشەویستەکەی خۆی لە مەسجیدول حەرامەوە کەوا لە شاری مەککە بردیو شەو ڕەوی پێ کرد تا مەسجیدول ئەقصا کەوا لە شاری قودس ئەو مزگەوتەی کە دەورو بەرەکەیمان پیرۆز کردووە، بۆ ئەوە بردمان کە هەنێ لە نیشانەو ئایەتەکانی خۆمانی نیشان

---

[٤] مسلم. فضائل: ٦٠٤٥.

[٥] مسلم. فضائل: ٦٠٥١ ، ٦٠٥٢. ترمذي. مناقب: ٣٦٥٠.

بدەین، چونکی بە ڕاستی خودای گەورە هەموو داواو پاڕانەوەیێ دەژنەوێو چاوی لە هەموو شتێکە!

٣١٥٥- عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا عِنْدَ الْبَيْتِ بَيْنَ النَّائِمِ وَالْيَقْظَانِ (وَذَكَرَ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ) فَأُتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ مُلِئَ حِكْمَةً وَإِيمَانًا، فَشُقَّ مِنَ النَّحْرِ إِلَى مَرَاقِّ الْبَطْنِ، ثُمَّ غُسِلَ الْبَطْنُ بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ مُلِئَ حِكْمَةً وَإِيمَانًا، وَأُتِيتُ بِدَابَّةٍ أَبْيَضَ دُونَ الْبَغْلِ وَفَوْقَ الْحِمَارِ الْبُرَاقُ، فَانْطَلَقْتُ مَعَ جِبْرِيلَ حَتَّى أَتَيْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا قِيلَ مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ مَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ، وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْتُ عَلَى آدَمَ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ مِنِ ابْنٍ وَنَبِيٍّ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَلَمَّا عَلَوْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَإِذَا رَجُلٌ عَنْ يَمِينِهِ أَسْوِدَةٌ وَعَنْ يَسَارِهِ أَسْوِدَةٌ، فَإِذَا نَظَرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضَحِكَ وَإِذَا نَظَرَ قِبَلَ شِمَالِهِ بَكَى فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالاِبْنِ الصَّالِحِ قُلْتُ: مَنْ هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَا آدَمُ، وَهَذِهِ الأَسْوِدَةُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ نَسَمُ بَنِيهِ فَأَهْلُ الْيَمِينِ أَهْلُ الْجَنَّةِ وَالأَسْوِدَةُ الَّتِي عَنْ شِمَالِهِ أَهْلُ النَّارِ فَإِذَا نَظَرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضَحِكَ وَإِذَا نَظَرَ قِبَلَ شِمَالِهِ بَكَى فَأَتَيْنَا السَّمَاءَ الثَّانِيَةَ، قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ مَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ: نَعَمْ. قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ، وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْتُ عَلَى عِيسَى وَيَحْيَى فَقَالاَ مَرْحَبًا بِكَ مِنْ أَخٍ وَنَبِيٍّ. فَأَتَيْنَا السَّمَاءَ الثَّالِثَةَ، قِيلَ مَنْ هَذَا قِيلَ جِبْرِيلُ. قِيلَ مَنْ مَعَكَ قِيلَ مُحَمَّدٌ. قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْتُ يُوسُفَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، قَالَ: مَرْحَبًا بِكَ مِنْ أَخٍ وَنَبِيٍّ فَأَتَيْنَا السَّمَاءَ الرَّابِعَةَ، قِيلَ مَنْ هَذَا؟ قِيلَ جِبْرِيلُ. قِيلَ مَنْ مَعَكَ؟ قِيلَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قِيلَ نَعَمْ. قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ، وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْتُ عَلَى إِدْرِيسَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَرْحَبًا مِنْ أَخٍ وَنَبِيٍّ. فَأَتَيْنَا السَّمَاءَ الْخَامِسَةَ، قِيلَ مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ؟ قِيلَ مُحَمَّدٌ. قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ، وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْنَا عَلَى هَارُونَ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ مِنْ أَخٍ وَنَبِيٍّ. فَأَتَيْنَا عَلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، قِيلَ مَنْ هَذَا؟ قِيلَ جِبْرِيلُ. قِيلَ مَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قِيلَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَبًا بِهِ، وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْتُ عَلَى مُوسَى، فَسَلَّمْتُ { عَلَيْهِ } فَقَالَ: مَرْحَبًا

بِكَ مِنْ أَخٍ وَنَبِيٍّ. فَلَمَّا جَاوَزْتُ بَكَى. فَقِيلَ مَا أَبْكَاكَ؟ قَالَ: يَا رَبِّ، هَذَا الْغُلاَمُ الَّذِي بُعِثَ بَعْدِي يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ أَفْضَلُ مِمَّا يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِي. فَأَتَيْنَا السَّمَاءَ السَّابِعَةَ، قِيلَ مَنْ هَذَا؟ قِيلَ جِبْرِيلُ. قِيلَ مَنْ مَعَكَ؟ قِيلَ مُحَمَّدٌ. قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قَيْلَ: نَعَمْ. قِيلَ: مَرْحَبًا بِهِ، وَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَأَتَيْتُ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ مِنِ ابْنٍ وَنَبِيٍّ، فَرُفِعَ لِيَ الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ، فَسَأَلْتُ جِبْرِيلَ فَقَالَ: هَذَا الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ يُصَلِّي فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، إِذَا خَرَجُوا لَمْ يَعُودُوا إِلَيْهِ آخِرَ مَا عَلَيْهِمْ، وَرُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَإِذَا نَبِقُهَا كَأَنَّهُ قِلاَلُ هَجَرٍ، وَوَرَقُهَا كَأَنَّهُ آذَانُ الْفُيُولِ، فِي أَصْلِهَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ نَهْرَانِ بَاطِنَانِ وَنَهْرَانِ ظَاهِرَانِ، فَسَأَلْتُ جِبْرِيلَ فَقَالَ: أَمَّا الْبَاطِنَانِ فَفِي الْجَنَّةِ، وَأَمَّا الظَّاهِرَانِ النِّيلُ وَالْفُرَاتُ، (النيل بأرض مِصْرَ والفرات بأرض العراق). وَفِي رِوَايَةٍ : ثُمَّ عُرِج بي حتَّى ظهرت لِمُسْتَوىً أسمع فيه صريف الأقـلام، ثُـمَّ فُرِضَـتْ عَلَـيَّ خَمْسُونَ صَلاَةً، فَأَقْبَلْتُ حَتَّى جِئْتُ مُوسَى، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ فُرِضَتْ عَلَيَّ خَمْسُونَ صَلاَةً. قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ بِالنَّاسِ مِنْكَ، عَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ، وَإِنَّ أُمَّتَكَ لاَ تُطِيقُ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَسَلْهُ. فَرَجَعْتُ فَسَأَلْتُهُ، فَجَعَلَهَا أَرْبَعِينَ، ثُمَّ مِثْلَهُ ثُمَّ ثَلاَثِينَ، ثُمَّ مِثْلَهُ فَجَعَلَ عِشْرِينَ، ثُمَّ مِثْلَهُ فَجَعَلَ عَشْرًا، فَأَتَيْتُ مُوسَى فَقَالَ: مِثْلَهُ، فَجَعَلَهَا خَمْسًا، فَأَتَيْتُ مُوسَى فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ جَعَلَهَا خَمْسًا، فَقَالَ: مِثْلَهُ، قُلْتُ سَلَّمْتُ بِخَيْرٍ، فَنُودِيَ إِنِّي قَدْ أَمْضَيْتُ فَرِيضَتِي وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي، وَأَجْزِي الْحَسَنَةَ عَشْرًا. رواه البخاري في بدءِ الخلق ومسلم في الإيمان وعبارته: فَلَمْ أَزَلْ أَرْجِعُ بَيْنَ رَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَبَيْنَ مُوسَى - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - حَتَّى قَالَ: يَا مُحَمَّد إِنَّهُنَّ خَمْس صَلَواتٍ كلَّ يومٍ وليلةٍ لكـلّ صـلاة عشرٌ فذلك خمسون صلاةً[1]:

**مالیکی کوڕی صەعصەعە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: لەکن بەیت لە نێوانی دوو پیاودا راکشابووم کە حەمزەی مامیو جەعفەری ئامۆزای بوو، فەرمووی: لە بەینی خەوتوو بێدار دا بووم، لەو کاتەدا تەشتێکی زێڕینیان هێنا پڕبوو لە دانایی (حیکمەت)و باوەڕ**

[1] مسلم. إيمان: ٤٠٩.

(ئیمان) ئینجا جوبرائیلو میکائیلو ئیسرافیل لە دانەی سەرسینگمەوە لەتیان کرد هەتا بەرمووسڵدانم، وە ناوسکمیان بە ئاوی زەمزەم شۆردەوەو ئینجا پڕیان کرد لە حیکمەتو ئیمان، جاوولاخێکی سپییان هێنا بۆم، لە هێستر بچووکترو لە گوێدرێژ گەورە تر بوو ناوی بۆراق بوو چەندێ چاوی بڕی دەکرد دەیکرد بە یەك هەنگاو سواری ئەو ولاخە بوومو لەگەڵ جوبرائیلدا رۆیشتم هەتا گەیشتینە ئاسمانی یەکەم گوترا: ئەوە کێیە؟ جوبرائیل فەرمووی: جوبرەئیل گوتیان: کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: موحەممەد گوتیان نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێر بێو هاتنەکەی خێری پێوە بێ، جا دەرگا کرایەوەو رۆیشتینە ژوورەوە چوومە لای باوە ئادەمو سڵاوو رۆژباشیم لێ کردو وەڵامی سڵاوەکەی دامەوەو فەرمووی: خۆش هاتی، ئەی کوڕی شیرینم! مەرحەبات لێ بێ ئەی پێغەمبەری چاك! لە گێڕانەوەیەکا: کاتێ سەرکەوتینە سەر ئاسمانی یەکەم تەماشام کرد وا پیاوێکی لێیە، لە راستو لە چەپیەوە پۆل پۆل تارمایی عەشامات دیارن، پیاوەکە کە سەیری لای راستی خۆی دەکرد پێ دەکەنی، بەڵام کە سەیری لای چەپی خۆی دەکرد دەگریا، فەرمووی بەمن: مەرحەبا لە پێغەبەری باشو لە کوڕی باش گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمە کێیە؟ فەرمووی: ئەمە ئادەمەو ئەو تارماییو عەشاماتەیش کەوان لە راستو لە چەپیەوە گیانکەلو رەوانکەل (ئەرواح)ی وە چەکەیەتی، ئەوانەیان کەوان لە لای راستیەوە ئەوانە بە هەشتین وەڵێ ئەوانەیان کەوان لەلای چەپییەوە ئەوانە دۆزەخین، جا بۆیە کە تەماشای لای راستی دەکا پێ دەکەنێو کە تەماشای لای چەپی دەکا دەگرییێ، ئینجا چووین بۆ ئاسمانی دووەم، گوتیان: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیلە، گوتیان: کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا کە تەشریف بێنێ بۆ میعراجو بۆ گەشتکردن بەناو ئاسمانەکاندا؟ فەرمووی: بەڵێ، وتیان: بەخێربێو دەرگایان کردەوە، جا لەوێ چوومە لای عیساو یەحیا کە پوورزای یەکترین سڵاوم لێ کردنو وەڵامی سڵاوەکەیان دامەوەو فەرموویان: مەرحەبا لە برای چاكو لە پێغەمبەری چاك

ئەوجا رۆیشتین بۆ ئاسمانی سێیەم، گوترا: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوترا: کێت لەگەڵدایە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە دوایە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێر بێ، لەوێ رۆیشتم بۆ لای یوسفو سڵاوم لێ کرد، فەرمووی: مەرحەبا لە پێغەمبەری چاکو برای چاك، پاش ئەمە چووین بۆ ئاسمانی چوارەم کە گەیشتینە ئەوێ جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد گوتیان: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوتیان: کێت لەگەڵە؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێربێ، لەوێ چووم بۆلای ئیدریسو رۆژباشیم لێ کرد، ئەویش فەرمووی: مەرحەبا لە برای چاكو لە پێغەمبەری چاك. ئینجا چووین بۆ ئاسمانی پێنجەم، گوتیان: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوتیان: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێربێ، لەوێ چووین بۆ لای هاروونو سڵاوم لێ کردو فەرمووی: مەرحەبا لە برای خاسو لە پێغەمبەری خاس. ئینجا چووین بۆ ئاسمانی شەشەم گوتیان: کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوتیان: کێت وا لەگەڵا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێربێ لەوێ چوومە کن مووساو سڵاوم لێ کرد، فەرمووی: مەرحەبا لە برای چاكو پێغەمبەری چاك کاتێ لە مووسا تێ پەڕبووم دەستی کرد بە گریان، گوترا: بۆ دەگریت؟ فەرمووی: ئەی خودایە! ئەم زەلامە کە لە پاش منیشەوە رەوانە کراوەو کراوە بە پێغەمبەر لە ئۆمەتی ئەو زیاتر دەچنە بەهەشت هەتا لە ئۆمەتی من، ئینجا چووین بۆ ئاسمانی حەوتەم، گوترا: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیل، گوتیان: کێت وا لەگەڵدا؟ فەرمووی: موحەممەد، گوتیان: نێردراوە بە شوێنیا؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: بەخێربێ. لەوێ چوومە لای ئیبراهیمو سڵاوم لێ کرد، فەرمووی: مەرحەبا لە کوڕی باشمو لە پێغەمبەری باش" ئینجا بەیتولمەعموور (خانەی ئاوەدان)یان نیشان دام، کە لە جوبرائیلم پرسی، فەرمووی: ئەمە بەیتولمەعموورە کە لە قورئاندا لە سەرەتای سوورەتی طوورەوە خودا سوێندی پێ دەخواو

دەفەرموێ – والبیت المعمور) هەموو رۆژێ حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تیا دەکەن، کە لێی چوونە دەرەوە ئیتر جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆی، وە دێنی ئەم ماڵە دوا ئەرکی سەر شانیانە! پاش ئەمە سیدرەتول مونتەها (دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ)م بە باشی بۆ دەرکەوت، کە تەماشام کرد دەنکە مۆردەکانی (واتە: بەرەکەی) ئەوەندەی کووپەڵەی دیێ هەجەر گەورەبوو، وە گەڵاکەی وەکوو گوێچکەی فیل وابوو، وە چوار رووبار لە بنیەوە هەڵ دەقوڵان، دوانیان دەچوونەوە بە ناوداو دەر نە دەکەوتن، وە دوانیان بە دەرەوە بوون، پرسیارم کرد لە جوبرائیل: ئەمانە چین؟ فەرمووی: ئەو دوو جۆگە دەڕۆنە ناوەوە ئەوە دوو جۆگەن وان لە بەهەشتا، وە ئەم دوو جۆگە وان بە دەرەوە دوو جۆگەی نیلو فوراتن (نیل لە خاکی میسرەو فورات لە خاکی عێراقە) لە گێڕانەوەیەکا: ئینجا بەرز کرامەوە بۆ شوێنێ کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانو سیدرەتولمونتەهاشەوە بوو گوێم لە جیڕەی قەڵەمەکان بوو کە چارەنووسی هەموو شتێکیان دەنووسی لە لەوحول مەحفوظ، لەکن کورسی، لە نزیك تەختو بارەگای خودای میهرەبانەوە ئینجا لەلایەنی خوداوە پەنجا نوێژی لەسەر دانرا لە هەموو شەوو رۆژێکا جا گەڕامەوە هەتا چوومەوە لای مووسای کوڕی عیمران، فەرمووی: چیت کرد؟ گوتم: پەنجا نوێژم لەسەر فەرزکراوە، فەرمووی: من لەتۆ باشتر شارەزاییم هەیە لە رەفتاری ئەو خەڵکە، چونکە من لە پێش تۆدا زۆر بە زەحمەت خەریکی بەنی ئیسرائیل بوومو بەراوردم کردوون، جا بۆیە دەزانم کە ئۆمەتی تۆ تەوانایی ئەوەیان نییە، کەواتە بگەڕێرەوە بۆ لای خودا داوای لێ بکە کە ئەم نوێژانە لەسەر ئۆمەتت سووك بکا، منیش گەڕامەوەو داوای ئەوەم لێ کردو ئەویش کردنی بە چل نوێژ، جا گەڕامەوە بۆ لای مووساو دووبارە وەك جاری پێشووی فەرموو: ئینجا خودا کردنی بە سیی نوێژ، ئینجا گەڕامەوە بۆ لای مووساو سێبارە وەك جاری پێشووی فەرموو، ئینجا خودا کردنی بە بیست نوێژ، دیسان گەڕامەوە بۆ لای مووساو چوار بارە وەك جاری پێشووی فەرموو، ئینجا خودا کردنی بە دە نوێژ، دیسانەوە گەڕامەوە بۆلای مووساو هەم دیسان وەك جاری

پێشووی فەرموو، ئینجا خودا کردنی بە پێنج نوێژ، دیسان کە چوومەوە بۆ لای مووسا فەرمووی: ها چیت کرد؟ گوتم: کردنی بە پێنج نوێژ، دیسان مووسا وەکوو جاری پێشووی فەرموو، بەڵام من گوتم: ئەم خێرەم قوبووڵەو کاری خۆم دایە دەست خوداو ئیتر شەرم دەکەم بڕۆمەوەو داوای سووککردنی لێ بەکەم جا کاتێ لەوێ دەرچووم بانگم لێ کرا: وا فەرزی خۆمم بڕیارداوە باری بەندەکانی خۆمم سووک کرد، وەیەك بە دەش پاداشی هەموو چاکەیێ دەدەمەوە (ب/م) عیبارەتی (م) ئاوایە: ئیتر هەر دەهاتمو دەچووم لە نێوانی خودای گەورەو لە نێوانی مووسادا (درودی خودای لەسەربێ) هەتا خودا فەرمووی: ئەی موحەممەد! خۆیان پێنج نوێژن – لە هەموو شەوو ڕۆژێکا – بەڵام هەر نوێژەی خێری دە نوێژی هەیە، جا کەوابوو دەکاتە پەنجا نوێژ ← (ب – ١ ز – ٤٣ ژمارە/ ٣٢٢/١).

٣١٥٦– عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمَّا كَذَّبَتْنِي قُرَيْشٌ حِينَ أُسْرِىَ بِي إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ قُمْتُ فِي الْحِجْرِ فَجَلَّى اللَّهُ لِي بَيْتَ الْمَقْدِسِ فَطَفِقْتُ أُخْبِرُهُمْ عَنْ آيَاتِهِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ[٢]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کە قوڕەیش بۆ مەسەلەی ئیسراء (شەورەوی) باوەڕیان پێ نەکردم، لە حیجری ئیسماعیلدا ڕاوەستام، جا خودا بەیتولمەقدیس (خانەی پیرۆز)ی بە تەواویو بەبێ پەردە هێنایە بەچاوم ئیتر نیشانە بە نیشانەیو شوێن بە شوێنی بە چاوی خۆم تەماشام دەکردو باسو وەصفیم دەکرد بۆیان (م+–ب).

٣١٥٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي الْحِجْرِ وَقُرَيْشٌ تَسْأَلُنِي عَنْ مَسْرَاىَ فَسَأَلَتْنِي عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ لَمْ أُثْبِتْهَا. فَكُرِبْتُ كُرْبَةً مَا كُرِبْتُ مِثْلَهُ قَطُّ فَرَفَعَهُ اللَّهُ لِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ مَا يَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَنْبَأْتُهُمْ بِهِ وَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي جَمَاعَةٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَإِذَا مُوسَى قَائِمٌ يُصَلِّى فَإِذَا رَجُلٌ ضَرْبٌ جَعْدٌ كَأَنَّهُ

---

[٢] مسلم. إيمان: ٤٢٧. تجريد/٤ ل/٢٠٢ رقم: ١٥١٢=٣٨٨٦، ٤٧١٠ فتح. ترمذي. تفسير: ٣٨٨١

مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ وَإِذَا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – قَائِمٌ يُصَلِّي أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ وَإِذَا إِبْرَاهِيمُ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – قَائِمٌ يُصَلِّي أَشْبَهُ النَّاسِ بِهِ صَاحِبُكُمْ – يَعْنِي نَفْسَهُ – فَحَانَتِ الصَّلاَةُ فَأَمَمْتُهُمْ فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنَ الصَّلاَةِ قَالَ: قَائِلٌ يَا مُحَمَّدُ هَذَا مَالِكٌ صَاحِبُ النَّارِ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ. فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ فَبَدَأَنِي بِالسَّلاَمِ. رواهما مسلم في كتاب الإيمان (وروى البخاري الأول منهما في باب حديث الإسراءِ قبيل باب المعراج – المترجم)[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە حیجری ئیسماعیل بووم لە پەنا کابەدا، قورەیش هەندێ پرسیاریان لێ کردم لە بارەی شەورەوی کردنی منەوە لە مەککەوە بۆ شاری قودس، جا بازێ شتیان لێ پرسیم، رەوانم نەبوون، ئیتر زۆر زۆر خەمو خەفەتو پەژارە دایگرتم، هەرگیزاو هەرگیز خەمو پەژارەی وا داینەگرتووم، جا خودای گەورە بەیتولمەقدیسی بۆ دەرخستم، بە چاوی خۆم بەبێ پەردە تەماشاییم دەکردو هەرچی شتێکیان لێ دەپرسیم لە بارەیەوە بە جوانی وەلامم دەدانەوە وەك باسی دەرگاکانیو نیشانەکانی، هەتا ناچار گوتیان: ناونیشانەکانی راستە. لەوێ لە بەیتول مەقدیس تەماشام کرد وا وام لەناو کۆمەڵێ لە پێغەمبەرەکاندا، کە سەرنجم دا وا مووسا لەوێیە نوێژ دەکا بە راوەستانەوە، مووسا پیاوێکی موو تەنکی موو کرژە، دەڵێی لە پیاوانی هۆزی شەنووئەیە، عیسای کوری مەریەمم دی (دروودی خودای لەسەربێ) ئەویش لەوێ بوو، راوەستابوو نوێژی دەکرد زیاتر لە هەموو کەسێ شێوەی لە عورەی کوری مەسعوودی ئەل–سەقەفی دەچێ، ئیبراهیمیشم دی، ئەویش لەوێ بوو (دروودی خودای لەسەربێ) راوەستابوو نوێژی دەکرد، زیاتر لە هەموو کەسێ شێوەی لە هاورێکەتان دەچێ واتە: شێوەی لە پێغەمبەر خۆی دەکا (دروودی خودای لەسەربێ)

[٣] مسلم. ایمان: ٤٢٩.

کاتێ کە نوێژ بوو من بەرنوێژیم بۆ کردن جا کە لە نوێژەکە بوومەوە یەکێ گوتی: ئەی موحەممەد! ئەمە مالیکە، کە کلیل بە دەستی دۆزەخە سلاوی لێ بکە، کە ئاوڕم لێ دایەوە ئەو لە پێشدا سلاوی لەمن کرد! (م).

## ١٠١) بەشی حەوتەم: باسی کۆچکردن (رەوکردن: هیجرەت)
## الفصل السابع: في الهجرة

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّـذِينَ كَفَـرُواْ لِيُثْبِتُـوكَ أَوْ يَقْتُلُـوكَ أَوْ يُخْرِجُـوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ – ٨/ ٣٠}.

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بیری ئەوە بکەرەوە کە بێ بڕواکان کەوتبوونە پیلان و فڕوفێڵ لە تۆ، بۆ ئەوەی کە حەپست بکەن لە شوێنێکا هەتا دەمری، یا بتکوژن، یا لە ولاتی مەککە دەرت بکەن و بە وردی خەریکی ئەم فڕوفێڵە بوون، بەلام فێڵ و فڕی خودا بڕسی فێڵ و فڕی ئەوان و هەموو کەسێکی تریش دەبڕێ و کەس ناتوانێ فێڵ لە خودا بکا.

{وَقَالَ تَعَالَى – إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ – صدق الله العظيم – ٩ /٤٠}.

ئەگەر ئێوە یارمەتی موحەممەد نەدەن و نەچن بۆ غەزای تەبووك و غەزا نەکەن لە رێگەی خوادا بزانن کە خودا هەمیشە یارمەتی دەدا، وەکوو چۆن لەمەو پێش لەو کاتەدا کە کافرو بێ بڕواکانی قورەیش لە شاری مەککە دەریان کرد ئەو یارمەتی دا ئاوا هەموو کاتێ یارمەتی دەدا، لەوکاتە ناسکەدا کە تەنیا دوو کەس بوون خۆی و هاوڕێکەی بوون، نە سوپای کۆچکەران و نە لەشکری یاریدە دەرانی وەك ئێستا لەگەلدا نە بوون، لەو کاتەدا کە دوو بە دوو لەناو ئەشکەوتەکەی کێوی ثەوردا بوون، کە ئەو دوژمنانەی شوێنیان کەوتبوون تا بیانکوژن گەیشتنە بەردەگای ئەشکەوتەکە، ئەبو بەکر قاچیانی

دی، ئەویش پێی فەرموو: هاوڕێ! دڵگران مەبەو خەفەت مەخۆ، بێگومان خودا وا لەگەڵمانا، خۆی لە زیانی ئەم دوژمنانە دەمانپارێزێ، جا خودای گەورە ئارامی دڵی ناردە خوارەوە بۆ سەر دڵی وە خودا بە سوپاو لەشکرێ پشتیوانی ئەوی کرد کە ئێوە بە چاوی خۆتان نەتان بینیبوون، جا خودا کارێکی وای کرد داواو داخوازی دەستەی کوفر ژێر کەوتو قسەیان سەری نەگرتو لە سایەی خوداوە دینو فەرموودەو فەرمایشتی خودا سەرکەوت.

٣١٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: لَمْ أَعْقِلْ أَبَوَيَّ قطٌّ إِلاَّ وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ الإِسْلاَمِيَّ وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ إِلاَّ يَأْتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَرَفَيِ النَّهَارِ بُكْرَةً وَعَشِيَّةً، فَلَمَّا ابْتُلِيَ الْمُسْلِمُونَ خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ مُهَاجِرًا نَحْوَ أَرْضِ الْحَبَشَةِ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَرْكَ الْغِمَادِ لَقِيَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ - وَهْوَ سَيِّدُ الْقَارَةِ - فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَبَا بَكْرٍ؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ أَخْرَجَنِي قَوْمِي فَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسِيحَ فِي الأَرْضِ فَأَعْبُدَ رَبِّي. قَالَ: ابْنُ الدَّغِنَةِ إِنَّ مِثْلَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ لاَ يَخْرُجُ وَلاَ يُخْرَجُ، فَإِنَّكَ تَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ، وَأَنَا لَكَ جَارٌ فَارْجِعْ فَاعْبُدْ رَبَّكَ بِبِلَدِكَ فَرَجَعَ وَارْتَحَلَ مَعَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ، فَطَافَ ابْنُ الدَّغِنَةِ فِي أَشْرَافِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، فَقَالَ: لَهُمْ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ لاَ يَخْرُجُ مِثْلُهُ، وَلاَ يُخْرَجُ، أَتُخْرِجُونَ رَجُلاً يُكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَيَصِلُ الرَّحِمَ، وَيَحْمِلُ الْكَلَّ، وَيَقْرِي الضَّيْفَ، وَيُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ. فَلَمْ تُكَذِّبْ قُرَيْشٌ بِجِوَارِ ابْنِ الدَّغِنَةِ وَقَالُوا لاِبْنِ الدَّغِنَةِ مُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيَعْبُدْ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، فَلْيُصَلِّ وَلْيَقْرَأْ مَا شَاءَ، وَلاَ يُؤْذِينَا بِذَلِكَ، وَلاَ يَسْتَعْلِنْ بِهِ، فَإِنَّا قَدْ خَشِينَا أَنْ يَفْتِنَ أَبْنَاءَنَا وَنِسَاءَنَا. قَالَ: ذَلِكَ ابْنُ الدَّغِنَةِ لأَبِي بَكْرٍ، فَطَفِقَ أَبُو بَكْرٍ يَعْبُدُ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، وَلاَ يَسْتَعْلِنُ بِالصَّلاَةِ وَلاَ الْقِرَاءَةِ فِي غَيْرِ دَارِهِ، ثُمَّ بَدَا لأَبِي بَكْرٍ فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ، وَكَانَ يُصَلِّي فِيهِ، وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَنْقَذِفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ الْمُشْرِكِينَ وَأَبْنَاؤُهُمْ وَهُمْ يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ وَيَعْجَبُونَ مِنْهُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَجُلاً بَكَّاءً لاَ يَمْلِكُ عَيْنَيْهِ إِذَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ أَشْرَافَ قُرَيْشٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَرْسَلُوا إِلَى ابْنِ الدَّغِنَةِ فَقَدِمَ عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا لَهُ إِنَّا كُنَّا أَجَرْنَا أَبَا بَكْرٍ بِجَوَارِكَ عَلَى أَنْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، فَقَدْ جَاوَزَ ذَلِكَ، فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ، وَأَعْلَنَ الصَّلاَةَ وَالْقِرَاءَةَ، فِيهِ قَإِنَا قَدْ خَشِينَا أَنْ يَفْتِنَ أَبْنَاءَنَا وَنِسَاءَنَا، فَانْهِهِ فَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْتَصِرَ عَلَى أَنْ يَعْبُدَ رَبَّهُ

فِي دَارِهِ فَعَلَ، وَإِنْ أَبَى إِلاَّ أَنْ يُعْلِنَ ذَلِكَ فَسَلْهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْكَ ذِمَّتَكَ، فَإِنَّا كَرِهْنَا أَنْ نُخْفِرَكَ، وَلَسْنَا مُقِرِّينَ لأَبِي بَكْرٍ الاِسْتِعْلاَنَ. قَالَتْ عَائِشَةُ فَأَتَى ابْنُ الدَّغِنَةِ أَبَا بَكْرٍ، فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتَ الَّذِي عَقَدْتُ لَكَ عَلَيْهِ، فَإِمَّا أَنْ تَقْتَصِرَ عَلَى ذَلِكَ وَإِمَّا أَنْ تَرُدَّ إِلَيَّ ذِمَّتِي، فَإِنِّي لاَ أُحِبُّ أَنْ تَسْمَعَ الْعَرَبُ أَنِّي أُخْفِرْتُ فِي رَجُلٍ عَقَدْتُ لَهُ. قَالَ: أَبُو بَكْرٍ إِنِّي أَرُدُّ إِلَيْكَ جِوَارَكَ، وَأَرْضَى بِجِوَارِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ والنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) للمسلمين: إِنِي أُرِيتُ دَارَ هِجْرَتِكُمْ، رَأَيْتُ سَبْخَةً ذَاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لاَبَتَيْنِ. وَهُمَا الْحَرَّتَانِ، فَهَاجَرَ مَنْ هَاجَرَ قِبَلَ الْمَدِينَةِ وَرَجَعَ عَامَّةُ مَنْ كَانَ هَاجَرَ بِأَرْضِ الحَبَشَةِ إِلَى الْمَدِينَةِ وَتَجهَّزَ أَبُو بَكر قَبْلَ المَدِينَةِ فَقَالَ: لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رِسْلِكَ فَإِنِّي أَرْجُو أَنْ يُؤْذَنَ لِي. قَالَ: أَبُو بَكْرٍ وَهَلْ تَرْجُو ذَلِكَ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي؟ قَالَ: « نَعَمْ ». فَحَبَسَ أَبُو بَكْرٍ نَفْسَهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيَصْحَبَهُ وَعَلَفَ رَاحِلَتَيْنِ كَانَتَا عِنْدَهُ وَرَقَ السَّمُرِ وَهُوَ الخَبَطُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە بیرەوەریی من باوكو دایكم بەم ئایینی ئیسلامە رەفتاریان كردووەو ئەوەتی من لە بیرمە ئەوان هەر موسوڵمان بوون هەموو رۆژێكیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەر لە بەیانیانو سەر لە ئێواران دەهات بۆ ماڵمان. كاتێ كە موسوڵمانان دوو چاری چەوسانەوەی دەستی بێ بڕواكانی هۆزی قورەیش بوونو لەتاو زوڵمو زۆر هەریەكە بەلایەكا پەردەوازە بوون، ئەبو بەكریش بەرەو خاكی حەبەشە سەری نایەوەو كۆچی كرد، دەڕوات تا دەگاتە بەر كولغەماد لەوێ تووشی ئیبنو دوغوننە دەبێ (كە سەرگەورەی هۆزی ئەلقارەبوو) پێی دەڵێ: ئەی ئەبو بەكر! بۆ كوێ دەچیت؟ دەڵێ: خزمەكانم دەریان پەڕاندوومو دەمەوێ بەوڵاتانا بگەڕێمو بەبێ پەروا بۆ خۆم خودای خۆم بپەرستمو بەندەیی بۆ بكەم ئیبنو دوغوننەیش دەڵێ: ئەی ئەبو بەكر! تۆو دەركردن! شتی وا نەبووەو نەئەبێ، پیاوەتیو مەردایەتی تۆ بێ وێنەیە، تۆ پیاوێكی خزم دۆستیتو داڵدەی

---

[1] بخاري. مناقب: ٣٩٠٥ ، ٢١٣٨ ، ٢٢٦٣ ، ٢٢٦٤ ، ٢٢٩٧ ، ٤٠٩٣ ، ٥٨٠٧ ، ٦٠٧٩ ، ٣٩٠٦ = تجريد/ ٤ ل — ٢١٨ رقم: ١٥١٧.

پیاوی هەژارو بێ نەوایتو خاوەن نانو دیوەخانیتو لەکاتی لێ قەومانا تۆ پشتو پەنایت، جا ئەوا من بۆت دەبم بە دالْدە، کەواتە بگەڕێرەوە لە وڵاتی خۆت خودای خۆت بپەرستە. جا ئەویش دەگەڕێتەوەو ئیبنو دوغوننەش لە گەڵیا دێ، وە ئێوارەیێ ئیبنو دوغوننە سووڕایەوە بەناو خانەدانەکانی قوڕەیش داو پێی گوتن: ئەبو بەکر پیاوی ئەوە نییە کە لە خۆیەوە بڕوا، یا ئێوە بە زۆر دەری بکەن، پیاوی واباشو جوانمەرد چۆن دەردەکرێ پیاوێکی نانبدەو بەخشندەو بێ وێنەیە، خزم دۆستەو پشتو پەنای زەبووناںو پیاوی ناشییو کۆڵییە، خاوەن قۆناخو دیوەخانەو لەکاتی سەختیو لێ قەومانا فریا ڕەسی پەنا بەرانە! ئیتر قوڕەیش قسەی ئیبنو دوغوننەیان نەشکانو دالْدەدانو پشت گرتنەکەی ئەویان قەبووڵ کردو پێیان گوت: بە ئەبو بەکر بڵێ: کە لە ماڵەکەی خۆی داخودای خۆی بپەرستێو نوێژی تیا بکاو چەندە ئارەزوو دەکا قورئانی تیا بخوێنێ، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئازاری ئێمەی پێ نەداو بە ئاشکرا نەیکا، چونکە مەترسی ئەوەمان هەیە کە ژنو منداڵو خێزانمان لە خشتە بەرێو لە ڕێ دەرکا! جا ئیبنو دوغوننەش ئەمەی بە ئەبو بەکر گوت، ئەبو بەکریش (بەم پێیەو لەسەر ئەم حاڵە) ماوەیێ مایەوەو لە ماڵەوە خودای خۆی دەپەرستو نوێژی دەکرد، بەڵام بەپێی مەرجەکە ئاشکرای نەدەکردو هەر لە ماڵەوەیش قورئانی دەخوێند. پاشان ئەبو بەکر بڕیاری داو لە بەردەم خانووەکەی دا مزگەوتێکی دروست کردو نوێژی تیا دەکردو قورئانی تیا دەخوێند، جا ژنانو کوڕانی بتپەرستەکانی لێ خڕ دەبوونەوەو تەماشای ئەبو بەرکیان دەکردو پێیان سەیر بوو! ئەبو بەکر پیاوێکی گرینۆكو خۆش گریان بوو کە قورئانی دەخوێند گریانی بۆ ڕاگیر نەدەکرا، جا خانەدانەکانی قوڕەیش – لە بتپەرستەکان – لەم حاڵە تۆقێنو ناردیان بە شوێنی ئیبنو دوغوننەدا، کە هات بۆ لایان پێیان گوت: ئێمە لەبەر خاتری تۆو بە دالْدەی تۆ پەنای ئەبو بەکرمان دا بەو مەرجە کە لە ماڵی خۆی دا بەبێ قرە خودای خۆی بپەستێ کەچی ئەو لەمە ڕەتی کردووەو ئەوەتانێ لە بەردەم ماڵەکەیدا مزگەوتی دروست کردووەو بە ئاشکرا نوێژی تیا دەکاو

قورئانی تیا دەخوێنێ، ئێمەش لەوە دەتریسین کە ژنانو خاوو خێزانمان لە رێ دەرکا، جا پێی بڵێ با وا نەکا، ئەگەر حەزدەکا با هەر لە ماڵی خۆیدا خودای خۆی بپەرستێ ئەوا با بیکاو کەس هەقی نییە بەسەریەوە، دەنا داوای لێ بکە کە لە پەنای تۆ دەرچێ چونکە حەزناکەین کە پەیمانی تۆ بشکێنین، وە قایلیش نابین کە ئەبو بەکر ئاوا ئاشکرای بکا! ئیبنو دوغوننە هات بۆ لای ئەبو بەکر، گوتی: خۆت دەزانیت کەمن لە سەرچی پەیمانم لەگەڵ تۆدا بەستووە، جا یا دەبێ هەر ئەوە بکەیت یا دەبێ پەیمانەکەمان پووچ بکەینەوەو من لە زامنیت دەردەچم، چونکە حەزناکەم کە عەرەبان ببیستنەوە کە من پەیمانم داوە بە پیاوێكو لە پاشا بێ پەیمان دەرچووم، ئەبو بەکریش گوتی: ئەوا منیش لە پەناو داڵدەی تۆ دەرچوومو رازیم بە پەنای خودای گەورەو سەروەر ئەو حەلەش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هێشتا لە مەککە بوو، فەرمووی: بە موسوڵمانان: هەواری کۆچتانم (لە خەودا) نیشان درا، شوێنی بوو باخە خورمای زۆر بوو، لە نێوانی دوو شوێنێ بەردەڵانی رەش دابوو واتە: دوو جێگەی بەردەڵان کە بەردی رەشیان زۆر بێ. ئیتر موسوڵمانان رووەو مەدینە کۆچیان کردو زوربەی ئەوانەی کە کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە گەڕانەوەو چوون بۆ مەدینە، ئەبو بەکریش بەرەو مەدینە تەدارەکی کردو تفاقی خست، بەڵام حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووی: هێواش کەو پەلەمەکە، چونکە من خۆشم بە هیوام کە خودا رێگەم بداتو کۆچ بکەم ئەبو بەکریش گوتی: باوكو دایکم لە دەورت گەڕێن، بۆچی تۆیش هیوای کۆچ کردنت هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ ئیتر ئەبو بەکر خۆی گلدایەوە بەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا لەرێ ببێ بە هاوڕێی وە دوو وشتری خۆی هەبوو، چوار مانگ ئالیکی گەڵای دار (سەموورە — السمر)ی دانێ، کە بە قەڵەنگ دەیوەرێننو دەیکەن بەگەڵ (ب). سەموورە = دارموغەیلان.

٣١٥٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا الْيَمَامَةُ أَوْ هَجَرٌ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ. رواهما البخاري[٢]:

**لە ئەبو مووساوە (خودای لێ رازی بێ) حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە خەوما دیم وا لەمەککەوە کۆچم کردووە بۆ ولاتێ کە دارە خورمای زۆری لێیە، زەینم بۆ ئەوەچوو کە دەبێ ئەو شوێنە یا یەمامە بێ، یاخود هەجەر بێ، کەچی خۆی نەبوو، ئەو شوێنە بە مەدینە دەرچوو، واتە: یەثریب (ب).**

٣١٦٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ يَوْمًا فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ قَالَ قَائِلٌ لأَبِي بَكْرٍ هَذَا رَسُولُ اللَّهِ مُتَقَنِّعًا، فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَأْتِينَا فِيهَا فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِدَاءٌ لَهُ أَبِي وَأُمِّي، وَاللَّهِ مَا جَاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَمْرٌ. قَالَتْ فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ فَدَخَلَ، فَقَالَ لأَبِي بَكْرٍ: – أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ – فَقَالَ: إِنَّمَا هُمْ أَهْلُكَ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَإِنِّي قَدْ أُذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصَّحَابَةُ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « نَعَمْ ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ فَخُذْ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِحْدَى رَاحِلَتَيَّ هَاتَيْنِ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « بِالثَّمَنِ ». قَالَتْ عَائِشَةُ فَجَهَّزْنَاهُمَا أَحَبَّ الْجِهَازِ، وَصَنَعْنَا لَهُمَا سُفْرَةً فِي جِرَابٍ، فَقَطَعَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ أُخْتِي قِطْعَةً مَنْ نِطَاقِهَا فَرَبَطَتْ بِهِ عَلَى فَمِ الْجِرَابِ، فَبِذَلِكَ سُمِّيَتْ ذَاتَ النِّطَاقِ – قَالَتْ – ثُمَّ لَحِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ بِغَارٍ فِي جَبَلِ ثَوْرٍ فَكَمَنَا فِيهِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، يَبِيتُ عِنْدَهُمَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ وَهْوَ غُلاَمٌ شَابٌّ ثَقِفٌ لَقِنٌ، فَيُدْلِجُ مِنْ عِنْدِهِمَا بِسَحَرٍ، فَيُصْبِحُ مَعَ قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ كَبَائِتٍ بِهَا، فَلاَ يَسْمَعُ أَمْرًا يُكْتَادَانِ بِهِ إِلاَّ وَعَاهُ، حَتَّى يَأْتِيَهُمَا بِخَبَرِ ذَلِكَ حِينَ يَخْتَلِطُ الظَّلاَمُ، وَيَرْعَى عَلَيْهِمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ مِنْحَةً مِنْ غَنَمٍ، فَيُرِيحُهَا عَلَيْهِمَا حِينَ يَذْهَبُ سَاعَةٌ مِنَ الْعِشَاءِ، فَيَبِيتَانِ فِي رِسْلٍ وَهْوَ لَبَنُ مِنْحَتِهِمَا وَرَضِيفِهِمَا، حَتَّى يَنْعِقَ بِهَا

---

[٢] بخاري. مناقب: ٣٨٩٦.

عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ بِغَلَسٍ، يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ تِلْكَ اللَّيَالِي الثَّلاَثِ، وَاسْتَأْجَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ رَجُلاً مِنْ بَنِي الدِّيلِ، وَهْوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ بْنِ عَدِيٍّ هَادِيًا خِرِّيتًا – وَالْخِرِّيتُ الْمَاهِرُ بِالْهِدَايَةِ – قَدْ غَمَسَ حِلْفًا فِي آلِ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ، وَهْوَ عَلَى دِينِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ فَأَمِنَاهُ، فَدَفَعَا إِلَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا، وَوَاعَدَاهُ غَارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثَلاَثِ لَيَالٍ فَأَتَاهُمَا بِرَاحِلَتَيْهِمَا صُبْحَ ثَلاَثٍ، وَانْطَلَقَ مَعَهُمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ وَالدَّلِيلُ فَأَخَذَ بِهِمْ طَرِيقَ السَّوَاحِلِ[٣]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەوا ڕۆژێ لە ماڵی ئەبو بەکر دانیشتبووین، قرچەی نیوەڕۆ بوو، لەوکاتەدا یەکێ بە ئەبو بەکری گوت: ئەوە پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) دەمو لووتی خۆی هەڵبەستووە، جارانی تر لەکاتی وادا نە دەهات بۆ ماڵمان، بۆیە ئەبو بەکر گوتی: باوكو دایکم بەقوربانی بێ، بە خودا دیارە ئیشی هەیە بۆیە لەم کاتەدا هاتووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گەیشتە جێو داوای ڕێگەدانی کرد کە بێتە ژوورەوەو ڕێگەی پێ دراو هاتە ژوورەوەو بە ئەبو بەکری فەرموو: کێت لەلایە با بچنە دەرەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ غەریبەمان تیا نییە هەرکەسو کارەکەی خۆمن، کە کەسو کاری خۆتن، فەرمووی: دەی من خودا ڕێگەی داوم کە دەربچمو کۆچ بکەم ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ، بمکە بە هاوڕێی خۆت لەم سەفەرە پیرۆزەدا، فەرمووی: بەڵێ باشە ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! یەکێ لەم دوو وشترەی من هەڵبگرە بۆ سواری ڕێگەت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باشە بەڵام بەکرێ عائیشە گوتی: جا تفاقێکی زۆر جوانمان بۆ ئامادە کردنو توێشوومان لە توێشە بەرەیەکا بۆیان کرد کە برێتی بوو لە مەڕێکی قاوورمە وە ئەسمای خوشکم پارچەیەکی لە پشتێنەکەی خۆی دادڕیو دەمی توێشە بەرەکەی پێ بەست جا لەمەوە ناونرا ذاتونیطاقەین واتە: خاوەنی دوو پشتێن گوتی: ئینجا ئێغەمبەرو ئەبو بەکر چوونە ناو

---

[٣] بخاري.فضائل الصحابة:٣٩٠٥ ، ٢١٣٨ ، ٢٢٦٣ ، ٢٢٦٤ ، ٢٢٩٧ ، ٤٠٩٣ ، ٥٨٠٧ ، ٦٠٧٩.تجريد:١٥١٧.

ئەشـكەوتێ لـە كێـوی ثـەور، وە سـێ شـەو لـەوێ خۆیـان حەشـار دەدەن، عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكر – كە جەهێڵێكی وشیاری وریا بوو – شەوی لە لایان دەكردەوە، بەڵام شەوەكی شەوی دەگرت بە دەمەوەو لەلای ئەوانەوە دەگەڕایەوە بۆمەككە، بەیانی لە قوڕەیش وابوو شەوی لە مەككە كردۆتەوە، جا عەبدوڵڵا هەرچی بەرگوێ دەكەوت لەو پیلانو فرو فێڵانەی كە بێ بڕواكانی مەككە دەیانكرد لە پێغەمبەرو ئەبو بەكر وەری دەگرتو كە تاریك دادەهات هەواڵی ئەوانەی بۆیان دەبردەوە. وە عامیری كوڕی فوهەیریش، كە نۆكەری ئەبو بەكر بوو، لە دەورو بەری ئەوان رانەكەی ئەبو بەكری دەلەوەڕاندو بە تاوێ لە پاش شێوان مێگەلەكەی لە دەرگای ئەشكەوتەكەدا مۆڵ دەدا، ئیتر شیری مەڕیان دەدۆشیو لە گلێنەیەكا بە بەردی داخی بەخۆر شلەتێنیان دەكرد، واتە: بەردە داخەكەیان دەخستە ناو جامە شیرەكەوە تا تۆزێ خاوییو لیقییەكەی نەمێنێ، وە هەموو شەوێ تێرو پڕیان لەو شیرە جوانە دەخواردەوە! وە سەر لەبەیان عامیر – بە تاریكو لێڵەكە – رانەكەی رادەداو پیڕكەی لێ دەكرد، هەر سێ شەوەكە عامیر ئەمە كاری بوو. پێغەمبەرو ئەبو بەكر" كابرایەكی بەنودیلییان بەكرێ گرتبوو، رێزانێكی بەدرەقەو شارەزا بوو، سوێند خۆرو هاوپەیمانی بنەماڵەی عاصی كوڕی وائیلی ئەـ سەهمی بوو وە لە ئامانی ئەوان دابوو، وەلێ لەسەر ئایینی بێ بڕواكانی قوڕەیش بوو، بەڵام پێغەمبەرو ئەبو بەكر بتمانەی پێ دەكەنو هەردوو وشترەكەی دەدەنێو بەڵێن دەدەن بەیەك كە لەپاش سێ شەو لە ئەشكەوتەكەی چیای ثەور یەك بگرنەوە، جا لەكاتی ناوبراودا لە بەیانی شەوی سێیەمدا هەردوو وشترەكەیان بۆ دەبات عامیری كوڕی فوهەیرەیش لەگەڵیان دەچێ، وە رێ زانەكە لە رێگەی پێ دەشتەوە دەیان بات نەك لە شاڕێوە، لەبەر شوێنە گومكێ (ب).

٣١٦١– قَالَ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمِ الْمُدَلْجِي: جَاءَنَا رُسُلُ كُفَّارِ قُرَيْشٍ يَجْعَلُونَ فِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ دِيَةَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا، لِمَنْ قَتَلَهُ أَوْ

أَسَرَهُ، فَبَيْنَمَا أَنَا جَالِسٌ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ قَوْمِي بَنِي مُدْلِجٍ إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ مِنْهُمْ حَتَّى قَامَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ جُلُوسٌ، فَقَالَ: يَا سُرَاقَةُ، إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ آنِفًا أَسْوِدَةً بِالسَّاحِلِ - أُرَاهَا مُحَمَّدًا وَأَصْحَابَهُ. قَالَ: سُرَاقَةُ فَعَرَفْتُ أَنَّهُمْ هُمْ، فَقُلْتُ لَهُ إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِهِمْ، وَلَكِنَّكَ رَأَيْتَ فُلاَنًا وَفُلاَنًا انْطَلَقُوا بِأَعْيُنِنَا. ثُمَّ لَبِثْتُ فِي الْمَجْلِسِ سَاعَةً، ثُمَّ قُمْتُ فَدَخَلْتُ فَأَمَرْتُ جَارِيَتِي أَنْ تَخْرُجَ بِفَرَسِي وَهْيَ مِنْ وَرَاءِ أَكَمَةٍ فَتَحْبِسَهَا عَلَيَّ، وَأَخَذْتُ رُمْحِي، فَخَرَجْتُ بِهِ مِنْ ظَهْرِ الْبَيْتِ، فَحَطَطْتُ بِزُجِّهِ الأَرْضَ، وَخَفَضْتُ عَالِيَهُ حَتَّى أَتَيْتُ فَرَسِي فَرَكِبْتُهَا، فَرَفَعْتُهَا تُقَرِّبُ بِي حَتَّى دَنَوْتُ مِنْهُمْ، فَعَثَرَتْ بِي فَرَسِي، فَخَرَرْتُ عَنْهَا فَأَخَذْتُ مِنْ كِنَانَتِي الأَزْلاَمَ، فَاسْتَقْسَمْتُ بِهَا أَضُرُّهُمْ أَمْ لاَ فَخَرَجَ الَّذِي أَكْرَهُ، فَرَكِبْتُ فَرَسِي، وَعَصَيْتُ الأَزْلاَمَ، تُقَرِّبُ بِي حَتَّى إِذَا سَمِعْتُ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهْوَ لاَ يَلْتَفِتُ، وَأَبُو بَكْرٍ يُكْثِرُ الاِلْتِفَاتَ سَاخَتْ يَدَا فَرَسِي فِي الأَرْضِ حَتَّى بَلَغَتَا الرُّكْبَتَيْنِ، فَخَرَرْتُ عَنْهَا ثُمَّ زَجَرْتُهَا فَنَهَضَتْ، فَلَمْ تَكَدْ تُخْرِجُ يَدَيْهَا، فَلَمَّا اسْتَوَتْ قَائِمَةً، إِذَا لأَثَرِ يَدَيْهَا غُبَارٌ سَاطِعٌ فِي السَّمَاءِ مِثْلُ الدُّخَانِ، فَاسْتَقْسَمْتُ بِالأَزْلاَمِ، فَخَرَجَ الَّذِي أَكْرَهُ، فَنَادَيْتُهُمْ بِالأَمَانِ فَوَقَفُوا، فَرَكِبْتُ فَرَسِي حَتَّى جِئْتُهُمْ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي حِينَ لَقِيتُ مَا لَقِيتُ مِنَ الْحَبْسِ عَنْهُمْ أَنْ سَيَظْهَرُ أَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ لَهُ إِنَّ قَوْمَكَ قَدْ جَعَلُوا فِيكَ الدِّيَةَ. وَأَخْبَرْتُهُمْ أَخْبَارَ مَا يُرِيدُ النَّاسُ بِهِمْ، وَعَرَضْتُ عَلَيْهِمِ الزَّادَ وَالْمَتَاعَ، فَلَمْ يَرْزَآنِي وَلَمْ يَسْأَلاَنِي إِلاَّ أَنْ قَالَ: أَخْفِ عَنَّا. فَسَأَلْتُهُ أَنْ يَكْتُبَ لِي كِتَابَ أَمْنٍ، فَأَمَرَ عَامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ، فَكَتَبَ فِي رُقْعَةٍ مِنْ أَدِيمٍ، ثُمَّ مَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). قَالَ: ابْنُ شِهَابٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقِيَ الزُّبَيْرَ فِي رَكْبٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا تِجَارًا قَافِلِينَ مِنَ الشَّأْمِ، فَكَسَا الزُّبَيْرُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبَا بَكْرٍ ثِيَابَ بَيَاضٍ، وَسَمِعَ الْمُسْلِمُونَ بِالْمَدِينَةِ مَخْرَجَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ مَكَّةَ، فَكَانُوا يَغْدُونَ كُلَّ غَدَاةٍ إِلَى الْحَرَّةِ فَيَنْتَظِرُونَهُ، حَتَّى يَرُدَّهُمْ حَرُّ الظَّهِيرَةِ، فَانْقَلَبُوا يَوْمًا بَعْدَ مَا أَطَالُوا انْتِظَارَهُمْ، فَلَمَّا أَوَوْا إِلَى بُيُوتِهِمْ، أَوْفَى رَجُلٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِهِمْ لأَمْرٍ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَبَصُرَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابِهِ مُبَيَّضِينَ يَزُولُ بِهِمُ السَّرَابُ، فَلَمْ يَمْلِكِ الْيَهُودِيُّ أَنْ قَالَ: بِأَعْلَى صَوْتِهِ يَا مَعَاشِرَ الْعَرَبِ هَذَا جَدُّكُمُ الَّذِي

تَنْتَظِرُونَه. فَثَارَ الْمُسْلِمُونَ إِلَى السِّلاَحِ، فَتَلَقَّوْا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِظَهْرِ الْحَرَّةِ، فَعَدَلَ بِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ حَتَّى نَزَلَ بِهِمْ فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَكَانَ ذَلِكَ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ مِنْ شَهْرِ رَبِيعٍ الأَوَّلِ، فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّاسِ، وَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَامِتًا، فَطَفِقَ مَنْ جَاءَ مِنَ الأَنْصَارِ مِمَّنْ لَمْ يَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَيِّي أَبَا بَكْرٍ، حَتَّى أَصَابَتِ الشَّمْسُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى ظَلَّلَ عَلَيْهِ بِرِدَائِهِ، فَعَرَفَ النَّاسُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ ذَلِكَ، فَلَبِثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً وَأُسِّسَ الْمَسْجِدُ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى، وَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ فَسَارَ يَمْشِي مَعَهُ النَّاسُ حَتَّى بَرَكَتْ عِنْدَ مَسْجِدِ الرَّسُولِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْمَدِينَةِ، وَهْوَ يُصَلِّي فِيهِ يَوْمَئِذٍ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَكَانَ مِرْبَدًا لِلتَّمْرِ لِسُهَيْلٍ وَسَهْلٍ غُلاَمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِ أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ – هَذَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ الْمَنْزِلُ – ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْغُلاَمَيْنِ، فَسَاوَمَهُمَا بِالْمِرْبَدِ لِيَتَّخِذَهُ مَسْجِدًا، فَقَالاَ لاَ بَلْ نَهَبُهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَبَى رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُمَا هِبَةً حَتَّى ابْتَاعَهُ مِنْهُمَا ثُمَّ بَنَاهُ مَسْجِدًا، وَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْقُلُ مَعَهُمُ اللَّبِنَ فِي بُنْيَانِهِ، وَيَقُولُ وَهُوَ يَنْقُلُ اللَّبِنَ:

هَذَا الْحِمَالُ لاَ حِمَالَ خَيْبَرْ

هَذَا أَبَرُّ رَبَّنَا وَأَطْهَرْ

وَيَقُولُ:

اللَّهُمَّ إِنَّ الأَجْرَ أَجْرُ الآخِرَهْ

فَارْحَمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ.

فَتَمَثَّلَ بِشِعْرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ لَمْ يُسَمَّ لِي. قَالَ: ابْنُ شِهَابٍ وَلَمْ يَبْلُغْنَا فِي الأَحَادِيثِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَمَثَّلَ بِبَيْتِ شِعْرٍ تَامٍّ غَيْرِ هَذِهِ الأَبْيَاتِ[٤]:

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوومی مودلیجی گوتی: ڕابەرو فروستادەکانی کافرەکانی قوڕەیش هاتن بۆ ناومان گوتیان: هەر کەسێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یا ئەبو بەکر بکوژێ، یا دیلیان بکا لە باتی هەر یەکێکیان خوێنبایی خۆیی خەڵات دەدەینێ، کە دەکاتە سەد وشتر، منیش لەناو کۆڕی هۆزی بەنی مودلیجدا دانیشتبووم – کە خزمانی خۆ من – لە پڕ پیاوێ دەرکەوت هات بەدیارمانەوە وەستا، ئێمەیش هەر بە دانیشتنەوە بووین، پیاوەکە گوتی: ئەی سوراقە! ئێستا لە پادەشتەکە ڕەشایی چەند زەلامێکم بە دی کرد، وا بزانم کە موحەممەدو هاوڕێکانی بوون سوراقە گوتی: خۆم زانیم کە ئەوانە خۆیان بوون بەڵام خۆم لێ هەڵەکردو گوتم: ئەوانە ئەوان نەبوون، بەڵام ئەوانەی کە تۆ دیوتن فیسارە کەسو فیسارەکەس بوون، کە تۆزێ لەمەبەر بە بەرچاوی خۆمانەوە دەرچوون، ئینجا تاوێ لە کۆڕەکەدا مامەوە، ئینجا هەڵسامو چوومەوەو بە کەنیزەکەکەمم گوت: مایینەکەمم بۆ ببە لە پشت ئەو یاڵەوە ڕای بگرە بۆم، ئینجا ڕمەکەمم هەڵگرتو لە پشتماڵەوە دەرچووم، نووکی ڕمەکەم دەخشاند لە زەوییو سەرەکەیم شۆڕکردەوە، تا کەس هەستی پێ نەکاو پێم نەزانن، ڕۆیشتم تا چوومە لای مایینەکەمو سواری بوومو تێم تەقان، بە چوارناڵە بردمی هەتا لێیان نزیک بوومەوە، جا مایینەکەم سەر سمێکی داو گلاندمی، جا هەڵسامەوەو دەستم برد لە تیردانەکەم دانە (ئەزلام)ە کەمم دەرهێناو دانەیەکم پێ گرتەوە تا بزانم زیانم دەبێ بۆیان یانا، جا دانەکە ئەوەی هێنا کە پێم ناخۆش بوو، بەڵام بە گوێی دانەم نەکردو سواری مایینەکەم بوومەوەو بە چوار ناڵە بردمی تاوا نزیک بوومەوە لێیان گوێم لە دەنگی پێغەمبەر بوو قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاووڕی نەدەدایەوە بەڵام ئەبو بەکر زۆر ئاووڕی دەدایەوە،

---

[٤] بخاري. فضائل: ٣٩٠٦ = تجريد/ ٤ ل/٢٢١.

جا دیسان ماینەکەم لەو زەویە ڕەقەنەدا هەردوو دەستی تا ئەژنۆکانی داچوونو هەمدیسانەوە لێی بەربوومەوە، لە پاشا تێم خوڕیو هەڵسایەوە زۆر بەگران دەستەکانی لە زەویەکە دەرهێنا! جا کاتێ کە هەڵسایەوە سەرپێ شوێنی هەردوو دەستی گەردێکی شەوقداری لێ هەڵسا بە ئاسمانا وەك دووکەڵ، هەمدیسان بەدانەکە دانەیەکی ترم گرتەوە، دووبارە ئەوە دەرچووەوە کە بە دڵم نەبوو، ئیتر بانگم کردنو ئەمانم پێ دان، ئەوجا وەستان، منیش سواری ماینەکەم بوومەوەو چووم بۆلایان، بەهۆی ئەوەوە کە بەسەرم هات بەهۆی ئەوانەوەو دەستم نەگەیشت پێیان هات بە دڵما: کە کاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەر دەگرێو حەزرەت سەردەکەوێ وە عەرزیم کرد: کە هۆزەکەت بڕیاریان داوە هەر کەسێ بە زیندوویی یا مردوویی تۆیان بدا بە دەستەوە خوێنبایی پیاوێ خەڵاتو مزگێنیی دەدەنێ! وە تێم گەیاندن کە ئەو خەڵکە چییان دەوێ لێیان وە توێشەو شتو متم پێشکەش کردن، بەڵام نەهیچیان لێ وەرگرتمو نە هیچیان لێ داوا کردم جگە لەوە کە فەرمووی: ئاشکرامان مەکە، منیش داوام لێ کرد کە نامەی ئەمانم بۆ بنووسێ، جا فەرمانی کرد بە عامیری کوڕی فوهەیرە لە پارچەیێ چەرما بۆینووسیم، ئینجا پێغەمبەر ڕۆیشت.

ئیبنو شەهاب گوتی: لە ڕێگە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەگا بە زوبەیر لەگەڵ کاروانێکا دەبێ لە موسوڵنان، کە بازرگان بوونو لەشام گەڕابوونەوە، زوربەیر سەرو دەست بەرگی سپی لەبەر پێغەمبەرو ئەبو بەکر دەکا، لەو لاشەوە موسوڵمانەکان، لە مەدینە، دەبیستنەوە کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەککە دەرچووە، جا هەموو بەیانیانێ دەهاتن بەپیریەوە بۆ بەردەڵانییەکە هەتا (ئەلحەرە) کە لەوێ چاوەڕوانیان دەکرد، تا گەرمای نیوەڕۆ زۆرێ بۆ دەهێنان ئەوجا دەگەڕانەوە جا ڕۆژێ زۆر چاوەنواڕ دەکەن کە هیچ نابێ دەگەڕێنەوە، هەر کە دەگەنە ماڵەوە پیاوێکی جوو دەچێتە سەر قەلایەکی خۆیان بۆ تەماشاکردنی شتێ، جا بە ڕێکەوت لە دوورەوە پێغەمبەرو هاوڕێکانی بەدی دەکا: بەرگەکانیان سپی دەکاتەوەو

تارماییەکەیان لەناو رێگی بیابان (سەراب)دا کەروێشکە دەکاو دەردەکەوێ! چا کابرای جووە خۆی پێ ناگیرێو بە هەموو دەنگی بانگەواز دەکاو دەڵێ: ئەی کۆمەڵەی عەرب! ئەمە ئەو شانسەتانە کە چاوەنواڕی دەکەن! چا موسوڵمانەکان پەلاماری چەك دەدەنو دەچن بە پیری پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) وە لە پشت بەردەڵانەکەوە پێی دەگەن، چا بەلای راستا دەیانبات هەتا دەچێتە ناو بنەماڵەی عەمری کوڕی عەوفو لەوێ دادەبەزن، ئەمەش رۆژی دوو شەممە بوو، لە مانگی مەولوود (مانگی رەبیعول ئەووەل) وە ئەبو بەکر دەچوو بەپیر خەڵکەکەوەو لە جیاتی پێغەمبەر چاكو چۆنی لەگەڵ دەکردن بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی بێ دەنگ دانیشتبوو، چا ئەوانەی لە یاریدەدەران کە پێغەمبەریان نە دیبوو کە دەهاتن رۆژ باشییان لە ئەبو بەکر دەکرد هەتا هەتاوەکە دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و ئەبو بەکر دەچێ بە پۆشاکەکەی خۆی سێبەری بۆ دەکا، ئەوساکە خەڵکەکە پێغەمبەر دەناسن چا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دە شەو زیاتر لەناو بنەماڵەی عەمری کوڕی عەوفدادەمێنێتەوە، وە ئەو مزگەوتە دادەمەزرێنێ کە بناغەی لەسەر تەقوا دامەزراوە بەپێی ئایەتی قورئان، وە خۆی نوێژی تیا دەکات ئینجا سواری وڵاخەکەی دەبێو لەگەڵ خەڵکەکەدا دەڕوا تا وشترەکەی لەلای شوێن مزگەوتەکەی ئێستای پێغەمبەردا لە مەدینە چۆك دادەدا، کە لەو سەرمەمەدا چەند پیاوێ لە موسوڵمانان لەوێدا نوێژیان دەکرد، کە لەوە پێش جێگە مشتاخی خەرمانی خورمابوو، هی دوو کوڕبوو، ناویان سوهەیلو سەهل بوو، هەتیو بوون، ئەسعەدی کوڕی زورارە سەرپەرشتی دەکردن، چا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە وشترەکەی لە ژێر خۆیا چۆکی داداو لەوێدا پاڵ کەوتو سینگی دادا فەرمووی: خودا حەزکا ئەمە جێگەیەتی! لە پاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەردوو کوڕەکەی بانگ کردو سەودای شوێن مشتاخەکەی لێ کردن هەتا بیکات بە مزگەوت. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵکوو دەیبەخشین پێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قاییل نەبوو کە بە بەخشش وەری بگرێ لێیان، لە ئەنجاما لێی

کـڕینو کـردی بـە مزگـەوت. پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) خۆشـی لەگـەڵ هاوڕێیانا خشتی کاڵی دەگواستەوە بۆ دروست کردنەکەی وە بە دەم خشت گواستنەوەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سۆزی دەکردو دەیفەرموو:

هَـذَا الْحِمَـالُ لاَ حِمَـالَ خَيْبَـرْ     هَـذَا أَبَـرُّ رَبَّنَـا وَأَطْهَـرْ

واتە:

کۆڵ ئەم کۆڵەیە نەک کۆڵی خەیبەر

چاکترەو پاکتر، خودای بانی سەر

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەشی فەرموو:

اللَّهُـمَّ إِنَّ الأَجْـرَ أَجْـرُ الآخِـرَهْ     فَـارْحَمِ الأَنْـصَارَ وَالْمُهَـاجِرَهْ.

واتە:

خێر ئەو خێرەیە سبەی لە خوانە!

رەحمەت لە ئەنصار، لە کۆچکەرانە!

ئیبنو شـەهاب (خودای لێ رازی بێ) دەڵـێ: لـە فـەرمووودەو فەرمایـشتدا نـەمان بیستووە کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) هـۆنراوەی تـەواوی خوێندبێتـەوەو بیکا بە نموونەو سەر مەشق جگە لەم هۆنراوانە. (ب- رەحمەتی خودای لێ بێ).

٣١٦٢- وَقَالَ أَنَسُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْمَدِينَةِ وَهُـوَ مُرْدِفٌ أَبَا بَكْرٍ وَنَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَابٌّ لاَ يُعْرَفُ وَأَبُو بَكْرٍ شَيْخٌ يُعْـرَفُ. قَـالَ: فَيَلْقَى الرَّجُلُ أَبَا بَكْرٍ فَيَقُولُ يَا أَبَا بَكْرٍ مَنْ هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْكَ فَيَقُولُ هَذَا الرَّجُلُ يَهْدِينِي السَّبِيلَ. فَيَحْسِبُ الْحَاسِبُ أَنَّهُ إِنَّمَا يَهْدِيهِ الطَّرِيقَ وَإِنَّمَا يَعْنِي سَبِيلَ الْخَيْرِ فَالْتَفَتَ أَبُو بَكْرٍ فَإِذَا هُوَ بِفَارِسٍ قَدْ لَحِقَهُمْ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ هَـذَا فَـارِسٌ قَـدْ لَحِـقَ بِنَـا. قَـالَ: فَالْتَفَتَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: اللَّهُمَّ اصْرَعْهُ فَصَرَعَتْهُ فَرَسُهُ ثُمَّ قَامَتْ تُحَمْحِمُ. قَالَ: ثُمَّ قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مُرْنِي بِمَا شِئْتَ. قَالَ: قِفْ مَكَانَكَ لاَ تَتْرُكَنَّ أَحَـداً يَلْحَـقُ بِنَـا قَالَ: فَكَانَ أَوَّلُ النَّهَارِ جَاهِداً عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ آخِرُ النَّهَـارِ مَـسْلَحَةً لَهُ. قَالَ: فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَانِبَ الْحَرَّةِ ثُمَّ بَعَثَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَاءُوا نَبِـيَّ

اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمُوا عَلَيْهِمَا وَقَالُوا ارْكَبَا آمِنَيْنِ مُطَاعِيْنَ. قَالَ: فَرَكِبَ نَبِيُّ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَحَفُّوا دَوْنَهُمَا بِالسِّلاَحِ: فَقِيلَ بِالْمَدِينَةِ جَاءَ نَبِيُّ اللّٰهِ. جَاءَ نَبِيُّ اللّٰهِ فَأَشْرَفُوا يَنْظُرُونَ وَيَقُولُونَ جَاءَ نَبِيُّ اللّٰهِ. جَاءَ نَبِيَّ اللّٰهِ فَأَقْبَلَ يَسِيرُ حَتَّى نَزَلَ جَانِبِ دَارِ أَبِي أَيُّوبَ. فَقَالَ نَبِيُّ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ بُيُوتِ أَهْلِنَا أَقْرَبُ؟ فَقَالَ: أَبُو أَيُّوبَ: أَنَا يَا نَبِيَّ اللّٰهِ هَذِهِ دَارِي وَهَذَا بَابِي. قَالَ: فَانْطَلِقْ فَهَيِّئْ لَنَا مَقِيلاً. قَالَ: قُومَا عَلَى بَرَكَةِ اللّٰهِ تَعَالَى. روى البخاري هذه الثلاثة[٥]:

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هات بۆ مەدینەو کۆچی کرد بۆ شارە نازدارەکەی خۆی ئەبو بەکری لە پاشکۆی خۆیەوە دانابوو، ئەو سەردەمە پێغەمبەر لاوێکی نەناسراو بوو، ئەبو بەرکیش پیرێکی ناسراو بوو هەر چەندە ئەبو بەکر منالٚتریش بوو بەلاّم چونکە ریشی پێغەمبەر رەش بوو وە ریشی ئەبو بەکر سپی بوو بە دیمەن وای دەنواند کە ئەو لاوەو ئەم پیرە، ئەبو بەکریش بەهۆی بازرگانییەوە هاتوچۆی مەدینەی دەکرد بەلاّم پێغەمبەر نەء هەندێ کەس کە پێیان دەگەیشت دەیگوت: ئەی ئەبو بەکر! ئەم پیاوە کێیە لە بەردەمتا؟ دەیگوت: ئەمە ئەوەیە کە رێگەم نیشان دەدا، ئیتر کابرا وا تێ دەگەیشت کە مەبەستی ئەبو بەکر لە رێگەوبانە، بەلاّم ئەو مەبەستی رێگەی چاکە بوو، جا لە رێگە ئەبو بەکر لا دەکاتەوە تەماشا دەکا کەوا سوارێ تەنگی پێ هەلٚچنیون دەلٚێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە سوارێکە تەنگی پێ هەلٚچنیوین! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوڕ دەداتەوەو دەفەرموێ: ئەی خودایە! بێ گلێنە ئیتر ماینەکەی دەیگلێنێ، ماینەکە کە هەلٚ دەسێتەوە لە تاواندا دەلووشکێنێ. جا سوارەکە دەلٚێ: ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمانت بەچییە تا جێبەجێی بکەم، دەفەرموێ: لە شوێنی خۆت راوەستە مەیەلٚە کەس دوامان بکەوێ گوتی: ئاوا ئەو پیاوە سەر لە بەیانی بە خوێنی سەری پێغەمبەر تینوو بوو کەچی سەر لە ئێوارێ بوو بە دیدەوانو پاسەوانی! ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە**

---

[٥] بخاري. فضائل: ٣٩١١.

خڕە بەرداوییەکە، لە قوباء دابەزیو پانزە شەو لەوێ مایەوەو مزگەوتێکی لەوێ دروست کرد ئینجا ناردی بە شوێن یاریدەدەرانداو یاریدەدەران هاتنو خۆشهاتنیان لێ کردنو گوتیان: فەرموون بەبێ باك سواری وشترەکانتان بنو فەرمانتان بە جێیەو ترستان لە کەس نەبێ. ئیتر پێغەمبەرو ئەبو بەکر سواربوونو ئەوانیش بە چەکەوە لە دەورو پشتیان دەرۆیشتن، ئینجا لەناو مەدینەدا دەنگ بڵاو بووەوە کەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دێ، جا خەڵك سەردەکەوتنو تەماشایان دەکردو دەیانگوت: ئەوا پێغەمبەری خودا هات، ئەوا پێغەمبەری خودا هات! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەڕوا هەتا لەلای خانووەکەی ئەبو ئەییوب دادەبەزێو دەفەرموێ: کام لە خزمەکانمانماڵەکەی نزیکترە؟ ئەبو ئەییوب دەڵێ: من، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە خانووەکەمەو ئەمەش دەرگاکەمە. دەفەرمووێ: دەبڕۆ شوێنی حەوانەوەمان بۆ ئامادە بکە دەڵێ: هەردووکتان هەڵسن لەسەر بەرەکەتی خودای گەورە با بچین بۆ ماڵەوە (ب).

٣١٦٣- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اشْتَرَى أَبُو بَكْرٍ مِنْ أَبِي رَحْلاً بِثَلاَثَةَ عَشَرَ دِرْهَمًا، وَسَاقَ عَنْ أَبِي بَكْرٍ حَدِيثاً في الهجرة إلى أنَّ قَالَ: فَلَمَّا دَنَا أِي مُنَّا سُرَاقة دَعَا عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَاخَ فَرَسُهُ فِي الأَرْضِ إِلَى بَطْنِهِ وَوَثَبَ عَنْهُ وَقَالَ يَا مُحَمَّدُ قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ هَذَا عَمَلُكَ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يُخَلِّصَنِي مِمَّا أَنَا فِيهِ وَلَكَ عَلَيَّ لأُعَمِّيَنَّ عَلَى مَنْ وَرَائِي وَهَذِهِ كِنَانَتِي فَخُذْ سَهْمًا مِنْهَا فَإِنَّكَ سَتَمُرُّ عَلَى إِبِلِي وَغِلْمَانِي بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا فَخُذْ مِنْهَا حَاجَتَكَ فَقَالَ: لاَ حَاجَةَ لَنَا فِي إِبِلِكَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ لَيْلاً فَتَنَازَعُوا أَيُّهُمْ يَنْزِلُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَنْزِلُ عَلَى بَنِي النَّجَّارِ أَخْوَالِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أُكْرِمُهُمْ بِذَلِكَ فَصَعِدَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ فَوْقَ الْبُيُوتِ وَتَفَرَّقَ الْغِلْمَانُ وَالْخَدَمُ فِي الطُّرُقِ يُنَادُونَ يَا مُحَمَّدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَا مُحَمَّدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. رواه مسلم والبخاري[٦]:

---

[٦] بخاري فضائل: ٣٩٢٥.

بەرائی کوڕی عازیب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو بەکر کۆپانە وشترێکی لە باوکم کڕی بە سیازدە درەم، ئینجا لە بابەت کۆچ کردنەوە فەرموودەیەکی درێژی گێڕایەوە لە دەم ئەبو بەکرەوە، تا گەیشتە سەر ئەوە گوتی: جا سوراقە کەنزیك بۆوە لێمان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نزای لێ کرد، ئیتر ماینەکەی تا ژێر سکی داچوو لەو زەوییە چەقەنەدا جا سوراقە باز دەداتە خوارەوە لە ماینەکەو دەڵێ: ئەی موحەممەد! دەزانم کە ئەمە ئیشی تۆ بووەوە تۆ پێت نواندم، کەواتە لە خودا بپارێرەوە کە لەمە قورتارم بکا، منیش بەرابەر بەوە ئەوانەی کە وان لە دوامنەوە منەیکوشتنی تۆ دەکەن هەڵەیان دەکەمو شوێنە گومکێیان لێ دەکەم، ئەمەش تیردانەکەمە تیرێکی لێ هەڵبگرەو بیکە بە نیشانە کە لە فیسارە شوێنەوە ڕەت بووی رانە وشترو ڕەنجبەرەکانم لەوێن پێویستیت بەچی هەبوو بیبە بۆ خۆت. فەرمووی: کارمان بە وشتری تۆ نیە ئەبو بەکر گوتی: جا کە گەیشتینە مەدینە شەو بوو، لەناو خۆیانا بوو بە کێشەیان، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەبێ میوانی کامیان بێ، فەرمووی: دەبم بە میوانی بەنی نەجاری خاڵوانی عەبدولموطەلیب، دەیکەم بە شانازیی بۆیان جا پیاوو ژن سەرکەوتنە سەر سەربانەکانو کوڕو کاڵو نۆکەرو کارەکەران بە کووچەو کۆڵانەکانا پرژو بڵاو بوونەوەو بانگەوازیان هەڵ دەدا: ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خودا! (م/ب).

٣١٦٤- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ الْمَدِينَةَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، وَكَانَا يُقْرِئَانِ النَّاسَ، فَقَدِمَ بِلاَلٌ وَسَعْدٌ وَعَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، ثُمَّ قَدِمَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، حَتَّى جَعَلَ الإِمَاءُ يَقُلْنَ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه البخاري[٧]:

---

[٧] بخاري. المبعث: ٣٩٢٥.

بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: یەکەم کەس کە هاتە ناومان بۆ مەدینە مەصعەبی کوڕی عومەیرو ئیبنو ئوممی مەکتووم بوون، ئینجا بیلالو سەعدی کوڕی وەققاصو عەمماری کوڕی یاسیرش هاتن، لە پاشا عومەری کوڕی خەطابیش – لەگەڵ بیست کەس لە یارانی پێغەمبەردا – هاتن. ئینجا پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) تەشریفی هات، ئەو شادیو خۆشییەی کە دانیشتوانی شاری مەدینە کردیان بە بۆنەی هاتنی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) ئەم دیوە قەت خۆشیو شادیی وا بکەن، تەنانەت کەنیزەکەکانیش لە خۆشیانا بانگەوازیان هەڵدەداو هەلهەلەیان دەکێشاو دەیانکرد بە قریوەو دەیانگوت: ئۆخەی! وا پێغەمبەری خودا تەشریفی هێناو بە خێرو خۆشی گەیشتە جێ! (ب– غەریقی رەحمەت بێ).

٣١٦٥– قال في الشرح: وأما الضعفاء والنساء فقد علون على ظُهُور البُيُوت والفرح يملؤهُنَّ ينشدن بصوت رخيمٍ.

طلع البدر علينا ... من ثنيات الوداع
وجب الشكر علينا ... ما دعا لله داع
أيها المبعوث فينا ... جئت بالأمر المُطاع

واتە:

مانگی چاردە هەڵهات لە شار ... ملەی وەداع بوو بە گوڵزار!
شوکری خودا شەکری سەر زار ... تا هەس کەسێ دەکا هاوار
لە خواوە دەڵێ بە تۆی نازار: ... هەم رەهبەری، هەم فەرماندار!

٣١٦٦– ← (ب – ٢ ز – ١٤٣ ف – ٦)[٩].

## ١٠٢) کۆچی دەستەی گەمیکە : (هجرة أصحاب السفينة)

٣١٦٧– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَلَغَنَا مَخْرَجُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ بِالْيَمَنِ فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ إِلَيْهِ أَنَا وَأَخَوَانِ لِي أَنَا أَصْغَرُهُمَا أَحَدُهُمَا أَبُو بُرْدَةَ

[٩] تقدم فى المجلد الثاني. تسلسل/ ١٤٣ برقم: ٦/١٧٥٠.

وَالآخَرُ أَبُو رُهْمٍ – وَخَمْسِينَ رَجُلاً مِنْ قَوْمِي – قَالَ فَرَكِبْنَا سَفِينَةً فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالْحَبَشَةِ فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأَصْحَابَهُ عِنْدَهُ فَقَالَ جَعْفَرٌ إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَنَا هَا هُنَا وَأَمَرَنَا بِالإِقَامَةِ فَأَقِيمُوا مَعَنَا. فَأَقَمْنَا مَعَهُ حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعًا فَوَافَقْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ فَأَسْهَمَ لَنَا – أَوْ قَالَ أَعْطَانَا مِنْهَا – وَمَا قَسَمَ لأَحَدٍ غَابَ عَنْ فَتْحِ خَيْبَرَ مِنْهَا شَيْئًا إِلاَّ لِمَنْ شَهِدَ مَعَهُ إِلاَّ لأَصْحَابِ سَفِينَتِنَا مَعَ جَعْفَرٍ وَأَصْحَابِهِ قَسَمَ لَهُمْ مَعَهُمْ فَقَالَ بَعْضَ النَّاسِ لَنَا نَحْنُ سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ. فَدَخَلَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ عَلَى حَفْصَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) تَزورُهَا فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَيهِمَا فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقَالَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ. فَقَالَ عُمَرُ الْحَبَشِيَّةُ هَذِهِ الْبَحْرِيَّةُ هَذِهِ؟ فَقَالَتْ أَسْمَاءُ نَعَمْ. فَقَالَ عُمَرُ سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْكُمْ. فَغَضِبَتْ وَقَالَتْ كَلِمَةً كَذَبْتَ يَا عُمَرُ كَلاَّ وَاللَّهِ كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ وَكُنَّا فِي دَارٍ أَوْ فِي أَرْضِ الْبُعَدَاءِ الْبُغَضَاءِ فِي الْحَبَشَةِ وَذَلِكَ فِي اللَّهِ وَفِي رَسُولِهِ وَايْمُ اللَّهِ لاَ أَطْعَمُ طَعَامًا وَلاَ أَشْرَبُ شَرَابًا حَتَّى أَذْكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ كُنَّا نُؤْذَى وَنُخَافُ وَسَأَذْكُرُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَسْأَلُهُ وَوَاللَّهِ لاَ أَكْذِبُ وَلاَ أَزِيغُ وَلاَ أَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ. قَالَ فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ إِنَّ عُمَرَ قَالَ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بِأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ وَلَهُ وَلأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ وَلَكُمْ أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ. قَالَتْ فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ يَأْتُونِي أَرْسَالاً يَسْأَلُونِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ مَا مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ هُمْ بِهِ أَفْرَحُ وَلاَ أَعْظَمُ فِي أَنْفُسِهِمْ مِمَّا قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ أَسْمَاءُ: فكان أبو موسى يستعيد هذا الحديث مني. رواه مسلم في الفضائل والبخاري في هجرة الحبشة[1]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە یەمەن بووین خەبەرمان زنەوت کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە جا خۆمو دوو برامو پەنجاوسێ کەسی تر لە خزمەکانم کۆچمان کرد بۆ لای، من بچووکی هەردوو

---

[1] بخاري. فرض الخمس: ٣١٣٦ ، ٣٨٧٦ ، ٤٢٣٠. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٦٠.

براکانم بووم، کە یەکێکیان ئەبو بوردەو ئەوی تریان ئەبو ڕەهم بوو، سواری پاپۆڕێ بووین لە حەبەشە لەلای نەجاشی هەڵێ ڕشتین، وە لەوێ تووشی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب‌و هاوڕێکانی بووین جەعفەر گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئێمەی ناردووە بۆ ئێرە وە فەرمانی پێ کردووین کە لێرە بمێنینەوە، ئێوەش لەگەڵ ئێمە بمێننەوە، ئیتر ئێمەش ماینەوە لەگەڵیدا هەتا گشتمان پێکەوە هاتینەوە، وا ڕێکەوت کە چووینە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوکاتە بوو کە قەڵای خەیبەری فەتح کردبوو، جا بەشەپشکی لە تالانی خەیبەر بۆ ئێمەیش دانا یا گوتی: بەشی ئێمەشی دالێی، ئەوەی لەکاتی گرتنی قەڵای خەیبەردا لەوێ نەبووبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەشی بۆ دانەناوە، جگە لە ئێمە کە تاقمەی پاپۆڕەکە بووین، جگە لە جەعفەرو هاوڕێکانی بەشی ئەوانیشی دانا لەگەڵ ئەوانا، جا هی وا هەبوو پێمانی دەگوت: ئێمە لە کۆچکردندا لە پێش ئێوەوەین ڕۆژێ ئەسمای کچی عومەیس کە یەکێك بوو لە دەستەی گەمێکە دەچێ بۆ دیدەنی حەفصە، عومەریش دەچێ بۆ لایان، ئەسماء لەوێ دەبینێ، بە حەفصەی کچی دەڵێ: ئەمە ئەوەیە کە لە حەبەشە بووەو لە دەریاوە گەڕاوەتەوە؟ دەڵێ: بەڵێ ئەوم. عومەر دەڵێ: ئێمە بۆ کۆچکردن لە پێش ئێوەوەین کەواتە ئێمە لە ئێوە لە پێشترین بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەسمائیش تووڕە دەبێ‌و دەڵێ: درۆت کرد ئەی عومەر! نەخێر، نە بە خودا وانییە، چونکە ئێوە لە خزمەتی پێغەمبەردا بوون‌و خۆی سەرەوکاری کردوون‌و برسیتانی نان‌و ئاو داوەو نادانتانی تەمێ‌و ئامۆژگاری کردووە، وەڵێ ئێمە لە حەبەشە بووین‌و لە دوورە وڵات بووین‌و لە ناوبێگانان‌و ناحەزاندا ژیاوین، ئەمەش کە بووەو قەبووڵمان کردووە هەمووی لە پێناوی ڕەزای خوداو لە پێناوی ئایینی پێغەمبەری ئەودا بووە، جا سوێند بێ بە خودا نەنان دەخۆم‌و نە ئاو دەخۆمەوە هەتا ئەم قسەی تۆیە نەگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئێمە ئازارو ئەشکەنجە دەدراین‌و تاڵاومان دەنۆشی‌و دەترسێنراین، وە ئەمانە هەمووی

باس دەکەم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وە بە باشی لێی دەپرسم، دەسابەو خودایە رێكو راست عەرزی دەکەم نە درۆی تیا دەکەمو نە راوەرێویی وە نەلێی پتر دەکەم، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! عومەر واوا دەڵێ، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی تۆ چیت پێ گوت؟ گوتم: واوام پێ گوت، فەرمووی: ئەو لە ئێوە لە پێشتر نییە بەمن، وە بۆ ئەوو بۆ هاوڕێکانی یەك کۆچ هەیە، بەڵام بۆ ئێوە — کە دەستەی گەمێکەن — دوو کۆچتان بۆ هەیە! ئەسماء گوتی: ئیتر ئەبو مووساو دانیشتوانی ناو پاپۆڕەکە دەستە دەستە دەهاتن بۆ لای منو ئەم فەرموودەیەیان لێ دەپرسیمەوە، شت نییە لەم جیهانەدا کە وەك ئەم مژدەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوا شادمانیان بکاو ئاوا لە دڵیانا گەورەو دڵ خۆشکەرە بێ. ئەسماء گوتی: گەلێ جار ئەبو مووسا لە خۆشییانا ئەم فەرموودەیەی دووبارەو سێ بارە پێ دەگێڕامەوە! (م/ب—خودایان لێ رازی بێ).

## ١٠٣) رای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) بۆ ئیشوکاری دنیایی

## رأي النبي ﷺ في أمور الدنيا

٣١٦٨– عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ تَبُوكَ فَأَتَيْنَا وَادِيَ الْقُرَى عَلَى حَدِيقَةٍ لِامْرَأَةٍ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اخْرُصُوهَا. فَخَرَصْنَاهَا وَخَرَصَهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَشَرَةَ أَوْسُقٍ وَقَالَ لِلْمَرْأَةِ: أَحْصِيهَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَيْكِ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ. وَانْطَلَقْنَا حَتَّى قَدِمْنَا تَبُوكَ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَتَهُبُّ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَلَا يَقُمْ فِيهَا أَحَدٌ مِنْكُمْ فَمَنْ كَانَ لَهُ بَعِيرٌ فَلْيَشُدَّ عِقَالَهُ. فَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ فَقَامَ رَجُلٌ فَحَمَلَتْهُ الرِّيحُ حَتَّى أَلْقَتْهُ بِجَبَلَيْ طَيِّئٍ وَجَاءَ رَسُولُ ابْنِ الْعَلْمَاءِ صَاحِبِ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِكِتَابٍ وَأَهْدَى لَهُ بَغْلَةً بَيْضَاءَ فَكَتَبَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَهْدَى لَهُ بُرْدًا ثُمَّ رَجَعْنَا حَتَّى قَدِمْنَا وَادِيَ الْقُرَى فَسَأَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَرْأَةَ عَنْ حَدِيقَتِهَا. كَمْ بَلَغَ ثَمَرُهَا فَقَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي مُسْرِعٌ فَمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ فَلْيُسْرِعْ مَعِيَ

وَمَنْ شَاءَ فَلْيَمْكُثْ. فَخَرَجْنَا حَتَّى أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَقَالَ: هَذِهِ طَابَةُ وَهَذَا أُحُدٌ وَهُوَ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ. ثُمَّ قَالَ: إِنَّ خَيْرَ دُورِ الأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ ثُمَّ دَارُ بَنِي سَاعِدَةَ وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ. فَلَحِقَنَا سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ أَلَمْ تَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيَّرَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلَنَا آخِرًا. فَأَدْرَكَ سَعْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خَيَّرْتَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلْتَنَا آخِرًا. فَقَالَ: أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الْخِيَارِ[1]:

ئەبو حومەید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) چووین بۆ غەزای تەبووك، كە گەیشتینە وادی لقورا ژنێ لەناو باخێكی خۆیدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم باخەبخەملێنن ئێمەش هەر كەسە بە جۆرێ خەملاندمان، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی خەملاندی بە دە وەسقو بە ژنەكەشی فەرموو: تۆ هەڵی ژمێرە تا دەگەڕێینەوە بۆ لات، خودا حەزكات ئەنجا ڕۆیشتین هەتا چووینە تەبووك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم شەو بایەكی سەخت هەڵ دەكا لێتان، كەستان لەو كاتەدا هەڵمەسن، هەر كەسەش وشتری هەیە باتوند پێوەندی بكا جا بایەكی سەختی وا هەڵی كرد، پیاوێ لەو كاتەدا هەڵسا بایەكە هەڵی گرتو لەلای دوو كێوەكەی طەییا لەوێ تووڕی دا، فروستادەی ئیبنو عەلمای شای ئەیلە نامەیەكی لە ئیبنو عەلماوە هێنا بۆ پێغەمبەر لەگەڵ هێسترە ماچەیەكی سپی دا بە دیاریی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) نامەیەكی بۆی ناردو عابایەكیشی بە دیاری بۆ نارد، جا كە هاتینەوە بۆ وادیلقورا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ باخەكە لە ژنەكەی پرسی: بەرەكەی چەند وەسق دەرچووە؟ گوتی: دە وەسق. ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من بە زوویی دەڕۆمەوە بۆ مەدینە، جا ئەوەی حەز دەكا لەگەڵ مندا بێ ئەوە كەیفی خۆیەتیو ئەوەشی حەز دەكا لێرە

---

[1] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٢ ، ٤٤٢٢ ، ٣٧٩١. مسلم. حج: ٣٣٥٨ ، ٥٩٠٧ ، ٥٩٠٨. أبو داود. خرج وإيمارة: ٣٠٧٩.

بمێنێتــەوە ئــەوە بــا بمێنێتــەوە ئــەنجا کەوتینــە ڕێ، کاتــێ لــە دوورەوە مەدینــەمان لێ دەرکــەوت فــەرمووی: ئەمــە طــابەیــە واتــە: خــۆش‌و خــاوێن‌و سازگارە وە ئەوەش چیای ئوحودە، ئەم کێوە ئێمەی خۆش دەوێ‌و ئێمـەش ئــەومان خــۆش دەوێ! لــە پاشــا فــەرمووی: باشــترین خانــەی یاریــدەدەران خانەکانی بەنی نەجاڕن، لە پاش ئەوان خانەکانی بەنی عەبدول ئەشهەلن، لــەپاش ئــەوان خانــەکانی بــەنی ســاعیدەن، وەخانووەکــانی یاریــدەدەران هەموویان خێردارو خاسن! لە پاشا کە سەعدی کوڕی عوبادەمان پێ گەیشت ئەبو ئوسەید پێی گوت: ئاگات لێیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) باشێتیی خانەکانی یاریدەدەرانی دیاری کردو پلەی بۆ دانان کە چی ئێمەی خستە دواوە! سەعدیش چوو بۆ لای پێغەمبەرو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باشێتیی خانەکانی یاریدەرانت دیاری کردووە کەچی ئێمەت لە پلەی دواوە داناوە!؟ فەرمووی: بەس نییە کە ئێوەیش بەر دەستەی چاکان کەوتوون. (م/ت- خودایان لێ ڕازی بێ).

٣١٦٩- عَنْ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يَأْبُرُونَ النَّخْلَ فَقَالَ: مَا تَصْنَعُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَصْنَعُهُ قَالَ: لَعَلَّكُمْ لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا كَانَ خَيْرًا. فَتَرَكُوهُ فَنَفَضَتْ أَوْ فَنَقَصَتْ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ دِينِكُمْ فَخُذُوا بِهِ وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ رَأْيٍ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَقَالَ: أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ. رواهما مسلم[٢]:

ڕافیعــی کــوڕی خــەدیج (خــودای لێ ڕازی بــێ) گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەربێ) کــە هــات بــۆ مەدینــە کــاتی متووربــە کردنــی خورمــا بــوو خــەڵك خــەریکبوون خورمایــان موتوربــەو پەیوەنــد دەکــر، فــەرمووی: (درودی خــودای لەسەربێ): ئەوەچی دەکەن؟ گوتیان: لە مێژەوە ئەمە دەکەین! حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕەنگ بێ ئەگەر ئەمەیش نەکەن هەر بەری باش بێنێ!

[٢] مسلم. فضائل: ٦٠٨١ ، ٦٠٨٠ ، ٦٠٧٩.

ئیتر ئەوانیش وازیان لە موتوربە کردنەکەیان هێنا، کەچی بەرەکەی پووچەڵ دەرچوو، یا گوتی: کەمی تیا بوو، جا کە ئەمەیان عەرزی حەزرەت کرد فەرمووی: منیش هەر ئادەمیزادم وەك ئێوە، خۆ غەیب زان نیم لە گێڕانەوەیەکا: خۆتان لە کارو باری جیهانی خۆتان باشتر دەزانن (م).

## ١٠٤) بەشی هەشتەم: باسی موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ یەکێکیان ئەوەیە ئاو لە نێوانی پەنجەکانیەوە هەڵقوڵیوە وەك کانیاو!

## الفصل الثامن: في معجزات النبي ﷺ منها نبع الماء من بين أصابعه ﷺ

٣١٧٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِإِنَاءٍ وَهُوَ بِالزَّوْرَاءِ، مَعَ أَصْحَابِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَجَعَلَ الْمَاءُ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ الْقَوْمُ. قَالَ قَتَادَةُ قُلْتُ لأَنَسٍ: كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ ثَلاَثَمِائَةٍ، أَوْ زُهَاءَ ثَلاَثِمِائَةٍ. رواه الشيخان[1]:

← (ب – ١ ز – ٢١ ل – رقم/٥/١٥٠) لە گێڕانەوەی ئێرەدا: ئەنەس (رزای خودای لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و هاوڕێکانی لە زەوراء بوون حاجەتێکیان هێنا بۆی، دەستی تێ خست، ئیتر پەیتا پەیتا ئاو لە نێوانی پەنجەکانیەوە هەڵئەقوڵا، ئینجا پیاوگەل دەسنوێژیان لێ گرت. قەتادە گوتی: گوتم بە ئەنەس: ئێوە چەندکەس دەبوون کە دەسنوێژتان گرت لەو ئاوە؟ گوتی: سێ سەدکەس بووین، یا گوتی: پێم وابوو ئەندازەی سێ سەدکەس دەبووین (ش).

٣١٧١- وَعَنْهُ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) وَحَانَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَالْتُمِسَ الْوَضُوءُ فَلَمْ يَجِدُوهُ فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِوَضُوءٍ، فَوَضَعَ يَدَهُ فِي ذَلِكَ

[1] تقدم برقم: ١٥٠/٥ مجلد/ ١ تسلسل/ ٢١.

الإِنَاءِ، فَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّئُوا مِنْهُ، فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ النَّاسُ حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ. رواه الشيخان والترمذي[٢]:

**دیسان ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: نزیکی نوێژی عەصر بوو، ڕوانیم دەگەڕان بۆ ئاو بۆ دەسنوێژ، ئاو نەبوو، تا لە جامێکا هەنێ ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بۆ دەسنوێژ، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەستی خستە ناو دەفرکەوەو دەستووری دا بە خەڵکەکە کە دەسنوێژی لێ بگرن، بە چاوی خۆم دەمدی ئاوەکە لە نێوانی پەنجەکانیەوە هەڵدەقولا، ئیتر عەشاماتەکە هەتا دواکەسیان لەو ئاوە دەسنوێژیان گرت (ش/ت).**

**٣١٧٢-** وَعَنْهُ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ مَخَارِجِهِ وَمَعَهُ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَانْطَلَقُوا يَسِيرُونَ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلَمْ يَجِدُوا مَاءً يَتَوَضَّئُونَ، فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَجَاءَ بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ يَسِيرٍ فَتَوَضَّأَ،مِنْهُ النَبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ مَدَّ أَصَابِعَهُ الأَرْبَعَ عَلَى الْقَدَحِ ثُمَّ قَالَ: قُومُوا فَتَوَضَّئُوا. فَتَوَضَّأَ الْقَوْمُ حَتَّى بَلَغُوا مَا يُرِيدُونَ مِنَ الْوَضُوءِ، وَكَانُوا سَبْعِينَ أَوْ نَحْوَهُ. رواه البخاري[٣]:

**دیسان ئەو** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر خۆیو چەن کەسێ لە یارانی دەرچوون بۆ سەفەرێ. دەڕۆن تا نوێژیان لێ دەبێ، ئاویان دەست ناکەوێ دەسنوێژی پێ بگرن، تا پیاوێ لەگەل ڕۆیشت، کەمێ ئاوی لە جامێکدا هێنا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەسنوێژی لێی گرت، ئەنجا هەر چوار پەنجەی خۆی بەسەرجامەکەدا ڕایەڵ کردو فەرمووی: ئادەی هەڵسن دەسنوێژ بگرن! پیاو گەلیش هەموویان بە ئارەزووی خۆیان چۆنیان ویست ئاوا سەرو دەسنوێژی تێرو تەسەلیان لەو جامە ئاوە کەمە گرت، لەم جارەدا**

---

[٢] بخاري. وضوء: ١٦٩ ، ١٩٥ ، ٢٠٠ ، ٣٥٧٢ ، ٣٥٧٣ ، ٣٥٧٤ ، ٣٥٧٥ ، تجريد/ ١ ل — ١٥٤ رقم: ١٣٠. مسلم. فضائل: ٥٩٠١. ترمذي.مناقب: ٣٦٣١. نسائى. طهارة: ٧٦.

[٣] بخاري. وضوء: ١٩٥ ، ١٦٩ (اخرجه مسلم/ عين/ ٣ ص٨٨، ٥٨ — هامش تجريد/ ١ ل — ١٦٤رقم: ١٤٤).

دەسنوێژگرەکان ژمارەیان حەفتا کەس دەبوو، یا گوتی: نزیکەی حەفتا کەس دەبوون ! (ب).

٣١٧٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَطِشَ النَّاسُ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ فَتَوَضَّأَ فَجَهَشَ النَّاسُ نَحْوَهُ، فَقَالَ: « مَا لَكُمْ ». قَالُوا لَيْسَ عِنْدَنَا مَاءٌ نَتَوَضَّأُ وَلاَ نَشْرَبُ إِلاَّ مَا بَيْنَ يَدَيْكَ، فَوَضَعَ يَدَهُ فِي الرَّكْوَةِ فَجَعَلَ الْمَاءُ يَفُورُ بَيْنَ أَصَابِعِهِ كَأَمْثَالِ الْعُيُونِ، فَشَرِبْنَا وَتَوَضَّأْنَا. قُلْتُ كَمْ كُنْتُمْ قَالَ لَوْ كُنَّا مِائَةَ أَلْفٍ لَكَفَانَا، كُنَّا خَمْسَ عَشْرَةَ مِائَةً. رواه الشيخان[٤]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژێ حودەیبییە، خەڵکەکە توونییان بوو، جەوەندەیێ ئاو لە بەردەستی پێغەمبەردا بوو، کە دەسنوێژی لێ گرت خەڵکەکە پەلاماری جەوەندەکەیان دا. فەرمووی: ئەوە چیتانە، بۆ وا دەکەن؟ عەرزیان کرد: جگە لەم ئاوە وا لەبەر دەستی تۆدا ئاویترمان نییە نە بۆ دەسنوێژو نە بۆ خواردنەوەمان. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی خستە ناو جەوەندەکەوە، ئیتر لەناو بەینی، پەنجەکانیەوە وەك کانی ئاو هەڵدەقوڵی! ئیتر هەم ئاومان خواردەوەو هەم دەسنیوژمان لێی گرت گوترا: ئەی ئەنەس! چەن کەس دەبوون؟ گوتی: هەزارو پێنج سەد کەس بووین، بەڵام ئەگەر سەد هەزار کەسیش بووینایە هەر بەشی دەکرد چونکە لە خوداوە یارمەتی بۆ دەهات (ش).

## ١٠٥) بازێکی تریان ئەوەیە کە لەپیتو فەڕی ئەوەوە ﷺ ئاوی کەم زۆر بووە

## ومنها تكثير الماء القليل ببركته ﷺ

٣١٧٤- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، وَالْحُدَيْبِيَةُ بِئْرٌ فَنَزَحْنَاهَا حَتَّى لَمْ نَتْرُكْ فِيهَا قَطْرَةً، فَجَلَسَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى

---

[٤] بخاري. مناقب: ٣٥٧٨.

شَفِيرِ الْبِئْرِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَمَضْمَضَ وَمَجَّ فِي الْبِئْرِ، فَمَكَثْنَا غَيْرَ بَعِيدٍ ثُمَّ اسْتَقَيْنَا حَتَّى رَوِينَا وَرَوَتْ - أَوْ صَدَرَتْ - رَكَائِبُنَا[١]:

**بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژێ حودەیبییە ئێمە خۆمان هەزارو چوار سەد کەس بووین دەوری سەد کەسێکی تریشمان پێوە نیشت حودەیبییە ناوی بیرێکە ڕۆژە ڕێیەك لە مەککەوە دوورە لەسەر ڕێگەی مەدینەیە ئاوی ئەو بیرەمان هەڵگواست تا دواتنۆکمان لێ بڕی، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر لێواری بیرەکە دانیشتو داوای هەنێ ئاوی کردو ئاوەکەی لە دەمی ڕاداو تفانیەوە ناو بیرەکە جا تۆزێ ماینەوەو چاوەنواڕمان کرد ئیتر دەستمان کرد بە ئاوکێش کردن، تا خۆمان تێراو بووینو وڵاخەکانیشمان ئاویان لەبەر مایەوە (ب).**

٣١٧٥- عَنْ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَسِيرٍ، فَجَعَلَنِي فِي رَكُوبٍ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَعَطِشْنَا عَطَشًا شَدِيدًا فَبَيْنَمَا نَحْنُ نَسِيرُ إِذَا نَحْنُ بِامْرَأَةٍ سَادِلَةٍ رِجْلَيْهَا بَيْنَ مَزَادَتَيْنِ، فَقُلْنَا لَهَا أَيْنَ الْمَاءُ فَقَالَتْ إِنَّهُ لاَ مَاءَ. فَقُلْنَا كَمْ بَيْنَ أَهْلِكِ وَبَيْنَ الْمَاءِ؟ قَالَتْ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ. فَقُلْنَا انْطَلِقِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: وَمَا رَسُولُ اللَّهِ فَلَمْ نُمَلِّكْهَا مِنْ أَمْرِهَا حَتَّى اسْتَقْبَلْنَا بِهَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَدَّثَتْهُ بِمِثْلِ الَّذِي حَدَّثَتْنَا غَيْرَ أَنَّهَا حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا مُؤْتِمَةٌ، فَأَمَرَ بِمَزَادَتَيْهَا فَمَسَحَ فِي الْعَزْلاَوَيْنِ، فَشَرِبْنَا عِطَاشًا أَرْبَعِينَ رَجُلاً حَتَّى رَوِينَا، فَمَلأْنَا كُلَّ قِرْبَةٍ مَعَنَا وَإِدَاوَةٍ، غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ نَسْقِ بَعِيرًا وَهْيَ تَكَادُ تَنِضُّ مِنَ الْمِلْءِ ثُمَّ قَالَ: هَاتُوا مَا عِنْدَكُمْ. فَجُمِعَ لَهَا مِنَ الْكِسَرِ وَالتَّمْرِ، حَتَّى أَتَتْ أَهْلَهَا قَالَتْ لَقِيتُ أَسْحَرَ النَّاسِ، أَوْ هُوَ نَبِيٌّ كَمَا زَعَمُوا، فَهَدَى اللَّهُ ذَاكَ الصِّرْمَ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ فَأَسْلَمَتْ وَأَسْلَمُوا. رواهما البخاري[٢]:

---

[١] بخاري. مغازي: ٤١٥٠ ، ٣٥٧٧ ، ٤١٥١. تجريد/ ٤ ل – ٢٩٨ رقم: ١٥٦٠.

[٢] بخاري. تيمم: ٣٤٤ ، ٣٤٨، ٣٥٧١ {تجريد/ ١ ل – ٢٢٨ رقم: ٢٢٠. اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة... رقم: ٦٨٢} = ١٥٦١ تخريج/ شيحا.

**عیمرانــی کــوڕی حوصــەین (خـوداى لێ رازى بـێ) گــوتی: لــە ســەفەرێکا لــە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، منی دانا لەناو دەستە سوارەکەی پێش خۆیەوە، ڕۆیشتین تا تەواو تینوومان بوو، بەدەم ڕۆیشتنەوە لەرێ ژنێکمان تووش بوو لە ناوکۆڵی دووکوندەی گاوەسا قاچەکانی شۆڕ کردبۆوە پێمان گوت: لەکوێ ئاو هەیە؟ گوتی: ئاو نییە. گوتمان: لە ئاوەکەوە تا لای کەسو کاری تۆ چەند دەبێ؟ گوتی: شەوو ڕۆژێکە، گوتمان: دەوەرە لەگەڵمان بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: پێغەمبەر کێیە، ئیتر بوارەمان نەدا تا بردمان بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وە چی قسەیەکی بۆ ئێمەکرد هەمان قسەی کردەوە بۆ ئەویش، وەڵێ عەرزی پێغەمبەری کرد کە هەتیوبارە، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەستووری دا هەردوو کوندەکەیان لە وشترەکە داگرتو خۆی دەستی پیرۆزی هێنا بە هەردوو هەنگڵەکانی دا ئێمە چل پیاوی تینوو بووین، هەموومان تێر ئاومان خواردەوە، وە هەرچی کوندەو جەوەندەشمان پێ بوون پڕمان کردن لەئاو، لەبەر پڕی وا توند بووبوون خەریکبوون بتەقێن، بەڵام وشترمان ئاو نەدا. ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەروشتی بدەنێ ئێمەیش نانەڵەتو خورمامان بۆ کۆکردەوەو دامان پێی، ژنەکە دەڕواتەوە بۆ لای کەسو کاری دەڵێ: تووشی جادووبازترین کەس بووم یا ئەگەر جادوو باز نەبێ ئەوە وەك خۆیان دەڵێن دیارە ئەو پیاوە پێغەمبەرە! جا پاشان بەهۆی ئەو ئافرەتەوە خودا ئەوخێڵەی ڕێ نموونی کردو ڕێگەی ڕاستی نیشان دان، ژنەکە خۆی ئیسلام بوو وە ئەوانیش ئیسلام بوون! (ب) ئەی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار:**

**تا مەل دەخوێنێ لەسەر چڵی دار**

**بەشنەی باوەڕ دڵ دەبێ بێدار**

**تا خوا حەز دەکاو خۆت دەبی رازی**

**بۆ گیانی پاکت سڵاوی بۆندار**

**(وەرگێڕ)**

## ١٠٦) یەکێکی تریان زۆرکردنی نانو چێشتە
## ومنها تكثير الطعام حتى وفى بالقوم وزاد

٣١٧٦- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ أَبُو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيْمٍ: لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَعِيفًا، أَعْرِفُ فِيهِ الْجُوعَ فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَأَخْرَجَتْ أَقْرَاصًا مِنْ شَعِيرٍ، ثُمَّ أَخْرَجَتْ خِمَارًا لَهَا فَلَفَّتِ الْخُبْزَ بِبَعْضِهِ، ثُمَّ دَسَّتْهُ تَحْتَ يَدِي وَلاَثَتْنِي بِبَعْضِهِ، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَهَبْتُ بِهِ، فَوَجَدْتُهُ فِي الْمَسْجِدِ وَمَعَهُ النَّاسُ، فَقُمْتُ عَلَيْهِمْ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ. فَقُلْتُ نَعَمْ. قَالَ بِطَعَامٍ. فَقُلْتُ نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِمَنْ مَعَهُ: قُومُوا. فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ حَتَّى جِئْتُ أَبَا طَلْحَةَ فَأَخْبَرْتُهُ. فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، قَدْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالنَّاسِ، وَلَيْسَ عِنْدَنَا مَا نُطْعِمُهُمْ. فَقَالَتِ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَانْطَلَقَ أَبُو طَلْحَةَ حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَاءَ مَعَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلُمِّي يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا عِنْدَكِ. فَأَتَتْ بِذَلِكَ الْخُبْزِ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَفُتَّ، وَعَصَرَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ عُكَّةً فَأَدَمَتْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيهِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ. فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ. فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ. فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ خَرَجُوا ثُمَّ قَالَ : ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ. فَأَكَلَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ وَشَبِعُوا، وَالْقَوْمُ سَبْعُونَ – أَوْ ثَمَانُونَ – رَجُلاً. رواه الخمسة إلا أبا داود[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو طەلحە گوتی: بە ئوممو سولەیم: گوێم لە دەنگی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ) دەنگی کزبوو، دەزانم کە لەبەر برسێتی وا کزە، ئایا هیچت لەلا هەیە کە بۆیبنێرین؟ گوتی: بەڵێ، جا چەن کولێرەیەکی جۆی دەرهێناو بە لایەکی لەچکەکەی پێچایەوەو خستیە بن دەستی منو ئەو لای لەچکەکەیی تێوەئالاندم تا نانەکان دەرنەکەونو کەس پێیان نەزانێ، ئەنجا ناردمی بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە

---

[1] بخاري. مناقب: ٣٥٨٠ {رياض/ ٢ ل – ٩٠ رقم: ٥٢١/٣١. بخاري: ٣٥٧٨ ومسلم: ٢٠٤٠}.

چووم روانیم لە مزگەوتە، خەڵکەکە وان لە خزمەتیا، منیش بە دیاریانەوە راوەستام، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: ئەبو طەلحە ناردوویتی؟ عەرزیم کرد: بەڵێ، فەرمووی: نانی پیا ناردووی؟ گوتم: بەڵێ، جا فەرمووی بەوانەی کە لە خزمەتیا بوون: هەڵسن بابچین بۆ ماڵی ئەبو طەلحە ئەوەی ناردوویەتی لەوێ دەیخۆین! جا ئەوان کەوتنە رێو منیش پێش ئەوان گەڕامەوە بۆ لای ئەبو طەلحەو حاڵەکەم تێ گەیاند، ئەویش بە ئوممو سەلیمی گوت: ئەی ئوممو سولەیم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وا خەڵکەکەی هێناو هات، ئێمەش نانی ئەم هەموو خەڵکەمان نییە جا چار چییە؟ ئەویش گوتی: مەترسە، رووزەردیمان بەسەر نایەت کاری پێغەمبەر بێ حیکمەت نیە خوداو پێغەمبەری خودا لە ئێمە باشتر ئاگایان لە حاڵکە هەیە! ئیتر ئەبو طەلحە خۆی چوو بە پیری پێغەمبەرەوەو لە گەڵیا هاتەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئوممو سولەیم! خواردنت چی هەیە بی هێنە ئەویش کولێرەکانی هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری دا وردیان کردن، ئوممو سولەیمیش هیزوڵکەیەکی هێناو گوشی بەسەر نانەوڵەکەداو پێی چەورکردو بوو بە پێخۆریو بوو بە چنگاڵ، ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەندەی خودا حەزکا دووعای بەسەردا خوێندو فەرمووی: فەرمووی دەکەس بکە فەرموویان لە دەکەس کردو دەکەس چوونە ژوورەوەو تا تێریان خوارد چنگاڵیان خواردو ئەنجا چوونە دەرەوە ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەموو جارێ دەیفەرموو: رێگەی دەکەسی تریش بدە وە دەکەسی تر دەچوونە ژوورەوە تێرچنگاڵیان دەخواردو دەهاتنە دەرەوە، هەتا پیاوەکان هەموویان تێرو پڕ نانو چنگاڵیان خوارد. ژمارەیان دەوری حەفتا – هەشتا پیاوێ دەبوو (ش/ت/ن).

٣١٧٧– عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا حُفِرَ الْخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَمَصًا شَدِيدًا، فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِي فَقُلْتُ: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ فَإِنِّي رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَمَصًا شَدِيدًا. فَأَخْرَجَتْ إِلَيَّ جِرَابًا فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَلَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ فَذَبَحْتُهَا، وَطَحَنَتِ الشَّعِيرَ فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِي، وَقَطَّعْتُهَا فِي

بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: لاَ تَفْضَحْنِي بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِمَنْ مَعَهُ. فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وَطَحَنَّا صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ كَانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ وَنَفَرٌ مَعَكَ. فَصَاحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا أَهْلَ الْخَنْدَقِ، إِنَّ جَابِرًا قَدْ صَنَعَ سُورًا فَحَيَّ هَلاً بِكُمْ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، وَلاَ تَخْبِزُنَّ عَجِينَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ. فَجِئْتُ وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْدُمُ النَّاسَ حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِي، فَقَالَتْ بِكَ وَبِكَ. فَقُلْتُ قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي قُلْتِ. فَأَخْرَجَتْ لَهُ عَجِينًا، فَبَصَقَ فِيهِ وَبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا فَبَصَقَ فِيهَا وَبَارَكَ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ادْعِي خَابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ وَاقْدَحِي مِنْ بُرْمَتِكُمْ وَلاَ تُنْزِلُوهَا، وَهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللَّهِ لَقَدْ أَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ وَانْحَرَفُوا، وَإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كَمَا هِيَ، وَإِنَّ عَجِينَنَا لَيُخْبَزُ كَمَا هُوَ. رواه البخاري في غزوة الخندق[٢]:

جابیر (خوای لێ خۆش نوود بێ) گوتی: رۆژی غەزای خەندەق، لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکەکەدا سەرنجم دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەواو برسیبوو، جا چوومەوە بۆ لای ژنەکەم پێم گوت: هیچمان هەیە؟ دەبینم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەواو برسییەتی، ئەویش هەمانەیەکی هێنا مەنێ جۆی تیا بوو، بەرخۆلەیەکی دەستەمۆشمان هەبوو ئەویشم سەربڕی، جا ئەو جۆکەی هاڕیو منیش بەرخەکەم جنیو کردمە ناودیزەکەیەوەو هەردوکمان پێکەوە لێ بووینەوە ئیتر ویستم بچمەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ژنەکەم گوتی: ها روو زەردم نەکەی، نەچی پێغەمبەرو ئەو هەموو عەشاماتەی کە لە گەڵیایەتی هەموویان خوڵك بکەیو ئەو هەموو خەڵکە برژێنی بە سەرما، چونکە نانەکە کەمەو بەشی ئەوەندە ناکا منیش چووم بەچپە عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرخۆلەیەکمان سەربڕیوەو مەنێ جۆشمان هاڕیوە، خۆتو چەن کەسێ بفەرموون وەرن بۆ نیوە رۆژە، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بانگەوازی هەڵداو فەرمووی: ئەی ئەهلی

---

[٢] بخاري. مغازي: ٤١٠١، ٣٠٧٠، ٤١٠٢ {تجريد/ ٤ ل – ٢٩٠ رقم: ١٥٥٠} + {رياض/ ٢ ل – ٨٧ رقم: ٥٢٠/٣٠. بخاري: ٤١٠١. مسلم: ٢٠٣٩}.

خەندەق! جابیر قاوەڵتی: نیوەڕۆژەی دروست کردووە، بفەرموون بە زوویی بچین! ئینجا فەرمووی: نە مەنجەڵەکەتان دابگرنو نە هەویرەکەتان بکەن بە نان تا خۆم دێم جا منیش گەڕامەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) وە پێش مەردومەکە کەوتو هات، کە چوومەوە ژنەکەم گوتی: واوات لێ بێ بۆ وات کرد؟ گوتم: من هەر ئەوەم گوت بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە خۆت گوتت، ژنەکە هەویرەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تفی پیرۆزی خۆیی تێ کردو نزای پیرۆزیی بەسەردا خوێندو ئەنجا چوو بۆ لای مەنجەڵەکەو تفی کردە ئەویشو نزای پیرۆزیی بەسەردا خوێندو فەرمووی: ژنێکی نانکەری تریش بانگ کە با نانت لەگەڵدا بکاو چێشتەکەش بە ئەسکوێ لە مەنجەڵەکە تێبکەو لەسەر ئاگرەکە دایمەگرن خەڵکەکە هەزار کەس بوون سوێندم بە یەزادنی پاك تا توانییان خواردیان هەتا لێیان مایەوەو هێشتا مەنجەڵەکەمان وەك خۆی مابوو قوڵتەی دەهات، وە هەویرەکەشمان وەك خۆی مابوو کەمی نەکردبوو! (ب).

٣١٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: لَمَّا كَانَ غَزْوَةُ تَبُوكَ أَصَابَ النَّاسَ مَجَاعَةٌ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أَذِنْتَ لَنَا فَنَحَرْنَا نَوَاضِحَنَا فَأَكَلْنَا وَادَّهَنَّا. فَقَالَ: افْعَلُوا. فَجَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ فَعَلْتَ قَلَّ الظَّهْرُ وَلَكِنِ ادْعُهُمْ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ ثُمَّ ادْعُ اللَّهَ لَهُمْ عَلَيْهَا بِالْبَرَكَةِ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَ فِي ذَلِكَ. (أي بركةً وخيراً) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَعَمْ. فَدَعَا بِنِطَعٍ فَبَسَطَهُ ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِكَفِّ ذُرَةٍ وَيَجِيءُ الآخَرُ بَكَفِّ تَمْرٍ وَيَجِيءُ الآخَرُ بِكِسْرَةٍ حَتَّى اجْتَمَعَ عَلَى النِّطَعِ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ يَسِيرٌ قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ بِالْبَرَكَةِ ثُمَّ قَالَ: خُذُوا فِي أَوْعِيَتِكُمْ. قَالَ: فَأَخَذُوا فِي أَوْعِيَتِهِمْ حَتَّى مَا تَرَكُوا فِي الْعَسْكَرِ وِعَاءً إِلاَّ مَلأُوهُ، قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا وَفَضِلَتْ فَضْلَةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ لاَ يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فَيُحْجَبَ عَنِ الْجَنَّةِ[٣].

[٣] مسلم. لقطة: ٤٤٩٣ ، ١٣٧ ، ١٣٨.

ئەبو هورەیرە – یا ئەبو سەعید (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لە غەزای تەبووکدا خەڵکەکە تووشی برسێتییەکی سەخت بوون. گوتیان: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! ئەگەر بفەرمووی‌و ڕێگەمان بدەی وشترەکانمان سەر دەبڕین، هەم گۆشتەکەیان دەخۆین‌و هەم بەزەکەیان دەکەین بە پیوو ڕۆن فەرمووی: باشە وا بکەن بەڵام عومەر هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئەمە بکەی وشتری سواری کەم دەبێتەوە، وەلێ بانگیان بکە با ئەو بنبۆڵ‌و پاشەڕۆکەی لە بنی نانە بەرەکانیاندا ماوە بیهێنن‌و تۆ نزا بخوێنە بە سەریا کە خوا پیت‌و فەڕی تێ بخا بۆیان، سا بەشکوو خودا پیت‌و فەڕی تێ بخات. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باشە وا دەکەم ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری دا لەسەر فەرمانی ئەو کەوڵێکیان هێنا بۆی‌و ڕایخست‌و دەستووری دا، جا ئەو بنبۆڵ‌و پاشەڕۆکەی لەناو تۆێشەبەرەکانیانا مابوو هێنایان، پیاوی وا هەبوو پڕ لەپێ گەنمە شامی دەهێنا، هی وا هەبوو لوێچێ خورمای دەهێنا، یەکێ تر کەرتە نانێکی دەهێنا، هەتا لەم هەمە جۆرو هەڕەمەیە هەنێ شت کۆکرایەوەو دانرا لەسەر کەوڵەکە، گوتی: ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نزای پیت‌و بەرەکەتی بەسەریدا خوێندو فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) دەی هەڵگرن‌و بیکەنە دەفرەکانتانەوە! گوتی: ئەوانیش لێیان دەبردو لێیان دەکردە جەواڵەکانیانەوە هەتا لەو لەشکرەدا دەفر نەما کە پڕی نەکەن لەو توێشەیە! گوتی: ئەنجا دەستیان کرد بە لێخواردنی‌و لێیان خواردتا تێربوون، کەچی هێشتا پاشخوان هەرمابوو! ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گەواهو شایەتی دەدەم کە هەر یەزدانی پاك خودای بە ڕاستییە، وە منیش پێغەمبەری خودام، هەربەندەیێ – بەم دوو وشەیەوە – بچێتەوە دیداریی خودا، بە مەرجێ بەبێ سووو گومان باوەڕی بە ناوەڕۆکەکەیان هەبێ، ئەوە ئەو بەندەیە نا ئومێد نابێ لە بەهەشت (م).

٣١٧٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَطْعِمُهُ فَأَطْعَمَهُ شَطْرَ وَسْقِ شَعِيرٍ فَمَا زَالَ الرَّجُلُ يَأْكُلُ مِنْهُ وَزَوْجَتُهُ وَضَيْفُهُمَا حَتَّى كَالَهُ فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: لَوْ لَمْ تَكِلْهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ وَلَقَامَ لَكُمْ. رواهما مسلم[٤]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داوای خەلەی لێ کرد بۆ نان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نیو وەسق جۆی دایە. ئیتر بەردەوام کابرا خۆیو ژنیو میوانیان لێی دەخۆنو هەر تەواو نابێ، هەتا پیاوەکە دەچێ دەی پێوێ ئیتر پیتو بەرەکەتی نامێنێو تەواو دەبێ پیاوەکە هاتەوە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر نەتپێوایە هەر لێتان دەخواردو تا ماوەیەکی زۆر ژێوارتان پێی دەچوو بەرێوە (م).

٣١٨٠- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَتَدَاوَلُ مِنْ قَصْعَةٍ مِنْ غُدْوَةٍ حَتَّى اللَّيْلِ يَقُومُ عَشَرَةٌ وَيَقْعُدُ عَشَرَةٌ. قُلْنَا فَمَا كَانَتْ تُمَدُّ قَالَ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَعْجَبُ مَا كَانَتْ تُمَدُّ إِلاَّ مِنْ هَا هُنَا وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى السَّمَاءِ. رواه الترمذي بسند صحيح. نسأل الله أن يعمنا ببركته (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

سەموورەی کوڕی جوندوب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران کە لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دەبووین، لە بەیانییەوە هەتا شەوێ لەیەك قەرەوانە دەمانخوارد، دە هەڵ دەسانو دەی تر لەسەری دادەنیشتن گوتمان: ئەی باشە لە کوێوەوە خواردنی بۆ دەهاتو کێ پری دەکردەوە؟ گوتی: سەیرت لەچی دێ؟! ئا لێرەوە بۆی دەهات! بەنجەی هەڵبری بۆ ئاسمان واتە: لە خوداوە پیتو فەری تێ دەکەوت، تا ببێ بە موعجیزە بۆ پێغەمبەر (ت-س/ص) لە خودا داوا دەکەین کە بە گشتی پیتو فەری پێغەمبەری پیرۆز بمانگرێتەوە. منیش کە وەرگێڕم دەڵێم:

---

[٤] مسلم. فضائل: ٥٩٠٥.

خۆشەویستی خوا نەحمەدی نازار!

تا چەکەرەو چووز شین دەکا بەهار

تا خوا دەڵێ بەس، تا خۆت دەڵێی: نێ

سەڵاوات لە تۆ بە سەدان هەزار!

## ١٠٧) یەکێکی تریان ئەوە بووە نانو خواردەمەنی لەبەر دەستیدا تەسبیحاتی کردووە دروودی خودای لەسەر : (ومنها تسبيح الطعام بين يديه ﷺ)

٣١٨١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ الآيَاتِ بَرَكَةً وَأَنْتُمْ تَعُدُّونَهَا تَخْوِيفًا، كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَقَلَّ الْمَاءُ فَقَالَ: اطْلُبُوا فَضْلَةً مِنْ مَاءٍ. فَجَاءُوا بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ قَلِيلٌ، فَأَدْخَلَ رَسُولُاللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ الْمُبَارَكِ، وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللَّهِ. فَلَقَدْ رَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَلَقَدْ كُنَّا نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ (أي بين يدي النبي – شرحه) وَهُوَ يُؤْكَلُ. رواه البخاري والترمذي بلفظ: كُنَّا نَأْكُلُ الطَّعَامَ مَعَ الطَّعَامَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ[1]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئێمە جاران رووداني نیشانەو عەلاماتو خەواریقمان بە پیتو فەڕ دادەنا، کەچی ئێوە ئەمە بە هەڕەشەو گوڕەشە دادەنێن، جارێ لە سەفەرێکا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) بووین، ئاو هاتە کەمی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): چۆڕێ ئاو پەیداکەن جا حاجەتێکیان هێنا کەمێ ئاوی تیا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی کرد بەناو حاجەتەکەداو فەرمووی: فەرموون وەرن بۆ سەر ئەم ئاوە پاکە فەڕ دارە، پیتو بەرەکەتیش لەسەر خودا، ئیتر بە چاوی خۆم دیم کە ئاوەکە لە نێوانی پەنجەکانیەوە هەڵدەقولا!! وە گەلێ جار گوێمان لە خواردەمەنی دەبوو

[1] بخاري.مناقب: ٣٥٧٩. تجريد/ ٤ ل — ١١٢ رقم: ١٤٣٠.

لەکاتی خواردنیا لە خزمەتی پێغەمبەردا بە زمانی حاڵو بە زمانی گوتن تەسبیحاتی خودای دەکرد، وەك ئەوە بە شێوەیەکی ڕەوانو ئاشکراو بیستراو دەیگوت: سبحان الله وبحمده (ب/ت) گفتەی (ت): گەلێ جار لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) جۆرەها خواردەمەنیمان دەخوارد، بە گوێی خۆمان گوێمان لێ بوو کە ئەو خواردەمەنییانە تەسبیحاتی خودایان دەکرد دیسان دەڵێم:

ئەی خۆشەویستی گەلی کورد زمان!

ئەحمەدی سەروەر، تاجی سەر سەرمان!

بەقەد گەڵاو گیاو گوڵی کوردستان

بارانی ڕەحمەت بدا لە گۆڕتان

### ١٠٨) موعجیزەیەکی تریان ئەوە بووە هەنێ خورمای کەمی زۆر کردووە هەتا بەتەواوی بەشی دانەوەی قەرزی خاوەن قەرزەکانی کردووە:
### ومنها تكثير التمر القليل حتى استوفى الغرماء

٣١٨٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: تُوُفِّيَ أَبِي وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: إِنَّ أَبِي تَرَكَ عَلَيْهِ دَيْنًا وَلَيْسَ عِنْدِي إِلاَّ مَا يُخْرِجُ نَخْلُهُ، وَلاَ يَبْلُغُ مَا يُخْرِجُ سِنِينَ مَا عَلَيْهِ، فَانْطَلِقْ مَعِي لِكَيْ لاَ يُفْحِشَ عَلَيَّ الْغُرَمَاءُ. فَمَشَى حَوْلَ بَيْدَرٍ مِنْ بَيَادِرِ التَّمْرِ فَدَعَا ثُمَّ آخَرَ، ثُمَّ جَلَسَ عَلَيْهِ فَقَالَ « انْزِعُوهُ ». فَأَوْفَاهُمُ الَّذِي لَهُمْ، وَبَقِيَ مِثْلُ مَا أَعْطَاهُمْ. رواه البخاري[1]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: باوکم کە مرد قەرزار بوو چوومە لای حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) عەرزیمکرد: قوربان! باوکم مردووەو قەرزی لەسەرە، منیش هەر ئەوەم هەیە کە باخە خورماکەی خۆی دەیگرێ بەرووبوومی ئەو باخەش بە چەند ساڵێ هێشتا بەشی دانەوەی قەرزەکەی کە

---

[1] بخاري. مناقب: ٣٥٨٠.

لــە ســەریەتی ناکــا، جــا بفــەرموو وەرە لەگــەڵما نــەبادا خــاوەن قــەرزەکان قسەیەکی ناشیرین بکەن لە رووما. جا تەشریفی هاتو سووڕایەوە بە دەوری یەکێ لە خەرمانە خورماکانداو لە خودا پاڕایەوەو ئینجا خولایەوە بە دەوری خەرمانێکی تریشداو لەپاشا چووە سەریو لەسەری دانیشتو فەرمووی: دەی بیپێونو دەست بکەن بە دانەوەی قەرزەکانیان ئیتر خورماکەیان کێش دەکردو حەزرەت قەرزەکانی بە تەواوی دانەوەو هێشتا لە بەرەکەتی ئەوەوە چەندی دایەوە بە وان ئەوەندەی تریشی لێ مایەوە بۆ خۆمان (ب).

## ١٠٩) موعجیزەیەکی تریان ئەوە بووە بنکەدار خورما کورکاندوویەتی بۆیو وەك منداڵ لە دوای گریاوە ﴿درودی خوای لەسەر﴾ : (ومنها حنين الجذع له ﷺ)

٣١٨٣- ← (ب – ١ ز – ١١٩ ل –ف – ٢). وَفِي هَذِهِ الرِوَايَةِ : عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ الْمَسْجِدُ مَسْقُوفًا عَلَى جُذُوعٍ مِنْ نَخْلٍ فَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَطَبَ يَقُومُ إِلَى جِذْعٍ مِنْهَا، فَلَمَّا صُنِعَ لَهُ الْمِنْبَرُ، وَكَانَ عَلَيْهِ سَمِعْنَا لِـذَلِكَ الْجِـذْعِ صَوْتًا كَصَوْتِ الْعِشَارِ، حَتَّى جَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا فَسَكَنَتْ. وَفِي رِوَايَةٍ : فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ وَرُفِعَ إِلَى الْمِنْبَرِ، فَصَاحَتِ النَّخْلَـةُ صِيَاحَ الـصَّبِيِّ. رواه البخاري والنسائي والترمذي بلفظ: فَحَنَّ الْجِذْعُ حَنِينَ النَّاقَةِ فَنَزَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَسَّهُ فَسَكَنَ[١]:

گێڕانەویــەی ئێــرە ئاوایــە: جــابیر (خــودای لێ رازی بــێ) گــوتی: ســەربانی مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر چەند کۆڵەکەیەکی دارخوما دروســت کرابــوو، لــە پێــشدا پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەربێ) کــە وتــاری دەخوێنــدەوە لــە پــاڵ یــەکێ لەوکۆڵەکــە دارخورمایانــەدا رادەوەســتاو شــانی پێوەی دەدا، بــەڵام لــە پــاش دا کاتــێ دووانگــە (مینبــەرە)کــە دروســت کــراو پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەربێ) چووە ســەریو ئــەو کۆڵەکەیــەی بــەجێ هێشت

---

[١] تقدم برقم: ٧٢٩/٢ مجلد أول تسلسل/١١٩.

گوێمان لێ بوو ئەو بنکەدار خومایە وەك وشترێ لەسەر گوان بێ، یا وشترێ تازە زابێ ئاوا دەیکوروکانو بە دوای پێغەمبەردا وەکی منداڵ لە شوێنی دایکی بگری، ئاوا دەگریا تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ لایو دەستی کردە ملی، ئەوجا داسەکناو بێ دەنگ بوو لە گێڕانەوەیەکا: کە رۆژی هەینی هاتو دوانگەکە دانراو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چووە سەری، ئەو کۆڵەکە دارخورمایە وەك منداڵ هاواری لێ هەڵسا! (ب/ن/ت) گفتەی (ت): ئەو بنکەدارە وەکوو وشترە مێنگە کورکاندی، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مینبەرەکە دابەزیو چوو بۆلایو دەستی پیادا هێنا، ئیتر کشو مات بوو.

٣١٨٤- قَالَ الإمام العلاّمة العيني في علامات النبوة في شرح حديث صحيح البخاري السّابق (رَضِيَ أَللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) ما يلي: وفي حديث أنسٍ عند أبي عوانة وابن خزيمة وأبي نعيم: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ أَلْتَزِمْهُ لَمَا زَالَ هَكَذَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، حُزْناً عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ أَمَرَ بِهِ فَدُفِنَ. وروى الدَّارميّ حديث بُريدة: إنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهُ: اخْتَرْ أَنْ أَغْرِسَكَ فِي الْمَكَانِ الَّذِي كُنْتَ فِيهِ، فَتَكُونَ كَمَا كُنْتَ، يفيَ قَبْلَ أَنْ تَصِيرَ جِذْعاً، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ أَغْرِسَكَ فِي الْجَنَّةِ فَتَشْرَبَ مِنْ أَنْهَارِهَا وَعُيُونِهَا فَيَحْسُنَ نَبْتُكَ وَتُثْمِرَ، فَيَأْكُلَ مِنْكَ أَوْلِيَاءُ اللّٰهِ مِنْ ثَمَرَتِكَ وَنَخْلِكَ فَعَلْتُ. فَقَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخْتَارُ أَنْ تَغْرِسَنِي فِي الْجَنَّةِ – المترجم.

ئیمامی عەینی (خودای لێ رازی بێ) لە باسی عەلاماتو نوبووەدا لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا دەڵێ: ئەبو عەوانەو ئیبنو خوزەیمەو ئەبو نەعیم لە ئیمامی ئەنەسەوە (خودا لە هەموویان خۆش نوود بێ) دەگێڕنەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی من وا لە دەسیا، ئەگەر ئاوا نەمگرتایەتە باوەش هەتا رۆژی قیامەت ئەمە حاڵی بوو ئاوا بۆ پێغەمبەری خوا خەمبارو پەرۆش دەبوو، لە پاشا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی دا چاڵێکیان بۆ کۆتەرەدارەکە هەڵکەندو ناشتیان لە ناوی دا وە هەر لەوێ دا دەڵێ: دارەمی دەگێڕێتەوە لە بورەیدەوە (خوا لێیان رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: خۆت سەرپشك بە ئەگەر حەز دەکەی ئەوا لە

**شوێنەکەی جارانی خۆتا دەتنێژمەوە وەك جاری جاران سەوز دەبیتەوە، واتە: وەکی پێش ئەوەی کە ببڕێتو بکرێیت بە کۆڵەکە، ئەگەر حەزیش دەکەی ئەوا بە دەستی خۆم دەتکەم بە نەمامو لە خاکی بەهەشتا دەتنێژمەوە! جا بۆ خۆت ئاو لە رووبارەکانی دەخۆیتەوەو زۆر بە جوانی دەڕوێیتەوەو گەورە دەبیو بەر دەگریو خۆشەویستو دۆستانی خودای گەورە لە بەرەکەت دەخۆن! ئەویش عەرزی حەزرەتی کرد: ئەوەیان هەڵ دەبژێرم کە خۆت لە بەهەشتا بمکەی بە نەمامو بمنێژی! (وەرگێڕ)[1].**

---

(١) دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەلەمی کە لەناو مەلایانو مامۆستایانی ئایینیدا مەشهوورە بە مەلا مستەفای زەڵمی گێڕایەوە گوتی: لە کتێبە نوێکاندا خوێندوومەتەوە زانایەکی گەورە دەیەوێ پەیوەندیی (عەلاقە)ی نێوانی گیانلەبەرانو دارو درەختو گژو گیا بە یەکەوە تاقی بکاتەوە، تا بزانێ: ئایا هۆگری یەکتریی دەبن یانا، دۆستایەتیو برادەریی لەناو خۆیان دا دەگرن یانا، جا مانگایێ دێنێ، ماوەی چەند ساڵێ دەیبەستێتەوە بەبنکی درەختێکەوەو لەپاشدا لەبن ئەو دارەدا مانگا کەسەر دەبڕێ، وە بە چەند دەسگایەکی فرە پێشکەوتووی دۆزەرەوە (أجهزة اکتشاف متطورة) چاو دێریی رەفتار (سولووك)ی درەختەکە دەکا، تا بزانێ هیچ هەستێ، سۆزێ، میهرەبانییە، جەو جووڵێ، شتێ لەم بابەتە نیشان دەدا، یا هەست بەم کارەساتە تازەیە دەکا کە بەسەر دراوسێ کۆنەکەی هاتووە یا نا.

گوتی: جا لە ئەنجامدا دەزگاکان هەستو رەفتارێکی گەڵێ سەیرو عەنتیکە لە درەختەکە تۆمار دەکەن، باش تۆماری دەکەن کەوا درەختەکە لە ناخی دەروونەوە لەرزە وجمەو جەو جووڵو بزووتنەوەیەکی سەیری تێ دەکەوێ، وە لە ناخەوە زۆر پەستو پەرۆشە بۆ مانگاکەی هاوسای وەك دەریا شەپۆل دەداو وەکی مەنجەڵی سەر ئاگر کوڵو فوڵ دەدا، بەلام ئەم رەفتارەی درەختە کە بە هەستیاری ئاسایی وەك پێنج هەستەکە، هەستی پێ ناکری!

جا ئەم داستانەیە ئەم سەر گوزەشتەیەی ناو ئەم فەرموودەیە بتەو دەکاو دەبێ بە بەڵگەو شایەتی زانستی، وە لە هەمان کاتدا دەری دەخا: کە مەگەر هەر پەروەردگار خۆی نهێنییەکانی ئەم بوونەوەرە گەورەو بەرینە بزانێ، بۆیە منیش لێرەدا گێڕامەوە بەندە بەم بۆنەیەوە دەڵێم: خۆزگا گەلی کورد دراوسێی کۆتەرەداری بوایە! تا لەکانی سەربڕینو کەوڵکردندا ئامێرە پێشکەوتووەکان دڵسۆزییو هاودەردیی کۆتەرە دارەکەیان تۆمار بکردایە! چونکە وادیارە

## ١١٠) موعجیزەیەکی تریان ئەوە بووە دارو درەخت شوێنی کەوتوونو بەگوێیان کردووە : (ومنها انقیاد الشجر له ﷺ)

٣١٨٥- عَنْ جَابِرَ قَالَ: سِرْنَا مَعَ رَسُولَ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى نَزَلْنَا وادياً أَفيح فَذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْضِي حَاجَتَهُ فَأَتْبَعْتُهُ بِإِدَاوَةٍ مِنْ مَاءٍ فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَرَ شَيْئًا يَسْتَتِرُ بِهِ، فَإِذَا شَجَرَتَانِ بِشَاطِئِ الْوَادِي فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى إِحْدَاهُمَا فَأَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا فَقَالَ: انْقَادِي عَلَيَّ بِإِذْنِ اللَّهِ تَعَالَى. فَانْقَادَتْ مَعَهُ كَالْبَعِيرِ الْمَخْشُوشِ الَّذِي يُصَانِعُ قَائِدَهُ حَتَّى أَتَى الشَّجَرَةَ الأُخْرَى، فَأَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا فَقَالَ: انْقَادِي عَلَيَّ بِإِذْنِ اللَّهِ تَعَالَى. فَانْقَادَتْ مَعَهُ كَذَلِكَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالْمَنْصَفِ فِيمَا بَيْنَهُمَا لأَمَ بَيْنَهُمَا يَعْنِي جَمَعَهُمَا فَقَالَ : الْتَئِمَا عَلَيَّ بِإِذْنِ اللَّهِ

---

ئێشو ئازارو دەردەکەیان ئەوەندە سووكو ئاسانە تەنانەت خۆشیان بە هەستیارە ئاساییەکان، کە پێنج هەستەن، هەستیان پێ ناکەن! بەڵام چ سوود! بۆیە دەڵێم:

**لالۆ! بەسیەتی گلەو سکاڵ**

**بەپێی باڵایە، برا لە! کاڵ!!** (وەرگێڕ - ١٩٨٤/٨/٧)

وەڵێ ئێستا کە (١٩٨٨/١٠/١٢)ە پشت بە خودا دەڵێم:

**ئاسمان! نومێدی گەورەی هەموومان**

**گەر تۆش نەپپرسی دادی مەڤلووەمان**

**زاڵم بردیەوە هاوار بە ماڵمان**

**دوشمنمان نەبینێ حاڵی بە حاڵمان!!**

ئێستایش کە (٢٠٠٧/٨/٢٥)ە دەڵێم: سوپاس بۆخودای گەورە، ئاسمان دادی پرسین، تۆڵەی بەرودوای لە زاڵمەکەمان سەند. بەڵام دیسان ئەم تێبینییە دەکەم: (کە زەندیقیو کفر بمانباتەوە سەر سفر) دەڵێین: کاك ئەحمەدی شێخ کە عوسمانلی سلێمانی چۆڵ دەکا. هانی خەڵکەکە دەدا کە شاربەدەریان کەن، وە خۆشی بە بەردباران هەتا قلیاسان دوایان دەکەوێ، بەلامکاتێ بابانەکان کاروبار دەگرنە دەستو سەردەکەنە مەستیو رابواردنو بێ دینیو بێ رەوشتی، وەك ئێستای کوردستانی ئازادی خۆمان کاتێ سوپای عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانیو پایتەختی مولکی بابان داگیردەکەنەوە کاك ئەحمەد هەتا بەکرەجۆ دەچێ بە پیریانەوەو سوژدەی شوکر دەبات جا خوا بکا ئێمەش ئەمە نەبینین. (وەرگێڕ)

تَعَالَى. فَالْتَأَمَتَا قَالَ جَابِرٌ: فَخَرَجْتُ أُحْضِرُ مَخَافَةَ أَنْ يُحِسَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقُرْبِي فَيَبْتَعِدَ أَوْ فَيَتَبَعَّدَ فَجَلَسْتُ أُحَدِّثُ نَفْسِي فَحَانَتْ مِنِّي لَفْتَةٌ فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُقْبِلٌ وَإِذَا الشَّجَرَتَانِ قَدِ افْتَرَقَتَا، فَقَامَتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا عَلَى سَاقٍ. فرايت رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وقف وقفةً فقال براسه هكذا، ثم أقبل فلما انتهى إلى قال: يا جابر هل رأيت مقامي؟ قلت: نعم يا رسول الله. رواه مسلم في حديث طويل لأبى اليسر (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) وسيأتى انشقاق القمر فى سورة اقتربت الساعة وانشق القمر فى التفسير إن شاء الله[1].

دەق (نەصص)ی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا گەلێ درێژە، لەبەر ئەوەی گەلێ سوودی هەیە وا لێرەدا دەیکەم بە کوردی، لە بەرگی هەژدەهەمی شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم (خودایان لێ ڕازی بێ) دەقی فەرموودەکە بەم جۆرەیە: عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامت (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: منو باوکم دەرچووینو ڕۆیشتین بۆ ناو هۆزی یاریدەدەران تا نەمردوونو ماون فێری عیلمو زانست ببین لێیان، یەکەم کەس کە تووشی بووین ئەبول یەسەر بوو – کە هاوڕێی پێغەمبەر بوو – (درودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوبێ) خولامێکی خۆیی لەگەڵ دابوو، خولامەکە پڕ بە قولێ تۆمارو پەڕە کاغەزی لوول دراوی پێ بوو، ئەبولیەسەر خۆی عابایەکی میلدارو مەعفیرییەکی لەبەردا بوو، خولامەکەشی هەروەها، جا باوکم پێی گوت: ئەی مامە! دەتبینم تووڕە دیاریت، گوتی: ئا، تووڕەم، چەردەیێ مالم لەسەر فیساری کوڕی فیساری ئەل-حەرامی بوو، چووم بۆ ماڵیانو سلاوم کردو گوتم: فیسارە کەس لە ماڵە؟ گوتیان: نەء، منالێکی هەراشی هەبوو هاتە دەرەوە، لێم پرسی: باوکت لە کوێیە؟ گوتی: گوێی لە دەنگی تۆ بوو خۆی کرد بە تەختە بەندەکەی دایکماو لەناو کولێنەکەدا خۆی حەشار داوە، منیش گوتم: وەرە دەرەوە، دەزانم لە کوێی: ئەویش هاتە دەرەوە، گوتم: بۆچی خۆتم لێ دەشاریتەوە؟ گوتی: بەخودا بەبێ درۆ ڕاستت

---

[1] مسلم. زهد: ٧٤٣٧.

پێ دەڵێم، بە خودا لەوە ترسام نەبادا قسەت بۆ بکەمو درۆزن دەرچمو بەڵێنتپێ بدەمو بۆم نەچێتە سەر، ئەمە لە کاتێکا کە تۆ هاوڕێی پێغەمبەر بوویتو شتی وا لەگەڵ تۆدا زۆر ناشایستەیە! سوێندم بە خودا دەستیشم کورتەو قەرزاریشمو نەدارام گوتی: گوتم: توخوا ئەمە وایە؟ گوتی: بە خودا وایە، گوتم: تۆ خودا؟ گوتی: بە خودا، گوتم: تو خودا؟ گوتی: بە خودا، گوتی: ئیتر ئەبولیسەر قەواڵەکەی دێنێو دەیکوژێنێتەوەو پێی دەڵێ: ئەگەر بووت بمدەرەوە، دەنا گەردنت ئازادبێ، جائەبو لیەسەر دوو پەنجەی نایە سەر هەردوو چاوی خۆیو گوتی: گەواهو شایەتی دەدەم کە بەم دووچاوەی خۆم چاوم لە پێغەمبەر بوو، وە بەم دوو گوێیەی خۆم گوێم لێی بوو، وە دەستی برد بۆ سەر بەندی دڵیو گوتی: وە بەم دڵەی خۆم بە باشی لێی حاڵی بووم لەو کاتەدا کە دەیفەرموو: هەر کەسێ مۆڵەتی قەرزارێکی نەدارا بدا، یا شتێ لە قەرزەکەی سەری دابشکێنێ بۆی خودا دەیباتە بەرسێبەری ڕەحمەتی خۆی! گوتی: منیش پێیم گوت: ئەی مامە! خۆزگە تۆ عابامیلدارەکەت لە خولامەکەت دەسەندو مەعافیرییەکەی خۆتت دەدا بەو، یا بە پێچەوانەوە، هەتا هەر کەسەتان سەرو دەستێ بەرگی لە یەك ڕەنگی لە بەردا بوایە! ئەویش دەستی هێنا بە سەرماو گوتی: خودایە! پیتو فەڕت تێ کەوێ، ئەی برازای خۆم! بەم دووچاوانەی خۆم چاوم لێ بوو، وە بەم دوو گوێچکانەی خۆم گوێم لێ بوو، وە بەم دڵەی خۆم دڵم لەلای بوو، وە لەم کاتەدا بە دەستی هێمای کرد بۆ بەندی دڵی خۆی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە هەمان شت کە خۆتان دەیخۆنو لە هەمان جلو بەرگ کە بۆ خۆتانی دەکەن نانو جلو بەرگیش بکەن بۆ بەندەو خولامەکانتان بۆیە منیش ئەوەم پێ باشترە کە لە پڕو پاتاڵی جیهان بەشی بدەم نەوەکوو لە ڕۆژی قیامەتا لە چاکەو خێرو خێراتم لە باتی ئەوە ببا بۆ خۆی، لە پاشا چووینە لای جابیری کوڕی عەبدوڵلا، لە مزگەوتەکەی خۆی بوو، لەوکاتەدا لەیەك لۆ جلدا نوێژی دەکرد، ئالاندبووی بە خۆیەوە، جا منیش بەناو خەڵکەکەدا هەنگاوم نا هەتا چووم لە بەینی ئەوو لە بەینی قیبلەدا،

دانیشتمو گوتم: بەر رەحمەتی خودا کەویت! چۆن بەیەك لۆ جلەوە نوێژ دەکەی، ئەمە لە کاتێکا کە ئەوە بالاٚ پۆشەکەتە لە لاتا، گوتی: جا ئەویش چەمۆڵەیەکی نا لە سێنگمو گوتی: مەبەستم ئەوەیە کە گەوجێکی وەك تۆ بێت بۆلامو بم بینێ کە من چی دەکەم تا ئەویش ئاوا بکا، لەم مزگەوتەی حازریەدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هات بۆلامان دارکی هێشووە خورمایەکی ئیبنو طابی بە دەستەوە بوو، بە رووی رووگەی مزگەوتەوە کڵمێکی دی، جا بە نووکی لاسکی هێشووە خورماکە چڵمەکەی کڕاند، ئەوجا رووی کردە ئێمەو فەرمووی: کێتان پێی خۆشە کە خودا رووی لێ وەرگێڕێ. گوتی: ئێمەیش سەرمان کزکردوو سامان لێ نیشت، دیسان فەرمووی: کێتان پێی خۆشە کە خودا رووی لێ وەرگێڕێ گوتی: دیسان سەرمان کزکردوو سام دایگرتین، دیسانەوە فەرموویەوە: کێتان پێی خۆشە کە خودا رووی لێ وەرگێڕێ، جا گوتمان: کەسمان، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەی کاتێ یەکێ لە ئێوە هەڵدەستێ بۆ نوێژ ئەوە خودای گەورەو پیرۆز روو بە روویەتیو بەرەورووویەتی کەواتە با تف رۆ نەکاتە بەر دەمی خۆی، وە هەروەها نەشیکاتە لای راستی خۆی با لە لای چەپییەوە تف بکاتە ژێر پێی چەپی، وە ئەگەر لە ناکاو تفێ، بەڵغەمێ، چڵمێ زۆری بۆ هێنا با بەلایەکی جلەکەی ئاوای لێ بکا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) جلەکەی نووشتانەوەو وڵی بەیەکا واتە ئاوای لێ بکا. ئینجا فەرمووی: هەنێ عەبیر واتە بۆنی خۆشم بۆ بێنن جا کوڕێکی لاو لەناو خەڵکەکەدا هەڵسا، بە هەڕاکردن چوو لە ماڵەوە لە ناو لەپیا هەنێ خەلووقی هێنا، کە شتێکی زۆر بۆن خۆشە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لێی وەرگرتو داینا لەسەر نووکی لاسکی هێشووە دارخورماکەو شوێنی کڵمەکەی پێ سواخ دا جابیر دەیگوت: ئا لەمەوەیە کە ئێستا ئێوە دەچن بۆنی خۆش دەدەن لە مزگەوتەکانتان!

لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) چووین بۆ غەزای بەطنی بوواط، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەگەڕا بۆ مەجدیی کوڕی عەمری ئەل-جوهەنی. لەو غەزایەدا تاقە وشترێکی ئاوکێش پێنج کەس، یا شەش کەس

یا حەوت کەس بەسەرە بەرو دوای یەکتری سواری دەبوون، جا پیاوێکی یاریدەدەر وشترێکی خۆی هەبوو سەرەی هاتە سەر کە سواربێ، وشترەکەی ییخ داو سواری بوو، کە ویستی هەڵی سێنێتەوە، ساوە ساوی دەکرد ئەویش گوتی: هەچچە، لەعنەتی خودات لێ بێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە کێ بوو لەعنەت لە وشترەکەی دەکا؟ گوتی: من بووم، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دابەزە لێی، لەگەڵ لەعنەت‌و نەفرین لێ کراوا هاوڕێتیی ئێمە مەکە، نزای خراپ لە خۆتان‌و لە ماڵ‌و مناڵتان مەکەن، مەبادا ڕێکەوتی ئەو کاتانە بکەن کە هەرچی لە خودا داوا بکرێ لەو کاتانەدا دەتان داتێ!. ڕۆیشتین لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا دەمەو ئێوارەیێ لە ئاوێ لە ئاوەکانی عەرەب نزیك بووینەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: چ پیاوێ لە پێش ئێمەوە دەڕوا ئەستێڵەکە سواخ دەداو ئامادەی دەکاو بەریانەکەی دەگرێ تا ئاوەکە ئەوق دەبێتەوە، هەم خۆشی ئاو دەخواتەوەو هەم ئاو بۆ ئێمەش ئامادە دەکا. جابیر گوتی: منیش هەڵسام‌و گوتم: قوربان! من دەچم، فەرمووی: کێی تر دەچێ لەگەڵ جابیردا؟ جەباری کوڕی صەخر هەڵسا گوتی: من جا من‌و ئەو تێمان تەقان تا چووینە سەربیرەکەو سەتڵێ دوو سەتڵ ئاومان هەڵگۆست‌و ئەستێڵی بەردەم بیرەکەمان سواخ داو ڕێکمان خست‌و ئینجا ئاومان لە بیرەکە هەڵکێشا هەتا ئەستێرەکەمان لیپان لیپ کرد لەئاو، جا یەکەم کەس کە هات‌و سەری هەڵدا بۆلامان پێغەمبەر خۆی بوو (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە یارمەتی ئێوە؟ عەرزمانکرد: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! ئیتر جڵەوی شل کرد بۆ وشترەکەی، وشترەکەی تێرئاوی خواردەوە، ئەنجا جڵەوەکەی توند کردەوەو وشترەکە گەڵی پان کردەوەو گمێزی کرد، ئەوجا وشترەکەی لادا لەسەر ئاوەکەو ییخی داو خستی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی هاتەوە بۆ سەر گۆمیلکەکەو دەسنوێژی لێ گرت‌و منیش هەڵسام‌و چووم لە شوێن دەسنوێژگەکەی پێغەمبەر دەسنوێژم گرت، جەباری کوڕی صەخریش چوو دەست بە ئاو بگەیەنێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵسا نوێژ بکا، منیش

یەك عابای میلدارم لە بەردابوو، ویستم دوو چمکەکەی راستو چەپ بکەم، پیاما نەگەیشتەوە، عاباکە هەنێ ریشوو گێزو گوڵنەگەی پێوە بوو، سەربەرەو خوارم کردەوەو ئەنجا لە ژێر هەردوو باڵمەوە هەر دوو، چمکەکەیم راستو چەپ کردو لە سەرسینگم گرێم دانو ملم کووڕ کردەوە بە سەریاو بە ملیش گرتم تا بەر نەبێتەوە ئەنجا چووم لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی گرتمو سووڕاندمیەوەو بردمی لەلای راستی خۆیەوە وەستاندمی، لە پاشدا جەبباری کوڕی صەخریش هاتەوەو دەسنوێژی گرتو هات لەلای چەپی پێغەمبەرەوە وەستا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی هەردووکمانی گرتو پاڵی پێوەناین بۆ دواوە هەتا رێك لە پشتی خۆیەوە ریزی کردینو رایوەستانین ئاگام لێ نەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەرنجی منی دەدا لە پاشا کە هەستم پێی کرد بە دەستی ئاوای کرد، واتە: ناوقەدت ببەستە، جا کاتێ کە لێ بووە فەرمووی: ئەی جابیر! گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ئەگەر جلەکە فەرەح بوو دووچمکە کەی راستو چەپ بکە، بەڵام ئەگەر تەسك بوو بیبەستە بە کەمەرتەوە. جا رۆیشتین لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەی ئادەمیزاد پێی بژی خۆراکی هەر پیاوێ لە ئێمە هەر رۆژەی یەك قل خورما بوو! جا ماوەیێ دەیمژیو لە پاشا گرێی دەدا لە قەراخێکی جلەکەیدا وە بە کەوانەکانیشمان گڵادارمان دەوەرانو دەمان خوارد، ئەوەندە گڵادارمان خواردبوو لالغاوەمان تەرەکی بوو، وە بوو بوو بە زام! سوێندم بە خودا رۆژێ پیاوێکمان بە هەڵە لە بیرچوو بوو، دەنکە خورماکەی نەدابوو پێی، ئێمە لەبەر بێ هێزی چووینە ژێر باڵیو بە لارەو لارو لەقە لەق بردمانو شایەتیمان بۆی دا کە وەری نەگرتووە، ئەوجا دەنکە خورماکەی دا پێی، ئەویش هەڵسا وەری گرت. لەگەڵ پێغەمبەردا کەوتینەرێو رۆیشتین هەتا گەیشتینە دۆڵێکی پانو پۆڕو بەرینو لەوێ لامان دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو دەست بە ئاو بگەیەنێ، منیش بە مەتارەیێ ئاوەوە شوێنی کەوتم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەماشای کرد هیچی نەدی کە خۆی لە پاڵدا حەشار بدا، لەوپەڕ

دۆڵەکەوە دوو درەخت هەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ لای یەکێکیان‌و لقێکی لێ گرت‌و بە درەختەکەی فەرموو: بە فەرمانی خودا شوێنم کەوەو لە دوام وەرە ئیتر وەك وشتری قەمتەر کراوی کەڵەمە لە لووت کە چۆن مامەحەمیی دەکا بۆ جڵەو کێشەکەی ئەو درەختەش ئاوا بە ملکەچی شوێنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کەوت، ڕۆیشت تا چووە لای درەختەکەی ترو پەلێکی لەویش گرت‌و بەویشی فەرموو: بە فەرمانی خودا وەرە لە شوێنم! ئەویش بە هەمان چەشن شوێنی کەوت، جا ڕۆیی تا گەیشتە ناوەڕاستی نێوانی هەردوو لایان، لەوێ دەرختەکانی نووساند بە یەکەوەو فەرمووی: بە فەرمانی خودا بنووسێن بە یەکەوەو حەشارم بۆ بکەن! درەختەکانیش لکان بە یەکەوەو پاڵیاندا بە یەکەوەو بوون بە پەردەو حەسار تا سەراوەکەی تەواو کرد جابیر گوتی: منیش بە غار دوور کەوتمەوە نەبادا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەست بکا کە من نزیك کەوتوومەتەوەو ئەو دوور بکەوێتەوە - یا زیاتر دوور بگرێ - ئینجا دانیشتم‌و لەبەر خۆمەوە بیرم لەمە دەکردەوەو سێی‌و دووی دڵی خۆمم دەکرد، جا کە ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد وا پێغەمبەر (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) دێت بەرەو من، وە درەختەکانیش لەیەك جوێ بوونەتەوەو هەریەکەی لەسەر بنکی خۆی وەستاوەو چاوەنواڕی فەرمانی پێغەمبەر دەکا! تەماشام کرد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ)، ئێستێکی کردو بەسەری ئاوایەکی کردو ئەوجا درەختەکان چوونەوە بۆ جێگەی خۆیان ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هاتەوە، کە گەیشتەوە لای من فەرمووی: ئەی جابیر! ئەم پایەی منت دی؟ عەرزیم کرد: ئا، ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی: دە بچۆ بۆ لای ئەو دوو درەختە، لە هەریەکەیان پەلێ ببڕەو بیانهێنە، تا دەگەیتە شوێنەکەی من، لەوێوە لقێکیان لە ڕاستی خۆتەوەو ئەو لقەکەی تریان لەلای چەپتەوە ڕەوانە بکە. جابیر گوتی: جا هەڵسام بەردێکم هێناو شکاندم‌و دەمەکەیم تەنگ کرد تا تەواو بوو بە دەم‌و تیژبوو، چووم بۆ لای درەختەکان‌و لە هەریەکەیان لقێکم بڕی‌وبە شوێن خۆما بەکێشم کردن هەتا گەیشتمە شوێن پایەکەی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ)

لەوێوە وەك حەزرەت فەرمانی پێ کردم لقیکیانم لە ڕاستمەوەو ئەو لقەکەی تریانم لە لای چەپمەوە ڕەوانەکردو خۆم" چوومەوە بۆ خزمەتیو گوتم: قوربان وەك فەرمووت وام کرد، ئەمە بۆچی بوو؟ فەرمووی: من بەلای دوو گۆڕدا تێ پەڕیم ئەشکەنجەو سزا دەدران لەبەر ئەوە حەزم کرد کە بەهۆی تکای منەوە سزاو ئازاریان سووك ببێ تا ئەو دوو لقە تەڕاییان تیا دەمێنێ. گوتی: جا چووینەوە هۆردووگاکە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی جابیر! ئاو پەیداکە بۆ دەسنوێژ منیش دەستم کرد بە بانگەواز: کێ بێ ئاوی لەلا بێ بۆ دەستویێژ، ئەرێ کێ بێ ئاوی لەلابێ بۆ دەستنوێژ... تاد، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا یەك دڵۆپ ئاو چییە لەناو کاروانەکەدا دەستم نەکەوت! پیاوێکی ئەنصاری هەبوو لەچەن کوندە کۆنێکی ڕەقەهەڵهاتوودا ئاوی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سارد دەکرد، لەسەر کوندەلانێ لە دارکی پەلکە خورما. گوتی: فەرمووی: تێ تەقێنە بۆ لای فیساری کوڕی فیساری ئەنصاری بزانە هیچ هەیە لە کوندەکانیدا گوتی: کە چووم تەماشام کرد تۆزێ ئاو هەبوو لە هەنگڵی کوندەیەکا بوو، ئەوەندە کەم بوو ئەگەر دایم بکردایە لا وشکەکەی کوندەکە خۆی هەڵی دەمژی! چوومەوە بۆ خزمەتیو حاڵەکەم عەرزی کرد، فەرمووی: بڕۆ ئەو چۆڕە ئاوەم بۆ بێنە چووم بۆیم هێنا، گرتی بە دەستیەوەو دەستی کرد بە دۆعا خوێندن، بەڵام نەم زانی دەفەرموێ چی وە بە دەستیشی کوندەکەی هەڵ دەگوشی، ئینجا دایەوە دەستمو فەرمووی: بانگەواز هەڵ دە بۆ سوێنەیەکی گەورەمنیش جاڕم دا: کێ بێ سوێنەیەکی گەورەی وای هەبێ کە بەشی ئەم برکە سوارە بکا، جا بە کۆڵ سوێنەیەکی وایان بۆ هێنام، تا لە بەردەمی حەزرەت خۆیدا دامنا، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی ئاوای کرد لەناو سوێنەکەدا: لەپی پان کردەوەو پەنجەکانی بڵاو کردەوەو دەستی لە ناوبنی سوێنەکەدا دانا، فەرمووی: ئەی جابیر بیگرەو بیکە بە سەرمناو بڵێ: باسم الله: بە پیرۆزیی ناوی خودا منیش گوتم: باسم الله، ئیتر چاوم لێ بوو کە بە قوڵ ئاو لە نێوانی پەنجەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵ دەقوڵی

ئەوجا سوێنەکە وەك کانی تەقیو ئاوی تێ زا تا پڕپڕ بوو، فەرمووی: ئەی جابیر! جاڕ بدە کێ کاری هەیە بە ئاو با بێ ببا گوتی: جەماوەرەکە هاتن ئاویان خواردەوە تا تێراوو پاراو بوون، گوتی: گوتم: ئەرێ کەس ماوە کاری بە ئاو هەبێ؟ ئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی لە سوێنەکە" دەرهێنا هێشتا لیپان لیپ بوو لە ئاو. خەڵکەکە لە خزمەتی حەزرەتدا سکاڵایان لە دەستی برسێتی کرد، فەرمووی: هیوا وایە خودا خواردەمەنیتان بۆ برەخسێنێ جا چووینە قەراخ دەریا، لەوێ دەریاکە شەپۆلێکی داو شەپۆلەکە لەگەڵ خۆیا نەهەنگێکی فڕە دایە دەرەوەو لە پاڵیا ئاگرمان کردەوەو دەستمان کرد بە کوڵاندنو برژاندن لێیو دەستمان کرد بە خواردن تا تێرمان خوارد. جابیر گوتی: منو فیسارو فیسارو ئەو فیسار کە هەموومان پێنج پیاو بووین لەناو کالانەی چاویا دانیشتین لە دەرەوە دیار نەبووینو کەس چاوی لێمان نەبوو تا خۆمان هاتینە دەرەوە، پەراسوویەکیشمان چەمانەوەو راستمان کردەوەو لەسەر نووکەکەی رامان گرت، زلترین زەلامی کاروانەکە، بە سواری زەبەللاحترین نێرە وشتری ناو وشترەکان کە قەبەترین زین بەسەر پشتیەوە بوو بە ژێری دا رۆییو لەژێریەوە رەت بوو، بەبێ ئەوەی کە سەری دانەوێنێ (صحیح مسلم).

## ١١١) موعجیزەیەکی تریان ئەوە بووە بەزوویی دووعاو نزای گیرا بووە دروودی خودای لەسەر

## ومنها سرعة اجابة دعوته ﷺ

٣١٨٦- (ب- ١ ز - ١٧٥ وَفِي هذه الرواية: عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَابَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ قَحْطٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَيْنَمَا هُوَ يَخْطُبُ يَوْمَ جُمُعَةٍ إِذْ قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكَتْ الْكُرَاعُ هَلَكَتْ الشَّاءُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا فَمَدَّ يَدَيْهِ وَدَعَا. قَالَ أَنَسٌ: وَإِنَّ السَّمَاءَ كَمِثْلُ الزُّجَاجَةِ فَهَاجَتْ رِيحٌ ثُمَّ أَنْشَأَتْ سَحَابَةً ثُمَّ اجْتَمَعَ ثُمَّ أَرْسَلَتِ السَّمَاءُ عَزَالِيَهَا فَخَرَجْنَا نَخُوضُ الْمَاءَ حَتَّى أَتَيْنَا مَنَازِلَنَا فَلَمْ نَزَلِ نُمْطَرُ إِلَى الْجُمُعَةِ الأُخْرَى، فَقَامَ إِلَيْهِ ذَلِكَ الرَّجُلُ أَوْ غَيْرُهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ

تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَحْبِسَهُ فَتَبَسَّمَ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَالَ: حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا. فَنَظَرْتُ إِلَى السَّحَابِ تَصَدَّعُ حَوْلَ الْمَدِينَةِ كَأَنَّهُ إِكْلِيلٌ. رواه الخمسة إلا الترمذي. نسأل الله أن يرزقنا الإجابة آمين[1]:

گێڕانەوەی ئەم حەدیسە بەم شێوەیە! ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بە سەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خەڵکی مەدینە تووشی قاتووقڕی بوون ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خەریك بوو وتاری دەدا، لەو کاتەدا پیاوێ هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاژەڵو ماڵاتو وڵاخ قڕبوون لەبەر بێ بارانی، دەی لە خودا بپاڕێرەوە کە بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەریش هەردوو دەستی درێژکردو پاڕایەوە. ئەنەس گوتی: ئاسمان وەك مینا ساف بوو یەك پەڵە هەور چییە پێیەوە نەبوو، لە بەرەکەتی دۆعاکەی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) بایێ هەڵی کردو هەورێکی پێك هێناو بەرە بەرە هەورەکە یەکی گرتو توندبوو، ئیتر باران وەك پلووسك دایکردو ئاسمان دەتگوت کوندەی سەرەوژێرە وەکراوە، کە لە مزگەوت هاتینە دەرەوە تا ماڵەوە بەناو" شەپۆلی ئاودا دەڕۆیشتین، ئیتر هەتا هەینی دوایی سەرومڕ بارانمان بۆ باریو خۆشی نەکردەوە، لە هەینی دواییدا هەر ئەو پیاوەی پێشوو – یا پیاوێکی تر لە کاتی وتاری هەینیدا هات بە پێوە لە خزمەتی حەزرەتدا وەستاو – عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خانووو ماڵ ڕووخاو ڕێگەو بان بڕا ئەوەندە باران باری، لە خودا بپاڕێرەوە کە ئیتر بیگرێتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زەردەخەنەیێ گرتیو فەرمووی: خوایا! بە دەورو بەرمانا بیبارێنە، نەوەك بە سەرمانا کە تەماشام کرد گورج هەورەکە لەسەر ئاستی مەدینە ڕەوییەوەو وەك بازنە لە ئاستی مەدینەدا خەرمانەی دا! (ش/د/ن– خودایان لێ ڕازی بێ).

---

[1] تقدم برقم: ٩٤٢/١ مجلد أول تسلسل/ ١٧٥.

## ١١٢) یەکێکی تریان ئەوە بووە شتی پەنهانو نەزانراوی ئاشکرا کردووە
## ومنها الإخبار بالمغيبات

٣١٨٧- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَشَكَا إِلَيْهِ الْفَاقَةَ، ثُمَّ أَتَاهُ آخَرُ، فَشَكَا قَطْعَ السَّبِيلِ. فَقَالَ: يَا عَدِيُّ هَلْ رَأَيْتَ الْحِيرَةَ؟ قُلْتُ: لَمْ أَرَهَا وَقَدْ أُنْبِئْتُ عَنْهَا. قَالَ: فَإِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ، حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ، لاَ تَخَافُ أَحَدًا إِلاَّ اللَّهَ – قُلْتُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِي فَأَيْنَ دُعَّارُ طَيِّئٍ الَّذِينَ قَدْ سَعَّرُوا الْبِلاَدَ، قَالَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتُفْتَحَنَّ كُنُوزُ كِسْرَى. قُلْتُ: كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ قَالَ: نَعَمْ، وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ، لَتَرَيَنَّ الرَّجُلَ يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، يَطْلُبُ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ، فَلاَ يَجِدُ أَحَدًا يَقْبَلُهُ مِنْهُ، وَلَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ يَلْقَاهُ، وَلَيْس بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ. فَيَقُولَنَّ لَهُ: أَلَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ رَسُولاً فَيُبَلِّغَكَ فَيَقُولُ: بَلَى. فَيَقُولُ: أَلَمْ أُعْطِكَ مَالاً وَوَلَداً وَأُفْضِلْ عَلَيْكَ فَيَقُولُ بَلَى. فَيَنْظُرُ عَنْ يَمِينِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ، وَيَنْظُرُ عَنْ يَسَارِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ. قَالَ: عَدِيٌّ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقَّةِ تَمْرَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ شِقَّةَ تَمْرَةٍ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ. قَالَ: عَدِيٌّ فَرَأَيْتُ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ، لاَ تَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ، وَكُنْتُ فِيمَنِ افْتَتَحَ كُنُوزَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ، وَلَئِنْ طَالَتْ بِكُمْ حَيَاةٌ لَتَرَوُنَّ مَا قَالَ النَّبِيُّ أَبُو الْقَاسِمِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه البخاري[1]:

**عەدیی کوڕی حاتەم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا بووم (درودی خودای لەسەربێ) پیاوێ هات سکاڵای حاڵی لە دەستی هەژاری کرد لە خزمەتیا، پیاوێ تریش هات لە دەستی جەردەییو ڕێگریی سکاڵای حاڵی لە خزمەتیا کرد، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ):ئەی عەدیی! حیرەت دیوە؟ گوتم: نەم دیوە، بەڵام ناوو نیشانیم بیستووە، فەرمووی: ئەگەر مەرگ مۆڵەتت بداتو تەمەنت درێژ بێ بە چاوی خۆت ئافرەتی کەژاوەنشین دەبینی لە حیرەوە دێ تەوافی کەعبە دەکا، وە لە خودا نەبێ لە کەسی تر ناترسێ ئاوا ڕێگەو بان ئەمین دەبێ منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی دەشێ ئەو جەردانەی**

---

[1] بخاري. مناقب: ٣٥٩٥.

هۆزی طەیی چییان بەسەربێ و بۆ کوێ بچن، ئەوانەی کە ئێستا ئەم وڵاتەیان کردووە بە ئاگر، فەرمووشی: ئەگەر تەمەنت بە بەریەوە هەبێ گەنجینەکانی کیسرا فەتح دەکرێنو ئەو هەموو گەنجو سامانو گەوهەرە، موسوڵمانان بە تاڵان دەیبەن بۆ خۆیان! عەرزیم کرد: مەبەستت کیسرای کوڕی هورموزە کە ئێستا شای ئێرانە؟ فەرمووی: ئا مەبەستم ئەوە، ئەگەر تەمەنت درێژ بێ بە چاوی خۆت پیاو دەبینی بە چنگێ زێڕەوە یا بە پڕچنگی زیوەوە دەسووڕێتەوە بەڵام لەبەر زۆری پارەو پوولو ماڵ کەسی دەست ناکەوێ کە ئەو چنگە زێڕو زیوەی لێ وەرگرێ، وەیەك بە یەکتان لە ڕۆژی قیامەتا کە دەگەنەوە بە خزمەتی خودای خۆتان خودا بە خودی خۆی بەبێ تەرجومان قسەتان لەگە دەکا، دەفەرموێ بە بەندە: ئایا لە دنیادا پێغەمبەرم نەنارد بۆ سەرت هەتا فەرمانی منت پێ ڕاگەیەنێ؟ بەندە دەڵێ: با، دەفەرموێ: ماڵو مناڵم دابوو پێت یانا؟ خێرو بێرێکی زۆرم ڕژاندبوو بە سەرتا یانا؟ بەندە دەڵێ بەڵێ وابوو، ئیتر ئەو بەندەیە کە سەیری لای ڕاستی خۆی دەکا دۆزەخ دەبینێو کە تەماشای لای چەپی خۆی دەکا دیسان هەر دۆزەخ دەبینێ جا کە حاڵ وایە خۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ ئەگەرچی بە لەتی دەنکە خورمایەکیشبێ، ئەوەشی کە نیەتی بە خێرو خێرات خۆی لە ئاگر قورتار بکا بابەقسەی باشو بە زمانی شیرین خۆی قوتار بکا. عەدیی گوتی: من خۆم بەچاوی خۆم دیم کە ئافرەتی کەژاوەنشین لە حیرەوە دەهاتو تەوافی کەعبەی دەکردو ترسی کەسی تری نەبوو. ترسی خوادانەبێ، وەمن خۆیشم یەکێك بووم لەو لەشکرەی کە گەنجینەکانی کیسرامان بە تاڵانی گرت. ئێوەیش ئەگەر تەمەنتان درێژ بێ ئەوی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی بە چاوی خۆتان دەیبینن! (ب).

٣١٨٨- عَنْ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، قُلْنَا لَهُ أَلاَ تَسْتَنْصِرُ لَنَا أَلاَ تَدْعُو اللَّهَ لَنَا قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهِ، فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ، فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ، وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ، مَا دُونَ لَحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ أَوْ عَصَبٍ، وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَاللَّهِ لَيُتِمَّنَّ اللهُ هَذَا الأَمْرَ حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ

مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ، لاَ يَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ أَوِ الذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ، وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ. رواه البخاري هنا وأبو داود في الجهاد[٢]:

**خەببابی کوڕی ئەرەتت** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لە سێبەری کەعبەدا لەسەر عاباکەی خۆی شانی دادابوو سکاڵامان لەلا کردو عەرزیمانکرد: قوربان! بۆ داوای کۆمەکی و سەرکەوتنمان بۆ ناکەیّ، بۆ لە خودا ناپاڕێیتەوە بۆمان! فەرمووی: لە نەتەوەکانی پێش ئێوە پیاوی خواناسی وا هەبوو چاڵیان لە زەویدا بۆی هەڵدەکەندو تێیان دەخستو ئینجا مشاریان دەهێناو لەسەر تەوقی سەری دایان دەناو بە مشار دوولەتیان دەکردو بە شەقە مشار شەقیان دەکرد هێشتا بەوەش وازی لە ئایینی خۆی نەدەهێنا، وە خاوەن باوەڕی قایمی وابووە بە کەڵکیت و شانەی ئاسنین ڕنەیان دەکردو دەیان دا لە شانەو ڕنەو پۆست و گۆشت و ڕەگ و ڕیشەو ئێسك و پڕووسکیان هەنجن هەنجن دەکرد هێشتا بەوەیش دەستی لە ئایینی خۆی هەڵنەدەگرت، کەچی ئێوە بەپەلەن لە کارەکە، دەسا بەخودا خودا ئەم ئایینی ئیسلامە بە ئەنجام دەگەیەنیّ و سەری دەخا، تەنانەت لە سێبەری ئیسلامدا ئەمن و ئاسایش وا پەرە دەسێنیّ و ڕەگ و ڕیشە دادەکوتیّ و دنیا وا ئەمین دەبێتەوە، سوار بە تەنها خۆی لە صەنعاوە بە تەنیا سوارە دەڕوا بۆ حەضرەمەوت، لە خودا نەبیّ لە کەسی تر ناترسیّ مەگەر ترسی گورگی هەبیّ کە بنێتە ڕانەکەی، وەلیّ وا دیارە ئێوە لە ئێشەکە بە پەلەن (ب/د).**

٣١٨٩- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَةَ الْعِشَاءِ ذات لَيْلَة فِي آخِرِ حَيَاتِهِ كُلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: أَرَأَيْتُكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ فَإِنَّ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ. قَالَ: ابْنُ عُمَرَ: فَوَهَلَ النَّاسُ فِي هَذِا وَتَحَدَّثُوا عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ كَلُ بِمَا فَهِمَهُ وَلَكِن مَعْنَاهُ بَعْدَ مِائَةُ سَنَةٍ لاَ يَبْقَى

[٢] بخاري. مناقب:٣٦١٢.

مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ يُرِيدُ بِذَلِكَ أَنَّهَا تَخْرِمُ ذَلِكَ الْقَـرْنَ. رواه مـسلم وأبـو داود والترمذي[٣]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە کۆتایی ژیانیدا، شەوێ نوێژی خەوتنانی بۆ کردین، کە سڵاوی دایەوە هەڵساو فەرمووی: لەم شەوەوە بیگرنو هەتا سەد ساڵی تەواو بژمێرن ئیتر کەس نامێنێ لەوانەی کە ئێستا وان لەسەر رووی زەوی. ئیبنو عومەر گوتی: جا هەنێ کەس لەم مەسەلەیەدا زەینیان بە هەڵە چووە، هەر کەسە بەپێی تێ گەیشتنی خۆی باسی ئەو سەدساڵە دەکا" بەڵام مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە لەپاش سەد ساڵی تر کەس نامێنێ لەم خەڵکەی کە ئێستا هەنو وان لەسەر رووی زەویو ئەم چینەی ئێستا هەیە کۆتایی دێ، مەبەست ئەوەنییە کە لە پاش سەد ساڵی تر قیامەت هەڵ دەسێو کەسی نامێنێ (م/د/ت).

٣١٩٠- وَقَالَ جَابِرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): سَمِعْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ بِشَهْرٍ: تَسْأَلُونِي عَنِ السَّاعَةِ وَإِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَأُقْسِمُ بِاللَّهِ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ تَأْتِي عَلَيْهَا مِائَةُ سَنَةٍ وَهِي حَيَّةٌ يُومئذٍ. رواه مسلم والترمذي[٤]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە مانگێ بەر لە مردنی لە خۆیم ژنەوت دەیفەرموو: ئێوە لەمن دەپرسن کە قیامەت کەی دەبێ، بەڵام سوێند دەخۆم بە خودا ئەوەی کە ئێستا لەسەر رووی زەوی دەژی لە پاش سەد ساڵی تر هیچی بە زیندوویی نامێنێ (م/ت).

٣١٩١- ← (ب – ٤ ز – ٤٧ ل – ف – ٥)[٥].

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٢٦- ٦٤٣٣. أبو داوُد. ملاحم: ٤٣٤٨.ترمذي. فتن: ٢٢٥١. بخاري. علم: ١١٦ ، ٥٦٤ ، ٦٠١. تجريد البخاري: ١١٦/٩٥.

[٤] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٢٨.

[٥] تقدم برقم: ٢٨٩٥/٥ مجلد رابع. تسلسل/ ٤٧.

٣١٩٢- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُوشِكُ إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ أَنْ تَرَى قَوْمًا فِي أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ يَغْدُونَ فِي غَضَبِ اللَّهِ وَيَرُوحُونَ فِي سَخَطِ اللَّهِ. رواهما مسلم في صفة أهل النار[٦]:

لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر تەمەنت درێژبێ دوور نییە ئەو هۆزە ببینیت کە قەمچی ریشووداریان بە دەستەوەیە، لە چەشنی کلکی گا شەوو رۆژ خەریکی زوڵمو زۆرنو بەیانیو ئێواری بەهۆی ناهەقییەوە خودا لە خۆیان دەرەنجێننو شایەستەی رقو قاری خودا دەبن (م).

٣١٩٣- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَتُنْفِقُنَّ كُنُوزَهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. رواه الترمذي والبخاري ومسلم في الفتن. وسبقت أحاديث كثيرة تخبر عن الغيب في أبوابٍ هي اشد لها مناسبة. وسيأتي كتاب الفتن وعلامات الساعة وكتاب القيامة وكلها إخبار بالغيب قطعاً[٧]:

دیسان لەوەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر کیسرا لەناو چوو ئیتر لە پاش ئەو کیسرای تر لە ولاتی عێراق نابێ، کە قەیصەریش لە ناوچوو ئیتر لە دوا ئەو قەیصەری تر (لەشام) نابێ، بەو کەسە کە رەوانی منی بەدەستە گەنجو سامانو گەنجینەی ئەم دوو پادشایە دەست موسوڵمانان دەکەونو بەخت دەکرێن لە رێگەی خودادا (ت/ب/م)، فەرموودەی زۆری لەم بابەتە لە پێشەوە زۆر رۆیشت تەماشای ئەم شوێنانە بکە: ← (ب/١ ز/١١ ف/٣ + ب/١ ز/٢٢٤ ف/٩ + ب/١ ز/ ٢٢٣ ف/٤).

---

[٦] مسلم. الجنة والنار: ٧١٢٤ ، ٧١٢٥.

[٧] مسلم. فتن: ٧٢٥٦ ، ٧٢٥٧ ، ٧٢٥٨ ، ٧٢٥٩. راجع رقم/٣/٨٥ مجلد/١ تسلسل/ ١١ + رقم: ١١٥٣/٩ مجلد/١ تسلسل/ ٢٢٤ + رقم/ ١١٤٤/٤ تسلسل/٢٢٣مجلد/١.

## ١١٣) یەکێکی تریان ئەوە بووە شتی پەنهانو نادیاری بەچاو دیوە
## ومنها إنكشاف الغيب له ﷺ

٣١٩٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ أَللهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ « إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ – أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ – وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا. رواه الشيخان – عليهما الرحمة والرضوان[1]:

**عوقبەی کوڕی عامیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **لە ماڵ دەرچوو، چوو نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی غەزای ئوحود کرد، لە پاشدا ڕۆیشتە سەر دوانگەو فەرمووی: خۆم بەرایی و پێشڕەوتانم و لە پێش ئۆمەتمەوە دەڕۆم، تا دێن حەوزی کەوثەریان بۆ ئامادە دەکەم، خۆم چاودێرم بە سەرتانەوەو شایەتیتا بۆ دەدەم، بە خودا من ئا ئێستاکە لەم دەمەمدا حەوزی کەوثەر – کە حەوزی تایبەتیی خۆمەو پێشوازیی ئۆمەتمی لەسەر دەکەم لە بەهەشتا – ئا ئێستا لەبەر چاومەو بە چاوی سەر تەماشای دەکەم، وە کلیلی گەنجینەکانی زەوی دراوە بە من یا فەرمووی: کلیلەکانی زەوی دراون بە من زوو یا درەنگ گەلی ئیسلامی من دەست دەگرن بەسەر ئەو وڵاتانەدا، بەخودای خۆم من تازە لەوە ناترسم کە ئێوە جارێکی تر دەست بکەنەوە بە بتپەریتیو شتی وا، بە پشتی خودا شتی وا تازە لە تێکڕای ئۆمەتم ڕوو ناداتەوە، تاکو تەراش ئەو گرنگییەی نییە، بەڵام ترسی ئەوەم لێتان هەیە کە لە ناو خۆتانا لەسەر پڕو پیتی جیهان بەربەرەکانێ و قینەبەریی بکەن! (ش).**

---

[1] بخاري. مناقب: ٣٥٩٦ ، ١٣٤٤ ، ٤٠٤٢ ، ٤٠٨٥، ٦٤٢٦ ، ٦٥٩٠. تجريد البخاري (مختصر صحيح البخاري): ٦٤١/ ١٣٤٤ = بەرگی دوو، لاپەڕە/٦١.

٣١٩٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّاسَ سَأَلُوا نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَحْفَوْهُ بِالْمَسْأَلَةِ فَخَرَجَ ذَاتَ يَوْمٍ فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَقَالَ: سَلُونِي لاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ بَيَّنْتُهُ لَكُمْ. فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ الْقَوْمُ أَرَمُّوا (أي سكتوا) وَرَهِبُوا أَنْ يَكُونَ بَيْنَ يَدَيْ أَمْرٍ قَدْ حَضَرَ. قَالَ أَنَسٌ فَجَعَلْتُ أَلْتَفِتُ يَمِينًا وَشِمَالاً فَإِذَا كُلُّ رَجُلٍ لاَفٌّ رَأْسَهُ فِي ثَوْبِهِ يَبْكِي فَأَنْشَأَ رَجُلٌ مِنَ الْمَسْجِدِ كَانَ يُلاَحَى فَيُدْعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَنْ أَبِي؟ قَالَ: أَبُوكَ حُذَافَةُ. ثُمَّ أَنْشَأَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً عَائِذًا بِاللَّهِ مِنْ سُوءِ الْفِتَنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ قَطُّ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ إِنِّي صُوِّرَتْ لِيَ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَرَأَيْتُهُمَا دُونَ هَذَا الْحَائِطِ. وَفِي رِوَايَةٍ : فَقَالَتْ أَمُّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذَافَةَ لِعَبْدِ اللَّهِ: مَا سَمِعْتُ بِابْنٍ قَطُّ أَعَقَّ مِنْكَ أَأَمِنْتَ أَنْ تَكُونَ أُمُّكَ قَدْ قَارَفَتْ بَعْضَ مَا تُقَارِفُ نِسَاءُ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ فَتَفْضَحَهَا عَلَى أَعْيُنِ النَّاسِ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُذَافَةَ وَاللَّهِ لَوْ أَلْحَقَنِي بِعَبْدٍ أَسْوَدَ لَلَحِقْتُهُ[٢]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خەڵك گەلێ پرسیاریان لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەكرد، بگرە بەپرسیار بێزاریان كردبوو، جا ڕۆژێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەماڵ دەرچوو سەركەوتە سەر دوانگەو فەرمووی: ئەمڕۆ چی پرسیارێكتان هەیە لێم بكەن، هەرچیم لێ بپرسن ڕوونی دەكەمەوە بۆتان كە یاران ئەمەیان بیست كپ بوونو نقەیان نەكردو مەترسی ئەوەیان لێ نیشت كە ئەمە هەڕەشەبێو سەرەتاو بەرایی سزایەكی لەسەر پێ بێ! ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جا كاتێ بەراستو بە چەپا ئاوڕم دایەوە تەماشام كرد هەر پیاو بوو دەگریاو بەجلەكەی سەری خۆی داپۆشیبوو، پیاوێ هەبوو كە لەگەڵ یەكێكا دەمی تێ دەگیرا بەرابەرەكەی پێی دەگوت: تۆ بیژۆیتو كوڕی باوكی خۆت نیت، جا ئەو پیاوە بۆ ساخكردنەوەی ڕشتەی بنەچەی خۆی عەرزی حەزرەتی كرد:

---

[٢] بخاري. تفسير: ٧٢٩٥، ٤٦٢١، ٦٤٨٦. تجريد البخاري (مختصر صحيح البخاري) بەرگ/٥ ل — ٤٤١ رقم: ١٦٨٥/ ٤٦٢١ ، ٩٣، ٥٤٠ ، ٧٤٩ ، ٦٣٦٢ ، ٦٤٦٨ ، ٦٤٨١ ، ٧٠٨٩ ، ٧٠٩٠ ، ٧٠٩١ ، ٧٢٩٤ ، ٧٢٩٥. مسلم. فضائل: ٦٠٧٢ — ٦٠٧٤.

قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باوکی من کێیە؟ فەرمووی: باوکی تۆ حوذافەیە ئەنجا عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) هەڵی دایەو گوتی: بە خوادایەتی خودا خۆش نوودین‌و ئیسلاممان بە ئایین پەسەند کردووەو موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە، هەمیشەش پەنا دەگرین بە پەنای خودا لە ئاژاوەو پشیویی خراپ. پێغەمبەر (سەرو ماڵ‌ومناڵ بە قوربانی بێ‌و صەلات‌و سەلام‌و دروودی خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: هەرگیزاو هەرگیز وەك ئەمڕۆ لە بابەت چاکەو لە بابەت خراپەوە شتم نەیدوە، بەهەشت‌و دۆزەخیان هێنایە بەرچاوم‌و لەپاڵ ئەم دیوارەدا وێنەی هەردووکیانم دی! لە گێڕانەوەیەکا: دایکی عەبدوللای کوڕی حوذافە بە عەبدوڵلای کوڕی گوت: نەم بیستووە قەت هیچ کوڕی بەقەد تۆ ئاوا خراپ بێ بۆ دایکی خۆی، تۆ چۆن نەترسایت لەوە کە دایکیشت وەك ژن گەلی سەردەمی نەزانی تووشی ئەو ئیشە خراپە بووبێت‌و ئاوا بەو ڕەنگە لەبەر چاوی دۆست‌و دوشمن سڕی هەڵمالێت‌و ڕیسوای بکەی!! عەبدوڵلاش گوتی: بەخودا من دەربەستی ئەمانە نیم، ئەگەر حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بیشی کردمایە بە کوڕی بەندەیەکی ڕەشیش دەبووم بە کوڕی‌و دەم کرد بە باوکی خۆم! (ش).

٣١٩٦- عَنْ أُسَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَشْرَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أُطُمٍ مِنَ الآطَامِ، فَقَالَ: هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى؟ إِنِّي أَرَى الْفِتَنَ تَقَعُ خِلَالَ بُيُوتِكُمْ مَوَاقِعَ الْقَطْرِ. رواهما الشيخان في الفتن[٣]:

ئوسامە (ڕزای خودای گەورەی لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر قەڵایێ لە قەڵاکانی مەدینەوە سەرنجی داو فەرمووی: ئەرێ ئەوەی من چاوم لێیەتی ئێوەیش چاوتان لێیەتی؟ گوتیان نەء فەرمووی: دەسا من دەبینم فیتنەو ئاشووب‌و بگرەو بەردەو کوشتن‌و بڕین وەکوو دڵۆپی باران لەناو ماڵەکانتانا دادەبارێن! ئەوە بوو وابوو لەپاش مەرگی حەزرەت فەرتەنە بەرپابوو، وەك کەری دەرویش سەری دەکرد بەهەموو ماڵێکا، بە کوشتنی ئیمامی عوسمان دەستی پێ کرد (ش).

---

[٣] بخاري. فضائل المدينة (تجريد/ ٢ ل/ ٢٥٧ رقم: ٨٦٣/ ١٨٧٨، ٢٤٦٧ ، ٣٥٩٧ ، ٧٠٦٠). مسلم. فتن: ٧١٧٤.

٣١٩٧- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْصَّلاَةَ فَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ. ثُمَّ قَالَ: أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ. ثَلاَثًا. وَبَسَطَ يَدَهُ كَأَنَّهُ يَتَنَاوَلُ شَيْئًا فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلاَةِ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ سَمِعْنَاكَ تَقُولُ فِي الصَّلاَةِ شَيْئًا لَمْ نَسْمَعْكَ تَقُولُهُ قَبْلَ ذَلِكَ وَرَأَيْنَاكَ بَسَطْتَ يَدَكَ. قَالَ « إِنَّ عَدُوَّ اللَّهِ إِبْلِيسَ جَاءَ بِشِهَابٍ مِنْ نَارٍ لِيَجْعَلَهُ فِي وَجْهِي فَقُلْتُ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ قُلْتُ أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ التَّامَّةِ فَلَمْ يَسْتَأْخِرْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أَرَدْتُ أَخْذَهُ وَاللَّهِ لَوْلاَ دَعْوَةُ أَخِينَا سُلَيْمَانَ لأَصْبَحَ مُوثَقًا يَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ. فى الصلاق وَسَبَقَ فِي صَلاَةِ الكُسُوفِ رؤيته (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِلنَّارِ وَالجَنَّةِوَمَا فِيهِمَا. وَسَيَأْتِي إِنْشَاءَاللهُ فِي الرِقَاق: إِنِّي أَرَى مَالاَتَرَوْنَ وَأَسْمَعَ مَالاَ تَسْمَعُونَ: نسألَ اللهَ كَمَالَ الإِيمَانِ بَالغَيْبَ.آمين. رواه الشيخان[٤]:

ئـەبو دەرداء (خـوداى لىٚ رازى بـێ) گـوتى: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەربێ) لـە نوێژدا راوەستا بوو، لەناو نوێژەکەدا بەرگوێمان کەوت دەی فەرمووی: پەنا دەگرم بە خودا لە شەڕی تۆ ئینجا سێ جاریش فەرمووی: بە نەفرینی خودا نـەفرینت لێ دەکـەم ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسـەربێ) وەك دەست ببا بۆ شتێ ئاوا دەستی درێژ کرد، کە لە نوێژەکە بووەوە گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! گوێمان لێت بوو لەم نوێژەدا، شتێکت فەرموو، یەکەم جارە کە شتی وا لەناو نوێـژدا بفەرموویت؟ هەروەها چاومان لێ بوو دەستیشت درێـژ کـرد بۆ شتێ؟ فەرمووی: ئەوە ئیبلیسی دوشمنی خودا سەرەبزووتێکی هێنابوو، خـەریك بـوو دەینـا بـە دەموچـاومەوە لەعنەتییـە دەیویـست لـە نوێژەکـەدا خەریکم بکا منیش سێ جار گوتم: پەنا دەگرم بە خودا لە شەڕی تۆ، ئینجا سێ جاریش گوتم: بە نەفرینی تەواوی خودا نـەفرینت لێ دەکەم، کەچی هەر نەچووە دواوەو تەسی نەکرد، ئەمجا ویستم کە بیگرم، بە خودا ئەگەر لەبەر داواکـەی سلێمانی بـرام نەبوایـە دەمگـرتو دەیـم بەسـتەوە بـە کۆڵەکـەکانی مزگەوتـەوە، هـەتا بـەیانی، کـوڕو کـاڵو منـاڵانو خـەڵکی مەدینـە، گاڵتـەو

---

[٤] بخاري. صلاة (تجريد البخاري) رقم: ٢٨٢/ ٤٦١ ، ١٢١٠ ، ٣٢٨٤ ، ٣٤٢٣ ، ٤٨٠٨. مسلم. مساجد/ ١٢٠٩ ، ١٢١٠. تقدم برقم: ٧٢٨/١٥ مجلد أول/ تسلسل/ ١١٨ + رقم: ٩٤٠/١ ورقم: ٩٤١/٢ مجلد أول تسلسل/ ١٧١.

قەشمەرییان پێ بکردایە (ش). تەماشای ئەم شوێنانەیش بکە بۆ ئەم باسە: (ب-١ ز-١١٨ ف-١٥ + ب-١ ز-١٧١ ف-١ + ف-٢).

## ١١٤) پێغەمبەران نامرن تا خۆیان دەکرێن بەسەر پشك لە نێوانی جیهانو ژیانی دوارۆژدا : (لا یموت نبي حتى يُخَيَّرَ بين الدنيا والآخرة)

٣١٩٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهَا) أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ وَهُوَ مُسْنِدٌ إِلَى صَدْرِهَا: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار لەسەرە مەرگا سەری نابوو بە سینگمەوە لەو کاتەدا دەیفەرموو: ئەی خودای خۆم! لێم خۆش بەو رەحمم پێ بکەو بەزەییت بێتەوە پێماو بمگەیەنە بە کاروانی یارانی ئازیزو شادم کە بە دیداریان (م).

٣١٩٩- وَعَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَسْمَعُ أَنَّهُ لَنْ يَمُوتَ نَبِيٌّ حَتَّى يُخَيَّرَ بَيْنَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ (قَالَتْ) فَسَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فِي مَرَضِهِ الَّذِى مَاتَ فِيهِ وَأَخَذَتْهُ بُحَّةٌ يَقُولُ (مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا) قَالَتْ فَظَنَنْتُهُ خُيِّرَ حِينَئِذٍ. رواهما مسلم في فضل عائشة[2]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەم بیست کە هیچ پێغەمبەرێ نامرێو فەرمانی هەق بەجێ ناهێنێ تا خۆی نەکرێ بەسەر پشك لە نێوانی گوزەرانی جیهانو ژیانی جاویدانی پاشە رۆژدا. گوتی: جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە سەرەمەرگا لەو کاتەدا کە دەنگی تەواو گڕ بوو بوو لێم ژنەوت دەیفەرموو {مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ

---

[1] بخاري. مغازي: ٤٤٤٠ (تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/ ٤ ل — ٣٩٧ رقم: ١٦٢٤/ ٤٤٤٠ ، ٥٦٧٤). مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٤٣ ، ٦٢٤٤. ترمذي. دعوات: ٣٤٩٦.

[2] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٤٥. تقدم تخرجه بمثل الحديث الذى قبله/ ٣١٦١/١.

وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا – ٦٩/٤}. لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خودا نیعمەتی پێ داونو دەستی قەدرو ڕێزی لێ ناون، لە پێغەمبەرانو لە پیاوە ڕاستو دروستەکانی خوداو لە دۆستانی خوداو لە شەهیدانو لە پیاو چاکان بەراستی ئەم چەشنە دۆستو برادەرە برادەرییان خۆشەو دۆستایەتیو ئاشنایەتی لە گەڵیانا زۆر جوانو پەسندە. عائیشە گوتی: ئیتر زانیم کە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کراوە بە سەرپشكو ژیانی دوایی هەڵبژاردووە بۆ خۆی (م).

٣٢٠٠– وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ وَهُوَ صَحِيحٌ « إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ فِي الْجَنَّةِ ثُمَّ يُخَيَّرُ ». قَالَتْ عَائِشَةُ فَلَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِى غُشِيَ عَلَيْهِ سَاعَةً ثُمَّ أَفَاقَ فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى السَّقْفِ ثُمَّ قَالَ : اللّٰهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى ». قَالَتْ عَائِشَةُ قُلْتُ إِذًا لاَ يَخْتَارُنَا. قَالَتْ عَائِشَةُ وَعَرَفْتُ الْحَدِيثَ الَّذِى كَانَ يُحَدِّثُنَا بِهِ وَهُوَ صَحِيحٌ فَكَانَتْ تِلْكَ آخِرُ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْلَهُ: اللّٰهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى. رواه الشيخان[٣]:

دیسان عائیشە گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ ساخ بوو دەیفەرموو، هەرگیز هیچ پێغەمبەرێ گیانی ناکێشرێ هەتا جێگەی خۆی لە بەهەشتا نەدێنێ، ئەوجا خودا خۆی خاترخۆ دەکا لە نێوانی مانو مردندا.

عائیشە گوتی: لە سەرەمەرگا سەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر ڕانم بوو، لەوکاتەدا تاوێ بووڕایەوە، لە پاشا هۆشی هاتەوەو چاوی بڕییە بنمیچەکەو فەرمووی: ئەی خودایە! بمگەیەنە بەکاروانی یارانو بەزەواری هاودەمانی خۆم کەوان لە بەهەشتی هەرە باڵادا، عائیشە گوتی: جا کە گوێم لەم فەرموودەیە بوو گوتم: ئیتر حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لای ئێمە پەسەند ناکاو حەزی لە جیهان نەماوەو وا دیارە ئەمجارە ئارەزووی لای

---

[٣] بخاري. مناقب (تجريد البخاري= مختصر صحيح البخاري) رقم: ١٦٢٢ م/ ٤٤٣٧ ، ١٦٢٢/ ٤٤٣٥ = بەرگی/ ٤ ل – ٣٩٥ ، ٤٤٦٣ ، ٦٣٤٨ ، ٦٥٩. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٤٧.

پەروەردکاری هەیە، وەزانیم کە ئەمە ئەو فەرمایشتەیەیە کە کاتێ ساخ بوو باسی دەکرد، دوا وشە کە بەسەر زاری پێغەمبەرەوە بوو ئەم وشەیە بوو: اللهم الرفيق الاعلى. (ش).

٣٢٠١– وَعَنْهَا اَنَّ رَسُولَ اللّٰهَ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ – أَوْ عُلْبَةٌ فِيهَا مَاءٌ، فَجَعَلَ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الْمَاءِ، فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ وَيَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ. ثُمَّ نَصَبَ يَدَهُ فَجَعَلَ يَقُولُ: فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى. حَتَّى قُبِضَ وَمَالَتْ يَدُهُ. رواه البخاري في الرقائق[٤]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە سەرەمەرگا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) جەوەندەیێ ئاوی لەبەر دەستابوو – یا قسەبەر (راوی) گوتی کوچەڵەیێ ئاوی لە بەردەستدابوو – خۆش خۆش دەستی دەکرد بە ئاوەکەداو دەیهێنا بە رووی خۆیداو دەیفەرموو لا الە الا الله، بە راستی حاڵاتی گیانەڵا سەختو زەحمەتەو شاڵاوی مەرگ بە زەبرو زەنگە لە پاشا دەستی راست دەکردەوەو هەر دەیفەرموو: في الرفيق الأعلى: شادمکە بە کاروانی ئازیزان کە وان لە بەهەشتی باڵادا. تا خودا گیانی پیرۆزی وەرگرتو دەستی شل بوو لار بووەوە (ب– هەزار رەحمەت لە گۆڕی پیرۆزی بێ).

## ١١٥) دوا وشە: باسی گەورەیی هەندێ لە پێغەمبەرەکان: (درووودو سڵاوی خودایان لەسەر بێ هەتا هەتایە):

## خاتمة: في فضل بعض الأنبياء ﷺ

## باسی گەورەیی ئیبراهیم (درووودی خودای لەسەر)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا – ١٩/٤١}.

---

[٤] بخاري. مغازي: ٤٤٥٣.

**خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! تۆ باسی ئیبراهیم بکە لەم قورئانە پیرۆزەدا، بە ڕاستی ئیبراهیم پیاوێکی ڕاستگۆو ڕاساڵ بوو، وە بە ڕاستی پێغەمبەرێکی خاوەن پایە بوو.**

٣٢٠٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا خَيْرَ الْبَرِيَّةِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاكَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ. رواه مسلم والترمذي وأبو داود في كتاب السُّنة[1]:

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: ئەی چاکترینی هەموو دروست کراوان! پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوە ئیبراهیمە کە چاکترینی هەموو دروستکراوانە (دروودی خودای لەسەربێ).**

٣٢٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - وَهُوَ ابْنُ ثَمَانِينَ سَنَةً بِالْقَدُّومِ[2]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئیبراهیم پێغەمبەر** (سڵاوی خودای لەسەر بێ) **کاتێ خۆی سوننەت کرد تەمەنی هەشتا ساڵ بوو، لەو کاتەدا لە گوندێ بوو ناوی قەدووم بوو (م/ب).**

٣٢٠٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - قَطُّ إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ ثِنْتَيْنِ فِي ذَاتِ اللَّهِ قَوْلُهُ (إِنِّي سَقِيمٌ). وَقَوْلُهُ (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا) وَوَاحِدَةٌ فِي شَأْنِ سَارَةَ فَإِنَّهُ قَدِمَ أَرْضَ جَبَّارٍ وَمَعَهُ سَارَةُ وَكَانَتْ أَحْسَنَ النَّاسِ فَقَالَ لَهَا إِنَّ هَذَا الْجَبَّارَ إِنْ يَعْلَمْ أَنَّكِ امْرَأَتِي يَغْلِبْنِي عَلَيْكِ فَإِنْ سَأَلَكِ فَأَخْبِرِيهِ أَنَّكِ أُخْتِي فَإِنَّكِ أُخْتِي فِي الإِسْلاَمِ فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ فِي الأَرْضِ مُسْلِمًا غَيْرِي وَغَيْرَكِ فَلَمَّا دَخَلَ أَرْضَهُ رَآهَا بَعْضُ أَهْلِ الْجَبَّارِ أَتَاهُ فَقَالَ لَهُ لَقَدْ قَدِمَ أَرْضَكَ امْرَأَةٌ لاَ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تَكُونَ

---

[1] مسلم. فضائل: ٦٠٩٠. أبوداود. السنة: ٤٦٧٢. ترمذي تفسير القرآن:٣٣٥٢.

[2] بخاري. أحاديث الأنبياء (تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/ ٤ ل - ٢٦ رقم: ١٣٤٨ / ٣٣٥٦ ، ٦٢٩٨. مسلم. فضائل/ ٦٠٩٣.

إِلاَّ لَكَ. فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا فَأُتِيَ بِهَا فَقَامَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ إِلَى الصَّلاَةِ فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ لَمْ يَتَمَالَكْ أَنْ بَسَطَ يَدَهُ إِلَيْهَا فَقُبِضَتْ يَدُهُ قَبْضَةً شَدِيدَةً فَقَالَ لَهَا ادْعِي اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِي وَلاَ أَضُرُّكِ. فَفَعَلَتْ فَعَادَ فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَةِ الأُولَى فَقَالَ لَهَا مِثْلَ ذَلِكَ فَفَعَلَتْ فَعَادَ فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ فَقَالَ لَهَا ادْعِي اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِي فَلَكِ اللَّهَ أَنْ لاَ أَضُرَّكِ. فَفَعَلَتْ وَأُطْلِقَتْ يَدُهُ وَدَعَا الَّذِي جَاءَ بِهَا فَقَالَ لَهُ إِنَّكَ إِنَّمَا أَتَيْتَنِي بِشَيْطَانٍ وَلَمْ تَأْتِنِي بِإِنْسَانٍ فَأَخْرِجْهَا مِنْ أَرْضِي وَأَعْطِهَا هَاجَرَ. قَالَ فَأَقْبَلَتْ تَمْشِي فَلَمَّا رَآهَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ انْصَرَفَ فَقَالَ لَهَا مَهْيَمْ قَالَتْ خَيْرًا كَفَّ اللَّهُ يَدَ الْفَاجِرِ وَأَخْدَمَ خَادِمًا. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَتِلْكَ أُمُّكُمْ يَا بَنِي مَاءِ السَّمَاءِ. رواهما مسلم هنا والبخاري في بدء الخلق[3]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیبراهیم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەرگیز درۆی نەکردووە، تەنیا سێ درۆ نەبێ، ئەو سێ درۆیەیش دوانیان ساخ لەبەر رەزای خودا بووە: یەکێ لەو دووە ئەوە بووە کە فەرموویەتی: انی سقیم: من نەخۆش‌و دەردەدارم. ئەوەکەی تریشیان ئەوە بووە کە فەرموویەتی: بل فعله کبیرهم هذا- واتە: ئەم بتانە من نەم شکاندوون، بەڵکوو گەورەکەیان ئەوەی کردووە، تاقەیەکەکەی تریشیان لە بارەی خاتوو سارەی خێزانیەوە بووە، جارێ سارەی پێ دەبێ دەگاتە وڵاتی پادشایەکی زۆرداری ملهوڕ، سارە بۆ جوانی وێنەی نابێ، لەبەر ئەوە پێی دەفەرموێ: ئەگەر ئەم زۆرداری زەبرداره پی بزانێ کە تۆ ژنی منی زەوتت دەکا لێم خۆشم دەکوژێ تا نەڵێن: ئەم پادشایە ئەوەندە خوا نەناس‌و بێ رەزایە ژن بە مارەو تەلاقەوە زەوت دەکا جا ئەگەر پرسیاری لێ کردی مەڵێ مێردمە، پێی بڵی: کە تۆ خوشکی منی، لە راستیدا تۆ خوشکی ئایینی منیت‌و بەپێی ئیسلامەتی موسوڵمان برای موسوڵمانە لەم سەرزەمینەشدا جگە لە خۆم‌و لە خۆت موسوڵمانێکی تر گومان نابەم، کاتێ ئیبراهیم دەڕواتە

---

[3] بخاري (تجريد البخاري - مختصر صحيح البخاري. رقم: ١٣٤٩/٣٣٥٨+ ٩٩٢ / ٢٢١٧ بەرگی/٤ ل – ٢٦). مسلم. فضائل/ ٦٠٩٧.

ناو وڵاتی زۆردارەکەوە هەندێ لە دەستوپای پادشا ملهووڕەکە چاویان بەسارە دەکەوێ، جا دەچن بۆلای‌و پێی دەڵێ: ئافرەتێ هاتۆتە قەڵمڕەوی تۆوە هەر قابیل بە خۆتە! پادشاش دەنێرێ بە شوێن سارەداو دەیبەن بۆی، ئیبراهیم هەڵ دەسێ‌و دەچێ بەلای نوێژەوە بە ئومێدی ئەوە کە خودا ناموسی بپارێزێ لە دەمی گلاوی ئەو سەگە هارە جا هەر کە سارە دەچێتە ژوورەوە بۆلای، ئیتر زۆردارەکە خۆی پی راگیرناکرێ‌و دەستی بۆ دەبا، بەلام لە لایەنی خوداوە توند دەستی رەق دەبێ! جا بە سارە دەڵێ: لە خودا داوا بکە کە دەستم چاك بکاتەوە وازت لێ دێنم‌و زیانم بۆت نابێ، ئەویش دەپاڕێتەوەو دەستی چاك دەبێتەوە، کەچی دیسانەوە دەستی بۆ دەباتەوە، وەلێ ئەم جارە دەستی لە جاری یەکەم زیاتر رەق دەبێ، دووبارە داوای لێ دەکاتەوە کە هەمدیسان بۆی بپاڕێتەوە، ئەویش دیسان بۆی دەپاڕێتەوە، کەچی هەمدیسانەوە دەستی بۆ دەباتەوەو ئەمجارە دەستی لە هەردووجارەکەی پێشوو زیاتر وشك دەبێ، ئەنجا پێی دەڵێ: لە خودا بپاڕێرەوە کە دەستم چاك بکاتەوە، سوێندت بۆ دەخۆم بە خودا کە ئیتر زیانم بۆت نابێ، سارەش وا دەکاو دەستی پادشا چاك دەبێتەوە، جا ئەوجا پادشا ئەو کابرایە بانگ دەکا کە سارەی بۆ هێنابوو، وە پێی دەڵێ: تۆ شەیتانت بۆ من هێناوە نە وەکوو ئادەمیزاد! خەریك بوو دەستم لێ بوەشێنێ، ئەم ژنە لە وڵاتی من بکەرە دەرەوەو هاجەرەشی بدەرێ فەرمووی: ئینجا سارە بەپێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئیبراهیم کەچاوی پێی کەوت نوێژەکەی تەواو کردو پێی فەرموو: چی بوو؟ سارە خاتوون گوتی: باش بوو، خودا لە باڵێ ئەو بەدکارەی داو رێگەی دەستی نەداو ئەم کارەکەرەشی بۆمان رەخسان. ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەی ئەی گەلی عەرەب! کە لەسەر ئاوی باران دەژین ئەم ئافرەتە واتە: خاتوو هاجەرە دایکە گەورەی ئێوەیە، چونکە دایکی ئیسماعیل پێغەمبەرەو ئێوەش لە نەوەی ئەون (م/ب).

٣٢٠٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عُرِضَ عَلَيَّ الأَنْبِيَاءُ فَإِذَا مُوسَى ضَرْبٌ مِنَ الرِّجَالِ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ وَرَأَيْتُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ – عَلَيْهِ

السَّلَامُ – فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهًا عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ وَرَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهًا صَاحِبُكُمْ – يَعْنِي نَفْسَهُ – وَرَأَيْتُ جِبْرِيلَ – عَلَيْهِ السَّلَامُ – فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهًا دِحْيَةُ بْنُ خَلِيفَةَ. رواه مسلم في الإسراء[٤]:

← ( ب/٤ ز/ ل/ ف/٣). لە گێڕانەوەی ئێرەدا: لە جابیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە شەوی ئیسراو شەوڕەوی دا پێغەمبەرەکانم نیشان دران، کە سەرنجی مووسام دا پیاوێکی داڵگۆشتی قەد باریك بوو، دەڵێی یەکێکە لە پیاوانی خێڵی شەنووئە، وە عیسای کوڕی مەریەمم دی، (دروودی لەسەر بێ) کوتومت دەتگوت عوڕەوەی کوڕی مەسعوودە، وە ئیبراهیمم دی، (دروودی بێ پایانی خودای لێ بێ) کتومت لە هاوڕێکەی خۆتان دەچوو واتە: دەق شێوەی لە پێغەمبەر خۆی دەکا، فەرمووی: جوبرائیلیشم دی، کەسم نەدیوە کە وەك دوحیەی کوڕی خەلیفە شێوەی لەو بچێ (م).

## ١١٦) باسی گەورەیی حەزرەتی مووسا دروودی خودای لەسەر : (موسى ﷺ)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا – ١٩/٥١}.

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! لەم قورئانە پیرۆزەدا – کە دەریای بەختەوەریو هەموو پیرۆزییەکە – باسی پێغەمبەری گەورەو خاوەن پایە مووسای کوڕی عیمران بکە، ڕاستی ئەو زاتە بەندەیەکی پاكو بێگەردو دڵسۆز بوو، خۆی تەرخان کردبوو وە لە لای ڕاستی کێوی (طوور)ەوە بانگمان لێ کرد وە لە کاتی گفتوگۆدا کە لەگەڵ مندا کردی نزیکمان کرەوە لە خۆمان.

---

[٤] تقدم برقم:٣/٣١٥٧ مجلد/٤ تسلسل/١٠٠.

٣٢٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ وَرَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: الْمُسْلِمُ وَالَّذِي اصْطَفَى مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْعَالَمِينَ، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى - عَلَيْهِ السَّلاَم - عَلَى الْعَالَمِينَ. فَرَفَعَ الْمُسْلِمُ يَدَهُ عِنْدَ ذَلِكَ فَلَطَمَ وَجْهَ الْيَهُودِيِّ، فَذَهَبَ الْيَهُودِيُّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَهُ بِمَا كَانَ مِنْ أَمْرِهِ وَأَمْرِ الْمُسْلِمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تُخَيِّرُونِي عَلَى مُوسَى، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَصْعَقُ مَعَهُمْ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُفِيقُ، فَإِذَا مُوسَى بَاطِشٌ بِجَانِبَ الْعَرْشِ، فَلاَ أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ فَأَفَاقَ قَبْلِي، أَوْ كَانَ مِمَّنِ اسْتَثْنَى اللَّهُ. رواه الثلاثة[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دوو پیاو - یەکێکی جوولەکەو یەکێی موسوڵمان - بوو بە شەڕەجنێویان، موسوڵمانەکە دەڵێ: بەو کەسە کە موحەممەدی هەڵبـژاردووەو کردوویەتی بە سەردەستەی هەموو جیهان! جوولەکەکەش بەرپەرچی دەداتەوە دەڵێ: بەو کەسە کە مووسای هەڵبژاردووەو کردوویەتی بەسەر دەستەی هەموو جیهان، ئیتر موسوڵمانەکە تەنگە دەیگرێو شەقا زللەیێ لە جوولەکەکە دەدا، جوولەکەکە دەچێ بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و سەر گوزەشتەی خۆیو موسوڵمانەکەی عەرز دەکا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باوی من مەدەن بەسەر مووساداو من بە باشتر دامەنێن لەو، چونکە لە ڕۆژی قیامەتا کە بەرەی ئادەمیزاد سەرجەم خورپەیان لێ دەکەوێو لە سامی نرکەو نەعرەتەیەکی گەورە هەموو لە هۆش خۆیان دەچن منیش لە گەڵیانا لەسەرخۆ دەچم، بەڵام یەکەم کەس دەبم کە دێمەوە هۆش خۆم، کەچی لەو کاتەدا دەبینم وا مووسا پەلاماری دامێنی تەختو بارەگا (عەرش)ی خودای داوەو بە توندی گرتوویەتی، جا نازانم ئایا مووساش لەگەڵ ئێمەدا لە هۆش خۆی دەچێ بەڵام لە پێش مندا هۆشی دێتەوە بە بەردا، یا هەر لە سەرەتاوە نا

---

[1] بخاري. احاديث الأنبياء (تجريد/٢ ل - ٦٠ رقم: ٦٣٩/ ١٣٣٩ ، ٣٠٤٧ ، ٢٤١٢ ، ٣٣٩٨ ، ٤٦٣٨، ٦٥١٧ ، ٦٩١٧ ، ٧٤٢٧. مسلم. فضائل: ٦١٠١ - ٦١٠٥. ابو داؤد. السنة: ٤٦٦٨.

بووریێتەوەو یەکێك دەبێ لەو کەسانە کە خودا جیایکردوونەتەوە وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ – ٣٩/٦٨}. واتە: فوو دەکرێ بە کەڕەنادا، ئیتر بە فەرمانی خودا هەرچی هەیە لە ئاسمانەکانو لە زەویدا دەمرێ، مەگەر ئەو کەسە نەبێ کە خودا جیای کردۆتەوەو حەز دەکا نەمرێ! (ش/د).

٣٢٠٧– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُرْسِلَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى – عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ – فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ فَقَالَ أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لاَ يُرِيدُ الْمَوْتَ. فَرَدَّ اللَّهُ عَلَيْهِ عَيْنَهُ وَقَالَ ارْجِعْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ مَا غَطَّتْ بِهِ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ. قَالَ أَىْ رَبِّ، ثُمَّ مَاذَا قَالَ ثُمَّ الْمَوْتُ. قَالَ فَالآنَ. فَسَأَلَ اللَّهَ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ عِنْدَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ. رواه الشيخان[٢]:

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): فریشتەی گیانکێشان دەچێ بۆ لای مووسا (دروودی خودای لەسەربێ) کە دەگاتە کنی، مووسا شەقازللەبەکی لێ دەدا چاوێکی قەلپووچ دەکا، جا دەگەڕێتەوە بۆ لای خوداو دەفەرموێ: تۆ منت ناردووە بۆ لای بەندەیێ کە نایەوێ بمرێ! فەرمووی: خوداش چاوی چاك دەکاتەوەو دەفەرموێ: بچۆرەوە بۆ لایو پێی بڵێ: دەستت دابنێ لەسەر پشتی جوانەگایێ، چەند موو بوو بە ژێر دەستتەوە لە باتی هەرموویێ لەو موانە ساڵێ تریش بژی، مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگام! لەپاش ئەوە چییی؟ فەرمووی: لە پاش ئەوەش هەر مردنە، مووسا فەرمووی: کەوابێ با ئێستابێ، بەڵام داوای کرد لە خودا کە وا نزیکی بکاتەوە لە خاکی پیرۆزەوە کە بەقەد یەك بەردەهاوێژی بمێنێ بۆی! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر لەوێ بوومایە گۆڕەکەیم نیشان

---

[٢] مسلم. فضائل: ٦٠٩٩، ٦١٠٠. بخاري. جنائز: (تجريد/ ٢ ل – ٥٩ رقم: ٦٣٩/ ١٣٣٩ ، ٣٠٤٧). مسلم. فضائل: ٦٠٩٩ ، ٦١٠٠. نسائي. جنائز: ٢٠٨٨.

دەدان کە وا لە تەنشت رێگەکەوە کە لەبن تەپۆڵکە لمەسوورەکە دایە بەردەهاوێژێکی دەمێنێ بۆ بەیتولمەقدیس (ش).

٣٢٠٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عِنْدَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي قَبْرِهِ. رواه مسلم[٣]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو شەوە کە چووم بۆ ئیسرا، لەکن مووساوە رەت بووم، لەلای تەپۆڵکە لمەسوورەکەدا بوو، لەناو گۆڕەکەیدا راوەستا بوو بە پاوە نوێژی دەکرد (م).

### ١١٧) باسی گەورەیی حەزرەتی عیسا دروودی خودای لەسەر : (عیسی ﷺ)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِذْ قَالَتِ الْمَلآئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ —صدق الله العظيم- ٣/٤٥ -٤٦}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی خۆشەویست! لەم قورئانە پیرۆزەدا کە یادنامەی ناوی خودا پێداوانە باسی ئەو کاتە پیرۆزە بکە کە جوبرەئیلی هێمن (ئەمین) فەرمووی بە مەریم: ئەی مەریەم! خودای گەورە موژدەت پێ دەدا بە کوڕێکی جوانی جوانمەرد کە بە فەرمانی تایبەتی لە تۆ دەبێ کە لەسەر فەرموودەی خودا بە وشەی (کن فیکون: ببە ئیتر دەبێ) دروست دەبێ، کە لە لایەنی خودا خۆیەوە ئەم وشەیە دەگوترێ، نازناوی مەسیحە، واتە: پیرۆزو دڵساف و پاك، ناوی راستی عیسایە، ناو بانگ بە کوڕی مەریەم دەر دەکا، چونکە دایکی دوورە لە پەیوەندی ژنو مێردیی، وە ئەم کوڕە هەم لە جیهانو هەم لە دوا رۆژا پایە بەرزو روودارو خاتردارەو نزیك دەبێ لە بارەگای خوداوە، وە قسە دەکا لەگەڵ خەڵکا لە بیشکەداو لە کاتێکیشا کە پڕو پێگەیشتووە وە لەو پیاوانە دەبێ کە بۆ خوا لێ دەبڕێنو

---

[٣] مسلم. فضائل: ٦١٠٧.نسائی.قیام اللیل: ١٦٣١، ١٦٣٢ ، ١٦٣٣ ، ١٦٣٤.

دەبن بە پیاوچاکانی خودا. – صدق الله العظیم – واتە: خودای گەورە راست دەفەرموێ‌و فەرمایشتی خودا هەمووی راست‌و دروستە.

٣٢٠٩– عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُرَانِي اللَّيْلَةَ عِنْدَ الْكَعْبَةِ، فَرَأَيْتُ رَجُلاً آدَمَ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنْ أُدْمِ الرِّجَالِ، لَهُ لِمَّةٌ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ اللِّمَمِ، قَدْ رَجَّلَهَا، فَهِيَ تَقْطُرُ مَاءً مُتَّكِئًا عَلَى رَجُلَيْنِ، أَوْ عَلَى عَوَاتِقِ رَجُلَيْنِ، يَطُوفُ بِالْبَيْتِ فَسَأَلْتُ مَنْ هَذَا فَقِيلَ: هَذَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ. ثُمَّ إِذَا أَنَا بِرَجُلٍ جَعْدٍ، قَطَطٍ، أَعْوَرِ الْعَيْنِ الْيُمْنَى كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، فَسَأَلْتُ مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ. رواه الشيخان[1]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شەوێ لە خەوما روانیم وا لەلای کەعبەدام، پیاوێکی سەوزەی گەنم رەنگم دی، تا بڵێی سەوزەیەکی زۆر جوان بوو، پرچێکی کورتی هەبوو تا بڵێی جوان بوو، پرچەکەی داهێنابوو، پرچەکەی هێشتا ئاوی لێ دەتکا، خۆی گرتبوو بە دوو پیاو یا فەرمووی: خۆی دابوو بە سەر شانی دوو پیاودا، تەوافی بەیتی دەکرد، پرسیم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە مەسیحی کوڕی مەریەمە، لە پاشتر پیاوێکی سەرلوولی قژ کرژم دی، چاوی راستی کوێر بوو، دەرپۆقی بوو دەتگوت دەنکە ترێی زەقی ناو بۆڵە، کە وەك شتی سەراوکەوتوو زەق ببێتەوەو سەر بۆڵەکە بکەوێ! پرسیم: ئەم کابرایە کێیە؟ گوترا: ئەمە جاڵە کوێرەی ساختەچی هەلاتبازە (ش).

٣٢١٠– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى مُوسَى بْنِ عِمْرَانَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – رَجُلٌ آدَمُ طُوَالٌ جَعْدٌ كَأَنَّهُ مِنْ

---

[1] بخاري. لباس: ٥٩٠٢ ، ٦٩٩٩ (تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري. رقم/ ١٣٧٠ / ٣٤٤٠ ، ٣٤٤١ ، ٥٩٠٢ ، ٦٩٩٩ ، ٧٠٢٦ ، ٧١٢٨.مسلم. إيمان: ٤٢٤ ، ٤٢٥ ، ٧٢٨٩.

رِجَالِ شَنُوءَةَ وَرَأَيْتُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ مَرْبُوعَ الْخَلْقِ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ سَبِطَ الـرَّأْسِ. رواه مسلم والترمذي في التفسير[٢]:

→ (ب – ٣ ز – ١٧٠ ل – ف – ٤) لـە گێڕانـەوەی ئێـرەدا: لـە ئیبنـو عەبباسەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): ئـەو شـەوە کـە بـرام بـۆ ئیسراو شـەوڕەوی لـەکن مووسـای کـوڕی عیمرانـەوە رەت بـووم (درودی خودای لەسەربێ) پیـاوێکی سـەوزەی گـەنم رەنگـی کەڵەگـەتی قـژلوول بوو، لەبەر داڵگۆشتیو باریکیو درێژی دەتگوت پیاوێکە لە هۆزی شەنووئە، عیسای کوڕی مەریەمیشم دی، پیاوێکی مامناوەندیی، نە زۆر کورتو نە زۆر درێـژ، نـە زۆر کـراوەو پـانو پـۆڕ، رەنگـی سـوورو سپی بـوو، قـژی خـاو بـوو. (م/ت– هەزاران هەزار رەحمەتیان لێ بێ).

٣٢١١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مَوْلُودٍ يُولَدُ إِلاَّ نَخَسَهُ الشَّيْطَانُ فَيَسْتَهِلُّ صَارِخًا مِنْ نَخْسَةِ الشَّيْطَانِ إِلاَّ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّـهُ ». ثُـمَّ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)[٣]:

ئـەبو هـورەیرە لـە پێغەمبـەرەوە فـەرمووی (درودی خـودای لەسـەربێ): هـەر منداڵێ کە لە دایك دەبێ شـەیتان سـەرە سیخورمەیەکی لێ دەدا، بەهۆی ئـەو سەرە سیخورمەی شەیتانەوەیە کە منداڵ هـەر کە لـەدایك دەکەوێتـە خـوارەوە دەس بـەجێ هـاوارو قیـژەیێ دەکـا، بـەڵام عیسـای کـوڕی مەریـەمو مەریـەمی دایکی بەر ئەم سەرە سیخورمەیە نەکەوتوون. ئەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەگەر حەزدەکەن بۆ راستو دروستی ئەمـە ئـەم ئایەتـە بخـوێنن: {وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ – ٣٦/٣}. واتە: وە بـە راسـتی مـن ئەم کـچەو نەتـەوەی ئـەم کـچە دەهاومـە پـەنای میهرەبانو تـەوانایی تـۆوە، لـە

---

[٢] بخاري. بدء الخلق: تجريد/ ٣ ل – ٤٣٩ رقم: ١٣٠٨.

[٣] بخاري. تفسير: ٤٥٤٨ ، ٣٤٣١.مسلم. فضائل: ٦٠٨٦ ، ٦٠٨٧.

دەس بۆ بردنو زیان لێ دانی ئیبلیسی دەرکراوی بە شبڕاو لە رەحمەتی تۆ (ش/د).

٣٢١٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ فِي الأُولَى وَالآخِرَةِ. قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ مِنْ عَلاَّتٍ وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ فَلَيْسَ بَيْنَنَا نَبِيٌّ. وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى بْنِ مَرْيَمَ، الأَنْبِيَاءُ أَولاَد عَلاَّتٍ وَلَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَ عِيسَى نَبِيٌّ. رواهما الثلاثة[٤]:

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لە هەردوو جیهاندا من لە هەموو کەسێکی تر لە پێشترم بە عیسای کوڕی مەریەم عەرزیان کرد: چۆن؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: پێغەمبەرەکان هەموو برای یەکرتین، بەلاَم لە چەند هەوێیەکن، ئەگەرچی دایکیان جیایە وەلێ ئایینەکەیان لە بنەرەتدا یەکە، کە خودا بەیەك زانینە، سەرە رای ئەمە منو عیسا پێغەمبەری ترمان لە نێواندا نەبووە (ش/د).

٣٢١٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ رَجُلاً يَسْرِقُ فَقَالَ لَهُ عِيسَى سَرَقْتَ. قَالَ كَلاَّ وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ. قَالَ عِيسَى آمَنْتُ بِاللّٰهِ وَكَذَّبْتُ عَيْنِي. رواه مسلم. نسأل الله كمال الإيمان. آمين[٥]:

دیسان لەوەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: عیسا (سلاوی لێ بێ) چاوی لێ بوو کابرایێ دزی دەکا، پێی فەرموو: تۆ دزیت دەکرد، کابراکە گوتی: ئەء، بەو خودایەی کە هەر خۆی خودایە من شتی وام نەکردووە! عیساش فەرمووی: باوەڕم هەیە بە خوداو چاوی خۆم بە درۆ دەخەمەوە! (م).

---

[٤] مسلم. فضائل: ٦٠٨٣ – ٦٠٨٥. أبوداود.السنة: ٤٦٧٥. بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٤٣. تجريد/٤ ل – ٥٩رقم: ١٣٧١/ ٣٤٤٢ ، ٣٤٤٣.

[٥] تجريد البخاري/ ٤ ل – ٥٩ رقم: ١٣٧٢/ ٣٤٤٤.مسلم. فضائل: ٦٠٨٩.

**١١٨) باسی فەزڵ‌و گەورەیی حەزرەتی یوونس‌و حەزرەتی زەکەریا (دروودی خودایان لەسەربێ) : (یونس وزكريا (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِمَا وَسَلَّمَ))**

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ – إلى أن قال-: وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ – صدق الله العظيم – ٣٧/١٣٩-١٤٨}.

خودا لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: بە ڕاستی یوونس پێغەمبەرێ بوو لە پێغەمبەرەکانی خودا، خودا کردی بە پێغەمبەرو ڕاوەنەی کرد بۆ سەر هۆزێ، ژمارەیان سەد هەزار کەس پتر بوو هەڕەشەی لە هۆزەکەی کرد، هەڕەشەکە نەهاتەجێ لەبەر ئەوە – بەبێ فەرمانی خوداو لە خۆیەوە – ڕایکردو هەڵهات‌و ڕۆیشت سواری پاپۆڕێکی پڕ بوو، پاپۆڕەکە لە ئاوەکەدا ڕۆیی تا گەیشتە ناو نێرینەی ئاوەکە، لەوێ ڕەق ڕاوەستاو پەکی کەوت، کەشتییەوانەکان گوتیان: هۆی ئەم پەککەوتنە ئەوەیە لەم کەشتییەدا بەندەیێ هەیە لە ئاغاکەی هەڵهاتووە، دەووتیرو پشك دەکەین‌و دەیدۆزینەوەو تووڕی دەدەینە ناو دەریاکەوە، کە دەویان کرد بەر یوونس کەوت ئیتر هەڵیان دایە ناو دەریاکەوە، دەسبەجێ نەهەنگێ قۆستیەوەو قووتی دا، یوونس لەم کارەدا گلەیی لێ دەکرێ، یا خۆی گلەیی لەخۆی کرد کە بۆ وای لە خۆی کردو خۆی نەگرت چونکە خود سەر ئەوەی کردبوو بە فەرمانی کردگاری نەیکردبوو، جا ئەگەر یوونس کردەوەی باشی خۆی فریای نەکەوتایە، کە ئەوە بوو لەوەوپێش هەمیشە سەرگەرمی یادو ذیکری خودا بوو، یا ئەگەر لە ناوسکی نەهەنگەکەدا دەستی نەکردایە بە گوتنی ئەم ویردە موبارەکە لا اله الا انت سبحانك! {إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ – ٢١/٨٨}: کەس خودانییەو کەس بەندەیی بۆ ناکرێ تۆ نەبێ‌و پاك‌و دوورت دەگرم لە هەموو نەنگ‌و شوورەییی‌و بە ڕاستی من لە وانەم کە ستەمکارن، ئەوا لە سکی ئەو نەهەنگەدا دەمایەوە هەتا ڕۆژی زیندوو بوونەوە لە قیامەتدا، جا بە پیرۆزی ئەو ذیکرو پاڕانەوەو تەسبیحاتەوە فڕەمان دایە دەرەوە بۆ وشکانی حاڵی وابوو نەخۆش بوو، لەشی زۆر ناسك بوو بووەوە، لە وێدا دارکوولەکەیەکمان لەسەری ڕواند، چونکە ئەو دارە مێش‌و مەگەزی لێ نانیشێ، ئیتر ماوەیێ لەوێ مایەوە تا کەمێ جەستەی ساخ بۆوە،

دیسان رەوانەمان کردەوە بۆ سەر گەلەکەی پێشووی، ئەوانیش سەر لە نوی باوەڕو ئیمانیان تازە کردەوەو ئێمەش تاکاتی دیاری کراوی خۆیان سەربەرزیی و خۆش گوزەرانیمان پێدان. وشەی –صدق الله العظیم– واتە: خودای مەزن و گەورە راستی فەرمووە.

٣٢١٤– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَسِيرِ بين مَكَّة وَالْمَدِينَّة فَمَرَّ بِوَادِ فَقَالَ: أيُّ وَادِ هَذَا؟ فَقَالُوا : هَذَا وَادِي الأَزْرَق، قَالَ : كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ هَابِطًا مِنَ الثَّنِيَّةِ لَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللّٰهِ تَعَالَى بِالتَّلْبِيَةِ. ثُمَّ أَتَى عَلَى ثَنِيَّةِ هَرْشَى قَالَ : أيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟. قَالُوا : ثَنِيَّةُ هَرْشَى قَالَ : كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يُونُسَ بْنِ مَتَّى –عَلَيْهِ السَّلاَم– عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ جَعْدَةٍ عَلَيْهِ جُبَّةٌ صُوفٍ خِطَامُ نَاقَتِهِ خُلْبَةٌ وَهُوَ يُلَبِّي. رواه مسلم في المعراج[1]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەمەدینەوە دەڕۆیی بۆ مەککە، گەیشتە شیوێ، فەرمووی: ئەم شیوە کوێیە؟ عەرزیان کرد: ئەمە (وادیلئەزرەق : شیوەشین)ە. فەرمووی: دەڵێی ئێستاش لەبەرچاومە کە مووسا (دروودی لەسەربێ) کە لە شەوی ئیسرادا دیم، لە دانەکەوە دادەپەڕیو هاواری دەکرد لە خوداو دەنگی لە ببەیکە کردنی بە بەرزی دەهات لە پاشا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە دانەی هەرشاوە رەت بوو، فەرمووی: ئەم ملەیە کوێیە؟ عەرزیان کرد: ئێرە دانەی هەرشایە. فەرمووی: دەڵێی ئێستاش یوونسی کوڕی مەتتام لەبەر چاوە (دروودی لەسەر) کە لە شەوی ئیسرادا دیم، جبەیەکی خوری لەبەردا بوو، سەرگەرمی لەببەیکەکردن بوو لەم شیوەدا، بە سواریی وشترە مێنگەیەکی سووری قەڵەوی پڕ کۆشت بوو، هەوسارەکەی گورزەیێ گوش بوو (م) جوببەی خوری واتە: فەرەنجی. (وەرگێڕ).

---

[1] بخاري. حج (تجريد/ ٢ ل – ١٧٠ رقم: ٧٤٧/ ١٥٥٥، ٣٣٥٥ ، ٥٩١٣).

٣٢١٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى ». وَنَسَبَهُ إِلَى أَبِيهِ. رواه مسلم وابو داود[٢]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ کەس ڕەوا نییە کە لە خۆیەوە بڵێ: من (واتە: پێغەمبەر) باشترم لە یوونسی کوڕی مەتتا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) یوونسی بە ناوی باوکیەوە ناوهێنا کەمەتتایە (م/د) ئەم حەدیسە بوخاریش (خودای لێ ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە (وەرگێڕ).

٣٢١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ زَكَرِيَّاءُ - عَلَيْهِ السَلاَمُ - نَجَّارًا. رواه مسلم. نسأل الله حسن الصناعة آمين.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: زەکەریا (دروودی لێ بێ) دارتاش بوو (م).

## ١١٩) باسی گەورەیی حەزرەتی ئەییوب دروودی خودای لەسەر: (أيوب ﷺ)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ. فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ - ٢١/٨٤-٨٥}.

باسی گەورەیی ئەییوب بکە لەو کاتەدا کە ڕووی کردە بارەگای بەخششو میهرەبانی خوداو پاڕایەوەو فەرمووی: پەروەردگارا! من تووشی ناساخی دەروونیو بێ ئاسایشی بوومو تۆیش لە هەموو خاوەن بەزەییێ بە بەزەیی تریو بە ڕاستی ئێشو ئازار گەیوەتە گیانمو تۆ خۆت ئاگات لە حاڵمەو دەمەوێ بەمیهرەبانی خۆت چاری حاڵی پەشێوم بکەیو لەم دەردەگرانە ڕزگارم بکەی، ئێمەیش دووعاو پاڕانەوەکەیمان گیرا کردو ئەو

---

[٢] بخاري (تجريد/ ٤ ل - ٤٩ رقم/ ١٣٦٤ / ٣٤١٦ ، ٣٤١٥ ، ٤٦٠٤ ، ٣٣٩٥ ، ٣٤١٣ ، ٤٦٣١ ، ٤٦٣٢ ، ٤٦٣١ ، ٤٨٠٥.مسلم. فضائل: ٦١٠٩ ، ٦١١٠. أبو داود. السنة: ٤٦٧١.

ناساخییە کە تووشی بووبوو لەسەرمان لابردو شیفاو چارەمان بۆی نارد، وە ئەوانـەی کـە مردبـوون لـە منداڵـەکانی زینـدووم کردنـەوە بـۆیو ئەوانـەو ئەوەنـدەی تریـشم لەگـەڵ ئەوانـەدا پێـدا، بـە رەحمـەتێکی تایبـەتی لـەلای خۆمەوە بۆ ئەو، وە بۆ ئەوەیش ببـێ بەهۆی بیرکردنەوەو مامەڵەو رەفتاری باش لەلایەنی ئەوانەوە کە بەندەیی خودا دەکەن.

٣٢١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَـا أَيُّـوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا فَخَرَّ عَلَيْهِ جَرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ أَيُّوبُ يَحْتَثِي فِي ثَوْبِـهِ، فَنَـادَاهُ رَبُّـهُ يَـا أَيُّوبُ، أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى قَالَ بَلَى وَعِزَّتِكَ وَلَكِنْ لاَ غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِـكَ. رواه البخاري في الغُسل في الطَّهارة. وسيأتي في التَّفسير إن شاء الله فضل يوسف وكثيرٍ مـن الأنبياء[1]:

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: جـارێ ئـەییوب بـە رووتـی واتـە: بـەبێ پەشـتەماڵ گرتنـەوە بـە بەرکۆشیا، بەڵام بە تەنیا لە جێگەیێ چۆڵا خۆی دەشۆرد، لەوکاتـەدا کوللـەی زێرینـی بەسـەردا دابـاری، جـا ئـەییوب بـە مـشت زێرەکـەی دەکـردە نـاو جلەکانیـەوە، خوداوەنـد گـازی کـرد: ئـەی ئـەیووب! ئـەدی مـن بـێ نیـازم نەکردبوویت لە شتی وا ئیتر ئەم هەڵەپەیە بۆچی دەکەی؟ فەرمووی: با، بە گەورەیی تۆ وایە ئەوەندەت خێرو بێر پێ بەخشیوم کارم نیە بەم زێرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەرگیزاو هەرگیز لە پیتو فەڕی تۆ بێ نیاز نابمو ئەو زێرەش بەشێکە لە پیتو فەڕی تۆ، بۆیە کۆی دەکەمـەوە! (ب) خـودا حـەزکا لـە باسـی تەفسیردا باسی گەورەیی یووسفو گەلێ لە پێغەمبەرەکانی تریش دێ.

---

[1] تجريد البخاري (مختصر صحيح البخاري): ١٩٣/ ٢٧٩ ، ٣٣٩١ ، ٧٤٩٣.

## ١٢٠) ذولقەرنەینو عوزەیرو توببەع (خودایان لێ رازی بێ) ذو القرنين وعزير وتبع (رَضيَ أَللهُ تَعَالَى عَنهُمْ)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا - ١٨/٨٣-٨٥}.

واتە: ئەی موحەممەد! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی پاشای بەناو بانگی ذولقەرنەین، تۆ بڵێ: لەمەولا بەیانێکی رەساتان بە سەردا دەخوێنمەوە، کە هۆی شەرەفو شانازییە بۆ ئەوو هەموو پیاوچاکێکی وێنەی ئەو، بەراستی ئێمە ئەو زاتەمان دامەزران لە عەرزداو دەستمان پێ داو لە هەموو هۆیەكو کەرەستەی گەیشتن بە مرازمان پێ داو ئەویش کۆتاییو درێغی نەکردو کەوتە دووی هۆیەکان.

{وَقَالَ تَعَالَى: وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ - ٩/٣٠}.

هەندێ لە جوولەکەکان دەڵێن: گوایە عوزەیر کوڕی خودایە! وە هەندێ لە گاورەکانیش دەڵێن: گوایە عیسای مەسیح کوڕی خودایە! ئەمە گەزافەو قسەی دەمیانەو بەبێ بەڵگەو لێکدانەوە بە سەردەمو زمانیانا دێ، ئەمانە لاسکایی قسە پڕو پووچەکانی بێ بڕواکانی پێش خۆیان دەکەنەوە، خودا بیانکوژێ، خودا بچێ بە گژیانا! چلۆن ئەمانە رێگەی راستیان لاچووەتە بەستو رێگەی چەوتو چەوێڵیان گرتووەو دەیکەن بە رێ!

{وَقَالَ تَعَالَى: أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ - ٤٤/٣٧}.

خودای گەورە دەفەرموێ: ئایا ئەمانە بۆ هۆش ناکەنەوەو ئەقڵ ناگرنو واز لەم سەرکەشیو منجڕییە نایەننو سەر بۆ هەق دانانەوێنن؟ ئایا ئەوان لەگەڵ توببەع چاکترن، کە خودا تەفرتووناى کردنو کردنی بە کولۆرەی ئاشی بای فەناداو کردنی بە ئاردی ناو دڕکی ناو زەبەن!

٣٢١٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَدْرِى أَتُبَّعٌ لَعِينٌ هُوَ أَمْ لاَ وَمَا أَدْرِى أَعُزَيْرٌ نَبِىٌّ هُوَ أَمْ لاَ. رواه ابو داود والحاكم ولفظه: وَمَا أَدْرِى ذَا الْقَرْنَيْنِ أَنَبِيًّا كَانَ أَمْ لاَ[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): نازانم ئایا کە توببەع کافری نەفرین لێ کراوی بێ بڕوا بووە یا موسوڵمان بووە، وەناشزانم ئایا کە عوزەیر پێغەمبەری خودا بووە یانا ٠ئەبو داوود دەیگێڕتەوە (س/صالح – حاکم) گفتەی حاکم (خودای لێ ڕازی بێ) ئاوایە: وە ناشزانم ئایا ذولقەڕنەین پێغەمبەر بووە یانا.

٣٢١٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَدْرِى الْحُدُودُ طَهَارَةٌ لأَهْلِهَا أَمْ لاَ:وَلاَ أَدْرِى تُبَّعٌ أَلَعِينًا كَانَ أَمْ لاَ، وَلاَ أَدْرِى ذَوْ الْقَرْنَيْنِ نَبِيًّا كَانَ أَمْ مَلْكاً. رواه ابن عساكر.

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): نازانم کە ئایا جێبەجێ کردنی حەدد گوناهی حەدد لێ دراوەکە پاك دەکاتەوە بە تەواوی یا ئەمە تۆڵەی جیهانیەتیو تۆڵەی قیامەتی لە دواوە هەرماوە، ناشزانم ئایا کە توببەع بێ بڕوا بووە یانا دیارە کە هەموو بێ بڕوایەکیش لەعنەتییە، ناشزانم کە ئایا دولقەڕنەین پێغەمبەر بووە یاخود پادشا بووە. (ئیبنو عەساکیر) ئەم باسە تەماشا بکە: (ب – ٣ ز – ٢١).

٣٢٢٠- ولأحمد والطبراني: لاَ تَسُبُّوا تُبَّعاً فَإِنَّهُ قَدْ كَانَ أَسْلَمَ. والله أعلم.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جنێو مەدەن بە توببەع چونکە موسوڵمان بووە، واتە خودا پەرست بووە (ئە/طەبەرانی).

دانەر (پڕ گۆڕەکەی لە نوورو ڕەحمەتی خوا بێ) دەڵێ: ژمارەی فەرموودەکانی نامەی پێغەمبەرایەتی (١٧٣) فەرموودەیە. منیش لێرەدا فاتیحایێ دادەدەمو پاداشەکەی دەنێرم بۆ گیانی پاکی هەموو پێغەمبەرانو مامۆستاو شێخو

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

پیرو مشایەخانو کەسوکاری خۆمان، بە تایبەت. بۆ گیانی پاکی حەزرەتی پێغەمبەرو کەسوکاریو بۆ گیانی پاکی شێخ عەبدولقادری گەیلانیو کاکە ئەحمەدی شێخو شێخی ضیائەددینو سیراجەددینو عەلائەددینو دانەری ئەم نامە پیرۆزەیە، ئەوجا ئەم صەڵەواتە لە دیاری هەموو پێغەمبەران لێ دەدەم:

کــــوردێکم دڵپـــاک، موســـوڵمانێ ســـاغ

دەنێـــرم لەگـــەڵ چـــەپکێ گوڵـــە بـــاغ:

هــــەزاران ڕەحمــــەت، هــــەزاران ســــەلام

بــــۆ پێغەمبــــەران، عەلــــەیهیم ســــلام!

ئــــەوجا چــــون هــــەنگێ شــــیرە بنۆشــــێ

گــــوڵاو گــــوڵ هــــەڵاڵ پــــڕ بکــــا کۆشــــێ

شــــانەیێ هــــەنگوین ســــپی هەڵبەســــتێ

شایــــستەی دیــــاری بــــۆ خۆشەویــــستێ

منــــیش ناوەهــــا دەســــکێ ســــەڵاوات

تــــەڵ تــــەڵ دەچــــنم لــــە بــــاخی ئــــاوات

دەیکــــەم بــــە دیــــاری، دەیبــــەم بــــۆ ســــەروەر

دەیکــــەم بــــە مایــــەی تکــــای پێغەمبــــەر

تاقــــە ئومێــــدێ دڵــــەی نائومێــــد

بــــە تــــەمای مابــــێ: نــــەبێ نــــا ئومێــــد

لــــە ڕەحمــــەتی خــــوا لــــە دینــــی ئەحمــــەد

تــــالووتی دەدا لــــە بــــەردی ئەڵحــــەد!

قــــەتارەی هیــــوام تــــاک تــــاکو ریــــز ریــــز

لــە دەم کــەل وەریــن، وەک گــەڵای پـایز

نەچـاویان پــشکووت، نــە سـەریان هەڵــدا

ئاسمــان قــووتی دان یـا چــوون بــە عــەردا؟!

ڕەزام بـــە قــــەزای خـــودای بـــانی ســــەر

دەبینێمــە ســەر ســەر وەک تـاجی گەوهــەر!

لـە دنیـا وەک خـۆم کەسـێ تـر بـێ کـەس

شــــک نابــــەم، دەنــــا دەسمەنایــــە دەس

بۆیـــە هەمیـــشە کـــزو تــەنیا بــاڵ

کرووشـکەم کـردووە، لـە دەر، یـا لـە مـاڵ!

ڕەزام بــــە قــــەزای یـــەزدانی ســــەروەر

دەبینێمــــە بـــان چــاو دەبینێمــە ســەر ســەر

ئــــاخ لــــە دڵکـــــەم چـــەنێ هــــەژارە!

تــــازە بــــە تــــەمای بەفرەکـــــەی پـــارە!

تــــازە بــــە تـــەمای حـــوجرەی فەقێیــــە

تــــازە بــــە تــــەمای ڕاتـــووی نــــاو دێیــــە

تــــازە بــــە تــــەمای دڵــــی بـــێ خەمـــە

تــــازە بــــە تــــەمای چـــاوی بـــێ تەمــــە"

گــشتی بەسەرچــوو، وەک بەفرەکــەی پـار

مایــــــەوە دڵو پــــــەیکوڵو جــــــەخار!!

ســـەد هـــەزار خۆزگـــەم بـــە جـــاری جـــاران

کە لەکن مەحوی فەقێ بووین، یاران![1]

دڵی ناسوودە، کەللەی پڕ خرۆش

ژینی کردبوون بە بەهەشتی خۆش!

مەرخەمی نوێژو رۆژوومان بوایە

چەرخی زێڕین بوو، چەن خۆشبوو خوایە!

ئێستە ئێمەوخەمبووینە برادەر

ژینی گشت کوردێ، شینە هەتاسەر

کوردێکت بینی بێ خەم ناسوودە

ئەوە کوردنییە، دەنا نامەردە

ئەم دوو شیعرەو چەند شیعرێکی تر لەم

چامەیە رەقابە لە بەغدا گرتبووی

چونکە ئاشکرا قسە لەو رۆژە رەشە

دەکەن، کە لەپاش هەرەسهێنانی

---

[1] - جاران کە لە خزمەتی جەنابی مامۆستا مەلا ئەسعەدی مەحویدا فەقێ بووین، کە من خۆم ئیجازەی مەلایەتیم لە خزمەت ئەودا وەرگرتووە، کە قازی شەرعی سلێمانی ئەو سەردەمە کە ناوی رەشاد موفتی بوو بە دەستی خۆی مێزەری سپی لەسەر نامو جبەی مەلایەتی لەبەر کردم، (خودایان لێ رازی بێ) گەلێ جار مامۆستا مەلا ئەسعەد پێی دەفەرمووین: (أمرت بالتغافل ألا فتغافلوا) کە عەرزمان کرد: قوربان! ئەم حەدیسە لەچی کتێبێکدایە؟ فەرمووی: رۆڵەکانم! ئەوە حەدیس نییە، ئەوە قسەی دایکی عوسمانە، هەموو جارێ کە لە شت بکۆڵمەوە دەڵێ: مەلا! ئەوەندە لە شت مەکۆڵەرەوە، کەمێ خۆت لەماڵەوە بێ ئاگاکە!!
دایکی عوسمان خێزانی مامۆستا مەلا ئەسعەد بوو، (هەزار رەحمەتی لێ بێ) نانی دەستی ئەو ژنە رەحمەتییەم گەلێ خواردووە، ئەو هەر دایکی کاک عوسمان مەحوی نەبوو بەڵکوو دایکی هەموو فەقێکانی خانەقا بوو. (وەرگێڕ - ١٩٨٨/١١/٤)

ڕێکەوتنی (١١) ئازار گەلی کورد تیا دەژیا، م/ محمد علی قەرەداغی گێڕایەوە بۆم کە مصطفی شوکر ئەم شیعرانەی کرتاندبوو. (وەرگێڕ)

تێبینی: فەرمووده دووبارەکان، هەمیشە ژمارەی بەرگەکەیانو ژمارەی زنجیرەکەیانو ژمارەی ناو زنجیرەکەشیان، لەهەموو بەرگەکانا ڕاستە. جا ئەگەر هەڵەیێ لەڕەقەمە سەرەکییەکەیان دا هەبوو، بەئاسانی بەژمارەی بەرگو زنجیرەو ژمارەی ناو زنجیرەکە دەدۆزرێنەوە. ئیتر پەنا بەخوا.

وەرگێڕ

کاتی پاکنووسو هەڵەبژێری

ئەم بەرگە پیرۆزە بۆ جاری سێیەم

٢٠٠٨/٧/٢

بسم الله الرحمن الرحيم

## بەشی سێهەم: باسی گەورەیی‌و پاکژیی تەفسیرو خەبات‌و تێکۆشان

## نامەی گەورەیی‌و پاکژیی

(حەوت باس‌و پاشەکییەکە)

### ١) بەشی یەکەم: باسی گەورەیی‌و پاکژیی یارانی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بە تێکڕایی

### القسم الثالث: في الفضائل والتفسير والجهاد

بسم الله الرحمن الرحيم

### كتاب الفضائل (وفيه سبعة فصول وخاتمة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا – ٤٨/٢٩}.

خودای گەورە دەفەرموێ: موحەممەد پێغەمبەری خودایەو، یارەکانی ئازاو دلێرو نەبەردو بە جەرگن‌و لە ئاستی کافران بەزەبرو زەنگن‌و رەحمیان پێ ناکەن تا بەچە ترسێن‌و چاو ترسێنیان کەن، وە لەناو خۆیانا تا بڵێی میهرەبان‌و دڵسۆزی یەکترین وەك باب‌و کوڕ، ئەوە تا تۆ بە چاوی خۆت هەموو کاتێ دەیان بینی هەر خەریکی نوێژو چەمینەوەو کوڕنووش‌و خودا پەرستین‌و سەرگەرمی تاعەتی خودای خۆیانن، داوای بەخشش‌و رەزاو خۆشنوودیی خودا دەکەن‌و هەمیشە شەیدای رەزامەندیی خودان، شێوەی شیرینیان لە چارەیان دیارە، نوورو ناوچاوانی پاکیان نیشانەی بیرو باوەڕی دڵی رووناکیانە کە وەك مانگ‌و خۆر لەناو تەوێڵی نوورانییاندا دەدرەوشێتەوە کە ئەوەیش شوێنەواری بەردەوامی کوڕنووش‌و تاعەتی زۆرە، ئەم نیشانەو رەفتارە شیرینەی کە باس کرا دەربارەی ئەم دلێر مەردانە

ئەوەیە كە لە تەوراتا، كە نامەی خودایەو بە خەڵات داویّتی بە مووسا پیّغەمبەر، تۆمار كراوەو خەبەری پیّ دراوە!

٣٢٢١- عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. قَالَ عِمْرَانُ فَلاَ أَدْرِي أَذَكَرَ بَعْدَ قَرْنِهِ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا. ثُمَّ إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْمًا يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذُرُونَ وَلاَ يَفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ.[1]

← (ب - ٣ ز - ١١٧ ژمارە: ٣/٢٥٨٠) لیّرەدا ئاوایە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە گوتی: جا باش نازانم كە لە پاش چینی خۆی دوو چینی تری فەرموو، یا سێ چینی تری فەرموو، فەرمووشی (دروودی خودای لەسەربێ): لە پاش ئێوەوە هۆزێ پەیدا دەبن كەس داوای شایەتیدانیان لێ ناكا كەچی لە خۆیانەوە لووت دەبەنە پیّشەوەو دەبن بە شایەت‌و شایەتی دەدەن، وەگزی‌و ناپاكی‌و دەغەڵی دەكەن‌و جیّگەی بتمانەو باوەڕ پیّ كردن نین، وە فووتوو (نەذر) دەكەن‌و جیّبەجیّی ناكەن، وە قەڵەویی لە ناویانا بڵاو دەبیّتەوە (ش/د/ت).

٣٢٢٢- ← (ب - ٣ ز - ١١٧ ژمارە: ٣/٢٥٨٠)[2].

٣٢٢٣- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) سُئِلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: الْقَرْنُ الَّذِي أَنَا فِيهِ ثُمَّ الثَّانِي ثُمَّ الثَّالِثُ. رَوَاهُ مسلم[3].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیار كرا لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) چ كەس باشە؟ فەرمووی: ئەوانەی كە لەم سەدەیەدان كە منی تیّدام،

---

[1] تقدم برقم ٢٥٨١/٣ مجلد/ ٣ تسلسل/ ١١٧. بۆ ژیننامەی عیمرانی كوڕی حوصەین بڕوانە: (تجرید/١ / ٢٣٢ ژ: ٢٢٠).

[2] تقدم برقم: ٢٥٨٠/٣ مجلد / ٣ تسلسل / ١١٧.

[3] مسلم. فضائل الصحابة، رقم: ٦٤٢٥. بۆ ژیننامەی عائیشە بڕوانە: (تجرید/ل ١٦ ژ:٣).

لە پاش ئەوان ئەوانەی کە دەکەونە سەدەی دووەم، لە پاش ئەوانیش ئەوانەی کە دەکەونە سەدەی سێهەم (م).

٣٢٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيَقُولُونَ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَيَقُولُونَ نَعَمْ. فَيُفْتَحُ لَهُمْ. ثُمَّ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَيَقُولُونَ نَعَمْ. فَيُفْتَحُ لَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَيَقُولُونَ نَعَمْ. فَيُفْتَحُ لَهُمْ. رَوَاهُ الشيخان. وزاد مسلم في رواية: ثُمَّ يَكُونُ الْبَعْثُ الرَّابِعُ فَيُقَالُ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ أَحَدًا رَأَى مَنْ رَأَى أَحَدًا رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ:[٤].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەردەمێ دادێ، کۆمەڵێ خەڵك دەڕۆن بۆ غەزا دەڵێن: کەسمان تیا هەیە کە هاوڕێتیی پێغەمبەری کردبێ تا بە بەرەکەتی ئەوەوە خودا سەرمان بخا؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا لەو غەزایەدا زاڵیان دەکاو سەردەکەون‌و ئەو شوێنە دەگرن، لە پاشدا سەردەمێ دادێ، عەشاماتێ دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: ئایا کەسمان لەناودا هەیە کە هاوڕێتی هاوڕێیانی پێغەمبەری کردبێ؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخا، لە پاشدا سەردەمێ دادێ عەشاماتێ دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: کەس هەیە لەناومانا کە هاوڕێتی هاوڕێیانی یارانی پێغەمبەری کردبێ؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخاو ئەو وڵاتەیش دەگرن (ش) لە گێڕانەوەیەکا موسلیم ئەمەی پتر کردووە: ئینجا سەرەی لەشکری چوارەم دێ، دەگوترێ: تەماشا بکەن ئایا کەسێ دەبینن لە ناویانا کە کەسێکی تری

---

[٤] بخاری. جهاد: ٢٨٩٧، ٣٥٩٤، ٣٦٤٩ = تجرید / ١١٩٣ بەرگی / ٣ ل – ٣١٨. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤١٤، ٦٤١٥ (ژینامەی ئەبو سەعید تەجرید/ ١/٤٠ ژ: ١٩).

دیبێ کە ئەو کەسە یەکێکی تری دیبێ کە ئەو یارانی پێغەمبەری دیبێ؟ جا پیاوێ لەو چەشنە دەست دەکەوێ لە ناویانا، ئیتر بەهۆی ئەوەوە خودا سەریان دەخاو ئەو ولاتە دەگرن.

٣٢٢٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ الأَصْحَابِ خَرَجَا مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، وَمَعَهُمَا مِثْلُ الْمِصْبَاحَيْنِ يُضِيآنِ بَيْنَ أَيْدِيهِمَا، فَلَمَّا افْتَرَقَا صَارَ مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَاحِدٌ حَتَّى أَتَى أَهْلَهُ. رَوَاهُ البخاری فی علامات النبوة:[٥].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دووپیاو (لە یارانی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ)) لەلای حەزرەت بوون، کە لەکنی دەردەچن‌و دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، شەوەکەی زۆر تاریك دەبێ، وە دوو پارچە نوور لە چەشنی دوو چرای ڕۆشن لە گەڵیان دەڕۆن‌و لەبەر دەمیانەوە ڕۆشنییان بۆ دەکەن، کە لە ڕێ لە یەك جیا دەبنەوە هەر کەسەیان پارچە نوورێ لەگەڵی دەڕوا تا دەگاتە ماڵەوە (ب—خودایان لێ رازی بێ).

٣٢٢٦- عَنْ أَبِى مُوسَى (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ثُمَّ قُلْنَا نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ الْعِشَاءَ فَخَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولِ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: مَا زِلْتُمْ هَا هُنَا؟ قُلْنَا نَعَمء يَا رَسُولَ اللّهِ قُلْنَا نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ الْعِشَاءَ، قَالَ: أَحْسَنْتُمْ أَوْ أَصَبْتُمْ. ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ وَكَانَ كَثِيرًا مَايَفْعَلُهُ فَقَالَ: النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ وَأَنَا أَمَنَةٌ لأَصْحَابِى فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِى مَا يُوعَدُونَ وَأَصْحَابِى أَمَنَةٌ لأُمَّتِي فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِى أَتَى أُمَّتِى مَا يُوعَدُونَ. رَوَاهُ مسلم[٦]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: نوێژی شێوانمان لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) کرد، جا گوتمان: دادەنیشین تا نوێژی خەوتنانیش دەکەین،

---

[٥] بخاری. أبواب المساجد/ ٤٦٥، ٣٦٣٩، ٣٨٠٥ = تجرید/ ٢٨٥. بۆ ژیننامەی ئەنەس. بڕ: تەجریدی بوخاری/ ١ ل — ٣٤ ژ: ١٣).

[٦] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤١٣. (ئەبو موسا. تجرید/ ١ ل — ٣٣ ژ: ١١)

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كە هاتەوە بۆ لامان بۆ كردنی بەرنوێژیی نوێژی خەوتنان فەرمووی: هێشتا هەر لێرە ماون عەرزمانكرد: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا! لە دڵی خۆمانا گوتمان: بۆچی بڕۆینەوە یەكجاری دادەنیشین تا نوێژی خەوتنانیش دەكەین. فەرمووی: ئافەرین باشتان كردووە یا فەرمووی: چاكتان كردووە. جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان - گەلێ جار وای دەكرد - ئینجا فەرمووی: ئەستێرەكان نیشانەی ئاسایشی ئاسمانن كە ئەستێرەكان نەمان ئەوجا ئەو هەڕەشەیەی لە ئاسمان كراوە دێتەدی‌و جیهانخاپوور دەبێ‌و قیامەت هەڵدەستێ منیش نیشانەی ئەمن‌و ئاساییشم بۆ یارانی خۆم، جاكە من نەمام‌و مردم ئەوسا ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیەی لە یارانم كراوە دێتە جێ‌و ئاژاوەو دووبەرەكی‌و جیاجیایی سەر هەڵدەدەن، یارانیشم نیشانەی ئاسوودەگی‌و ئاساییشن بۆ ئوممەتم، جا كە یارانم نەمان‌و گشت مردن ئەوجا ئەو هەرەشەیەی لە ئوممەتم كراوە دێتە دی‌و شوێنی هەوەس‌و ئارەزوو دەكەون (م).

٣٢٢٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ عَبْدًا لِحَاطِبٍ جَاءَ لِرَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَشْكُو حَاطِبًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ لَيَدْخُلَنَّ حَاطِبٌ النَّارَ. فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَذَبْتَ لاَ يَدْخُلُهَا فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْرًا وَالْحُدَيْبِيَةَ. رَوَاهُ مسلم والترمذي[٧].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەندەیەكی حاطیب هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سكاڵای لە دەست حاطیب كردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بە راستی حاطیب دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ! فەرمووی: درۆدەكەی، ناچێتە ناوی چونكە ئەو حازری غەزای بەدرو غەزای حودەیبییە بووە (م/ت- خودایان لێ رازی بێ).

٣٢٢٨- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ عِنْدَ حَفْصَةَ: لاَ يَدْخُلُ النَّارَ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ أَحَدٌ. الَّذِينَ بَايَعُوا تَحْتَهَا. قَالَتْ: بَلَى يَا رَسُولَ اللّٰهِ. فَانْتَهَرَهَا

---

[٧] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٥٣. ترمذی. مناقب: ٣٨٦٤. (جابیر: تجرید/١ ل-١٧ ژ:٤).

فَقَالَتْ حَفْصَةُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بَعْدَهَا (ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا). رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذى[٨]:

دیسان لەوەوە گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەکن حەفصە (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: خوا حەزکا، هیچ کەس لە دەستەی ئەصحابولشەجەرە ناڕۆنە ناو دۆزەخ، ئەو دەستەیەی کە لەژێر دەرەختەکەدا لە ژێر دارسەمووروەکەدا کە لەکاتی حودەیبییەدا لەگەڵ من پەیمانیان بەست. حەفصەش دەڵێ: با دەچن، ئەی پێغەمبەری خودا! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) تێی دەخوڕێ‌و لێی تووڕە دەبێ، حەفصەش دەڵێ: ئەی ئەوە نییە خودای گەورە دەفەرموێ:

{وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا – ١٩ / ٧١}.

واتە: کەس نییە لە ئێوە کە بەناو دۆزەخا نەڕواو نەچێتە دۆزەخ. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە لە پاش ئەوەوە دەفەرموێ:

{ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا – ٧٢/١٩}.

واتە: بەڵام لە پاشا ئەوانەی کە خاوەن تەقوان‌و لە خوداترسن رزگاریان دەکەین‌و لەناو دۆزەخ دەریان دەکەین، وەستەمکارە بەدبەختەکان دەهێڵینەوە تیایا لەسەر ئەژنۆ بە داماوی‌و کزی‌و دۆشداماوی (م/د/ت).

٣٢٢٩- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَمَسُّ النَّارُ مُسْلِمًا رَآنِي أَوْ رَأَى مَنْ رَآنِي[٩]:

دیسان هەر ئەو گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ کە من ببینێ، یا کەسێ ببینێ کە ئەو کەسە منی دیبێ، ئەوە ئاگری دۆزەخ چەشکەی ناکا (ت-س/ح).

---

[٨] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٥٤.

[٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٣٢٣٠- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِي يَمُوتُ بِأَرْضٍ إِلاَّ بُعِثَ قَائِدًا وَنُورًا لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ الترمذی[١٠]:

بورەیدە (خودای لیّ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرمویّ (درودی خودای لەسەربێ): هەر کەسێ لە هاورێیانی من لە هەر خاکێ بمرێ، لە رۆژی قیامەتا کە زیندوو دەکرێتەوە دەبێ بە پێشەواو رەهبەرو بە نوورو رۆشنایی بۆ خەڵکی ئەوێ! (ت-سند غريب).

## ٢) جنێو پێدان‌و ناتۆرەکردنی یارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) تاوانێکی گەلێ گەورەیە

## سب الأصحاب جرم عظيم

٣٢٣١- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللّٰهَ اللّٰهَ فِي أَصْحَابِي اللّٰهَ اللّٰهَ فِي أَصْحَابِي لاَ تَتَّخِذُوهُمْ غَرَضًا بَعْدِي فَمَنْ أَحَبَّهُمْ فَبِحُبِّي أَحَبَّهُمْ وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ فَبِبُغْضِي أَبْغَضَهُمْ وَمَنْ آذَاهُمْ فَقَدْ آذَانِي وَمَنْ آذَانِي فَقَدْ آذَى اللّٰهَ وَمَنْ آذَى اللّٰهَ فَيُوشِكُ أَنْ يَأْخُذَهُ. رَوَاهُ الترمذی[١]:

عەبدوڵلای کوڕی موغەففە (خودای لیّ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە خودا بترسن، لە خودا بترسن، دەربارەی هاورێیانی من، دیسان لە خودا بترسن، لە خودا بترسن دەوربارەی هاورێیانی من، لەپاش خۆم مەیانکەن بە نیشانەی تانەو تەشەرتان، جا ئەوەی ئەوانی خۆش دەوێ ئەوە بۆیە خۆشی دەوێن چونکە بەراستی منی خۆش ەوێ‌و لە خۆشەویستی من ئەوانیشی خۆش دەوێ، وە ئەوەی رقی لەوانە ئەوە بۆیە رقی لێیانە چونکە لە دڵەوە رقی لەمنەو لە رقی من رقی لەوانیشە، وە ئەوەی ئازاریان دەدا، لە ژیانیانا یا لە پاش مردنیان ئەوە با بزانێ کە ئازاری من دەدات،

---

[١٠] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه) (بورەیدە/ تەجرید/ ١ / ٣٢٨ ژ: ٣٢٤).

[١] سكت عن درجته الشارح. (عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل تەجرید/ ١ / ٣٣٣ ژمارە/ ٣٣١).

ئـەوەی ئـازاری مـن دەدا ئـەوە بـا بـاش بزانـێ كـە ئـەوە ئـازاری خـودا دەدات ئەوەیشی كە ئازاری خودا دەدات بە زوویی خودا سەرەنگرێی دەكات (ت).

٣٢٣٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ بَـيْنَ خَالِـدِ بْـنِ الْوَلِيـدِ وَبَـيْنَ عَبْـدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ شَيْءٌ فَسَبَّهُ خَالِدٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ تَـسُبُّوا أَحَـدًا مِـنْ أَصْحَابِي فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَوْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ. رَوَاهُ الأربعة[٢]:

ئـەبو سـەعید گـوتی: شـتێ هـەبوو لـە نێـوان خالیـدی كـوڕی وەلیـدو ئـەورەحمانی كوڕی عەوفدا، خالید جنێوی دا بە ئـەوڕەحمان، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جمێن مەدەن بە هیچ كەسێ لـە هاوڕێیـانی مـن، گریمان یەكێ لەئێوە بەقەد كێوی ئوحود زێڕ ببەخشێتەوە هێشتا ناگات بە مشتێكی ئەوان، بگرە ناگات بە نیومشتیشیان! (ش/د/ت).

٣٢٣٣- وللترمذي: إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَسُبُّونَ أَصْحَابِي فَقُولُوا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى شَرِّكُمْ[٣]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر دیتان كەسێ جنێوی بـە هاوڕێیـان‌و یـارانی مـن دەدا، پێـی بڵـێن: لەعنـەت‌و نـەفرینی خـودا لـە خراپەكەتان بێ (ت).

**بەشی دووەم: باسی گەورەیی‌و پاكژی چواریاری حەزرەت** (درووودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر ئەوان بێ)

**باسی گەورەیی ئەبو بەكر** (ڕەزای خودای لێ بێ)

**الفصل الثاني: في فضائل الخلفاء الأربعة : فضائل أبي بكر** (رَضِي اللهُ عَنْهُ)

٣٢٣٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ خَطَبَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) النَّاسَ وَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ فَاخْتَارَ ذَلِكَ الْعَبْدُ مَا عِنْدَ اللَّـهِ.

---

[٢] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٦٧٣. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٣٥. أبو داود. السنة: ٤٦٥٨. ترمذي. مناقب: ٣٨٦١ م.

[٣] سكت عنه الشارح.

قَالَ: فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ، فَعَجِبْنَا لِبُكَائِهِ أَنْ يُخْبِرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ عَبْدٍ خُيِّرَ. فَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هُوَ الْمُخَيَّرُ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَنَابِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ مِنْ أَمَنِّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبَا بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً غَيْرَ رَبِّي لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ، وَلَكِنْ أُخُوَّةُ الإِسْلاَمِ وَمَوَدَّتُهُ، لاَ يَبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ بَابٌ إِلاَّ سُدَّ، إِلاَّ بَابَ أَبِي بَكْرٍ. وَفِي رِوَايَةٍ: وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ أُمَّتِي خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ، أَبَا بَكْرٍ، وَلَكِنَّه أَخِي وَصَاحِبِي وَقَدْ اتَّخَذ اللهِ صَاحِبَكُمْ خَلِيلاً. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وتارێكی دا بۆ یاران، فەرمووی: خودا بەندەیەكی خۆیی كردووە بە سەرپشك: كە یا لە جیهاندا بمێنێ یا ئەو بەش و بارەیە هەڵبگرێ كە لەلای خودا دانراوە بۆی، ئەو بەندەیەش ئەو بەش و بارەیەی هەڵبژارد كە لەلای خودایە. گوتی: جا ئەبو بەكر دەستی كرد بە گریان، ئێمە ئەم گریانەی ئەومان بەلاوە سەیربوو، تومەز ئەو بەندەیەی كە كرابوو بە سەرپشك و خاتر خۆ كرا بوو لە نێوان ئەم جیهان و ئەو جیهاندا پێغەمبەر خۆی بوو (دروودی خودای لەسەربێ) وە ئەبو بەكر (خودای لێ رازی بێ) لە ئێمە باشتر لە مەبستی فەرموودەكەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) تێ گەیشتبوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڕاستی ئەبو بەكر لە هەموو كەس پتر پیاوەتی بەسەرمنەوە هەیە چ بەسەر، چ بە ماڵ، ئەگەر من لە ئۆمەتم كەسێكم بگرتایە بە دۆست بۆ خۆم ئەبو بەركم هەڵدەبژاردو دەمكرد بە دۆستی گیانی بە گیانی خۆم، بۆیەش كەسی تر ناكەم بە دۆست بۆ خۆم چونكە من خودا كردوومی بە دۆستی خۆی بەلام لەگەڵ ئەمەشدا تا بلێی برایەتی و دۆستایەتی ئایینی ئیسلام لە نێوانمانا پتەوو بەهێزە لە سایەی خوداوە، هەر دەرگایەك لەسەر مزگەوتە دەبێ بگیرێ تەنیا دەرگای ماڵەكەی ئەبو بەكر نەبێ. لە گێڕانەوەیەكا: گریمان من كەسێكم – لە ئۆمەتم – بگرتایە بە دۆست

---

[1] بخاری. صلاة: ٤٦٦ = ٢٨٦ تجرید رفاه: ٤٦٥٤ ، ٣٩٠٤. ترمذی. مناقب: ٣٦٦٠

(خەلیل) ئەبو بەکرم هەڵدەبژاردو ئەوم دەکرد بە دۆستی گیانی بەگیانی خۆم، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشا لە سایەی خوداوە هەم برای ئایینیمەو هەم هاوڕێمە، وە منی هاوڕێی ئێوە خودا دەستی قەدرو رێزی لێ ناوم‌و هەڵی بژاردووم‌و کردوومی بە دۆستی خۆشەویستی خۆی (ش/ت- نوقمی شەپۆلی میهرەبانی یەزدان بێ) رەحمەت لەو کەسەی گوتوویە:

**مەرد لە چاکەی مەرد هەرگیز دەرناچێ**

**پیاوەتی‌و مەردییش قەت لەبیر ناچێ**

٣٢٣٥- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ آخِذًا بِطَرَفِ ثَوْبِهِ حَتَّى أَبْدَى عَنْ رُكْبَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَّا صَاحِبُكُمْ فَقَدْ غَامَرَ. فَسَلَّمَ، وَقَالَ إِنَّهُ كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ ابْنِ الْخَطَّابِ شَيْءٌ فَأَسْرَعْتُ إِلَيْهِ ثُمَّ نَدِمْتُ، فَسَأَلْتُهُ أَنْ يَغْفِرَ لِي فَأَبَى عَلَيَّ، فَأَقْبَلْتُ إِلَيْكَ فَقَالَ: يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ. ثَلاَثًا، ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ نَدِمَ فَأَتَى مَنْزِلَ أَبِي بَكْرٍ فَسَأَلَ أَثَمَّ أَبُو بَكْرٍ فَقَالُوا لاَ. فَأَتَى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ فَجَعَلَ وَجْهُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَمَعَّرُ حَتَّى أَشْفَقَ أَبُو بَكْرٍ، فَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا كُنْتُ أَظْلَمَ مَرَّتَيْنِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ اللَّهَ بَعَثَنِي إِلَيْكُمْ فَقُلْتُمْ كَذَبْتَ. وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ صَدَقَ. وَوَاسَانِي بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَهَلْ أَنْتُمْ تَارِكُو لِي صَاحِبِي. مَرَّتَيْنِ فَمَا أُوذِيَ بَعْدَهَا[٢]:

ئەبو دەرداء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) دانیشتبووم، لە ناکاو ئەبو بەکر پەیدابوو، داوێنی جلەکەیی گرتبوو بە دەستیەوە، بە رەنگێکی وا ئەژنۆکانی دەرکەوتبوون، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە لەسەر ئەم حاڵە ئەبو بەکری دی فەرمووی: وا دیارە ئەم هاوڕێیەتان قەوماندوویەتی! ئەبو بەکر هاتە بەرەوەو سڵاوی کردو گوتی: ئەوەی راست بێ لە نێوانی من‌و عومەری کوڕی خەتتابدا شتێ رووی دا، وە

[٢] بخاری. فضائل الصحابة؛ ١٤٥١ تجرید = ٣٦٦١ ، ٤٦٤٠ فتح الباری. (ئەبو دەرداء. تەجرید/ ٢ / ٢٨٣ ژ: ٨٩٧ / ١٩٤٥).

من خۆم پێ ڕانەگیراو قسەی ڕەقم پێ گوت، بەڵام لە پاشا پەشیمان بوومەوەو داوام لێی کرد کە لێم خۆش بێ‌و چاوپۆشیم لێ بکا، کەچی ئەو بەگوێی نەکردم، جاوا هاتووم بۆلای تۆ ئەی پێغەمبەری خودا! تا تۆ ناوبژیمان بکەی. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار لەسەریەك فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر خودا! لێت خۆش بێ. لە پاشدا عومەر پەشیمان دەبێتەوەو دەچێ بۆ ماڵی ئەبو بەکرو دەپرسێ: ئەرێ ئەبو بەکر لە ماڵە؟ دەڵێن: نەء، ئیتر هەر لەوێوە دێ بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە گەیشتە بەرەوە سڵاوی کرد، جا بەرەبەرە ڕووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گرژ بوو، بە ڕەنگێکی وا کە ئەبو بەکر ترسی لێ نیشت کە عومەر لەسەر ئەو لەلایەنی پێغەمبەرەوە تووشی شتێ ببێ، ئیتر ئەبو بەکر هات بە چۆکا لە خزمەتی پێغەمبەرداو بۆ عومەر پاڕایەوەو گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! زۆرتری سووچی من بوو، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کە خودا منی کرد بە پێغەمبەرو ڕەوانەی کردم بۆ ناوتان، ئێوە دەتانگوت: درۆ دەکەی، بەڵام ئەبو بەکر دەیگوت: ڕاست دەکا، وە ئەبو بەکر چ بە سەر، چ بە ماڵ فریام کەوت‌و بەسەرو ماڵ خۆی کردووە بە قوربانی ئیسلام، ئینجا دووجار لەسەر یەك فەرمووی: کە حاڵ وایە ئەدیی ئیتر بۆ واز نایەنن لەم هاوڕێیەم لەبەر خاتری من! گوتی: ئیتر بڕای بڕای لە پاش ئەمە کەس ئازاری ئەبو بەکری نەدا (ب).

٣٢٣٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَاتَ وَأَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِالسُّنْحِ فَقَامَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ: عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: وَاللَّهِ مَا كَانَ يَقَعُ فِي نَفْسِي إِلاَّ ذَاكَ وَلَيَبْعَثَنَّهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَلَيَقْطَعَنَّ أَيْدِيَ رِجَالٍ وَأَرْجُلَهُمْ فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَكَشَفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَبَّلَهُ وَقَالَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي طِبْتَ حَيًّا وَمَيِّتًا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُذِيقُكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْمَوْتَتَيْنِ أَبَدًا. ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: أَيُّهَا الْحَالِفُ عَلَى رِسْلِكَ فَجَلَسَ عُمَرُ فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: أَلاَ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا فَإِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ مَاتَ وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ وَقَالَ اللهُ تَعَالَى:

(إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ) وَقَالَ (وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ) قَالَ: فَنَشَجَ النَّاسُ يَبْكُونَ قَالَ: وَاجْتَمَعَتِ الأَنْصَارُ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ فَقَالُوا مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ فَذَهَبَ إِلَيْهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمْ) فَذَهَبَ عُمَرُ يَتَكَلَّمُ فَأَسْكَتَهُ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) فَكَانَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) يَقُولُ: وَاللَّهِ مَا أَرَدْتُ بِذَاكَ إِلاَّ أَنِّي قَدْ هَيَّأْتُ كَلاَمًا قَدْ أَعْجَبَنِي خَشِيتُ أَنْ لاَ يُبْلِغَهُ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ وَأَبْلَغَ فَقَالَ فِي كَلاَمِهِ: نَحْنُ الأُمَرَاءُ وَأَنْتُمُ الْوُزَرَاءُ. قَالَ الْحُبَابُ بْنُ الْمُنْذِرِ: لاَ وَاللَّهِ لاَ نَفْعَلُ أَبَدًا مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ): لاَ وَلَكِنَّا الأُمَرَاءُ وَأَنْتُمُ الْوُزَرَاءُ هُمْ أَوْسَطُ الْعَرَبِ دَارًا وَأَعْرَبُهُمْ أَحْسَابًا فَبَايِعُوا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ أَوْ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ. فَقَالَ عُمَرُ: بَلْ نُبَايِعُكَ أَنْتَ فَأَنْتَ خَيْرُنَا وَسَيِّدُنَا أَحَبُّنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَخَذَ عُمَرُ بِيَدِهِ فَبَايَعَهُ وَبَايَعَهُ النَّاسُ فَقَالَ قَائِلٌ: قَتَلْتُمْ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ. فَقَالَ عُمَرُ: قَتَلَهُ اللَّهُ[٣]:

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە مرد لەوکاتەدا ئەبو بەکر لە سونح بوو، عومەر (خودای لێ رازی بێ) هەڵسا وتارێکی داو گوتی: بەخودا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەمردووە! وە لەوە دوا عومەر دەیگوت: بە خودا لە راستیدا ئەوە قسەی دڵم بوو، هەروا عومەر لە وتارەکەیدا گوتی: بەخودا خودای گەورە پێغەمبەر زیندوو دەکاتەوەو دەست‌و پای ئەو پیاوانە دەبڕێ کە دەڵێن: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە ئێجگاری مردووە، جا ئەبو بەکر هاتەوەو چووە سەر تەرمەکەی پێغەمبەرو سەری پێغەمبەری هەڵدایەوەو نێوانی هەردوو چاوەکانی ماچکردو گوتی: بە باوکم‌و بەدایکمەوە بەقوربانت بم، چ بە زیندوویی‌و چ بەمردوویی چەندە پاک‌و نازداری! بەو کەسە کە گیانی منی بە دەسە هەرگیز خودا لە جیهاندا دووجار ناتمرێنێ.**

---

[٣] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٦٧٠.

ئینجا چووە دەرەوەو چوو بۆ ناو عەشاماتەکەو بە عومەری گوت: ئەی سوێند خۆر! هێواش، جا عومەر دانیشت‌و ئەبو بەکر دەستی کرد بە قسەکردن‌و سوپاس‌و ستایشی خودای کردو گوتی: باش باش بزانن! ئەوەی کە موحەممەدی دەپەرست بێگومان ئەوا موحەممەدمرد، وە ئەوەشی کە خودا دەپەرستێ ئەوا دیارە کە خودا هەرماوەو زیندووەو قەت نامرێ! وە ئەوەتا خودای مەزن لە قورئان دا دەفەرموێ:

{إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ - ٣٩/٣٠}.

واتە: وەکوو تۆ دەمری ئەوانیش دەمرن! وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ - ٣/١٤٤}.

واتە: مەحەممەدیش تەنیا پێغەمبەرێکە وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی کە لە پێش ئەوەوە بوون‌و هاتوون‌و رابوردوون، جا ئایا ئەگەر ئەو بمرێ یا بکوژرێ ئێوە وەردەگەڕێن لەسەر پاژنەتان بەرەو دوا؟! واتە: دەگەڕێنەوە بۆ سەر کوفرو بتپەرستی سەردەمی نەفامی، دیارە کە هەر کەسێ لە هەق لاری بێ‌و رێگەی راست بەرداو رێگەی چەوت بگرێ ئەوە هەر خۆی زیان دەکاو خودا بەوە هیچ زیانی لێ ناکەوێ بەڵگەنەویستیشە کە خودا لەمەولا پاداشی ئەو کەسانە دەداتەوە کە سوپاسی خودایان کردووە.

گوتی: ئیتر خەڵکەکە دایان لە پڕمەی گریان. گوتی: لەولاشەوە یاریدەدەران (ئەنصار) لەلای سەعدی کوڕی عوبادە لە ساباتەکەی بەنی ساعیدە کۆ دەبنەوەو کۆمەڵ دەبەستن‌و دەڵێن: دەبێ فەرمانڕەوایێ لە ئێمەو فەرمانڕەوایێ لە ئێوە بێ، جا ئەبو بەکرو عومەرو ئەبو عوبەیدەی جەرراح دەچن بۆ لایان، عومەر دەیەوێ دەست بەقسە بکات، بەڵام ئەبو بەکر رێگەی نادا، عومەر خۆی دەیگوت: بەخودا من لەو قسەکردنە مەبەستم تەنیا ئەوە بوو، وتارێکم ئامادەکردبوو، زۆر جوان بوو، بەدڵم بوو، مەترسیم هەبوو کە

ئەبو بەكر پەی بەوتاری وا نەبا، ئینجا ئەبو بەكر بە جوانی دێتە قسەو لەناو فەرمایشتەكەیدا دەڵێ: ئێمە فەرمانڕەواو ئێوە شالیارو راوێژكارمان بن! حوبابی كوڕی مونزیریش دەڵێ: نەخێر، بەخودا شتی واناكەین، فەرمانڕەوایێ لە ئێمە كە دەستەی یاریدەدەرانین‌و فەرمانڕەوایێ لە ئێوە، كە دەستەی قوڕەیشن، ئەبو بەكریش دەڵێ: خەیر! بەڵام ئێمە فەرمانڕەواو ئێوە وەزیرو راوێژیار، وڵاتی قوڕەیش سەرتەڵی وڵاتی عەرەبە چونكە برێتییە لە مەككەی پیرۆز كە كابەی نازداری لێیە وە بۆ خانەدانیش تا بڵێی خانەدانن، كەواتە بەیعەت‌و پەیمان بدەن بە عومەر، یا بە ئەبو عوبەیدە، عومەریش دەڵێ: بەڵكوو پەیمان دەدەین بەتۆو تۆ دەكەین بەفەرمانڕەوای خۆمان، چونكە تۆ گەورەمانیت‌و چاكترین كەسمانیت‌و پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) لە هەمووماین زیاتر تۆی خۆش دەویست جا عومەر دەستی ئەبو بەكر دەگرێ‌و پەیمان‌و بەیعەتی دەداتێ، ئیتر خەڵكەكەش پەیمانی دەدەنێ. جا لەو كاتەدا كابرایێ دەڵێ: ئێوە بەم پەیمان دانەبە ئەبو بەكر سەعدی كوڕی عوبادەتان كوشت بۆیە وای گوت چونكە سەعد سەركەورەی یاریدەدەران بوو بەتەمابوو خۆی ببێ بەسەرۆك عومەریش وەڵامی كابرا دەداتەوەو دەڵێ: خودا بیكوژێ ئێمە بۆ دەیكوژین (ب—خوای لێ رازی بێ).

٣٢٣٧- عَنْ عَمَّارٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا مَعَهُ إِلاَّ خَمْسَةُ أَعْبُدٍ وَامْرَأَتَانِ وَأَبُو بَكْرٍ. روى البخاری هذه الثلاثة[٤]:

عەممار (خودای لێ رازی بێ) گوتی: خۆم پێغەمبەرم دیوە (درودی خودای لەسەربێ) تەنیا پێنج بەندەو دوو ئافرەت‌و ئەبو بەكر نەبێ كەسی تری لەگەڵ دا نەبوو! (ب—خودای لێ رازی بێ).

٣٢٣٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَرَضِهِ: ادْعِي لِي أَبَا بَكْرٍ وَأَخَاكِ حَتَّى أَكْتُبَ كِتَابًا فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ وَيَقُولَ قَائِلٌ أَنَا أَوْلَى. وَيَأْبَى اللَّهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبَا بَكْرٍ[٥]:

---

[٤] تجریدی بخاری: ١٤٥٠ = ٣٦٦٠ ، ٣٨٥٧ متح الباری (عە مار. تەجرید/ ٤ ل — ١٤٠ ژ: ١٤٥١).

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەو نەخۆشییەیدا کە تیامرد فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەبو بەکری باوکت‌و براکەتم بۆ بانگ بکە، هەتا وەصییەتنامەیێ بنووسم بۆ ئەبو بەکر کە لەپاش خۆم ئەو جێنشینم بێ، نەبادا هەر کەسە بۆخۆی هەوڵ بدا بۆ شوێنەکەم‌و بڵێ: هەقی منەو بۆ من ڕەواترەو بڕوبیانوو بۆ ئەمە بدۆزەرەوە، وەلێ نا، پێویست بەنامە ناکا، چونکە خودا ئەوە ناکات‌و موسوڵمانانیش شتی وا قەبووڵ ناکەن‌و جگە لە ئەبو بەکر بەکەسی تر ڕازی نابن کە لەپاش خۆم ببێ بە جێنشینم (م).

٣٢٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً؟ قَالَ: أَبُو بَكْرٍ أَنَا. قَالَ: فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ أَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ. رواهما مسلم[٦]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کامتان ئەمڕۆ بەڕۆژوون؟ ئەبو بەکر دەڵێ: من، دەفەرموێ: ئەی کێتان ئەمڕۆ لەگەڵ تەرما چووە بۆ سەرگۆڕستان؟ ئەبو بەکر دەڵێ: من، دەفەرموێ: ئەی کامتان ئەمڕۆ سەری لە نەخۆش داوە؟ ئەبو بەکر دەڵێ: من. دەفەرموێ: ئەی کامتان ئەمڕۆ نانی هەژارێکی داوە؟ ئەبو بەکر دەڵێ: من. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەی ئەم کارە باشانە لەهەر کەسێکا کۆ ببنەوە مسۆگەر ئەو کەسە دەچێتە بەهەشت (م).

٣٢٤٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلَامِ) فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَرَانِي بَابَ الْجَنَّةِ الَّذِي تَدْخُلُ مِنْهُ أُمَّتِي. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَدِدْتُ أَنِّي

---

[٥] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٣١.

[٦] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٣٢. (ئەبو هورەیرە/ تەجرید/ ١ / ٣١ ژ: ٩).

كُنْتُ مَعَكَ حَتَّى أَنْظُرَ إِلَيْهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَا إِنَّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي. رَوَاهُ أبو داود[٧]:

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆلام‌و دەستی گرتم‌و ئەو دەرگایەی بەهەشتی پێ نیشان دام كە گەلەكەم لێیەوە دەچنە ناو بەهەشت ئەبو بەكریش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگەم لەگەڵتا دەبووم بەڵكوو تەماشایم بكردایە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بزانە — ئەی ئەبو بەكر !– كە تۆ یەكەم كەس دەبیت لە ئۆمەتم كە دەچیتە بەهەشت. (د) دانەر– پڕ كلكۆی لە میهرەبانی خودابێ — لە شەرحەكەدا دەڵێ: لەپاش ئەبو بەكر عومەر دەچێتە بەهەشت، ئەوجا عوثمان، ئەوجا عەلی، ئەوجا ئەوانی تری دەكەسە مژدە بە بەهەشت پێ دراوەكان، ئەوجا ئەوانی تری هاوڕێیان ئەوجا پەیڕەوان (تابیعین = چینی دووەمی موسوڵمانان) ئەوجا پەیڕەوانی پەیڕەوان (ئەتباعول تابیعین = چینی سێیەمی گەلی موسوڵمان) ڕەزاو خۆشنوودی خودا لە هەموویان، لەگەڵ ڕەچاو كردنی ئەم خاڵەدا: كە هەژارانی هەموو چینێ لەم چینانە وەپێش ئەوانی تریان دەكەون!

٣٢٤١– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا لأَحَدٍ عِنْدَنَا يَدٌ إِلاَّ وَقَدْ كَافَيْنَاهُ مَا خَلاَ أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا يَدًا يُكَافِئُهُ اللَّهُ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَا نَفَعَنِي مَالُ أَحَدٍ قَطُّ: مَا نَفَعَنِي مَالُ أَبِي بَكْرٍ[٨]:

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەستیاوی كەسمان بەسەرەوە نەماوە كە تۆڵەو هەقمان بۆ نەكردبێتەوە، دەستیاوی ئەبو بەكر نەبێ پیاوەتی ئەومان بەسەرەوە ماوە، لە ڕۆژی قیامەتدا خودا خۆی

---

[٧] سكت عن درجته الشارح:

[٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

پاداشی گەورەی ئەوەی دەداتەوە، ماڵ‌و دارایی کەسیش -- هەرگیزاو هەرگیز – وەك ماڵ‌و دارایی ئەبو بەکر بە فریام نەکەوتووە! (ت–س/ح).

٣٢٤٢– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) أَنَّهُ قَالَ لأَبِي بَكْرٍ: أَنْتَ صَاحِبِي عَلَى الْحَوْضِ وَصَاحِبِي فِي الْغَارِ[٩]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئەبو بەکری فەرموو: تۆ هاوڕێی سەرحەوزی کەوسەرم دەبی هەروەك لە ئەشکەوتی حیرادا هاوڕێم بووی (ت–س/ص).

٣٢٤٣– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: أَنْتَ عَتِيقُ اللّٰهِ مِنَ النَّارِ. قَالَتْ: فَمِنْ يَوْمِئِذٍ سُمِّيَ عَتِيقًا[١٠]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ ئەبو بەکر چووە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەزرەت پێی فەرموو: تۆ ئازادکراوی خودای‌و قوتاربووی لە ئاگری دۆزەخ، ئیتر لەو رۆژەوە ئەبو بەکر ناونرا: عەتیق واتە: ئازادکراو (ت–سند غریب).

٣٢٤٤– وَعَنْهَا عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لاَ يَنْبَغِي لِقَوْمٍ فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَؤُمَّهُمْ غَيْرُهُ. روى هذه الأربعة الترمذي[١١]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەبو بەکر لەناو هەر کۆمەڵێکا بێ، دەبێ ئەو بەرنوێژییان بۆ بکا (ت–سەند غەریب).

---

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه). (عومەر. تەجرید/١٣٨/٢ ژمارە/ ٧١٦ تەجرید = ١٤٩٠ فەتح).

[١٠] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١١] رواه الترمذي بسند غيب (شرحه).

## ٤) باسی پاکژی و گەورەیی حەزرەتی عومەر (خودای لێ رازی بێ)
## فضائل عُمَرْ (رَضِي اللّهُ تَعالَی عَنهُ)

٣٢٤٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ، وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَايَبْلَغ دُونَ ذَلِكَ، وَمَرَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ. قَالُوا مَاذَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللّهِ قَالَ: الدِّينَ. رَوَاهُ الشيخان[1]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نوستبووم لە خەوما ئەو خەڵکەم نیشان دەدران هەموو سەرو کراسیان لەبەردابوو، هەیان بوو کراسەکەی دەگەیشتە سەر مەمکی و هەیان بوو لەوە زیاتر یا کەمتر بوو، بەڵام کە سەرەی عومەری کوڕی خەتتاب هات و ئەو بە بەردەمما رەت بوو، تەماشام کرد کراسێکی ئاودامانی لەبەردابوو لەبەر پێی دەخشا عەرزییانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوەت بەچی خەوپەرژین کردو بەچی لێکت دایەوە؟ فەرمووی: بە ئایین (ش).

٣٢٤٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إذْ رَأَيْتُ قَدَحًا أُتِيتُ بِهِ فِيهِ لَبَنٌ فَشَرِبْتُ مِنْهُ حَتَّى إنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَجْرِي فِي أَظْفَارِي ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ. قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللّهِ قَالَ: الْعِلْمَ[2]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ خەوتبووم، لەخەوما کاتێکم زانی پیاڵەیێ شیریان بۆ هێنام، جا خۆم لێیم خواردەوە هەتا تەواو پاراو بووم و شیر لەسەری نینۆکەکانمەوە سەری کردو لە لووتمەوە هاتەوە، ئینجا پاشماوەکەی خۆمم دا بە عومەری کوڕی خەتتاب گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بەچی لێك دەدەیتەوە؟ فەرمووی: بەزانین (ش).

---

[1] بخاری. إیمان: ٢٢ = تجرید ، ٣٦٩١ ، ٧٠٠٨ ، ٧٠٠٩ مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٣٩. ترمذي. رؤیا: ٢٢٨٥. نسائی. ایمان: ٥٠٢٦.

[2] بخاری. علم: ٨٢ = تجرید/ ٧٢ ، ٣٦٨١ ، ٧٠٠٦ ، ٧٠٠٧ ، ٧٠٢٧ ، ٧٠٣٢.

٣٢٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لَقَدْ كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ رِجَالٌ يُكَلَّمُونَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَكُونُوا أَنْبِيَاءَ، فَإِنْ يَكُنْ مِنْ أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ فَعُمَرُ. رواهما الشيخان والترمذى (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمْ)[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە پێشینان، لە نەوەی ئیسرائیل، لە هۆزی جوولەکە گەلیٚ پیاوی وا هەبوون لەگەڵ ئەوەدا کە پێغەمبەر نەبوون، بەڵام قسەیان راست دەردەچوو، وەك خودا بیخاتە ناو دڵیان وابوو، یا فریشتە قسەیان بۆ بکا ئاوا، جا ئەگەر لە ئوممەتی من ئەم جۆرە پیاوە هەبیٚ عومەر یەکێکە لەوان! (ش/ت—خودایان لیٚ رازی بێ).

٣٢٤٨- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عَلَى النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَعِنْدَهُ نِسْوَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُكَلِّمْنَهُ وَيَسْتَكْثِرْنَهُ، عَالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ عَلَى صَوْتِهِ فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ قُمْنَ فَبَادَرْنَ الْحِجَابَ فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَدَخَلَ عُمَرُ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَضْحَكُ، فَقَالَ عُمَرُ أَضْحَكَ اللّٰهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَجِبْتُ مِنْ هَؤُلاَءِ اللاَّتِي كُنَّ عِنْدِي فَلَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ ابْتَدَرْنَ الْحِجَابِ. فَقَالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ أَحَقُّ أَنْ يَهَبْنَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ. ثُمَّ قَالَ عُمَرُ يَا عَدُوَّاتِ أَنْفُسِهِنَّ، أَتَهَبْنَنِي وَلاَ تَهَبْنَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقُلْنَ نَعَمْ، أَنْتَ أَفَظُّ وَأَغْلَظُ فَقَالَ: رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إِيهًا يَا ابْنَ الْخَطَّابِ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ سَالِكًا فَجًّا قَطُّ: إِلاَّ سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ[٤]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خودای لیٚ رازی بێ) گوتی: دەستەییٚ لە ژنانی قورەیش لەلای حەزرەت دەبن‌و گوفتوگۆی لەگەڵ دەکەن بە دوورو درێژیی، لەبەر غەڵبەغەڵبی خۆیان دەنگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کپ دەکەن، جا

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٥٤. ترمذي. مناقب: ٣٦٩٣. بخارى. فضائل الصحابة: ٣٦٨٩.

[٤] بخارى. بدء الخلق: ٣٢٩٤، ٣٦٨٣، ٦٠٨٥. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٥٢. (ژیاننامەی سەعد: بڕ: تەجرید/ ١ ل — ٤٦: ٢٦).

لەوكاتـەدا عومـەر داوای ڕێگـە دەكـا كـە بـچێ بـۆ لای حـەزرەت (دروودی خـودای لەسەربێ) ئیتر ژنەكان گورج هـەڵ دەسن‌و خۆیـان دەپێچنەوەو دەیانـەوێ بڕۆن، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەربێ) ڕێگـە دەدا بـە عومـەرو عومـەر دەچـێتە ژوورەوە، دەڕوانـێ وا حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پـێ دەكـەنێ، دەڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! یـاخودا پێكـەنینی خێـرت بـێ، خێـرە وا پـێ دەكـەنی؟ دەفەرموێ: سەیرم هات لەم ژنانە كە لەلای منن، هەر كە گوێیان لە دەنگی تۆ بوو گورج پەلاماریان دا پەچەیان گرتەوەو خۆیان گرد كردەوە! عومەر گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەق وابوو كە ئەمانە شەرم‌و شكۆ لـە تۆ پتر بكەن، ئینجا عومەر بە ژنەكانی گوت: ئەی دوشمنانی خۆتان! چۆن سام لەمن دەكەن‌و كەچی سام لە حەزرەت ناكەن! گوتیـان: ئـاخر تـۆ مۆنیت‌و پیـاوێكی گەڵ ڕەق‌و توندو تیژیت، بەڵام حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) زۆر بە نەزاكـەت‌و نەرمو نیان‌و هێدییە جا حـەزرەت (دروودی خودای لەسـەربێ) فـەرمووی: بەسـە، ئـەی كـوڕی خـەتتاب! ئـەم بەسـەزمانانە لـە كـوێ دەرەقـەتی تـۆدێن، تـۆ شـەیتان دەرەقتت نایێ، بەوكەسە كە ڕەوانـی منـی وا لـە دەسـا تـۆ لەهـەر ڕێگەیەكـەوە بڕۆی شەیتان لەترسی تۆ بەو ڕێگەیەدا ناڕوا! (ش).

٣٢٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ، فَإِذَا امْرَأَةٌ تَتَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ فَقَالُوا لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَذَكَرْتُ غَيْرَتَهُ، فَوَلَّيْتُ فَبَكَى عُمَرُ وَقَالَ: أَعَلَيْكَ أَغَارُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. رواهما الشيخان[٥]:

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: خـەوتبووم، وا لـە خـەوما وام لـە بەهەشـتا، كـە تەماشـام كـرد وا ئافرەتـێ لـەپاڵ كۆشـكێكا دەسـنوێژ دەگـرێ گـوتم: ئـەم كۆشـك‌و تـەلارە هـی كێیە؟ گوتیان: هیی عومەرە، جا ویستم كە بچمە ناوی‌و تەماشای بكەم بەڵام

---

[٥] بخاری. نكاح: ٥٢٢٧. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٤٨.

كەیادی غیرەتی عومەرم كەوتەوە كە چەندە بە تەنگ: ناموسەوە دێت ئیتر نەچووم‌و بەرەو دوا گەڕامەوە (ش).

٣٢٥٠- عَنْ أَبِي بُرَيْدَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فَدَعَا بِلاَلاً فَقَالَ: يَا بِلاَلُ بِمَ سَبَقْتَنِي إِلَى الْجَنَّةِ مَا دَخَلْتُ الْجَنَّةَ قَطُّ: إِلاَّ سَمِعْتُ خَشْخَشَتَكَ أَمَامِي دَخَلْتُ الْبَارِحَةَ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْخَشَتَكَ أَمَامِي فَأَتَيْتُ عَلَى قَصْرٍ مُرَبَّعٍ مُشَرَّفٍ مِنْ ذَهَبٍ فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ فَقَالُوا: لِرَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ فَقُلْتُ: أَنَا عَرَبِيٌّ لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ قَالُوا: لِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ قُلْتُ: أَنَا قُرَشِيٌّ لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ قَالُوا لِرَجُلٍ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ قُلْتُ أَنَا مُحَمَّدٌ لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ قَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ. فَقَالَ بِلاَلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَذَّنْتُ قَطُّ: إِلاَّ صَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ وَمَا أَصَابَنِي حَدَثٌ قَطُّ: إِلاَّ تَوَضَّأْتُ عِنْدَهَا وَرَأَيْتُ أَنَّ لِلَّهِ عَلَيَّ رَكْعَتَيْنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بِهِمَا. رَوَاه الترمذي والشيخان[٦]:

ئەبو بورەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەیانی زوو بیلالی گاز كردو پێی فەرموو: ئەی بیلال! هەرچەندە دەڕۆم بۆ بەهەشت گوێم لە چرپەی پێتە لە پێشمەوە لە بەهەشتا دەڕۆیت، پێم بڵێ بەچی پێش من دەكەوی لە بەهەشتا؟ ئەم شەو چووم بۆ بەهەشت گوێم لە خشپە خشپی پێت بوو لە پێشمەوە دەڕۆیشتیت، چوومە لای كۆشكێكی چوارگۆشەی قووچی زێڕین، گوتم: ئەم كۆشكە هی كێیە؟ گوتیان: هینی پیاوێكی عەرەبە، گوتم: من خۆم عەرەبم هی كێیە؟ گوتیان: هی پیاوێكی قوڕەیشییە، گوتم: من خۆم قوڕەیشیم هی كێیە؟ گوتیان: هی پیاوێكە لە گەلی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) گوتم: من خۆم موحەممەدم، دەی هی كێیە؟ گوتیان: كۆشكی عومەری كوڕی خەتتابە، بیلال وەڵامی حەزرەتی دایەوەو گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! گشت جارێ كە بانگ: دەدەم دوو ركات نوێژی سوننەت دەكەم، هەموو جارێكیش كە دەسنوێژم دەشكێ گورج

---

[٦] بخاری. تهجد: ١١٤٩ ، ٣٦٧٩ ، ٣٦٨٠ مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٧٤.

دەسنوێژ تازە دەکەمەوەو بە پێویستی دەبینم لەسەر خۆم کە دوو رکات نوێژی سوننەتی دەسنوێژ بکەم بۆ خوداو دوو رکات نوێژ بەو نیازە دەکەم. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دیارە بەهۆی ئەم دوو رەوشتە جوانەوەیە کە گەیشتووی بەم پایەیە!(ت/ش).

**٣٢٥١- تقدم برقم: ٣٩٩/٥. مجلد/ أول تسلسل/ ٥٣ وفي هذه الرواية: عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ عُمَرُ: وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلَاثٍ: فِي مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ وَفِي الْحِجَابِ وَفِي أُسَارَى بَدْرٍ. رَوَاهُ الشيخان[٧]:**

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: عومەر گوتی: لەم سێ شتەدا رای من لەگەڵ فەرمانی پەروەردگاری گەورەما یەکی گرت: یەکەم لە بابەت مەقامی ئیبراهیمەوە، دووەم لە بابەت پەچە پۆشین‌و پەردەگرتنەوەوە، سێهەم لە بابەت دیلەکانی غەزای بەدرەوە چونکە رای من وابوو کە ئەوانە سەرۆك‌و پێشەوای کوفرو خودا نەناسین‌و وا باشە بکوژرێن‌و نەمێنن تا نەبن بە کۆسپ لەبەر خێزاوی ئیسلامدا، بەڵام پێغەمبەر بەگوێی منی نەکردو بەگوێی ئەبو بەکری کردو نەیکوشتن‌و سەرانەی لێ وەرگتن، ئەوەبوو خودا لەسەر ئەوە گلەیی لە حەزرەت‌و ئەوان کرد (ش).**

**٣٢٥٢- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ أَعِزَّ الإِسْلَامَ بِأَحَبِّ هَذَيْنِ الرَّجُلَيْنِ إِلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ أَوْ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ. قَالَ: وَكَانَ أَحَبَّهُمَا إِلَيْهِ عُمَرُ فَأَصْبح فَغَدَا عَلِى رسول الله فأسلم[٨]:**

**دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودایە! لەم دوو پیاوە: لە ئەبو جەهل‌و لە عومەری کوڕی خەتتاب کامیانت خۆش دەوێ بەوەیان ئیسلام زاڵ‌و شکۆدار بکە گوتی: جا ئەوە بوو ئەوەیان کە خودا**

---

[٧] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٥٦.

[٨] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

خۆشی دەویست عومەر بوو، بۆیە بۆ سبەینێ عومەر بەپێی خۆی چوو بۆ خزمەتی حەزرەت‌و ئیسلام بوو (ت–س/ص).

٣٢٥٣– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ جَعَلَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا): مَا نَزَلَ بِالنَّاسِ أَمْرٌ قَطُّ: فَقَالُوا فِيهِ وَقَالَ فِيهِ عُمَرُ إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ الْقُرْآنُ عَلَى نَحْوِ مَا قَالَ عُمَرُ[٩]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا كارێكی وایكردووە كە زمان‌و دڵی عومەر لەسەر هەق راهاتوون ئیبنو عومەر دەیگوت: گشت جارێ كە شتێ لە مەردوم رووی دەدا، ئەگەر خەڵكەكە قسەیان لێ بكردایەو عومەریش قسەی لێ بكردایە قورئان بەپێی قسەكەی عومەر دەهاتە خوارەوە (ت–س/ح).

٣٢٥٤– عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ جَاءَتْ جَارِيَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ إِنْ رَدَّكَ اللَّهُ صَالِحاً أَنْ أَضْرِبَ بَيْنَ يَدَيْكَ بِالدُّفِّ وَأَتَغَنَّى. فَقَالَ لَهَا: إِنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَاضْرِبِي وَإِلاَّ فَلاَ. فَجَعَلَتْ تَضْرِبُ فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَهِيَ تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ وَهِيَ تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهِيَ تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَأَلْقَتِ الدُّفَّ تَحْتَ اسْتِهَا ثُمَّ قَعَدَتْ عَلَيْهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ الشَّيْطَانَ لَيَخَافُ مِنْكَ يَا عُمَرُ إِنِّي كُنْتُ جَالِسًا وَهِيَ تَضْرِبُ فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَهِيَ تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ وَهِيَ تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهِيَ تَضْرِبُ فَلَمَّا دَخَلْتَ أَنْتَ يَا عُمَرُ أَلْقَتِ الدُّفَّ[١٠]:

(ب–٣ز–١٣٠ف–٢٥٢٥/٦). لێرەدا جیاوازیی زۆرە ئاوایە: بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچوو، رۆیشت بۆ غەزایێ، كە هاتەوە – واتە: كە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە – كەنیزەكێكی رەش هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فووتوو (نەذر)م كردووە، ئەگەر خودا بە خێرو

---

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٠] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

خۆشی تۆی هێنایەوە لەم غەزایە لە خزمەتتا دەف لێ بدەم‌و گۆرانی بڵێم؟ پێیی: فەرمووو ئەگەر نەزرت کردووە لێی دە، ئەگینا مەیکە جا کەنیزەکەکە دەستی کرد بەدەف لێدان، جا ئەبو بەکر هات ئەو هەردەفی خۆی لێ دەدا، لە پاشا عەلی هات ئەو هەر دەفی خۆی لێ دەدا، لە پاشا عوسمان هات ئەو هەر دەفی خۆی لێ دەدا، لە پاشا عومەر هات ئیتر ژنەکە دەفەکەی دانا لە ژێر قنگیاو لە سەری دانیشت، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عومەر! بە راستی شەیتان لە تۆ دەترسێت، من خۆم دانیشتبووم ئەو ژنە هەر دەفی خۆی لێ دەدا، ئەبو بەکر هات ئەو هەر لە دەفی خۆی دەدا، عەلی هات، ئەو هەر دەفی خۆی لێ دەدا، عوسمانیش هات هەر دەفی خۆی لێ دەدا، بەلاّم کە تۆ هاتیت ئەی عومەر! ئیتر دەفەکەی فڕێ دا! (ت-س/ص).

٣٢٥٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسًا فَسَمِعْنَا لَغَطًا وَصَوْتَ صِبْيَانٍ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذَا حَبَشِيَّةٌ تُزْفِنُ وَالصِّبْيَانُ حَوْلَهَا فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ تَعَالَيْ فَانْظُرِي. فَجِئْتُ فَوَضَعْتُ لَحْيَيَّ عَلَى مَنْكِبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَعَلْتُ أَنْظُرَ إِلَيْهَا فَقَالَ لِي أَمَا شَبِعْتِ أَمَا شَبِعْتِ. قَالَتْ فَجَعَلْتُ أَقُولُ لاَ لأَنْظُرَ مَنْزِلَتِي عِنْدَهُ إِذْ طَلَعَ عُمَرُ قَالَ فَارْفَضَّ النَّاسُ عَنْهَا قَالَتْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي لأَنْظُرُ إِلَى شَيَاطِينِ الإِنْسِ وَالْجِنِّ قَدْ فَرُّوا مِنْ عُمَرَ. قَالَتْ فَرَجَعْتُ [١١]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتبوو غەڵبەغەڵب‌و ژاوەژاوی مندالاّنمان هاتە بەرگوێ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵسا تەماشای کرد، روانی وا ژنێکی حەبەشەیی دەف لێ دەداو سەما دەکاو مندالاّنیش لە چوار دەوری گردبوونەتەوە. فەرمووی: ئەی عائیشە! وەرە سەیر کە منیش چووم چەناگەم نایە سەرشانی حەزرەت‌و دەستم کرد بە تەماشاکردنی تا لە پاشا ناو بەناو دەیفەموو: ئەرێ تێر

---

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

نەبووی، ئەریٚ بەست نییە منیش بۆ ئەوەی كە بزانم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تا چ رادەیێ خاتری منی دەویٚ هەر دەمگوت: نەخێر! تا لەپڕ عومەر پەیدابوو، ئیتر عەشاماتەكە بڵاوەیان لیٚ كردو دەوری ژنەكەیان چۆڵ كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەبینم شەیتانەكان – چ ئادەمیزادیان، چ جنۆكەیان – لەتاو عومەر هەڵهاتن!. عائیشە (خودای لیٚ رازی بێ) گوتی: ئینجا منیش گەڕامەوە (ت–س/ص) بەپێی ئەم فەرموودە صەحیحە دروستە پیاوو ژن سەیری بەزم‌و رەزم بكەن‌و گوێی لیٚ بگرن، بەڵام شادی‌و خۆشییەكە دەبیٚ بۆ مەبەستێكی رەوابیٚ، بەڵام نابیٚ سەری تیٚ بكەن‌و بیكەن بە كارو پیشەی شەوو رۆژیان. (وەرگێڕ).

٣٢٥٦– عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ كَانَ بَعْدِي نَبِيٌّ لَكَانَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ [١٢]:

عوقبەی كوڕی عامیر (خودای لیٚ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر لە پاش من كەسیٚ تر ببوایە بە پێغەمبەر عومەری كوڕی خەططاب دەبوو بە پێغەمبەر (ت–س/ح).

٣٢٥٧– وَقَالَ عُمَرُ لأَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) يَا خَيْرَ النَّاسِ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَا إِنَّكَ إِنْ قُلْتَ ذَاكَ فَلَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ عَلَى رَجُلٍ خَيْرٍ مِنْ عُمَرَ. روى الترمذى هذه الستة [١٣]:

عومەر (خودای لیٚ رازی بێ) بە ئەبو بەكر دەڵیٚ: ئەی چاكترین كەس لە پاش پێغەمبەر! (دروودی خودای لەسەربێ) ئەبو بەكریش دەڵیٚ: كە تۆ وا دەڵێی سامنیش لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: لەم جیهانەدا پیاوێكی باشتر لە عومەری تیا نیە (ت– بەسەندێكی غەریب).

---

[١٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه) (عوقبه بن عامر – تجريد/ ١/ ٢٥٣ ژ: ٢٣٩).

[١٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ٥- مایەی شانازییەکانی ئەبو بەکرو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ)
## مناقب أبي بكر وعمر (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُمَا)

٣٢٥٨- ← (ب – ٢ ز – ١٧١ ژ: ٢/١٩١٠) [١]:

٣٢٥٩- عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قُلْتُ لأَبِي: أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ بَعْدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: أَبُو بَكْرٍ. قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ ثُمَّ عُمَرُ. وَخَشِيتُ أَنْ يَقُولَ عُثْمَانُ قُلْتُ ثُمَّ أَنْتَ قَالَ مَا أَنَا إِلاَّ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. رَوَاهُ البخارى وأبو داود[٢].

موحەممەدی کوڕی حەنەفییە، کە کوڕی ئیمامی عەلییە (خودایان لێ ڕازی بێ) بەڵام بە ناوی دایکییەوە ناوی دەرکردووە گوتی: گوتم بە باوکم لە پاش پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کام کەس باشترە؟ گوتی: ئەبو بەکر، گوتم: ئەی لە پاش ئەوکێ باشترین کەسە؟ گوتی: عومەر، مەترسیم هەبوو ئەگەر دیسان هەمان پرسیاری لێ بکەمەوە بڵێ عوسمان، جا لەبەر ئەوە خۆم، پێشی کەوتم‌و گوتم: ئینجا تۆ، گوتی: من پیاوێکم لە تێکڕای موسوڵمانان! (ب/د- خودایان لێ ڕازی بێ).

٣٢٦٠- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: وُضِعَ عُمَرُ عَلَى سَرِيرِهِ، فَتَكَنَّفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُصَلُّونَ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَجُلٌ آخِذٌ مَنْكِبِي، فَإِذَا عَلِيٌّ فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ، وَقَالَ مَا خَلَّفْتَ أَحَدًا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللَّهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ، وَايْمُ اللَّهِ، إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَحَسِبْتُ أَنِّي كُنْتُ كَثِيرًا أَسْمَعُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: ذَهَبْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ. رَوَاهُ الشيخان[٣]:

---

[١] تقدم برقم: ٢/١٩١٠ مجلد/ ٢ تسلسل/ ١٧٠

[٢] بخارى. فضائل الصحابة: ٣٦٧١.

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٣٧. (ڕێن نامەی ابن عباس: تجريد/ال-١٩ ژ: ٥).

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عومەریان لەسەر دارە تەرمێ دانابوو، خەڵکەکە دەورەیان لێ دابوو، بۆی دەپاڕانەوەو نوێژیان لەسەری دەکرد، من خۆمیان تیابووم، ئەمەیش لە پێش ئەوەدا بوو کە بیبەن بینێژن، لە ناکاو ئەوەندەم زانی پیاوێ شانی گرتم، کە تەماشایم کرد عەلی بوو، جا ڕەحمەتی نارد بۆ عومەرو گوتی: کارێکی مەردانەی وات کردووە کە کەسێکی ترت نەهێشتۆتەوە، لە پاش خۆتەوە کە حەزبکەم ڕەفتاری ئەو بکرم‌و بە مانەندی کردەوەی ئەوەوە بچمەوە دیداری خودا جگە لەخۆت، بە ڕاستی بووی بە سەرمەشقی هەرەبالا بۆمان سوێندم بە خودا بە ڕاستی هیوام هەبوو کە خودا بەسەر بەرزی شادت بکاتەوە بەدیداری هەردوو هاوڕێکانت چونکە گەلێ جار دەم ژنەوت لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: من‌و ئەبو بەکرو عومەر بووین یا دەیفەرموو: من‌و ئەبو بەکرو عومەر چووینەوە بۆ ماڵ یا لە ماڵ دەرچووین یا ئەمەمان کردو ئەوەمان کرد (ش).

٣٢٦١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى لَيَرَاهُمْ مَنْ تَحْتَهُمْ كَمَا تَرَوْنَ النَّجْمَ الطَّالِعَ فِي أُفُقِ السَّمَاءِ وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ مِنْهُمْ وَأَنْعَمَا[٤]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە چۆن بە ژوور سەرتانەوە ئەستێرە بە ئاسمانەوە دەبینن کە لە ئاسۆ هەڵدێ، ئەوانەشی لە بەهەشتا کە وان لە خوارەوە ئاوا تەماشای پلەو پایەی بەهەشتییە خاوەن پایە بەرزەکان دەکەن وە ئەبو بەکرو عومەریش لەو دەستەیەن، بگرە لە سەرووی ئەوانیشەوەن! (ت-س/ح).

٣٢٦٢- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَلَهُ وَزِيرَانِ مِنْ أَهْلِ السَّمَاءِ وَوَزِيرَانِ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ فَأَمَّا وَزِيرَاىَ مِنْ أَهْلِ السَّمَاءِ فَجِبْرِيلُ وَمِيكَائِيلُ وَأَمَّا وَزِيرَاىَ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ فَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ[٥]:

---

[٤] رواه ترمذي بسند حسن (شرحه).

دیسان گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێ لە خەڵكی ئاسمان دوو راوێژیار (وەزیر)ی هەیەو لە خەڵكی سەرزەمینیش دووراوێژیاری هەیە، ئەو دوو وەزیرەی من كە خەڵكی ئاسمانن جوبرائیل‌و میكائیلن ئەو دوو وەزیرەشم كە خەڵكی سەرزەمینن ئەبو بەكرو عومەرن (ت-س/ح).

٣٢٦٣- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنِّي لاَ أَدْرِي مَا بَقَائِي فِيكُمْ فَاقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي وَأَشَارَ إِلَيهِمَا[٦]:

حوذەیفە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو دوو كەسەی كە لە دوای من دێن‌و لە جێگەی من دەبن بە جێنشین، كە ئەبو بەكرو عومەرن ئەم دوو كەسە بكەن بە سەرمەشق‌و پەیڕەوییان بكەن لە گێڕانەوەیەكا: من نازانم چەندی تر لەناو ئێوەدا دەمێنم‌و دەژیم، بەڵام ئێوە ئەو دوو پیاوە كە لەپاش من لە جێگەی من دادەنیشن بیان كەن بە سەرمەشق‌و چاویان لێ بكەن حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئاماژە (ئیشارەت)ی كرد بۆ ئەبو بەكرو عومەر (ت-س/ح).

٣٢٦٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَبيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ طَلَعَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَذَانِ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ إِلاَّ النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ يَا عَلِيُّ لاَ تُخْبِرْهُمَا[٧]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە خزمەتی حەزرەتدا بووم لەپڕ ئەبو بەكرو عومەر دەركەوتن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم دوو پیاوە سەرگەورەی پیاوە كامڵە بەتەمەنەكانی ناو بەهەشتن، لە پێشینان‌و

---

[٥] رواه ترمذي بسند حسن (شرحه).

[٦] رواه ترمذي بسند حسن (شرحه). (حذيفه. تجريد/ ١ / ١٨٤ ژ: ١٦٣).

[٧] رواه ترمذي بسند حسن (شرحه). (على: تجريد/ ١ / ١١٢ ژ: ٨٩).

پاشینان، پێغەمبەرەكان‌و فروستادەكانیان لێ دەرچێ. ئەی عەلی! ئەم هەواڵە بەخۆیان مەڵێ! (ت-س/ح).

٣٢٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَنْطَبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ فَقَالَ: هَذَانِ السَّمْعُ وَالْبَصَرُ.[٨]:

عەبدوڵڵای كوڕی حەنطەب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چاوی بە ئەبو بەكرو عومەر كەوت فەرمووی: ئەم دوو پیاوە هەم گوێ‌و هەم دیدەی خۆم‌و ئوممەتمن! (ت).

٣٢٦٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَخْرُجُ عَلَى أَصْحَابِهِ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ وَهُمْ جُلُوسٌ فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَلاَ يَرْفَعُ إِلَيْهِ أَحَدٌ مِنْهُمْ بَصَرَهُ إِلاَّ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَإِنَّهُمَا كَانَا يَنْظُرَانِ إِلَيْهِ وَيَنْظُرُ إِلَيْهِمَا وَيَتَبَسَّمَانِ إِلَيْهِ وَيَتَبَسَّمُ إِلَيْهِمَا[٩]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەرۆیشت بۆ ناو یارانی - لە كۆچكەران‌و لە یاریدەدەران - بۆ ناو كۆمەڵ‌و كۆڕی دانیشتنیان، كە ئەبو بەكرو عومەریش لە ناویاندا دادەنیشتن، كەسیان پرکێشیان نەدەكرد كەسەر هەڵبڕن‌و تەماشای حەزرەت بكەن، جگە لە ئەبو بەكرو عومەر، بەڵام ئەم دوانە سەیری ئەویان دەكردو ئەویش سەیری ئەوانی دەكرد، وە ئەمان زەردەخەنەیان بۆ ئەو دەكردو ئەویش بە دەم ئەوانەوە پێ دەكەنی! (ت).

٣٢٦٧- عَنْ ابِنْ عَمْرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ ذَاتَ يَوْمٍ وَدَخَلَ الْمَسْجِدَ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِهِ وَالآخَرُ عَنْ شِمَالِهِ وَهُوَ آخِذٌ بِأَيْدِيهِمَا وَقَالَ: هَكَذَا نُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[١٠]:

---

[٨] غريب اومسكوت عنه (شرحه).

[٩] غريب اومسكوت عنه (شرحه).

[١٠] غريب اومسكوت عنه (شرحه).

ئیبنو عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵ دەرچوو چوو بۆ ناو مزگەوت، ئەبو بەكرو عومەری لەگەڵ بوون، یەكێكیان لەلای راستیەوە بوو، ئەوەكەی تریشیان لەلای چەپییەوە بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی هەردوكیانی گرتبوو، فەرمووی: لە رۆژی قیامەتا ئاوا لەسەر ئەم شێوەیە زیندوو دەكرێینەوە (ت).

٣٢٦٨- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ ثُمَّ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ ثُمَّ آتِي أَهْلَ الْبَقِيعِ فَيُحْشَرُونَ مَعِي ثُمَّ أَنْتَظِرُ أَهْلَ مَكَّةَ حَتَّى أُحْشَرَ بَيْنَ الْحَرَمَيْنِ[١١]:

دیسان لەوەوە، لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خۆم یەكەم كەس دەبم كە دەمی زەوی دەقەڵەشێتەوە بۆم‌و لە گۆڕ دێمە دەرەوە، لە پاش من ئەبو بەكر، لەپاش ئەویش عومەر! لە پاشا دەڕۆم بۆ لای خەڵكی گۆڕستانی بەقیع، ئەوانیش لەگەڵ خۆمدا حەشر دەكرێن، ئینجا لە نێوانی هەردوو حەرەمدا، كە مەككەی پیرۆزو مەدینەی نازدارن، چاوەڕوانی خەڵكی مەككە دەكەم وە لەوێوە هەموومان پێكەوە دەڕۆین بۆ دەشتی مەحشەر! (ت).

٣٢٦٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَطْلُعُ عَلَيْكُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ». فَاطَّلَعَ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ قَالَ: يَطْلُعُ عَلَيْكُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَاطَّلَعَ عُمَرُ. روى الترمذى هذه التِسْعَةَ. نسأل الله أن يروينا من عِلْمِها اللدني آمين[١٢]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێستا پیاوێكی بەهەشتی سەرهەڵ دەداو دێ بۆ ناوتان كاتێكمان زانی ئەبو بەكر هات، فەرموویەوە: ئێستا پیاوێكی تری بەهەشتی سەرهەڵدەداو دێ بۆ ناوتان كاتێكمان زانی عومەر پەیدا بوو! (ت = تیرمیذی. خودای لێ رازی بێ).

---

[١١] غريب اومسكوت عنه (شرحه).

[١٢] غريب اومسكوت عنه (شرحه). (ابن مسعود: تجريد/ ٤ / ١٦٤ ژ: ١٤٧٣.

## ٦) ئیسلامبوونی عومەر (خودای لێ رازی بێ)
## إسلام عمر (رَضيَ أللهُ تَعالَى عَنهُ)

**٣٢٧٠-** عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرَ فِي الدَّارِ خَائِفًا، إِذْ جَاءَهُ الْعَاصُ بْنُ وَائِلِ السَّهْمِيُّ، عَلَيْهِ حُلَّةُ حِبَرَةٍ، وَقَمِيصٌ مَكْفُوفٌ بِحَرِيرٍ، وَهُوَ مِنْ بَنِي سَهْمٍ، وَهُمْ حُلَفَاؤُنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَقَالَ لَهُ مَا بَالُكَ؟ قَالَ زَعَمَ قَوْمُكَ أَنَّهُمْ سَيَقْتُلُونِي إِنْ أَسْلَمْتُ. فَقَالَ لاَ سَبِيلَ لَهُمْ إِلَيْكَ. بَعْدَ أَنْ قَالَهَا أَمِنْتُ، فَخَرَجَ الْعَاصِ، فَلَقِيَ النَّاسَ قَدْ سَالَ بِهِمُ الْوَادِي فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُونَ؟ فَقَالُوا نُرِيدُ عُمَرَ ابْنَ الْخَطَّابِ الَّذِي صَبَا. قَالَ لاَ سَبِيلَ إِلَيْهِ. فَكَرَّ النَّاسُ. وفي رِواية: لَمَّا أَسْلَمَ عُمَرُ اجْتَمَعَ النَّاسُ عِنْدَ دَارِهِ وَقَالُوا صَبَا عُمَرُ. وَأَنَا غُلاَمٌ فَوْقَ ظَهْرِ الْبَيْتِ، فَجَاءَ رَجُلٌ عَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْ دِيبَاجٍ فَقَالَ: قَدْ صَبَا عُمَرُ. فَمَا ذَاكَ؟ فَأَنَا لَهُ جَارٌ. قَالَ فَرَأَيْتُ النَّاسَ تَصَدَّعُوا عَنْهُ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: الْعَاصِ بْنُ وَائِلٍ. رَوَاهُ البخاري[1]:

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئەوا عومەر لە ماڵەوە لەتاو ئازاردانی هۆزەکەی ترسی لێ نیشتووە، لەو کاتەدا لە پڕ عاصی کوڕی وائیلی ئەل-سەهمی هات بۆ لای، دەستێ جلی ئاوریشم‌و کراسێکی بە ئاوریشم چنراوی لەبەردابوو، عاص لە هۆزی بەنی سەهم بوو، کە لە کاتی سەردەمی نەزانیدا سوێند خۆری ئێمە بوون، جا عاص بە عومەری گوت: ئەوە چییتە بۆ وا شەڵەژاوی؟ عومەر گوتی: هۆزەکەت بە قسەی خۆیان دەڵێن: ئەگەر عومەر ئیسلام ببێ دەیکوژین. گوتی: ناتوانن پەنجەت تێوەدەن، عومەر دەیگوت: کە عاص وایگوت ئیتر ترسم نەما ئەنجا عاص دەردەچێ‌و دەڕوا بۆ ناوخەڵکەکە، دەڕوانێ وا عەشاماتێکی زۆر لە دژی عومەر لەناو ئەو شیوەدا پەنگیان خواردۆتەوە! دەڵێ: ئەوە بۆ کوێ دەچن‌و چیتان دەوێ؟ دەڵێن: دەڕۆین بۆ سەر عومەری کوڕی خەططاب، کە لە ئایینی ئێمە وەرگەڕاوەو چووەتە سەر ئایینی موحەممەد، عاص دەڵێ: کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ. ئیتر خەڵکەکە دەگەڕێنەوە. لە گێڕانەوەیەکدا: کە**

---

[1] بخاری. فضائل: ٣٨٦٤.

عومەر موسوڵمان دەبێ، ئەو خەڵکە گەمارۆی ماڵەکەی دەدەن دەیانگوت: ئای عومەر وەرگەڕاوە، ئەو حەلە من خۆم کوڕێکی منداڵکاربووم، لە سەربان بووم، جا پیاوێ هات کەوایەکی ئاورێشمی لەبەردابوو، گوتی: عومەر وەرگەڕاوە جا چی بووە؟ ئەوا من پەنای دەدەم‌و دەبم بە داڵدەی. ئیتر تەماشام کرد خەڵکەکە دڕیانداو لەبەری ڕەوینەوە. کە پرسیم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: عاصی کوڕی وائیلە (ب).

## ٧) ڕاسپیری (وەصییەت)ەکەی عومەرو پەیماندان بە عوسمان (خودایان لێ ڕازی بێ)
## وصية عمر والبيعة لعثمان (رَضيَ أَللهُ تَعَالَى عَنهُمَا)

٣٢٧١- عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَبْلَ أَنْ يُصَابَ بِأَيَّامٍ بِالْمَدِينَةِ وَقَفَ عَلَى حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ وَعُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ، قَالَ: كَيْفَ فَعَلْتُمَا أَتَخَافَانِ أَنْ تَكُونَا قَدْ حَمَّلْتُمَا الأَرْضَ مَا لاَ تُطِيقُ؟ قَالاَ: حَمَّلْنَاهَا أَمْرًا هِيَ لَهُ مُطِيقَةٌ، مَا فِيهَا كَبِيرُ فَضْلٍ. قَالَ: انْظُرَا أَنْ تَكُونَا حَمَّلْتُمَا الأَرْضَ مَا لاَ تُطِيقُ، قَالَ: قَالاَ: لاَ. فَقَالَ عُمَرُ: لَئِنْ سَلَّمَنِي اللَّهُ لأَدَعَنَّ أَرَامِلَ أَهْلِ الْعِرَاقِ لاَ يَحْتَجْنَ إِلَى رَجُلٍ بَعْدِي أَبَدًا. قَالَ: فَمَا أَتَتْ عَلَيْهِ إِلاَّ رَابِعَةٌ حَتَّى أُصِيبَ. وَلَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلاَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ غَدَاةَ أُصِيبَ، وَكَانَ إِذَا مَرَّ بَيْنَ الصَّفَّيْنِ قَالَ: اسْتَوُوا. حَتَّى إِذَا لَمْ يَرَ فِيهِنَّ خَلَلاً تَقَدَّمَ فَكَبَّرَ، وَرُبَّمَا قَرَأَ سُورَةَ يُوسُفَ، أَوِ النَّحْلَ، أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ، فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى حَتَّى يَجْتَمِعَ النَّاسُ، فَمَا هُوَ إِلاَّ أَنْ كَبَّرَ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ قَتَلَنِي - أَوْ أَكَلَنِي - الْكَلْبُ. حِينَ طَعَنَهُ، فَطَارَ الْعِلْجُ بِسِكِّينٍ ذَاتِ طَرَفَيْنِ لاَ يَمُرُّ عَلَى أَحَدٍ يَمِينًا وَلاَ شِمَالاً إِلاَّ طَعَنَهُ حَتَّى طَعَنَ ثَلاَثَةَ عَشَرَ رَجُلاً، مَاتَ مِنْهُمْ سَبْعَةٌ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، طَرَحَ عَلَيْهِ بُرْنُسًا، فَلَمَّا ظَنَّ الْعِلْجُ أَنَّهُ مَأْخُوذٌ نَحَرَ نَفْسَهُ، وَتَنَاوَلَ عُمَرُ يَدَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ فَقَدَّمَهُ للصَّلاَةِ، فَمَنْ يَلِي عُمَرَ فَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِي أَرَى، وَأَمَّا نَوَاحِي الْمَسْجِدِ فَإِنَّهُمْ لاَ يَدْرُونَ غَيْرَ أَنَّهُمْ قَدْ فَقَدُوا صَوْتَ عُمَرَ وَهُمْ يَقُولُونَ: سُبْحَانَ اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ سبحان الله. فَصَلَّى بِهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ صَلاَةً خَفِيفَةً، فَلَمَّا انْصَرَفُوا. قَالَ عُمَرُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، انْظُرْ مَنْ قَتَلَنِي. فَجَالَ سَاعَةً، ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ: غُلاَمُ الْمُغِيرَةِ. قَالَ: الصَّنَعُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ:

قَاتَلَهُ اللّٰهُ لَقَدْ أَمَرْتُ بِهِ مَعْرُوفًا، الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِى لَمْ يَجْعَلْ مَنِيَّتِى بِيَدِ رَجُلٍ يَدَّعِى الإِسْلاَمَ، قَدْ كُنْتَ يا بن عَبَّاسٍ أَنْتَ وَأَبُوكَ تُحِبَّانِ أَنْ تَكْثُرَ الْعُلُوجُ بِالْمَدِينَةِ وَكَانَ الْعَبَّاسُ أَكْثَرَهُمْ رَقِيقًا. فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ قَتَلْنَاهُمْ، قَالَ: كَذَبْتَ، بَعْدَ مَا تَكَلَّمُوا بِلِسَانِكُمْ، وَصَلَّوْا قِبْلَتَكُمْ وَحَجُّوا حَجَّكُمْ فَاحتُمِلَ عُمَرُ إِلَى بَيْتِهِ فَانْطَلَقْنَا مَعَهُ، وَكَأَنَّ النَّاسَ لَمْ تُصِبْهُمْ مُصِيبَةٌ قَبْلَ هذِهِ، فَقَائِلٌ يَقُولُ لاَ بَأْسَ. وَقَائِلٌ يَقُولُ أَخَافُ عَلَيْهِ، فَأُتِىَ بِنَبِيذٍ فَشَرِبَهُ فَخَرَجَ مِنْ جَوْفِهِ، ثُمَّ أُتِيَ بِلَبَنٍ فَشَرِبَهُ فَخَرَجَ مِنْ جَوْفِهِ، فَعَلِمُوا أَنَّهُ مَيِّتٌ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ، وَجَاءَ النَّاسُ يُثْنُونَ عَلَيْهِ، وَجَاءَ رَجُلٌ شَابٌّ، فَقَالَ: أَبْشِرْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ بِبُشْرَى اللّٰهِ لَكَ مِنْ صُحْبَةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدَمٍ فِي الإِسْلاَمِ مَا قَدْ عَلِمْتَ، ثُمَّ وَلِيتَ فَعَدَلْتَ، ثُمَّ شَهَادَةٌ. قَالَ: وَدِدْتُ أَنَّ ذَلِكَ كَفَافٌ لاَ عَلَيَّ وَلاَ لِى. فَلَمَّا أَدْبَرَ، إِذَا إِزَارُهُ يَمَسُّ الأَرْضَ. قَالَ: رُدُّوا عَلَيَّ الْغُلاَمَ، فجاءَ فقال: يا ابْنَ أَخِي ارْفَعْ ثَوْبَكَ، فَإِنَّهُ أَبْقَى لِثَوْبِكَ وَأَتْقَى لِرَبِّكَ، ثُمَّ قَالَ: يَا عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عُمَرَ انْظُرْ مَا عَلَيَّ مِنَ الدَّيْنِ. فَحَسَبُوهُ فَوَجَدُوهُ سِتَّةً وَثَمَانِينَ أَلْفًا أَوْ نَحْوَهُ، قَالَ: إِنْ وَفَى لَهُ مَالُ آلِ عُمَرَ، فَأَدِّهِ مِنْ أَمْوَالِهِمْ، وَإِلاَّ فَسَلْ فِي بَنِى عَدِىِّ بْنِ كَعْبٍ، فَإِنْ لَمْ تَفِ أَمْوَالُهُمْ فَسَلْ فِي قُرَيْشٍ، وَلاَ تَعْدُهُمْ إِلَى غَيْرِهِمْ، فَأَدِّ عَنِّى هَذَا الْمَالَ. ثم قال: انْطَلِقْ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فَقُلْ يَقْرَأُ عَلَيْكِ عُمَرُ السَّلاَمَ. وَلاَ تَقُلْ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ. فَإِنِّى لَسْتُ الْيَوْمَ لِلْمُؤْمِنِينَ أَمِيرًا، وَقُلْ يَسْتَأْذِنُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَنْ يُدْفَنَ مَعَ صَاحِبَيْهِ، فذهَبَ فَسَلَّمَ وَاسْتَأْذَنَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيْهَا، فَوَجَدَهَا قَاعِدَةً تَبْكِى فَقَالَ لَهَا مَا قَالَ عُمَرُ فَقَالَتْ كُنْتُ أُرِيدُهُ لِنَفْسِى، وَلأُوثِرَنَّ بِهِ الْيَوْمَ عَلَى نَفْسِى. فَلَمَّا أَقْبَلَ قِيلَ هَذَا عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عُمَرَ قَدْ جَاءَ. قَالَ عُمَرُ: ارْفَعُونِى، فَأَسْنَدَهُ رَجُلٌ إِلَيْهِ، فَقَالَ لابْنِ عُمَرَ مَا لَدَيْكَ؟ قَالَ: الَّذِى تُحِبُّ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَذِنَتْ. قَالَ: الْحَمْدُ لِلّٰهِ، مَا كَانَ شَىْءٌ أَهَمُّ إِلَيَّ مِنْ ذَلِكَ، فَإِذَا أَنَا قُبِضْتُ فَاحْمِلُونِى ثُمَّ سَلِّمْ فَقُلْ يَسْتَأْذِنُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَإِنْ أَذِنَتْ لِى فَأَدْخِلُونِى، وَإِنْ رَدَّتْنِى رُدُّونِى إِلَى مَقَابِرِ الْمُسْلِمِينَ. وَجَاءَتْ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ حَفْصَةُ وَالنِّسَاءُ تَسِيرُ مَعَهَا، فَلَمَّا رَأَيْنَاهَا قُمْنَا، فَوَلَجَتْ عَلَيْهِ فَبَكَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، وَاسْتَأْذَنَ الرِّجَالُ، فَوَلَجَتْ دَاخِلاً لَهُمْ، فَسَمِعْنَا بُكَاءَهَا مِنَ الدَّاخِلِ. فَقَالُوا: أَوْصِ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ اسْتَخْلِفْ. قَالَ: مَا أَجِدُ أَحَقَّ بِهَذَا الأَمْرِ مِنْ هَؤُلاَءِ النَّفَرِ أَوِ الرَّهْطِ الَّذِينَ تُوُفِّىَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ عَنْهُمْ رَاضٍ. فَسَمَّى عَلِيًّا وَعُثْمَانَ وَالزُّبَيْرَ وَطَلْحَةَ

وَسَعْدًا وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ وَقَالَ: يَشْهَدُكُمْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَلَيْسَ لَهُ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ – كَهَيْئَةِ التَّعْزِيَةِ لَهُ – فَإِنْ أَصَابَتِ الإِمْرَةُ سَعْدًا فَهْوَ ذَاكَ، وَإِلاَّ فَلْيَسْتَعِنْ بِهِ أَيُّكُمْ مَا أُمِّرَ، فَإِنِّي لَمْ أَعْزِلْهُ عَنْ عَجْزٍ وَلاَ خِيَانَةٍ ثُمَّ قَالَ: أُوصِي الْخَلِيفَةَ مِنْ بَعْدِي بِالْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ أَنْ يَعْرِفَ لَهُمْ حَقَّهُمْ، وَيَحْفَظَ لَهُمْ حُرْمَتَهُمْ، وَأُوصِيهِ بِالأَنْصَارِ خَيْرًا، الَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ، أَنْ يُقْبَلَ مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَأَنْ يُعْفَى عَنْ مُسِيئِهِمْ، وَأُوصِيهِ بِأَهْلِ الأَمْصَارِ خَيْرًا فَإِنَّهُمْ رِدْءُ الإِسْلاَمِ، وَجُبَاةُ الْمَالِ، وَغَيْظُ الْعَدُوِّ، وَأَنْ لاَ يُؤْخَذَ مِنْهُمْ إِلاَّ فَضْلُهُمْ عَنْ رِضَاهُمْ، وَأُوصِيهِ بِالأَعْرَابِ خَيْرًا، فَإِنَّهُمْ أَصْلُ الْعَرَبِ وَمَادَّةُ الإِسْلاَمِ أَنْ يُؤْخَذَ مِنْ حَوَاشِي أَمْوَالِهِمْ وَتُرَدَّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، وَأُوصِيهِ بِذِمَّةِ اللَّهِ وَذِمَّةِ رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُوفَى لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَأَنْ يُقَاتَلَ مِنْ وَرَائِهِمْ، وَلاَ يُكَلَّفُوا إِلاَّ طَاقَتَهُمْ. فَلَمَّا قُبِضَ خَرَجْنَا بِهِ فَانْطَلَقْنَا نَمْشِي فَسَلَّمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَلى عَائِشَةَ وَقَالَ يَسْتَأْذِنُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ. قَالَتْ أَدْخِلُوهُ. فَأُدْخِلَ، فَوُضِعَ هُنَالِكَ مَعَ صَاحِبَيْهِ، فَلَمَّا فُرِغَ مِنْ دَفْنِهِ اجْتَمَعَ هَؤُلاَءِ الرَّهْطُ:، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: اجْعَلُوا أَمْرَكُمْ إِلَى ثَلاَثَةٍ مِنْكُمْ. فَقَالَ الزُّبَيْرُ: قَدْ جَعَلْتُ أَمْرِي إِلَى عَلِيٍّ. فَقَالَ طَلْحَةُ قَدْ جَعَلْتُ أَمْرِي إِلَى عُثْمَانَ. وَقَالَ سَعْدٌ قَدْ جَعَلْتُ أَمْرِي إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ. فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: أَيُّكُمَا تَبَرَّأَ مِنْ هَذَا الأَمْرِ فَنَجْعَلُهُ إِلَيْهِ، وَاللَّهُ عَلَيْهِ وَالإِسْلاَمُ لَيَنْظُرَنَّ أَفْضَلَهُمْ فِي نَفْسِهِ. فَأُسْكِتَ الشَّيْخَانِ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ أَفَتَجْعَلُونَهُ إِلَيَّ، وَاللَّهُ عَلَيَّ أَنْ لاَ آلُوَ عَنْ أَفْضَلِكُمْ قَالاَ نَعَمْ، فَأَخَذَ بِيَدِ أَحَدِهِمَا (عَلِيٍّ) فَقَالَ: لَكَ قَرَابَةٌ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْقَدَمُ فِي الإِسْلاَمِ مَا قَدْ عَلِمْتَ، فَاللَّهُ عَلَيْكَ لَئِنْ أَمَّرْتُكَ لَتَعْدِلَنَّ، وَلَئِنْ أَمَّرْتُ عُثْمَانَ لَتَسْمَعَنَّ وَلَتُطِيعَنَّ. ثُمَّ خَلاَ بِالآخَرِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا أَخَذَ الْمِيثَاقَ عَلَيْهِمَا قَالَ: ارْفَعْ يَدَكَ يَا عُثْمَانُ. فَبَايَعَهُ، فَبَايَعَ لَهُ عَلِيٌّ، وَوَلَجَ أَهْلُ الدَّارِ فَبَايَعُوهُ. رَوَاهُ البخاري[1]:

**عـەمری كـوڕی مـەيموون (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: بـە چـەند ڕۆژێ بـەر لـە ئەنگێورانی عومەر، لە مەدينە عومەرم دی لە ديار خوذەيفەو عوسمانی كوڕی حونـەيف وەسـتابوو، دەيگـوت پێيـان: چيتان كـرد، دەترسم بـاری خـەڵكتان**

---

[1] بخاری. فضائل: ٣٧٠١

گـران کردبـێ و زۆروسـتـەمتان لـە خـەڵکی وڵات کردبـێ؟ عومـەر ئـەم دوانـەی ناردبوو بۆ خەمڵکردنی مڵکانەو دانانی ئەندازەی سەرانە لە عێراق، گوتیـان: زۆرو سـتـەممان لێ نـەکردوون و ئـەرکێکی وامـان لـە سـەریان دانـاوە کـە لـە کێشیانا هـەبێ، کارەکەی ئێمـەیش زۆر جێگـەی شـانازی نییـە، چونکە ئێمـە ئەرکی سەرشانی خۆمانمان بەجێ هێناوەو بەس، دیسان عومەر گوتی: بـاش تەماشا بکەن نەبادا ئەرکێکی واتان لەسەر شانی خەڵکی وڵات دانابێ، کە لـە وزەو کێشیانا نەبێ؟ گوتیـان: نـەء شـتی وامـان نـەکردووە، جـا عومـەر گـوتی: ئەگەر خودابێ وەیم بکا وا لە بێوەژنانی خەڵکی عێـراق دەکـەم کـە هـەرگیز لـە پاش من ئاتاجی دەستی پیاوێکی تر نەبن، چونکە ئەوەندە مووچەو بەراتیان بـۆ دەبڕمـەوە، گـوتی: بـەڵام تـەنیا چوارشـەو لـەوەدوا عومـەر پێکـرا، ئـەو بەیانییەی کە عومەر پێکرا تـەنیا ئیبنـو عـەبباس لـە نێـوانی من و ئـەودا بـوو، عومەر دەستووری وابوو کە لە نێوانی دوو ریزەوە ڕەت دەبوو دەیگـوت: ڕێـك بـن و ڕێـك راوەسـتن، جـا کـە دەیـدی و دڵنیـا دەبـوو کـەوا ریزەکـان کەچـی و کـەموکوڕییان نییـە ئەوسـا پـێش دەکـەوت و نوێـژی دادەبەسـت و، ئـەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، گەلێ جار لە رکاتی یەکەمدا سوورەتی یوسفی دەخوێند، یـا گـوتی: سـوورەتی نـەحلی دەخوێنـد، یـا سـوورەتێکی درێـژی لـەم بابەتـە دەخوێنـد، هـەتا خەڵکەکـە کۆببنـەوەو فریـای جەماعـەت بکـەون، بـەڵام هـەر لەگەڵ گوتی: ئەڵڵاهو ئەکبەرو نوێژی دابەست ئەو بەدبەختەدایـە بەر چەقۆو بەکێرد دایدووری، یەکسەر گوێم لێ بوو عومەر گوتی: ئەو سەگە کوشتمی، یا گـوتی: ئـەو سـەگە خـواردمی، ئـیتر ئـەو حەیتەزیندیقـە بـە راست و بـە چـەپا هەڵپـەی دەکـردو دەسـتی دەوەشـاندو هـەر کەسـی بـەر هـەوێڵ دەکـەوت بـە کێردێکـی دوو دەمـی دووسـەر دایدەپاچـی، تـا لـە ئەنجامـدا سـیازدە پیـاوی زامار کرد، حەوتیان لێ مردن، جا پیاوێکی موسوڵمان – کە چاوی بـەم حاڵـە کەوت – کەڕەکێکی دا بە سەریاو گرتی، ئەو زرتـەبۆزە زەندەیقـەش کـە دی وا گیراو چارەی نـەما خـۆی سـەربڕی و خـۆی کوشت! جا عومـەر (خودای لێ رازی بێ) دەسـتی عەبدوڕەحمانی کـوڕی عـەوفی گـرت و پێـشی خـست بـۆ بەرنوێـژیی،

هەتا ئەو لە باتی عومەر بەرنوێژییەکەیان بۆ بکا، ئیتر ئەوانەی کە لە پشتی عومەرەوە بوون و لێی نزیك بوون، وەك من چاویان لەم کارەساتەوە بوو، وەڵێ ئەم لاولای مزگەوتەکە نەیان دەزانی کە مەسەلەکە چییە، تەنیا ئەوە نەبێ کە گوێیان لە دەنگی عومەرنەما، وە هەردەیانگوت: سوبحانەڵلا، سوبحانەللا، سوبحانەڵلا! عەبدوڕەحمانیش خێرا نوێژێکی سووکەڵەی بۆ کردن، کە لە نوێژەکە بوونەوە عومەر گوتی: ئەی ئیبنو عەبباس! بزانە ئەمە کێ بوو منی کوشت؟ ئەویش تاوێ خولایەوە بەناو مەردومەکەداو هاتەوەو گوتی: خولامەکەی موغیرەبوو، گوتی: دەست ڕەنگینەکە؟ گوتی: ئا، گوتی: خودا بیکوژێ، خۆمن لەکن خۆی چاکەم بۆی بووە! سوپاس و ستایش بۆ خودا کە بە دەستی پیاوێکی موسوڵمان نەکوژرام، ئەی ئیبنو عەبباس! خۆت و باوکت هەر حەزتان دەکرد ئەم حەیتە زەندیقانە لە مەیدنە زۆر بن - عەبباس لە هەموو کەس زیاتر خولام و بەندەی هەبوو - ئیبنو عەبباسیش گوتی: ئەگەر تۆ حەزدەکەی دەیانکوژین، گوتی: درۆ مەکە، پاش ئەوەکە بە زمانی ئێوە قسە دەکەن و وەك ئێوە نوێژ بەرەو قیبلە دەکەن و وەك ئێوە حەج دەکەن، ئیتر چۆن دەیان کوژن! ئینجا عومەریان هەڵگرت و بردیانەوە بۆ ماڵەوە، ئێمەش لە گەڵیا چووین، ئەو خەڵکە وەها شەڵەژابوون دەتگوت هەرگیز لەوە بەر تووشی چورتم و قۆرتی وەها نەبوون، یەکێ دەیگوت: قەی ناکا، یەکێ دەیگوت: مەترسیم لێی هەیە، جا خۆشاوی خورمایان بۆ هێنا، کە خواردیەوە لە زامەکەی ناوسکیەوە سەری کردو هاتە دەرەوە، ئینجا جامێ شیریان بۆ هێنا، کە ئەویشی خواردەوە دیسان لە دەمی زامەکەیەوە هاتە دەرەوە، ئیتر زانییان کە دەمرێ، کە چووینە ژوورەوە بۆ لای خەڵکیش دەهاتن و وەسپیان دەکردو باسی باشی و چاکی ئەویان دەکرد، لاوێ هات گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! مژدەی مزیگێنی خودات لێ بێ: تۆ خۆت دەزانی کە هاوڕێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بوویت و پایەو شانێکی باشت هەیە لە ئایینی ئیسلام داو، کە بووشیت بە کاربەدەست و سەرگەورەی موسوڵمانان گەلێ پیاوێکی عادڵ و دادپەروەرو حەقانی بوویت، سەرەڕای ئەم پایەو شانە ئەوا

شەهیدیش کرایت! عومەر گوتی: خۆزگەم نەزیانی دەبوو بۆم‌و نە قازانج! جا کە لاوەکە گەڕایە دواوە عومەر تەماشای کرد جلەکەی دەخشێ لە سەرزەوی، بۆیە گوتی: ئەم کوڕە بێننەوە بۆ لام، کە کوڕەکە هاتەوە عومەر پێی گوت: ئەی برازای خۆشەویستم! جلەکەت هەڵکە، چونکە هەم جلەکەت زۆر تر دەکاو هەم لەبەر خوداش وا باشترە، هەم بۆ سوودی خۆت‌و هەم بۆ ڕەزای خودا وا باشترە، لە پاشدا عومەر گوتی: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر! بزانە چەندێ قەرزم لە سەرە؟ کە حلێبیان کرد دەوری هەشتاو شەش هەزار قەرزی لەسەر بوو، گوتی: ئەگەر دارایی‌و ماڵی کەس‌و کارەکانی عومەر خۆی بەشی دانەوەی ئەم قەرزانەیان دەکرد ئەوە لە ماڵی ئەوان بیدەرەوە، ئەگینا لە نەوەی عەدیی کوڕی کەعبیش پیتاکی بۆ بکە کە من خۆم لەو بەرە بابەم، جا ئەگەر هەر بەشی نەکرد لە قوڕەیشیش پیتاك کۆ بکەرەوە، بەڵام لەوان بترازێ لە کەسی تر پیتاك مەکەن! ئیتر دەبێ پشتگوێی نەخەیت‌و ئەم قەرزەم هەر بۆ بدەیتەوە ئینجا گوتی: بڕۆ بۆ لای عائیشەی دایکی موسوڵمانان! پێی بڵێ: عومەر سڵاوت لێ دەکا – مەڵێ: فەرمانڕەوای موسوڵمانان (ئەمیرولموئمنین) چونکە من لەم ڕۆوە ئیتر فەرمانڕەوای موسوڵمانان نیم، بەڵام بڵێ: عومەری کوڕی خەطاب ڕوخصەت دەخوازێ کە لەگەڵ دووهاوڕێکەی خۆیدا لە پاڵ پێغەمبەرو ئەبو بەکرا گۆڕی بۆ هەڵ دەکەنین‌و دەینێژین؟ ئەویش چوو بۆ لای عائیشەو سڵاوی لێ کردو ڕوخصەتی چوونە ژوورەوەی خواست‌و چووە ماڵەوە ڕوانی وا عائیشە بۆ عومەر دەگری جا عەبدوڵڵا ڕاسپێرییەکەی عومەر بە عائیشە دەڵێ: ئەویش دەڵێ: ئەو جێگەیەم بۆ شوێن گۆڕی خۆم دانابوو، بەڵام کە وای لێ هات دەیدەم بەو، جا کە دەگەڕێتەوە دەڵێن: وا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هاتەوە، عومەر دەڵێ: کەمێ بەرزم کەنەوە، جا پیاوێ پاڵی دەدا بە خۆیەوەو ڕاستی دەکاتەوە، جا بە ئیبنو عومەر دەڵێ: ها، گوتی چی؟ گوتی: بە دڵی تۆ بوو ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! عائیشە ڕێگەی دا کە تەرمی تۆ لە پاڵ پێغەمبەرو ئەبو بەکردا لە هۆدەکەی ئەودا بە خاك بسپێرێ عومەر گوتی: سوپاس‌و ستایش بۆ خودا، ئەم باسەم بە لاوە لە هەموو

شتێكی تر گرنگتربوو، جا كە گیانم سپارد هەڵم گرن و بم بەن و خۆت سەلام بكەو بڵێ: عومەری كوڕی خەططاب روخصەت دەخوازێ، جا ئەگەر عائیشە رێگەی پێدام، ئەوا بم بەنە ژوورەوەو لەوێ لە خزمەت حەزرەت و ئەبو بەكردا بم نێژن، ئەگینا بم بەن بۆ گۆڕستانی تێكڕای موسوڵمانان، حەفصەی دایكی موسوڵمانان، كە هاوسەری پێغەمبەر بوو كچی عومەر بوو، ژنگەلیش لە گەڵیا دەهاتن، كە گەیشتە بەرەوە ئێمە هەڵساین و ئەو چووە ژوورەوە بۆ لای و تاوێ لە كنی مایەوە، دیسان پیاوان داوای چوونە ژوورەوەیان كردەوەو حەفصە لەوێوە رۆیشتە ناو هۆدەیەكی ترەوەو گوێمان لێ بوو لە ژوورەوە دەگریا، جا عەرزیان كرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! وەصییەت بكەو راسپێرەو كەسێ لە جێگەی خۆت بكە بە جێنشین" گوتی: بۆ ئەم كارە كەس وەك ئەم دەستەیە بە باش نازانم – یا گوتی: وەك ئەم تاقمەیە بە باش نازانم – چونكە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا مرد لێیان رازی بوو، ئەنجا عەلی و عوسمان و زوبەیرو طەلحەو سەعدو عەبدولڕەحمانی بەناو دیاری كردو گوتی: عەبدوللای كوڕی عومەر شایەت بێ لەسەرتان، بەڵام خۆی بەشی لەم كاری جێنشینییەدا نییە، وەك كەسێ بیەوێ بەم شایەتییە دڵی بداتەوە، جا ئەگەر سەعدبوو بە فەرمانڕەوا ئەوا باشە ئەگینا هەركامێكتان كران بە فەرمانڕەواو داوای راوێژو كۆمەكی لێ بكەن، چونكە من كاتی خۆی كە لەسەر كارلام بردو لە فەرمانڕەوایی كووفەم خست لەبەر بێ كارەیی و دەستەوسانی و دەست پیسی و ناپاكی نەبوو. لە پاشدا گوتی: من ئامۆژگاری ئەو كەسە دەكەم كە لە شوێنی من دەبێ بە جێنشین (خەلیفە) كە زۆر باش بێ بۆ كۆچكەرە پێشینەكان و چاوی خێری لێیان بێ، بەم رەنگە قەدریان بزانێ و خاتریان بگرێ و رێزیان رابگرێ و مافی خۆیانیان بداتێ، وە هەروەها ئامۆژگاریشی دەكەم كە بۆ یاریدە دەرانیش زۆر باش بێ، چونكە خودا خۆشی دەوێن و لە پەسن و مەدح و ستایشی ئەواندا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ – ٩٥/٥}.

واتە: وە بۆ ئەو موسوڵمانە یاریدەدەرانەشە كە لە پێش كۆچ‌و رەوی كۆچكەرانا بۆ شاری مەدینە ئەوان لەوێ ماڵ‌و حاڵی خۆیان هەبوو، لە خانەو لانەی خۆیانا دامەزرابوون، وە ئەمانیش بە رلە هاتنی ئەوان هۆگری ئیمان‌و ئیسلامەتی‌و باوەڕ بووبوون وەك ئەوان، بۆیەكا كاتێ خەڵكی مەككە كۆچیانكرد بۆ لایان ئەوان زۆر بە گەرم‌و گوڕی‌و گەلێ بەسۆزو شەوق‌و خۆشەویستییەوە پێشوازییان لێ كردن عومەر گوتی: ئامۆژگاریی‌و راسپێریم ئەوەیە: كە لە باشیان رازی بن‌و چاو پۆشی لە خراپیان بكەن، وە هەروەها ئامۆژگاری دەكەم كە بۆ خەڵكی گەورە شارەكان باش بێ‌و چاوی خێری لێیان بێ، چونكە ئەوانە پشت‌و پەناو قەڵای پۆڵایینی ئیسلامن‌و كانگای دارایی‌و سامانن بۆ دەوڵەتی ئیسلام‌و داخی دڵی دوشمنانن! وە نابێ بە زۆرو زۆركاری هیچیان لێ بسێنرێ، مەگەر شتێ كە لە خۆیان زیاد بێ، ئەویش بە رەزامەندیی خۆیان! وە هەروەها ئامۆژگاریشی دەكەم كە زۆرباش بێ بۆ عەرەبە دەشتەكییەكان چونكە ئەوانیش بنج‌و بنچینەی عەرەبن‌و ماك‌و مایەی ئیسلامن، ئەو زیادە ماڵەشی كە لێیان دەسێنرێ دەدرێتەوە بە هەژارانی خۆیان، وە هەروەها ئامۆژگاریشی دەكەم كە عەهدو پەیمانی خوداو عەهدو پەیمانی پێغەمبەری خودا رابگرێ دەربارەی پەیماندارەكان‌و ئەهلی ذیممەو بۆیان باش بێ‌و پەیمانیان بباتە سەرو لە سەریان بكاتەوەو نەیەڵێ كەسێ دەسدرێژیی لە ناموس‌و سەرو ماڵیان بكا، وە داوای كارێكی وایان لێ نەكا كە لە تەوانایانا نەبێ، گوتی: كاتێ گیانی سپارد ئەوجا هەڵمان گرت‌و بردمان چووین بۆ لای عائیشە، ئیبنو عومەر سڵاوی لێ كردو گوتی: عومەر روخصەت دەخوازێ.

عائیشەش گوتی: بیبەنە ژوورەوە، ئینجا بردیانە ژوورەوەو لەوێ لە پاڵ هەردوو هاوڕێكەیدا دایان ناو ناشتیان! جا كە لێ بوونەوە لە ناشتنی تەرمی عومەر ئەو تاقمە كۆ بوونەوەو عەبدولڕەحمان گوتی: ئەم كارو فرمانەی كە سپێرراوە بە ئێوە ئادەی بەرەو رووی سێ كەستانی بكەنەوە زوبەیر گوتی: من هەقی خۆم بەرەوڕووی عەلی كردەوە، طەلحەش گوتی: من

مافی خۆمم بەرەو رووی عوسمان کردەوە سەعدیش گوتی: من مافی خۆمم بەرەو رووی عەبدولرەحمان کردەوە، ئینجا عەبدورەحمان گوتی: کامتان دەیەوێ لە ئۆباڵی ئەم کارە دەرچێ دەیدەین بەوو ئیتر دەیدەینە دەستی خوداو ئایینی ئیسلام‌و خۆی‌و خوای خۆی‌و خۆی‌و دینی خۆی! – تا بەم قسەیە لە دڵی خۆیەوە تاقییان بکاتەوەو بزانێ کامیان باشترن – بەڵام هەردو پیر خامۆش بوون‌و چرکەیان نەکرد، ئەوسا عەورەحمان گوتی: ئایا کارەکە بەرەو من دەکەنەوە، خودا شایەت بێ لەسەرم کە دریغی نەکەم‌و بیدەم بە باشترین کەستان بۆ ئەم کارە؟ گوتیان: ئا بەرەو رووی تۆی دەکەینەوە، ئەویش دەستی عەلی گرت‌و گوتی: تۆ خۆت دەزانی کە هەم خزمی پێغەمبەری هەم پایەو شانێکی باشت هەیە لە ئایینی ئیسلامدا، هەر وەکوو یەکێکی لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان جا خودا شایەت بێ لەسەرت ئەگەر تۆ بکەم بە فەرمانڕەوا عادڵ‌و دادپەروەر دەبیت‌و ئەگەر عوسمانیش بکەم بە فەرمانڕەوا گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەریی ئەو دەکەیت‌و لە فەرمانی دەرناچی؟ گوتی: بەڵێ، ئینجا لەگەڵ عوسمانیشدا دوو بەدوو سەریان کرد بە یەکاو هەمان قسەی بەویش گوت، جا کە لەسەر ئەم شێوەیە عەهدو پەیمانی لێ وەرگرتن گوتی: ئەی عوسمان! دەستت هەڵبڕە، ئەوجا عەبدورەحمان خۆی پەیمانی دایەو عەلیش پەیمانی دایە، ئیتر خەڵکی مەدینەش بەرودوا چوونە ژوورەوەو پەیمان‌و بەیعەتیان لەگەڵی دابەست! (بوخاری – خودای لێ رازی بێ).

## ٨) باسی گەورەیی‌و پاکژی حەزرەتی عوسمان (خودای لێ رازی بێ)
## فضائل عثمان (رَضِيَ اَللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ)

٣٢٧٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَائِطٍ: مِنْ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَاسْتَفْتَحَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ. فَفَتَحْتُ لَهُ، فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ، فَبَشَّرْتُهُ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَحَمِدَ اللّٰهَ، ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ فَاسْتَفْتَحَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ. فَفَتَحْتُ لَهُ، فَإِذَا هُوَ عُمَرُ، فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَمِدَ اللّٰهَ، ثُمَّ اسْتَفْتَحَ رَجُلٌ،

فَقَالَ لِي النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ. فَإِذَا عُثْمَانُ، فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ قَالَ اللَّهُ الْمُسْتَعَانُ. رَوَاهُ الشيخان والترمذى[1]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە باخێ لە باخەکانی مەدینەدا لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) بووم، باخەکە بیرێکی تیابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر ئاخڵەی بیرەکە دانیشت‌و قاچەکانی داهێشتە ناو بیرەکەوە، منیش بووم بە دەرکەوانی" پیاوێ هات لە دەرگای دا کە دەرگای بۆ بکەینەوە" پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەرگای بۆ بکەرەوەو مژدەی بەهەشتیشی بدەرێ کە دەرگام کردەوە بۆی روانیم ئەبو بەکرە، مزگێنییەکەی پێغەمبەرم پێدا، سوپاس‌و ستایشی خودای کرد. ئەنجا پیاوێکی تریش هات لە دەرگای دا، حەزرەت فەرمووی: دەرگای بۆ بکەرەوەو مژدەی بەهەشتیشی بدەرێ، کە دەرگام کردەوە بۆی روانیم عومەربوو، مزگێنییەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێیم گوت، سوپاس‌و ستایشی خودای کرد، ئینجا پیاوێکی تریش هات لە دەرگای دا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەرگای بۆ بکەرەوەو مژدەی بەهەشتێ پێ بدە، گەرچی تووشی مەینەت‌و بەڵایەکیش دەبێ جا کە دەرگاکەم بۆی کردەوە سەیرم کرد عوسمان بوو، کە فەرمایشتەکەی حەزرەتم پێی گوت سوپاسی خودای کردو لە پاشا گوتی: الله المستعان: هەر خودایە کە داوای یارمەتی لێ دەکرێ‌و بە تەمای پشتیوانی خودا (ش/ت—خودایان لێ رازی بێ).

٣٢٧٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: كُنَّا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ نَعْدِلُ بِأَبِي بَكْرٍ أَحَدًا ثُمَّ عُمَرَ ثُمَّ عُثْمَانَ، ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ نُفَاضِلُ بَيْنَهُمْ. رَوَاهُ البخارى وابو داود والترمذى[2]:

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٦٩٣ ، ٣٦٩٥ ، ٦٢١٦ ، ٧٢٦٢. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٦٢ ترمذي. مناقب: ٣٧١٠

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: بە سەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كەسمان بەهاوتای ئەبو بەكر دانەدەنا، لە پاش ئەو عومەرمان بە دووەم كەس دادەنا، لە پاش ئەویش عوسمانمان بە سپێیەم كەس دادەنا، ئیتر دەستمان لە كارو باری نێوانی یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەدەداو باوی كە سیانمان نەدەدا بەسەر كەسیانا (ب/د/ن).

٣٢٧٤- وَعَنْهُ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَيٌّ أَفْضَلُ أُمَّةِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَهُ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ ثُمَّ عُثْمَانُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ). رَوَاهُ أبو داود والطبراني وزاد: فيسمع النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَلِكَ فَلاَ يَنْكُره[٣]:

دیسان گوتی: ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی مابوو، دەمانگوت: چاكترینی ئوممەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) — لە پاش خۆی — ئەبو بەكرە، لە پاش ئەویش عومەرە، لە پاش عومەریش عوسمانە. (رەزای خودایان لێ بێ) (د/ طەبەرانی) طەبەرانی ئەمەشی زیاترە: وا دەبوو حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) گوێی لەم قسەیە دەبوو رەخنەی لێ نەدەگرت. لە عەینیدا دەڵێ (خوا لە خاوەنەكەی رازی بێ): سەرپاكی سوننییەكان لەو بیرو باوەڕەدان: كە لە پاش عوسمانیش عەلی چاكترین كەسە، لە پاش عەلیش ئەوانی تری دەكەسە مژدە پێدراوەكانە، ئینجا بەدرییەكانە، واتە: ئەوانەی كە ئامادەی غەزای بەدر بوون (وەرگێڕ).

٣٢٧٥- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَعِدَ أُحُدًا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ فَرَجَفَ بِهِمْ فَقَالَ: اثْبُتْ أُحُدُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلم[٤]:

---

[٢] بخاری. فضائل، ٣٦٩٧.

[٣] مسكوت عنه من الشارح.

[٤] بخاری. فضائل، ٣٦٩٩.

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرو ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان دەڕۆنە سەرکێوی ئوحود، کێوەکە لە خۆشییانا دەکەوێتە جموجووڵ و لەرزە لەرز، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ پێی: ئەی ئوحود! داسەکنێ و دامرکێ، تەنیا پێغەمبەرێك و پیاو چاکێکی ڕاستاڵی ڕاستگۆو دوو شەهید وان لەسەر تۆ (ب/د/ت/ن/خودایان لێ ڕازی بێ).

٣٢٧٦- وَقِيْلُ لِعُبَيْدِ اللّٰهِ بْنَ عَدِيٍّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تُكَلِّمَ عُثْمَانَ فِي أَخِيهِ الْوَلِيدِ فَقَدْ أَكْثَرَ النَّاسُ فِيهِ. فَقَصَدْتُ لِعُثْمَانَ حَتَّى خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقُلْتُ له: إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، وَهِيَ نَصِيحَةٌ لَكَ. قَالَ يَا أَيُّهَا الْمَرْءُ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْكَ. فَرَجَعْتُ إِلَيْهِمْ إِذْ جَاءَ رَسُولُ عُثْمَانَ فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: مَا نَصِيحَتُكَ؟ فَقُلْتُ: إِنَّ اللّٰهَ سُبْحَانَهُ بَعَثَ مُحَمَّدًا بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، وَكُنْتَ مِمَّنِ اسْتَجَابَ لِلّٰهِ وَلِرَسُولِهِ، فَهَاجَرْتَ الْهِجْرَتَيْنِ، وَصَحِبْتَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَأَيْتَ هَدْيَهُ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ أَكْثَرَ النَّاسُ فِي شَأْنِ الْوَلِيدِ. قَالَ: أَدْرَكْتَ رَسُولَ اللّٰهِ؟ قُلْتُ لاَ وَلَكِنْ خَلَصَ إِلَيَّ مِنْ عِلْمِهِ مَا يَخْلُصُ إِلَى الْعَذْرَاءِ فِي سِتْرِهَا. قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ اللّٰهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَقِّ، فَكُنْتُ مِمَّنِ اسْتَجَابَ لِلّٰهِ وَلِرَسُولِهِ وَآمَنْتُ بِمَا بُعِثَ بِهِ، وَهَاجَرْتُ الْهِجْرَتَيْنِ كَمَا قُلْتَ، وَصَحِبْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبَايَعْتُهُ، فَوَاللّٰهِ مَا عَصَيْتُهُ وَلاَ غَشَشْتُهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللّٰهُ، ثُمَّ أَبُو بَكْرٍ مِثْلُهُ، ثُمَّ عُمَرُ مِثْلُهُ، ثُمَّ اسْتُخْلِفْتُ، أَفَلَيْسَ لِي مِنَ الْحَقِّ مِثْلُ الَّذِي لَهُمْ؟ قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: فَمَا هَذِهِ الأَحَادِيثُ الَّتِي تَبْلُغُنِي عَنْكُمْ أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ شَأْنِ الْوَلِيدِ، فَسَنَأْخُذُ فِيهِ بِالْحَقِّ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ، ثُمَّ دَعَا عَلِيًّا فَأَمَرَهُ أَنْ يَجْلِدَهُ فَجَلَدَهُ ثَمَانِينَ. رَوَاهُ البخاری وأحمد والترمذی[٥]:

گوتیان بەعوبەیدوڵڵای کوڕی عەدیی (خودای لێ ڕازی بێ) بۆ قسە لەگەڵ عوسمان ناکەیٚ، لە بارەی وەلیدی دایك برایەوە، بە ڕاستی لە تامی دەرکردووەو مەردووم زۆر باسی خراپیی دەکەن! گوتی: کە عوسمان هات بۆ نوێژ چوومە لای و پێیم گوت: ئیشێکم پێت هەیە، دەمەوێ ئامۆژگارییەکی

[٥] بخاری. فضائل: ٣٦٩٦.

دۆستانەت بكەم، كەچی گوتی: كابرا! پەنا دەگرم بە خودا لەتۆ! ئیتر منیش چوومەوە بۆ لای خەڵكەكە پاشان رابەڕی عوسمان هات بە شوێنما، كە چوومەوە كنی گوتی: ئامۆژگارییپیەكەت چییە؟ گوتم: یەزدانی پاك‌و بێ نەنگ ئەم ئایینە راست‌و دروستەی بەموحەممەددا ناردووەو قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆی كە نامەو پەیامی خودا خۆیەتی، تۆ خۆت یەكێكی لەو كەسانە كە بە جوانی چوویت بە دەنگی خوداو پێغەمبەری خوداوە، سەرەڕای ئەوەش لە باتی یەك كۆچ، كە خەڵكی تر كردوویانە، تۆ دوو كۆچت كردووەو لە پێناوی بیرو باوەڕی ئیسلامدا تۆ دووجار لە وڵاتی خۆت رەوت كردووە، جارێ بۆ حەبەشەو جارێ بۆ مەدینە، وە خۆت هاوڕێتیی پێغەمبەرت كردووەو بە چاوی خۆت رێنموونی‌و رەفتاری شیرینی ئەو زاتەت دیوە (دروودی خودای لەسەربێ) ئێستاكەش خەڵك زۆر باسی وەلیدی دایك برات بە خراپی دەكەن. عوسمان گوتی پێم: تۆ فریای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كەوتووی لەكاتی ژیانیدا؟ گوتم: نەء، بەڵام بە پوختی‌و بێ گەردی زانست‌و شەریعەتە نازدارەكەی ئەوم پێ گەیشتووە، هەروەك بە هەموو كەسێكی تریش گەیشتووە، تەنانەت بە بووكی ناو پەردەش گەیشتووە، ئیتر بەمن چۆن ناگا، گوتی: دەسا لەپاش ئەمە، وەك تۆ گوتت، خودا كە ئەم ئایینە راست‌و دروستەی نارد بۆ موحەممەدو قورئانی نارد بۆی من یەكێك بووم لەو كەسانە كە بە باشی وەرامی خوداو پێغەمبەری خودایان دایەوەو چوون بەپیر فەرمانیانەوە، وە لە باتی جارێ دوو جار كۆچم كرد، وە بۆ خۆم هاوڕێتیی پێغەمبەری خودام كردووەو بە چاوی خۆم رێنموونی‌و رەفتاری شیرین‌و بەرزی ئەوم دیوە، سەرەڕای ئەمەش پەیمانم لەگەڵدا بەستووە، ئەمانەیشم بۆیە كردووە چونكە بەراستی‌و بەدڵ باوەڕم بە ئایینەكەی كردووە! دەسا بە یەزدانی پاك تاخودا بردیەوە بۆ لای خۆی نە نافەرمانی ئەوم كردووەو نە لە قسەی دەرچووم‌و نەناپاكی‌و گزێتیم لێی كردووە! لە پاش خۆشی بۆ ئەبو بەكرو بۆ عومەریش كە جێنشینی ئەوبوون هەروا بووم" دڵسۆزو گوێڕایەڵ بووم، ئێستاش كە من لە پاش ئەوان لە جێی ئەوان كراوم بە جێنشین ئایا

هەمان مافێ كە بۆ ئەوان هەبوو بۆ منیش نییە؟ گوتم: با بۆ نییە؟! گوتی: ئەی ئیتر ئەم قسەو باس‌و خواسانە چییە كە لە ئێوەوە پێم دەگاتەوە؟ بۆ ئەوەشی كە باست كرد لە بارەی وەلیدەوە، خوا حەزكا مافی ئەوەی لێ دەستێنین، چونكە ئێستا هەموو شتێكم لەم بارەیەوە بۆ روون بۆتەوە، لە پاشدا عەلی بانگكردو دەستووری دایێ كە داركاریی وەلید بكا، جا عەلی هەشتاداری حەددی لێ دا (ب) بۆ ئەوەی بزانی وەلید چی كردبوو تەماشای ئەم جێگەیە بكە: ← (ب – ٣ ز – ٩٦ فەرموودەی ژمارە /٤/ ٢٣٣٩).

٣٢٧٧- وَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ يَحْفِرْ بِئْرَ رُومَةَ فَلَهُ الْجَنَّةُ. فَحَفَرَهَا عُثْمَانُ. وَقَالَ: مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَلَهُ الْجَنَّةُ. فَجَهَّزَهُ عُثْمَانُ. رَوَاهُ البخاری وأحمد والترمذی[٦]:

(ب – ٢ز – ١٨٣ رقم: ١٩٤٦/٢) لێرەدا دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ) هەر كەسێ بیری رۆمەهەڵكەنێ بەهەشتییە جا عوسمان لەسەر مەسرەفی خۆی هەڵیكەند، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووشی: هەر كەسێ جەیشولعوسرە واتە: سوپای تەنگی‌و تەنگانە تەدارەك بكا بەهەشتییە عوسمان ئەویشی تەدارەك كرد (ب/ئە/ت).

٣٢٧٨- عَنْ عُثْمَانُ بْنُ مَوْهَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ يَحُجُّ الْبَيْتَ فَرَأَى قَوْماً جُلُوساً فَقَالَ مَنْ هَؤُلاَءِ الْقَوْمُ؟ فَقَالُوا: قُرَيْشٌ. قَالَ: فَمَنِ الشَّيْخُ فِيهِمْ قَالُوا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ. قَالَ يَا ابْنَ عُمَرَ إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ شَيْءٍ فحدِّثنشی هَلْ تَعْلَمُ أَنَّ عُثْمَانَ فَرَّ يَوْمَ أُحُدٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ فَتَعْلَمُ أَنَّهُ غَابَ عَنْ بَدْرٍ فَلَمْ يَشْهَدْهُ قَالَ نَعَمْ. قَالَ وَتَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ عَنْ بَيْعَةِ الرُّضْوَانِ قَالَ نَعَمْ. قَالَ فَكَبَّرَ الْمِصْرِيُّ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ تَعَالَ أُبَيِّنْ لَكَ مَا سَأَلْتَنِي عَنْهُ أَمَّا فِرَارُهُ يَوْمَ أُحُدٍ فَأَشْهَدُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ عَفَا عَنْهُ وَغَفَرَ لَهُ وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَدْرٍ فَإِنَّهُ كَانَتْ تَحْتَهُ ابْنَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِنَّهَا مَرِضَتْ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَكَ أَجْرُ رَجُلٍ شَهِدَ بَدْراً وَسَهْمُهُ » وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَيْعَةِ الرُّضْوَانِ فَلَو

---

[٦] رواه تعليقا البخاری قبل رقم: ٣٦٩٥ مباشرة (مترجم).

كَانَ أَحَدٌ أَعَزَّ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ عُثْمَانَ لَبَعَثَهُ بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عُثْمَانَ وَكَانَتْ بَيْعَةُ الرُّضْوَانِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ عُثْمَانُ فَضَرَبَ بِهَا يَدَهُ عَلَى يَدِهِ وَقَالَ: هَذِهِ لِعُثْمَانَ. قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ اذْهَبْ بِهَذَا الآنَ مَعَكَ. رَوَاهُ البخارى والترمذى[٧]:

عوسمانی کوڕی مەوهیب (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ کابرایێ هات خەڵکی میسربوو، حەجی ماڵی خودای کرد، تاقمێ پیاوی دی دانیشتبوون، گوتی: ئەم پیاوگەلە کێن؟ گوتیان: قوریشن، گوتی: ئەی ئەو دەمسپییە کێیە لە ناویاندا؟ گوتیان: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە، گوتی: ئەی ئیبنو عومەر! پرسیارێکم هەیە وەڵامم بدەرەوە، ئەدی پێم بڵێ: ئایا دازانیت کە عوسمان لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا هەڵهاتبوو؟ گوتی: ئا دەزانم، گوتی: ئەی دەزانی کە لە غەزای بەدریش پاش کەوتبوو، بەشداری ئەویشی نەبوو؟ گوتی: ئا، ئەوەش دەزانم، گوتی: ئەی دەزانی کە لە بەیعەتولریضوان (پەیمانی خۆشنوودیو هۆی ڕەزای خودا)یشدا لەوێ نەبوو؟ گوتی: ئا دەزانم، جا کابرا لە خۆشییانا کە وەڵامەکەی ئەویش ڕێکی دڵی ئەوەو بەڵگەیە لەسەر ناتەواویی عوسمان گوتی: ئەڵڵاهو ئەکبەر! ئیبنو عومەر گوتی: وەرە یەکە یەکە ڕوونی بکەمەوە بۆت‌و تێت بگەیێنم: هەڵهاتنەکەی ڕۆژی ئوحود، من شایەتی دەدەم کە خوا لەوە لێی خۆش بووە بەپێی ئەم ئایەتە کە لەوبابەتەوە قسە دەکاو دەفەرموێ:

{وَلَقَدْ عَفَا اللّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ – ٣/١٥٥}.

واتە: بەراستی خودا چاوپۆشی کرد لەو موسوڵمانانەی کە لە غەزای ئوحوددا هەڵهاتبوون‌و پشتی سوپای ئیسلامیان چۆڵ کردبوو، چونکە خودا توانابەخش‌و بە مۆڵەت‌و ئارامە، نەهاتنەکەی ڕۆژی بەدریش عوسمان لەبەر ئەوە نەهاتبوو چونکە کچی پێغەمبەری لەباخەڵا بوو، کە ناوی ڕوقیە بوو (دروودی خودا لەخۆی‌و باوکی بێ) ڕوقیە نەخۆش بوو (عوسمان لەسەر فەرمانی

---

[٧] تجريد البخاری/ بەرگی/ ٤ ل ١٥٠ رقم: ١٤٦١ = ٣٦٩٩ ، ٣١٣٠ ، ٣٦٩٨ ، ٣٧٠٤ ، ٤٠٦٦ ، ٤٥١٤ ، ٤٥١٣ ، ٤٦٥٠ ، ٤٦٥١ ، ٧٠٩٥. فتح الباری.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مایەوە بەلای ژنەكەیەوە، بۆیە لەپاشا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: هەم پاداشی باش‌و هەم پشك‌و بەشت بۆ هەیە بەقەی پیاوێ كە بەخودی خۆی بەشداریی كردبێ لە غەزای بەدردا.

لەبیعەتولریزوانیشدا كە عوسمان حازر نابێ، لەبەر ئەوە دەبێ كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەوكاتەدا كەسێكی تری وەك عوسمان تەواناو هێژا دەست ناكەوێ هەتا لە شوێنی عوسمان بینێرێ بۆ گوفتوگۆ لەگەڵ كافرەكانی ولاتی مەككە هەتا تێیان بگەیەنێ كە حەزرەت‌و یارانی بۆ عەمرە هاتوون‌و بۆ شەڕو هەرا نەهاتوون جا لەپاش ئەوە كە عوسمان بەفەرمانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رۆیشت بۆلای خەڵكی مەككە قاو بلاو دەبێتەوە كە قوڕەیش خۆیان ئامادە دەكەن بۆ جەنگ، ئیتر، موسوڵمانەكانیش خۆیان گورج دەكەنەوەو لەبارو دۆخێكی ئاوا ئالۆزدا بەیعوتولریزوان روو دەدات لەبەر ئەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەدەستی راستی خۆی ئامارەی كردو فەرمووی: ئەمە دەستی عوسمانە ئینجا دای بە دەستی چەپی خۆیاو فەرمووی: ئەم بەیعەت‌و پەیمانەش لەباتی عوسمان! ئیبنو عومەر بە كابرای گوت: دە ئێستا ئەم وەلامانە لەگەڵ خۆت بەرەو ئیتر ئەمانە مەكە بە بەهانە لە عوسمان (ب/ت).

٣٢٧٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُضْطَجِعًا فِي بَيْتِي كَاشِفًا عَنْ فَخِذَيْهِ أَوْ سَاقَيْهِ فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ فَتَحَدَّثَ ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ فَتَحَدَّثَ ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَسَوَّى ثِيَابَهُ - قَالَ مُحَمَّدٌ وَلاَ أَقُولُ ذَلِكَ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ - فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ فَلَمَّا خَرَجَ قَالَتْ عَائِشَةُ: يا رسوا الله دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ فَقَالَ: أَلاَ أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلاَئِكَةُ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنَّ عُثْمَانَ رَجُلٌ حَيِيٌّ وَإِنِّي خَشِيتُ إِنْ أَذِنْتُ لَهُ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ أَنْ لاَ يَبْلُغَ إِلَيَّ فِي حَاجَتِهِ. رواهما مسلم[٨].

---

(٨) مسلم. فضائل: ٦١٥٩ ، ٦١٦٠.

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵی من راکشابوو، هەردوو رانی، یا گوتی: هەردوو لاقی هەڵماڵی بوو، ئەبو بەکر هات روخصەتی هاتنە ماڵەوەی خواست، حەزرەت رێگەی دا هاتە ژوورەوە، بەڵام وەزعی لەخۆی تێك نەداو لەسەر حاڵی خۆی مایەوەو دەستیان کرد بە گوفتوگۆ لە پاشدا عومەر روخصەتی خواست‌و ئەویش هەر بەو شێوەیە هاتە ژوورەوەو دەستی کرد بە گوفتوگۆ، لەپاشدا عوسمان روخصەتی خواست، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێك دانیشت‌و جلەکانی خۆیی رێك خست موحەممەدی قسەبەر –راوی– دەڵێ: من ناڵێم کە ئەمە هەمووی لەیەك رۆژدا رووی داوە ئەوجا عوسمان هاتە ژوورەوەو قسەی خۆی کرد، کە رۆیی عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەبو بەکر هاتە ژوورێ رووت خۆش نەبوو لەگەڵی‌و دەربایستی نەبووی لەپاشا عومەریش هات بۆ ئەویش هەروەها بووی، کەچی کە عوسمان هات هەڵسای دانیشتی‌و خۆت کۆکردەوەو جلەکانی خۆتت رێك خست! فەرمووی: چۆن شەرم‌و شکۆ نەکەم لە پیاوێ کە فریشتە شەرم‌و شکۆی لێ دەکەن. لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: عوسمان پیاوێکی زۆر شەرمنە مەترسی ئەوەم هەبوو ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە رێگەی بدەم بێ بۆلام ئەو ئیشەی کە بەمنی هەبوو بۆی جێبەجێ نەکرێ (م– خودای لێ رازی بێ).

٣٢٨٠– عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: لَمَّا حُصِرَ عُثْمَانُ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ فَوْقَ دَارِهِ ثُمَّ قَالَ لِمَنْ حَاصَرُوهُ: أُذَكِّرُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ حِرَاءَ حِينَ انْتَفَضَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «اثْبُتْ حِرَاءُ فَلَيْسَ عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ». قَالُوا نَعَمْ. ثمَّ قَالَ: أُذَكِّرُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ فِي جَيْشِ الْعُسْرَةِ «مَنْ يُنفِقُ نَفَقَةً مُتَقَبَّلَةً وَالنَّاسُ مُجْهَدُونَ مُعْسِرُونَ فَجَهَّزْتُ ذَلِكَ الْجَيْشَ قَالُوا: نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ: أُذَكِّرُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ بِئْرَ رُومَةَ لَمْ يَكُنْ يَشْرَبُ مِنْهَا أَحَدٌ إِلاَّ بِثَمَنٍ فَابْتَعْتُهَا فَجَعَلْتُهَا لِلْغَنِيِّ وَالْفَقِيرِ وَابْنِ السَّبِيلِ قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ وَأَشْيَاءُ عَدَّدَهَا[٩]:

---

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه) (عثمان: تجريد/ ١ / ١٥٠ ز:١٢٦

ئـەبو عەبـدوڕەحمانی سـەلەمی (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: عوسمـان کاتـێ دەوری گیرابـوو لەسـەربانەکەی خۆیـەوە ملـی کێـشاو بەوانـەی گـوت کـە گەمارۆیان دابوو: تۆ ئەو خودایە، ئایا دەزانن‌و لەبیرتان ماوە ئەوجارە کە کێوی حیراء کەوتە لەرزە، کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پێیی فەرموو: ئەی حیراء![*] دامەزرێ، ئەوەی کە لەسەر تۆیە لە یەکێ لەم سێ کەسە بەدەر نییە: یا پێغەمبەرە، یا دۆستێکی خوای ڕاستگۆو ڕاستاڵە، یا شەهیدەو لەپێناوی خوادا دەکوژرێ، ئایا ئەمەتان ئاگا لێیە؟ گوتیان: بەڵێ. ئیمجا گوتی: تۆ ئەو خوایە ئایا دەزانن‌و لەیادتان ماوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی سوپای جەیشولعوسرەوە فەرمووی: کێ دەیەوێ خێرو خێراتێکی وا بکا کە لەلای خـودا پەسـەندو گیرابـێ لـەو کاتـەدا ئەمـەی فـەرموو کـە موسـوڵمانان دەست تەنگ‌و نەدارا بوون، وە من لە ماڵی حەڵاڵی ساغی خۆم تەدارەکی ئەو لەشکرەم هەموو کرد، ئایا ئەمە دەزانن؟ گوتیان: بەڵێ باش ئاگامان لێیەتی. گوتی: توخوا ئایا دەزانن‌و لەیادتان ماوە کە بیری ڕۆمە ئاوەکەی بە پارەبوو، بە پارەو پـوول نەبوایە کـەس لێـی نـەدەخواردەوە، جا مـن ئـەو بیرەم کـڕی‌و کردم بە وەقفی دەوڵەمەندو هـەژارو ڕێبـوار وەك یـەك؟ گوتیـان: ئا لـە بیرمانـە، وە گەلێ شتی تری لەم بابەتەی ژمارد (ت-س/ح).

٣٢٨١- عَنْ مُرَّةُ بْنُ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَكَرَ الْفِتَنَ فَقَرَّبَهَا فَمَرَّ رَجُلٌ مُقَنَّعٌ فِي ثَوْبٍ فَقَالَ: هَذَا يَوْمَئِذٍ عَلَى الْهُـدَى فَقُمْـتُ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ. قَالَ فَأَقْبَلْتُ عَلَيْهِ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ[١٠]:

موڕڕەی کوڕی کەعب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسـی ئـاژاوە گـەل‌و فەرتەنـەکانی دەکـردو نزیکـی کردبوونـەوە

---

(*) بـە گـوێرەی حەدیـسی ئەنـەس کـە ژمارەکـەی (٣٢٧٥/٤) بـوو، کەلـە زنجیـرە هەشـتی ئـەم بەرگەدا ڕابورد کێوەکە کێوی ئوحود بووە نەك کێوی حیراء؟!!. (وەرگێڕ)

[١٠] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

پیاوێکیش لەوکاتەدا لەوێوە ڕەت بوو، سەرتاپا بە جلەکەی خۆی داپۆشیبوو، فەرمووی: ئەم پیاوە لەو ڕۆژەدا ڕێگەی ڕاست بەرنادا! منیش هەڵسام چووم بۆ لای پیاوەکە، تەماشام کرد عوسمانی کوڕی عەففان بوو، ڕوویم کردە پێغەمبەرو گوتم: ئا ئەم پیاوە؟ فەرمووی: بەڵێ ئەو پیاوە (ت- س/ص).

٣٢٨٢- عَنْ أَبِى سَهْلَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ عُثْمَانُ يَوْمَ الدَّارِ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ عَهِدَ إِلَيَّ عَهْدًا فَأَنَا صَابِرٌ عَلَيْهِ[11]:

ئەبو سەهلە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەو ڕۆژەی کە عوسمان لە ماڵەکەی خۆیا دەورەی گیرابوو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرج‌و پەیمانێکی کردووە لە گەڵما و مزگێنی بەهەشت‌و شەهیدی‌و تووشبوونی ئەم قۆرت‌و بەڵایەی داومەتێ وامنیش ددان دەگرم بە خۆماو ئارام دەگرم لەسەری (ت- س/ص).

٣٢٨٣- عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ حَزْنٍ الْقُشَيْرِىِّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: شَهِدْتُ الدَّارَ حِينَ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ عُثْمَانُ فَقَالَ ائْتُونِى بِصَاحِبَيْكُمُ اللَّذَيْنِ أَلَّبَاكُمْ عَلَيَّ. قَالَ فَجِيءَ بِهِمَا فَكَأَنَّهُمَا جَمَلاَنِ أَوْ كَأَنَّهُمَا حِمَارَانِ. قَالَ فَأَشْرَفَ عَلَيْهِمْ عُثْمَانُ فَقَالَ أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ يُسْتَعْذَبُ غَيْرَ بِئْرِ رُومَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ. مَنْ يَشْتَرِى بِئْرَ رُومَةَ فَيَجْعَلُ دَلْوَهُ مَعَ دِلاَءِ الْمُسْلِمِينَ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ. فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِى فَأَنْتُمُ الْيَوْمَ تَمْنَعُونِى أَنْ أَشْرَبَ مِنْهَا حَتَّى أَشْرَبَ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ. قَالُوا اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ الْمَسْجِدَ ضَاقَ بِأَهْلِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ يَشْتَرِى بُقْعَةَ آلِ فُلاَنٍ فَيَزِيدُهَا فِي الْمَسْجِدِ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ. فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِى فَأَنْتُمُ الْيَوْمَ تَمْنَعُونِى أَنْ أُصَلِّيَ فِيهَا رَكْعَتَيْنِ. قَالُوا اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنِّى جَهَّزْتُ جَيْشَ الْعُسْرَةِ مِنْ مَالِى قَالُوا اللَّهُمَّ نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ

---

[11] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

وَالإِسْلاَمِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عَلَى ثَبِيرِ مَكَّةَ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَأَنَا فَتَحَرَّكَ الْجَبَلُ حَتَّى تَسَاقَطَتْ حِجَارَتُهُ بِالْحَضِيضِ فَرَكَضَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِرِجْلِهِ وَقَالَ: اسْكُنْ ثَبِيرُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ. قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ شَهِدُوا لِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ أَنِّي شَهِيدٌ ثَلاَثًا[١٢]:

سومامەی كوڕی حەزەنی قوشەیری (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە ڕۆژی خانەبگیرەكەدا لەوێ بووم، عوسمان لە سەربانەوە سەری كێشایە ناویانەوەو گوتی: ئەو دوو كەسەتانم بۆ بێنن كە ئێوەیان لەمن ورووكاندووە، گوتی: كە هێنایانن لە دوو نێرە وشتر دەچوون، یا لە دوو نێرەكەر دەچوون، جا عوسمان لەسەربانەوە سەری كێشایە ناویان و گوتی: سوێندتان دەدەم بە خودای گەورەو بە ئایینی ئیسلام ئایا دەزانن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە كۆچی كرد بۆ مەدینە ئاوی سازگارو خۆشی لێ نەبوو جگە لەبیری ڕۆمە، فەرمووی: كێ بیری ڕۆمە دەكڕی خودا لە بەهەشتا بە باشتر هەقی بۆ دەكاتەوە، بەمەرجێ بیكا بە وەقف و خێراو بۆ موسوڵمانان و خۆشی وەك یەكێ لەوان سوودی لێ وەربگرێ وە من ئەو بیرەم كڕی بەماڵی ساغی خۆم و كردم بە وەقفی موسوڵمان، كەچی ئێوە ئەمڕۆ ڕێگەم نادەن كە لە ئاوەكەشی بخۆمەوە، ناچار ئاوی تاڵی دەریا دەخۆمەوە، گوتیان: بەڵێ خودا ئاگای لێیە چۆنی دەڵێی وایە، عوسمان گوتی: توخواو تو ئایینی ئیسلام ئایا دەزانن كە مزگەوتەكەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەنگەبەربوو، جێگەی خەڵكەكەی لێ نەدەبۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: كێ ئەو پارچە زەوییەی ماڵی فیسارەكەس دەكڕێ و دەیخاتە سەر مزگەوت، خودا لە بەهەشتا لە باتی ئەوە شتی باشتری دەداتێ وە من ئەو پارچەیەم كڕی بەپارەی ساغی خۆم، وە دامەدەم مزگەوت بە تەمای شادبوونم بە بەڵێنەكەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) كە گومانی تیانیە دێتەدی، كەچی ئەوەتانێ ئێوە ئەمڕۆ ڕێگەشم نادەن كە دوو ركات نوێژی تیا بكەم! گوتیان: بەڵێ وایە. گوتی: توخوداو تۆ

---

[١٢] بسند حسن رواه الترمذي (شرحه).

ئیسلامەتی و تو دیانەنتان ئایا دەزانن كە من بەماڵی خۆم لەشكری جەیشولعوسرەم بە تەواوی تەدارەك كرد؟ گوتیان: ئا، وایە، پاشان عوسمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: تو هەقی خوداو تو هەقی ئیسلام ئایا دەزانن كە رۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر چیای سەبیری مەككە بوو، ئەبو بەكرو عومەرو منی لە خزمەتدا بووین، چیاكە وەها لەرییەوە تەنانەت بەردەكانی گل بوونەوە بۆ بنی، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) پێ لەقەیەكی پیا كێشاو فەرمووی: داسەكنێ ئەی سەبیر! ئەوانەی لەسەر تۆن پێغەمبەرێك‌و پیاوێكی راست لەگەڵ خودای خۆیاو دوو شەهیدن ئایا ئاگاتان لەمە هەیە؟ گوتیان: ئا چۆنت گوت وایە، عوسمان گوتی: ئەڵڵاهو ئەكبەر! بە خودای كەعبە ئەوا خۆیان شایەتیم بۆ دەدەن كە من شەهیدم، وە سێ جار ئەمەی دووبارە كردەوە (ت-س/ح).

٣٢٨٤- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِتْنَةً، فَقَالَ: يُقْتَلُ فِيهَا هَذَا مَظْلُومًا[١٣]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) باسی ئاژاوەیەكی دەكرد، فەرمووی: ئەمە واتە: عوسمان بە ناڕەوا لەو ئاژەوەدا دەكوژرێ (ت-س/ح).

٣٢٨٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا عُثْمَانُ إِنَّهُ لَعَلَّ اللَّهَ يُقَمِّصُكَ قَمِيصًا فَإِنْ أَرَادُوكَ عَلَى خَلْعِهِ فَلاَ تَخْلَعْهُ لَهُمْ[١٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی عوسمان! بەڵكوو خودا كراسێكت لەبەر بكات، ئەگەر دنیا بوو ویستیان بە زۆر لەبەرتی دابكەنن، بە قسەی ئەوان دایمەكەنە (ت-س/ح). ئەو كراسە خەلافەت‌و جێنشینی حەزرەت بوو، ئەوەبوو لە دوورە شارەكانەوە چوون بۆ

---

[١٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

سەر ئیمامی عوسمان کە لەسەر کار لایبەرن بەڵام بەگوێی نەکردن‌و قسەی ئەوانی شکاندو فەرموودەکەی حەزرەتی نەشکاند، تا شەهید کرا (وەرگێڕ).

٣٢٨٦- وَقَالَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ): جَاءَ عُثْمَانُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِأَلْفِ دِينَارٍ فِي كُمِّهِ حِينَ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَنَثَرَهَا فِي حِجْرِهِ. فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُقَلِّبُهَا فِي حِجْرِهِ وَيَقُولُ: مَا ضَرَّ عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ الْيَوْمِ. مَرَّتَيْنِ[١٥]:

عەبدولڕەحمانی کوڕی سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەریکبوو سوپای جەیشولعوسرەی ڕێك دەخست عوسمان هاتە خزمەتی، لە قۆڵی کراسەکەیا هەزار لیرەی زێڕی بۆ هێناو هەڵی ڕێژایە ناو کۆشیەوە، بەچاوی خۆم چاوم لێبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە کۆشیا پارەکەی ئەم دیوو دیو دەکرد دوو جار لەسەریەك فەرمووی: ئیتر لەمڕۆ بەدواوە عوسمان هەرچی بکا زیانی پێ ناگەیەنێ (ت-ن/س/ح).

٣٢٨٧- وَقَالَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَبَّابٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ): شَهِدْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَحُثُّ عَلَى جَيْشِ الْعُسْرَةِ فَقَامَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَيَّ مِائَةُ بَعِيرٍ بِأَحْلاَسِهَا وَأَقْتَابِهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. ثُمَّ حَضَّ عَلَى الْجَيْشِ فَقَامَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَيَّ مِائَتَا بَعِيرٍ بِأَحْلاَسِهَا وَأَقْتَابِهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. ثُمَّ حَضَّ عَلَى الْجَيْشِ فَقَامَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَيَّ ثَلاَثُمِائَةِ بَعِيرٍ بِأَحْلاَسِهَا وَأَقْتَابِهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ. فَأَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْزِلُ عَنِ الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَقُولُ: مَا عَلَى عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ هَذِهِ مَا عَلَى عُثْمَانَ مَا عَمِلَ بَعْدَ هَذِهِ. روى الترمذي (رَضِي اللَّهُ تَعَالَى عَنهُ) هذه الثمانية، الثلاثة الأول منها بأسانيد صحيحة[١٦]:

ئەوڕەحمانی کوڕی خەبباب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆم لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) بووم هانی خەڵکەکەی دەدا بۆ ڕێکخستنی سوپای جەیشولعوسرە، عوسمان هەڵسا گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری

---

(١٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(١٦) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

**خودا! سەد وشتر بە كۆپان‌و بەژێر كۆپانیەوە لەسەر من" دەیاندەم لە ڕێگەی خودادا، دیسان پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هانەهانەی مەردوومەكەی دا بۆ بەرێكردنی ئەو سوپایە، سەر لەنوێ عوسمان هەڵسایەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دوو سەد وشتر - بە كۆپان‌و بە جلەوە - لەسەرمن دەیاندەم لە ڕێگەی خودادا، دیسانەوە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هانەهانەی مەردومەكەی دا بۆ تەدارەككردنی ئەو سوپایە دووبارە عوسمان هەڵسایەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! سێ سەد وشتر (بە كۆپان‌و ژێر جلیانەوە) لەسەر من، دەیاندەم لە ڕێگەی خودادا جا خۆم چاوم لێ بوو كە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە دوانگەكە دابەزی، دەیفەرموو: عوسمان - لەپاش ئەمە - هەرچی بكا هیچی لەسەر نییە (ت- بەسەندێكی غەریب).**

## ٩) مەزنایەتی‌و مایەی شانازیی (مەناقیب)یەكانی عەلی كوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خوای لێ بێ)

## مناقب علي بن أبي طالب (رَضِي اللَّهُ عَنهُ)

**٣٢٨٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) **قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ قَدْ تَخَلَّفَ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فِي خَيْبَرَ وَكَانَ رَمِدًا فَقَالَ أَنَا أَتَخَلَّفُ عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَخَرَجَ عَلِيٌّ فَلَحِقَ بِالنَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَلَمَّا كَانَ مَسَاءُ اللَّيْلَةِ الَّتِي فَتَحَهَا اللَّهُ فِي صَبَاحِهَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ أَوْ لَيَأْخُذَنَّ بِالرَّايَةِ غَدًا رَجُلٌ يُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَوْ قَالَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَإِذَا نَحْنُ بِعَلِيٍّ وَمَا نَرْجُوهُ فَقَالُوا هَذَا عَلِيٌّ. فَأَعْطَاهُ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **الرَّايَةَ فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ**[1]:

**سەلەمەی كوڕی ئەكوەع** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لە غەزای خەیبەردا عەلی جێما بوو لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەبەر ئەوەی چاوی دەئێشا، لەپاشا عەلی گوتی: من لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دوابكەوم! جا لەماڵ**

---

[1] بخاری. جهاد: ٢٩٧٥ ، ٣٧٠٢ ، ٤٢٠٩. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٧٤. (سلمة بن الأكوع/ تجريد/١/١١٣ ژ: ٩٠).

دەردەچێ و دەچێ بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا لە ئێوارەی ئەو شەوەدا کە بۆ بەیانی خودا خەیبەر فەتح دەکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: سبەینێ ئالاکە دەدەم بە پیاوێ یا فەرمووی: سبەینێ پیاوێ وەری دەگرێ کە خواو پێغەمبەری خودا ئەویان خۆش دەوێ. یا فەرمووی: کە خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ، خودا خەیبەر لەسەر دەستی ئەودا ئازاد دەکا ئێمە بە تەمای عەلی نەبووین چونکە چاوی دەئێشا کەچی لەناکاو عەلی پەیدا بوو، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە عەلییە ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئالاکەی دایەو خوداش خەیبەری بۆ فەتح کردو قەلای خەیبەر گیرا لەسەر دەستی ئەودا (ش- خودای لێ رازی بێ).

٣٢٨٩- عَنْ سَهْلِ بْنُ سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: لأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ رَجُلاً يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كُلُّهُمْ يَرْجُونَ أَنْ يُعْطَاهَا فَقَالَ: أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ؟ فَقَالُوا هُوَ - يَا رَسُولَ اللَّهِ - يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ قَالَ: فَأَرْسَلُوا إِلَيْهِ، فَأُتِيَ بِهِ فَبَصَقَ فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ فَبَرَأَ حَتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ فَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ فَقَالَ عَلِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا. فَقَالَ: انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللَّهِ فِيهِ فَوَاللَّهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ[٢].

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی غەزای خەیبەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم ئالایە سبەینێ دەدەم بە پیاوێ، خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ‌و خوداو پێغەمبەری خوداش ئەویان خۆش دەوێ، لەسەر دەستی ئەودا خودا خەیبەر فەتح دەکا، ئیتر ئەو شەوە هەتا بەیانی خەڵکەکە هەر رەمڵیان لێ دەدا: ئاخۆ ئالاکە دەدرێ بە کامیان، جا

---

[٢] بخاری. جهاد: ٢٩٤٢ ، ٣٠٠٩ ، ٣٧٠١ ، ٤٢١٠ = تجرید/ ٣ ل – ٣٣١ رقم/ ١٢٠٧. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٧٣ ، ٦١٧٤.

كە رۆژ بۆوە مەردومەكە زوو چوونە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر كەسەیان لە دڵەوە بە تەما بوو كە ئاڵاكە بدرێ بەو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەلی كوڕی ئەبو تالیب لە كوێیە؟ عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! هەردوو چاوی دێشێن. فەرمووی: دەبنێرن بە شوێنیا كە عەلی هات پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تفی خۆی كردە ناو هەردوو چاوەكانیەوەو نزای چاكبوونەوەی بۆ كردو بۆیپاڕایەوە، ئیتر دەس بەجێ چاوەكانی وا چاك بوونەوە، دەتگوت كە هەر چاوی نەئێشاوە! ئاڵاكەی دایێ، عەلی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا وەك ئێمەیان لێ دێ هەر شەڕیان لەگەڵ بكەم؟ فەرمووی: بە ئاهیستەو هێدیو هێواشی لەگەڵ سوپاكەتا بكشێ هەتا دەچیتە مەیدان بۆیانو دەگەیتە قەراخ ماڵەكانیان، لەوێ بانگیان بكە بۆ موسوڵمان بوون، ئەوەی مافی خودایەو لە ئایینی ئیسلامدا لەسەریان پێویستە بۆیان روون بكەرەوە، جا ئەگەر ژنەوتیانو ئیسلام بوون ئەوا باشە، ئەگینا ئەوسا شەڕ بكە لەگەڵیان. دەسا بەوخوایەی كە كەسی لە رەنگ نییە بەهۆی تۆوە خودا تاقە پیاوێ رێنموونی بكاو رێگای راستی نیشان بدا ئەوە بۆ تۆ باشترە لە هەرچی وشتری سوور هەیە كە نایا بترین ماڵی عەرەبە ← (ب - ١ ز - ١٥ ژمارە: ١١٣/٥)

٣٢٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: لأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ رَجُلاً يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ. قَالَ عُمَرُ: بْنُ الْخَطَّابِ مَا أَحْبَبْتُ الإِمَارَةَ إِلاَّ يَوْمَئِذٍ فَتَسَاوَرْتُ لَهَا رَجَاءَ أَنْ أُدْعَى لَهَا فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِيًّا فَأَعْطَاهُ إِيَّاهَا وَقَالَ: امْشِ وَلاَ تَلْتَفِتْ حَتَّى يَفْتَحَ اللَّهُ عَلَيْكَ. قَالَ فَسَارَ عَلِيٌّ شَيْئًا ثُمَّ وَقَفَ وَلَمْ يَلْتَفِتْ فَصَرَخَ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَى مَاذَا أُقَاتِلُ النَّاسَ؟ قَالَ: قَاتِلْهُمْ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ فَقَدْ مَنَعُوا مِنْكَ دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى. روى الشيخان هذه الثلاثة[٣]:

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٧٢. بخاری تقدم تخريجه فی الحديث الرقم: ٢ /٣٢٨٩ قبل هذا الحديث مباشرة.

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ڕۆژی خەیبەر حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەم ئالایە دەدەم بە پیاوێ، خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ، لەسەر دەستی ئەودا خودا قەڵای خەیبەر فەتح دەکا عومەر** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەیگوت: ئەو ڕۆژە نەبێ هەرگیز حەزم لە فەرمانداریی‌و سەرکردەیی نەکردووە، بەڵام ئەو ڕۆژە خۆم بۆی قوت کردەوە، سا بەشکوو من بکرێم بە سەرکردەو شاد ببم بەم پەسنەی پێغەمبەرە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەلی بانگکردو ئالاکەی داپێی فەرمووی: بڕۆو لامەکەرەوە هەتا خودا بۆت فەتح‌و ئازاد دەکا عەلی تۆزێ ڕۆیشت‌و ڕاوەستا — بەڵام لای نەکردەوە — بە دەنگی بەرز گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسەر چی جەنگ بکەم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا؟ فەرمووی: جەنگیان لەگەڵ بکە هەتا شایەتی دەدەن کە: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، جا کە ئەوەیان کرد ئیتر سەروماڵیان لەتۆ قەدەغە دەبێ، مەگەر لەسەر هەق، ئیتر لەوە دوا لێ پرسینەوەیان لەسەر خودایەو خودای گەورە خۆی ئاگای لە دڵیانە (ش).**

**٣٢٩١– عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **قَالَ: خَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُخَلِّفُنِي فِي النِّسَاءِ وَالْصِّبْيَانِ؟ فَقَالَ: أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى غَيْرَ أَنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي. روى الشيخان والترمذی**[٤]:

**سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لە غەزای تەبوکدا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەلی کوڕی ئەبو تالیبی کرد بە جێنشینی خۆی‌و لە مەدینە بەجێی هێشت بەسەرشارەوە، عەلی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەمکەیت بە جێنشین‌و بەجێم دێڵی لە ناوژنان‌و مناڵاندا؟ فەرمووی: ئەدی تۆ بەوە ڕازی نابی کە تۆ بۆ من لە پایەی هارووندا بیت بۆ مووسای برای وەك خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:**

[٤] بخاری. مغازی: ٤٤١٦ ، ٣٧٠٦ = ١٦١٨ تجرید. بەرگی/ ٤ ل ٣٧٤.

{وَقَالَ مُوسَى لأَخِيهِ هَارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلاَ تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ – ٧/ ١٤٢}.

واته: مووسا كاتێ رۆیشت بۆ بەجێهێنانی خواپەرستیی چل رۆژەكە، بە هاروونی برای فەرموو: لە جێگەی مندا دابنیشەو ئیش‌و كاری ئایینی‌و دنیایی بەجێ بێنە لەناو گەلەكەماو با رەفتارت لەگەڵیانا بەشێوەی خۆم بێ‌و مەبەستت رێك‌و پێكی‌و دامەزرانی ناو كۆمەڵ بێ‌و چاو لە گێرە شێوێنان مەكەو دووربە لە رەفتارو كردارو كۆمەڵ‌و كۆڕیان فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەمە حاڵ‌و پایەی من‌و تۆیە لەگەڵیەكا، وەلێ ئەوەندە جیاوازیی هەیە هاروون پێغەمبەربووە بەڵام تۆ پێغەمبەر نیت، چونكە لە دوای من پێغەمبەری تر نییەو نابێ (ش/ت).

٣٢٩٢– عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: اسْتُعْمِلَ عَلَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ مِنْ آلِ مَرْوَانَ فَدَعَا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَأَمَرَهُ أَنْ يَشْتِمَ عَلِيًّا فَأَبَى سَهْلٌ فَقَالَ لَهُ: أَمَّا إِذَا أَبَيْتَ فَقُلْ لَعَنَ اللَّهُ أَبَا التُّرَابِ. فَقَالَ سَهْلٌ: مَا كَانَ لِعَلِيٍّ اسْمٌ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَبِي التُّرَابِ وَإِنْ كَانَ لَيَفْرَحُ إِذَا دُعِيَ بِهَا. فَقِيلَ لَهُ أَخْبِرْنَا لِمَ سُمِّيَ أَبَا تُرَابٍ؟ قَالَ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بَيْتَ فَاطِمَةَ عليها السلام فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِي الْبَيْتِ فَقَالَ: أَيْنَ ابْنُ عَمِّكِ؟ فَقَالَتْ كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ شَيْءٌ فَغَاضَبَنِي فَخَرَجَ فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِي فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لإِنْسَانٍ: انْظُرْ أَيْنَ هُوَ فَجَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ فِي الْمَسْجِدِ رَاقِدٌ. فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُضْطَجِعٌ قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ فَأَصَابَهُ تُرَابٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) يَمْسَحُهُ عَنْهُ وَيَقُولُ: قُمْ أَبَا التُّرَابِ قُمْ أَبَا التُّرَابِ. رَوَاهُ الشيخان[٥]:

سەهلی كوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ بوو بەسەركاری شاری مەدینەی نازار، لە كەسوكاری مەڕوان بوو منی بانگكرد گوتی: وەرە

---

[٥] بخاری. صلاة: ٤٤١ ، ٣٧٠٣ ، ٦٢٠٤ ، ٦٢٨٠ = تجرید/ ١ ل – ٢٨٠ ژ: ٢٧٠/ ٤٤١. مسلم. فضائل: ٦١٧٩.

جنێو بە عەلی بدە گوتم: من شتی واناکەم پێی گوتم: کە ئەوە ناکەی بڵێ: لەعنەت و نەفرینی خودا لە ئەبو توراب بێ، گوتم: هیچ ناوێکی عەلی وەك ئەم ناوەی لەلای خۆش نەبوو، کە بە ئەبو توراب بانگیان دەکرد کەیف خۆش دەبوو، جا پێیان گوت: بۆچی بە عەلی دەڵێن ئەبو توراب واتە: خۆڵاوی؟ گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەڕوا بۆ ماڵی فاتیمەی کچی، دەڕوانێ عەلی لە ماڵەوە نییە، دەفەرموێ: ئامۆزات کوا؟ فاتیمە دەڵێ: شتێ رووی دا لە نێوانماندا تۆزێ عاجزی کەوتە نێوانمان و لەبەر ئەوە چووەتە دەرەوەو وچانی نیوەڕۆی لەلای من نەکرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە مرۆڤێ دەفەرموێ: ئادەی بزانە عەلی لە کوێیە؟ کە دێتەوە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی لە مزگەوت نووستووە، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆلای، دەڕوانێ وا راکشاوەو پۆشاکەکەی لە لایا کەوتووەو خۆڵاوی بووە، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە دەستی خۆی خۆڵەکەی لێ دەتەکێنێ و خۆش خۆش دەفەرموێ: هەڵسە ئەی خۆڵاوی ئەی ئەبو توراب! هەڵسە ئەی خۆڵاوی! جا لەمەوە ناونرا ئەبو توراب (ش-خودایان لێ رازی بێ).

٣٢٩٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنِي مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ أَنْ أَسُبَّ أَبَا التراب. فقلت: أَمَّا مَا ذَكَرْتُ ثَلاثًا قَالَهُنَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَنْ أَسُبَّهُ لأَنْ تَكُونَ لِي وَاحِدَةٌ مِنْهُنَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ: قَدْ خَلَّفَهُ رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ يَا رَسُولَ اللَّهِ خَلَّفْتَنِي مَعَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ؟ فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى إِلاَّ أَنَّهُ لاَ نُبُوَّةَ بَعْدِي. وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ خَيْبَرَ: لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ رَجُلاً يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ. قَالَ: فَتَطَاوَلْنَا لَهَا فَقَالَ: ادْعُوا لِي عَلِيًّا. فَأُتِيَ بِهِ أَرْمَدَ فَبَصَقَ فِي عَيْنِهِ وَدَفَعَ الرَّايَةَ إِلَيْهِ فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ) دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِيًّا وَفَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلاَءِ أَهْلِي. رَوَاهُ مسلم والترمذي[٦]:

---

[٦] بخاري. فضائل الصحابة: ٣٧٠٦. مسلم. فضائل: ٦١٧٠. ترمذي. مناقب: ٣٧٤٢.

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: موعاوییە گوتی پێم كە جنێو بە ئەبو توراب بدەم، منیش گوتم: لەبەر ئەم سێ شتە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی دەربارەی عەلی، هەرگیزاو هەرگیز من شتی واناكەم‌و جمێن بەو زاتە نادەم، ئەگەر یەكێ لەم سێ بەهرەیە هی من بێ، بەهەموو موڵك‌و سامانی جیهانی نادەم: یەكێكیان ئەوە بوو جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆ غەزایێ، وە عەلی لەماڵەوە كرد بە جێنشینی خۆی، بەڵام عەلی گوتی: ئەی ڕەهبەری خودا! تۆ منت كردووە بە جێنشینی خۆت بەسەر ژنان‌و منالانەوە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەدی! تۆ بەوە ڕازی نابی كە تۆ بۆ من لەجێی هارون بیت بۆ مووسای برای، تەنیا ئەوەندە هەیە كە لەپاش من پێغەمبەری تر نیە. یەكێكی تریان ئەوەبوو لەڕۆژی غەزای خەیبەردا بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم ئاڵایە دەدەم بە پیاوێ خواو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ‌و خوداو پێغەمبەری خودایش ئەویان خۆش دەوێ گوتی: جا ئێمەیش گوێقوڵاخ بووین‌و خۆمان بۆ قوت كردەوە، تا فەرمووی: عەلیم بۆ بانگ بكەن عەلییان بۆ هێنا، چاوی دەئێشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تفی پیرۆزی خۆی كردە قنگە لەپەكانی خۆی‌و سووی لەهەر دووچاوی‌و فەرمووی: اللهم لا یشتكی حرا ولا قرا: خودایە! نەبە گەرماو نە بەسەرما چاوی نەئێشێ، عەلی دەیگوت: ئیتر بڕای بڕای تا ئێستا چاوم نەئێشاوە ئەوجا ئاڵاكەی داپێی‌و خودا خەیبەری گرت لەسەر دەستی ئەودا. كە ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە:

{فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ – ٣ / ٦٣}.

واتە: ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ بەو كەسەو بە هاوبیری ئەو كەسە: وەرن ئێمە كوڕەكانمان بانگ دەكەین‌و ئێوەیش كوڕەكانتان بانگ بكەن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی‌و فاتیمەو حەسەن‌و حوسەینی بانگ كردو فەرمووی: ئەی خودایە ئەمانە كەسوكاری منن (م/ت).

٣٢٩٤- عَنْ زَيْد بْنِ أَرْقَمَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ كُنْتُ مَوْلَاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلَاهُ»[٧]:

زەیدی كوڕی ئەرقەم (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی من بە گەورەو سەروەری خۆی دادەنێ، دەبێ عەلیش بە گەورەو سەروەری خۆی دابنێ! (ت-س/ص).

٣٢٩٥- وَعَنْهُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ عَلِيٌّ. قَالَ عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِإِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ فَأَنْكَرَهُ وَقَالَ أَوَّلُ مَنْ أَسْلَمَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ[٨]:

دیسان زەید گوتی: یەكەم كەس لە منالان كە موسوڵمان بوو عەلی بوو، عەمری كوڕی موڕە گوتی: ئەم قسەی زەیدم گێڕایەوە بۆ ئیبراهیمی ئەل-نەخەعی گوتی: یەكەم كەس كە موسوڵمان بوو ئەبو بەكری صەدیق بوو (ت-س/ص).

٣٢٩٦- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَنْتَ مِنِّي وَأَنَا مِنْكَ[٩]:

بەرائی كوڕی عازیب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عەلی كوڕی ئەبو تالیبی فەرموو: تۆ پارچەیەكی لە من‌و من پارچەیەكم لەتۆ! (ت-س/ص).

٣٢٩٧- عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ بِالرَّحَبَةِ قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ الْحُدَيْبِيَةِ خَرَجَ إِلَيْنَا نَاسٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فِيهِمْ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو وَأُنَاسٌ مِنْ رُؤَسَاءِ الْمُشْرِكِينَ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ خَرَجَ إِلَيْكَ نَاسٌ مِنْ أَبْنَائِنَا وَإِخْوَانِنَا وَأَرِقَّائِنَا وَلَيْسَ لَهُمْ فِقْهٌ فِي الدِّينِ وَإِنَّمَا خَرَجُوا فِرَارًا مِنْ أَمْوَالِنَا وَضِيَاعِنَا فَارْدُدْهُمْ إِلَيْنَا قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِقْهٌ فِي الدِّينِ سَنُفَقِّهُهُمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا مَعْشَرَ

---

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).. ( زيد بن أرقم: تجريد/٢/ل١١أز: ٥٩٠).

[٨] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه)..

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه)..

قُرَيْشٍ لَتَنْتَهُنَّ أَوْ لَيَبْعَثَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ مَنْ يَضْرِبُ رِقَابَكُمْ بِالسَّيْفِ عَلَى الدِّينِ قَدِ امْتَحَنَ اللَّهُ قَلْبَهُ عَلَى الإِيمَانِ. قَالُوا: مَنْ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ مَنْ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَقَالَ عُمَرُ مَنْ هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: هُوَ خَاصِفُ النَّعْلِ. وَكَانَ أَعْطَى عَلِيًّا نَعْلَهُ يَخْصِفُهَا ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيْنَا عَلِيٌّ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ[١٠]:

ربیعی کوڕی حیراش (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: لە حەوشی مزگەوتەکەی کووفە، لەو سەردەمەدا کە عەلی فەرمانڕەوای موسوڵنان بوو گیٚڕایەوە بۆمان، گوتی: لە ڕۆژی غەزای حودەیبییەدا دەستەییٚ لە بتپەرستەکان هاتن بۆ لامان، بە سەرۆکایەتی سوهەیلی کوڕی عەمرو چەن گەورە پیاویٚکی تریان، گوتیان: ئەی پیٚغەمبەری خودا! چەند کەسیٚ لە کوڕو براو بەندەی ئیٚمە هەڵهاتوون‌و هاتوون بۆلای تۆ، ئەمانە لە ئایین تیٚ ناگەن، بەڵام لەتاو ئیش‌و کارو لە ترسی خزمەتی ماڵ‌و زەوی‌و زار رایان کردووە، کەواتە بیان دەرەوە پیٚمان. ئەویش فەرمووی: ئەوانە ئەگەر خۆشیان شارەزای ئایین نەبن خۆمان لەمەولا شارەزایان دەکەین! لە پاشدا فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی قورەیش! بەخودا یادەبیٚ وازبیٚنن لەم سەرکەشی‌و سەر رەقییەو بیٚنە ژیٚر رکیٚفی ئیسلام یا دەبیٚ خودا پیاویٚ بنیٚریٚ بۆ سەرتان لەسەر ئایین بە شمشیٚر دەدا لە گەردنتان، ئەو پیاوەش حاڵی وایە کە خودا دڵی ئەوی بە باوەڕو ئیمان جۆش داوە گوتیان: ئەی پیٚغەمبەری خودا! ئەوە کیٚیە؟ ئەبو بەکر گوتی: ئەوە کیٚیە؟ عومەر گوتی: قوربان! ئەوە کیٚیە؟ فەرمووی: ئا ئەمەیە کە ئەم پیٚڵاوانە دەدووریٚتەوە لەوکاتەدا پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) پیٚڵاوەکانی خۆی دابوو بەمن، خەریکبووم دەمدووریینەوە. گوتی: ئینجا عەلی لای کردەوە بەلای ئیٚمەوەو گوتی: پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: ئەوی بە ئارەزوو درۆ بەدەم منەوە بکاو خۆی درۆ هەڵبەستیٚ‌و بیداتە پاڵی من ئەوە با جیٚگە قنگی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکا! (ت-س/ح).

---

[١٠] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه). (ربعي بن حراش: تجريد/١/ل-١١أ: ٨٩).

٣٢٩٨- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَلِيًّا، فَمَضَى فِي السَّرِيَّةِ فَأَصَابَ جَارِيَةً فَأَنْكَرُوا عَلَيْهِ وَتَعَاقَدَ أَرْبَعَةٌ مِنْ أَصْحَابِ عَلَى أَنَّ يَخْبُرُوا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَجَعُوا وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ إِذَا رَجَعُوا مِنَ السَّفَرِ بَدَءُوا بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمُوا عَلَيْهِ ثُمَّ انْصَرَفُوا إِلَى رِحَالِهِمْ فَلَمَّا قَدِمَتِ السَّرِيَّةُ سَلَّمُوا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَامَ أَحَدُ الأَرْبَعَةِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَمْ تَرَ إِلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ صَنَعَ كَذَا وَكَذَا. فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَامَ الثَّانِي فَقَالَ مِثْلَ مَقَالَتِهِ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ قَامَ إِلَيْهِ الثَّالِثُ فَقَالَ مِثْلَ مَقَالَتِهِ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ قَامَ الرَّابِعُ فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالُوا فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْغَضَبُ يُعْرَفُ فِي وَجْهِهِ فَقَالَ: مَا تُرِيدُونَ مِنْ عَلِيِّ مَا تُرِيدُونَ مِنْ عَلِيِّ مَا تُرِيدُونَ مِنْ عَلِيِّ إِنَّ عَلِيًّا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ وَهُوَ وَلِيُّ كُلِّ مُؤْمِنٍ بَعْدِي[11]:

عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەشكرێكی نارد بۆ سەر شوێنێ، عەلی كرد بەسەر لەشكریان عەلی لەگەڵ سوپاكەدا كەوتنە رێ، لەرێ عەلی چووە لای كەنیزەكێ، خەڵكەكە ئەم ئیشەی عەلییان پەسەند نەكردو بە ئیشێكی ناشیرینیان دانا، بۆیە چواركەس لە هاوڕێیان لەناو خۆیانا قسەیان كرد بە یەك كاتێ لە سەفەر گەڕانەوە ئەم باس‌و خواسە بگێڕنەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) یاسای موسوڵمانانیش وابوو كاتێ لە سەفەر دەگەڕانەوە لە پێشدا دەڕۆیشتنە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) سڵاویان لێ دەكردو هەواڵی ئەویان دەزانی‌و ئەوجا بڵاوەیان لێ دەكردو هەر كەسە دەچوونەوە بۆ ماڵی خۆیان، جا بەپێی ئەم دەستوورە لەشكرەكە كاتێ گەڕانەوە چوونە خزمەتی پێغەمبەرو سڵاویان لێ كرد، لەپاش ماوەیێ یەكێ لە چوار پیاوەكە هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دەزانی كە عەلی ئیشێكی واوای كردووە! بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رووی لێ وەرچەرخان، ئینجا دووهەم

[11] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

هەڵساو قسەکەی ئەوی دووبارە کردەوە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی لەویش وەرچەخان، سێیەم‌و چوارەمیش هەروا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە روویەکی توورەو زیزەوە رووی تێ کردن‌و فەرمووی: چیتان دەوێ لە عەلی؟ سێ جار ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە، ئینجا فەرمووی: عەلی پارچەیەکە لەمن‌و من پارچەیەکم لە عەلی، وە لە دوای من ئەو گەورەو سەرداری هەموو موسوڵمانێکە (ت-س/ح).

٣٢٩٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لاَ يُحِبُّ عَلِيًّا مُنَافِقٌ وَلاَ يَبْغَضُهُ مُؤْمِنٌ[١٢]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: مرۆی ناپاك‌و مونافیق عەلی خۆش ناوێ، مرۆی موسوڵمانیش رقی لە عەلی نابێ (ت-س/ح).

٣٣٠٠- عَنِ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِحُبِّ أَرْبَعَةٍ وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ يُحِبُّهُمْ. قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ سَمِّهِمْ لَنَا. قَالَ « عَلِيٌّ مِنْهُمْ يَقُولُ ذَلِكَ ثَلاَثًا وَأَبُو ذَرٍّ وَالْمِقْدَادُ وَسَلْمَانُ أَمَرَنِي بِحُبِّهِمْ وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ يُحِبُّهُمْ[١٣]:

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە فەرمانی کردووە بەمن کە چوارکەسم خۆش بوێ، وە فەرمووی پێم: خۆشم خۆشم دەوێن! گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ناویان چییە؟ فەرمووی: یەکێکیان عەلییە سێ جار ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە، ئینجا فەرمووی: ئەوانی تریشیان: ئەبو زەڕو میقدادی کوڕی ئەسوەدو سەلمانی فارسین، خودا فەرمانی پێم کردووە کە ئەمانەم خۆش بوێ، وە فەرموویەتی پێم: خۆشی خۆشی دەوێن (ت-س/ح).

---

[١٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه) . (أم سلمه. تجريد/ ١ ل- ١١٨ ژ: ٩٤).

[١٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٣٣٠١- عَنْ حُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلِيٌّ مِنِّي وَأَنَا مِنْ عَلِيّ وَلاَ يُؤَدِّي عَنِّي إِلاَّ أَنَا أَوْ عَلِيٌّ[١٤]:

حەبەشی كوڕی جونادە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەلی لەمنەو من لە عەلیم، كەس لەجیاتی من ئیش و كار، ڕایی نەكا جگە لە خۆم و عەلی (ت–س/ح).

٣٣٠٢- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا): آخَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ عَلِيٌّ تَدْمَعُ عَيْنَاهُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ آخَيْتَ بَيْنَ أَصْحَابِكَ وَلَمْ تُؤَاخِ بَيْنِي وَبَيْنَ أَحَدٍ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنْتَ أَخِي فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ[١٥]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) برایەتی (موئاخات)ی بەست لە نێوانی یارانی خۆیا، عەلی بە چاوی فرمێسكاوییەوە هات بۆ خزمەتی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پەیمانی برایەتیت بەستووە لە نێوانی هەر دوو كەسێ لە هاوڕێیانی خۆت، بەڵام لە نێوانی من و كەسێكی تردا پەیمانی برایەتیت نەبەستووە! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): لە دنیاو لە قیامەتا ئەی عەلی! تۆ برای منیت! (ت–س/ح).

٣٣٠٣- عَنْ عَلِيٌّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: كُنْتُ إِذَا سَأَلْتُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْطَانِي وَإِذَا سَكَتُّ ابْتَدَأَنِي[١٦]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) دەیگووت: هەمیشە وابووم لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر خۆم داوەی بەشم لێی بكردایە ئەوا بەشی دەدام، ئەگەر دەنگیشم نەكردایە لە منەوە دەستی پێ دەكرد (ت–س/ح).

٣٣٠٤- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: بَعَثَ النَّبِي جَيْشَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَى أَحَدِهِمَا عَلِياً وَعَلَى الآخَرِ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَقَالَ: إِذَا كَانَ الْقِتَالُ فَعَلِيٌّ. (أي هو الأمير) فَافْتَتَحَ عَلِيٌّ

---

[١٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

حِصْنًا فَأَخَذَ مِنْهُ جَارِيَةً فَكَتَبَ مَعِي خَالِدُ كِتَابًا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَشِي بِعَلِيٍّ فَقَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فأعطيته الكتابَ فقرأَهُ فَتَغَيَّرَ لَوْنُهُ ثُمَّ قَالَ: مَا تَرَى فِي رَجُلٍ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، قُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ غَضَبِ اللَّهِ وَغَضَبِ رَسُولِهِ وَإِنَّمَا أَنَا رَسُولٌ. فَسَكَتَ[١٧]:

**بەراء** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دوو لەشكری بەڕێكرد عەلی كرد بەسەركردەی لەشكرێكیان‌و خالیدی كوڕی وەلیدیش بەسەركردەی لەشكرێكیان وە فەرمووی: كە كوشتارو جەنگ بەرپا بوو عەلی فەرمانداری گشتییە. عەلی قەڵایەكی گرت‌و كەنیزەكێكی لێ برد بۆ خۆی، خالیدیش نووسراوێكی نووسی‌و بەمنا ناردی بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **راستیی ئەو ئیشەی لە عەلی دا، منیش چوومەوە بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ)**و نووسراوەكەم دایێ، كە خوێندیەوە رەنگی گۆڕا، فەرمووی: پیاوێ خوداو پێغەمبەری خودای خۆش بوێت‌و خوداو پێغەمبەری خواش ئەویان خۆش بوێ تۆ ئەو پیاوە چۆن دەبینیت‌و بەچۆن پیاوێكی دەزانیت ئەقڵ دەیگرێ كە كاری ناشایستە بكا؟ گوتم: من پەنا دەگرم بەخودا لەقاری خوداو لەقاری پێغەمبەری، من چیم بەدەستە من تەنیا رابەرێكم‌و بەس، ئیتر حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەنگی نەكرد (ت-س/ح).**

**٣٣٠٥-** وَقَالَ جَابِر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الطَّائِفِ فَانْتَجَاهُ فَقَالَ النَّاسُ: لَقَدْ طَالَ نَجْوَاهُ مَعَ ابْنِ عَمِّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا انْتَجَيْتُهُ وَلَكِنَّ اللَّهَ انْتَجَاهُ[١٨]:

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: رۆژی غەزای تائیف پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەلی بانگ كردە لاوەو دەستی كرد بە چپەكردن لەگەڵیا، خەڵكەكەش بێزار بوون‌و گوتیان: لەگەڵ ئامۆزاكەیدا چپ‌و هوڕیان درێژەی كێشا!**

---

[١٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من لە خۆمەوە چپەم لەگەڵ نەكرد، من بە فەرمانی خودا چپەم لەگەڵ دەكرد! (ت-ێ/ح).

٣٣٠٦- وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِعَلِيٍّ: يَا عَلِيُّ لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ أَنْ يُجْنِبَ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ غَيْرِي وَغَيْرَكَ[١٩]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عەلی فەرموو: ئەی عەلی! بۆ من و تۆ نەبێ بۆ كەسی تر دروست نییە كە لەم مزگەوتەدا بە لەشی پیسەوە હاموشۆ بكات (ت-س/ح).

٣٣٠٧- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَيْشًا وَفِيهِمْ عَلِيٌّ. قَالَتْ فَسَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْنِي حَتَّى تُرِيَنِي عَلِيًّا[٢٠]:

ئوممو عەتییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشكرێكی بەرێكرد، عەلییان تیابوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرز كردبۆوە، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ئەی خودایە! نەم مرێنیت تا عەلیم نیشان دەدەیتەوەو چاوم بە عەلی دەكەوێتەوە! (ت-س/ح).

٣٣٠٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَيْرٌ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ ائْتِنِي بِأَحَبِّ خَلْقِكَ إِلَيْكَ يَأْكُلُ مَعِي هَذَا الطَّيْرَ. فَجَاءَ عَلِيٌّ فَأَكَلَ مَعَهُ[٢١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باڵندەیەكی دانابوو، فەرمووی: خودایە! كێت لە دروستكراوانی خۆت لە هەموو كەسێ خۆشتر دەوێ بێ رەخسێنە بۆم، تا ئەم پەلەوەرەم لەگەڵدا بخوات. جا عەلی هات لەگەڵیا خواردی (ت-بەسەندێكی غەریب).

---

[١٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٢٠] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه). (ام عطية: تجريد/١ل-٢١٤ ژ: ٢٠٥).

[٢١] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٣٣٠٩- عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَحِمَ اللّٰهُ أَبَا بَكْرٍ زَوَّجَنِي ابْنَتَهُ وَحَمَلَنِي إِلَى دَارِ الْهِجْرَةِ وَأَعْتَقَ بِلاَلاً مِنْ مَالِهِ رَحِمَ اللّٰهُ عُمَرَ يَقُولُ الْحَقَّ وَإِنْ كَانَ مُرًّا تَرَكَهُ الْحَقُّ وَمَالَهُ صَدِيقٌ رَحِمَ اللّٰهُ عُثْمَانَ تَسْتَحْيِيهِ الْمَلاَئِكَةُ رَحِمَ اللّٰهُ عَلِيًّا اللّٰهُمَّ أَدِرِ الْحَقَّ مَعَهُ حَيْثُ دَارَ. روى الترمذى (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) الستة عشر[٢٢]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لە ئەبو بەكر، كچی خۆی داوەپێم‌و بە سواری ولاخی خۆی هێنامی تا گەیاندمیە هەواری كۆچم‌و بەماڵی خۆی بیلالی كڕی‌و ئازادی كرد، رەحمەتی خودا لە عومەر، پیاوێكی حەق بێژو هەقانی‌و راستی پەروەرە، هەق‌و راستی‌و شتی رەوا، خۆش بێ‌و تاڵ بێ، عومەر سەری پێوە نییە لە راستیان، هەقدۆستی‌و راستی پەروەری دۆست‌و برادەریان نەهێشتووەتەوە بۆ عومەر، رەحمەتی خودا لە عوسمان، فریشتە شەرم‌و شكۆی لێ دەكەن رەحمەتی خودا لەعەلی، ئەی خودایە! هەق‌و راستی لەگەڵ عەلیدا بسووڕێنە، كارێكی وا بكە عەلی لە كوێ بێ هەقیش لەوێ بێ! (ت-سند غریب).

٣٣١٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا دَارُ الْحِكْمَةِ وَعَلِيٌّ بَابُهَا. رَوَاهُ الترمذى والطبرانى وصححه الحاكم[٢٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من خۆم گەنجینەی دانایی‌و زانست‌و حیكمەتم‌و عەلی دەرگاكەیەتی. (ت/ تەبەرانی/ حا:ص).

٣٣١١- عَنِ الأَقْرَعِ مُؤَذِّنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنِي عُمَرُ إِلَى الأُسْقُفِّ فَدَعَوْتُهُ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: وَهَلْ تَجِدُنِي فِي الْكِتَابِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ تَجِدُنِي؟ قَالَ: أَجِدُكَ قَرْنًا. قَالَ: فَرَفَعَ عُمَرَ عَلَيْهِ الدِّرَّةَ فَقَالَ: قَرْنٌ مَهْ؟ فَقَالَ: قَرْنٌ حَدِيدٌ أَمِينٌ

---

[٢٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٢٣] صحيح عند الحاكم.

**شَدِيدٌ، قَالَ عُمَر: كَيْفَ تَجِدُ الَّذِي يَجِيءُ مِنْ بَعْدِي؟ قَالَ: أَجِدُهُ خَلِيفَةً صَالِحًا غَيْرَ أَنَّهُ يُؤْثِرُ قَرَابَتَهُ، فَقَالَ عُمَرُ: يَرْحَمُ اللَّهُ عُثْمَانَ ثَلاثًا فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدُ الَّذِي بَعْدَهُ؟ قَالَ: أَجِدُهُ صَدَأَ حَدِيدٍ، فَوَضَعَ عُمَرُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ فَقَالَ: يَا دَفْرَاهُ يَا دَفْرَاهُ. فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّهُ خَلِيفَةٌ صَالِحٌ وَلَكِنَّهُ يُسْتَخْلَفُ حِينَ يُسْتَخْلَفُ وَالسَّيْفُ مَسْلُولٌ وَالدَّمُ مُهْرَاقٌ. رَوَاهُ أبو داود بسند صالح والله أعلم[٢٤]:**

**ئەقرەعی بانگدەری عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عومەر منی نارد بە شوێن سەرەك قەشە (ئوسقوف)ی گاورەكاندا، كە بۆیم بانكرد پێی گوت: لەنامەی ئێوەدا ناوونیشانەی من هەیە یانا؟ ئوسقوف گوتی: ئا هەیە، گوتی: چییەو چی نییە؟ گوتی: بەشاخ لە قەڵم دراویت! عومەر قەمچی لێ راست كردەوەو وایزانی زەمی دەكا گوتی: شاخی چیت مەبەستە؟ گوتی: شاخی ئاسنین، دەستپاكو بەتین عومەر گوتی: ئەی ئەوەی كە لە پاش من دێ چۆنەو چۆن نیە؟ گوتی: خۆی جێنشینێكی باشە، بەڵام خزم پەرستەو لەگەڵێ شتا خزمانی خۆی وەپێش دەخات، جا عومەر سێ جار گوتی: رەحمەتی خودا لە عوسمان! ئینجا گوتی: ئەی ئەوەی لە پاش ئەودێ چۆنەو چۆن نییە لە كتێبی ئێوەدا؟ گوتی: وەك ژەنگی ئاسن وایەو لە سەردەمی ئەودا چەك ئەوەندە بە كاردەهێنرێو ئەوەندە لەبەر دەكرێ ژەنگ هەڵدێنێ، عومەر دەستی دانا لەسەر سەری خۆیو گوتی: ئای لە بۆگەنی! ئای لە بۆگەنی! ئەویش گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! خۆی جێنشینی باشە، بەڵام لەوكاتەدا كە ئەو دەكرێ بە جێنشین شیر لە كالان دەركێشراوەو خوێن لە هەرلا رژاوەو پڕاوە! (ئەبو داوود- سەنند صالح)[١].**

---

[٢٤] رواه أبو داود بسند صالح.

(١) مامۆستای دانەری ئەم كتێبە پڕ گۆڕەكەی لە نوورو رەحمەتی خودابێ، جار جارە ئەگەر فەرموودەیەكی بەدڵ نەبێ، لە راڤە (شەرحە)كەدا زۆر بە نەزاكەت دەفەرموێ: دڵ بەم قسەیە ئاونا خواتەوە، منیش لێرەدا عەرزی خوێنەری هێژاو ئازیز دەكەم: دڵ لەم فەرموودەیە چەكەرە دەكا، لەبەر ئەم خاڵانە:

١- دیارەو بەڵگە نەویستە کە ئەو ئوسقوفە غەیبزان نەبووە، چونکە شتی غەیبی‌و نادیار بەس خوداوەند خۆی دەیزانێ، کەوابوو ئەم مەعلوومات‌و زانیارییانەی لەکوێ بووە، ئەگەر دەڵێیت ئەم ناوونیشانانەی لە کتێبە پێشووەکاندا دیوە، ئەی ئێستاکە ئەو کتێبانە دەرکەوتوون‌و دەست هەموو کەسێ دەکەون بۆ ئەم باسو خواسانەیان تێدا نییە؟

٢- بەڵێ راستە بەپێی دەقی قورئان جوولەکەو گاورەکان ناوونیشانی پێغەمبەرو یارانی ئەویان لە تەورات‌و ئینجیلدا گۆڕیوەو دەستکارییان کردوون، وەك دەفەرموێ: {يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ – ٤٦/٤} واتە: هەندێ کەس لە جوولەکەکان دەستکاریی وشەکانی تەورات دەکەن‌و دووریان دەخەنەوەو لایان دەدەن لە جێگەی خۆیان. وە دەفەرموێ: {وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ –٦} واتە: هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێ کە لە پاش من دێت‌و ناوی ئەحمەدە. وە دەفەرموێ:

{مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ –٢٩/٤٨}.

واتە: موحەممەد پێغەمبەری خودایە، بۆ سەر هەموو پەری‌و ئادەمیزاد، ئەو یارانەش کەوان لەگەڵ ئەودا بەدڵ‌و بەگیان لەگەڵیان، بۆیە بەتین‌و بەهێزو توندو تیژن لەسەر کافرەکان‌و لەناو خۆیانا میهرەبان‌و دڵنەرمن هەمیشە خەریکی نوێژو خواپەرستی‌و بەجێهێنانی فەرمانی خودای خۆیانن‌و داوای بەش‌و بارەی لێ دەکەن؛ وەنیشانەی مەردایەتی‌و خودا پەرستی لە چارەی پاك‌و نوورانییان دیارە، لە شوێنەواری هەمیشە کوڕنووش بردنەوە بۆ خودای مەزن‌و گەورە، ئەمە نیشانەو سیفەتی مەردانەی ئەوانە لە تەوراتا، بەڵام وێنەو نیشانەیان لە ئینجیلی عیسادا ئەمەیە: وەکوو کشتێ وان.. تا کۆتایی ئایەت. بەڵێ ئەمە راستە ئەم دوو میللەتە ئەم تاوانە گەورەیە دەکەن، بگرە هەر بەوەشەوە نەوەستاون‌و ناوەستێن، بەڵکوو لە کۆن‌و نۆدا هەوڵی ئەوەیان داوەو ئێستاش‌و لەمەو لاش بێ وچان، هەوڵی ئەوە دەدەن کە دەسکاریی ئایەتەکانی قورئانیش بکەن، هەروەك گەڵێ حیکایات‌و داستان‌و ریوایاتی پڕو پووچ‌و پڕمزەرو دەردیان داناوەو بە حەدیس‌و فەرموودەو شتی وا لە قەڵەمیان داون‌و بە هەزارویەك فێڵ‌و فەرەج وەك دەردی گولی شەتڵیان کردوون لەناو مێشك‌و دڵی موسوڵمانانداو وەك دڕکی مەم‌و زین کۆمەڵەی موسوڵمانانیان پێ تەفرو توونا کردووەو تەیمانی نامۆیی‌و ناکۆکییان لە

مەعبێنا دروست کردووە! وە بەم کارە ناپەسەندەیان زیانێکی گەلێ گەورەیان لە قەلاَی ئایینی ئیسلام داوە، تانانەت وامان لێ هاتووە هەر وەختێ ئەوان بیانەوێ ئەوا ئێمە وەك شەرەکەڵەشێرو شەرەگەڕەکی منالاَن‌و شەرە جووجەڵەی کەچەڵەی بەری مریشك سەرو گوێلاکی یەکتر دەکوتینەوەو تێرو پڕ لەیەك دەکوژین‌و دەبڕین، تا ئەوان بەخێری خۆیان تاقەتی تەماشاکردنیان نامێنێ‌و هەر کەسەیان کەڵەشێری خۆی دەبەستێتەوەو رەشە خەڵکەکەیش تاجەولەی قادیمە پشوویێ دەدەن! ئەمە راستەو وایەو زیادی هەیەو کەمی نییە، بەلاَم کەی ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) پیاوێکی ئەوەندە ساویلکەو خۆشباوەڕو هەژارۆکە بووە کە بچێ فاڵ‌و کتێب بە قەشەی فەلان‌و بە پیاوێکی غەیرە دین بگرێتەوە، یا گوێ بۆ وێنەی ئەم لاژگە لاژگی ئەسقوفە شل بکات، بەتایبەتی لە شتێکی وا گرنگدا، ئیمامی عومەر نوموونەی بالاَی موسوڵمانێکی پاکی زانای هۆشیاری دینداری رۆشنبیری بلیمەتی زاناو داناو حاڵ بین‌و دوور بین بووە، شتی وا لەوەوە گەلێ دوورە!

٣- بەم قسەیەبێ لە قسەی ئیمامی عومەرەوە (خودای لێ رازی بێت) وا دەردەکەوێ کە زانیویەتی عوسمان لەپاش خۆی دەبێ بەجێنشین، خۆی لە هەموو کەس خۆی‌و عوسمان باشتر دەناسێ‌و دەزانێ چین‌و چیین، ئیتر بۆ لەئوسقوفی فەلان دەپرسێت: ناوونیشانەی من چییەو چی نییە؟ یا لەپاش من کێ دەبێ، یا خۆ چۆنەو چۆن نییە! گریمان ئەم پرسیارو وەلاَمانەبوون، کێ دەڵێ کەئەم ئوسقوفە ناحەزە بۆ گێرەشێوێنی وا ناڵێ، ئەگەر ئوسقوف راست دەکاو باوەڕی بەقسەی خۆی هەیە بۆ ئیسلام نەبووە!

٤- بەڵێ لە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەردا هەیە کە دروستە پرس‌و ڕا بەئەهلی کیتاب بکرێ ئیستیشهادو نەقڵ بە کوتوب‌و چیرۆك‌و حیکایاتیان بکرێ، بەلاَم نەك شێتانەو کوێرانەو نەك بۆ هەموو شت‌و هەموو بابەتێ. داخەکەم گەلێ لە مامۆستاو مەلاکانمان – لەبەر نەزانی‌و ساویلکەیی خۆیان – بڕوا بەهەموو نووسراوو داستان‌و حیکایەتێ دەکەن، عەقڵ‌و هۆش بیگرێ‌و نەیگرێ، راست بێ‌و درۆبێ، باش بێ‌و خراپ بێ ئەم لایەنانە بەلایانەوە گرنگ نین، گرنگ ئەوەیە نووسراوەو تۆمار کراوەو بووە بە کتێب، لە خودا خۆی داوا دەکەین کە یارمەتی هەموو لایێ بدات‌و کۆمەڵێ زانای گەورە گەورە بڕەخسێنێ بۆ ئەم ئوممەتی موحەممەدە، تاوەك سەردەمی حەزرەت خۆی‌و پاش خۆی، ئایینی ئیسلام لەبەر رووناکی ئایەتەکانی قورئان‌و فەرموودە راست‌و دروست‌و جوانەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ)

## بەشی سێیەم: باسی گەورەیی‌و پاکژیی ئەوانی تر لە عەشەرەی موبەششەرە واتە: لە دەبەهەشتییە مژدەپێدراوەکان:

## ١٠- مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام (خودای لێ رازی بێ)

## الفصل الثالث: في فضائل بقية العشرة المبشرين بالجنة

## مناقب الزبير بن العوام (رَضِى اللّهُ تَعَالى عَنهُ)

**٣٣١٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: نَدَبَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّاسَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِكُلِّ نَبِيِّ حَوَارِيٌّ، وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ[1]:**

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: لە رۆژی غەزای خەندەقا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەردوومی هان دەدا لەسەر خەبات یەکەم کەس کە چوو بە دەنگییەوەو ئامادەیی خۆی عەرزکرد زوبەیربوو، تا سێ جار حەزرەت هەر موسوڵمانەکانی هان دەدا لەسەر غەزاکردن‌و خەباتگێڕان‌و هەموو جارێ زوبەیر مەردانەو شێرانە دەچوو بە دەنگیەوە پێغەمبەریش**

---

سەرلەنوێ گەشە بکاو رووناکی‌و نوورو تیشکی بەهەرلادا پرژو بڵاو ببێتەوە. مەبەستی بەندەش لەم روونکردنەوەیە بە درۆخستنەوەی ئەم‌و ئەو نییەو دوژمنایەتی‌و ناهەقی کردن لە ئەهلی کیتاب‌و خاوەن نامەکان نییە، ئەمانە ئەگەر ناپاکی‌و دژایەتی لەگەڵ ئێمە نەکەن‌و لەناو وڵاتی ئێمەو لەشوێنی خۆیان بە ئاشتی‌و خۆشی‌و بێوەیی دانیشن ئێمە هەقمان نییە بەسەریانەوە، ئەوەی پەیماندارەو ئەهلی زیممەیە ئەوە بە گوێرەی خۆیان بەپێی شەریعەتی خۆمان رێزی سەروماڵ‌و ناموس‌و دین‌و ئایین‌و یاسایان دەگرین، ئەوانەشی کە دوورە وڵاتن‌و لەژێر رکێفی ئێمەدانین موعامەلە بیلمیسلییان لەگەڵ دەکەین‌و بەپێی رەفتاری خۆیان رەفتیان لەگەڵ دەکەین. ئیتر پەنا بەخوا.

وەرگێڕ - کەرکووك: نەخۆشخانەی سەربازی کەرکووك.

نووری فارس - ١٤٠٥/١/٤ ك ★ ١٩٨٤/٩/٢٩ ز

[1] بخاری. جهاد: ٢٧٤٧ ، ٢٩٩٧ ، ٧٢٦١. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٩٣.

(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەری یارو یاوەرێك‌و دوستێکی گیانی هەیە، یارویاوەرو دۆستی گیانی منیش زوبەیرە! (ش/ت).

٣٣١٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِي اللَّهُ عَنهما) قَالَ: كُنْتُ يَوْمَ الأَحْزَابِ جُعِلْتُ أَنَا وَعُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ فِي النِّسَاءِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا أَنَا بِالزُّبَيْرِ عَلَى فَرَسِهِ، يَخْتَلِفُ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا، فَلَمَّا رَجَعْتُ قُلْتُ يَا أَبَتِ، رَأَيْتُكَ تَخْتَلِفُ إلى قريضة؟ قَالَ أَوَهَلْ رَأَيْتَنِي يَا بُنَيَّ؟ قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ يَأْتِ بَنِي قُرَيْظَةَ فَيَأْتِينِي بِخَبَرِهِمْ فَانْطَلَقْتُ فَلَمَّا رَجَعْتُ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبَوَيْهِ فَقَالَ: فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي. رواهما الشيخان والترمذي[٢]:

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی غەزای خەندەق، من‌و عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە دانرابووین بە دیارژنەکانی حەزرەتەوە کە لەناو قەڵاکەی حەسساندابوون بۆ ئاگادارییان، سەرنجم دا زوبەیر دوو سێ جار بە سواریی ئەسپەکەی دێ‌و دەچێ بۆبەنی قوڕەیزە، کە گەڕامەوە ماڵێ گوتم: باوە! تۆم دی هەر دەهاتی‌و دەچووی بۆ بەنی قوریزە خێر بوو؟ گوتی: بۆ کوڕی خۆم تۆ بە چاوی خۆت منت دی؟ گوتم: ئا، گوتی: ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کێ دەچێ بۆ هۆزی بەنی قورەیزە دەنگوباسی ئەوانم بۆ دێنێ تا بزانین کە پەیمانەکەیان دەشکێنن‌و شەڕ لە دژی ئێمە دەکەن یانا؟ جا من چووم‌و دەنگوباسی ئەوانم بۆی هێنایەوە، کە چوومەوە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باوك‌و دایکی خۆی پێکەوە کرد بە قوربانم‌و فەرمووی: باوك‌و دایکم بەقوبانت بن!(ش/ت-خودایان لێ رازی بێ).

٣٣١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عَلَى جَبَلِ حِرَاءٍ فَتَحَرَّكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اسْكُنْ حِرَاءُ فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ

---

[٢] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٢٠ = تجرید/ ٣ ل – ١٥٤ ژ- ١٤٦٣. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٩٥. ترمذي. مناقب: ٣٧٤٣.

صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ، وَعَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمْ). رَوَاهُ مسلم والترمذى[٣]:

→ (ب – ٥ ز – ٨ ف – ٩ = ٩/٣٢٨٠ + فەرموودەی– ١٢ = ب/ ٥ ز– ٨ ژمارە/ ٢/ ٣٢٨٣). لێرانەدا ئەمەی پترە: لەوكاتەدا ئەم زاتانە لەسەر چیاكە دەبن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەبو بەكرو عومەرو عوثمان‌و عەلی‌و طەلحەو زوبەیرو سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص، ڕەزای خودایان لێ بێ (لەبەر خاتری ئەوانیش لە تاوانی ئێمەو دایك‌و باوك‌و كەسوكارمان خۆش بێ (م/ت).

٣٣١٥– عَنْ عَرْوَةَ بن الذبير (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما) قَالَ: قَالَتْ لِي عَائِشَةُ: أَبَوَاكَ وَاللّٰهِ مِنَ الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلّٰهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ. رَوَاهُ الشيخان[٤]:

عوروەی كوڕی زوبەیر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) پێی گوتم: بەخودا باوك‌و دایكی تۆ لەو كۆمەڵەیەن كە خودا لە ستایشیاندا دەفەرموێ:

{الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّٰهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ – ٣١٧٢}.

ئەو كەسانەی كە فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودایان بەجێ هێناو كەوتنە ڕێگە بە شوێنی دوشمنەكانیانا لەپاش ئەوەی كە تووشیان بوو لە زام‌و لە كوشتار لە غەزای ئوحودداو ئەو شەكەتی‌و زاماری‌و ئێش‌و ئازارە ساردی نەكردنەوە، بۆ ئەم كۆمەڵە دلێرە دڵسۆزە نەبەردە نەبەزە لە هاوڕێیانی تۆ، كە بە بەڵگەو گفتارو ڕەفتار ساخیان كردەوە كە خاوەن چاكەن‌و دارای باوەڕی ساغن‌و لە خودا ترسی ڕاست‌و دروستن بۆ ئەمانە

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٩٨.

[٤] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٩٩. بخاری. فضائل: ٤٠٧٧ = تجرید/ ٤ ل – ٢٩٠ ژ: ١٥٤٩. (عروة. تجرید/ ٢ / ٢٠٣ ژ: ٧٨٤).

پاداش‌و بەش‌و بارەیەكی گەورە لە هەردوو جیهاندا هەیە خودای گەورە لە جیهانا ئەناخوانیانەو بەهەشتی بەرین لەو جیهانا جێگەیانە! (ش–خودایان لێ رازی بێ).

٣٣١٦– عَنِ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَابَ عُثْمَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) رُعَافٌ شَدِيدٌ سَنَةَ الرُّعَافِ، حَتَّى حَبَسَهُ عَنِ الْحَجِّ وَأَوْصَى، فَدَخَلَ عَلَيْهِ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ قَالَ: اسْتَخْلِفْ. قَالَ: وَقَالُوهُ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَمَنْ؟ فَسَكَتَ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: اسْتَخْلِفْ. فَقَالَ عُثْمَانُ: وَقَالُوا؟ فَقَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَمَنْ هُوَ؟ فَسَكَتَ قَالَ فَلَعَلَّهُمْ قَالُوا الزُّبَيْرَ؟ قَالَ نَعَمْ. قَالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُ لَخَيْرُهُمْ مَا عَلِمْتُ، وَإِنْ كَانَ لأَحَبَّهُمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٥]:

مەڕوانی كوڕی حەكەم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ساڵی لوتپڕژانەكە عوثمان تووشی لووتپڕژانێكی سەختی وابوو، نەیهێشت كە بچێ بۆ حەج، تەنانەت ئەوەندە شپرزەی كرد وەصێتی كرد، پیاوێ لە قوڕەیش هاتە لای عەرزیكرد: جێنشین لە جێی خۆت دابنێ، عوثمان گوتی: كەسیان گوتووەو ناوهێناوە كە بیكەم بە جێنشینی خۆم؟ گوتی: ئا، گوتی: كێیە؟ پیاوەكە دەنگی نەكرد، پیاوێكی ترهات ئەویش گوتی: یەكێ لە جێی خۆت دابنێ گوتی: بۆ كەسیان بە ناو گوتووە؟ گوتی: ئا، گوتی: كێیە؟ پیاوەكە دەنگی نەكرد، گوتی: رەنگ بێ بڵێن زوبەیر. باشە بۆ جێنشینی من؟گوتی: بەڵێ وا دەڵێن، عوثمان گوتی: بەوكەسە كە روحی رەوانی منی بەدەسە، بە پێی ئاگای من ئەو لە گشتیان باشترە بۆ ئەمكارە، بێگومان كە ئەو لە هەموویان خۆشەویستتر بوو لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) (ب).

٣٣١٧– عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبير (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالُوا لِلزُّبَيْرِ يَوْمَ الْيَرْمُوكِ: أَلاَ تَشُدُّ عَلَى الكُفَّارِ فَنَشُدَّ مَعَكَ فَحَمَلَ عَلَيْهِمْ، فَضَرَبُوهُ

[٥] بخاری. فضائل: ٣٧١٧. (مروان ابن الحكم: تجريد/ ٢ / ٢١٦ ژ: ٧٩٩).

ضَرْبَتَيْنِ عَلَى عَاتِقِهِ، بَيْنَهُمَا ضَرْبَةٌ ضُرِبَهَا يَوْمَ بَدْرٍ. قَالَ عُرْوَةُ: فَكُنْتُ أُدْخِلُ أَصَابِعِي فِي تِلْكَ الضَّرَبَاتِ أَلْعَبُ وَأَنَا صَغِيرٌ. رواهما البخاری[٦]:

عـوروەی کـوڕی زوبـەیر (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: لـە ڕۆژی ڕووداوی (یـەرمووك)دا یـارانی پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەسـەر ئەوان بێ) بەزوبەیر دەڵێن: بۆ تـۆ پێشمان ناکەویت و هەڵمەت ببەی بۆ سەر لەشکری کافرەکان، ئێمەیش بە زاتی تۆوە هەڵمەتی شێرانە دەبەینە سەریان، ئەویش هەڵمـەت دەباتـە سـەریان، بـەڵام کافرەکـان دوو زامـی کاریگـەر لەسـەر شـانی دەکەن، زامێکی لە مـەعبێنابوو، لـە ڕۆژی بـەدرا ئـەو زامـەی تێکرابوو، عورووە دەیگوت: کە منـاڵ بووم یـاریم پـێ دەکـردن، پەنجـەم دەخسـتە نـاو جـێ چاڵـی ئەوزامانەوە(ب).

٣٣١٨- وَعَنْهُ قَالَ: أَوْصَى الزُّبَيْرُ إِلَى ابْنِهِ عَبْدِ اللَّهِ صَبِيحَةَ الْجَمَلِ فَقَالَ مَا مِنِّي عُضْوٌ إِلاَّ وَقَدْ جُرِحَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى انْتَهَى ذَاكَ إِلَى فَرْجِهِ[٧]:

دیـسان عـورووە (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: سـەر لەبـەیانی ڕۆژی ڕووداوی ئەلجەمەل، زوبەیر ڕاسپێری (وەصیـەت)ی کـرد بـۆ عەبـدوڵڵای کوڕی، گـوتی: هـەموو ئەندامـەکانم یـەك بـە یـەك لـە غـەزادا لـە خزمـەتی حـەزرەتا (درووودی خودای لەسەربێ) زامارکراوون، تەنانەت گوتی: شەرمیشم زامارکراوە! (ت-س/ح).

٣٣١٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى فِي بَيْتِ الزُّبَيْرِ مِصْبَاحًا فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ مَا أُرَى أَسْمَاءَ إِلاَّ قَدْ نَفِسَتْ فَلاَ تُسَمُّوهُ حَتَّى أُسَمِّيَهُ. فَسَمَّاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَبْدَ اللَّهِ وَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ بِيَدِهِ رواهما الترمذی بسندين حَسَنَيْنِ[٨]:

عائیـشە (خودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسـەربێ) لـە مـاڵی زوبـەیری مێـردی ئـەسمای خوشـکم چـرایێ دەبینـێ، فـەرمووی: عایـشێ! وا

---

[٦] بخاری. فضائل: ٣٧٢١.

[٧] رواه الترمذي بسند حسن.

[٨] رواه الترمذي بسند حسن.

دەزانم ئەسماء منداڵی بووەو زەیستانە ناوی مەنێن تا خۆم ناوی دەنێم جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) منداڵەكەی ناونا عەبدوڵلا، وە بەدەستی خۆی مەلاشووی بەخورما شیرین كرد (ت-س/ح).

## ١١) مەزناهی تەڵحەی كوڕی عوبەیدوڵلا (خودای لێ رازی بێ)

## مناقب طلحة بن عبيدالله (رضى الله تعالى عنه)

٣٣٢٠- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الأَيَّامِ الَّتِي يُقَاتِلُ فِيهِنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَيْرُ طَلْحَةَ وَسَعْدٍ. عَنْ حَدِيثِهِمَا. رواه الشيخان[1]:

ئەبو عوثمان (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: لە غەزای ئوحوودا كە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) شەڕی تیاكردووە، كەسی تری لە گەڵدا نامێنێ بێجگە لە طەلحەو لە سەعد، ئەمەش كە من دەیڵێم بینا لەسەر قسەی ئەم دوو زاتە خۆیانەو بە پێی ئاگای ئەوانە، ئەگینا چەن كەسێ تریش مابوونەوە لە خزمەتیدا وەك عەلی‌و ئەبو طەلحەو عومەرو ئەبو بەكرو كێ‌و كێی تریش (ش).

٣٣٢١- وَقَالَ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): رَأَيْتُ يَدَ طَلْحَةَ الَّتِي وَقَى بِهَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ شَلَّتْ. رواه البخاری[2]:

قەیسی كوڕی ئەبو حازم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەو دەستەی طەلحەم دیوە كە لە غەزای ئوحوددا كردبووی بە قەڵخان‌و دابوویە بەر شمشێری كافرەكان‌و نەیهێشتبوو كە شیرەكە بەر پێغەمبەر بكەوێ، ئەو دەستەی گۆج بوو بوو (ب- خوای لێ رازی بێ).

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة، ٣٧٢٢ ، ٣٧٢٣ ، ٤٠٦٠ ، ٤٠٦١. مسلم. فضائل الصحابة، ٦١٩٢

[2] بخاری. فضائل الصحابة ٤٠٦٢، ٣٧٢٤، ٤٠٦٣.

٣٣٢٢- عَنِ الزُّبَيْرِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ أُحُدٍ دِرْعَانِ فَنَهَضَ إِلَى صَخْرَةٍ فَلَمْ يَسْتَطِعْ فَأَقْعَدَ تَحْتَهُ طَلْحَةَ فَصَعِدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى اسْتَوَى عَلَى الصَّخْرَةِ فَقَالَ: أَوْجَبَ طَلْحَةُ[٣]:

زوبەیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی ئوحود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو زریەی لە بەردابوو، ویستی بچێتە سەر تاوێرێ نەیتوانی، تا طەلحە پشتی بۆ داناو لەسەر پشتی ئەوەوە سەرکەوتە سەر تاوێرەکەو فەرمووی: طەلحە بەهەشتی مسۆگەر کرد بۆ خۆی (ت-س/ص).

٣٣٢٣- عَنْ طَلْحَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالُوا: لأَعْرَابِيِّ جَاهِلٍ سَلْهُ عَمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ مَنْ هُوَ؟ وَكَانُوا لاَ يَجْتَرِئُونَ عَلَى مَسْأَلَتِهِ يُوَقِّرُونَهُ وَيَهَابُونَهُ فَسَأَلَهُ الأَعْرَابِيُّ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ إِنِّي اطَّلَعْتُ مِنْ بَابِ الْمَسْجِدِ وَعَلَيَّ ثِيَابٌ خُضْرٌ فَلَمَّا رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ عَمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ. قَالَ الأَعْرَابِيُّ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. (قَالَ) هَذَا مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ[٤]:

طەلحە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر خۆی بێ‌و رەزای خودا لە یارانی) بە عەرەبێکی دەشتەکی نەزانیان گوت: لە پێغەمبەر بپرسە مەبەست لەم ئایەتە کێیە:

{مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ - ٣٣ / ٢٣}.

واتە: گەلێ پیاوی پیاوانە لە کۆمەڵەی موسوڵمانان ئەرکی سەرشانی خۆیان بە مەردی بەجێ هێناو لەگەڵ خوای خۆیان قسە راست‌و سەر راست دەرچوون‌و پەیمان‌و بەڵێنی خۆیان بە پیاوانە بردە سەر، جا هەیانە لەسەر پەیمانی خۆی ما تا کۆچی دوایی کردو عەمری هەقی بەجێ هێنا، هەشیانە

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه). (طلحة. تجريد / ١ / ٦٦ ژ: ٤٣).

هێشتا سەر گەرمە لە كۆڕی خەباتا و بە شەوق‌و خۆشیەوە چاوەڕوانی ئەو دەمەیە كە لە پێناوی بەرزەوە بوونی ئالآی قورئاندا شاد ببێ بە كۆشی مەرگ‌و دەست بكاتە مل ئاكامی خۆی! گوتی: لەبەرئەوە نایانە سەر دەمی ئەو كە ئەو لێی بپرسێ چونكە خۆیان زۆر قەدری پێغەمبەریان دەزانی‌و سامیان لێ دەكردو هەروا بە ئاسانی پڕ كێشی ئەوەیان نەدەكرد كە خودسەر لە خۆیانەوە پرسیاری لێ بكەن! جا كە كابرای دەشتەكی پرسیارەكەی لێ كرد رووی لێ وەرچەرخان تا من لە دەرگای مزگەوتەوە دەركەوتم، جلێكی سەوزم لە بەردا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە منی دی فەرمووی: كێ بوو پرسیاری لە ئایەتی (من قضى نحبه) كرد؟ ئەعرابییەكە گوتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی: ئەمە یەكێكە لەو كەسانە كە بەر ئەم ئایەتە دەكەون! (ت-س/ح).

٣٣٢٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعَتْ أُذُنِي مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَقُولُ: طَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ جَارَايَ فِي الْجَنَّةِ[٥]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەگوێی خۆم لە دەمی پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەربێ) بیست فەرمووی: لە بەهەشتا طەلحەو زوبەیر دراوسێی منن. (ت-سند غەریب).

٣٣٢٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى شَهِيدٍ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ. روى الترمذى هذه الأربعة: نسأل الله التوفيق آمين[٦]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ حەزدەكا كە سەیری شەهیدێ بكا كە هێشتا دەسووڕێتەوە لەسەر زەوی باتەماشای طەلحەی كوڕی عوبەیدوڵڵا بكا (تیرمیذی- بە سەنەدێكی غەریب).

---

[٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٦] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ١٢) مەزناهی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ رازی بێ)
## مناقب سعد بن ابی وقاص (رضی الله تعالی عنه)

٣٣٢٦- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبَوَيْـهِ لأَحَدٍ غَيْرَ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ فَإِنَّهُ جَعَلَ يَقُولُ لَـهُ يَـوْمَ أُحُـدٍ. ارْمِ فِـدَاكَ أَبِـي وَأُمِّـي: رواه الشيخان والترمذي وزاد: ارْمِ أَيُّهَا الْغُلاَمُ الْحَزَوَّرُ[1]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ سەعدی کوڕی مالیك نەبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) باوك و دایکی پێکەوە بە قوربانی کەسی تر نەکردوون بەڵام لە رۆژی ئوحوددا بە سەعدی دەفەرموو: دەی تیر بتەقێنە، باوك و دایکم بە قوربانت بن! (ش/ت) تیرمیذی ئەمەشی پترە: ئەی رۆڵەی نەبەردی چاو نەترس!

٣٣٢٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَـهِرَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقْدَمَهُ الْمَدِينَةَ لَيْلَةً فَقَالَ: لَيْتَ رَجُلاً صَالِحًا مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ. قَالَـتْ: فَبَيْنَـا نَحْنُ كَذَلِكَ سَمِعْنَا خَشْخَشَةَ سِلاَحٍ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ. فَقَالَ لَـهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا جَاءَ بِكَ؟ قَالَ: وَقَعَ فِي نَفْسِي خَوْفٌ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجِئْتُ أَحْرُسُهُ. فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُـمَّ نَـامَ. رواه الترمـذی ومسلم[2]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەو سەردەمەدا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ مەدینە، شەوێ خەوی لێ زڕا، فەرمووی: خۆزگا ئەم شەو پیاوێکی باش لە هاوڕێیانی خۆم ئێشکی دەگرتم. عائیشە گوتی: زۆری پێ نەچوو خڕەی چەکمان بیست، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەوە کێیە؟ گوتی: منم، سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی

---

[1] بخاری. جهاد: ٢٩٠٥ ، ٢٩٠٥م، ٤٠٥٨ ، ٦١٨٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٨٣. ترمذي. مناقب: ٣٧٥٤.

[2] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٨٠ ، ٦١٨١ ، ٦١٨٢ ، بخاری. جهاد: ٢٨٨٥ ، ٧٢٣١. تجرید/ ٣ ل- ٣١٤ ژ- ١١٨٧. ترمذي. مناقب: ٣٧٥٦.

فەرموو: بۆچی هاتووی؟ گوتی: مەترسیم لە پێغەمبەر هەبوو، کەسێ دەسدرێژی لێ بکا، هاتووم ئیمشەو ئێشکت دەگرم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پاڕایەوە بۆی‌و نزای باشی بۆیکردو ئەوجا بە دڵنیایی خەوت (ت/م).

٣٣٢٨- عَنْ سَعْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: حَلَفَتْ أُمُّ سَعْدٍ أَنْ لاَ تُكَلِّمَهُ أَبَدًا وَلاَ تَأْكُلَ وَلاَ تَشْرَبَ حَتَّى يَكْفُرَ بِدِينِهِ. قَالَتْ زَعَمْتَ أَنَّ اللَّهَ وَصَّاكَ بِوَالِدَيْكَ وَأَنَا أُمُّكَ وَأَنَا آمُرُكَ بِهَذَا. قَالَ فَمَكَثَتْ ثَلاَثًا حَتَّى غُشِيَ عَلَيْهَا مِنَ الْجَهْدِ فَقَامَ ابْنٌ لَهَا يُقَالُ لَهُ عُمَارَةُ فَسَقَاهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: فَإِذَا أَرَادُوا أَنْ يُطْعِمُوهَا شَجَرُوا فَاهَا بعصاً ثُمَّ أوجروها، فَجَعَلَتْ تَدعو عَلَى سَعْدٍ فَأنزل الله تَعَالَى: (وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِنْ جَاهداك على أن تُشرك بي ما ليس لك به علمٌ فلا تُطعهُما). رواه مسلم هنا والترمذى فى التفسير[٣]:

سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئوممو سەعدی دایکم سوێندی خوارد کە نە قسەم لەگەڵ بکاو نە نان‌و ئاوبخوا، تا من پەشیمان (پاشگەز) نەبمەوە لە ئایینی ئیسلام، وە دەیگوت پێم: تۆ لەکن خۆت دەڵێی خودا فەرمانی پێ کردوی کە بۆ باوك‌و دایکت باش بی دەی ئەگەر وایە من دایکتم‌و فەرمانت پێ دەکەم کە وازبێنی لە ئیسلام، جا دایکم سێ شەوو سێ رۆژ بەو حاڵە مایەوە تامی ئاووزادی نەکرد تا لەبەر پەرێشانی بوورایەوە، هەتا کوڕێکی تری هەبوو ناوی عومارەبوو چوو ئاوی دایێ لە گێڕانەوەیەکا: کە دەیان ویست ئاوی بدەنێ بە دارێ دەمی دایکمیان دادەچەقاندو بە زۆر ئاوو نانیان دەکرد بە قوڕگیا، جا ئەویش دەستی دەکرد بە نزای خراپ لە سەعد خودای گەورەش لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا – ٢٩ / ٨}.

واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادم کردووە کە بۆ باوك‌و دایکی زۆرباش بێ‌و چاك بێ لەگەڵیانا، بەڵام لە بێ ئەمری خوادا بە هیچ جۆرێ بە گوێیان مەکەن وە ئەم دوو ئایەتەشی نارده خوارەوە کە دوەمیان دەفەرموێ:

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٨٨.

{وَإِن جَاهَدَاكَ عَلى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا – ٣١ / ١٤ – ١٥}.

واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە کە زۆر باش‌و فرەخاس بێ لەگەڵ دایك‌و باوك‌و نەنك‌و باپیرياو چاکەی ئەوانی لەبەر چاو بێ‌و دڵسۆزیان بێ‌و سپڵەی بەدنمەك دەرنەچێ، چونکە ئەوان هۆو رشتەی بوونی ئەون، ئەوەتانێ دایکی بەسەزمان بە چەرمی سك، بە هەزار ئەرك‌و ئازارو دەردی سەری نۆمانگ هەڵی دەگرێ‌و دوو ساڵی رەبەق شیری دەداتێ‌و خزمەتی دەکا تا دەیبڕێتەوە لە شیر، پاش ئەوەش جۆرەها ناخۆشی لە پێناوی خۆشیی ئەودا دەکێشێ‌و دەچێژێ، دەی سوپاسی من بکەن کە خودای ئێوەم‌و دروستم کردوون لە نەبوون، سوپاسی ئەوانیش بکەن‌و چاکەیان بدەنەوە، ئەوەش بزانن کە دوا ئەنجامتان لای منەو زووبێ یا درەنگ دێنەوە بەر دەستی خۆم، بەڵام ئەگەر باوك‌و دایك‌و کەسوکارو هەر کەسێکی تر هەوڵیان دا لە گەڵتانا کە هاوبەش بۆ من دابنێن‌و شتێ کە خۆی هەبوونی نییەو ئێوە خۆتان باوەڕتان پێی نییەو بەشیاوی نازانن بە قسەی ئەمو ئەوو تەنانەت بە زۆری زۆرداریش مەیکەن بە هاوڕێی من، وەلێ خوا هەقەو هەموو هەقێکی پێ خۆشە لە دنیادا بە جوانی‌و بە مەردی‌و بە پیاوەتی رەفتاریان لەگەڵ بکەن (م/ت). لە بەرگی سێیەمی (اقتران النيرين)دا مامۆستا مەلا رەشید بەگ (رەزای خودای لێ بێ) ئاماژە بۆ ریوایەتی دوایی ئەم فەرموودەیە دەکا، کە نەقڵی دەکا لە صەحیحی موسلیمەوە، کە موسلیم (خودای لێ رازی بێ) دەیکا بە زیادەی طەریق (رێگە)ی شوعبە بەسەر طەریقی زوهەیردا (خودا لە هەموویان رازی بێ) بۆ هەمان فەرموودە، لەوێ لە پێش ئەم زیادەوە لە کۆتایی ریوایەتی یەکەما باسی مەی‌و شەراب هەیە، زیادەکەش لەسەر ئەم شێوەیە: وفي اخرى عَنْ طريق شعبة: قال: فكانوا إذا ارادوا ان شاء الله يطعموها شجروا فاها بعصا، ثم اوجروها. مامۆستا مەلا رەشید دەڵێ: دیارە ئەو ضەمیرە (مؤنث) انه راجعين ئەلای شەراب نابێ راجیع بنە ئەلای سەعد.. تا ئەوە دەڵێ: وەلحاصل تێی

نەگەییم‌و نایزانم، بە خێری خۆتان مەعنای لێك بدەنەوە، مامۆستا محمد علی قەرەداغیش (خودا دەست بە عەمری بگری‌و پیت‌و بەرەكەت بخاتە كۆششە پیرۆزەكەی) لە پەراوێزەكەدا دەڵێ: منیش زۆری بۆ گەڕام‌و دوایش چوومە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەریس هەر بۆمان ساخ نەكرایەوە. بەڵام لە خودا بە زیاد بێ وامن فەرمانەكەی مامۆستای بابانم بەجێ هێناو بە خێری ئەو مەعنام لێ دایەوە لە هەمان شوێندا كاكەی قەرەداغی (كە من خۆشم خەڵكی ناوچەی قەرەداخم) ئاماژە بۆ ئەوە دەكا كە ئایەتەكە بە هەڵە نووسراوە، دەڵێ: گەڕامەوە بۆ موسلیم‌و لەوێش هەروا نووسرابوو. بەندەیش دەڵێم لە موسلیمدا (بە پێی نوسخەكەی من) كەمێ جیاوازی هەیە، هەرچۆن بێ بەم تەرتیبەی من كردم بۆ ئایەتەكە هەرچەندە كەمێ دووریشە رەنگ بێ ئەو كێشەیەش چاربكرێ‌و ئەم هەڵەیە هەڵبگیرێتەوە، چونكە لە بەیضاویدا دەفەرموێ:

ئایەتەكەی عەنكەبووت‌و لوقمان‌و ئەحقاف لەهۆی سەعدی كوڕی ئەبو وەققاسەوە نازڵ بوون، مامۆستا موحەممەد عەلی ئایەتەكەی عەنكەبووتی بە ئایەتی ژمارە هەشتی سوورەتی رووم داناوە" رەحمەت لەوكەسەی دەڵێ:

هەڵەی گەورە پیاو هەڵدەگرینەوە

بە مەردی گەردی یەك دەسڕینەوە! (وەرگێڕ)

٣٣٢٩- وَعَنْهُ قَالَ: مَا أَسْلَمَ أَحَدٌ إِلاَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي أَسْلَمْتُ فِيهِ، وَلَقَدْ مَكَثْتُ سَبْعَةَ أَيَّامٍ وَإِنِّي لَثُلُثُ الإِسْلاَمِ. رواه البخاري (رضوان الله تعالى عليه)[٤]:

دیسان سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەپێی ئاگاداری من هەتا ئەو رۆژەی من ئیسلام بووم كەسی تر موسوڵمان نەبوو بوو، هەتا حەوت رۆژیش من سێیەكی گەلی ئیسلام بووم! (ب).

---

[٤] بخاری. فضائل: ٣٧٢٧.

٣٣٣٠- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللّٰهُمَّ اسْتَجِبْ لِسَعْدٍ إِذَا دَعَاكَ[٥]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی خودایە! هەمیشە دوعاو نزاو پاڕانەوەی سەعد گیرا بکە (ت-س/ح).

٣٣٣١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَذَا خَالِي فلْيُرني أمرؤٌ خَالَهُ. رواهما الترمذی والله أعلم[٦]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص هات، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمەیە لالەی من، باخەڵکی تریش لالەی خۆیانم نیشان بدەن! (ت-س/ح).

## ١٣) مەزناهی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح (خودای لێ رازی بێ)
## مناقب أبي عبيدة بن الجراح (رضى الله تعالى عنه)

٣٣٣٢- عَنْ أَنَسُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينًا، وَإِنَّ أَمِينَنَا أَيَّتُهَا الأُمَّةُ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو ئوممەتێ ئەمینداریکی هەیە، ئەمینداری ئێمەش (ئەی ئوممەتی موحەممەد!) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراحە (ش/ت).

٣٣٣٣- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليمان قَالَ: جَاءَ أَهْلُ نَجْرَانَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ابْعَثْ إِلَيْنَا رَجُلاً أَمِينًا. فَقَالَ: لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكُمْ رَجُلاً أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ، فَاسْتَشْرَفَ لَهَا النَّاسُ فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ. رواهما الشيخان والترمذی[٢]:

---

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٤٤ ، ٣٧٤٤ ، ٧٢٥٥ = تجرید / ٤ ل - ١٦٥ ژ: ١٤٧٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٠٢.

حوذەیفەی کوڕی یەمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: خەڵکی نەجران هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێکی هێمن و ئەمینمان بۆ بنێرە، فەرمووی: پیاوێکی تەواو هێمن و ئەمینداری بە حەق ئەمین و دەستپاکتان بۆ دەنێرم! گوتی: جا خەڵکەکە هەر کەسێ لە لای خۆیەوە، لە خۆشی ئەم نازناوە جوانە خۆی قوت کردەوە و گوێقولاخبوون بۆ ئەو فەرمانە مەزنە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی نارد، تاببێ بە مامۆستایان و فێری ئیسلامیان بکا (ش/ت).

٣٣٣٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَهْلَ الْيَمَنِ قَدِمُوا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْعَثْ مَعَنَا رَجُلاً يُعَلِّمْنَا السُّنَّةَ وَالإِسْلاَمَ. قَالَ فَأَخَذَ بِيَدِ أَبِي عُبَيْدَةَ فَقَالَ: هَذَا أَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ. رواه الشيخان[٣]:

ئەنەس (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: خەڵکی یەمەن هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لێبێ) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێکی وامان لەگەڵ بنێرە کە ڕەووشت و سوننەتی تۆو شەریعەتی ئیسلاممان فێربکا، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی ئەبو عوبەیدەی گرت و فەرمووی: ئەمە ئەمینداری ئەم ئوممەتەیە (ش).

## ١٤) مەزناهی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف (خودای لێ رازی بێ)
## مناقب عبدالرحمن بن عوف (رضی الله تعالی عنه)

٣٣٣٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ،

---

[٢] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٤٥ ، ٤٣٨٠ ، ٤٣٨١ ، ٧٢٥٤ ، ٤٣٨١ ، ٣٧٤٤ ، ٤٣٨٢ = تجرید/ ٤ ل – ٣٦٥ ژ: ١٦١٠ / ٤٣٨٠. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٠٤.

[٣] مسلم. فضائل: ٦٢٠٣.

وَالزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدُ بْنُ مَالِكٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَسعيدٌ فى الجنة، وَأَبُو عُبَيدَة بْنِ الْجرَاحِ فِي الْجَنَّةِ. رواه الترمذى وأبو داود[١]:

عەبدوڕڕەحمان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی ئەبو بەكر بەهەشتییە، عومەر بەهەشتییە، عوثمان بەهەشتییە، سەعدی كوڕی مالیك بەهەشتییە، عەلی بەهەشتییە، طەلحە بەهەشتییە، زوبەیر بەهەشتییە، عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف بەهەشتییە، سەعد بەهەشتییە، سەعید بەهەشتییە، ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاح بەهەشتییە، ئەم دە كەسە هەردەیان بەهەشتین‌و بەبێ سزا ڕێك دەچنە بەهەشتێ (ت/د-س/ص).

٣٣٣٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: إِنَّ أَمْرَكُنَّ مِمَّا يُهِمُّنِي بَعْدِي وَلَنْ يَصْبِرَ عَلَيْكُنَّ إِلاَّ الصَّابِرُونَ. قَالَ: ثُمَّ تَقُولُ عَائِشَةُ فَسَقَى اللَّهُ أَبَاكَ مِنْ سَلْسَبِيلِ الْجَنَّةِ. تُرِيدُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ وَقَدْ كَانَ وَصَلَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَالٍ، يَقَالَ بِيعَتْ بِأَرْبَعِينَ أَلْفًا. رواه الترمذى بسند صحيح[٢]:

جارێ عائیشەی خێزانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) قسەی بۆ كوڕێكی ئەوڕەحمانی كوڕی عەوف دەكرد، پێی گوت: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: بۆ پاش مردنی خۆم گەلێ بە تەنگی گوزەران‌و كاروباری ئێوەوە دێم، چونكە ئەوی بە پشوو وبە صەبر نەبێ ئۆقرە ناگرێ لە دیارتان‌و قەدرتان وەكی پێویستە نازانێ، گوتی: عائیشە دەیگوت پێم: سا خودا لە كارێزی سەلسەبیلی بەهەشت باوكت تێراو بكا، عائیشە لەم دووعایە مەبەستی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف بوو، كە هەمیشە

---

[١] الحديث صحيح كمايأتى فى مناقب سعيد (شرحه).

[٢] صحيح عند الترمذي.

هاوسەرەكانی پێغەمبەری بەسەر دەكردەوەو پارەوشتی بۆ دەناردن، دەڵێن: جاری وا دەبوو چل هەزار درەمی بۆ دەناردن! (ت-س/ص).

٣٣٣٧- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ أَوْصَى بِحَدِيقَةٍ لأُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِيعَتْ بِأَرْبَعِمِائَةِ أَلْفٍ. رواهما الترمذی[٣]:

ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەورەحمانی كوڕی عەوف باخێكی كردبوو بە وەقف لەسەر دایكانی موسوڵمانان ئومو لموئمینینەكان جارێ وادەبوو لە دەستكەوتی ئەو باخە چوار سەد هەزاری بۆیان دەنارد (ت-س/ح).

## ١٥) مەزناهی سەعیدی كوڕی زەید (خودای لێ رازی بێ)

## مناقب سعيد بن زيد (رضى الله تعالى عنه)

٣٣٣٨- عَنْ حُمَيْدٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) حَدَّثَهُ فِي نَفَرٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَشَرَةٌ فِي الْجَنَّةِ، أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَالزُّبَيْرُ وَطَلْحَةُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَأَبُو عُبَيْدَةَ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَسَكَتَ عَنِ الْعَاشِرِ، فَقَالَ الْقَوْمُ: نَنْشُدُكَ اللَّهَ يَا أَبَا الأَعْوَرِ مَنِ الْعَاشِرُ؟ قَالَ: نَشَدْتُمُونِي بِاللَّهِ أَبُو الأَعْوَرِ فِي الْجَنَّةِ[١]:

حومەید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەستەیێ بووین، سەعیدی كوڕی زەید (خودای لێ رازی بێ) بۆیگێڕاینەوە، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم دە كەسەیە بەهەشتین: ئەبو بەكرو عومەرو عوثمان‌و عەلی‌و زوبەیرو طەلحەو عەبدوررەحمان‌و ئەبو عوبەیدەو سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص. ئیتر سەعید ووسبوو، ناوی كەسی دەهەمی نەگوت پیاو گەل گوتیان: توخودا

---

[٣] حسن عند الترمذي (شرحه). (أبو سلمة: تجريد/ ٢ / ١٢٩ ژمارە/ ٧٠٥).

[١] رواه الترمذي وأبو داود بسند صحيح (شرحه). (سعيد بن زيد = تجريد/ ٣ / ١٥٦ ژ: ١٠٦٣).

ئەی ئەبولئەعوەر! پێمان بڵێ دەهەمیان كێیە؟ سەعید گوتی: كە ناوی خواتان لێ هێنام دەهەمیان خۆمم ئەبولئەعوەر (ت/د-ص).

٣٣٣٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) أَنَّهُ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى التِّسْعَةِ أَنَّهُمْ فِي الْجَنَّةِ وَلَوْ شَهِدْتُ عَلَى الْعَاشِرِ لَمْ آثَمْ. قِيلَ وَكَيْفَ ذَلِكَ؟ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِحِرَاءَ فَقَالَ: اثْبُتْ حِرَاءُ فَإِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ، قِيلَ: وَمَنْ هُمْ؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعْدٌ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ. قِيلَ: فَمَنِ الْعَاشِرُ؟ قَالَ: أَنَا. رواهما الترمذى وأبو داود[٢]:

سەعیدی كوڕی زەید كوڕی عەمری كوڕی نوفەیل (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: شایەتی دەدەم كە ئەم نۆ كەسە بەهەشتین، ئەگەر بۆ یەكێكی تریش (كە دەكاتە دەهەمیان) شایەتی بدەم تاوانبار نابم، گوترا: چۆن چۆنی بوو؟ گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) بووین، لەسەر كێوی حیراء بووین، كێوەكە كەوتە لەرزە" حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی حیراء! دامەزرێ ئەوانەی كەوان لەسەر پشتی تۆ لە یەكێ لەم سێ كەسەیە بە دەرنین یا پێغەمبەر، یا دۆستێكی خودای گەورەیەو سەر ڕاستو قسە ڕاستو خۆی ڕاستو ڕاستاڵە، یا شەهیدەو لە پێناوی خودادا دەكوژرێ! گوترا: ئەوانە كێ بوون كە لەوكاتەدا لەوێ بوون؟ گوتی: پێغەمبەر بوو، ئەبو بەكرو عومەرو عوثمانو عەلیو طەلحەو زوبەیرو سەعدو عەبدولڕەحمانی كوڕی عەوف بوون، گوترا: ئەی كەسی دەهەم كێ بوو؟ گوتی: من بووم! (ت-س/ص).

٣٣٤٠- وَعَنْهُ قَالَ: وَهُوَ فِي مَسْجِدِ الْكُوفَةِ: وَاللَّهِ رَأَيْتُنِي وَإِنَّ عُمَرَ لَمُوثِقِي عَلَى الإِسْلاَمِ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عُمَرُ، وَلَوْ أَنَّ أُحُدًا ارْفَضَّ لِلَّذِي صَنَعْتُمْ بِعُثْمَانَ لَكَانَ. رواه البخارى فى إسلام سعدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)[٣]:

---

[٢] رواه أبو داود والترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٣] بخاری. فضائل: ٣٨٦٢.

دیـسان سـەعید (خـودای لیٚ رازی بـێ) لـەناو مزگەوتەکـەی کووفـەدا گـوتی: بەخودا عومـەر (لـە پـێش ئیسلامبوونیا) لەسـەر ئیـسلامەتی پـەتی کـردوومو ناومێتیە ژێرپێلەقە! بەڵام هێشتا ناگا بەو ناڕەواییەی کە ئێوە لـە عوثمـانتـان کرد، چونکە ئەگەر کێوی ئوحود ببێ بەگەردو بچێ بە حەوادا لەبەرئەوەی کە ئێوە لە عوثمانتان کردوە پتر جێگەی خۆیەتی تا لەبەرئەوەی کە بێ بڕواکان بە ئێمەیان کردووە! (ب).

## ١٦) بەشی چوارەم: باسی مەزناهی کەسوکار (ئالوبەیت)ی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر

## الفصل الرابع: في مناقب أهل البيت (رضى الله عنهم)

٢٣٤١- سُئِلَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ قَوْلِهِ تَعالَى: قُل لاَ أَسَأَلُكُم عَلَيهِ أَجْرَاً إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى - فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ: قُرْبَى آلِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: عَجِلْتَ إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَكُنْ بَطْنٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلاَّ كَانَ لَهُ فِيهِمْ قَرَابَـةٌ فَقَالَ إِلاَّ أَنْ تَصِلُوا مَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ مِنَ الْقَرَابَةِ. رواه البخارى فى التفسير[1]:

لەبارەی ئەم ئایەتەوە پرسیار لە ئیبنو عەبباس (خودایان لیٚ رازی بێ) کرا کە مەبەسـت لـەم خزمایـەتیو دۆسـتایەتییە کێیـەو چـییە؟ لـەم ئایەتـەدا کـە دەفەرموێ:

{قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى - ٤٢ / ٢٣}.

واتـە: ئـەی موحەممـەد! پێیـان بڵـێ: ئـەوەی لەسـەر منـە ڕاگەیانـدنی فـەرمانی خودایـە بە ئێـوە، لەسـەر ئـەم ئـەرکو زەحمەتـەیش کـە دەیکێشم بـۆ شارەزاکردنی ئێوە بۆ ڕێگـەی ئیـسلام هـیچ مـوزدو هـەقێکم نـاوێ لێتـان ئـەوە نەبێ کە منتان خۆش بوێ لەبەر ئەو دۆستایەتییەی کە لـە بەینمانایـەو لەبـەر ئەو خزمایەتییەی کەوا لـە ناومانـا، دیـارە کەسـێ منـی خـۆش بـوێ لەبـەر مـن خزمو دۆستو کەسوکاری منیشی خۆش دەوێ سەعیدی کوڕی جوبەیر کە

---

[1] بخاری. تفسیر: ٤٨١٨ ، ٣٤٩٧ = تجرید/ ١٦٩٢ ، ١٦٩٣.

لە لای بوو هەڵی دایەو گوتی: مەبەست خزمان‌و کەسوکاری موحەممەدە (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیبنو عەبباس گوتی: پەلە مەکە وانیە، چونکە هەموو تیرەکانی قورەیش بە خزمایەتی دەگەنەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە چاك‌و بە خراپیانەوە، ئیبنو عەبباس گوتی: مەبەست ئەوەیە دەفەرموێ: پێیان بڵێ: تەنیا ئەوەم لە ئێوە دەوێ لە چاکەی ئەم ئەرك‌و زەحمەتەدا کە من دەیکێشم بۆ خۆشی‌و باشیی هەردوو جیهانی ئێوە، ئێوەیش باش بن بۆ خزم‌و کەسوکاری من کە خزمی خۆشتانن (ب- نوقمی میهرەبانی خودا بێ).

٣٣٤٢- عَنْ عَائِشَةُ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَدَاةً وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ مِنْ شَعْرٍ أَسْوَدَ فَجَاءَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيّ فَأَدْخَلَهُ ثُمَّ جَاءَ الْحُسَيْنُ فَأَدْخَلَهُ مَعَهُ ثُمَّ جَاءَتْ فَاطِمَةُ فَأَدْخَلَهَا ثُمَّ جَاءَ عَلِيٌّ فَأَدْخَلَهُ ثُمَّ قَالَ (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا). رواه مسلم والترمذى ولفظه: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا) فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ فَدَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا فَجَلَّلَهُمْ بِكِسَاءٍ وَعَلِيٌّ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَجَلَّلَهُ بِكِسَاءٍ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلُ بَيْتِي فَأَذْهِبْ عَنهُمُ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا. قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: وَأَنَا مَعَهُمْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْتِ عَلَى مَكَانِكِ وَأَنْتِ إِلَى خَيْرٍ[٢]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: سەر لەبەیانییەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رۆیشتە دەرێ، بالاّ پۆشێکی یەمەنی لەبەردا بوو، لە مووی رەش بوو، بەوێنەی کۆپانی ووشتر نەخشابوو یا بە وێنەی مەنجەڵ‌و تیانچە نەخشابوو، حەسەنی کوری عەلی هات بۆ لای، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خستیە ناو بالاّ پۆشەکەوە" لەپاشا حوسەین هات ئەویشی کردە ژێری‌و لەگەڵ ئەوا داینا لە پاشا فاطیمە هات ئەویشی کرد بە ژێر بالاپۆشەکەیەوە لە دوایی دا فەرمووی:

{إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا - ٣٣ / ٣٣}.

---

[٢] مسلم. فضائل: ٦٢١١ ، ٥٤١٢. أبو داود. لباس: ٤٠٣٢. ترمذي. أدب: ٢٨١٣.

واتە: خودا کە ئەوەندە ئامۆژگاریتان دەکاو ئەوەندە دەربایستو بە تەنگی ئێوەوەیە مەبەستو خواستی تەنیا ئەوەیە کە پاکتان بکاتەوە لە نەنگی ئاشکراو نهێنی، چونکە ئێوە (ئەی کەسوکاری موحەممەد! ئەی خانەنشینانی خانەی پێغەمبەرایەتی!) وەکوو بلووری بێ گەرد، بە فوویێ، بە قسەیەکی سەرد گەرد دەگرن (م/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: ئەم ئایەتە:

{إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا — کە هاتە خوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەو کاتەدا لە ماڵی ئوممو سەلەمە بوو، فاتیمەو حەسەن‌و حوسەینی بانگ کردو داینان لە پشت خۆیەوەو ئینجا باڵاپۆشەکەی خۆی دا بە سەریانداو دایپۆشین پێیی‌و، فەرمووی: ئەی خودایە! ئا ئەمانەن کەسوکاری من، دەی لە گوناهو شتی پیس دووریان بخەرەوەو بە پاك کردنەوەیەکی باش خاوێنیان بکەرەوە. ئوممو سەلەمەش (خوای لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! منیش لەگەڵیانم، دەفەرموێ: تۆ لەسەر بەش‌و بارەی خۆتی، بەش‌و بارەی تۆش گەلێ باشە. گەورەمان مەولەوی (خوای لێ خۆش بێ) شیعرێکی ناسکی هەیە، دەڵێ:

اذ شهر من كان محرما        فبنقطة صار مجرما

واتە:

خۆیی سەرنوخوون بە خاڵی لە خوار

دەبێ بەجوییێ دەردەکرێ لەشار

یاخود:

خۆیی نوختەی سەربێتە خوارەوە

دەبێ بە جوویێ لە خوار شارەوە[1]!

---

[1] خۆیی= مەحرەم. جاران کە من منداڵ بووم گەڕەکی جوولەکەکان لە سلێمانی لە خواری شارەوە بوو، لە گەلێ شاری تریش هەروابوو واتە: (محرم) بەخاڵێ: بەلکەیێ دەبێ بە (مجرم). (وەرگێڕ)

٣٣٤٣- عَنْ يَزِيدُ بْنُ حَيَّانَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَحُصَيْنُ بْنُ سَبْرَةَ وَعُمَرُ بْنُ مُسْلِمٍ إِلَى زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ فَلَمَّا جَلَسْنَا إِلَيْهِ قَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: لَقَدْ لَقِيتَ يَا زَيْدُ خَيْرًا كَثِيرًا رَأَيْتَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَسَمِعْتَ حَدِيثَهُ وَغَزَوْتَ مَعَهُ وَصَلَّيْتَ خَلْفَهُ لَقَدْ لَقِيتَ يَا زَيْدُ خَيْرًا كَثِيرًا حَدِّثْنَا يَا زَيْدُ مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي وَاللّٰهِ لَقَدْ كَبِرَتْ سِنِّي وَقَدُمَ عَهْدِي وَنَسِيتُ بَعْضَ الَّذِي كُنْتُ أَعِي مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا حَدَّثْتُكُمْ فَاقْبَلُوا وَمَا لاَ فَلاَ تُكَلِّفُونِيهِ. ثُمَّ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا فِينَا خَطِيبًا بِمَاءٍ يُدْعَى خُمًّا بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ فَحَمِدَ اللّٰهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَوَعَظَ وَذَكَّرَ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ أَلاَ أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ الثَّقَلَيْنِ أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللّٰهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ فَخُذُوا بِكِتَابِ اللّٰهِ وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ. فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللّٰهِ وَرَغَّبَ فِيهِ ثُمَّ قَالَ: وَأَهْلُ بَيْتِي أُذَكِّرُكُمُ اللّٰهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي أُذَكِّرُكُمُ اللّٰهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي أُذَكِّرُكُمُ اللّٰهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي. فَقَالَ: لَهُ حُصَيْنٌ وَمَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ يَا زَيْدُ أَلَيْسَ نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ؟ قَالَ: نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ وَلَكِنْ أَهْلُ بَيْتِهِ مَنْ حُرِمَ الصَّدَقَةَ بَعْدَهُ. قَالَ: وَمَنْ هُمْ يازيدُ؟ قَالَ: هُمْ آلُ عَلِيٍّ وَآلُ عَقِيلٍ وَآلُ جَعْفَرٍ وَآلُ عَبَّاسٍ. قَالَ حصينٌ: كُلُّ هَؤُلاَءِ حُرِمَ الصَّدَقَةَ قَالَ: نَعَمْ. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ؟ نِسَاؤُهُ؟ قَالَ: لا وايم الله إنَّ المرأة تكون مع الرجُل العصر من الدَّهر ثم يُطلِّقُها فترجع إلى أبيها وقومها، أهل بَيْتِه أصلُه وعصبته الَّذين حُرِمُوا الصدقة بعده. رواه مسلم فی فضائل عليّ والترمذی ولفظه: إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمْ مَا إِنْ تَمَسَّكْتُمْ بِهِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدِي أَحَدُهُمَا أَعْظَمُ مِنَ الآخَرِ كِتَابُ اللّٰهِ حَبْلٌ مَمْدُودٌ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ وَعِتْرَتِي أَهْلُ بَيْتِي وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ فَانْظُرُوا كَيْفَ تَخْلُفُونِي فِيهِمَا[٣].

یەزیدی کوڕی حەییان (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: من‌و حوصەینی کوڕی سەبرەو عومەری کوڕی موسلیم رۆیشتین بۆلای زەیدی کوڕی ئەرقەم، کە دانیشتین لە خزمەتیا حوصەین عەرزیکرد: ئەی زەید! بە راستی خێری زۆرت دەست کەوتووە، بە چاوی خۆت پێغەمبەرت دیوەو بە گوێی خۆت

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٧٥ ، ٦١٧٦ ، ٦١٧٧ ، ٦١٧٨.

گوێت لە فەرموودەی بووەو خۆت لە خزمەتی خۆیا چوویت بۆ غەزاو لە گەڵیا غەزات کردووەو نوێژت لە پشتیەوە کردووە، ئەی زەید! بە راستی خێری زۆرت وەدەست هێناوە، ئەی زەید! فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەوە کە خۆت لە پێغەمبەر خۆیت بیستبێت. گوتی: ئەی کوڕی برام! بە خودا پیرو ئیختیار بووم، هەندێ شتم لە یاد نەماوە لەو شتانەی کە لە پێغەمبەرم وەرگرتوون، جا هەرچی فەرمودەیەکم بۆتان گێڕایەوە وەری بگرن، ئەگینا رووم لێ مەنێن بۆ هی تر. زەید گوتی: رۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر ئاوێ بوو، ناوی غەدیر خۆمم بوو، کەوا لە نێوانی مەککەو مەدینەدا، لەوێ هەڵسایەوە ووتارێکی بۆمان خوێندەوە، سوپاس و ستایشی خودای کردو پەندو ئامۆژگاری کردین و، لە پاشدا فەرمووی: لە پاش ئەمە، ئەی خەڵکینە! ئاگاداربن، بزانن کە منیش ئادەمیزادێکم وەکوو ئێوە، بە سەرهاتی ژیان و مردن وەك لە ئێوە روودەدا لە منیش روودەدا، جا هاکا رابەری پەروەردگارم سەری لێ دام و خواه درەنگ خواه زوو مردن یەخەم دەگرێ و منیش دەچم بە پیریەوەو ملی بۆ کەچ دەکەم، جا لەم حاڵەدا دوو شتی سەنگین و گران بە هاتان لە ناودا بەجێ دەهێڵم بەباشی ئاگادارییان بکەن و هەقیان بەجێ بێنن یەکەمیان کە نامەی خودایە بە راستی بۆ رێگەی راست چرایە جا نامەی خودا بگرن و بەری مەدەن و بیکەن بەسەر مەشق و هەمیشە پەیڕەوی بکەن ئیتر گەلێ هانەهانەی دان لەسەر کارکردن و رەفت کردن بە نامەی خودا، ئینجا فەرمووی: وە ئەوی تریان کەسوکارەکەی خۆمە، هەمیشە ترسی خواتان لە دڵدا بێ لە هۆی کەسوکارەکەی منەوە سێ جار لە سەریەك دووپاتەی کردەوە: هەمیشە ترسی خواتان لە دڵدا بێ لە هۆی کەسوکارەکەی منەوە.

حوصەین پێی گوت: ئەدیی کەسوکاری پێغەمبەر (درودی خودای گەورە لەسەر خۆیی و کەسوکاری) کێ و کێن؟ ئەی زەید! ئایا ژنەکانی بەر کەسوکاری دەکەون یانا؟ گوتی: ژنەکانی دادەنرێن بەکەس و کاری بەم مەعنایەی کە لە خێزانی ئەون و پاك و بێگەردن بەلام کەسوکاری تایبەتیی ئەوانەن کە لەپاش خۆی زەکاتیان پێ ناشێ گوتی: دەی ئەوانە کێن؟ ئەی زەید! گوتی: ئەوانە لە

عورفی موسوڵماندا برێتین لە نەوەی عەلی و نەوەی عەقیل و نەوەی جەعفەر، کە کوڕانی ئەبو طالیبین، وە لە نەوەی عەبباسی مامەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حوصەین گوتی: جا ئەمانە هەموویان زەکاتیان پێ ناشێ؟ گوتی: بەڵێ لە گێڕانەوەیەکا: کەسوکاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کێ و کێن؟ ژنەکانیەتی و بەس؟ گوتی: نەخێر بە خودا ژنەکانی لەوان نین، چونکە وا دەبێ ژن ماوەیەکی دوورو درێژ ژنی پیاوێ دەبێ و لەگەڵیا هەڵدەسێ و دادەنیشێ، کەچی لە ناکاوێکا پیاوەکەی تەلاقی دەداو دەچێتەوە سەر باوان و خزم و کەسوکاری خۆی وەك کوردەکانی خۆمان دەڵێن: شەلەباوان و کوێرەباوان! جا بینا لەسەر ئەمە کەسوکاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بنەچەو باوانیەتی، ئەوانیش ئەوانەن کە لەپاش خۆی زەکات و سەرفترەیان پێ ناشێ (م/ت) گفتەی (ت) لەم شوێنەدا رۆیی: (ب- ١ز- ژمارە: ٧٥/١٤= بەرگی یەکەم، زنجیرەی/٩ فەرموودەی ژمارە ٧٤/١٤).

٣٣٤٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَحِبُّوا اللَّهَ لِمَا يَغْذُوكُمْ مِنْ نِعَمِهِ وَأَحِبُّونِي بِحُبِّ اللَّهِ وَأَحِبُّوا أَهْلَ بَيْتِي بِحُبِّي [٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خوداتان خۆش بوێ بە نازو نیعمەت گۆشتان دەکات و بەشەکرو شیر پەروەردەتان دەکا، منیشتان خۆش بوێ لەبەر خۆشەویستی خودا، کەسوکاری منیشتان خۆش بوێ لەبەر خۆشەویستی من (ت-س/ح).

٣٣٤٥- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَ بِيَدِ حَسَنٍ وَحُسَيْنٍ فَقَالَ: مَنْ أَحَبَّنِي وَأَحَبَّ هَذَيْنِ وَأَبَاهُمَا وَأُمَّهُمَا كَانَ مَعِي فِي دَرَجَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٥]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی حەسەن و حوسەینی گرت و فەرمووی: ئەوەی منی خۆش بوێ و ئەم دوانەو

---

[٤] رواه الترمذي بسند حسن.

[٥] رواه ترمذی بسند حسن.

باوك‌و دایكی ئەم دوانەی خۆش بوێ ئەوە لە رۆژی قیامەتا لە پایەو پلەی من دا دەبێ لەگەڵ خۆم لە بەهەشتا دەبێ (ت–س/ح).

٣٣٤٦– عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِعَلِيٍّ وَفَاطِمَةَ وَالْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ: أَنَا حَرْبٌ لِمَنْ حَارَبْتُمْ وَسِلْمٌ لِمَنْ سَالَمْتُمْ. روى هذه الثلاثة الترمذى الأولان بسندين حسنين[٦]:

زەیدی كوڕی ئەرقەم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە عەلی‌و فاتیمەو حەسەن‌و حوسەینی فەرموو: ئەوەی دوشمنی ئێوەبێ دوشمنی منیشە، ئەوەی دۆستی ئێوە بێ دۆستی منیشە (ت).

## ١٧) باسی گەورەیی عەبباس (خوای لێ رازی بێ)

## فضائل العباس (رضى الله تعالى عنه)

٣٣٤٧– ⬅(ب– ١ز– ژمارە: ٩٤٩/١)[١]:

٣٣٤٨– عَنْ عَبْدُ الْمُطَّلِبِ بْنُ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) أَنَّ الْعَبَّاسَ دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُغْضَبًا وَأَنَا عِنْدَهُ فَقَالَ: مَا أَغْضَبَكَ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَنَا وَلِقُرَيْشٍ إِذَا تَلاَقَوْا بَيْنَهُمْ تَلاَقَوْا بِوُجُوهٍ مُبْشَرَةٍ وَإِذَا لَقُونَا لَقُونَا بِغَيْرِ ذَلِكَ. قَالَ: فَغَضِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَدْخُلُ قَلْبَ رَجُلٍ الإِيمَانُ حَتَّى يُحِبَّكُمْ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ. ثُمَّ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ آذَى عَمِّي فَقَدْ آذَانِي فَإِنَّمَا عَمُّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ[٢]:

عەبدولموطەلیبی كوڕی رەبیعەی كوڕی حاریثی كوڕی عەبدولموطەلیب (رەزای خودایان لێ بێ) گوتی: خۆم لە خزمەتی حەزرەتدا بووم (دروودی خودای لەسەربێ) عەبباس بە تووڕەیی هات بۆ خزمەتی، فەرمووی: بۆ تووڕە بووی؟ عەرزیكرد:

---

[٦] سكت عن درجته الشارح.

[١] تقدم برقم: ١/ ٩٤٩ فى المجلد الأول. تسلسل/ ١٧٨.

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئەی پێغەمبەری خودا! نازانم لەبەر چی قورەیش لەناو خۆیاندا كە بە یەكتری دەگەن روویان خۆشە، بەڵام لەگەڵ ئێمەدا بە جۆرێكی ترن، گوتی: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەها تووڕە بوو رووی سوور هەڵگەڕا، ئەوجا فەرمووی: بەو كەسە كە رەوانی منی بە دەسە ئیمان و باوەڕ روو لە دڵی كەس ناكا هەتا لەبەر خوداو لەبەر پێغەمبەری خودا ئێوەی خۆش نەوێ، ئیمان و رق لە ئێوە قەت لە یەك دڵا كۆنابنەوە. لەپاشدا فەرمووی: ئەی مەردوم! باش بزانن ئەوەی ئازاری مامم دەدا ئەوە ئازاری خۆم دەدا، چونكە مامەی پیاو لە جێگەی باوكێتی! (ت-س/ص).

٣٣٤٩- عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِعُمَر وَكَانَ قَدْ تَكَلَّمْ فى صَدَقَةِ الْعَبَّاسَ: إِنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ. وَفِى رِوَايَةِ: الْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ أَوْ مِنْ صِنْوِ أَبِيهِ[٣]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عومەر لە بارەی زەكاتی عەبباسەوە قسەی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: مامەی پیاو هاوتای باوكێتی. لە گێڕانەوەیەكا: عەبباس مامەی پێغەمبەری خودایە، مامەی پیاویش مانەندی باوكێتی یا فەرمووی: هاولفی باوكێتی! (ت-س/ص).

٣٣٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهما) عَنْ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعَبَّاسُ مِنِّى وَأَنَا مِنْهُ[٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: عەبباس پارچەیەكە لە من و من پارچەیەكم لە عەبباس. (ت-س/ص).

٣٣٥١- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِلْعَبَّاسِ: إِذَا كَانَ غَدَاةُ الإِثْنَيْنِ فَأْتِنِي أَنْتَ وَوَلَدُكَ حَتَّى أَدْعُوَ لَهُمْ بِدَعْوَةٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهَا وَوَلَدَكَ، فَغَدَا وَغَدَوْنَا مَعَهُ

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

وَأَلْبَسَنَا كِسَاءً ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْعَبَّاسِ وَوَلَدِهِ مَغْفِرَةً ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً لاَ تُغَادِرُ ذَنْبًا اللَّهُمَّ احْفَظْهُ فِي وَلَدِهِ. روى الترمذى هذه الأربعة[٥]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی بە عەبباس: سەر لەبەیانی ڕۆژی دووشەممە خۆت‌و منداڵەکانت وەرن بۆلام، هەتا نزایەکی خێرت بۆ بکەم، تا خودا بیکا بە مایەی سوودو چاکە، چ بۆ خۆت‌و چ بۆ منداڵەکانت. جا سەر لەبەیانی لەگەل باوکما چووینە خزمەتی، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پۆشاکێکی بە خەڵات داینێ، یا گوتی: بە عابایێ داپۆشین، لەپاشدا فەرمووی: ئەی خودایە! لە عەبباس‌و لە مناڵەکانی خۆش بە، لێخۆشبوونێکی وا کە گوناهی ئاشکراو نهێنی یان پاك بکاتەوەو ناوو دەرەوەیان خاوێن بکاتەوە" خودایە! ئاگات لە منداڵەکانی بێ (ت-س/ح).

## ١٨) گەورەیی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب (خودای لێ ڕازی بێ)
## فضائل جعفر بن أبى طالب (رضى الله تعالى عنه)

٣٣٥٢- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِجَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي. رواه الترمذى والبخارى[١]:

برائی کوڕی عازیب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی بە جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب: هەم شێوەی شیرینت‌و هەم ڕەفتاری جوانت لە خۆم دەچێ! (ت/ش).

٣٣٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَقُولُونَ أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ. وَإِنِّي كُنْتُ أَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشِبَعِ بَطْنِي، حَتَّى لاَ آكُلُ الْخَمِيرَ، وَلاَ أَلْبَسُ الْحَبِيرَ، وَلاَ يَخْدُمُنِي فُلاَنٌ وَلاَ فُلاَنَةُ، وَكُنْتُ أُلْصِقُ بَطْنِي بِالْحَصْبَاءِ مِنَ الْجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لأَسْتَقْرِئُ الرَّجُلَ الآيَةَ هِيَ مَعِي كَيْ يَنْقَلِبَ بِي فَيُطْعِمَنِي، وَكَانَ أَخْيَرَ النَّاسِ

---

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاری. عمرة القضاء: ٤٢٥٢، ٤٢٥١

لِلْمِسْكِينِ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، كَانَ يَنْقَلِبُ بِنَا فَيُطْعِمُنَا مَا كَانَ فِي بَيْتِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ لَيُخْرِجُ إِلَيْنَا الْعُكَّةَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ، فَنَشُقُّهَا فَنَلْعَقُ مَا فِيهَا. رواه البخارى والترمذى وزاد: وَكَانَ جَعْفَرَ يُحِبُّ الْمَسَاكِينَ وَيَجْلِسُ إِلَيْهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ وَيُحَدِّثُونَهُ فَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَكْنِيهِ بِأَبِي الْمَسَاكِينِ[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: خەڵکی دەڵێن: ئەبو هورەیرە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زۆر دەگێڕێتەوە ئەمە هۆی چییە، ئەی بۆ کۆچکەران‌و یاریدەدەران بە قەد ئەو حەدیث ناگێڕنەوە؟ هۆی ئەوەیە کە من بە نانەسکی دەلکام بە پێغەمبەرەوە‌و لێی جیا نەدەبوومەوە هەمیشە لە خزمەتیا دەمامەوە، نەنانی هەڵاتەم دەخواردو نە ئاوریشم‌و جلی گرانبەهام دەپۆشی، نە نۆکەرو کارەکەرم هەبوو کە خزمەتم بکەن بەڵام ئەوان سەوداگەری‌و سەرپەرشتی کردنی ماڵ‌و منداڵ خەریکی دەکردن وەك من نەیان دەپەرژا، بەڵام من خۆم تەرخان کردبوو بۆ فێربوونی فەرموودەکانی پێغەمبەر جا جاری وا دەبوو لە برسانا سکم دەنووسان بە زەوییەوە، یا بەردم بەزکمەوە دەبەست تا فێنکی گڵ‌و بەردەکە گڕەی دەروونی برسیم کپ بکا گەلێ جاریش وابووە دەچووم ئایەتێکم لە پیاوێ دەپرسییەوە خۆشم ئایەتەکەم دەزانی، مەبەستم ئەوە نەبوو کە پێم بڵێتەوە، بەڵکوو مەبەستم ئەوەبوو کە بەو بیانووە خوڵکم بکاو بمباتەوە بۆ ماڵەوە‌و تێر نان‌و ئاوم بکا! هەمیشە جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب باشترین کەس بوو کە یاریدەی بێ نەواو هەژارانی دەدا، هەمیشە ئێمەمانانی دەبردەوە‌و لە ماڵەوە هەرچی خوا بیدایە دەرخواردی دەداین، ئەگەر هەر هیچ نەبوایە دەچوو هیزەی رۆناوی بەتاڵی بۆمان دەهێنا لەتمان دەکردو چی پێوە بوو دەمان لستەوە‌و دەمان خوارد! (ب/ت) گێڕانەوەی (ت) ئەوەی زیاترە: جەعفەر هەژارانی خۆش دەویست‌و لە لایان دادەنیشت‌و قسەو گوفتوگۆی لەگەڵدا دەکردن، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ناوی نابوو: باوکی هەژاران! (رەزای خواتان لێ بێ،

---

[٢] بخاری. فضائل: ٣٧٠٨.

ئەی یارە نازدارەكانی پێغەمبەری خۆشەویست و سەروەر خودای گەورە و میهرەبان لەبەر خاتری ئێوەی بەرێز و خۆشەویست و دڵپاك و رەزا سووك لە ئێمەی گوناهباریش خۆش بێ و هەموو مرازێكمان بێنێتە دی ئامین خودایە – وەرگێڕ).

٣٣٥٤– وَعَنْهُ قَالَ: مَا احْتَذَى النِّعَالَ وَلاَ انْتَعَلَ وَلاَ رَكِبَ الْمَطَايَا وَلاَ رَكِبَ الْكُورَ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْضَلُ مِنْ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ[٣]:

دیسان خۆی گوتی: لەپاش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) باشترین كەسێ كە پێڵاوی لە پێ كردبێ و سواری وولاخ و زین و كۆپان بووبێ جەعفەری كوڕی ئەبو طالیبە (ت–ص).

٣٣٥٥– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَأَيْتُ جَعْفَرًا يَطِيرُ فِي الْجَنَّةِ مَعَ الْمَلاَئِكَةِ. رواهما الترمذی[٤]:

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەعفەرم لە بەهەشتا دی، لەگەڵ فریشتەكاندا دەفری! (ت– بە سەنەدێكی غەریب).

٣٣٥٦– وَكَانَ ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) إِذَا سَلَّمَ عَلَى ابْنِ جَعْفَرٍ يَقُولُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا ابْنَ ذِي الْجَنَاحَيْنِ. رواه البخاری. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى. آمين[٥]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەستووری وابوو كە سڵاوی لە عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر دەكرد دەیگوت: سڵاو لەتۆ، ئەی كوڕی خاوەنی دووباڵ! (ب).

لە شەرحەكەدا دەڵێ (خودای لێ رازی بێ): لەبەر ئەم فەرموودانە جەعفەر ناوی دەركردووە بە جەعفەری طەییار (واتە: جەعفەری باڵدار).

---

[٣] صحيح عند الترمذي (شرحه).

[٤] غريب عند الترمذي (شرحه).

[٥] بخاری. فضائل: ٣٧٠٩ ، ٤٢٦٤.

**١- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەری فەرموو: چاوو دڵت ڕۆشن! باوكت لە ئاسمانا لەناو فریشتەكاندا دەفڕێ (طەبەرانی).**

**٢- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیمشەو جەعفەرم پێ گەیی لەناو پۆلێ فریشتەدابوو، هەردووباڵی خەڵتانی خوێن بوو (حاكم).**

## ١٩) مەزناهی فاطمە خانی كچی پێغەمبەر (دروودی خودایان لەسەر بێ)

## مناقب السيدة فاطمة بنت النبی (صَلَّى اللهُ عَلَيْهما وَسلَّم)

**٣٣٥٧- عَنْ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَقُولُ: إِنَّ بَنِي هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ اسْتَأْذَنُونِي أَنْ يُنْكِحُوا ابْنَتَهُمْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فَلاَ آذَنُ لَهُمْ ثُمَّ لاَ آذَنُ لَهُمْ ثُمَّ لاَ آذَنُ لَهُمْ إِلاَّ أَنْ يُحِبَّ ابْنُ أَبِي طَالِبٍ أَنْ يُطَلِّقَ ابْنَتِي وَيَنْكِحَ ابْنَتَهُمْ فَإِنَّمَا ابْنَتِي بَضْعَةٌ مِنِّي يَرِيبُنِي مَا رَابَهَا وَيُؤْذِينِي مَا آذَاهَا. رواه الخمسة ولفظ البخاری: فاطمة بضعةٌ منی فمن أغضبها أغضبنی[1]:**

**میسوەری كوڕی مەخرەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر دوانگە دەیفەرموو: كوڕەكانی هیشامی كوڕی موغیرە پرسم پێ دەكەن: كە كچیان بدەن بە عەلی كوڕی ئەبو طالیب، بەسەر فاتیمەی كچم یانا؟ منیش ڕێگەم پێ نەداون ئێستاش ڕێگەیان پێ نادەم‌و لەمەولاش ڕێگەیان پێ نادەم مەگەر بەمەرجێ عەلی كوڕی ئەبو طالیب كچەكەی من تەڵاق بدا ئەوسا كچی ئەوان مارە بكات، چونكە كچەكەم پارچەیەكە لەخۆم، هەرچی ئەو مەترسی لێ بكا منیش مەترسی لێ دەكەم‌و هەرچی ئازاری ئەوبدا ئازاری منیش دەدا (ش/د/ت/ن) گفتەی (ب):**

---

[1] بخاری. فضائل: ٣٧١٤ ، ٣٧٦٧ ، ٥٢٣٠ ، ٥٢٧٨. مسلم. فضائل: ٦٢٥٧. أبو داود: نكاح: ٢٠٧١. ترمذي. مناقب: ٣٨٦٧. (مسور بن مخرمة: تجريد/ ٢ / ٢١٦ ژ: ٧٩٩).

فاتیمە پارچەیەكە لە من، ئەوەی تووڕەی دەكاو دڵی دەئێشێنێ بەواتا من تووڕە دەكاو دڵی من دەئێشێنێ!

٣٣٥٨- وَلَمَّا عَلَمَتْ فَاطِمَةُ بِخُطْبَة عَلَيّ لِبَيْت أَبِي جَهَلٍ أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّ قَوْمَكَ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّكَ لاَ تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ وَهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحًا ابْنَةَ أَبِي جَهْلٍ. قَالَ الْمِسْوَرُ فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ فَحَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي وَإِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ مُضْغَةٌ مِنِّي وَإِنَّمَا أَكْرَهُ أَنْ يَفْتِنُوهَا وَإِنَّهَا وَاللَّهِ لاَ تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ أَبَدًا. قَالَ: فَتَرَكَ عَلِيٌّ الْخِطْبَةَ. رواه مسلم[٢]:

فاتیمە (خودای لێ رازی بێ) كە بیستیەوە عەلی خوازبێنی كچی ئەبو جەهل دەكا، چووە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) عەرزیكرد: خزمانی تۆ بە قسەی خۆیان دەڵێن كە تۆ لەسەر كچەكانت هەڵ نادەیتێ و ئەگەر ژنیان بە سەربێنن تووڕە نابیت، ئەوەتا عەلی خەریكە كچی ئەبو جەهل مارەدەكات و ژن بەسەر من ئەهێنێ، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵسا ووتارێكی داو شایەتمانی هێناو فەرمووی: لەپاش ئەمە، من ژنم دا بە ئەبولعاصی كوڕی رەبیع" ئەو پیاوە گفتی دامێ و راستی لەگەڵ كردم و قسەی خۆی پیاوانە بردەسەر: فاتیمەی كچی موحەممەد پارچەیەكە لەمن بەڕاستی حەزناكەم كە كەس دڵی برەنجێنێ و تووشی سەراسیێی بكا، ئەوەی راست بێ (سوێندم بە یەزدانی پاك) هەرگیز شتی وانابێ كە كچی پێغەمبەری خوداو كچی دوشمنی خودا لە كن یەك پیاو كۆببنەوە میسوەر گوتی: ئیتر عەلیش وازی لە خوازبێنییەكە هێنا (م).

٣٣٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: دَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاطِمَةَ ابْنَتَهُ فِي شَكْوَاهُ الَّذِي قُبِضَ فيها، فَسَارَّهَا بِشَيْءٍ فَبَكَتْ، ثُمَّ دَعَاهَا، فَسَارَّهَا فَضَحِكَتْ،

---

[٢] مسلم. فضائل فاطمة: ٦٢٥٨ ، ٦٢٥٩ ، ٦٢٦٠. بخاری. جمعة: ٩٢٦ تعليقا، ٣١١٠ ، ٣٧١٤. أبو داود. نكاح: ٢٠٦٩ ، ٢٠٧٠. (فاطمه بنت محمد: تجريد / ٤ / ١٥٤ ژ: ١٤٦٢).

قَالَتْ عَائِشَةَ: فَسَأَلْتُهَا عَنْ ذَلِكَ فَقَالَتْ: سَارَّنِي النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ يُقْبَضُ فِي وَجَعِهِ هَذَا فَبَكَيْتُ، ثُمَّ سَارَّنِي فَأَخْبَرَنِي أَنِّي أَوَّلُ أَهْلِهِ يَتْبَعُهُ فَضَحِكْتُ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

**عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) له نەخۆشی سەرەمەرگا، فاتیمەی کچی بانگکردو چپەیەکی لەگەڵدا کرد، فاتیمه دەستی کرد به گریان، لەپاشا بانگی کردەوەو سرتەیەکی تری لەگەڵدا کردەوەو ئەمجارە فاتیمە دەستی کرد بە پێکەنین، عائیشه گوتی: بۆ ئەمە لە فاتیمەم پرسی، گوتی: لە جاری یەکەمدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە چپەی لەگەڵدا کردم هەواڵی دامێ کە لەم نەخۆشییەدا دەمرێ، بۆیە منیش گریام بەڵام لە جاری دووهەمدا بە نهێنی پێی گوتم کە من یەکەم کەس دەبم (لە کەسوکاری پێغەمبەر) کە لەپاش خۆی دەمرم‌و دەچم بۆلای ئەو، بۆیە منیش لە خۆشییانا پێکەنیم! (ش/ت).**

٣٣٦٠- وَعَنْهَا قَالَتِ: اجْتَمَعَ نِسَاءُ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كُلُّهُنَّ عِنْدَه في مَرَضه فَجاءَتْ فاطِمَةُ تَمْشِي كَأَنَّ مِشْيَتَهَا مِشْيَةُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَرْحَبًا بِابْنَتِي. مَرحباً بابنتي فَأَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمَالِهِ ثُمَّ إِنَّهُ أَسَرَّ إِلَيْهَا حَدِيثًا فَبَكَتْ فَاطِمَةُ ثُمَّ إِنَّهُ سَارَّهَا فَضَحِكَتْ أَيْضًا فَقُلْتُ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ؟ فَقَالَتْ: مَا كُنْتُ لأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ فَرَحًا أَقْرَبَ مِنْ حُزْنٍ. فَلَما قُبضَ النَّبِيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَأَلْتُهَا فَقَالَتْ: كَانَ حَدَّثَنِي أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُهُ بِالْقُرْآنِ كُلَّ عَامٍ مَرَّةً وَإِنَّهُ عَارَضَهُ بِهِ فِي الْعَامِ مَرَّتَيْنِ وَلاَ أُرَانِي إِلاَّ قَدْ حَضَرَ أَجَلِي وَإِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لُحُوقًا بِي وَنِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ. فَبَكَيْتُ لِذَلِكِ ثُمَّ إِنَّهُ سَارَّنِي فَقَالَ: أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الأُمَّةِ. فَضَحِكْتُ لِذَلِكِ. رواه مسلم واترمذي

---

[٣] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧١٥، ٣٧١٦، ٣٦٢٥، ٣٦٢٦ ، ٤٤٣٣، ٤٤٣٤، ٦٢٨٥، ٦٢٨٦. تجرید/ ٤ ل- ٣٩٤ ژمارە/ ١٦٢١ مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٦٢. ترمذی. ماقب:٣٨٩٣.

والبخاري ولفظهما: ثمَّ أخبرني أنى سيّدة نساءِ أهل الجنَّة إلاَّ مريم بنت عمران فَضَحِكْتُ[٤].

دیسان هەر ئەو گوتی: لە نەخۆشی سەرەمەرگا ژنەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەموویان لەكنی كۆبووبوونەوە، لەوكاتەدا فاتیمەی كچیشی هات،شێوەی رۆیشتنەكەی كوتومت لەشێوەی رۆیشتنی پێغەمبەر خۆیی دەكرد، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆش هاتی، مەرحەبا لە كچی خۆم ئەوجا یا لەلای راستی خۆیەوە، یا لەلای چەپی خۆیەوە داینیشان لەپاشا بە نهێنی قسەیەكی بۆیكرد، فاتیمە دەستی كرد بەگریان دیسان هەر بە نهێنی قسەیەكی تری بۆیكرد، ئەمجارە فاتیمە دەستی كرد بە پێكەنین، منیش گوتم پێی: بۆچی دەگریت‌و كەچی لەپاشا پێ دەكەنیت؟ گوتی: بۆمن نەهاتوە كە نهێنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئاشكرا بكەم، منیش گوتم: شتی وام نەدیوە وەك ئەوەی ئەمڕۆ تۆ كردت، گریان‌و پێكەنین ئاوا بەرودوا بە سەریەكەوە، كاتێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) گیانی پاكی سپارد لێیم پرسی، گوتی: ئەوە پێی فەرمووم: كە جوبرائیل لەمەو پێش هەموو ساڵێ یەك جار دەوری قورئانی لەگەڵدا دەكردمەوە، لە مانگی رەمەزانا گوێی لێ دەگرتم، بەڵام ئەمساڵ دوو جار دەوری قورئانی لەگەڵدا كردمەوە، جا وادەزانم كە ئاكامم هاتووە، تۆش یەكەم كەس دەبی لە كەسوكارم كە دێی بۆلام، وە من بەرایی‌و پێشڕەوی چاكم بۆ تۆ منیش لەبەر ئەوە گریام، لەپاشا ئەوەبوو بە نهێنی فەرمووی پێم: ئەدیی باشە تۆ رازی نابی بەوە كە تۆ گەورەی ژنانی موسوڵمانەكان بیت یا فەرمووی: تۆ گەورەی ژنانی ئەم ئوممەتەبی جا منیش لە خۆشی ئەوە پێكەنیم (م/ت/ب) گفتەی (ت)و (ب) ئاوایە: لەپاشا گوتی پێم كە من سەر گەورەی خانمە بەهەشتییەكانم، مەریەمی كچی عیمرانی لێ دەرچێ ئەوەبوو منیش پێكەنیم.

---

[٤] بخاری. مناقب: ٣٦٢٣ ، ٦٢٨٥ ، ٦٢٨٦ . مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٦٣.

**٣٣٦١- وَعَنْهَا وَقَدْ سُئِلَتْ أَيُّ النَّاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَتْ: فَاطِمَةُ فَقِيلَ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَتْ: زَوْجُهَا. إِنْ كَانَ مَا عَلِمْتُ صَوَّامًا قَوَّامًا. رواه الترمذی بسند حسن[٥]:**

**لە عائیشەیان پرسیارکرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کێی زیاتر خۆش دەویست؟ گوتی: فاتیمە، گوتیان: ئەی لە پیاوان کێ؟ گوتی: شووەکەی فاتیمە، ئەوەی من ئاگام لێبێ ئەو پیاوە پیاوێکی رۆژوو نوێژ دروست بوو، رۆژووی سوننەتی زۆر دەگرت‌و شەو نوێژی زۆر دەکرد. (ت- س/ح).**

**٣٣٦٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ فَاطِمَةَ - عَلَيْهَا السَّلاَمُ أَرْسَلَتْ إِلَى أَبِي بَكْرٍ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا مِنْ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا فهو صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ مِنْ هَذَا الْمَالِ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لاَ أُغَيِّرُ شَيْئًا مِنْ صَدَقَاتِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهَا فِي عَهْدِهِ وَلأَعْمَلَنَّ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَشَهَّدَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ثُمَّ قَالَ: إِنَّا قَدْ عَرَفْنَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَضِيلَتَكَ، وَذِكْرِ قَرَابَتِهِمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَحَقَّهُمْ، فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَرَابَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ أَصِلَ مِنْ قَرَابَتِي. رواه الخمسة[٦]:**

**➡ (ب/٣ز-١٠ژ:١٩٩٦/٢) لێرەدا لەدواوە ئەم زیادەیەی هەیە: عەلی لەپاش مەرگی فاتیمە لەگەڵ ئەبو بەکردا سازا، رۆژێ شایەتمانی هێناو گوتی: ئەی ئەبو بەکر! ئێمە چاکی‌و پیاوەتی تۆمان بۆ دەرکەوتووە، ئینجا باسی ئەوەشی کرد کە ئەوان خزم‌و کەسوکاری پێغەمبەرن‌و لەم رووەوە گەلێ هەق‌و مافیان هەیە ئەبو بەکریش وەرامی دایەوەو گوتی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەیە، حەزدەکەم کە لەگەڵ خزم‌و خوێشی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) زیاتر چاکەو پیاوەتی بکەم هەتا لەگەڵ خزمانی خۆمدا (ش/د/ت/ن).**

---

[٥] حسن عند الترمذي.

[٦] تقدم برقم: ٢ / ١٩٩٦. مجلد / ٣ تسلسل/ ١٠.

## ٢٠) باسی مەزناهی حەسەن‌و حوسەین (خودایان لێ رازی بێ)
## مناقب الحسن والحسين (رضى الله تعالى عنهما)

٣٣٦٣- سَأَلَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلُ الْعِرَاقِ عَبْدِ اللهِ بْنَ عُمَرُ عَنِ الْمُحَرِمِ يَقْتُلِ الذُّبَابِ فَقَالَ ابْنَ عُمَرَ أَهْلِ الْعِرَاقِ يَسْأَلُ عَنْ الذُّبَابِ وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ بْنت رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ النَّبِيّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هُمَا رَيْحَانَتَایَ مِنَ الدُّنْيَا. رواه البخاری والترمذی ولفظه: سَأَلَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلُ الْعِرَاقِ ابْنَ عُمَرُ دَمِ الْبَعُوضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا يَسْأَلُ عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ النَّبِيّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَسَمِعْتُه يَقُولُ: إِنَّ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ هُمَا رَيْحَانَتَایَ مِنَ الدُّنْيَا[1]:

پیاوێكی خەڵكی عێراق لە ئیبنو عومەری پرسی: ئەگەر كەسێ لە ئیحرام دابێ‌و مێش بكوژێ چی لەسەرە؟ ئیبنو عومەریش گوتی: خەڵكی عێراق كچەزای پێغەمبەر دەكوژن‌و لە مێش كوشتن دەپرسن! وەلحاڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو دوانە واتە: حەسەن‌و حوسەین دوو چڵە رێحانەی منن لەدنیای رۆشندا (ب/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: پیاوێكی خەڵكی عێراق پرسیاری كرد لە ئیبنو عومەر: ئەگەر خوێنی مێشوولە بكەوێ لە جل‌و بەرگ حوكمەكەی چییە؟ گوتی: سەیری ئەمە كەن! كچەزای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەكوژن‌و لە حوكمی خوێنی مێشوولە دەپرسن!! ئەمە لە كاتێكا كە من بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: حەسەن‌و حوسەین دوو تەڵە رێحانەی منن لە جیاتی رێحانەی جیهان!. وەڵامەكان ئاوایە: ئیحرامدار (موحریم) دروست نییە مێش بكوژێ ئەگەر كوشتی دەشێ خێربكا، خوێنی مێشوولەش ئەگەر زۆربوو دەبێ لابرێ، چونكە هەموو خوێنێ پیسە (وەرگێر).

٣٣٦٤- عَنْ أَبِی بَكرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ وَالْحَسَنُ إِلَى جَنْبِهِ، يَنْظُرُ إِلَى النَّاسِ مَرَّةً وَإِلَيْهِ مَرَّةً، وَيَقُولُ: ابْنِی هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ

---

[1] بخاری. فضائل: ٣٧٥٣.

اللّٰهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. رواه البخاری والترمذی ولفظه: إِنَّ ابْنِی هَذَا سَيِّدٌ يُصْلِحُ اللّٰهُ عَلَى يَدَيْهِ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ[٢]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەسەر دوانگە پێغەمبەرم بەچاوی خۆم دی، حەسەنی کوڕی عەلی لە تەنیشتیەوە بوو، جارێ سەیری خەڵکەکەی دەکردو جارێ سەیری حەسەن، لەم حاڵەدا لێیم ژنەوت دەیفەرموو (درووودی خودای لەسەربێ): ئەم کوڕەی من سەییدە (واتە: سەرگەورەو سەروەرە) ئومێدەکەم کە خودا نێوانی دوو کۆمەڵەی لە موسوڵمانان پێ رێك بخا، کە لە حاڵی جەنگ‌و هەرادا دەبن (ب/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: ئەم کوڕەی من سەردارو سەروەرە، لەسەر دەستی ئەمدا خودا ناوبژیی دوو کۆمەڵەی گەورە دەکاو نێوانی تێکچوویان رێك دەخاتەوە.

٣٣٦٥- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْحَسَنُ عَلَى عَاتِقِهِ يَقُولُ: اللّٰهُمَّ إِنِّی أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ. رواه الشيخان والترمذی[٣]:

بەراء (خوای لێ خۆشنودبێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (درووودی خودای لەسەربێ) حەسەنی بە قەڵاندۆشکانەوە بوو، دەیفەرموو: خودایە! من ئەمەم خۆش دەوێ، ساتۆیش خۆشت بوێ! (ش/ت).

٣٣٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجتُ مع النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي طَائِفَةِ النَّهَارِ لاَ يُكَلِّمُنِي وَلاَ أُكَلِّمُهُ حَتَّى أَتَى سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعَ ثم الصَرَفَ حَتَّى أَتى خِبَاءَ؟ فَاطِمَةَ. فَقَالَ: أَثَمَّ لَكُعُ أَثَمُّ لَكَعُ؟ يعنى حَسَناً فَظَنَّنَا أَنَّ أُمَّهُ تَحبِسُهُ لِتُغَسِّلَهُ وَتلبسه سخاباً، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ يَسْعى حَتَّى اعتنق كلُ واحِدٍ منها صاحِبَهُ. فقال رسول الله (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اللهم إني أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ وَأَحْبِبْ مَن يُحِبُّهُ[٤]:

---

[٢] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٤٦. (أبو بكره: تجريد / ١ ل — ٥٠ ژ: ٢٩).

[٣] بخاری.فضائل الصحابة: ٣٧٤٩ ، ٣٨٣. ترمذي. مناقب: ٣٨٢ ، ٣٧٨٣. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٠٨.

[٤] بخاری. البيوع: ٢١٢٢ ، ٥٨٨٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٠٦ ، ٦٢٠٧.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ (بەرۆژ) لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) دەرچووم، لە رێ بەبێ قسەو گفتوگۆ رۆیشتین، تا چووینە بازاڕی بەنی قەینوقاع، ئینجا گەڕایەوەو چوو بۆ ماڵی فاتیمە، لەوێ فەرمووی: ئەرێ بچكۆلە لە كوێیە؟ ئەرێ بچكۆلە لەوێیە؟ واتە: حەسەن لەوێیە؟ جا دایكی نەختێ بەندی كرد، وا بزانم تا تۆزێ بیشواو حەتحەتۆكەی لە مل بكا، زۆری پێ نەچوو كە حەسەن بە هەڕاكردن هات‌و لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودایان لەسەر بێ) دەستیان كردە ملی یەكتری‌و حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودایە! من ئەمەم خۆش دەوێ، ساتۆیش خۆشت بوێ‌و ئەو كەسەیشت خۆش بوێ كە خۆشی دەوێ (م).

٣٣٦٧- عَنْ إِيَاسٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَىَ عَنْهُمَا) قَالَ: لَقَدْ قُدْتُ بِنَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ بَغْلَتَهُ الشَّهْبَاءَ حَتَّى أَدْخَلْتُهُمْ حُجْرَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَذَا قُدَّامَهُ وَهَذَا خَلْفَهُ. رواهما مسلم[٥]:

ئییاس لە باوكیەوە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: خۆم بە دەستی خۆم جڵەوی هێسترە بۆزی پێغەمبەرم رادەكێشا پێغەمبەرو حەسەن‌و حوسێنی بەسەر پشتەوە بوون ئەمیان لە بەردەمیاو ئەویان لە پاشكۆیا بوو، لەسەر ئەم حاڵە جڵەوی هێسترەكەم بۆ راكێشان تا بردمنە هۆدەكەی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) (م).

٣٣٦٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ أَشْبَهَ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ. رواه البخاری والترمذی[٦]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: كەس وەكوو حەسەنی كوڕی عەلی شێوەی لە پێغەمبەر نەدەچوو (درودی خوایان لەسەر بێ) (ب/ت).

---

[٥] مسلم. فضائل: ٦٢١٠. ترمذي: الأدب: ٢٧٥.

[٦] بخاري. فضائل: ٣٧٥٢.

٣٣٦٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: رَأَيْتُ أَبَابَكْرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) وَحَمَلَ الْحَسَنَ وَهُوَ يَقُولُ: بِأَبِي شَبِيهٌ بِالنَّبِيِّ، لَيْسَ شَبِيهٌ بِعَلِيّ. وَعَلِيٌّ يَضْحَكُ. رواه البخاري[٧]:

عوقبەی كوڕی حاریث (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو بەكرم دی حەسەنی كوڕی عەلی بە قەڵاندۆشكان هەڵگرتبوو، دەیگوت: باوكم بە قوربانی بێ شێوەی كوتومت لە شێوەی پێغەمبەر دەچێ، شێوەی لە عەلی ناكا، عەلیش (گوێی لێ بوو، بۆ پشتگیریی قسەكەی ئەو) پێ دەكەنی (ب).

٣٣٧٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ زِيَادٍ فَجِيءَ بِرَأْسِ الْحُسَيْنِ فَجَعَلَ يَقُولُ بِقَضِيبٍ لَهُ فِي أَنْفِهِ وَيَقُولُ: مَا رَأَيْتُ مِثْلَ هَذَا حُسْنًا قُلْتُ: أَمَا إِنَّهُ كَانَ مِنْ أَشْبَهِهِمْ بِرَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ). رواه الترمذي والبخاري[٨]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: لەلای ئیبنو زییاد بووم، سەری حوسێنیان بۆی هێناو لە ناو تەشتێكا دایان نا، ئیبنو زییاد شووڵێكی بەدەستەوە بوو، شووڵەكەی دەژەند بە دەم‌و لووت‌و چاوی حوسەینداو دەیگوت: شتی وا جوان‌و نازدارم نەدیوە! منیش گوتم: دەی بزانن كە حوسەین لە هەموویان زیاتر شێوەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەچێ (ت/ب).

٣٣٧١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الْجَنَّةِ[٩]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: حەسەن‌و حوسێن سەروەری لاوانی خەڵكی بەهەشتن (ت- س/ص).

---

[٧] بخاری. فضائل: ٣٧٥٠. (عقبة بن حارث: تجريد/١/٩٩ ژ – ٧٦).

[٨] بخاری. فضائل: ٣٧٤٨.

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٣٣٧٢- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبْصَرَ حَسَنًا وَحُسَيْنًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُمَا فَأَحِبَّهُمَا[١٠]:

بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەسەن و حوسەینی دی فەرمووی: خودایە! من ئەم دوانەم خۆش دەوێ دەی تۆیش خۆشت بوێن! (ت-س/ص)[١].

٣٣٧٣- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: الْحَسَنُ أَشْبَهُ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا بَيْنَ الصَّدْرِ إِلَى الرَّأْسِ وَالْحُسَيْنُ أَشْبَهُ بِالنَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا كَانَ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ[١١]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە سینگەوە هەتا سەر، حەسەن شێوەی زیاتر لە پێغەمبەر دەكا، لە سینگیش بەرەو ژێر حوسەین زیاتر شێوەی لە پێغەمبەر دەكا (دروودی خوا لەسەر هەر چواریان) (ت-س/ص).

٣٣٧٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ كُلَّ نَبِيٍّ أُعْطِيَ سَبْعَةَ نُجَبَاءَ أَوْ نُقَبَاءَ وَأُعْطِيتُ أَنَا أَرْبَعَةَ عَشَرَ، قُلْنَا: مَنْ هُمْ؟ قَالَ: أَنَا وَابْنَايَ وَجَعْفَرٌ وَحَمْزَةُ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَمُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَبِلَالٌ وَسَلْمَانُ وَالْمِقْدَادُ وَأَبُو ذَرٍّ وَعَمَّارٌ وَعَبْدُ اللّٰهِ بْنُ مَسْعُودٍ[١٢]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گشت پێغەمبەرێ حەوت كەسی خانەدان، یا فەرمووی: حەوت یاوەر (نەقیب)ی پێ

---

[١٠] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا
بە زەهرو بە شیر دڵیان لەت كرا
دەبێ كوردێكی بێكەسی وەك من
كلە لە كێ كا گەر نازار درا!؟

م.ك.ع - ١٩٨٨/١٢/١٧ - وەرگێڕ

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

دراوە، بەڵام من چواردە كەسم لەوانە پێ دراوە گوتمان: ئەی عەلی! ئەوانە كێ‌و كێن؟ گوتی: من‌و دوو كوڕەكەی من، كە حەسەن‌و حوسێن‌و جەعفەرو بیلال‌و سەلمان‌و میقدادو ئەبو زەڕو عەممارو عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودین (ت-س/ح).

٣٣٧٥- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلَتْنِي أُمِّي مَتَى عَهْدُكَ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: مَا لِي بِهِ عَهْدٌ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا. فَنَالَتْ مِنِّي فَقُلْتُ لَهَا: دَعِينِي آتِي النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأُصَلِّيَ مَعَهُ الْمَغْرِبَ وَأَسْأَلُهُ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لِي وَلَكِ. فَذَهَبْت فَصَلَّيْتُ مَعَهُ الْمَغْرِبَ فَصَلَّى حَتَّى صَلَّى الْعِشَاءَ ثُمَّ انْفَتَلَ فَتَبِعْتُهُ فَسَمِعَ صَوْتِي فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ حُذَيْفَةُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: مَا حَاجَتُكَ؟ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ وَلأُمِّكَ. ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَا مَلَكٌ لَمْ يَنْزِلِ الأَرْضَ قَطُّ قَبْلَ هَذِهِ اللَّيْلَةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ أَنْ يُسَلِّمَ عَلَيَّ وَيُبَشِّرَنِي بِأَنَّ فَاطِمَةَ سَيِّدَةُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَأَنَّ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الْجَنَّةِ[١٣].

حوزەیفە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دایكم لێی پرسیم: لە كەیەوە بە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) نەگەیشتووی؟ گوتم: لە فیسارە وەختەوە بە خزمەتی نەگەیشتووم، دایكم قسەی پێگوتم، پێیم گوت: لێم گەڕێ، دەچم بۆ خزمەتی‌و نوێژی شێوان لە گەڵیدا دەكەم‌و داوای لێ دەكەم كە هەم بۆ من‌و هەم بۆ تۆ بپاڕێتەوە‌و داوای لێخۆشبوونمان بۆ بكا، جا چووم‌و نوێژی شێوانم لە پشتیەوە كرد، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەر نوێژی تری كرد، هەتا نوێژی خەوتنانی كرد، لەپاشا گەڕایەوە منیش شوێنی كەوتم، كە گوێی لە دەنگم بوو فەرمووی: ئەوە كێیە؟ حوزەیفەیە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: چیت دەوێ‌و داخوازیت چییە؟ خودا لە خۆت‌و لە دایكت خۆش بێ! لەپاشدا فەرمووی: ئا ئەمە فریشتەیەكە، ئەمە یەكەم جارە كە دێ بۆ سەر زەوی، ڕوخصەتی خواستووە لە خودا كەبێ بۆ لای من‌و سڵاوم لێ بكا، وە مزگێنیم بداتێ: كە فاتیمە گەورە‌و سەروەری ئافرەتانی

---

[١٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

بەهەشتە، وە حەسەن‌و حوسەینیش گەورەو سەروەری هەموو لاوانی بەهەشتن (ت-س/ح).

٣٣٧٦- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُنَا إِذْ جَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ وعَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْمِنْبَرِ فَحَمَلَهُمَا وَوَضَعَهُمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ (إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ) فَنَظَرْتُ إِلَى هَذَيْنِ الصَّبِيَّيْنِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قَطَعْتُ حَدِيثِي وَرَفَعْتُهُمَا[١٤]:

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوانی بۆمان دەدا، لەپڕ حەسەن‌و حوسەین بە خلەخل هاتن!سلاوی خودایان لێ بێ، سەرو کراسی سووریان لە بەردابوو، هەر دەڕۆیشتن‌و دەگلان! ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە دوانگە (مینبەرەکە) دابەزی‌و هەردووکیانی هەڵگرت‌و لە بەردەم خۆیدا داینان‌و فەرمووی: فەرموودەی خودا راست‌و دروستە، کە دەفەرموێ:

{إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ – ٦٤ / ١٥}.

واتە: ماڵ‌و منداڵتان مایەی تاقی کردنەوەو بەراووردکردنتانن لای خودا، هەر وەك هۆی زەحمەتی دنیاو سزای پاشە رۆژن ئینجا فەرمووی: تەماشای ئەم دوو منداڵەم کرد، هەر دەرۆیشتن‌و سەرسمیان دەدا، لەبەرئەوە خۆم پێ رانەگیرا قسەکەمم بڕی‌و دابەزیم‌و سەرم خستن بۆلای خۆم (ت-س/ح).

٣٣٧٧- عَنْ يَعْلَى بن مُرَّةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حُسَيْنٌ مِنِّي وَأَنَا مِنْ حُسَيْنٍ أَحَبَّ اللَّهُ مَنْ أَحَبَّ حُسَيْنًا حُسَيْنٌ سِبْطٌ مِنَ الأَسْبَاطِ[١٥]:

---

[١٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

یەعلای کوڕی موڕڕە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حوسێن لە منەو من لە حوسێنم، خودا ئەوکەسەی خۆش بوێ کە حوسێنی خۆش دەوێ، حوسێن بە تەنیا خۆی لەبەر خووی شیرینی و ڕەفتاری جوانی وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ وایە، لە نەتەوە باشەکان (ت- س/ح).

٣٣٧٨- عَنْ سَلْمَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها) قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ وَهِيَ تَبْكِي فَقُلْتُ مَا يُبْكِيكِ؟ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَنَامِ وَعَلَى رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ التُّرَابُ فَقُلْتُ: مَا لَكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: شَهِدْتُ قَتْلَ الْحُسَيْنِ آنِفًا[١٦]:

سەلما (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چووم بۆ لای ئوممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) روانیم وا دەگری، گوتم: خێرە، بۆچی دەگریت؟ گوتی: لە خەوما پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) خۆڵ بە سەرو ریشیەوە بوو، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟ فەرمووی: نەختێ لەمەوپێش لە دیار حوسەینی کوڕم بووم لەبەر چاوی خۆم کوشتیان! (ت- بە سەنەدێکی غەریب).

٣٣٧٩- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ أَهْلِ بَيْتِكَ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ، وَكَانَ يَقُولُ لِفَاطِمَةَ: ادْعِي لِي ابْنَيَّ فَيَشُمُّهُمَا وَيَضُمُّهُمَا إِلَيْهِ[١٧]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پرسیارکرا: کێت زیاتر خۆش دەوێ لە کەسوکاری خۆت؟ فەرمووی: حەسەن و حوسێن هەموو جارێکیش بە فاتیمەی دەفەرموو: دوو کوڕەکەی خۆم بۆم بانگکە، جا کە حەسەن و حوسێن دەهاتن، دەیگوشین بە سینگی خۆیەوەو تێر تێر بۆن و ماچی دەکردن (ت- سەنەد غەریب).

---

[١٦] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١٧] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٣٣٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) حَامِلَ الْحُسَيْنِ عَلَى عَاتِقِهِ، فَقَالَ رَجُلٌ: نِعْمَ الْمَرْكَبُ رَكِبْتَ يَا غُلاَمُ. فَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ): وَنِعْمَ الرَّاكِبُ هُوَ. روى الترمذى هذه العشرة[١٨]:

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ حوسەین بە قەڵاندۆشکانی پێغەمبەرەوە بوو (درودی خودایان لێ بێ) پیاوێ گوتی: ئەی کوڕ! سواری سوار گا (مەرکەب)ێکی چاك بوویت! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاخر خۆشی سواری چاکە! (ت- سەنەد غەریب).

## ٢١) گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خودایان لێ رازی بێ)
## فضل عبدالله بن العباس (رضى الله تعالى عنهما)

٣٣٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: ضَمَّنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) إِلَى صَدْرِهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ. رواه البخارى والترمذى[١]:

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ خۆش نود بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوشیمی بە سینگیەوەو فەرمووی: ئەی خودایە! فێری دانایی‌و زانستی رێك‌و پێك‌و رەفتاری پەسەندی بکە (ب/ت).

٣٣٨٢- وَعَنْهُ قَالَ: دَعَا لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُؤْتِيَنِي اللَّهُ الْحِكْمَةَ مَرَّتَيْنِ. رواه الترمذى بسند حسن[٢]:

دیسان گوتی: دوو جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نزای بۆکردم لە خودا پاڕایەوە کە خودا دانایی‌و حیکمەتم پێ ببەخشێ (ت- س/ح).

٣٣٨٣- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ الْخَلاَءَ، فَوَضَعْتُ لَهُ وَضُوءًا فَلَمَّا خَرَجَ، قَالَ: مَنْ وَضَعَ هَذَا؟ قُلْتُ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ. رواه مسلم[٣]:

---

[١٨] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١] بخارى. فضائل الصحابة: ٣٧٥٦.

[٢] بسند حسن.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رۆیشتە ناو ئاودەست منیش ئاوی دەسنوێژم بۆی دانا، جا کە هاتە دەرەوەو ئاوەکەی دی فەرمووی: کێ ئەم ئاوەی داناوە؟ گوتم: من، فەرمووی: خودایە! شارەزای شەریعەتی بکەو بیکە بە زانایەکی گەورەی ئایین (م- خودای لێ رازی بێ).

## ٢٢) گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (خودایان لێ رازی بێ)
## فضل عبدالله بن جعفر (رضی الله تعالی عنهما)

٣٣٨٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ جَعْفَرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ تُلُقِّيَ بِصِبْيَانِ أَهْلِ بَيْتِهِ وَإِنَّهُ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ فَسُبِقَ بِي إِلَيْهِ فَحَمَلَنِي بَيْنَ يَدَيْهِ ثُمَّ جِيءَ بِأَحَدِ ابْنَيْ فَاطِمَةَ فَأَرْدَفَهُ خَلْفَهُ فَأُدْخِلْنَا الْمَدِينَةَ ثَلاَثَةً عَلَى دَابَّةٍ. رواه مسلم وأبو داود[1]:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هەموو جارێ کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە لە رێبوارییی (سەفەر) دەهاتەوە منالانی کەسوکاری دەچوون بە پیریەوە، جارێ لە سەفەرێ هاتەوە لە پێشدا من گەیشتم پێی، لەبەر دەمی خۆیەوە سواری کردم، لە دواییدا یەکێ لە دوو کووڕەکەی فاتیمەشیان هێنا، ئەویشی سواری پاشکۆی خۆی کرد، ئیتر هەر سێکمان هەتا چوینە ناو مەدینە بە سواری ئەو وولاخە رۆیشتین (م/د- خودایان لێ رازی بێ).

٣٣٨٥- وَعَنْهُ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ. رواه مسلم: إلى هُنا انتهى ذكر أهل البيت المعدودين في حديث زيد بْنِ أرقم السَّابق في أهل البيت (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) وغفر لنا ولأهلنا. آمين[2]:

---

(٣) بخاری. وضوء: ١٤٣ = تجرید / ١ ل — ١٤١ ذ: ١١٦ / ١٤٣. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣١٨.

(١) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢١٨. أبو داود. جهاد: ٢٥٦٦.

(٢) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٢٠.

دیسان گوتی: رۆژێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە پاشکۆی خۆیەوە سواری کردم و فەرموودەیەکی بە نهێنی پێ فەرمووم، بۆ کەسی ناگێڕمەوە (م).

لێرەدا باسی گەورەیی کەسوکاری حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) تەواو دەبێ، رەزای خودایان لێ بێ، بە پێی ئەو ژمارەیەی کە لە فەرموودەکەی زەیدی کوڕی ئەرقەمدا دیاری کرابوون.

## ٢٣) گەورەیی زەیدی کوڕی حاریث (خودای لێ رازی بێ) کە ئازادکراوی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ)

## فضل زيد بن حارثة مولى النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

٣٣٨٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْثًا، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَطَعَنَ بَعْضُ النَّاسِ فِي إِمَارَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنْ تَطْعُنُوا فِي إِمَارَتِهِ فَقَدْ كُنْتُمْ تَطْعُنُونَ فِي إِمَارَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلُ، وَايْمُ اللَّهِ، إِنْ كَانَ لَخَلِيقًا لِلإِمَارَةِ، وَإِنْ كَانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ. رواه البخاری والترمذی ومسلم وزاد: فَأُوصِيكُمْ بِهِ فَإِنَّهُ مِنْ صَالِحِيكُمْ[1]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشکرێکی ناردو ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد بەسەر لەشکریان هەندێ کەس تانووتیان لە فەرمانداریی ئوسامە دەدا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆ ئەگەر ئێوە ئێستا تانەو تانووت لە فەرمانداریی ئوسامە بدەن، ئەوە شتێکی تازە نییە، چونکە لەمەوپێش تانووتتان لە فەرمانداریی باوکیشی دەدا گوایە دەیانگوت: زەید بەندەی ئازادکراوە چۆن دەبێ ببێ بەسەر لەشکرێ کە زۆربەیان پیاوی ئازادبن! دەسا بە هەقی خودا باوکی شایستەی فەرمانڕەوایی بوو، وە زۆر زۆریش خۆشەویست بوو لەلام،

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٣٠، ٤٢٥٠، ٤٤٦٨، ٤٤٦٩، ٦٦٢٧، ٧١٨٧ = تجرید / ٤ ل – ١٥٨ ژ / ١٤٦٨. مسلم. فضائل: ٦٢١٤. ترمذي. مناقب: ٣٨١٦.

وە لەپاش خۆی ئەم کوڕەیم زۆر زۆر خۆش دەویٚ (ب/ت/م) موسلیم ئەمەی زیاترە: جا کەواتە من راتان دەسپیٚرم‌و عەهدتان بۆ دەکەم لەهۆی ئەوەوە کە خۆشتان بویٚ‌و باش بن بۆی، چونکە ئەو یەکیٚکە لە پیاو چاکانی ئیٚوە.

٣٣٨٧- وَعَنْهُ قَالَ: مَا كُنَّا نَدعو زَيْدُ بْنُ حَارِثَة إِلاَّ زَيْدُ مُحَمَّدٍ حَتَّى نَزَلَ الْقُرآنْ: (أدعوهم لآبائهم هو أقسط عند الله). رواه مسلم والترمذى[٢]:

دیسان گوتی: لە پیٚشدا هەتا ئەم ئایەتە لە قورئاندا هاتە خوارەوە کە دەفەرمویٚ:

{ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ – ٣٣ / ٥}.

واتە: ئەو کەسانە کە کردووتانن بە کوڕی خۆتان بە ناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن، ئەوە ریٚکی هەق‌و راست‌و دروستە لەلای خودا گوتی: هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە هیٚشتا هەر بە زەیدی کوڕی حاریثەمان دەگوت زەیدی کوڕی موحەمەد (م/ت).

٣٣٨٨- وَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنْتَ أَخُونَا وَمَوْلاَنَا. رواه البخارى[٣]:

پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی بە زەید: تۆ هەم برامانی‌و هەم یارو یاوەرو ئازادکراومانی! (ب).

٣٣٨٩- عَنْ جَبَلَةُ بْنُ حَارِثَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْعَثْ مَعِي أَخِي زَيْدًا. قَالَ: هُوَ ذَا فَإِن انْطَلَقَ مَعَكَ لَمْ أَمْنَعْهُ. قَالَ زَيْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ لاَ أَخْتَارُ عَلَيْكَ أَحَدًا. قَالَ جَبَلَة: فَرَأَيْتُ رَأْىَ أَخِي أَفْضَلَ مِنْ رَأْيِي[٤]:

---

[٢] بخارى. تفسير: ٤٧٨٢ . مسلم. فضائل: ٦٢١٢. ترمذي. تفسير القرآن. ٣٢٠٩ ، ٣٨١٣.

[٣] رواه البخارى تعليقا بين الرقمين: ٣٧٢٩ و ٣٧٣٠.

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

جەبەلـەی کـوڕی حاریثـە (خـودای لێ رازی بێ) گـوتی: چـووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبـەری خـودا! زەید برای منە بیدەرەوە پێم، فەرمووی: ئەوە خۆیەتی ئەگەر لەگەڵتا دێتـەوە مـن رێگـەی لێ ناگرم زەیدیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! سوێندم بە خـودا مـن لای تـۆ بە هیچ شوێنێکی تر ناگۆڕمەوە، جەبەلە گوتی: لەپاشا بۆم دەرکەوت کـە رای زەیدی برام لە رای من باشتر بوو (ت-س/ح).

٣٣٩٠- وَفَرَضَ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) لأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ فِي ثَلاثَـةِ آلافٍ وَخَمْـسِمِائَةٍ وَفَرَضَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ فِي ثَلاثَةِ: آلافٍ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ لأَبِيهِ لِمَ فَضَّلْتَ أُسَـامَةَ عَلَيَّ فَوَاللَّهِ مَا سَبَقَنِي إِلَى مَشْهَدٍ. قَالَ لأَنَّ زَيْدًا كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَبِيكَ وَكَانَ أُسَامَةُ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْـكَ، فَـآثَرْتُ حُـبَّ رسول الله عَلَى حُبِّي.رواهما الترمذی بسندين حسنين[٥]:

عومـەر (خـودای لێ رازی بێ) سـێ هـەزارو پێـنج سـەدی مووچـە بڕییـەوە بـۆ ئوسامەی کوڕی زەید، وەسێ هەزاریشی مووچە بڕییەوە بۆ عەبدوڵلای کوڕی خۆی، عەبدوڵلا گـوتی بە بـاوکی: بۆچی‌و لەبەرچـی بـاوی ئوسـامە دەدەیـت بەسەرمندا، خۆ بەخودا لـە هـیچ نەبـەردو چەشمەنداز (مەشهەد)ێکا ئوسامە پـێش مـن نەکـەوتووە، کەواتـە بـۆ زیـاتر دەدەی بـەو، عومـەر گـوتی: چـونکە پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەربێ) زەیــدی پــتر خــۆش دەویــست لــەباوکت‌و، ئوسامەشـی زیـاتر خـۆش دەویـست لـە خـۆت! بۆیـە منـیش فـەزڵ‌و بـاوی خۆشەویـستی پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەربێ) دەدەم بەســەر خۆشەویـستی خۆما! (ت-س/ح).

---

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

## ٢٤) چاکێتی (فەزڵ)ی ئوسامەی کوڕی زەید (خودای لێ رازی بێ)
## فضل اسامة بن زيد (رضى اللة تعالى عنه)

**٣٣٩١-** عَنْ أُسَامَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ جَاءَ عَلِيٌّ وَالْعَبَّاسُ يَسْتَأْذِنَان فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ عَلِيٌّ وَالْعَبَّاسُ يَسْتَأْذِنَان. فَقَالَ: أَتَدْرِى مَا جَاءَ بِهِمَا؟؟ قُلْتُ: لاَ أَدْرِىَ، فَقَالَ: لَكِنِّى أَدْرِى، فَأَذِنَ لَهُمَا فَدَخَلاَ فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ أَىُّ أَهْلِكَ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: فَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ، فَقَالاَ: مَا جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ عَنْ أَهْلِكَ. قَالَ: أَحَبُّ أَهْلِى إِلَيَّ مَنْ قَدْ أَنْعَمَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتُ عَلَيْهِ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ. قَالاَ: ثُمَّ مَنْ قَالَ: ثُمَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ، قَالَ الْعَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ جَعَلْتَ عَمَّكَ آخِرَهُمْ قَالَ: لأَنَّ عَلِيًّا قَدْ سَبَقَكَ بِالْهِجْرَةِ[1]:

ئوسامەی کوڕی زەید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەربێ) لەپڕ عەلی‌و عەبباس هاتن، داوای رێگادانیان کرد، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی‌و عەبباس دەیانەوێ بێن بۆ خزمەتت؟ فەرمووی: دەزانیت بۆچی هاتون؟ گوتم: نەء نازانم، فەرمووی: بەڵام من دەزانم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی پێدان، کە چوونە ژورەوە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووین لێت دەپرسین: کێت زۆرتر خۆش دەوێ لە کەسوکاری خۆت؟ فەرمووی: فاتیمەی کچی موحەممەد گوتیان: مەبەستمان لە پرسیارەکەمان کەسەکانی خۆت نییە، فەرمووی: دە خۆشەویستترین کەسم لەلام ئوسامەی کوڕی زەیدە کە هەم خودا چاکەی لەگەڵدا کردووەو هەم خۆم چاکەم بۆی بووە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! پاش ئەو کێی تر؟ فەرمووی: لەپاش ئەویش عەلی کوڕی ئەبو طالیب. عەبباس گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مامەتت خستە دواوە، فەرمووی: چونکە عەلی لەپێش تۆدا کۆچ (هیجرەت)ی کردووە (ت-س/ص).

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه). (اسامة/ تجريد/ ١ / ١٣٨ ژ: ١١٣).

٣٣٩٢- وَعَنْهُ قَالَ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَبَطْتُ وَهَبَطَ النَّاسُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ عَلَيهِ وَقَدْ أُصْمِتَ فَلَمْ يَتَكَلَّمْ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَضَعُ يَدَيْهِ عَلَيَّ وَيَرْفَعُهُمَا فَأَعْرِفُ أَنَّهُ يَدْعُو لِي[٢]:

دیسان گوتی: نەخۆشینەكەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەرەبەرەگران بوو، جا خەڵك لەم لاو لای مەدینەوە دەچوون بۆ خزمەتی، منیش چووم بۆ مەدینە بۆ خزمەتی، كە چووم زمانی گۆی نەدەكردو قسەی بۆ نەدەكرا، لەو حاڵەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستەكانی خۆی دادەنا لەسەر جەستەی من‌و ئینجا هەڵی دەبڕین بۆ ئاسمان، ئیتر زانیم كە ئەوە دووعاو نزای باش بۆ من دەكا (ت-س/ح).

٣٣٩٣- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا): أَرَادَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُنَحِّيَ مُخَاطَ أُسَامَةَ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي حَتَّى أَكُونَ أَنَا الَّذِي أَفْعَلُ. قَالَ: يَا عَائِشَةُ أَحِبِّيهِ فَإِنِّي أُحِبُّهُ. روى الترمذي هذه الثلاثة والأول بسند صحيح[٣]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ویستی چڵمی ئوسامە بسڕێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! رێگەم بدە با من لووتی بسڕم، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئوسامەت خۆش بوێ، چونكە بەڕاستی من خۆشم دەوێ! (ت-س/ح).

## ٢٥) چاكێتیی بیلالی كوڕی رەباح كە بانگدەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەو)

## فضل بلال بن رباح الحبشي مؤذن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

٣٣٩٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَقُولُ أَبُو بَكْرٍ سَيِّدُنَا، وَأَعْتَقَ سَيِّدَنَا. يَعْنِي بِلاَلاً[١]:

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: عومەر** (خودای لێ رازی بێ) **دەیگوت: ئەبو بەکر** (خودای لێ رازی بێ) **سەروەرمانەو سەروەری ئێمەی ئازادکردووە، واتە: بیلال.** (ب- نوقمی سۆزو میهرەبانی خودا بێ).

**٣٣٩٥-** عَنْ قَيْسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ بِلاَلاً قَالَ لأَبِى بَكْرٍ: إِنْ كُنْتَ إِنَّمَا اشْتَرَيْتَنِى لِنَفْسِكَ فَأَمْسِكْنِى، وَإِنْ كُنْتَ إِنَّمَا اشْتَرَيْتَنِى لِلَّهِ فَدَعْنِى وَعَمَلَ اللَّهِ. رواهما البخاری[٢]:

**قەیس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: بیلال لەپاش کۆچی دوایی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **ویستی بچێ بۆ غەزا، ئەبو بەکریش رێگەی پێ نەدەدا، ئەویش بە ئەبو بەکری گوت: ئەگەر تۆ منت لەبەر خۆت کڕیوەتەوە ئەوا بەندم بکە لای خۆت و رێگەم مەدە کە بڕۆم بۆ غەزا، بەڵام ئەگەر لەبەر رەزای خودا منت کڕیوەتەوەو ساغ لەبەر رەزای خوا ئازادت کردووم ئەوا لێم گەڕێ با کاربکەم بۆ رەزای خودا ئەوجا ئەبو بەکر پێی گوت: بیکە بە خاتری خودا بەجێم مەهێڵە، ئیتر ئەویش بەجێی نەهێشت! (ب).**

**٣٣٩٦-** عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِبِلاَلٍ عِنْدَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ: يَا بِلاَلُ حَدِّثْنِى بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ عِنْدَكَ فِى الإِسْلاَمِ مَنْفَعَةً فَإِنِّى سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ خَشْفَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَىَّ فِى الْجَنَّةِ. قَالَ بِلاَلٌ مَا عَمِلْتُ عَمَلاً فِى الإِسْلاَمِ أَرْجَى عِنْدِى مَنْفَعَةً مِنْ أَنِّى لاَ أَتَطَهَّرُ طُهُورًا تَامًّا فِى سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ وَلاَ نَهَارٍ إِلاَّ صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كَتَبَ اللَّهُ لِى أَنْ أُصَلِّىَ. رواه مسلم والبخاری ولفظه: سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَىَّ فِى الْجَنَّةِ[٣]:

➡ (ب/ ٥ ز: ٤ ژ: ٦ / ٣٢٥٠ + ژ: ٥ / ٣٢٤٩) **گێڕانەوەی ئێرە بەم شێوەیەیە: ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: رۆژێ لەپاش نوێژی بەیانی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەی بیلال! پێم بڵێ: کام کارێ دەکەی**

---

[١] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٥٤.

[٢] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٥٥.

[٣] تقدم تخريجه برقم: ٦ / ٣٢٥٠. مجلد/ ٥ تسلسل/ ٤

کە بەلاتەوە زیاتر جێگەی ئومێدبێ لەلای خودا، کە لە سەردەمی ئیسلامدا دەیکەی؟ چونکە ئەم شەو لە بەهەشتا لەبەر دەم خۆمەوە لە بەهەشتا گوێم لە چرپەی سۆڵەکانت بوو بیلال گوتی: ئەو کارەی کە لەکاتی ئیسلامەتیدا دەیکەم‌و لەلام پتر جێگەی ئومێد بێ ئەوەیە: هەر کاتێ بە شەو یا بە رۆژ کە دەسنوێژ دەگرم دەسنوێژێکی تەواو دەگرم‌و چەندە خودا لە چارەی نووسیبم نوێژ دەکەم (م/ب) گفتەی (ب) ئاوایە: لە بەردەممەوە لە ناو بەهەشتا گوێم لە خشپەی پێڵاوەکانت بوو!

## ٢٦) چاکێتی موصعەبی کوڕی عومەیری قوڕەیشی (ڕەزای خودای لێ بێ)
## فضل مصعب بن عمير القريشي (رضى الله تعالى عنه)

٣٣٩٧- عَنْ خَبَّابٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَبْتَغِي وَجْهَ اللَّهِ فَوَقَعَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ فَمِنَّا مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهُوَ يَهْدُبُهَا وَإِنَّ مُصْعَبَ بْنَ عُمَيْرٍ مَاتَ وَلَمْ يَتْرُكْ إِلاَّ ثَوْبًا كَانُوا إِذَا غَطَّوْا بِهِ رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلاَهُ وَإِذَا غُطِّيَ بِهَا رِجْلاَهُ خَرَجَ رَأْسُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَطُّوا رَأْسَهُ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ الإِذْخِرَ. رواه الترمذی بسند صحيح والبخاری[1]:

خەبباب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) کە کۆچمان کرد مەبەستمان بەس ڕەزای خوابوو، ئیتر ئەجرو پاداشمان کەوتە سەر خودا، جا گەلێ کەسمان مردو هیچی لە ئەجرو پاداشی باشی خۆی لە دنیادا نەخواردو گشتی برد بۆ قیامەتی یەکێك لەم خودا پێداوانە کە مردوون موصعەبی کوڕی عومەیربوو، گەلێ کەسیشمان ماون‌و لە خودا بە زیادبێ باخەکەیان خەملیوەو پەیتا پەیتا دەیڕنن، موصعەبی کوڕی عومەیر (خودای لێ رازی بێ) کە لە غەزای ئوحودا شەهیدکرا یەك لۆ بەرگی لەپاش بەجێمابوو، ئەو

---

[1] بخاری. مغازی: ٤٠٤٥ (خباب: تجريد/ ١ / ٣٩٣ ژ – ٤٠٧).

لۆ بەرگەیان کرد بە لۆیەك كفن بۆی، بەڵام ئەویش ئەوەندە نەبوو کە هەموو لەشی داپۆشێ، ئەگەر دەیاندا بەسەر سەریدا قاچەکانی دەردەکەوتن، ئەگەر دەیاندا بەسەر قاچەکانیدا سەری دەردەکەوت! لەبەرئەوە حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەری بە جلەکەی داپۆشن و پووشی سوڕناتیك (گیای ئیزخەر)یش بدەن بەسەر قاچەکانی دا!!!

(ت-س/ص-ب) سوبحانەڵلا! مرۆڤ لەم رازە سەری سوڕ دەمێنێ، بۆیەکا دەڵێم:

کفنی شەهیدی نوحود یەک لۆ بوو

هێشتا نیوەشی پووشی سەر کۆ بوو!

لەم رازە کۆڵیی زەحمەت حاڵی بێ

کەسێ تێ دەکا لەم را قاڵی بێ!!

دەروێش! پێم بڵێ شێخی تۆ کێیە؟

یادی کێ دەکەی کە حاڵت لێیە؟؟

پیرم! بە قوربان، بە یادی یاران

سۆزی جگەرم دادەکا باران!

حەزم لە کفنی پوشی یەک لۆیە

لەو بەرگەی کەوا لەبەری تۆیە!!

## ٢٧) چاکێتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودایان لێبێ)

## فضل عبدالله بن عُمَرَ بن الخطاب (رضى الله تعالى عنهما)

٣٣٩٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا أَقُصُّهَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكُنْتُ غُلَامًا شَابًّا عَزَبًا وَكُنْتُ أَنَامُ فِي

الْمَسْجِدِ حِيْنَذَاكَ فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ كَقَرْنَي الْبِئْرِ وَإِذَا فِيهَا نَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ فَجَعَلْتُ أَقُولُ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ فَلَقِيَهُمَا مَلَكٌ آخَرُ فَقَالَ لِي: لَنْ تُرَاعَ فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ. قَالَ سَالِمٌ فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بَعْدَ ذَلِكَ لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلاَّ قَلِيلاً. رواه الشيخان[1]:

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: بە سەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەگەر پیاوێ خەونێکی بدیبایە دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) منیش بە عەزرەتەوە بووم کە خەونێ ببینم هەتا بیگێڕمەوە بۆی (دروودی خودای لەسەربێ) لەو سەردەمەدا من هەرزەکار بووم رەبەن بووم ژنم نەبوو، لە مزگەوت دەخەوتم، جارێ لە خەوما دیم وا دوو فریشتە وەك بمگرن‌و بمبەن بۆ دۆزەخ وابوو، ئاگرەکەش هەڵچنرابوو وەکی بیری هەڵچنراو هەروا دووشاخەی هەبوو وەك دووشاخەی چەرخی سەر بیر، چەند کەسێکی تێدا بوون ناسیمنەوە، ئیتر دەستم کرد بە گوتنی پەنا دەگرم بە خودا لە زیانی ئاگر، جا لەم کاتەدا دوو فریشتەکە گەیشتن بە فریشتەیەکی تر، فریشتە تازەکە پێی گوتم: ترست نەبێ، جا ئەم خەونەم گێڕایەوە بۆ حەفصەی خوشکم، کە هاوسەری حەزرەت بوو" حەفصەیش دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: عەبدوڵڵا پیاوی چاکە، بریا (بەشەو) شەونوێژی دەکرد! سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوایان لێ رازی بێ) دەیگوت: ئیتر عەبدوڵڵا بەشەو، نەختێك نەبێ، نەدەنووست (ش).**

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٣٨ ، ٣٧٣٩ ، ١١٢١ ، ١١٢٢ ، ٣٧٤٠ ، ٣٧٤١ ، ٧٠٢٨ ، ٧٠٢٩ ، ٧٠٣٠ ، ٧٠٣١.
تجرید/ ١ ل – ٥٥٨ ذ/ ٥٧٩ / ١١٥٦ ، ١١٥٧. مسلم. فضائل: ٦٣١٩ ، ٦٣٢٠.

٣٣٩٩- وَعَنْهُ قَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّمَا فِي يَدِي قِطْعَةُ إِسْتَبْرَقٍ وَلاَ أُشِيرُ بِهَا إِلَى مَوْضِعٍ مِنَ الْجَنَّةِ إِلاَّ طَارَتْ بِي إِلَيْهِ فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ أَخَاكِ رَجُلٌ صَالِحٌ. أَوْ إِنَّ عَبْدَ اللّٰهِ رَجُلٌ صَالِحٌ. رواه الترمذی والشیخان[٢]:

دیسان گوتی: لە خەونا دیم، وەكوو پارچەیێ ئاوریشمی ئەستوورو رەقم بە دەستەوەبێ وابوو، بەرەو هەر جێیەك لە بەهەشتا ئاراستەم دەكرد باڵی دەگرتەوەو دەیبردم بۆ ئەوێ، جا ئەمەم گێڕایەوە بۆ حەفصە، ئەویش دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: براكەت پیاوێكی باشە یا دەفەرموێ: بێگومان عەبدوڵڵای برات پیاوی باشە (ت/ش).

٣٤٠٠- تقدم فی مجلد / ٤ ص ٧٤ تسلسل / ٢١ رقم: ٧ / ٢٧١٣[٣]:

بەڵام لێرەدا لە ناوەندی وشەی (كبركة المسلم)و (فظننته النخلة)دا ئەمەی پترە: وفی روایة: إِنَّ من الشجر شجرة لا يسقط ورقها حدثونی ماهی؟ فوقع الناس فی شجر البوادی: كەواتەی وایە: لە ناو درەختەكانا درەختێ هەیە گەڵاكەی ناوەرێ، پێم بڵێن ئەوە چییە؟ جا خەڵكەكەش كەوتنە ناو دارو درەختی ئەو دەشت‌و دەرەو دەیانگوت: ئەمەیەو ئەوەیە.. تا كۆتایی فەرموودەكە (ب/ت).

## ٢٨) چاكیتی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خودای لێ رازی بێ)
## فضل عبدالله بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ)

٣٤٠١- عَنْ مَسْرُوقٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَكَرُوا ابْنَ مَسْعُودٍ عِنْدَ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو فَقَالَ: ذَاكَ رَجُلٌ لاَ أَزَالُ أُحِبُّهُ بَعْدَ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

[٢] بخاری. تهجد: ١١٥٦ ، ١١٥٧ ، ٧٠١٥ ، ٧٠١٦. مسلم. فضائل: ٦٣١٩ . ترمذي. مناقب: ٣٨٢٥.

[٣] تقدم فی المجلد الرابع (ص) ٧٤ رقم: ٧ / ٢٧١٣.

يَقُولُ: اسْتَقْرِئُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ: مِنِ عبدالله ابْنِ مَسْعُودٍ فَبَدَ أَبِهِ وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ. رواه الشيخان[1]:

مەسووق (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر باسی ئیبنو مەسعوود کرا، گوتی: ئەوەتی ئەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بیستووە ئیتر ئەو پیاوەم خۆش دەوێ دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): لەلای ئەم چوار کەسە قورئان بخوێنن‌و فێری ببن، لەلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو سالمی ئازادکراوی ئەبو حوذەیفەو ئوبەییەی کوڕی کەعب‌و موعاذی کوڕی جەبەل پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەپێشدا ناوی ئیبنو مەسعوودی هێنا، بۆ گرنگی پێدانی پتر (ش).

٣٤٠٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمْتُ أَنَا وَأَخِي مِنَ الْيَمَنِ فَكُنَّا حِينًا وَمَا نُرَى ابْنَ مَسْعُودٍ وَأُمَّهُ إِلاَّ مِنْ أَهْلِ بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ كَثْرَةِ دُخُولِهِمْ وَلُزُومِهِمْ لَهُ. رواه الشيخان والترمذى[2]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: من‌و براکەم کە لە یەمەنەوە هاتین، تا ماوەیەکیش هەروامان دەزانی کە ئیبنو مەسعوودو دایکی لە خێزانی پێغەمبەرن (درودی خودای لەسەربێ) چونکە ئەوەندە بە گەرمی هاموو شۆی ماڵی پێغەمبەریان دەکردو ئەوەندە زۆر لە خزمەتیا دەمانەوە (ش/ت).

٣٤٠٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْنَا حُذَيْفَةَ عَنْ رَجُلٍ قَرِيبِ السَّمْتِ وَالْهَدْيِ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى نَأْخُذَ عَنْهُ فَقَالَ: مَا أَعْرِفُ أَحَدًا أَقْرَبَ سَمْتًا وَهَدْيًا وَدَلاًّ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ. رواه البخارى والترمذى

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٥٨ ، ٣٧٠٦ ، ٣٨٠٨ ، ٤٩٩٩. فضائل: ٦٢٨٤. تجرید/ ٤ ل — ١٦٨. ژ/ ١٤٧٩ / ٣٧٥٨ ، ٣٧٦٠ ، ٣٨٠٨. (ژیننامەی مسروق. بڕوانە: تەرجەمەی ژمارە/ ٨٤. مختصر صحیح مسلم للمنذری).

[2] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٦٣ ، ٤٣٨٤. مسلم. فضائل: ٦٢٧٦. ترمذی. مناقب: ٣٨٠٦.

وزاد: حَتَّى يَتَوَارَى مِنَّا فِي بَيْتِهِ وَلَقَدْ عَلِمَ المحظوظون مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ أَنَّ ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ هُوَ مِنْ أَقْرَبِهِمْ إِلَى اللَّهِ زُلْفَى[٣]:

عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پرسیارمان کرد لە حوزەیفە کە پیاوێکی وامان نیشان بدا، کە وەك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئێسك سووك و ڕەفتار شیرین بێ، هەتا شتی لەلا فێرببین و زانستی لێ وەربگرین، گوتی: کەسێ گومان نابەم کە وەك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئاوا تەحرجوان و ڕەفتار شیرین و بە وێڵ و سەلاربێ، مەگەر عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ب/ت) تیرمیذی ئەمەی پترە: گەلێ جار لەماڵەوە خۆی دەشاردەوە لێمان، ئەو بەختیارانەی ماون لە هاوڕێیانی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) باش دەزانن کە کوڕەکەی ئوممو عەبد واتە: ئیبنو مەسعوود لە گشتیان لە پێشترە لەلای خودا.

٣٤٠٤- عَنْ عَلْقَمَةَ (رَضِي صالِحاً اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ الشَّأْمَ فَصَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ يَسِّرْ لِي جَلِيسًا. فَرَأَيْتُ شَيْخًا مُقْبِلاً، فَلَمَّا دَنَا قُلْتُ: أَرْجُو أَنْ يَكُونَ اللهُ اسْتَجَابَ. قَالَ: مِنْ أَيْنَ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ. قَالَ: أَفَلَمْ يَكُنْ فِيكُمْ صَاحِبُ النَّعْلَيْنِ وَالْوِسَادِ وَالْمِطْهَرَةِ أَوَلَمْ يَكُنْ فِيكُمُ الَّذِي أُجِيرَ مِنَ الشَّيْطَانِ أَوَلَمْ يَكُنْ فِيكُمْ صَاحِبُ السِّرِّ الَّذِي لاَ يَعْلَمُهُ غَيْرُهُ (قال ذلك الشيخ) كَيْفَ قَرَأَ ابْنُ أُمِّ عَبْدٍ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى فَقَرَأْتُ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى * وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى * وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى. قَالَ الشيخ: أَقْرَأَنِيهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاهُ إِلَى فِيَّ، فَمَا زَالَ هَؤُلاَءِ حَتَّى كَادُوا يَرُدُّونِي. رواه البخاري[٤]:

عەلقەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کە گەیشتمە دیمەشق چوومە مزگەوت، دوو ڕکات نوێژم کردو گوتم: ئەی خوایە! هاونشینێکی باشم بۆ برەخسێنە، جا چاوم لێ بوو پیرەمێردێ هات، کە نزیك بووەوە گوتم: هیوام وایە کە خودا تکاکەی گیرا کردبێتم، تا هات لە تەنیشتمەوە دانیشت پرسیم: ئەمە کێیە؟

---

[٣] بخاری. فضائل: ٣٧٦٢ ، ٦٠٩.

[٤] بخاری. فضائل: ٣٧٦١.

گوتیان: ئەبو دەردایە، گوتم: لە خوا پاڕامەوە کە هاودەمێکی باشم بۆ بنێرێ، خوا تۆی بۆ ناردم گوتی: تۆ کوێندەریت؟ گوتم: خەڵکی کووفەم، گوتی: لە قسەتەوە وادیارە کە فێرخوازی‌و وێڵی بە شوێن زانینا خۆ ئەو پیاوەی کە سۆڵ‌و کەوش‌و سەرین‌و مەتارەکەی پێغەمبەری هەڵ دەگرت‌و سەر پەرشتی دەکردن کە ئیبنو مەسعوودە لەلای ئێوەبوو هەروا ئەو پیاوەشی کە خودا پەنای داوە لە شەیتان لەسەر زمانی پێغەمبەر خۆی لەلای ئێوەیە واتە: عەممار هەروا ئەو پیاوەشی کە هەر خۆی نهێنیە تایبەتییەکانی دەزانی کە حەزرەت خۆی پێی گوتبوو کە حوذەیفەی کوڕی یەمانە ئەویش هەر لەلای ئێوە بوو کەواتە: زانای گەورە گەورە لای خۆتان زۆرە، ئیتر چ پێویستە شت لەمن بپرسی لەپاشدا ئیختیارە گوتی: ئیبنو مەسعوود (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى)ی چۆن دەخوێندەوە؟ منیش گوتم: ئاوای دەخوێندەوە: {وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى والذَّكَرَ وَالْأُنثَى} پیرەمێرد گوتی: پێغەمبەر (دروودو صەلات‌و سەلام‌و رەحمەت‌و بەرەکەتی خودای گەورەی لەسەر بێ) بەزاری پیرۆزی خۆی ئەم سوورەتەی پێ گوتووم‌و ئەم سوورەتەم بەدەمی خۆم لە دەمی خۆی وەرگرتووە، کەچی ئێستە ئەمانە هەروازیان لێ نەدەهێنام‌و دەیان ویست کە منیش ببەنە سەر قیرائەت‌و شێوە خوێندنەوەی خۆیان‌و لەباتی رستەی {الذَّكَرَ وَالْأُنثَى} (وەك ئەوان بخوێنمەوە {وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى} (ب).

٣٤٠٥- عَنْ خَيْثَمَةَ بْنِ أَبِي سَبْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ يَسِّرْ لِي جَلِيسًا صَالِحًا فَيَسَّرَ لِي أَبَا هُرَيْرَةَ فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: لَهُ إِنِّي سَأَلْتُ اللَّهَ أَنْ يُيَسِّرَ لِي جَلِيسًا صَالِحًا فَوُفِّقْتَ لِي. فَقَالَ لِي مِنْ أَيْنَ أَنْتَ قُلْتُ مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ جِئْتُ أَلْتَمِسُ الْخَيْرَ وَأَطْلُبُهُ. قَالَ أَلَيْسَ فِيكُمْ سَعْدُ بْنُ مَالِكٍ مُجَابُ الدَّعْوَةِ وَابْنُ مَسْعُودٍ صَاحِبُ طَهُورِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَعْلَيْهِ وَحُذَيْفَةُ صَاحِبُ سِرِّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَمَّارٌ الَّذِي أَجَارَهُ اللَّهُ مِنَ الشَّيْطَانِ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ وَسَلْمَانُ صَاحِبُ الْكِتَابَيْنِ. رواه الترمذي بسند صحيح[٥]:

---

[٥] صحيح عند الترمذي.

خەیثەمەی كوڕی ئەبو سەبرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چوومە مەدینە گوتم: خودایە! هاودەمێكی باشم بۆ بسازێنە، زۆری پێ نەچوو خودا ئەبو هورەیرەی ڕەخساند، لەكنی دانیشتم‌و گوتم: من لە خودا داوام كرد كە هاودەمێكی باشم بۆ بسازێنێ، ئەوا خواو ڕاسان تۆم بۆ ڕێكەوت! پێی گوتم: خەڵكی كوێی؟ گوتم: خەڵكی كووفەم‌و وێڵ‌و سەوداسەرو خولیای خێرو چاكەم گوتی: ئەدی خۆ خۆتان ئەم كەڵە پیاوانەتان لە ناودا هەیە، ئیتر چ پێویست، وەكوو سەعدی كوڕی مالیك كە دووعاو نزای گیرابوو، وەكوو ئیبنو مەسعوود كە ئاوی دەسنوێژی پێغەمبەرو ئاگاداری پێڵاوەكانی حەزرەتی بە دەست بوو، وەكوو حوذەیفە كە خاوەنی ئەو نهێنیە بوو كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە نهێنی ناوی هەموو مونافیق‌و ناپاكەكانی پێ گوتبوو، وەكوو عەمماری كوڕی یاسیر كە لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خودا بۆخۆی پەنای داوە لە شەیتان! وەكوو سەلمانی فارسیی كە هەم ئینجیل‌و هەم قورئانی لەبەرە (ت-س/ص).

٣٤٠٦- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا نُزَلْتَ (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا الآية. قَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قِيْلُ لِي أَنْتَ مِنْهُم[٦]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: كە ئەم ئایەتە دابەزی:

{لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ إِذَا مَا اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ – ٥/ ٩٣}.

واتە: گوناح‌و تاوان نییە لەسەر ئەو كەسانە كە باوەڕو ئیمانیان هێناوە بە ئایینی ئیسلام‌و كردەوەی باشیان كردووە لەو شەرابەدا كە خواردوویانەتەوەو لەو كردەوانەدا كە كردوویانن، بە مەرجێ ئەوە كە ئیمڕۆ

---

[٦] مسلم. فضائل: ٦٢٧٥ ، ٥١٠٢. ترمذی. تفسیر القرآن: ٣٠٥٣.

لەسەر ئەو ئیمانە مابن و خۆیان بپارێزن لەو شتانە کە ئیسلام قەدەغەی کردون و مادەم بەردەوام بن لەسەر کردنی کردەوەی چاکەو، پاش ئەوەیش لەخودا بترسن و پیشەو کارو کردەوەیان چاکەبێ، دیارە چاکە کەرانیش دوورن لە خراپە خەڵاتی پیاو چاکان و چاکەکەرانیش ئەوەیە کە خودای گەورە خۆشی دەوێن. گوتی: کاتێ ئەم ئایەتە هات حەزرەت پێی فەرمووم: ئەی عەبدوڵلا! پێم گوترا: کە تۆ یەکێکیت لەمانە (م) مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە تەفسیری نامی زێڕیندا، بە گەلێ بۆنەوە گەلێ شیعری جوان و ناسکی وەك پەڕەی گوڵی نووسیوە، کە وایە دیارە لە کتێبی حەدیث و تەفسیردا شتی وا جوان و پەسەندە، بۆیە بەندەیش جارو بار نیمچە شیعرو شتی وا دەنووسم. دەڵێم:

براى موسوڵمان! دڵسۆزى وڵات!

رێى چاکە بکە بە رێگەى خەبات

پیشەت چاکە بێ و خراپە نەکردن

کامەران دەبى، لە ژین و مردن!!

پیشەى پیاوى مەرد هەمیشە وایە

بۆ خۆى روو لەخوا، بۆ خەڵک چرایە

٣٤٠٧- وَعَنْهُ قَالَ: وَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ مَا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ سُورَةٌ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ حَيْثُ أُنْزِلَتْ، وَمَا مِنْ آيَةٍ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ فِيمَ أُنْزِلَتْ[٧]:

دیسان گوتی: بەو خوایەی کە کەسی لە رەنگ نییە سوورەت بە سوورەتی قورئان دەزانم کە لە کوێ هاتۆتە خارەوە، ئایەت بە ئایەتیش دەزانم کە بۆچی و بەبۆنەی چییەوە هاتووە (م).

---

[٧] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٠٢. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٨٣.

٣٤٠٨- وَعَنْهُ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِضْعًا وَسَبْعِينَ سُورَةً وَلَقَدْ عَلِمَ أَصْحَابُ مَحَمَّدٍ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنِّي أَعْلَمُهُمْ بِكِتَابِ اللّٰهِ وَلَوْ أَعْلَمُ أَنَّ أَحَدًا أَعْلَمُ مِنِّي لَرَحَلْتُ إِلَيْهِ. قَالَ شَقِيقٌ فَجَلَسْتُ فِي حَلَقِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا يَرُدُّ ذَلِكَ عَلَيْهِ وَلاَ يَعِيبُهُ. روى هذه الثلاثة مسلم[٨]:

دیسان گوتی: حەفتاو ئەوەندە سوورەتم لە خزمەتی حەزرەت خۆیدا (درودی خودای لەسەربێ) خوێندووە، بێ گوومان کە یارانی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) خۆیان باش باش دەزانن کە من لە گشتیان باشتر لە قورئان تێ دەگەم، خۆ ئەگەر بشزانم کە یەکێك هەیە لە خۆم زاناتر کۆچ دەکەم بۆ خزمەتی. شەقیق دەیگوت: خۆم لە کۆڕی یارانی موحەممەددا (درودی خودای لەسەربێ) گەلێ دانیشتووم نەم بیستووە کە کەسێ ئەم قسەیەی ئیبنو مەسعوودە رەت بکاتەوە، یاخود نەنگ و خراپەی لێ بگرێ (م).

٣٤٠٩- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي مِنْ أَصْحَابِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَاهْتَدُوا بِهَدْيِ عَمَّارٍ وَتَمَسَّكُوا بِعَهْدِ ابْنِ مَسْعُودٍ[٩]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو دوو کەسە کە لە یارانم کە لەپاش من دێن، کە بریتین لە ئەبو بەکرو عومەر بیانکەن بەسەر مەشق و چاویان لێ بکەن، وە بە رێنموونی عەمماریش ملی رێ بگرن و ئەو رێگە راستەی ئەو لەسەری دەڕوا ئێوەش لەسەری بڕۆن، وە رێڕەوی ئیبنو مەسعوودیش بگرن و پەیڕەوی رەفتاری جوانی و خووی شیرینی بکەن (ت-س/ح).

٣٤١٠- عَنْ عَلِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُؤَمِّرًا أَحَدًا مِنْ غَيْرِ مَشُورَةٍ مِنْهُمْ لأَمَّرْتُ عَلَيْهِمُ ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ. رواهما الترمذی. نسأل الله حسن الرواية وحسن الخاتمة[١٠]:

---

[٨] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٠٠. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٨٢.

[٩] رواه الترمذی بسند حسن (شرحه).

عەلی (خوای لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر من بەبێ راوێژوو پرس‌و رای موسوڵمانان خۆیان کەسێکم لە خۆمەوە بکردایە بە فەرمانـدار ئـەوا کوڕەکـەی ئوممـو عەبـدم دەکـرد بـە فەرمانـدار لەسـەریان واتـە: ئیبنـو مەسـعوودم دەکـرد بەسـەر لەشـکریان (ت- بـە سەنەدێکی غەریب ریوایەتی کردووە).

## ٢٩) چاکێتیی سالم کە ئێرانی بووەو ئازادکراوی ئەبو حوزەیفە بووە (خوایان لێ رازی بێ)

## فضل سالم مولى أبى حذيفة الفارسي (رضى الله عنهما)

١- تقدم برقم: ٣٤٠١/١ مجلد/٥. تسلسل/٢٨.

## چاکێتی عەماری کوڕی یاسر (رەزای خودایان لێ بێ)

## فضل عمار ياسر (رضى الله تعالى عنهما)

٣٤١١- عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ عَمَّارٌ يَسْتَأْذِنُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ائْذَنُوا لَهُ مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ. رواه الترمذى بسند صحيح[١]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ عەممار هات داوای رێگەی کرد کە بچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رێگەی بدەن مەرحەبا لە پیاوی پاک‌و خاوێن‌و حەلاڵزادە (ت-س/ص).

٣٤١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَبْشِرْ عَمَّارُ تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ. رواه الترمذى ومسلم[٢]:

---

[١٠] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١] رواه الترمذي بسند صحيح.

[٢] مسلم. فتن: ٧٢٤٩ ، ٧٢٥٠ ، ٧٢٥١ ، ٧٢٥٢.

لـە ئـەبو هـورەیرە (خـوداى لێ رازى بـێ) دەڵـێ: پـێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەربێ) دەفـەرموێ: ئـەی عـەممار! مـژدەت لێ بـێ، دەسـتەی سـتەمكارو لـەخوا یـاخی دەتكوژن (ت/م).

٣٤١٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمْ) قَالَ: مَا خُيِّرَ عَمَّـارٌ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ اخْتَارَ أَرْشَدَهُمَا. رواه الترمذى وابن ماجه. والله أعلم وبالله التوفيق[٣]:

عائیشە (خوداى لێ رازى بێ) دەڵـێ: حـەزرەت دەفـەرموێ (دروودى خوداى لەسەربێ): هـەر كاتـێ عـەممار خـۆی كرابـێ بەسـەر پـشك لـەنێوانی دوو كـاردا ئـەوەیانی كردووە كە رەوای تەواو بێ (ت-س/حەزرەت- ئیبنو ماجە).

٣٤١٤- وَلأبى نعيمٍ (على ما جاء فى الشرح): عَمَّارٌ مَلِيئٌ إِيْمَانًـا إِلَـى مُـشَاشِهِ (أي رؤس عظامه)[٤]:

دەفەرموێ: ئیمان‌و باوەڕ لەسەر جمگەكانی عەممارەوە سەر رێژ دەكا! (ئەبو نەعیم-غایەتولمەئموول).

٣٤١٥- ولابن عساكرٍ (عَلى ما جاء في الشرح أيضاً): عمَّارٌ خلط الله الإِيْمَـانَ بلحمه ودمه، يزول مع الحقّ حيث زال، ولا ينبغى للنَّار أن تأكل منه شيئاً[٥]:

حـەزرەت (دروودى خـوداى لەسـەربێ) دەفـەرموێ: بـاوەڕو ئیمـان لـە خـوداوە تێكەڵی گۆشت‌و خوێنی عەممار بووە چۆن گوڵە بەڕۆژە لەگەڵ خۆرا دەگەڕێ عـەمماریش ئـاوا لەگـەڵ هـەق‌و راسـتیدا دەگـەڕێ، ئـاگر رادەی ناكـەوێ كـە چەشكەی شوێنێكی عەممار بكا (ئیبنو عەساكر- غایەتولمەئموول).

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] سكت عن درجته الشارح).

[٥] سكت عن درجته الشارح.

## ٣١) چاكێتی عەمری كوڕی عاص (خودای لێ رازی بێ)
## فضل عمرو بن العاص (رضى الله تعالى عنه)

٣٤١٦- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَسْلَمَ النَّاسُ وَآمَنَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ[١]:

عوقبەی كوڕی عامیر (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەندێ كەس قلیچ موسوڵمانن، بەڵام عەمری كوڕی عاص بە دڵ‌و بە گیان ئیمانی هێناوە (ت- سەنەد ضەعیف).

٣٤١٧- عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ مِنْ صَالِحِي قُرَيْشٍ. رواهما الترمذى[٢]:

طەلحەی كوڕی عوبەیدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بێ گومان كە عەمری كوڕی عاصیش یەكێكە لە پیاوە باشەكانی قوڕەیش (ت- سەنەد ضەعیف).

٣٤١٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِسْتَعْمَلَنِي عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ. قَالَ فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: عَائِشَةُ. قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: أَبُوهَا. رواه الترمذى فى فضل عائشة والبخارى فى غزوة ذات السَّلاسل وزاد: قُلْتُ ثُمَّ مَنْ قَالَ: عُمَرُ. فَعَدَّ رِجَالاً فَسَكَتُّ مَخَافَةَ أَنْ يَجْعَلَنِي فِي آخِرِهِمْ[٣]:

عەمری كوڕی عاص (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) منی كرد بە فەرماندەی سوپای غەزای زاتولسەلاسیل، چوومە خزمەتی عەرزیمكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! كام كەسە زۆر خۆشەویستە لەلات؟ فەرمووی: عائیشە گوتم: ئەی لە پیاوان كێ؟ فەرمووی: باوكی عائیشە

---

[١] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

[٢] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

[٣] بخارى. فضائل: ٣٦٦٢ ، ٤٣٥٨. مسلم. فضائل الصحابة: ٦١٢٧. ترمذى. مناقب: ٣٨٨٥.

(ت/م/ب) بوخاری (وەك باران رەحمەتی لێ باری) ئەمەی پترە (زیادا)نەی هەیە: گوتم: لەپاش ئەوان کێی تر؟ فەرمووی: عومەر وەچەند پیاوێکی تریشی ژمارد ئیتر منیش بێ دەنگ بووم و نەمگوت ئیتر کێ، نەبادا بمخاتە دوا دوای ئەوانەوە.

٣٤١٩- عَنْ شَمَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ وَهُوَ فِي سِيَاقَةِ الْمَوْتِ. فَبَكَى طَوِيلاً وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إِلَى الْجِدَارِ فَجَعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ: يَا أَبَتَاهُ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِكَذَا أَمَا بَشَّرَكَ بِكَذَا قَالَ فَأَقْبَلَ بِوَجْهِهِ. فَقَالَ إِنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ إِنِّي قَدْ كُنْتُ عَلَى أَطْبَاقٍ ثَلاَثٍ لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضًا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنِّي وَلاَ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ قَدِ اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَقَتَلْتُهُ فَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلَمَّا جَعَلَ اللَّهُ الإِسْلاَمَ فِي قَلْبِي أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: ابْسُطْ يَمِينَكَ فَلأُبَايِعْكَ. فَبَسَطَ يَمِينَهُ فَقَبَضْتُ يَدِي. قَالَ: مَا لَكَ يَا عَمْرُو؟ قَالَ: قُلْتُ أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ. قَالَ: تَشْتَرِطُ بِمَاذَا. قُلْتُ: أَنْ يُغْفَرَ لِي. قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الإِسْلاَمَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ. وَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلأَ عَيْنَيَّ مِنْهُ إِجْلاَلاً لَهُ وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ لأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلأُ عَيْنَيَّ مِنْهُ وَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَرَجَوْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ثُمَّ وَلِينَا أَشْيَاءَ مَا أَدْرِي مَا حَالِي فِيهَا فَإِذَا أَنَا مُتُّ فَلاَ تَصْحَبْنِي نَائِحَةٌ وَلاَ نَارٌ فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي فَشُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ شَنًّا ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ قَبْرِي قَدْرَ مَا تُنْحَرُ جَزُورٌ وَيُقْسَمُ لَحْمُهَا حَتَّى أَسْتَأْنِسَ بِكُمْ وَأَنْظُرَ مَاذَا أُرَاجِعُ بِهِ رُسُلَ رَبِّي. رواه مسلم في الإيمان. نسأل الله كمال الإيمان[٤]:

ئیبنو شەماس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە سەرەمەرگا بە دیاری عەمری کوڕی عاصەوە بووین، زۆر گریاو رووی کردە دیوارەکە کوڕەکەشی هەر دەیگوت: بابە! بۆ وا دەکەی؟ خۆتۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) مژدەی

---

[٤] مسلم، إیمان: ٣١٧.

ئەمەو ئەوەی پێت داوە، گوتی: ئەویش رووی تێ کردین‌و گوتی: گەورەترین شت کە ئامادەمان کردووەو جێگەی ئومێدمانە شایەتی دانە بەمە: الا الە الا الله وان محمدا رسول الله. من بەم سێ حاڵەدا تێ پەڕیوم: لە پێشدا وابووم کەس وەك من وا زۆر رقی لە پێغەمبەر نەبوو، ئەگەر خوا نەخاستە لەسەر ئەو حاڵە بمردمایە بێگومان دۆزەخی دەبووم، کاتێکیش کە خودا ئیسلامەتی نایە ناو دڵمەوە بەپێی خۆم چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیمکرد: دەستی راستت بێنە هەتا بەیعەت‌و پەیمانت بدەمێ، جا کە ئەو دەستی خۆی درێژکرد من دەستی خۆمم کێشایەوە فەرمووی: ئەی عەمر! ئەوە چیتە بۆ وادەکەی؟ عەرزیمکرد: دەمەوێ مەرج دابنێم! فەرمووی: مەرجی چی دادەنێی؟ عەرزیمکرد: کە خوا لێم خۆش بێ، فەرمووی: ئەدیی نازانی کە ئیسلامەتی هەرچی گوناهێ لە پێش خۆیەوە بووبێ دەیڕمێنێ هەروا کۆچ‌و رەو کردنیش هەرچی گوناهو تاوانی پێش خۆیەتی دەیرووخێنێ، هەروەها حەج کردنیش هەرچی گوناهێ لەپێشیەوە بووبێ دەیسڕێتەوە ئیتر لەوەدوا کە موسوڵمان بووم کەسی تر وەکوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوا خۆشەویست‌و نازدار نەبووە لە بەرچاوم، ئەوەندە نازدارو بەقەدرو بەرێزو بەسام‌و شکۆبوو پڕکێشم نەدەکرد کە پڕ بەدڵ تێرو پڕ سەیری بکەم! تەنانەت ئەگەر کەسێ داوام لێ بکا کە ناونیشانی هەڵبدەم ناتوانم‌و بۆم هەڵنادرێ، چونکە لەبەر خۆشەویستی‌و سام‌و شکۆی زاتم نەدەکرد کە بە ووردی سەرنجی بدەم، ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بمردمایە ئەوە هیوام وابوو کە بەهەشتی بوومایە، وەلێ لە دوای ئەوە بووین بەسەرکارو کار بەدەست لەسەر هەندێ شت، لەماوەی ئەو کاربەدەستییەدا نازانم حاڵم چۆن دەبێ، جا کەمردم نەسەر دۆلکەبێژ (نائحە): ژنی شیوەنکەرو نە ئاگرو بخوردم لەگەڵ دانەیەت بۆ سەر گۆڕخانە وە لەکاتی ناشتنمدا خۆڵ‌و گڵەکە بکەن بەسەرما، لەپاشدا ئەوەندە لە دەوری گۆڕەکەم بوەستن کە ووشترێ سەربڕێ‌و گۆشتەکەی دابەش بکرێ، هەتا هۆ بگرم پێتانەوەو بە زاتی

ئێــوەوە ســامم بــشكێ و بیربكەمــەوە كــە چــۆن وەرامــی فروســتادەكانی پەروەردگارم بدەمەوەو چی بە نەكیرو مەنكەر بڵێم! (م).

## ٣٢) چاكێتی خالیدی كوڕی وەلید (خودای لێ رازی بێ)
## فضل خالد بن الوليد القرشی (رضی الله تعالی عنه)

٣٤٢٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَعَى زَيْدًا وَجَعْفَرًا وَابْنَ رَوَاحَةَ لِلنَّاسِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَهُمْ خَبَرُهُمْ، فَقَالَ « أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَ جَعْفَرٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ - وَعَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ - حَتَّى أَخَذَهَا سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ. رواه البخاری وسيأتی فی غزوة مؤتة أن شاء الله[1]:

ئەنــەس (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەربێ) هـەواڵی مـەرگی زەیدو جەعفەرو ئیبنو رەواحـەی راگەیاند بە مـەردوم، پێش ئـەوەی هـەواڵیان بە ئاسایی بگا پێیـان، فـەرمووی: زەید ئاڵاكـەی هـەڵگرت و پێكرا، ئینجا عەبدوڵڵای كوڕی رەواحە هەڵیگرت و ئـەویش پێكرا لـەم كاتـەدا هـۆن هۆن فرمێسك بـە چاوەكانی پێغەمبـەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دەهاتـە خوارێ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئیتر ئاڵاكە شمشێری (لە شمشێرەكانی خودا) هەڵیگرت و داینەنا هەتا خودا سەری خستن (ب).

٣٤٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَزَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْزِلاً فَجَعَلَ النَّاسُ يَمُرُّونَ فَيَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ هَذَا يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ فَأَقُولُ فُلاَنٌ. فَيَقُولُ: نِعْمَ عَبْدُ اللَّهِ هَذَا. وَيَقُولُ: مَنْ هَذَا. فَأَقُولُ فُلاَنٌ. فَيَقُولُ: بِئْسَ عَبْدُ اللَّهِ هَذَا. حَتَّى مَرَّ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ هَذَا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ. فَقَالَ: نِعْمَ عَبْدُ اللَّهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ. رواه الترمذی بسند حسن[2]:

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة، ٣٧٥٧.

[2] سنده حسن عند الترمذي.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) لە هەوارێ بارمان خست، بەرودوا خەڵکەکە لە لایەوە تێ دەپەڕین، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەمە کێیە؟ دەمگوت: فیسارە کەسە دەیفەرموو: ئەم بەندەی خودایە بەندەی چاکە! یەکێکی تر تێ دەپەڕی دەیفەرموو: ئەی ئەمە کێیە؟ دەمگوت: فیسارە کەسە، دەیفەرموو: ئەم بەندەی خودایە بەندەیەکی خراپە هەتا سەرە هاتە سەر خالیدی کوڕی وەلیدو خالید بە بەردەمیا رەت بوو، فەرمووی: ئەی ئەمە کێیە؟ عەرزیمکرد: ئەمە خالیدی کووڕی وەلیدە، فەرمووی: بەندەی خودا خالیدی کوڕی وەلید پیاوی چاکە، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خودا (ت-س/ح).

## ٣٣) چاکێتی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (خودایان لێ رازی بێ)
## فضل معاوية بن أبي سفيان (رضى الله تعالى عنهما)

٣٤٢٢-عَنْ أَبِي مُلَيْكَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قِيلَ لابْنِ عَبَّاسٍ هَلْ لَكَ فِي أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ مُعَاوِيَةَ، فَإِنَّهُ مَا أَوْتَرَ إِلاَّ بِوَاحِدَةٍ. قَالَ إِنَّهُ فَقِيهٌ. رواه البخارى[1]:

ئەبو مولەیکە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە ئیبنو عەبباس گوترا: خۆزیا قسەت لەگەڵ فەرمانڕەوای موسوڵمانان موعاوییە دەکرد، چۆن تاقە رکاتی نوێژی وەتر دەکا، ئیبنو عەبباس گوتی: کارەکەی رێکی رێبازی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) خراپەی لێ ناگیرێ، چونکە خۆی مەلایە (ب).

٣٤٢٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمِيرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ لِمُعَاوِيَةَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا وَاهْدِ بِهِ. رواه الترمذى بسند حسن[2]:

---

[1] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٦٥.

[2] رواه الترمذي بسند حسن.

ئەوڕەحمانی کوڕی ئەبو عومەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) {کە خۆی صەحابە بوو، لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بوو} گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە موعاوییەی فەرموو: ئەی خودایە! بیخەرە سەر ڕێگەی ڕاست‌و بیکە بە ڕەهبەرو بیکە بەهۆی ڕێنموونی (ت-س/ح).

## ٣٤) چاکێتی ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب (خودای لێ ڕازی بێ)

## فضل ابی سفیان بن حرب (رضی الله تعالی عنه)

٣٤٢٤- عَنْ ابِنْ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ لاَ يَنْظُرُونَ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ وَلاَ يُقَاعِدُونَهُ فَقَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا نَبِيَّ اللَّهِ ثَلاَثٌ أَعْطِنِيهِنَّ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: عِنْدِي أَحْسَنُ الْعَرَبِ وَأَجْمَلُهُ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ أَبِي سُفْيَانَ أُزَوِّجُكَهَا قَالَ: نَعَمْ. قَالَ وَمُعَاوِيَةُ تَجْعَلُهُ كَاتِبًا بَيْنَ يَدَيْكَ. قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَتُؤَمِّرُنِي حَتَّى أُقَاتِلَ الْكُفَّارَ كَمَا كُنْتُ أُقَاتِلُ الْمُسْلِمِينَ. قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَبُو زُمَيْلٍ وَلَوْلاَ أَنَّهُ طَلَبَ ذَلِكَ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا أَعْطَاهُ ذَلِكَ لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُسْئَلُ شَيْئًا إِلاَّ قَالَ: نَعَمْ. رَوَاهُ مسلم[١]:

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: لەپێشدا موسوڵمانان بە چاوێکی باش تەماشای ئەبو سوفیانیان نەدەکردو لەگەڵیا دانەدەنیشتن لەبەر کردەوەی پێشووی، تا ئەبو سوفیان عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم سێ شتەم پێ خەڵات بکەو ئەو سێ تکایەم هەیە لە خزمەتتا، فەرمووی: بەڵێ گوتی: ئوممو حەبیبەی کچم، کە ئافرەتی وا جوان‌و نازداری تر کەم هەیە لەناو عەرەبا، کە بۆ خانەدانیش کچی ئەبو سوفیانە دەمەوێ خۆم مارەی بکەمەوە لێت‌و مارە بڕینەوەکەی تازە بکەمەوە بۆت، فەرمووی: بەڵێ، باشە گوتی: موعاوییەی کوڕیشم بکە بە میرزای بەردەستی خۆت فەرمووی: بەڵێ باشە گوتی: خۆشم بکە بەسەر لەشکر تا چۆن کاتی خۆی لە دژی سوپای موسوڵمانان شەڕم دەکرد ئێستا ئاوا شەڕ بکەمەوە لە دژی

---

[١] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٥٩.

لەشکری کافرەکان، فەرمووی: باشە ئەبو زومەیل گوتی: خۆی داوای ئەمانەی کرد لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەنا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەوانەی لە خۆیەوە نەدەدایە، چونکە عادەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) وابوو دەستی نەدەنا بە رووی کەسەوە، داوای هەر شتێکیان لێ دەکرد بەپێی توانا دەیفەرموو باشە (م).

إلى هنا أنتهي ذكر المهاجرين إلا النفر الأخير (رضى الله تَعَالَى عـنهم أجمعـين — وجميع من تقدم من أبي بكر إلى هنا قرشيون إلا زيد بن حارثة وولده أسامه وبلالا وابن مسعود مولى أبي حذيفة وعمار بن ياسر (رضى الله تَعَالَى عنهم وعنا بجاههم).

لێرەدا باسی کۆچکەران تەواو، وەلێ ئەم چەن کەسەی دواوە کۆچکارنین، لە ئەبو بەکرەوە بیگرە هەتا ئێرە هەموویان قورەیشین ئەمانەی لێ دەرچێ: زەیدی کوڕی حاریسەو ئوسامەی کوڕی بیلالی حەبەشی‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو سالمی فارسی کە بەندەی ئازادکراوی ئەبو حوذەیفە بوو و عەممارى کوڕی یاسیر. خودا لێیان رازی بێ‌و لەبەر خاتری ئەوان لە ئێمەی پەیڕەوی ئەوانیش خۆش بێ‌و لێمان رازی بێ. ئامین ماڵ ئاوایی لە کۆچکاران دەکەم‌و دەڵێم بە یادی ئەو دلێر مەردانەوە:

نازیز! نەورۆزە، وەرزی بەهارە

دڵ لە چڵپاوی چلە بێزارە!

شەوی نەفامی‌و سوپای تارومار

شیری ئیسلامیان لێ کەوتۆتە کار

گزنگی تیشکی شۆڕشێکی پاک

دەشت‌و دەری کرد بە رۆژی رووناک"

بڵێسەی نووری قورئانی پیرۆز

دەوەزی‌و دڵی پڕ دەکرد لە سۆز"

پۆل پۆل پیاوی مەرد خۆی‌و خێزانی

بــوون بــە پەروانــەی تاهــاو قورئــانی

کــۆچو باریــان کــرد بــەرەو مەدینــە

حاشا لـە گـشت شـت، جگـە لەودینـە،

کــە خــوا ناردوویــە بــە موحەممــەدا

تاقــە رەهبــەری ریّــی راســتی خــودا،

لەوســاوە ئــیتر گومــەزی ئیــسلام

بــۆ خوانــاس بــووە بــە چــەتری ســەلام!

## ٣٥) بەشی پێنجەم: باسی گەورەیی‌و پاکژیی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ)

### الفصل الخامس: في فضائل زوجات النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: يَا نِسَاء النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاء إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ٣٣/٣٢-٣٤}.

خـودای مـەزن دەفـەرموێ: ئـەی ژنـەکانی پێغەمبـەر! ئێـوە هاوسـەری پێغەمبەری خودان، ئێوە وەکوو ژنـانی تر نین، نـەنگی ئێـوە نـەنگی خوداو پێغەمبەرە، کەواتە ئەگەر تەقواتان هەیەو خۆتان بە خاوەن تەقوا دەزانن ئەوا قسەی نەرم‌و مێچکە لەگەڵ پیاوی بیانیدا مەکەن، نەبادا ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشەو بێ شـەرم‌و بـێ ئـابڕوون تـەمای بـەدو خـەیاڵی خراپتـان دەربارە بکەن، هەمیشە قسەی باش‌و جوان بکەن، رێزو سەلاری‌و سەنگینی خۆتـان بپـارێزن، لـە ژوورو ماڵـەکانی خۆتانـا بـە حـەیاو حورمـەت‌و قـەدرو ویقـار دابنیشن‌و لـەکاتی بـە رێگـە رۆیـشتن دا لەنجـەو لار مەکـەن‌و خۆتـان ئارایش

مەدەن بۆ پیاوی بیانی، وەكوو ئەو ژنانەی كە لە كاتی نەزانی‌و كافرێتی كۆندا لارو لەنجەیان دەكردو خۆیان دەڕازاندەوە بۆ خەڵك ئێوە كەسوكاری پێغەمبەرن‌و خودا دەستی قەدری لێ ناون، دەی سوپاسی ئەو بەهرەیە بكەن‌و لەكاتی خۆیا نوێژەكانتان بەجێ بێنن‌و زەكاتی ماڵتان بدەن‌و فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمبەری بەجێ بێنن. راڤەی مەندەی ئایەتەكە لەم شوێنەدا رۆیشت ➡ (ب- ٣ز- ١٩١ف- ٢) وەلێ لێرە لە ئاخرەكەیەوە ئەمەی پترە: خەریكی دەور كردنەوەی قورئانی پیرۆز بن‌و لە ماڵەوە هەمیشە خەریكی فێربوونی ئایەتەكانی قورئان‌و فەرموودەكانی پێغەمبەر بن كە هەمووی حیكمەت‌و زانستی پیرۆزو بەرزە، بێگومان خودای گەورە ئاگای لە هەموو شت هەیە.

وَقَالَ تَعَالَى: {النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ - صدق الله العظيم - ٦/٣٣}.

خودای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: پێغەمبەر لە هەموو شتێكا بۆ هەموو موسوڵمانێ نزیكترەو لەپێشترە لەهەموو كەسێكی تر، تەنانەت لە پێشترە بۆیان لە خودی خۆشیان بۆ خۆیان، وە خێزانەكانیشی وان لە جێگەی دایكیانا.

## ٣٦) چاكێتیی خەدیجە خانی كچی خووەیلید (خودای لێ رازی بێ)
## فضل السیدة خدیجة بنت خویلد (رضی الله تعالی عنها)

٣٤٢٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى نِسَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلاَّ عَلَى خَدِيجَةَ وَإِنِّي لَمْ أُدْرِكْهَا. قَالَتْ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا ذَبَحَ الشَّاةَ فَيَقُولُ: أَرْسِلُوا بِهَا إِلَى أَصْدِقَاءِ خَدِيجَةَ. قَالَتْ: فَأَغْضَبْتُهُ يَوْمًا فَقُلْتُ خَدِيجَةَ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنِّي قَدْ رُزِقْتُ حُبَّهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: فَرُبَّمَا قُلْتُ: لَهُ كَأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ فِي الدُّنْيَا امْرَأَةٌ إِلاَّ خَدِيجَةُ. فَيَقُولُ: إِنَّهَا كَانَتْ وَكَانَتْ، وَكَانَ لِي مِنْهَا وَلَدٌ. وَفِي

رِوَايَةٍ: مَا غِرْتُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ لِكَثْرَةِ ذِكْرِهِ إِيَّاهَا وَمَا رَأَيْتُهَا قَطُّ لأنَّها مَاتَت قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجني بثلاث سنين[1]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە هیچ ژنێکی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەوەندەی خەدیجە (خودای لێ ڕازی بێ) هەوێباریم نەکێشاوە، لەگەڵ ئەوەیشا کە من فریای خەدیجە نەکەوتووم، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زۆری ناو دەبرد، گەلێ جار کە مەڕێکی سەر دەبڕی دەیفەرموو: بەشی دۆست‌و ئاشناکانی خەدیجە بنێرن! گوتی: ڕۆژێ تووڕەیم کرد، گوتم: خەدیجەو خەدیجە! فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بە دەست خۆم نییە خۆشەویستی ئەو لە خوداوە لە دڵما چەسپیوە! لە گێڕانەوەیەکا: گەلێ جار عەرزی پێغەمبەرم دەکرد: دەڵێی ئەم جیهانە کەسی تری تیانییە خەدیجە نەبێ، ئەویش دەیفەرموو: ئافرەتێکی وەهاو وەها باش بوو، سەرەڕای ئەوەیش منداڵم لێی هەبوو! لە گێڕانەوەیەکی تردا: ڕقەم نەکێشاوە لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر هیچ ژنێکی وەکوو لەسەر خەدیجە ڕقەم لێ دەکێشا، خەدیجەشم هەرگیز نەدیوە، چونکە سێ ساڵ بەر لەوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) من بگوێزێتەوە خەدیجە مردووە، هۆی ئەم ڕقەکێشانە ئەوەبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زۆر باسی ئەوی دەکرد (ش/ت).

٣٤٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى جِبْرِيلُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْكَ مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ إِدَامٌ أَوْ طَعَامٌ أَوْ شَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنْ رَبِّهَا عزَّ وجلَّ، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ، لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ[2]:

---

[1] بخاری. أدب: ٦٠٠٤ ، ٧٤٨٤. تجرید/ ٤ ل - ١٨٤ ژ: ١٤٩٨ / ٣٨١٦ ، ٣٨١٧ ، ٥٢٢٩ ، ٧٤٨٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٢٨.

[2] بخاری. مناقب: الأنصار: ٣٨٢٠ ، ٧٤٩٤.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جوبرائیل (دروودی خودای گەورەی لێ بێ) لە ئەشکەوتی حیرا دێتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە خەدیجەیە وا بە رێوە، وا هات بۆ لات، دەفرێکی پێیە پێخۆری تیا هێناوە بۆت یا دەفەرموێ: خۆراك یا خواردنەوەی تیا هێناوە بۆت، جا کە گەیشتە لات لە لایەنی خودای گەورەو سەروەرەوەو لە لایەنی منەوە سڵاوی لێ بکەو مزگێنی ئەوەشی بدەرێ کە خودا لە بەهەشتا کۆشکێکی بۆ داناوە، لە مرواری هوڵوڵ دروستکراوە، نە دەنگە دەنگ و قرەقرِی تیایەو نە نارەحەتی و شەکەتی! (ش/ت).

٣٤٢٧- عَنْ عَلي (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ. روى هذه الثلاثة الشيخان والترمذي[٣]:

عەلی (رەزای خوای لێ بێ) گوتی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: باشترینی ئافرەتی جیهان مەریەمی کچی عیمرانە (واتە: لە کاتی خۆیا) لەم چەرخەشدا باشترینی ئافرەتی جیهان خەدیجەی کچی خووەیلیدە (ش/ت).

٣٤٢٨- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْها) اسْتَأْذَنَتْ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ أُخْتُ خَدِيجَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَعَرَفَ اسْتِئْذَانَ خَدِيجَةَ وتذكّرَهُ فَارْتَاعَ لِذَلِكَ فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ. فَغِرْتُ فَقُلْتُ وَمَا تَذْكُرُ مِنْ عَجُوزٍ مِنْ عَجَائِزِ قُرَيْشٍ حَمْرَاءِ الشِّدْقَيْنِ هَلَكَتْ فِي الدَّهْرِ فَأَبْدَلَكَ اللَّهُ خَيْرًا مِنْهَا. رواه الشيخان[٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: هالەی کچی خووەیلیدی خوشکی خەدیجە داوای رێگەی کرد کە بێتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەنگی ئەودا دەنگی خەدیجەی بیرکەوتەوەو

---

[٣] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨١٥ ، ٣٤٣٢. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٢١. ترمذي. مناقب: ٣٨٢.

[٤] بخاری. فضائل خدیجه: ٣٨٢١. مسلم، ٦٢٣٢ = تجرید/ ٤ ل — ١٨٦ ژ/ ١٥٠٠ / ٣٨٢١.

وایزانــی ئــەوە، چــونکی دەنگیــان لــە یــەك دەچــوو، لەبەرئــەوە راچــەنی و فــەرمووی: ئــەی خودایــە! دەی هالــەی کــچی خووەیلیــد بــێ! منــیش دەمــار گرتمی و گوتم: ئەمە چییە ئەوەندە یادی ئەم پیرێژنە لالفاوە سوورە ددان لە دەمــا نــەماوەی قوڕەیــشییە دەکەیتــەوە، کــە ســەردەمێکی دوورو درێــژە لــەناو چووە! کە لەگەڵ ئەوەیشدا خودا لەباتی ئەو ژنی باشتری داویتێ! (ش).

٣٤٢٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حَسْبُكَ مِنْ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ وَخَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ وَفَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ. رواه الترمذی والنسائی والحاکم[٥]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفــەرموێ: لــە ژنــانی هــەموو جیهــان ئــەم چــوار ژنــەت بەســە بــۆ بەهرەمەنــدیی و پــاکژیی و گــەورەیی: مەریــەمی کــچی عیمــران و خەدیجــەی کــچی خووەیلیــدو فاتیمــەی کچی موحەممەدو ئاسیەی ژنی فیرعەون (ش-س/ص-ن/حاکم).

## ٣٧) چاکێتی عائیشە خانی کچی ئەبو بەکر (خودایان لێ رازی بێ)
## فضل السیدة عائیشة بنت ابی بکر (رضی الله عنهما)

٣٤٣٠- عَنْ عَائِشَةَ عَنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَــالَ: أُرِيتُــكِ فِــي الْمَنَــامِ ثَلَاثَ لَيَالٍ جَاءَنِي بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ فَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُــكَ. فَأَكْــشِفُ عَــنْ وَجْهِكِ فَإِذَا أَنْتِ هِيَ فَأَقُولُ إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ. رواه الــشیخان والترمــذی ولفظه: جَاءَ جِبْرِيلَ لِلنبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِصُورَةِ عَائِشَةَ فِي خِرْقَةِ حَرِيرٍ خَضْرَاءَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ زَوْجَتُكَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ[١]:

لەوە پێش ئەم حەدیثە گوتراوە لێرەشدا بەم شێوەیەیە: عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵــێ: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێــی فــەرمووم: ســێ شــەو لــە

---

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاری. نکاح: ٥١٢٥. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٣٣.

خەوما تۆم پێنیشاندرا، جوبرائیل وێنەی تۆی لەناو دەسماڵێكی ئاورێشما بۆم دەهێناو دەیفەرموو: ئەمە ژنی تۆیە، منیش روویم هەڵ دەدایەوەو تەماشایم دەكرد، ئەوا ئێستا دەركەوت كە خاوەنی ئەم وێنەیە تۆ بووی! ئەو كاتە دەمگوت: ئەگەر ئەمە لە خوداوە بێ دەیكاو خۆی دەیهێنێتە دی! (ش/ت) گفتەی (ت): جوبرائیل لە پارچەیێ ئاوریشمی سەوز دا وێنەی عائیشە دێنێ بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی دەفەرموێ: ئەمە لە هەردوو جیهاندا ژنی تۆیە.

٣٤٣١- وَقَالَ عَرْوَة (رَضِي اللهُ عَنْهُ): تُوُفِّيَتْ خَدِيجَةُ قَبْلَ هجرة النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِثَلاَثِ سِنِينَ، فَلَبِثَ سَنَتَيْنِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ، وَنَكَحَ عَائِشَةَ وَهْيَ بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، ثُمَّ بَنَى بِهَا وَهْيَ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. بعد الهجرة. رواه البخاري[٢]:

عوروە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە سێ ساڵ بەر لە كۆچكردنی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بۆ مەدینە خەدیجەی خێزانی لە مەككە كۆچی دوایی كرد، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پاش دەوری دوو ساڵ لەوە دوا لەپێش كۆچكردنا عائیشە مارە دەبڕێ بۆ خۆی، ئەو دەمە عائیشە تەمەنی شەش ساڵ بوو ئەوجا لەپاش كۆچكردن لە مانگی شەشەڵاندا لە مەدینە گواستیەوە، ئەو دەمە كە گواستیەوە تەمەنی عائیشە نۆ ساڵ بوو (ب).

٣٤٣٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ خَزْرَجٍ، فَوُعِكْتُ فَتَمَرَّقَ شَعَرِي فَوَفَى جُمَيْمَةً، فَأَتَتْنِي أُمِّي أُمُّ رُومَانَ وَإِنِّي لَفِي أُرْجُوحَةٍ وَمَعِي صَوَاحِبُ لِي، فَصَرَخَتْ بِي فَأَتَيْتُهَا لاَ أَدْرِي مَا تُرِيدُ بِي فَأَخَذَتْ بِيَدِي حَتَّى أَوْقَفَتْنِي عَلَى بَابِ الدَّارِ، وَإِنِّي لأَنْهَجُ، حَتَّى سَكَنَ بَعْضُ نَفَسِي، ثُمَّ أَخَذَتْ شَيْئًا مِنْ مَاءٍ فَمَسَحَتْ بِهِ وَجْهِي وَرَأْسِي ثُمَّ أَدْخَلَتْنِي الدَّارَ فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْبَيْتِ فَقُلْنَ عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ. فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِنَّ

---

[٢] تقدم برقم: ١ م/ ٢٠٦١ مجلد / ٣ز: ٣٦. الحديث الأول.

فَأَصْلَحْنَ مِنْ شَأْنِي، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضُحًى، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْـهِ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. رواه البحارى[٣]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: تەمـەنم شـەش سـاڵ بـوو کـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) مـارەی کـردم، لەپاشـدا چـووین بـۆ مەدینـە، لـەوێ لـەناو نـەوەی حـاریثـی کـوڕی خـەزرەجـدا بـە ماڵەوەماینـەوە، جـارێ تووشـی لـەرزو تایەکی سەختی وا بووم قژم رووتایەوە لەپاشا قژەکەم هاتەوەو پەلکۆڵەیەکی پەیدا کردەوە دەیدا لە ناو شانم ئەوا جارێ وام لەناو جۆلانەیەکا لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکی خۆما گەمەو دیلانێمان دەکرد، هەر ئەوەنـدەم زانـی ئوممـو رۆمانی دایکم هاتە لام‌و بانگی کردم، منیش چوومە لای، نەیشم دەزانـی چـی لێم دەوێ، ئیتر دەستی گرتم‌و بردمی، تا گەیشتینە بەر دەرگای مـاڵی خـۆمـان لەوێدا تۆزێ رایوەستاندم، لەبەر مانـدوێتی هەناسـەم سـواربوو بـوو، هەناسـە بـڕکێم بـوو، تـا نـەختێ پـشووم بـە بـەردا هاتـەوە، نـەختێ ئـاوی هـەڵگرت‌و ئاوەکـەی هەڵسوی لـە دەموچـاوو سـەرو چـاوم، ئینجـا بردمیـە ماڵـەوە، کـە تەماشام کرد وا کۆمەڵێ ژنی یاریدەدەران هان لە ماڵەوە، کە چوومە ژوورەوە گوتیـان: لەسـەر خێـرو خۆشـی، لەسـەر بـەختی بـاش ئـیتر دایکـم منـی دایـە دەسـتی ئـەوان، ئـەوانیش نـەختێ رێکیـان خـستم، ئـیتر ئاگـام لـە هـیچ نـەبوو کاتێکم زانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەکاتی چێشتەنگاودا خۆی کرد بە مـاڵا و دایچەڵەکاندم" ئـەوسا ژنـەکان منیـان دایە دەسـتی و هـەر ئـەوکاتـە لـەو شوێنەدا لە ماڵی خۆمان بە دەستی گرتم ئەو حەلە تەمەنم نۆ ساڵ بوو (ب).

٣٤٣٣- وَعَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا عَائِشَ، هَذَا جِبْرِيـلُ يُقْرِئُكِ السَّلاَمَ. فَقُلْتُ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُـهُ، تَـرَى يارَسُـولَ اللَّـهِ مَـا لاَ أَرَى[٤]:

---

[٣] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨٩٤ ، ٣٨٩٦ ، ٥١٣٣ ، ٥١٣٤ ، ٥١٥٦ ، ٥١٥٨ ، ٥١٦٠.

[٤] بخاری. بدء الخلق: ٣٢١٧ ، ٣٧٦٨ ، ٦٢٠١ ، ٦٢٤٩ ، ٦١٥٣. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٥٤.

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئایشێ! ئەمە جوبرائیلە سڵاوت لێ دەكا منیش گوتم: وعلیە السلام ورحمة الله وبركاتە: سڵاوو رەحمەت‌و پیت‌و بەرەكاتی خوداش لەسەر ئەو بێ ئەی پێغەمبەری خودا! گەلێ شتی وا هەیە بە تۆ دەبینرێ، بە ئێمە نابینرێ! (ش/ت).**

**٣٤٣٤- تقدم برقم: ٥ / ٣٤٢٩ و ٣٤٢٧[٥]:**

**٣٤٣٥- عَنْ عَائِشَةُ (رَضِي اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ النَّاسَ يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ، فاجتمع صَوَاحِبِي إلى أم سلمة، فقلن: يا أُمَّ سَلَمَةَ، واللهِ إنَّ النـاسَ يتحـرَّوْنَ بِهَدَاياهم يَوْمَ عَائِشَةَ وَإِنَّا نُرِيدُ الْخَيْرَ كَمَا تُرِيدُهُ عَائِشَةُ، فَمُرِي النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَنْ يَأْمُرَ النَّاسَ أَنْ يُهْدُوا إِلَيْهِ حَيْثُ مَا كَانَ أَوْ حَيْثُ مَا دَارَ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَأَعْرَضَ عَنِّي، فَلَمَّا عَادَ فى الثانِيَةِ ذَكَرْتُ لَهُ ذَاكَ فَأَعْرَضَ عَنِّي، فَلَمَّا كَانَ فِي الثَّالِثَةِ ذَكَرْتُ لَهُ فَقَالَ « يَا أُمَّ سَلَمَةَ لاَ تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ، فَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا نَزَلَ عَلَيَّ الْوَحْيُ وَأَنَا فِي لِحَافِ امْرَأَةٍ مِنْكُنَّ غَيْرِهَا. رواه البخارى والترمذى[٦]:**

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: موسوڵمانان كە دیارییەكیان دەبرد بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **چاوەڕوانی ئەو رۆژەیان دەكرد كە رۆژی سەرەی عائیشە بێ هەتا لەوێ دیارییەكەی بۆ بەرن چونكە دەیانزانی كە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **عائیشەی خۆش دەوێ جا هەوێكانم لەكن ئوممو سەلەمە كۆ دەبنەوەو دەڵێن: ئەی ئوممو سەلەمە! بەخودا خەڵكەكە كە دیاری دەبەن بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **هەڵی دەگرن هەتا رۆژی سەرەی عائیشە دێ، ئەوسا بۆی دەبەن، ئێمەش وەك عائیشە دەمانەوێ لەو خێرەمان بەركەوێ، كەوابوو تۆ عەرزی پێغەمبەر بكە** (دروودی خودای لەسەربێ) **كە بە خەڵكەكە بفەرموێ كە خۆی تەشریفی لە ماڵی هەر كامێ لە ژنەكانی بێ لەوێ**

---

[٥] تقدم برقم/٥/٣٤٢٩و رقم/٣/٣٤٢٧ مجلد/٥ تسلسل/٣٦.

[٦] بخاری. هبة: ٢٥٧٤ ، ٢٥٨٠ ، ٢٥٨١ ، ٣٧٧٠ — تجريد / ٣ ل — ١٩٠ ژ/ ١١٠٢ / ٢٥٨١. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٣٩.

دیاریی بۆ ببەن‌و جیاوازیی لەنێوانی ماڵی هاوسەرەکانیا نەکەن ئوممو سەلەمە گوتی: کە ئەمەم عەرزوی حەزرەت کرد وەرامی نەدامەوە، بۆ جاری دووەم کە سەرەم هاتەوەو حەزرەت هات دووبارە عەرزیمکردەوە دیسانەوە وەڵامی نەدامەوە بەڵام لە جاری سێیەمدا کە عەرزیمکرد فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئوممو سەلەمە! لەسەر عائیشە ئازارم مەدە، چونکە بە خودا نەبووە کە لەناو نوێنی ژنێ لە ئێوەدابم‌و سرووشم بۆ بێ جگە لە نوێنی عائیشە (ب/ت).

٣٤٣٦- وَعَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا كَانَ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَرَضِهِ، جَعَلَ يَدُورُ فِي نِسَائِهِ وَيَقُولُ « أَيْنَ أَنَا غَدًا أَيْنَ أَنَا غَدًا. حِرْصًا عَلَى بَيْتِ عَائِشَةَ، قَالَتْ عَائِشَةُ فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي سَكَنَ. رواه البخاری مسلم، ولفظه: كَانَ يَتَفَقَّدُ يَوْمی أَيْنَ أَنَا الْيَوْمَ أَيْنَ أَنَا غَدًا اسْتِبْطَاءً لِيَوْمِ عَائِشَةَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي[٧]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە نەخۆشییەکەیدا هەر ڕۆژە بە سەرە لەماڵی ژنێکی دەبوو، دەیفەرموو: سبەینێ لەلای کێم، دووسبەی لەلای کێم بۆیە وای دەفەرموو چونکە حەزی لە ماڵی من بوو، کە سەرەی ڕۆژی من هات ئیتر لەلای من گلی خواردەوەو ماڵەو ماڵی نەکرد بەپێی نۆرە ڕۆژی ژنەکانی، ئیتر خۆم خزمەتم کرد هەتا مردو شاد بوو بە دیداری پەروەردگاری (ب/م) گفتەی (م): چاوەنواڕی ڕۆژی من بوو، بۆیە دەیفەرموو: ئەمڕۆ لە کوێم، سبەینێ لەکوێ دەبم پەلەی ڕۆژی سەرەی منی بوو، ئیتر لە ڕۆژی سەرەی خۆمدا لەباوشمدا، پشتی پیرۆزی دابوو بە سینگ‌و بەرۆکمەوە کە خودای مەزن گیانی کێشاو ڕۆحی موبارەکی سەند. بە بۆنەی ئەم فەرموودە پیرۆزەیەوە هەزاران دروودو سڵاو دەنێرم بۆ مەزاری گیانی حەزرەت‌و کەسوکاری نازداری‌و دەڵێم:

رازێکـــی ســـەیرە پرســـی نـــەمجارە:

---

[٧] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧٧٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٤٣.

داوای دۆست لە دۆست رۆحی نازدارە؟

دەرمانی دەردی نوشتووی یەزدان بوو

سەر قەڵەمانەی رۆحی رەوان بوو!!

سپاردی گیانی لە كۆشی یارا

لەگەڵ یارەكەی بە خودای دارا!!

٣٤٣٧- وَعَنْهَا قَالَتْ: كنت ألعب بالبنات عند رَسُولَ اللّٰـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَتْ تَأْتِينِي صَوَاحِبِي فَكُنَّ يَنْقَمِعْنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَ يُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ»[٨]:

دیسان گوتی: كە لەلای حەزرەت بووم (دروودی خودای لەسەربێ) بە بوكڵە یاریم دەكرد، دەستە خوشكەكانم دەهاتن بۆ لام، بووكبووكێنەمان دەكرد، كە چاویان بە حەزرەت دەكەوت شەرمیان لێ دەكردو لە ئاستی ئەو خۆیان دەشاردەوە، ئەویش رێی بۆ چۆڵ دەكردن‌و رەتی دەكردن بۆ لای من (م).

٣٤٣٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى ». قَالَتْ فَقُلْتُ مِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ لاَ وَرَبِّ مُحَمَّدٍ، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى قُلْتِ لاَ وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ. قَالَتْ قُلْتُ أَجَلْ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَهْجُرُ إِلاَّ اسْمَكَ. رواهما مسلم[٩]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: من دەزانم كە تۆ لێم رازیت یا لێم دڵگیریت گوتم: ئەوە بە چیا دەزانیت؟ فەرمووی: ئەگەر رازی بی لێم ئەوا دەڵێی: نا، بە خودای موحەممەد، بەڵام ئەگەر لێم زیزبیت دەڵێی: نا، بە خودای ئیبراهیم گوتم: ئەرێ بە خودا ئەی پێغەمبەری

---

[٨] مسلم. فضائل الصاحبة: ٦٢٣٧.

[٩] بخاری. نكاح: ٥٢٢٨. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٣٥ = تجريد/ ٥ ل — ٥٠ ژمارە/ ١٧٨١ = ٥٢٢٨ ، ٦٠٧٨ فتح الباری.

خودا! بەس ناوەكەت نایەت بەسەر زارما ئەگینا خۆشەویستیی تۆ هەمیشە وا لە ناو دڵما (م–ب).

٣٤٣٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا أَشْكَلَ عَلَيْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدِيثٌ قَطُّ فَسَأَلْنَا عَائِشَةَ إِلاَّ وَجَدْنَا عِنْدَهَا مِنْهُ عِلْمًا. رواه الترمذي بسند صحيح[١٠]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئێمە خۆمان كە یارانی پێغەمبەرین (دروودی خودا لەسەر خۆیی‌و رەزای خودا لەسەر یارانی بێ) هەرچەند كە فەرموودەیەكمان لێ دەئاڵۆسكا كە لە عائیشەمان دەپرسییەوە ئەو بە باشی دەیزانی (ت–س/ص).

٣٤٤٠- قال المؤلف – نور الله ضريحه – في شرحه عَلى تأليفه هذا: وروى: (خذوا نصف دينكم عَنْ هذه الحمراء) يريد عائشة ذات اللّون المشرب بحُمرةٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنهُا وَأرضاها) آمين[١١]:

دانەر (پڕ گلكۆكەی لە بلێسەی نووری خودا بێ) لە راڤەكەیدا دەڵێ: دەگێڕنەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمویەتی: نیوەی ئایینی خۆتان لەم ژنە سووركەلەیە وەربگرن واتە: لە عائیشە، كە ئافرەتێكی سوورو سپی بووە (غایەتولمەئموول).

## ٣٨) چاكێتی خاتوو سەودەی كچی زەمعە (خودای لێ رازی بێ)
## فضل سودة بنت زمعة (رضی الله تعالى عنها)

٣٤٤١- ⬅ (ب – ٣ ز – ٥٠ ل- ١٢٨ ف – ٥ = ژ: ٥ / ٢١٧٥).

---

(١٠) صحيح عند الترمذي.

(١١) سكت عن درجته الشارح.

## ٣٩) چاكێتیی خاتوو ئوممو سەلەمەو ئوممو حەبیبە (خودایان لێ رازی بێ)
## فضل أم سلمة (رضي الله تعالى عنها)

٣٤٤٢- عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لاَ تَكُونَنَّ إِنِ اسْتَطَعْتَ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ السُّوقَ وَلاَ آخِرَ مَنْ يَخْرُجُ مِنْهَا فَإِنَّهَا مَعْرَكَةُ الشَّيْطَانِ وَبِهَا يَنْصِبُ رَايَتَهُ. قَالَ سَلْمَانُ: وَأُنْبِئْتُ أَنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ أَتَى نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ أُمُّ سَلَمَةَ قَالَ: فَجَعَلَ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ قَامَ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأُمِّ سَلَمَةَ مَنْ هَذَا؟ أَوْ كَمَا قَالَ، قَالَتْ: هَذَا دِحْيَةُ الكَلْبِيُّ قَالَ: فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: ايْمُ اللَّهِ مَا حَسِبْتُهُ إِلاَّ إِيَّاهُ حَتَّى سَمِعْتُ خُطْبَةَ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخْبِرُ خَبَرَنَا. أَوْ كَمَا قَالَ، فَقُلْتُ لِأَبي عثمان: مِمَّنْ سَمِعْتَ هذا؟ قَالَ: مِنْ أُسَامَةَ بن زيدٍ. رواه مسلم. وتقدَّمَ حديث زَوَاجِ أُمِّ حَبِيبَةَ بالنبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَابِ الصداق مِن النِّكَاحِ[1]:

سەلمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەگەر بۆت دەكرێ نە یەكەم كەسبە كە بچی بۆ بازاڕو نە دواهەمین كەسیش بە كە لە بازاڕ دەرچی چونكە بازاڕ مەیدان‌و شەڕگای شەیتانەو شەیتان ئالای سووپای خۆی لەوێ هەڵ دەدات، سەلمان دەیگوت: هەواڵم زانیوە كە جارێ جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) دێ بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەست دەكا بە گفتوگۆ لەگەڵیا ئوممو سەلەمەش لەو كاتەدا لە خزمەتیا دەبێ، لەپاشا جوبرائیل هەڵدەستێ‌و دەڕوا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئوممو سەلەمە دەفەرموێ: دەزانی ئەمە كێ‌بوو؟ یا شتێكی ئاوای پێ دەفەرموێ، ئوممو سەلەمەش دەڵێ: ئەمە دیحیەی ئەلكەلبی بوو. ئوممو سەلەمە دەیگوت: بە خودا سا لە راستیدا هەر بە دیحیەم دەزانی هەتا ئەو دەمەی گوێم لە ووتاری پێغەمبەر بوو، باسی ئەم هەواڵەی ئێمەی دەگێڕایەوەو باسی ئەم هاتنەی جوبرائیلی دەكرد، یا شتێكی لەم بارەیەوە فەرموو، گوتم بە ئەبو عوثمان: تۆ ئەم فەرموودەیەت لە كێ بیستووە؟ گوتی: لە ئوسامەی كوڕی زەید (م)، باسی شووكردنی ئوم حەبیبە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەم شوێنەدا رابورد، باسی مارەیی = ٣ / ٢٠٩٤ ز: ٣٣ بەرگی / ٣.

---

[1] مسلم. فضائلك ٦٢٦٥. بخاري. مناقب:٣٦٣٤، ٤٩٨٠.

## ٤٠) چاکێتیی زەینەبی کچی جەحش (خودای لیٚ رازی بیٚ)
## فضل زينب بنت جحش (رضى الله تعالى عنها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا – صدق الله العظيم – ٣٧/٣٣}.

خودای مەزن دەفەرمویٚ: پاش ئەوەی زەیدی کوڕی حاریثە ژنەکەی خۆی تەلاّقدا، کە ناوی زەینەبی کچی جەحش بوو، کە لەسەر فەرمانی تۆ بە نابەدڵ شووی کردبوو بە زەید، وە لەپاش ئەوە کە بەپێی شەریعەتی ئیسلام حەیە (عیددە)ی هەڵهات ئێمە دڵیمان هێنایەوە جێی خۆی‌و هەقمان بۆ کردەوەو لە تۆمان مارەکردو نازناوی ئوممولموئمینینی پیٚ بڕا.

٣٤٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَسْرَعُكُنَّ لَحَاقًا بِي أَطْوَلُكُنَّ يَدًا. قَالَتْ: فَكُنَّ يَتَطَاوَلْنَ أَيَّتُهُنَّ أَطْوَلُ يَدًا. قَالَتْ فَكَانَتْ أَطْوَلَنَا يَدًا زَيْنَبُ لأَنَّهَا كَانَتْ تَعْمَلُ بِيَدِهَا وَتَصَدَّقُ. رواه مسلم والبخاری[1]:

عائیشە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: هەندیٚ لە هاوسەرەکانی حەزرەت (درودی خودای لەسەربیٚ) عەرزیان کرد: لەپاش مردنی تۆ کاممان زووتر دەمرین‌و بە خزمەتت دەگەینەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: ئەوەتان کە دەستی درێژترە زووتر دەگاتەوە بەمن عائیشە گوتی: ئیتر ژنەکانی باسکی خۆیان بە تەڵیٚ قامیش دەپێوا هەتا بزانن دەستی کامیان درێژترە بەلاّم لە دواییدا دەرکەوت مەبەستی حەزرەت لە دەستی درێژ خێرەومەندی‌و بەخشندەییە، چونکە سەودە لە هەموویان باسکی درێژتر بوو، بەلاّم زەینەب لە پێشی هەموویانا عەمری خوای کرد دیاربوو کە دەستدرێژییەکەی زەینەب برێتی بوو لە خێرەومەندی‌و خێرخوایی، چونکە هەمیشە بە دەستی خۆی ئیشی دەکردو کۆی دەکردەوەو دەیکرد بە خێرو چاکە (م/ب).

---

[1] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٦٦.

## ٤١) چاكێتیی صەفییەی كچی حوییە (خودای لێ رازی بێ)
## فضل صفية بنت حيي (رضى الله تعالى عنها)

٣٤٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَلَغَ صَفِيَّةَ أَنَّ حَفْصَةَ قَالَتْ: إِنَّهَا بِنْتُ يَهُودِيٍّ. فَبَكَتْ فَدَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهِيَ تَبْكِي فَقَالَ: مَا يُبْكِيكِ. فَقَالَتْ: قَالَتْ لِي حَفْصَةُ إِنِّي بِنْتُ يَهُودِيٍّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّكِ لاَبْنَةُ نَبِيٍّ وَإِنَّ عَمَّكِ لَنَبِيٌّ وَإِنَّكِ لَتَحْتَ نَبِيٍّ فَفِيمَ تَفْخَرُ عَلَيْكِ. ثُمَّ قَالَ: اتَّقِي اللَّهَ يَا حَفْصَةُ وَفي رِواية: بَلَغَنِي عَنْ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ أَنَّهُمْ قَالُوا: نَحْنُ أَكْرَمُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ صَفِيَّةَ نَحْنُ أَزْوَاجُهُ وَبَنَاتُ عَمِّهِ. فَدَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: أَلاَ قُلْتِ فَكَيْفَ تَكُونَانِ خَيْرًا مِنِّي وَزَوْجِي مُحَمَّدٌ وَأَبِي هَارُونُ وَعَمِّي مُوسَى. رَوَاهُ الترمذى بسند صحيح[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: قسە دەگاتەوە بە صەفییە كە گوایە حەفصە دەڵێ: صەفییە بنەجووە، ئەویش لە داخا دەست دەكا بە گریان، لەوكاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەچی بە سەریا، دەفەرموێ: ئەوە بۆچی دەگری؟ دەڵێ: حەفصەی ژنت پێم دەڵێ: من كچە جوولەكەم‌و تانەی بنە جووییم لێ دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: تۆ هەم كچی پێغەمبەریت‌و هەم مامەت پێغەمبەر بووەو هەم ژنی پێغەمبەریت، ئیتر حەفصە شانازی چی بەسەر تۆدا دەكا! لەپاشا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە حەفصە دەفەرموێ: ئەی حەفصە! لە خودا بترسە! لە گێڕانەوەیەكا: دەڵێن حەفصەو عائیشە دەڵێن: لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئێمە لە صەفییە بە قەدرترین چونكە ئێمە وەك ژنی ئەوین ئامۆزاو كەس‌و كاریشین. صفیە گوتی: كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام ئەمەم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: ئەدی تۆ بۆ نەتگوت: منێك كە مێردم موحەممەد بێ‌و باوكم هاروون بێ‌و مامەم مووسا بێ ئیتر چۆن ئێوە لە من باشتر دەبن (ت–س/ص).

---

[١] صحيح السند عند الترمذي.

تا ئێرە باسی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەواو دەبێ کە یەکێکی تریان حەپسە خانی کچی ئیمامی عومەرە گشتیان لە هۆزی قورەیشن سەفییە نەبێ، هەمووشیان کۆچکارن خەدیجە خان نەبێ، چونکە ئەو لەپێش کۆچ کردندا ئەمری هەقی بەجێ هێنا لە مەککە. خودا لە هەموویان رازی بێ و ئێمەش لە بەهەشتا لەم دایکانەمان دانەبڕێ:

سەرای هاوسەری و زیاد لە هاوڕێتی
لەگەڵ سیفەتی کەسوکارێتی
بڕی بە باڵای کاڵای دایکێتی
گشت هاوسەرێکی پاکی حەزرەتی
کیان بە قوربانی خۆی و خێزانی
لەگەڵ یارانی کیانی بەکیانی
سەدجار دەرم کەن لە قاپی خۆیان
دڵ دەبەم دەیکەم بە دەرکەوانی

١٩٨٩/١/٦

### ٤٢) چاکێتیی ئوممو ئەیمەن کە لەلەو ئازادکراوی پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خوداش لەسەر ئەوبێ)

### فضل أم أيمن مولاة النبي (صَلَّى الله تعالى عَلَيهِ وسلم)

٣٤٤٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ وكنت مَعَهُ فَنَاوَلَتْهُ إِنَاءً فِيهِ شَرَابٌ، فَلاَ أَدْرِى أَصَادَفَتْهُ صَائِمًا أَوْ لَمْ يُرِدْهُ فَجَعَلَتْ تَصْخَبُ عَلَيْهِ وَتَذَمَّرُ عَلَيْهِ:[1]

---

[1] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٦٧.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (درودو سلاوو رەحمەت‌و میهری خودای گەورەی لەسەر بێ) چوو بۆ لای ئوممو ئەیمەن، ئوممو ئەیمەن جامێ خواردنەوەی هێنا بۆی، جا نازانم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وا رێکەوت لەوکاتەدا بە رۆژوو بوو، یا لەبەر هەر هۆیەکی تر شتەکەی نەخواردەوە، ئیتر ئوممو ئەیمەن دەستی کرد بە بۆڵە بۆڵ بەسەر پێغەمبەرداو لێی توند بوو چونکی دایەنی بوو، نازی هەبوو لەلای (م) ئیمامی نەوەوی (نوقمی لێشاوی میهری خودا بێ) لە شەرحی صەحیحی موسلیما لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا لەم باسەدا دەڵێ: وكانت تدل عَلَيهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لكونها حضنته وربته (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وجاء في الحديث: (ام ايمن امي بعد امي). واتە: ئوممو ئەیمەن نازی بەسەر حەزرەتدا (درودی خودای لەسەربێ) دەکرد، چونکی دایەنی بووەو پەروەردەو گەورەی کردووە دایکی شیریی بووە. لە حەدیثا هەیە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: لە دوای دایکم ئوممو ئەیمەن دایکی منە. (وەرگێڕ)

٣٤٤٦- وَعَنْهُ قَالَ: قالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) بَعْدَ وَفَاةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا كَمَا كَانَ النَّبِيّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزُورُهَا. فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ فَقَالاَ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ مَا عِنْدَ اللّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: مَا أَبْكِي لَجهلي بِذَلِكَ وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ. فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ فَجَعَلاَ يَبْكِيَانِ مَعَهَا. رواهما مسلم[٢]:

دیسان دەڵێ: لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەبو بەکر بە عومەری گوت: وەرە با بچین بۆ دێنیی ئوممو ئەیمەن وەك ئەوسا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دێنیی ئەوی دەکرد، جا کە گەیشتینە لای دەستی کرد بە گریان، ئەوانیش پێیان گوت: بۆ دەگری؟ لای خودا باشترە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: خۆ من لەبەرئەوە ناگریم کە ئەوە نەزانم، بەڵام بۆیە

---

[٢] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٦٨.

دەگریم چونکە ئیتر سرووش لە ئاسمان نایەتە خوارەوە، کەوای گوت: ئەوانیش دڵیان پڕبوو، هەردووکیان لەگەڵیا دەستیان کرد بە گریان! (م).

## ٤٣) چاکێتیی ئوممو سولەیم (خودای لێ رازی بێ)
## فضل أم سليم (رضى الله تعالى عنها)

٣٤٤٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَدْخُلُ عَلَى أَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِ إِلاَّ أُمِّ سُلَيْمٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَدْخُلُ عَلَيْهَا فَقِيلَ لَهُ فِى ذَلِكَ فَقَالَ: إِنِّى أَرْحَمُهَا قُتِلَ أَخُوهَا مَعِى[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەدینەی نازدار جگە لە ژنەکانی خۆی بۆ ماڵی ژنی تر نەدەچوو بۆ ماڵی ئوممو سولەیمی دایکم نەبێ، بەڵام بۆ لای ئەو دەچوو بۆ ماڵەوە، کە لەم لایەنەوە پرسیاری لێ کرا فەرمووی: دڵم پێی دەسووتێ، بەزەویم پیادا دێتەوە، چونکە براکەی لەگەڵ مناو لە پێناوی ئیسلاما کوژراوە (م/ب).

٣٤٤٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْفَةً فَقُلْتُ مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحَانَ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. وَفِى رِوَايَةٍ: أُرِيتُ الْجَنَّةَ فَرَأَيْتُ امْرَأَةَ أَبِى طَلْحَةَ ثُمَّ سَمِعْتُ خَشْخَشَةً أَمَامِى فَإِذَا هُوَ بِلاَلٌ. روى مسلم هذه الثلاثة[2]:

➡ (ب- ٥ز- ٢٥ ژمارە: ٣٣٩٦/٣) لێرەدا وایە: دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: چوومە بەهەشت، چرپەیەکم بەرگوێ کەوت، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتیان: ئەوە غومەیصای کچی میلحانە کە دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە. لە گێڕانەوەیەکا: بەهەشتم پێ

---

[1] بخارى. جهاد: ٢٨٤٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٦٩

[2] تقدم فى المجلد الخامس، تسلسل/ ٢٥ رقم: ٣ / ٣٣٩٦.

نیشان درا، ژنەکەی ئەبو طەلحەشم لەوێ دی، لەپاشدا لەبەر دەممەوە خشپە خشپێ دەهات، تمەز ئەوە بیلالە! (م).

## ٤٤) بەشی شەشەم: باسی پاکژی‌و گەورەیی یاریدەدەران (أنصار) (رەزای خوایان لێبێ)

## الفصل السادس: في فضائل الأنصار (رضي الله عنهم)

{قَالَ اللهُ تَعَالَى: وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ – صدَقَ الله العظيم – ٩/٥٩}.

خودای گەورە دەفەرموێ: وە بۆ ئەو موسوڵمانە یاریدەدەرانەیشە کە لەپێش کۆچ‌و رەوی کۆچکەرانا بۆ شاری مەدینە ئەوان لەوێ ماڵ‌و حاڵی خۆیان هەبوو لە خانەو لانەی خۆیانا دامەزرابوون، وە ئەمانیش بەر لە هاتنی ئەوان هۆگری ئیمان‌و ئیسلامەتی‌و باوەڕ بوو بوون وەك ئەوان، بۆیەکا کاتێ خەڵکی مەککەو کەسانی تر کۆچیان کرد بۆ لایان ئەوان زۆر بە گەرم‌و گوڕی‌و گەلێ بە سۆزو شەوق‌و خۆشەویستی‌و خۆشییەوە بەخێرهاتن‌و پێشوازییان لێ کردن‌و بەسەرو بە ماڵ تێ دەکۆشن بۆ خۆشی‌و کامەرانی ئەوان زیاتر لە خۆیان‌و هەرچی خێرو خۆشییەکی دین‌و دونیایان دەست کەوێ پێیان خۆشەو بەخیلی‌و حەسوودی‌و رژدییان پێ نابەن، با خۆشیان نەداراو کەم دەست بن لەگەڵ ئەوەشا هەر یاریدەو دەسگیرۆیی داماوان‌و لێقەوماوان پێش خۆیان دەخەن! بەڕاستی سەر بەرزو سەر فراز کەسێکە کە لە بەندی کۆت‌و زنجیری رژدی‌و چرووکی دەروونی خۆی رزگاری ببێ.

پێوەنـدو کـۆت‌و کەلەپـچەی شـەیتان

دەروونـی کـردووی بـە نـاخی زینـدان

کلیلـــی زینـــدان بـــە دەســـی خۆتـــە

گـەر نەیکەیتـەوە لـە پیـسی خۆتـە!

٣٤٤٩- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الأَنْصَارُ لاَ يُحِبُّهُمْ إِلاَّ مُؤْمِنٌ وَلاَ يُبْغِضُهُمْ إِلاَّ مُنَافِقٌ مَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللّهُ وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللّهُ. رواه الشيخان والترمذى[1]:

بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان یاریدەدەران (ئەنصار)ی خۆش دەوێ، ناپاك (دوو روو= مونافیق)یش رقی لێیانە، ئیتر ئەوەی ئەوانی خۆش دەوێ خوداش ئەوی خۆش دەوێ وە ئەوەی رقی لەوانە خوداش رقی لەوە (ش/ت).

٣٤٥٠- ⬅ (ب- ١ز- ٢ژ: ٤/٦)[2]:

٣٤٥١- وَعَنْهُ – أَىْ عَنْ أَنَسٍ – أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى صِبْيَانًا وَنِسَاءً مِنَ الأَنْصَارِ مُقْبِلِينَ مِنْ عُرْسٍ فَقَامَ مُمْثِلاً فَقَالَ: اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ ثَلاَثَ مِرارٍ[3]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كۆمەڵێ منداڵ و ژنی یاریدەدەرانی دی لەشایی و زەماوەند دەگەڕانەوە، رێك هەڵسایە سەر پێ و راست راوەستا و سێ جار فەرمووی: خودا ئاگای لێیە كە ئێوە لە خۆشەویستترین كەسانن لای من (ش).

٣٤٥٢- وَعَنْهُ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَخَلاَ بِهَا وَقَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. روى الشيخان هذه الثلاثة[4]:

---

[1] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٧٨٣ = مجلد/ ١٤٨٣ ب / ٤ ل – ١٧١.

[2] ب – ١ ز – ٢ ذ: ٤ / ٦.

[3] تجريد/ ٤ ل – ١٧١ ژ: ١٤٨٤ / ٣٧٨٥ ، ٥١٨٠.

[4] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٧٨٦ ، ٥٢٣٤ ، ٦٦٤٥ = تجريد/ ٤ ل – ١٧٢ ژ: ١٤٨٥ / ٣٧٨٦ ، ٥٢٣٤ ، ٦٦٤٥. مسلم. فضائل: ٦٣٦٦.

دیسان دەڵێ: ئافرەتێ (لە یاریدەدەران) هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قسەی لەگەڵ کرد، لەپاشا فەرمووی: بەوکەسە کە رەوانی من وا لە دەستیا ئێوە ئەی دەستەی یاریدەدەران! خۆشەویستترین کەسن لەلای من سێ جار وای فەرموو (ش).

٣٤٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ أَنَّ الأَنْصَارَ سَلَكُوا وَادِيًا أَوْ شِعْبًا، لَسَلَكْتُ فِي وَادِي الأَنْصَارِ، وَلَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ. رواه البخاری والترمذی[٥]:

ئەبو هورەیرە (خوای لێ خۆش نوود بێ) گوتی: حەزرەت (دروودو سلاوی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرمووی: یاریدەدەران لە هەر شیوو هەردێکەوە بڕۆن منیش لەوێوە دەڕۆم‌و خۆم لەوان جیا ناکەمەوە لەبەرئەوە نەبێ کە کۆچکەرو مشەخت‌و موهاجیرم دەنا بابایێ دەبووم لە یاریدەدەران!! (ب/ت- خودایان لێ رازی بێ).

٣٤٥٤- وَقِيْلُ لأَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ): أَرَأَيْتَ اسْمَ الأَنْصَارِ أَكُنْتُمْ تُسَمَّوْنَ بِهِ، أَمْ سَمَّاكُمُ اللّٰهُ؟ قَالَ: بَلْ سَمَّانَا اللّٰهُ عزَّ وَجَلَّ[٦]:

عەرزی ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) کرا: پێمان بفەرموو ئایا ناوی ئەنصار واتە: یاریدەدەرانی حەزرەت ئێوە خۆتان کردووتانە بە ناو بۆ خۆتان، یاخود خودا ناوی ناون ئەنصار؟ گوتی: خەیر، بەڵکوو خودای سەروەرو سەردار خۆی ئەو ناوەی لێ ناوین (ب- هەزار رەحمەت لە گیانی نازداری).

٣٤٥٥- ⬅ (ب - ٢ ز - ١٧٠ ژ - ٢ = رقم: ٢/ ١٩٠٧)[٧]:

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَتِ الأَنْصَارُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ لِكُلِّ نَبِيٍّ أَتْبَاعٌ، وَإِنَّا قَدِ اتَّبَعْنَاكَ، فَادْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَ أَتْبَاعَنَا مِنَّا. فَدَعَا بِهِ. قَالَ: اللّٰهُمَّ أَجْعَل اتباعهم منهم. روى البخاری هذه الثلاثة[٨]:

---

(٥) بخاری. مناقب الأنصار: ٣٧٧٩، ٧٢٤٤ = تجرید / ٤ ل - ١٧٠رقم: ١٤٨٢.

(٦) بخاری. مناقب الأنصار: ٣٧٧٦ ، ٣٨٤٤.

(٧) تقدم برقم: ٢ / ١٩٠٧ مجلد / ٢ تسلسل / ١٠.

زەیدی كوڕی ئەرقەم (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) گوتی: یاریدەدەران گوتیان: ئەی پیٚغەمبەری خودا! هەموو پیٚغەمبەریٚ لەكاتی خۆیا لایەنگیرو پەیڕەوانی تایبەتی خۆی هەبووە، ئیٚمەیش، پەیڕەوانی تۆین‌و شویٚن ڕیٚبازی پیرۆزی تۆ كەوتووین‌و خودا دەستی قەدری لیٚ ناوین‌و ناوی ناوین ئەنصار، جا بۆ ئەوەی ئەم ڕیٚزو قەدرو سەربەرزییە دەستو پیٚوەندەكانیشمان بگریٚتەوە لەگەڵ سویٚنخۆرەكانمانا دەی تۆ دووعاو نزامان بۆ بكە كە خودا دەستو پیٚوەندەكانیشمان لە خۆمان حلیٚب بكا، ئەویش ئەونزایەی بۆكردن‌و فەرمووی: خودایە! پەیڕەوانیان لە خۆیان بن (ب).

٣٤٥٦- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلأَبْنَاءِ الأَنْصَارِ. رواه مسلم والترمذى ولفظه: فَكَتَبَ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) لَعَزِيَةً لأَنَسٍ فَقَالَ: إِنِّى أُبَشِّرُكَ بِبُشْرَى مِنَ اللَّهِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلِذَرَارِيِّ الأَنْصَارِ وَلِذَرَارِيِّ ذَرَارِيِّهِمْ[٩]:

دیسان گوتی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: خودایە! لە یاریدەدەران خۆش بە، لە خۆیان، لە كوڕیان، لە كوڕی كوڕیان (م/ت- خودایان لیٚ ڕازی بیٚ) گفتەی (ت): زەیدی كوڕی ئەرقەم (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) پرسەنامەیەكی نووسی بۆ ئەنەس گوتی: مژدەی مزگیٚنیی خوداوەندت دەدەمیٚ، ژنەوتم لە زاری پیٚغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربیٚ) دەیفەرموو: خودایە!" خۆش ببە لە یاریدەدەران، لە خۆیان‌و لە وەچەیان‌و لە وەچەی وەچەیان!

٣٤٥٧- ولمسلم (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلِذَرَارِيِّ الأَنْصَارِ لِمَوَالِي الأَنْصَارِ[١٠]:

---

[٨] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٧٨٧ ، ٣٧٨٨ = تجريد / ٤ / ١٧٢ رقم: ١٤٨٦.

[٩] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٦٣. ترمذي. مناقب: ٣٩٠٢ م.

[١٠] مسلمز فضائل الصحابة: ٦٣٦٤.

گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پاڕایەوەو داوای لێخۆشبوونی كرد لە خودا بۆ یاریدەدەران، بۆ خۆیان‌و بۆ وەچەیان‌و بۆ ئازادكراوو دەستو پێوەندیشیان (م).

٣٤٥٨- وللترمذی: (رَضِي اللهُ عَنْهُ) اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَلأَبْنَاءِ الأَنْصَارِ وَأَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ وَلِنِسَاءِ الأَنْصَارِ[11]:

فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): خودایە! خۆش ببە لە یاریدەدەران لە خۆیان‌و لە كوڕیان‌و لە كوڕی كوڕیان‌و لە ژنیان‌و لە خاوو خێزانیان (ت- خوای لێ رازی بێ).

٣٤٥٩- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ دُورِ الأَنْصَارِ بَنُو النَّجَّارِ ثُمَّ بَنُو عَبْدِ الأَشْهَلِ ثُمَّ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ ثُمَّ بَنُو سَاعِدَةَ وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ. فَقَالَ: سَعْدٌ بنُ عُبَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ): مَا أُرَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلاَّ قَدْ فَضَّلَ عَلَيْنَا. فَقِيلَ: قَدْ فَضَّلَكُمْ عَلَى كَثِيرٍ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَقَالَ سَعِدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خَيَّرْتَ دُورَ الأَنْصَارِ فَجَعَلتنا آخِرا، فَقَالَ: أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الْخِيَارِ. رواه الشيخان والترمذی[12]:

➡ (ب- ٤ز- ١٠٣ رقم: ٣١٦٨/١) لێرەدا ئەم تۆزەی پترە: سەعدی كوڕی عوبادە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەبینم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) باوی زۆر كەسانی تری داوە بەسەر ئێمەدا، پێیان گوت: باوی ئێوەشی داوە بەسەر كەسانی تردا.

٣٤٦٠- عَنْ أَنَسَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ أَبُو بَكْرٍ وَالْعَبَّاسُ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) بِمَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الأَنْصَارِ وَهُمْ يَبْكُونَ، فَقَالَ مَا يُبْكِيكُمْ قَالُوا ذَكَرْنَا مَجْلِسَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَّا. فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَهُ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ عَصَبَ عَلَى رَأْسِهِ حَاشِيَةَ بُرْدِهِ فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ وَلَمْ يَصْعَدْهُ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ، فَحَمِدَ اللَّهَ

---

[11] سكت عنه الشارح.

[12] تقدم برقم: ١ / ٣١٦٨ مجلد / ٤ ل — ٣٣٠. چاپی یەكەم.

وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أُوصِيكُمْ بِالأَنْصَارِ، فَإِنَّهُمْ كَرِشِي وَعَيْبَتِي، وَقَدْ قَضَوُا الَّذِي عَلَيْهِمْ، وَبَقِيَ الَّذِي لَهُمْ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَتَجَاوَزُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ»[١٣].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو بەكرو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەچنە ناو كۆڕێ لە كۆڕی یاریدەدەران، دەڕوانن دەگرین، یەكێكیان لێیان دەپرسێ: ئەوە بۆ دەگرین؟! دەڵێن: یادی ئەو كاتانەمان كردۆتەوە كە لە خزمەتی پێغەمبەردا كۆڕمان دەبەست‌و لە ناو ئێمەدا دادەنیشت (ئێستاش دەترسین بەم ناساغیە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بمرێ) ئەویش دەچی بۆ لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ)و ئەمە باس دەكا بۆی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵ دەردەچێ، سەری بە پەراوێزی عاباكەی دەپێچێ، سەردەكەوێتە سەر دوانگە، كە ئەو جارە دواجار بوو بچێتە سەر دوانگە، لە پێشا سوپاس‌و ستایشی خودای كردو فەرمووی: ئامۆژگاری‌و راسپێریتان دەكەم كە زۆر باش بن بۆ یاریدەدەران، چونكە لە راستیدا ئەوان جەرگ‌و هەناوی منن‌و بوخچەی رازو نیازو جێی باوەڕی منن، ئەوان زۆر بە جوانی ئەركی سەرشانی خۆیان بە پیاوانە بەجێ هێناوە ماوەتەوە ئەوە كە هەقیان بۆ بكرێتەوەو تۆڵەی چاكەیان بدرێتەوە! دەی كەوایە رێزو قەدری چاكیان بگرن‌و چاوپۆشیش لە خراپیان بكەن (ب- رەحمەت لە كۆڕی نازداری).

٣٤٦١- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا)قَالَ: خَرَجَ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ مِلْحَفَةٌ، مُتَعَطِّفًا بِهَا عَلَى مَنْكِبَيْهِ، وَعَلَيْهِ عِصَابَةٌ دَسْمَاءُ حَتَّى جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَيُّهَا النَّاسُ، فَإِنَّ النَّاسَ يَكْثُرُونَ وَتَقِلُّ الأَنْصَارُ، حَتَّى يَكُونُوا كَالْمِلْحِ فِي الطَّعَامِ، فَمَنْ وَلِيَ مِنْكُمْ أَمْرًا يَضُرُّ فِيهِ أَحَدًا أَوْ يَنْفَعُهُ، فَلْيَقْبَلْ مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَيَتَجَاوَزْ عَنْ مُسِيئِهِمْ»[١٤].

---

[١٣] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨٠١ = تجرید / ٤ ل – ١٧٦ رقم: ١٤٩٠ / ٣٧٩٩ ، ٣٨٠١ مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٦٧. ترمذي. مناقب: ٣٩٠٧.

[١٤] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٧٩٩.

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ خۆش نوود بێ - ڕەزای خوایان لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە نەخۆشینی مەرگا لە ماڵ هاتە دەرێ، ساقۆیەکی ئالاندبوو بە خۆیەوە دابووی بەسەر هەردوو شانیدا، سەرپێچێکی ڕەشیشی پێچابوو بە سەریەوە، ڕۆیشت تا چوو لەسەر مینبەرەکە دانیشت و سوپاس و ستایشی خودای کردو فەرمووی: لە پاش سوپاس و ستایش، ئەی موسوڵمانینە! بزانن تا دێ خەڵکی تر زۆر دەبن، بەڵام یاریدەدەران بەرە بەرە کەم دەبنەوە چونکە لەهەر چوار لاوە خەڵك دێن و ئیسلام دەبن، بەڵام یاریدەدەران چینێکی تایبەتین، کە یەکێکیان لێ مرد یەکێکی تر نایەتە جێی، تاوای لێ دێ رۆژێ وەك خوێ ناوچێشتیان لێ دێ، جا ئەگەر کەسێ لە ئێوە بووبە سەرەوکاری کارێ وە دەیتوانی کە زیان یا سوود بە خەڵك بگەیەنێ ئەوە با چاکەی چاکیان وەربگرێ و چاو پۆشی لە خراپیان بکا (ب).

٣٤٦٢- ➡ (ب- ٢ز- ١٨٠ژ- ١= رقم: ١/١٩٣٧)[١٥]:

٣٤٦٣- وَعَنْهُ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِي كَمَا اسْتَعْمَلْتَ فُلاَنًا قَالَ: سَتَلْقَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الْحَوْضِ[١٦]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ لە یاریدەدەران گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! وەك فیسارە کەست کردووە بە سەرکار منیش بکە بە سەرکاری کارێ و لەسەر ئیشێ دامنێ، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئێوە دوای من تووشی خۆخۆیی و خۆپەرستی دەبن و نازی ئەم و ئەو دەدەن بە سەرتانا، جا لەکاتی وادا دان بە خۆتانا بگرن و صەبرو ئارام بکەن بە پیشەی هەمیشەو لەسەر پڕوپیتی جیهان ئاژاوە مەنێنەوە تا لە بەهەشتا لەسەر حەوزی کەوسەر بە خۆم دەگەنەوە (ب-خ= بوخاری خوای لێ رازی بێ).

---

[١٥] تقدم برقم: ١ / ١٩٣٧ مجلد/ ٢ تسلسل: ١٨٠.

[١٦] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٧٩٢ = تجريد / ٤ ل — ١٧٤ رقم: ١٤٨٨ / ٣٧٩٢ ، ٧٠٧٥. أحرجه مسلم فى الإمارة، باب الأمر بالصبر عند ظلم الولاه رقم: ١٨٤٥ (تجريد / ٤ / ١٧٤).

٣٤٦٤- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ تَقُولُ:

نَحْـــنُ الَّـــذِينَ بَـــايَعُوا مُحَمَّـــدَا عَلَـــى الْجِهَـــادِ مَـــا حَيِينَـــا أَبَـــدَا

فَأَجَابَهُمْ:

اللَّهُـــمَّ لاَ عَـــيْشَ إِلاَّ عَـــيْشُ الآخِـــرَهْ فَـــأَكْرِمِ الأَنْـــصَارَ وَالْمُهَـــاجِرَة

رواهما البخاری[١٧].

دیسان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە رۆژی رووداوی خەندەکا یاریدەدەران دەیانگوت:

نَحْـــنُ الَّـــذِينَ بَـــايَعُوا مُحَمَّـــدَا
عَلَـــى الْجِهَـــادِ مَـــا حَيِينَـــا أَبَـــدَا

واتە:

پەیمانەو دەیکەین لەگەڵ موحەممەد
خەبات دەگێڕین تا بەردی ئەڵحەد!

حەزرەتی موحەممەدیش (دروودی خودای لەسەربێ) وەرامی دەدانەوە دەیفەرموو:

اللَّهُـــمَّ لاَ عَـــيْشَ إِلاَّ عَـــيْشُ الآخِـــرَهْ
فَـــأَكْرِمِ الأَنْـــصَارَ وَالْمُهَـــاجِرَة

واتە:

ژین نەو ژینەیە وەک یاریدەران
لە بەهەشتا بێ‌و لەگەڵ کۆچکاران!

واتەی هەڵبەستی یەکەم بە پەخشان وایە: ئێمە کەسانێکین بەیعەت‌و پەیمانمان داوە بە موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر خەباتگێڕان‌و

[١٧] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٧٩٦.

تێكۆشان هەتا دوا دلۆپی خوێنمان. واتەی هەڵبەستی دووەمیش بە پەخشان وایە: ئەی خوایە! ژیان بڕێتییە لە ژیانی ڕۆژی دوایی، جا ئەی خودایە! لە هەردوو جیهاندا ڕێزی یاریدەدەران‌و كۆچكەران بگرە (ب- بوخاری خوای لێ ڕازی بێ).

٣٤٦٥- عَنْ أَبِي طَلْحَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اقْرَأْ قَوْمَكَ السَّلاَمَ فَإِنَّهُمْ مَا عَلِمْتُ أَعِفَّةٌ صُبُرٌ رواه الترمذی بسند حسن[١٨]:

ئەبو طەلحە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: سلاوی من بگەیەنە بە هۆزی خۆت، لە ڕاستیدا بە پێی ئاگای من‌و ئەوەی من بیزانم هۆزێكی دەست‌و دڵپاكن‌و ساغ‌و دروستن‌و خۆگرو بەصەبرو بە ئارامن (ت-س/ح= تیرمیذی ریوایەتی كردووە بە سەنەدێكی حەسەن).

## ٤٥) باسی مەزناهیی سەعدی كوڕی موعاز (خودای لێ ڕازی بێ) كە ئاغای خێڵی ئەوس بوو

### مناقب سعد بن معاذ سید الاوس (رضی الله عنه)

٣٤٦٦- ← (ب- ٤ز- ٢٩ژ: ٣= تقدم برقم: ٣/٢٧٦٤)[١].

٣٤٦٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: اهْتَزَّ الْعَرْشُ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ: اهْتَزَّ لَهَا عَرْشُ الرَّحْمَنِ. رواهما الخمسة إلا أبا داود[٢]:

← (ب- ١ز- ٢٢٤ژ-١٠= تقدم برقم: ١٠/١١٥٤) لە گێڕانەوەی ئێرەدا ئاوایە: جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: تەخت‌و بارەگای خودا كەوتە لەرزە بۆ

---

[١٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١] تقدم فی مجلد/ ٤ تسلسل/ ٢٩ رقم: ٣ / ٢٧٦٤.

[٢] تقدم فی مجلد الأول = ز- ٢٢٤ رقم: ١٠ / ١١٥٤.

مردنی سەعدی کوڕی موعاز. لە گێڕانەوەیەکا: گوتی: تەرمەکەی سەعدی کوڕی موعاز لەبەر دەممانا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تەخت‌و بارەگای خودای میهرەبان بۆی خورۆشاوە! (ش/ت/ن).

٣٤٦٨- وَقَالَ أَنَسٌ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): لَمَّا حُمِلَتْ جَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ قَالَ الْمُنَافِقُونَ: مَا أَخَفَّ هذِهِ. وَذَلِكَ لِحُكْمِهِ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ كَانَتْ تَحْمِلُهُ. رواه الترمذي بسند صحيح[٣]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە تەرمەکەی سەعد هەڵ دەگرن سووک دەبێ، ناپاکەکان دەڵێن: ئەم دارە تەرمە چەندە سووکە! لە دڵەوە مەبەستیان تانە دەبێ، وەك بڵێن سووکیی دارە تەرمەکەی بکەن بە نیشانەی سووکیی خاوەنەکەی لەلای خودا ئەوەش بۆیەکا وا دەڵێن لەداخی ئەو بڕیارەی کە سەعد دابووی دەربارەی بەنی قوریظة، کاتێ ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە فریشتە تەرمەکەیان هەڵگرتبوو بۆیە وا سووك بوو (ت-س/ص).

٣٤٦٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أُنَاسًا نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَجَاءَ عَلَى حِمَارٍ، فَلَمَّا بَلَغَ قَرِيبًا مِنَ الْمَسْجِدِ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قُومُوا إِلَى خَيْرِكُمْ أَوْ سَيِّدِكُمْ. فَقَالَ: يَا سَعْدُ، إِنَّ هَؤُلاَءِ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِكَ. قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ أَنْ تُقْتَلَ مُقَاتِلَتُهُمْ وَتُسْبَى ذَرَارِيُّهُمْ. قَالَ: حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللَّهِ، أَوْ بِحُكْمِ الْمَلِكِ. رواه الثلاثة والله أعلم[٤]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هۆزی بەنی قورەیزە کاتێ لەشکری ئیسلام دەورەیان دان‌و بیست‌و پێنج رۆژ گەمارۆی قەڵاکانیان دان، چاریان نەما رازی بوون بەوە کە سەعدی کوڕی موعاز هەر بڕیارو حوکمێ دەربارەی

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] بخاری. جهاد: ٣٠٤٣ (تجرید/ ٤ ل — ٢٩٣ رقم: ١٥٥٣). ٣٨٠٤ ، ٤١٢١ ، ٦٢٦٢. مسلم. جهاد: ٤٥٧١. ابو داود. أدب: ٥٢٥١ ، ٥٢١٦.

ئەوان دەرکا پێی رازی بن جا لە سەنگەرو قەڵاکانیان هاتنە دەرەوە، بەڵام لەو دەمەدا سەعد لەوێ نەبوو، چونکە لە غەزای خەندەقا زامار بوو بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ناردی بە شوێنیا، سەعد بە سواریی گوێدرێژێ هات، جا کە گەیشتە نزیکی مزگەوت (نوێژگا)کە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەڵسن بچن بە پیری چاکترین کەستانەوە یا فەرمووی: بچن بە پیری ئاغاتانەوە ئینجا فەرمووی: ئەی سەعد! ئەمانە تۆیان کردووە بە حەکەم‌و بە فەرمانڕەواو بە بڕیاری تۆ رازی بوون سەعدیش گوتی: دەوا من ئەم بڕیارەیان بۆ دەدەم: کە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن‌و خاو خێزانیشیان بە تاڵانی بگیرێن! فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): بەپێی فەرمانی خودا فەرمانت دا، یا فەرمووی: بەپێی فەرمانی پادشای گەورە کە خودایە فەرمانت دەرکرد (ش/د).

## ٤٦) چاکێتیی ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر (رەزای خوایان لێ بێ)
## فضل اسید بن حضیر وعباد بن بشر (رضی الله عنهما)

٣٤٧٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أُسَيْدَ بْنَ حُضَيْرٍ وَعَبَّادَ بْنَ بِشْرٍ تَحَدَّثَا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ سَاعَةٌ فِي لَيْلَةٍ شَدِيدَةِ الظُّلْمَةِ ثُمَّ خَرَجَا وَبِيَدِ كُلِّ واحِدٍ منهما عُصَيَّةٌ فَأَضَاءَتْ عَصَا أَحَدِهِمَا لَهُمَا حَتَّى مَشَيَا فِي ضَوْئِهَا حَتَّى إِذَا افْتَرَقَ بِهِمَا الطَّرِيقُ أَضَاءَتْ لِلآخَرِ عَصَاهُ فَمَشَى كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا فِي ضَوْءِ عَصَاهُ حَتَّى بَلَغَ إِلَى أَهْلِهِ[1]:

➡ (ب/٥ ز/١ ژ/٥/ تقدم برقم: ٣٢٢٥/٥) لە گێڕانەوەی ئەم شوێنەدا: ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر لە خزمەتی پێغەمبەردا دەبن، هەتا شەو درەنگ دەبێ خەریکی قسەو گوفتوگۆ دەبن، شەوەکەشی شەوەزەنگ دەبێ، کە لەلای پێغەمبەر (دروودی

[1] بخاری. مناقب: ٣٦٣٩ ، ٣٨٠٤. تقدم في المجلد الخامس تسلسل/ ١ رقم: ٥ / ٣٢٢٥.

خودای لەسەربێ) دەردەچن سەرو داردەستیان بە دەستەوە دەبێ، ئیتر بە فەرمانی خودا داردەستی یەکێکیان دەبێ بە چراو رۆشناییان بۆ دەکاو لەبەر شەوقەکەی دەڕۆن هەتا رێگەکەیان لە یەك جیا دەبێتەوە، ئەوجا داردەستی ئەوی تریشیان دەبێ بە چراو رۆشنایی دەکا بۆی، ئیتر هەرکەسەیان لەبەر شەوقی داردەستی خۆی دەڕوا تا دەگاتەوە ماڵی خۆی (ب- رەحمەت لە گۆڕی نازداری) ئێ، دنیا! فەقێ بووم لە مزگەوتی شێخ مەحموودی قەرەچێواری بووم، لە گەڕەکی چوار باغ لە سلێمانی، مامە شێخ حوسەینی قازانقایەیی هەبوو، پیاوێکی ئیختیاری سۆفیلکە بوو، نیمچە خوێنەوار بوو، بەڵام ئاگادارییەکی باشی لە حەدیثا هەبوو. پارشێوێ لە خزمەتیا گوتمان: دەبێ رەمەزانی ئایندە ئێمە لە کوێ بین؟ مامە شێخ حوسێن گوتی: من رەمەزانی ئایندە لە گردی سەیوان دەبم، ئێمەش وامانزانی مەبەستی ئەوەیە بە ماڵەوە دەچێ بۆ ئەوێ، کە لێمان روون کردەوە: قوربان! مەبەستت چییە؟ گوتی: ئێوە هەقتان چییە، بەخودا من جەژنی رەمەزانی ئایندە لە گردی سەیوان دەکەم. تەمەز مەبەستی مردن بوو، چونکە پێش رەمەزانێکی تر ئەمری خودای کردو لە گۆڕستانی سەیوان بە خاك سپێررا، وەڵێ بۆ گردەکە باش لە یادم نەماوە، نازانم گوتی: گردی سەیوان یان گوتی: گردی شێخ موحیەددین، ئێستا گۆڕەکەی لەو گۆڕستانەیە کە خۆی گوتی. بەڵام ئێمە کاتی خۆی کە لە ئامـاژەی قسەکەی تێ گەیشتین لەپاش مردنی و هەمووومان رەحمەتمان بۆینارد. هەزار رەحمەت لە گۆڕی ئەوو لە گۆڕی مامە شێخ مەحموودی قەرەچێواری. (وەرگێڕ)

## ٤٧) چاکیتیی سەعدی کوڕی عوبادە کەسەرۆکی هۆزی خەزرەج بوو (خوای لێ رازی بێ)
## فضل سعد بن عبادة رئيس الخزرج (رضى الله عنه)

٣٤٧١- ⬅ (ب- ٥ز- ز-٤٤ ژ - ١٢ تقدم برقم: ٣٤٥٩/١٢)[1]:

---

[1] تقدم فى المجلد/ ٥ تسلسل/ ٤٤ رقم: ٣٤٥٩/١٢.

لێرەدا لەپاش ووشەی: (فقال سعد بن عبادة) ئەم پترییەی هەیە: وكان ذا قدم في الاسلام. واتە: سەعدی کوڕی عوبادەش (خودای لێ ڕازی بێ) (کە پایەو شانێکی باشی هەبوو لە ئیسلامدا) گوتی...تاد.

٣٤٧٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ قَيْسَ بْنَ سَعْدٍ بِنْ عُبَادَةَ مِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَنْزِلَةِ صَاحِبِ الشُّرَطِ مِنَ الأَمِيرِ رَوَاهُ الترمذى بِسَنَدٍ حَسَنٍ. نسأل الله حسن الحال في الحال والمال[٢]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاربەدەستی باڵباز واتە: بەڕێوەبەری پۆلیس چۆنە بۆ فەرمانڕەوا قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەش بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەو پایەدا بوو (ت-س/ح).

## ٤٨) چاکێتیی موعازی کوڕی جەبەل‌و ئوبەییەی کوڕی کەعب‌و زەیدی کوڕی ثابیت (خودایان لێ ڕازی بێ):

## فضل معاذ بن جبل وأبى بن كعب وزيد بن ثابت (رضى الله تعالى عنهم)

٣٤٧٣- ➡ (ب- ٥ز- ٢٨ژ- ١ تقدم برقم: ٣٤٠١/١)[١].

٣٤٧٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْبَعَةٌ كُلُّهُمْ مِنَ الأَنْصَارِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ وَأَبُو زَيْدٍ. قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لأَنَسٍ: مَنْ أَبُو زَيْدٍ؟ قَالَ: أَحَدُ عُمُومَتِي. رواه الشيخان والترمذى[٢]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: بە سەرینیی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم چوار کەسەیە هەموو قورئانیان بە تەواوی لەبەربوو، وە هەر چواریشیان لە یاریدەدەران بوون: موعازی کوڕی جەبەل‌و ئوبەییەی کوڕی

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن.

[١] تقدم في مجلد/ ٥ تسلسل / ٢٨ رقم: ١ / ٣٤٠١.

[٢] بخارى. مناقب الأنصار، تجريد / ١٤٩٤ / ٢٨١٠ ، ٣٩٩٦ ، ٥٠٠٣ ، ٥٠٠٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٩٠. ترمذي. مناقب: ٣٧٩٤.

كەعب‌و زەیدی كوڕی ثابیت‌و ئەبو زەید. قەتادە گوتی: بە ئەنەسم گوت: ئەبو زەید كێیە؟ گوتی: ئامۆزایەكی من بوو (ش/ت).

٣٤٧٥- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ وَأَشَدُّهُمْ فِي دِينِ اللَّهِ عُمَرُ وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ وَأَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ وأَفْرَضُهُمْ زيد بْنُ ثابتٍ وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەبەزەیی ترین‌و بە رەحمترین كەس لە ئۆمەتم بە خودی ئۆمەتم ئەبو بەكرە، توندوتیژتریان لەسەر جێبەجێ كردنی فەرمانی خودا عومەرە، بە شەرموشكۆترین كەسیان عوثمانە، باشترین قورئان خوێنیان ئوبەییەی كوڕی كەعبە، باشترین فەرائیض زانیان زەیدی كوڕی ثابیتە زاناترین كەسیان بە دروست‌و نا دروست‌و بە حەڵاڵ‌و بە حەرام موعازی كوڕی جەبەلە (ت-س/ص).

٣٤٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نِعْمَ الرَّجُلُ أَبُو بَكْرٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ عُمَرُ، نِعْمَ الرَّجُلُ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ، نِعْمَ الرَّجُلُ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ مُعَاذُ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ رَوَاهُمَا الترمذى. نسأل الله حسن الرواية آمين[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەبو بەكر پیاوی چاكە، عومەر پیاوی چاكە، ئەبو عوبەیدە پیاوی چاكە، ئوسەیدی كوڕی حوضەیر پیاوی چاكە، ثابیتی كوڕی قەیسی كوڕی شەماس پیاوی چاكە، موعازی كوڕی جەبەل پیاوی چاكە، موعازی كوڕی عەمری كوڕی جەمووح پیاوی چاكە (ت-س/ح).

---

[٣] ترمذي/ سند حسن.

[٤] ترمذي/ سند حسن.

## ٤٩) چاكێتی ئەبو تەلحە (خودای لێ رازی بێ)
## فضل أبي طلحة (رضي الله تعالى عنه)

٣٤٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَمَ النَّاسُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو طَلْحَةَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُجَوِّبٌ عَلَيْهِ بِحَجَفَةٍ لَهُ، وَكَانَ أَبُو طَلْحَةَ رَجُلاً رَامِيًا شَدِيدَ الْقِدِّ، يَكْسِرُ يَوْمَئِذٍ قَوْسَيْنِ أَوْ ثَلاثًا، وَكَانَ الرَّجُلُ يَمُرُّ مَعَهُ الْجَعْبَةُ مِنَ النَّبْلِ فَيَقُولُ النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): انْشُرْهَا لأَبِي طَلْحَةَ. فَأَشْرَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْظُرُ إِلَى الْقَوْمِ، فَيَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، لاَ تُشْرِفْ يُصِيبُكَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ الْقَوْمِ، نَحْرِي دُونَ نَحْرِكَ. وَلَقَدْ وَقَعَ السَّيْفُ مِنْ يَدَيْ أَبِي طَلْحَةَ إِمَّا مَرَّتَيْنِ، وَإِمَّا ثَلاثًا. رواه الشيخان[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ڕۆژی ڕووداوی ئوحود، خەڵكەكە لە دەوری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵهاتن، بەڵام ئەبو طەلحە لەو كاتەدا بە قەڵخانەكەیەوە خۆی دەكا بە سوپەرو دەبێ بە سەنگەر بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەبو طەلحە پیاوێكی تیر ئەندازی ژێی كەوان قایم‌و توند بوو" ئەو ڕۆژە ئەوەندە بە توندی تیر دەهاوێژێ دوو كەوان یا سێ كەوان دەشكێنێ، پیاو هەبوو تیردان (تیركێش)ەكەی پڕبوو لەتیر، بە وێدا ڕادەبورد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی دەفەرموو: تیر كەشەكەت بۆ ئەبو طەلحە هەڵبڕژێرە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كاتێ خۆی بەرز دەكردەوەو سەری دەكێشا هەتا تەماشای تێكڕژانی هەردوولا بكاو تێ بگا لە بارو دۆخی جەنگ‌و بەیەكادانی پیاوان، ئەبو طەلحە بە پەرۆشەوە پێی دەگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! باوك‌و دایكم بە قوربانت بن، وامەكە، سەرمەكێشە، مەبادا تیرێكی دوشمن بت پێكێ، سینگی من قەڵغانی سینگی تۆیە، من لەشی خۆم كردووە بە قەڵغان‌و سەنگەری تۆ، ئەو ڕۆژە دووجار یا سێ جار شمشێر لە دەستی ئەبو طەلحە دەكەوێتە خوارەوە چونكە پاش ترس‌و بیمەكەی ڕۆژی ئوحود خودا بە كەرەمی خۆی ئەمن‌و ئاسایشی نارد بۆیان، بە ڕەنگێكی وا

---

[1] بخاري. جهاد: ٢٨٨٠ ، ٢٩٠٢ ، ٣٨١١ ، ٤٠٦٤ (تجريد/ ٤ / ١٨٠ رقم: ١٤٩٥ / ٣٨١١. مسلم. جهاد: ٤٦٦٠.

سەرەوەنەوز (نوعاس) گرتنی، ئەبو طەلحەش بەهۆی ئەو سەرەوەنەوزەوە شیرەکەی لە دەست دەکەویّ (ش- خوایان لیّ رازی بیّ).

٣٤٧٨- ➡ (ب- ٢ز- ١٨٢ژ- ١= تقدم برقم: ١/١٩٤٢)[٢]:

## ٥٠) چاکێتیی جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری (رەزای خوایان لیّ بیّ): فضل جابر بن عبدالله الانصاری (رضی الله عنهما)

٣٤٧٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بِرَاكِبِ بَغْلٍ وَلاَ بِرْذَوْنٍ[١]:

جابیر (خودای لیّ رازی بیّ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) بە پیّ هات بۆ دیدەنیم، نە بە سواری هێستر هات‌و نە بە سواری وولاٌخی تر (ت-س/ص).

٣٤٨٠- وَعَنْهُ قَالَ اسْتَغْفَرَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ الْبَعِيرِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ مَرَّةً[٢]:

دیسان گوتی: ئەو شەوەی کە وشترەکەمم فرۆشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) بیست‌و پێنج جار پاڕایەوە بۆم (ت-س/ص).

٣٤٨١- وَكَانَ النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَبَرُّ جَابِرًا وَيَرْحَمُهُ لأَنَّ وَلِدَهُ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ بَنَاتٍ فَكَانَ جَابِرٌ يَعُولُهُنَّ وَيَقُومُ بِأَمْرِهِنَّ. روى الترمذى هذه الثلاثة بأسَانِيدَ صَحِيحَةٍ [٣]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) گەلیّ باش بوو بۆ جابیر، هەمیشە بەزەیی پیادا دەهاتەوە، چونکە لە رۆژی ئوحوودا باوکی شەهیدبوو، چەند کچێکی لەپاش بە جێمابوون، جابیر خۆی بە خێوی دەکردن‌و سەرپەرشتی کاروباری دەکردن (ت-س/ص).

---

[٢] تقدم برقم: ١ / ١٩٤٢ فی مجلد / ٢ تسلسل / ١٨٢.

[١] رواه الترمذي بسند صحيح

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح.

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح.

## ٥١) چاكێتیی عەبدوڵڵای كوڕی عەمری باوكی جابیر (ڕەزای خوایان لێ بێ).
## فضل عبدالله بن عمرو والد جابر (رَضي اللّٰهُ عَنهُمَا)

٣٤٨٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ) قَالَ: أصيب أبي يوم أحُدٍ وجيء به مُجدَّعاً بين يدي النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَعَلْتُ أَكْشِفُ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ وَأَبْكِي، وَهُمْ يَنْهَوْنِي عَنْـهُ وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَنْهَانِي، وَجَاءَت فَاطِمَةُ بِنْتُ عمرو عَمَّةُ جَابِرٍ تَبْكِيـهِ، فَقَـالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تبكيهِ أَولا تبكيهِ، مَا زَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ تُظِلُّـهُ بِأَجْنِحَتِهَـا حَتَّـى رَفَعْتُمُوهُ. رواه مسلم[1]:

جـابیر (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: لـە ڕۆژی ئوحـوودا بـاوكم كـوژرا، كـە لاشەكەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لـووت‌و گوێیـان كردبـوو، منیش چووم سەرم هەڵ دایەوەو دەستم كرد بە گریان بۆی! خزمـان نـەیان دەهێـشت بـۆی بگـریم، بـەڵام پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) ئاگـای لـێم بـوو، قەدەغەی نەكردم، تا فاتیمەی كچی عەمر (كە پووری منە) هات‌و دەستی كرد بە گریـان بـۆی ئـەوسا حـەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: بـۆی بگریـت‌و بۆی نەگریت ئـەی فاتیمـە! چوونیەكە بۆ ئەو، چونكە بە پایـەو شـانی خـۆی گەیشتووە، ئەو فریشتە بە باڵیان سێبەریان بۆی كردبوو هەتا ئـەو كاتـەی كە هەڵتان گرت لەوجێیەی كە لێی شەهید كرابوو (م/ب).

## ٥٢) چاكێتیی سیماكی كوڕی خەرەشە (خودای لێ ڕازی بێ)
## فضل سماك بن خرشة (رَضِيَ اللّٰهُ تعالى عَنهُ)

٣٤٨٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَ سَـيْفًا يَـوْمَ أُحُدٍ فَقَالَ: مَنْ يَأْخُذُ مِنِّي هَذَا. فَبَسَطُوا أَيْدِيَهُمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ يَقُولُ أَنَا أَنَا. قَالَ: فَمَنْ

---

[1] بخاری. جنائز: ١٢٤٤ ، ١٢٩٣ ، ٢٨١٦ ، ٤٠٨٠ = تجرید / ٢ / ٢٥ ژمارە/ ٦٠٢ / ١٢٤٤. مسلم. فضائل الصحابة/ ٦٣٠٤. نسائی. جنائز: ١٨٤١.

يَأخُذُهُ بِحَقِّهِ. قَالَ: فَأَحْجَمَ الْقَوْمُ فَقَالَ سِمَاكُ بْنُ خَرَشَةَ أَبُو دُجَانَةَ: أَنَا آخُذُهُ بِحَقِّهِ. قَالَ: فَأَخَذَهُ فَفَلَقَ بِهِ هَامَ الْمُشْرِكِينَ. رواه مسلم[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە رۆژی ئوحوددا، شمشێرێكی هەڵگرت‌و فەرمووی: كێ ئەمەم لێ وەردەگرێ؟ هەموویان دەستیان بۆی درێژ كردو هەركەسە دەیگوت: من من، فەرمووی: بەڵام كێ بە مەرجی ئەوە وەری دەگرێ كە هەقی خۆی بداتێ؟ ئیتر كوڕگەل كشانەوە بەڵام ئەبو دوجانە، سیماكی كوڕی خەرەشە، گوتی: من وەری دەگرم‌و هەقی خۆیی دەدەمێ، گوتی: جا ئەو وەری گرت‌و كەللەی بتپەرستەكانی پێ یەكالا دەكردەوە! (م).

## ٥٣) چاكێتیی جولەیبیب (ڕەزای خوای لێ بێ)
## فضل جليبيب (رَضِي اللهُ تعالى عَنه)

٣٤٨٤- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِي مَغْزًى لَهُ فَأَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَقَالَ لأَصْحَابِهِ هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ؟ قَالُوا: نَعَمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَفُلاَنًا. ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ. قَالُوا: نَعَمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَفُلاَنًا. ثُمَّ قَالَ: هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ. قَالُوا لاَ. قَالَ: لَكِنِّي أَفْقِدُ جُلَيْبِيبًا فَاطْلُبُوهُ. فَطُلِبَ فِي الْقَتْلَى فَوَجَدُوهُ إِلَى جَنْبِ سَبْعَةٍ قَدْ قَتَلَهُمْ ثُمَّ قَتَلُوهُ فَأَتَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: قَتَلَ سَبْعَةً ثُمَّ قَتَلُوهُ هَذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ هَذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ. قَالَ: فَوَضَعَهُ عَلَى سَاعِدَيْهِ لَيْسَ لَهُ سَرِيرٌ إِلاَّ سَاعِدَيِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى حُفِرَ لَهُ وَوُضِعَ فِي قَبْرِهِ. وَلَمْ يَذْكُرْ غَسْلاً. رواه مسلم. نسأل الله كمال الطهارة[1]:

ئەبو بەرزە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە یەكێ لە غەزاواتەكانی خۆیدا بوو، خودا ماڵی تاڵانیی زۆری بە سەردا رژاندو تاڵانییەكی مفتی بۆ رەخسان، فەرمووی بە یارانی: ئایا هەیچ كەستان لێ كەم

---

[1] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٠٣.

[1] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٠٨.

بۆتەوە؟ عەرزیان کرد: بەڵێ، فیسارو ئەو فیسارو ئەو فیساری تریش دیارنین، هەمدیسان فەرموویەوە: ئایا کەسی تر ماوە کە دیار نەبێ؟ گوتیان: ئا، ئەو سێ کەسەیش دیارنین، هەمدیسان فەرموویەوە: دەی ئیتر کەسی تر ماوە کە بزربێ؟ گوتیان: خەیر، ئیتر کەس نەماوە کە دیار نەبێ، فەرمووی: با ماوە جولەیبیب لەبەر چاوم دیار نییە، ئادەی بچن بۆی بگەڕێن! کاتێ بۆی گەڕان لەناو کوژراوەکاندا بوو، دۆزییانەوە لە تەنیشتی حەوت کوژراوەوە بوو، کە هەر حەوتیان بە دەستی ئەو کوژرابوون، ئینجا خۆشی کوژرابوو، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چوو لە دیاری راوەستاو فەرمووی: حەوتی کوشتووە ئەوسا کوشتوویانە، ئەمە لە منەو من لەوم، ئەمە لە منەو من لەوم گوتی: ئیتر هەتا گۆڕیان بۆ هەڵکەندو نایانە ناو گۆڕەکەیەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەردوو باڵی خۆی بۆ راخستو لاشەکەیی لە باوەشی خۆیا لەسەر بازووەکانی دانا، لەوماوەیەدا جگە لە باسکەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هیچ تەختو رایەخێکی تری لە ژێردا نەبوو! ئەبو بەرزە باسی ئەوەی نەکرد کە ئایا" شۆردیان یان نا (م).

## ٥٤) چاکێتیی ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ)
## فضل أنس بن مالك (رَضِي اللّهُ تعالى عَنه)

٣٤٨٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْنَا وَمَا هُوَ إِلاَّ أَنَا وَأُمِّي وَأُمُّ حَرَامٍ خَالَتِي فَقَالَتْ أُمِّي: يَا رَسُولَ اللَّهِ خُوَيْدِمُكَ ادْعُ اللَّهَ لَهُ قَالَ: فَدَعَا لِي بِكُلِّ خَيْرٍ وَكَانَ فِي آخِرِ مَا دَعَا لِي بِهِ أَنْ قَالَ: اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ وَبَارِكْ لَهُ فِيهِ. رواه مسلم[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هات بۆ ماڵمان، بەس منو دایکمو ئوممو حەرامی پوورم بووین، دایکم گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ نۆکەرە بچکۆلەکەی خۆت ئەنەسی خزمەتکارت نزاو

---

[1] بخاري. دعوات: ٦٣٧٨ ، ٦٣٧٩. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٢٢. ترمذي. مناقب ٣٨٢٩.

دووعا بکە، ئەنەس گوتی: ئیتر ئەوەی نزای باش بێ بۆیکردم‌و دوا نزای ئەوەبوو فەرمووی: ئەی خودایە! ماڵ‌و منداڵی زۆری بدەری‌و پیت‌و فەڕی بۆ تێخە! (م).

٣٤٨٦- وَعَنْهُ قَالَ: جَاءَتْ بِي أُمِّي أُمُّ أَنَسٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ أَزَّرَتْنِي بِنِصْفِ خِمَارِهَا وَرَدَّتْنِي بِنِصْفِهِ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا أُنَيْسٌ ابْنِي أَتَيْتُكَ بِهِ يَخْدُمُكَ فَادْعُ اللَّهَ لَهُ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ. قَالَ أَنَسٌ: فَوَاللَّهِ إِنَّ مَالِي لَكَثِيرٌ وَإِنَّ وَلَدِي وَوَلَدَ وَلَدِي لَيَتَعَادُّونَ عَلَى نَحْوِ الْمِائَةِ الْيَوْمَ[٢]:

دیسان گوتی: دایکم نیوەی سەرپۆشەکەی خۆی وەك کراس ئاڵان بە لای سەرووی لەشمەوە، ئەو نیوەکەی تریشی لە باتی دەرپێ پێچا بەلای خوارووی لەشمەوە‌و ئینجا بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە نەسەکەی کوڕمە، هێناومە کە خزمەتت بکا، لە خودا بپاڕێرەوە بۆی فەرمووی: خودایە! ماڵ‌و منداڵی زۆری بدەرێ ئەنەس دەیگوت: دەی بەخودا بە راستی ماڵم زۆرە، بۆ منداڵیش ئەمڕۆکە منداڵ‌و وەچەو نەوەی خۆم دەوری سەدکەس دەبن (م/ت).

٣٤٨٧- وَعَنْهُ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ صَوْتَهُ فَقَالَتْ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ هذَا أُنَيْسٌ. فَدَعَا لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَ دَعَوَاتٍ قَدْ رَأَيْتُ مِنْهَا اثْنَتَيْنِ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَرْجُو الثَّالِثَةَ فِي الآخِرَةِ. رواهما مسلم والترمذی[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رەت بوو، ئوممو سولەیمی دایکم گوێی لە دەنگی بوو، گوتی: ئەی رەوانەکراوی خودا! باوك‌و دایکم بە صەدەقت بن، ئەمە ئەنەسۆڵەیە نزای بۆ بکە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ)

---

[٢] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٢٦. ترمذي. مناقب: ٣٨٢٧.

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٢٧. ترمذي. مناقب: ٣٨٢٧.

سێ نزای بۆ کردم، دوانیانم بە چاوی خۆم دیوە لەم دنیادا هاتوونەتە دی، ئومێد دەکەم کە سێیەمیشیان لە قیامەتا بێتە دی! (م/ت).

٣٤٨٨- وَعَنْهُ قَالَ: أَتَى عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا أَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ فَسَلَّمَ عَلَيْنَا فَبَعَثَنِي إِلَى حَاجَةٍ فَأَبْطَأْتُ عَلَى أُمِّي فَلَمَّا جِئْتُ قَالَتْ: مَا حَبَسَكَ؟ قُلْتُ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِحَاجَةٍ. قَالَتْ: مَا حَاجَتُهُ؟ قُلْتُ: إِنَّهَا سِرٌّ. قَالَتْ: لاَ تُحَدِّثَنَّ بِسِرِّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَدًا. قَالَ أَنَسٌ: وَاللَّهِ لَوْ حَدَّثْتُ بِهِ أَحَدًا لَحَدَّثْتُكَ يَا ثَابِتُ[٤]:

ثابیتی بەنانی لە ئەنەسەوە (خوایان لێ رازی بێ) دەڵێ: ئەنەس گوتی: لە ناو منالاًندا گەمەم دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام، سلاًوی لێ کردین‌و منی نارد بۆ فرمانێ، لەپاشا درەنگ چوومەوە بۆ لای دایکم، دایکم گوتی: بۆ وا درەنگت پێ چوو؟ گوتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ناردمی بۆ فرمانێ، گوتی: فرمانەکەی چی بوو؟ گوتم: شتێکی نەهێنییە. گوتی: رازو نەهێنیی پێغەمبەر بە کەسی تر مەڵێ. ئەنەس گوتی: ئەی ثابیت! بە خودا ئەو نهێنییەم ئەگەر بۆ کەسێکی تر بگێرایەتەوە بۆ تۆم دەگێرایەوە (م).

٣٤٨٩- وَعَنْهُ قَالَ: أَسَرَّ إِلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سِرًّا فَمَا أَخْبَرْتُ بِهِ أَحَدًا بَعْدَهُ. رواهما مسلم[٥]:

دیسان ئەنەس گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قسەیەکی نهێنی لەلام درکاند، هێشتا بۆ کەسم نەگێراوەتەوە (م).

٣٤٩٠- وَعَنْهُ قَالَ: رُبَّمَا قَالَ لِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا ذَا الأُذُنَيْنِ[٦]:

دیسان گوتی: گەلێ جاری وا دەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی دەفەرمووم: ئەی ماخۆ (خاوەن)ی دوو گوێ! (ت-ص).

---

[٤] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٢٨.

[٥] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨١٢. مسلم. فضائل الصحابة/٦٣٢٧.

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٣٤٩١- عَنْ ثَابِتٌ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ لِي أَنَسُ: يَا ثَابِتُ خُذْ عَنِّي فَإِنَّكَ لَنْ تَأْخُذْ عَنْ أَحَدٍ أَوْثَقَ مِنِّي إِنِّي أَخَذْتُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ جِبْرِيلَ وَأَخَذَهُ جِبْرِيلُ عَنِ اللَّهِ تَعَالَى. رواهما الترمذي[٧]:

ثابیت (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەنەس پێی گوتم: ئەی ثابیت! زانست‌و ئایین لە من وەربگرە، چونكە كەسێكی ترت دەست ناكەوێ كە وەك من جێگەی باوەڕ بێ، چونكە من فەقێی پێغەمبەر بووم‌و لەوزاتە لە خۆیم وەرگرتووە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) شاگردی جوبرائیل بووەو لەوی وەرگرتووە، جوبرائیلیش (درودی خودای لەسەربێ) لە خودای گەورەی وەرگرتووە (ت-ح).

ئەنەسی هەتیو، فەقێی پێغەمبەر
بە سوختەیی ئەو خۆی بوو بە سەروەر
بوو بە كڕیاری هەزاران گەوهەر
هەیشە گەوهەرە خۆی دەكا بە هەر
كەواتە كاكە خۆت لە هەڕ جیاكە
ببە بە گەردێ لە ناو ئەو خاكە
وا لە دەرماڵی ئەو پیاوە چاكە
كەوا ماڵەكەی وا لە (بەغا) كە[١]

## ٥٥) چاكێتیی حوزەیفەی كوڕی یەمان (خودای لێ ڕازی بێ)
## فضل حذيفة بن اليمان (رَضِي اللهُ تعالى عَنْه)

٣٤٩٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ هُزِمَ الْمُشْرِكُونَ هَزِيمَةً بَيِّنَةً، فَصَاحَ إِبْلِيسُ أَيْ عِبَادَ اللَّهِ أُخْرَاكُمْ، فَرَجَعَتْ أُولاَهُمْ عَلَى أُخْرَاهُمْ، فَاجْتَلَدَتْ مَعَ أُخْرَاهُمْ، فَنَظَرَ حُذَيْفَةُ، فَإِذَا هُوَ بِأَبِيهِ فَنَادَى أَيْ عِبَادَ اللَّهِ، أَبِي أَبِي. فَقَالَتْ

---

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١] سوختە كەسێكە كە تازە دەستی كردبێ بە خوێندن لە مزگەوتا وە ئیش‌و كار بكا بۆ مامۆستای (فەرهەنگی خاڵ).

فَوَاللَّهِ مَا احْتَجَزُوا حَتَّى قَتَلُوهُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ. قَالَ عُرْوَةُ: فَوَاللَّهِ مَا زَالَتْ فِي حُذَيْفَةَ مِنْهَا بَقِيَّةُ خَيْرٍ حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ. رواه البخاری[١]:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا، لە سەرەتاوە لەشکری هاوبەش پەیداکەرەکان باش باش شکان، بە شکانێکی دیاری‌و ئاشکرا، هەتا ئیبلیس خۆی دەقریشکێنێ‌و بەقایم هاوار دەکا: ئەی بەندەکانی خودا! فریای دواوەتان بکەون‌و ئاگاتان لە دواتانەوە بێ، ئیتر پێشەوەیان دەگەڕێنەوە بە هاواری دواوەیان‌و دەبێ بە تیک بەربوون‌و تێکرژان، جا حوزەیفە تەماشا دەکا وا خەریکن بە هەڵە باوکی دەکوژن، هاوار دەکا، ئەی موسوڵمانینە! ئەوە باوکمە، ئەی بەندەکانی خودا! ئەوە باوکمە مەیکوژن بەڵام شەڕەکە وا گەرم بوو بوو شپرزە بوو بوون بە خودا تا نەیان کوشت لە کۆڵی نەبوونەوە، بەڵام حوزەیفە نەیگرتە دڵ‌و باوەڕی پێ کردن کە نەیان ناسیوە بۆیە کوشتوویانە لەبەرئەوە بۆیان پاڕایەوە‌و گوتی: خودا چاو پۆشیتان لێ بکا. عورووە دەیگوت: بە خودا حوزەیفە تا چووەوە دیداری خودای گەورە‌و مەزن هەر پەستیی ئەو ڕووداوەی لەدڵامابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ڕەزای خودا هەتا مردن هەر دووعای خێری بۆ بکوژی باوکی دەکرد (ب).

٣٤٩٣- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَو اسْتَخْلَفْتَ. قَالَ: إِنِ اسْتَخْلَفْتُ عَلَيْكُمْ فَعَصَيْتُمُوهُ عُذِّبْتُمْ وَلَكِنْ مَا حَدَّثَكُمْ حُذَيْفَةُ فَصَدِّقُوهُ وَمَا أَقْرَأَكُمْ عَبْدُ اللَّهِ فَاقْرَءُوهُ. رواه الترمذی بسند حسن[٢]:

حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە جێنشینت بۆ خۆت دیاری دەکرد! فەرمووی: ئەگەر جێنشین بۆ خۆم دابنێم‌و لەپاش خۆم بە گوێی نەکەن خودا عەزاب‌و سزایەکی سەختتان دەدات، بەڵام

---

[١] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨٢٤.

[٢] سند حسن.

حوزەیفە هەرچی پێ گوتن باوەڕی پێ بكەن، وە هەر چۆنێكیش عەبدوڵلا قورئانی پێ خوێندن ئاوای بخوێنن! (ت-س/ح).

## ٥٦) چاكێتیی بەڕای كوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ)
## فضل البراء بن مالك (رَضِي اللّهُ تعالى عَنه)

٣٤٩٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لاَ يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ مِنْهُمُ الْبَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ. رواه الترمذي بسند صحيح[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گەلێ كەسی كوڵكنی چڵكنی لەش تەپ‌و تۆزاوی وا هەیە، كە دوو پارچە پەلاسی شڕی لە بەردایە، لەبەر زەبوونی‌و هەژاری خۆی هیچ كەسێ نازی ناگرێ‌و گوێی پێ نادا" بەلام ئەگەر سوێند بخوا لە خوا كە دەبێ ئەو ئیشەی بۆ بكا" خودا دڵی ناشكێنێ‌و سوێندەكەی ناخات‌و داواكەی جێ بەجێ دەكا، یەكێك لەوانە كە ئەمە حاڵیانە بەڕای كوڕی مالیكە (ت-س/ص).

## ٥٧) چاكێتیی حەسسانی كوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ)
## فضل حسان بن ثابت (رَضِي اللّهُ تعالى عَنه)

٣٤٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) أَنَّ عُمَرَ مَرَّ بِحَسَّانَ وَهُوَ يُنْشِدُ الشِّعْرَ فِي الْمَسْجِدِ فَلَحَظَ إِلَيْهِ فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أُنْشِدُ وَفِيهِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ. ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ أَنْشُدُكَ اللَّهَ أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: أَجِبْ عَنِّي اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ، قَالَ اللَّهُمَّ نَعَمْ[1]:

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن.

[1] بخاری. صلاة: ٤٥٣ (تجريد/ ٢٧ / ٤٥٣ ، ٣٢١٢ ، ٦١٥٢. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٣٤ ، ٦٣٣٥ ، ٦٣٣٦. أبو داود. أدب: ٥٠١٣ ، ٥٠١٤. نسائي. مساجد: ٧١٥ ، ٣٤٠٢ ، ١٣١٤٠ ، ١٥١٥٦.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: حەسـسان لـە مزگەوتەکـەی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) هۆنراوەی دەخوێنـدەوە عومـەر (خودای لێ رازی بێ) لەلایـەوە رەت بـوو، بـە گۆشـەی چـاو خێـسەیەکی لێ کـردو لێـی مـۆڕ بـۆوە، ئەویش گوتی: نا بەجێیم نەکردووە ئا لـەم شـوێنی حازریـەدا هـۆنراوەم تیایا خوێندۆتەوەو لەو کاتەدا پیاوی لـە تـۆ باشـتریش لـەوێ بووە، کە پێغەمبـەرە (درودی خـودای لەسـەربێ) ئـەو جـا رووی کـردە مـن‌و گـوتی: ئـەی ئـەبو هـورەیرە! توخـوا ئایـا تـۆ بـۆ خـۆت لـە پێغەمبـەرت نەبیـستووە کـە بـە مـن بفـەرموێ: لـەجیاتی مـن تـۆ وەرام‌و بەرپەرچـی تانـەو تەشـەری بـێ بڕواکـان بـدەرەوە، خودایە! بە گیانی پاك واتـە: بە هـۆی جوبرائیلـەوە پـشتیوانی بکـە؟ گـوتی: منیش گوتم: خودا ئاگادارە کە چۆن دەڵێی وایەو قسەکەت راست‌و دروستە. (م– رەزای خوای لێ بێ).

٣٤٩٦– عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ اهْجُهُمْ أَوْ هَاجِهِمْ وَجِبْرِيلُ مَعَكَ[٢]:

بـەراء (خـودای لێ رازی بـێ) دەڵـێ: ژنـەوتم لـە پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) دەیفەرموو بە حەسسانی کوڕی ثابیت: بە خوسپ (هـەجو) شـڕیان بکـە یا پێی دەفەرموو: بە تانەو تەشەر دایان شۆرە، جوبرائیل لە گەڵتە (م).

٣٤٩٧– عَنْ مَسْرُوقٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ وَعِنْدَهَا حَسَّانُ بْـنُ ثَابِتٍ يُنْشِدُهَا شِعْرًا يُشَبِّبُ بِأَبْيَاتٍ لَهُ فَقَالَ: حَصَانٌ رزانٌ، مَاتزنُّ بريبَةٍ وَتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: لَكِنَّكَ لَسْتَ كَذَلِكَ. قَالَ مَسْرُوقٌ فَقُلْتُ لَهَا: لِمَ تَأْذَنِينَ لَهُ يَدْخُلُ عَلَيْكِ وَقَدْ قَالَ اللَّهُ: (وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ)؟ فَقَالَتْ: فَأَيُّ عَذَابٍ أَشَدُّ مِنَ الْعَمَى إِنَّهُ كَانَ يُنَافِحُ أَوْ يُهَاجِي عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)[٣]:

---

[٢] بخاری. أدب (تجرید: ١٢٩٨ / ٣٢١٣ ، ٤١٢٣ ، ٤١٢٤ ، ٦١٥٣. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٣٧ — ٦٣٤١.

[٣] بخاری. مغازی: ٤١٤٦ ، ٤٧٥٥ ، ٤٧٥٦ مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٤١.

مەسرووق (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: چووم بۆ لای عائیشە حەسسانی كوڕی ثابیتی لە لابوو، پارچەیێ شیعری لە وەسپ‌و مەدحی عائیشەدا دانابوو، دەیخوێندەوە بۆی، گوتی:

حَصَــــانٌ رَزَانٌ مَــا تُزَنُّ بِرِيبَةٍ

وَتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ

واتە:

پاكیزەو سەلار لە گومان دوورە

بێ رازو غەیبەت، ژنێ روو سوورە

وەكوو تریش واتە: ئافرەتێكی داوێنپاك‌و سەلارو سەنگینەو گومانی خراپەی لێ ناكرێ‌و ناوی كەسیش بە خراپە نابات بە تایبەت ناوی ژنی بێ ئاگای بێ تاوان. عائیشەیش پێی گوت: بەڵام تۆ خۆت وا نیت! مەسرووق دەڵێ: منیش بە عائیشەم گوت: كەوایە بۆ رێگەی حەسسان دەدەیت كە بێت بۆ لات؟ وەلحاڵ خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: والذی تولی كبره منهم لە عذاب عظیم (١١/٢٤) واتە: وە بۆ هەریەكێ لەو درۆزنانە بەشی خۆی هەیە لە گوناهو تاوانباری‌و تۆڵەی تاوان، بەتایبەتی ئەو كەسەیان كە كێشی تاوانەكەی هاویتە سەر شانی خۆی‌و سەرۆكایەتی درۆ بڵاو كردنەوەكەی دەكرد سزاو ئازارێكی گەلێ گەورەی بۆ هەیە. عائیشە گوتی: جا چی سزایەك هەیە كە لە كوێریی سەختتر بێ ئەوەتانێ خودا لەم پایزی تەمەنەدا باری پیریی‌و كوێریی‌و دوو دەست گۆجیی لێ ناوە لەگەڵ ئەمیشە ئەم پیاوە لەكاتی خۆیدا لەسەر پێغەمبەری دەكردەوە، یا گوتی: لە جیاتی پێغەمبەر (درودو صەلات‌و سەلام‌و بەرەكەتی خودای لەسەر بێ) وەڵامی هەجوی بێ بڕوایانی دەدایەوە! (م).

٣٤٩٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ حَسَّانُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فِي أَبِي سُفْيَانَ قَالَ: كَيْفَ بِقَرَابَتِي مِنْهُ. قَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ لأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنَ الْخَمِيرِ. فَقَالَ حَسَّانُ:

وَإِنَّ سَنَامَ الْمَجْدِ مِنْ آلِ هَاشِمٍ

بَنُو بِنْتِ مَخْزُومٍ وَوَالِدُكَ الْعَبْدُ

قَصِيدَتَهُ هَذِهِ. روى مسلم هذه الأربعة:[٤]!

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی:** حەسسان (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی:** ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێگەم بدە با خوسپ (هەجو)ی ئەبو سوفیان بکەم. فەرمووی: چۆن؟ ئاخر ئەو خزمەو ئامۆزامە، دەترسم ئەگەر زەمی بنەچەی ئەو بکەیت بەر منیش بکەوێ چونکە ئەم ئەبو سوفیانە کوڕی حارثی کوڕی عەبدولموطەلیبە گوتی: بەو کەسە کە تۆی کردووە بەم پێغەمبەرە نازدارە وەك تەڵێ موو لە هەویر دەربکێشرێ ئاوا ڕەسەن و بنەچەی تۆیان لێ جیا دەکەمەوە. جا حەسسان گوتی:

وَإِنَّ سَنَامَ الْمَجْدِ مِنْ آلِ هَاشِمٍ

بَنُو بِنْتِ مَخْزُومٍ وَوَالِدُكَ الْعَبْدُ

واتە:

نەوەی هاشم و مەخزووم کە باوان و خاڵوانی

سەر بەرزی پێغەمبەرن، بەڵام تۆ نەنک شوانی!

لەدوا ئەم بەیتەوە ئەم بەیتەیش هەیە کە دەڵێ:

ومن ولدت ابناء زهرة منهموا

كرام، ولم يقرب عجائزك المجد

واتە:

سەربەرزە نەو ژنەش وا چەن وەچەیەیێ چون گوڵووک

ختیەوە لەو مەردانە، نەنکانی تۆش گشت بێ تووک؟

---

[٤] بخاری. مناقب (تجرید/ ٤ / ٩٦ ژ: ١٤٠٥ / ٣٥٣١.

بە پەخشانیش واتە: چڵە پۆپەی سەربەرزی‌و مەردایەتی دراوە بە نەوەی خانەوادەی هاشم، بەوانەیان كەلە ژنە مەخزوومییەكە بن كە فاتیمەی دایكی عەبدوڵڵای باوكی پێغەمبەرە، كەئەم رشتە تان‌و پۆ ئاورێشمە باوان‌و خاڵوانی پێغەمبەرن، هەروا دراوە بەو رۆڵە نازدارانەیشیان كە لە هالەی كچی وەهبن، كە حەمزەو صەفییەی خستۆتەوە لەو مەردانە، بەڵام تۆ ئەی ئەبو سوفیان هەرچەند لەو نەوەو بەرە بابەی وەلێ رەگێكی ناڕەسەنت تیایە، چونكە دایكت‌و نەنكە گەورەت كەنیزو كارەكەری ماڵان بوون ئیتر چامەیەكی خوێندەوە هەتا دوایی (م/خودای لێ رازی بێ).

لێرەدا ئەم تێبینییە گەرەكە:

یەكـەم: عەبدولموتەلیب ئەم سێ ژنەی هەبووە: فاتیمەی نەنكی پێغەمبەر مەخزوومی بووە، هالەی كچی وەهەب دایكی حەمزەو صەفییە، سومەییەی كچی مەوهیب كە نەنكی ئەبو سوفیانە كە بەندە زاد بووە.

دووەم: ئەم ئەبو سووفیانە لە دواییدا ئیسلام بووەو موسوڵمانێكی جوانی لێ دەرچووە.

سێیەم: بەنی زوهرە خێڵێ بوون لە قورەیش بە ناوی نەنكە گەورەیانەوە ناوداربوون، كە ناوی زوهرە بووەو ژنی كیلابی كوڕی موڕە بووە. (وەرگێڕ)

٣٤٩٩- وعَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اهْجُوا قُرَيْشًا فَإِنَّهُ أَشَدُّ عَلَيْهَا مِنْ رَشْقٍ بِالنَّبْلِ. فَأَرْسَلَ إِلَى ابْنِ رَوَاحَةَ فَقَالَ: اهْجُهُمْ. فَهَجَاهُمْ فَلَمْ يُرْضِ فَأَرْسَلَ إِلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ قَالَ حَسَّانُ قَدْ آنَ لَكُمْ أَنْ تُرْسِلُوا إِلَى هَذَا الأَسَدِ الضَّارِبِ بِذَنَبِهِ ثُمَّ أَدْلَعَ لِسَانَهُ فَجَعَلَ يُحَرِّكُهُ فَقَالَ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَفْرِيَنَّهُمْ بِلِسَانِى فَرْىَ الأَدِيمِ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تَعْجَلْ فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ أَعْلَمُ قُرَيْشٍ بِأَنْسَابِهَا - وَإِنَّ لِى فِيهِمْ نَسَبًا - حَتَّى يُلَخِّصَ لَكَ نَسَبِى. فَأَتَاهُ حَسَّانُ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ لَخَّصَ لِى نَسَبَكَ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنَ الْعَجِينِ. قَالَتْ عَائِشَةُ فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ لاَ يَزَالُ يُؤَيِّدُكَ مَا نَافَحْتَ عَنِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ. قَالَ حَسَّانُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) (وافر):

هَجَـوْتَ مُحَمَّـدًا فَأَجَبْـتُ عَنْـهُ ... وَعِنْـدَ اللَّـهِ فِـى ذَاكَ الْجَـزَاءُ
هَجَـوْتَ مُحَمَّـدًا بَـرًّا حَنِيفـاً ... رَسُـولَ اللَّـهِ شِـيمَتُهُ الْوَفَـاءُ
فَـإِنَّ أَبِـى وَوَالِـدَهُ وَعِرْضِـى ... لِعِـرْضِ مُحَمَّـدٍ مِـنْكُمْ وِقَـاءُ
ثَكِلْـتُ بُنَيَّتِـى إِنْ لَـمْ تَرَوْهَـا ... تُـثِيرُ النَّقْـعَ مِـنْ كَنَفَـىْ كَـدَاءُ
يُبَـارِينَ الأَعِنَّـةَ مُـصْعِدَاتٍ ... عَلَـى أَكْتَافِهَـا الأَسَـلُ الظِّمَـاءُ
تَظَـلُّ جِيَادُنَـا مُتَمَطِّـرَاتٍ ... تُلَطِّمُهُـنَّ بِـالْخُمُرِ النِّسَـاءُ
فَـإِنْ أَعْرَضْـتُمُوا عَنَّـا اعْتَمَرْنَـا ... وَكَـانَ الْفَـتْحُ وَانْكَـشَفَ الْغِطَـاءُ
وَإِلاَّ فَاصْـبِرُوا لِـضِرَابِ يَـوْمٍ ... يُعِـزُّ اللَّـهُ فِيـهِ مَـنْ يَـشَاءُ
وَقَـالَ اللَّـهُ قَـدْ أَرْسَـلْتُ عَبْـدًا ... يَقُـولُ الْحَـقَّ لَـيْسَ بِـهِ خَفَـاءُ
وَقَـالَ اللَّـهُ قَـدْ يَـسَّرْتُ جُنْـدًا ... هُـمُ الأَنْـصَارُ عُرْضَـتُهَا اللِّقَـاءُ
يُلاَقِـى كُـلَّ يَـوْمٍ مِـنْ مَعَـدٍّ ... سِـبَابٌ أَوْ قِتَـالٌ أَوْ هِجَـاءُ
فَمَـنْ يَهْجُـو رَسُـولَ اللَّـهِ مِـنْكُمْ ... وَيَمْدَحُـهُ وَيَنْـصُرُهُ سَـوَاءُ
وَجِبْرِيـلٌ رَسُـولُ اللَّـهِ فِينَـا ... وَرُوحُ الْقُـدْسِ لَـيْسَ لَـهُ كِفَـاءُ

٣٥٠٠- قَالَتْ عَائِشَةَ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: هَجَاهُمْ حَسَّانُ فَشَفَى وَاشْتَفَى. رواه مسلم والبخاري[٥]:

**دیسان عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەجوی قوڕەیش بکەن، چونکە لە تیرەباران چاکتر کاریان لێ دەکا ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کە خوسپ (هەجو)یان بکاو فەرمووی پێی: هەجویان بکە ئەویش هەجوی کردن، بەڵام بە دڵیان نەبوو ئینجا ناردی بۆلای کەعبی کوڕی مالیك ئەویش وا. لە پاشدا ناردی بە شوێن حەسساندا، کە هاتە خزمەتی گوتی: ئاخری ناردتان بە شوێن شێرە گەورەدا! ئینجا زمانی دەرکێشاو دەستی کرد بە زمان بزوان‌و بادان، گوتی: بەو کەسە کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری ڕاست‌و**

---

[٥] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٤٥.

دروست وەك كەوڵە شڕ بە شیعرو هەڵبەست شڕو ووڕیان دەكەم. پێغەمبەر (درودو سڵاوو ڕەحمەت‌و بەرەكەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: هێواش پەلە مەكە، هەتا ئەبو بەكر ڕشتەی ڕەسەنی منت بۆ دیاری نەكا دەست پێ مەكە، چونكە بنەچەی خۆشم لەوانە، ئەبو بەكریش لە هەموو كەس باشتر ڕەگەزو ڕەچەڵەكی قوڕەیش دەناسێت لە پاشدا حەسسان چووە خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی كرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو بەكر بە جوانی‌و ڕێكوپێكی ڕشتەی ڕەسەنی تۆی بۆ دیاری كردم بەو خودایە كە تۆی كردووە بە پێغەمبەری ڕاست‌و دروست وەك چۆن تەڵەموو سفت‌و ساخ‌و پاك لە هەویر دەردەكێشرێ ئاوا تۆیان لێ جیا دەكەمەوە، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەسا بزانە تا تۆ لەسەر خوداو پێغەمبەری خودا بكەیتەوە هەمیشە جوبرائیل دەست دەگرێ بە پشتت‌و خودای گەورە پشتیوانتە حەسسان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: (بەحری وافر):

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا فَأَجَبْتُ عَنْهُ ... وَعِنْدَ اللّٰهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا بَرًّا حَنِيفاً ... رَسُولَ اللّٰهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ

فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِرْضِي ... لِعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ

ثَكِلْتُ بُنَيَّتِي إِنْ لَمْ تَرَوْهَا ... تُثِيرُ النَّقْعَ مِنْ كَنَفَيْ كَدَاءِ

يُبَارِينَ الأَعِنَّةَ مُصْعِدَاتٍ ... عَلَى أَكْتَافِهَا الأَسَلُ الظِّمَاءُ

تَظَلُّ جِيَادُنَا مُتَمَطِّرَاتٍ ... تُلَطِّمُهُنَّ بِالْخُمُرِ النِّسَاءُ

فَإِنْ أَعْرَضْتُمُوا عَنَّا اعْتَمَرْنَا ... وَكَانَ الْفَتْحُ وَانْكَشَفَ الْغِطَاءُ

وَإِلاَّ فَاصْبِرُوا لِضِرَابِ يَوْمٍ ... يُعِزُّ اللّٰهُ فِيهِ مَنْ يَشَاءُ

وَقَالَ اللّٰهُ قَدْ أَرْسَلْتُ عَبْدًا ... يَقُولُ الْحَقَّ لَيْسَ بِهِ خَفَاءُ

وَقَالَ اللّٰهُ قَدْ يَسَّرْتُ جُنْدًا ... هُمُ الأَنْصَارُ عُرْضَتُهَا اللِّقَاءُ

يُلاَقِي كُلَّ يَوْمٍ مِنْ مَعَدٍّ ... سِبَابٌ أَوْ قِتَالٌ أَوْ هِجَاءُ

فَمَنْ يَهْجُو رَسُولَ اللّٰهِ مِنْكُمْ ... وَيَمْدَحُهُ وَيَنْصُرُهُ سَوَاءُ

وَجِبْرِيلٌ رَسُولُ اللّٰهِ فِينَا ... وَرُوحُ الْقُدْسِ لَيْسَ لَهُ كِفَاءُ

واتە:

زەمی موحەممەد دەکەی ئەمن دەدەم وەڵامی
پاداش لە بۆ من هەیەو تۆڵەش بۆ تۆی نەفامی
زەمی موحەممەد دەکەی، بە مانگەشەو وەڕینە!
پێغەمبەری خودایە، زۆر بە وەفاو بە دینە
من خۆم‌و کەسوکارم، ناموس‌و حاڵ‌و ماڵم
شووراى ناموسی ئەوین: خۆم‌و ماڵ‌و منالم!
یەک یەک لە کۆستی رۆڵەم دابنیشم بۆ شیوەن
گەر هەڵمەتی شێرانە لە هەرچار لاوە نەبەن
رۆژی رووناکی ئێوە وەک شەوە زەنگ لێ نەکەن
لە خوێنی ئێوەی دوشمن شیرو تیریان ناو نەدەن
وولاخ‌و رەخشی ئێمە کە بە رەسەن رەسەنن!
بە هێرشی بێ ووچان تۆڵەتان لێ دەسەنن
بارانـاوی نارەقیان بەس لە کاتی ووچانا
ژنان بە ناز دەیسڕن بەسەر پۆشی خۆیانا
گەر ئێوە شەڕ فرۆش نین، ئێمە بۆ عەمرە هاتووین
بۆ ئێوەش دەردەکەوێ ئەو حەقەی پێی راهاتووین
دەنا خۆتان رابگرن بۆ رمبەی شیرو تیرمان
بە فەرمانی خوداوەند سەر دەکەوێ لەشکرمان
خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: ناردوومە بەندەیێ باش
هەق بێژەو لە گەڵیەتی سوپایێ لە پێش‌و پاش
وەک شێری نەڕ لە مەیدان سەرسنگیان داکوتاوە
تانەو تەشەری ئێوە بە شیر دەدەنە دواوە
ئێوە لەبەر بێ وێڵی‌و بێ نرخی‌و بێ دینی تان
یەکسانە لامان، زەم‌و رەف‌و سەنا خوانی تان!
چونکە رابەری ئێمە گیانی پاک پشتی دەگرێ
ئیتر کێیە رادەی بێ؟ بێ بەرابە بەو بگرێ!!

بە پەخشانیش واتە: تۆ رەف‌و خوسپی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) دەکەی من لە جیاتی ئەو زاتە وەڵامت بدەمەوە، بە هیواو تەمای پاداشی باش لەلای خودای گەورە، دیارە کە تۆش بە تۆڵەی سەختی خۆت دەگەی، موحەممەد زەم هەڵناگرێ، چونکە ئەو پیاوێکی زۆر زۆر باشە، خێرخواو خواناس‌و راست‌و راستاڵە، ئەو پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، مەردو جەوانمەردو بە ئەمەك‌و بە وەفایە، لەبەرئەوە من خۆم‌و هۆزم‌و کەس‌و کارم‌و سەرو حاڵ‌و ماڵ‌و منداڵ‌و ناموسم هەموو دەکەم بە قوربانی موحەممەدی نازدارو خۆشەویست‌و دەبین بە قەڵاو پەرژین‌و سوپەر بۆ ئابڕوو و ناموس‌و شەرەفی موحەممەد! وە یەکە یەکە لە شینی کوڕو کچەکانما دابنیشم‌و بەرو دوا شیوەنیان بۆ بگێڕم ئەگەر نەیانبینم وەك بەچکە شێر لە هەر چوار لاوە بە سواری‌و بە پیادەیی هەڵمەتی شێرانە نەبەنە سەرتان‌و دانەی کەدا کە دانەی سەرووی مەککەیە لە تەپ‌و تۆزی هێرشی بێسامانیانا نوقم نەکەن‌و رۆژی ڕووناکتان لێ نەکەن بە شەوی تاریکو نوتەك‌و لە خوێنی دوشمنانی موحەممەد شیرو رم‌و تیرەکانیان ئاو نەدەن‌و ئاو پاش‌و ئاو دانەوەیان نەکەن! ئەسپ‌و وولاخەکانمان – کەبە رەسەن رەسەنن– هەمیشە لە هێرشدان بۆسەر ئێوە، لەبەرئەوە ئارەقیان وشك نابێتەوە، مەگەر ئەوەندە کە ژنەکانمان (لەکاتی پشوودانا) بە سەرپۆش‌و چارشێوەکانی خۆیان، نەك بە پەڕۆ شڕو شتی وا، زۆر بە قەدرو رێزەوە ووشکیان بکەنەوە‌و سەر لە نوێ رنەك‌و قاشاویان بکەن‌و رەونەقیان پێ هەڵبێننەوە‌و ئامادەیان بکەنەوە بۆ هەڵمەتێکی نوێ، جا ئەگەر ئێوە لە کەڵی شەیتان دێنە خوارەوە ئەوا ئێمە شەڕ فرۆش‌و شەڕخوازنین، ئیتر خۆشی‌و ئاشتی دەکەوێتەوە‌و ئاسایش باڵ دەکێشێ بەسەر وولاتا‌و هەق‌و ناهەقی دەردەکەوێ بۆ هەردوولا، ئەگینا ئەوا خۆتان بگرن بۆ گورزو گۆپاڵمان، بۆ شەڕەنێزەو شەڕە شیرو تیر لەو رۆژەدا کە خودا بە خواستی خۆی خۆشەویستانی خۆی سەردەخاو سەریان بەرز دەکاتەوە‌و کەللەی دوژمن لەبەر پێیان گوێینی پێ دەکەن، خوداوەندی گەورە‌و مەزن دەفەرموێ: من لەشکرێکم لە بەندە باشەکانی خۆم

سازکردووەو کردوومن بە یارو یاوەرو یاریدەدەر بۆ بەنەیەکی باشی خۆم، کە رەفتاری ئەو بەندەیەم وایە هەمیشە کردوویەتی بە پیشە راستگۆو راستو راستاڵەو هەق گۆیەو لە راستی لاریی نییەو لە راستی حەق سەری پێوەنییە! لەشکرەکەشی هەمەدەم لەسەر پێن و لە سوپای کوفرو ناهەقی کۆناکەن و شەوو رۆژ خەبات دەگێڕن و لە مەیدانی نەبەردو لە کۆڕی شەڕدا وەك شێری نەڕ نرکەو نەڕە نەڕیان دێ و سینگیان وەك سنجووق و سنگ داکوتاوە! ئەو پێغەمبەرە نازدارە هەموو رۆژێ (لە نەفام و دەست درێژکەرەکانی قوڕەیشەوە کە نەوەی مەعەددی کوڕی عەدنانن) تووشی شەڕە جنێوو شەڕو شۆڕو قسەی ناشیرین دەبێ، وەلێ ئێوە ئەی میللەتی کوفرو بێ بڕوایی! ئەی دەستەی نەفامان و نەزانان! خۆتان چینو شەڕو رەفتان چییە، ئێوە لەبەر بێ نرخی و بێ وێڵی و سووك و تڕۆیی خۆتان لە لامان چوو یەکە: چ خوسپی پێغەمبەر بکەن و چ مەدحی بکەن و چ لەسەری بکەنەوە و چ لەسەری نەکەنەوە، هەمووی یەکسانە بۆ ئەوو نەسوودو نە زیانی پێ ناگەیەنێ، چونکە ئەو خودای لە گەڵەو جوبرائیل (کە گیانی پاکە) پەیتا پەیتا مژدەی سەرکەوتنی بۆ دینێ، کەشتی وا هەرگیزاو هەرگیز هاوتای نییە. عائیشە گوتی: جا بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە زمانی شیرینی خۆی فەرمووی: حەسسان شڕو ووڕی کردن و داخی دڵی خۆی و داخی دڵی موسوڵمانانی پێ رشتن! (م/ب).

٣٥٠١- جَاءَ فِي دِيوان حَسَّانَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ مَا يَلَي: وَقَالَ (أي حسَّانٌ) أَيضاً يَمدح رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):-

| | |
|---|---|
| وأحسن منك لم تـرَ قطُّ عيني | وأجمل منك لم تلد النِّسَاءُ |
| خُلقت مُبرَّءاً من كـلِّ عيبٍ | كـأنَّك خُلقت كما تشاء |

(المترجم)[٦]:

---

[٦] نقل صحيح من ديو ان حسان.

واتە: لە دیوانەکەی حەسسانی کوڕی ثابیتدا ئەم دوو شیعرە هەیە کە لە مەدحی پێغەمبەردا گوتوویەتی (بەحری وافیر):

واحسن منك لم تر قطّ عيني
واجمل منك لم تلد النساء
خلقت مبرءا من كل عيب
كانك خلقت كما تشاء

واتە:

بە چاو نەمدیوە وەک تۆ شۆخو شەنگ
لە دایک نەبوە رۆڵەی وابێ رەنگ
دروست کراوی بێ گەردو بێ نەنگ
چۆنت دەوێ وا، نازدارو قەشەنگ

لە بەحری شیعرە کە خۆشی کە بەحری (وافر)ە بەم شێوەیە تەرجەمە دەکرێ، بەڵام شێوەی کێشی پەنجەکە رەنگ بێ جوانتربێ:

بە چاو نەم دیوە وەک تۆ شۆخو شەنگی
لە دایک نەبوە رۆڵەی وا چەلەنگی
دروست کراوی بەبێ گەردو نەنگی
چۆن خۆت حەز دەکەی وا بە قەشەنگی[1]

## ٥٨) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەیمانی برایەتی لە نێوانی یاریدەدەرانو کۆچکاراندا دەبەستێ (رەزای خوایان لێ بێ):

**اخاء النبيى (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بين الانصار والمهاجرين (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُم)**

٣٥٠٢- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوفٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَا قَدَمْ الْمُهَاجِرُونَ الْمَدِينَةَ آخَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بِنْ عَوْفٍ وَسَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ ، فَقَالَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ: إِنِّى أَكْثَرُ الأَنْصَارِ مَالاً فَأَقْسِمُ مَالِي نِصْفَيْنِ، بَيْنِي وَبَيْنَكَ، وَلِي

[1] بێ رەنگی: بێ چوونی (فەرهەنگی مەردۆخ). قەشەنگ: شتی زۆر چاك. قەشەنگیی: چاکیو جوانی شت (فەرهەنگی خاڵ). چەلەنگ: فريف، جميل (فەرهەنگی مەهاباد).

امْرَأَتَان ، فَانْظُرْ أَعْجَبَهُمَا إِلَيْكَ فَسَمِّهَا لِي أُطَلِّقْهَا ، فَإِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا فَتَزَوَّجْهَا . قَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ ، أَيْنَ سُوقُكُمْ فَدَلُّوهُ عَلَى سُوقِ بَنِي قَيْنُقَاعَ ، فَمَا انْقَلَبَ إِلاَّ وَمَعَهُ فَضْلٌ مِنْ أَقِطٍ وَسَمْنٍ ، ثُمَّ تَابَعَ الْغُدُوَّ، إِلَى السُّوقِ ثُمَّ جَاءَ يَوْمًا وَبِهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَهْيَمْ. قَالَ تَزَوَّجْتُ. امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ. قَالَ: كَمْ سُقْتَ إِلَيْهَا؟ قَالَ: نَوَاةً مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ. رَوَاهُ الثلاثة[1]:

ئەورِەحمانی کوڕی عەوف (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێ کۆچکاران هاتن بۆ مەدینە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پەیمانی برایەتیی بەست لە نێوانی من‌و سەعدی کوڕی رەبیعدا، سەعد پێی گوتم: من لە هەموو یاریدەدەران دەوڵەمەندترم، هەرچی ماڵم هەیە لە بەینی خۆم‌و خۆتا دەیکەم بە دوو کوتەوەو نیوەی بۆ من‌و نیوەی بۆ تۆ، دوو ژنیشم هەیە سەرنج بدە، کامەیانت بە دڵە پێم بڵێ، تەڵاقی دەدەم بۆت، کەی حەیەی هەڵهات‌و عیددەی تەواو بوو مارەی بکە بۆ خۆت! منیش گوتم: خودا پیت‌و بەرەکەت برژێنێ بەسەر خۆت‌و ماڵ‌و منالتا خودا سەد ئەوەندەت بداتێ، من ئەوە ناکەم، بەڵام پێم بڵێ بازاڕەکەتان لە کوێیە؟ ئەویش بازاڕی بەنی قەینوقاعی پێ نیشان دام، ئیتر نەگەڕامەوە هەتا هەندێ کەشك‌و رۆنم لەگەڵ خۆم نەبردەوە، لەوەدوا سەرومڕ دەچووم بۆ بازاڕو سەوداو ئاڵوێڵم دەکرد، هەتا رۆژێ چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) نیشانەی زاواییم پێوە بوو، فەرمووی: ئەم رەنگ‌و بۆنە چییە؟ عەرزیمکرد: ژنم هێناوە، لە یاریدەدەرانە، فەرمووی: چەندەت مارەیی داوەتێ؟ گوتم: سەنگی ناوکەیێ زێڕ. فەرمووی: نانی شایی دروست کە بابەتاقە مەڕێکیش بێ (ش/د).

٣٥٠٣- عَنِ أبي جحيفة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: آخى رسوالله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بين أبي الدَّرداءِ وسلمان. رَوَاهُ البخارى[2]:

---

[1] بخارى. نكاح: ٥١٥٥ ، ٦٣٨٤. مسلم. نكاح: ٢٤٧٥ — ٣٤٨١. ترمذى. نكاح: ١٠٩٤. نسائى. نكاح: ٣٣٧٢. ابن ماجه. نكاح: ١٩٠٧.

[2] هذا التعليق قطعة من حديث أخرجه البخارى بتمامه فى كتاب الصيام ذكره هنا بين الرقمين: ٣٩٣٦ و ٣٩٣٧ (عينى / ١٧ ص ٦٨).

ئـەبو حوزەیفـە (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) برایەتی بەست لە نێوانی ئەبو دەرداو سەلمانی فارسی دا (ب).

٣٥٠٤- عَنْ أَنسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: آخى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بين أبـى عُبيدة بن الجّراح وبين أبى طلحة[٣]:

ئەنـەس (خـودای لێ رازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) پـەیمانی برایـەتیی بەسـت لـە نێـوانی ئـەبو عوبەیـدەی كـوڕی جـەراح‌و لـە نێـوانی ئـەبو طەلحەدا (م).

٣٥٠٥- وَعَنْهُ قَالَ: حالف رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بين قريشٍ والأنـصار في داره الّتي بالمدينة[٤]:

دیسان ئەنەس دەڵێ: لە مەدینـە، لـە مـاڵی منـدا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەیمانی دۆستایەتی‌و دەستە برایەتیی بەست لە نێـوانی كۆچكەران‌و یاریدەدەراندا (م).

٣٥٠٦- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلّمَ) قَـالَ: لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ وَأَيُّمَا حِلْفٍ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ إِلاَّ شِدَّةً. روى مسلم هذه الثلاثة. والله أعلم[٥]:

جوبـەیری كـوڕی مـوطعیم (خودای لێ رازی بێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێت: پـەیمان بەسـتن لەسـەر شـتی نـاڕەوا، وەك ئەمـە لەسـەر هەق‌و ناهەق لەسەر هاوپەیمانی خۆت بكەیتەوە، شتی وا ناڕەوا لە ئیسلامدا نیـە، وەلێ ئـەو پەیمانـە رەوایانەشـی كـە لـە سـەردەمی نـەزانی پـێش هـاتنی ئیسلامدا باوبوون، ئیسلام زیاتر پتەویان دەكات! (م- خوای لێ رازی بێ).

---

[٣] سلم. فضائل الصحابة: ٦٤٠٩

[٤] بخاری. كفالة: ٢٢٩٤ ، ٦٠٨٣ ، ٧٣٤٠. مسلم. فضائل الصحابة ٦٤١٠ (تجريد / ٣ / ٩١ ژمـارە/ ١٠١٠ / ٢٢٩٤ ، ٦٠٨٤): مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤١٠، ٦٤١١.

[٥] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤١٢. أبو داود. فرائض: ٢٩٢٥.

## ٥٩) بەشی حەوتەم: باسی گەورەیی کۆمەڵێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە نە لە کۆچکەران‌و نە لە یاریدەدەرانن، یەکێ لەوانە ئەبو زەڕی غیفارییە (خودای لێ رازی بێ)

## الفصل السابع: فى رَهْطٍ مِنَ الأصحاب، ليسوا من قريش ولامن الانصار، منهم ابو ذر الغفارى (رَضِيَ اللّٰهُ تعالى عَنه)

٣٥٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَكَّةَ قَالَ لأَخِيهِ: ارْكَبْ إِلَى هَذَا الْوَادِى فَاعْلَمْ لِى عِلْمَ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِى يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ يَأْتِيهِ الْخَبَرُ مِنَ السَّمَاءِ فَاسْمَعْ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ ائْتِنِى. فَانْطَلَقَ الأَخُ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ وَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَبِى ذَرٍّ فَقَالَ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الأَخْلاَقِ وَكَلاَمًا مَا هُوَ بِالشِّعْرِ. فَقَالَ أبو ذر: مَا شَفَيْتَنِى مِمَا أَرَدْتُ. فَتَزَوَّدَ وَحَمَلَ شَنَّةً لَهُ فِيهَا مَاءٌ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ فَأَتَى الْمَسْجِدَ فَالْتَمَسَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ يَعْرِفُهُ وَكَرِهَ أَنْ يَسْأَلَ عَنْهُ حَتَّى أَتَى اللَّيْلِ فَاضْطَجَعَ فَرَآهُ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فَعَرَفَ أَنَّهُ غَرِيبٌ فَلَمَّا رَآهُ تَبِعَهُ فَلَمْ يَسْأَلْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَىْءٍ حَتَّى أَصْبَحَ ثُمَّ احْتَمَلَ قُرَيْبَتَهُ وَزَادَهُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَظَلَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَلاَ يَرَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَمْسَى فَعَادَ إِلَى مَضْجَعِهِ فَمَرَّ بِهِ عَلِيٌّ فَقَالَ أَمَا أَنَ لِلرَّجُلِ أَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَهُ فَأَقَامَهُ فَذَهَبَ بِهِ مَعَهُ وَلاَ يَسْأَلُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَىْءٍ حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الثَّالِثِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ فَأَقَامَهُ عَلِيٌّ مَعَهُ ثُمَّ قَالَ لَهُ أَلاَ تُحَدِّثُنِى مَا الَّذِى أَقْدَمَكَ هَذَا الْبَلَدَ قَالَ إِنْ أَعْطَيْتَنِى عَهْدًا وَمِيثَاقًا لَتُرْشِدَنِّى فَعَلْتُ. فَفَعَلَ فَأَخْبَرَهُ بِمَا جَاءَ لَهُ، قَالَ عَلِيٌّ: إِنَّهُ حَقٌّ وَهُوَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَاتَّبِعْنِى فَإِنِّى إِنْ رَأَيْتُ شَيْئًا أَخَافُ عَلَيْكَ قُمْتُ كَأَنِّى أُرِيقُ الْمَاءَ فَإِنْ مَضَيْتُ فَاتَّبِعْنِى حَتَّى تَدْخُلَ مَدْخَلِى. فَفَعَلَ فَانْطَلَقَ يَقْفُوهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَدَخَلَ مَعَهُ فَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ وَأَسْلَمَ مَكَانَهُ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ارْجِعْ إِلَى قَوْمِكَ فَأَخْبِرْهُمْ حَتَّى يَأْتِيَكَ أَمْرِى. فَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لأَصْرُخَنَّ بِهَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ. ثُمَّ قَامَ الْقَوْمُ فَضَرَبُوهُ حَتَّى أَضْجَعُوهُ فَأَتَى الْعَبَّاسُ فَأَكَبَّ عَلَيْهِ فَقَالَ وَيْلَكُمْ أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ مِنْ غِفَارٍ وَأَنَّ طَرِيقَ تُجَّارِكُمْ إِلَى الشَّامِ عَلَيْهِمْ. فَأَنْقَذَهُ مِنْهُمْ ثُمَّ عَادَ مِنَ الْغَدِ بِمِثْلِهَا فَضَرَبُوهُ وَثَارُوا إِلَيْهِ فَأَكَبَّ عَلَيْهِ الْعَبَّاسُ فَأَنْقَذَهُ. رواه الشيخان وَفِى رِوَايَةٍ لمسلم: فَقَالَ لَهُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَلْ أَنْتَ مُبَلِّغٌ عَنِّى قَوْمَكَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَنْفَعَهُمْ بِكَ وَيَأْجُرَكَ فِيهِمْ. فَعَادَ فَأَسْلَمَ أَخُوهُ أُنَيْسٌ وأُمُّهُما، وَأَتَوا قَوْمَهُمْ، فَأَسْلَمَ نِصْفُهُمْ وَكَانَ يَؤُمُّهُمْ إِيمَاءُ بْنُ رَحَضَةَ الْغِفَارِىُّ وَكَانَ سَيِّدَهُمْ. وَأَسْلَمَ بَاقِيهِمْ حِينَمَا قَدِمَ النَّبِىّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَجَاءَتْ أَسْلَمُ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نُسْلِمُ عَلَى الَّذِى أَسْلَمَ عَلَيْهِ إِخْوَتُنَا فَأَسْلَمُوا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ[١]:

ئیبنو عەبباس (خوایان لیّ رازی بیّ) گوتی: ئەبو زەڕ کە دەبیسێت خودا پێغەمبەری کردووە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئونەیسی برای دەڵێ: سواربە، بچۆ بۆ ئەم دۆڵی مەککەیە، دەنگو باسی ئەم پیاوەم بۆ بزانە، کە لە مەککە پەیدابووەو خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ، گوایە لە ئاسمانەوە هەواڵو باسوو خواسی بۆ دێت، گوێ لە قسەی بگرەو لەپاشا وەرەوە بۆلام، جا براکەی دەڕوات تا دەچێتە مەککە، لەوێ گوێ لە فەرمایشتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەگرێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەبو زەڕو پێیی دەڵێ: ئەو پیاوەم دی، فەرمان دەکا بە رەفتاری بەرزو خووی شیرین‌و جۆرە قەسەیێ دەکا لە شیعرو هۆنراوە ناچێ. ئەبو زەڕیش دەڵێ: بە دەردی منت نەخوارد ئینجا خۆی توێشوو دەکاو کوندەیێ ئاو هەڵ دەگرێ‌و دەڕوا تا دەچێتە مەککە، لەوێ دەچێتە مزگەوت‌و دەگەڕێ بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەڵام لەبەرئەوەی خۆی نایناسێ‌و حەزیش ناکا لە کەسی تر بپرسێ نایدۆزێتەوە، دەمێنێتەوە تا شەو دادێ، جا رادەکشێ، عەلی دەیبینێت‌و دەزانێ کە نامۆیە پێی دەڵێ: نابەڵەدی؟ دەڵێ: بەڵێ ئیتر عەلی خوڵکی دەکاو ئەویش شوێنی دەکەوێ‌و دەچنەوە بۆماڵەوە، ئەو شەوە کەسیان پرسیار لە کەسیان ناکەن کە تۆ کێیت‌و کێ‌نیت‌و چ کارەیت‌و چ کارە نیت، کە رۆژ دەبێتەوە ئەبو زەڕ کوندەو توێشووەکەی هەڵ دەگرێت‌و دەچێتەوە بۆ مزگەوت، ئەو رۆژەش تا ئێوارێ دەمێنێتەوەو پێغەمبەر نابینێ، کە شەوی بەسەردا هات دەچێتەوە لە

---

[١] بخاری. مناقب: (تجرید / ٤ / ٩٢ رقم: ١٤٠٣ / ٣٥٢٢ ، ٣٨٦١) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣١٢ ، ٦٣٧٦ — ٦٣٧٩.

شوێنەکەی دویٚ شەوی خۆیا پاڵ دەکەوێتەوەو عەلی دێتەوە بۆ لای‌و دەڵێ: ئەوە چییە، هێشتا ئەم پیاوە ماڵی خانە خوێکەی خۆی نا ناسێتەوە، جا هەڵی دەسێنێ‌و لەگەڵیا دەچێتەوەو ئەو شەوەش دیسان کەسیان پرسیاری هیچ شتێ لە کەسیان ناکەن، تا رۆژی سێیەم، دیسانەوە عەلی دێتەوەو هەڵی دەسێنێتەوەو دەیباتەوە، ئەو جار عەلی دەڵێ: ئەرێ پێم ناڵێیت بۆچی هاتوویت؟ ئەویش دەڵێ: ئەگەر گفت‌و پەیمانم بدەیتێ کە رابەریم دەکەی ئەوا پێت دەڵێم، ئەویش بەڵێنی ئەوەی دەداتێ، جا ئەویش پێی دەڵێ کە بۆچی هاتووەو عەودالی چییە، عەلی دەڵێ: ئەوەی ژنەوتووتە راست‌و دروستەو ئەو پیاوە بە راستی فرستادەو پێغەمبەری خودایە، کەوایە بە یانەکی لە شوێن منەوە وەرە، ئەگەر شتێکی وام بینی کە مەترسی هەبوو بۆ تۆ ئەوە دەوەستم لە پاڵ دیوارێکا گوایا دەست بە ئاو دەگەیەنم، تۆش دوور بە دوور چاوەڕوانم بکە، جا کە رۆیشتم شوێنم بکەوەرەوە، تا من چوومە کوێوە تۆش لە دوامەوە وەرە ژوورەوە، ئەویش وا دەکا، لە دوایەوە دەڕوا تا دەچنە لای پێغەمبەرو ئەبو زەڕ گوێ لە فەرمایشتەکانی دەگرێ‌و هەر لەوێدا ئیسلام دەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی دەفەرموێ: بچۆرەوە بۆ ناو هۆزەکەت‌و قسەیان بۆ بکەو هەواڵیان بدەرێ، تا فەرمانی خۆمت بۆ دێ ئەوجا وەرەوە بۆ لام ئەبو زەڕ دەڵێ: بەو خودایەی کە گیانی من وا لەدەستی تەوانایی ئەودا بانگەوازی ووشەی یەکتایی خودا لە ناوەراستی کۆمەڵەکەیاندا بەبێ پەروا هەڵ دەدەم، جا ئەبو زەڕ (خودای لێ رازی بێ) دەردەچێ‌و دەڕوا تا دەچێتە مزگەوت‌و لەوێ بە هەموو هێزی خۆی بانگەواز هەڵ دەدا: اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله: شایەتی دەدەم کە هەر خودا خۆی خودای راست‌و دروستەو جگە لە یەزدانی پاك خودای تر نییە، ئەگەر گریمان هەیشبێ درۆیە، وە شایەتیش دەدەم کە موحەممەد پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودایە ئیتر کەوا دەڵێ هۆزی بت پەرست بۆی هەڵ دەسن‌و دەچنە وێزەی تێرو پڕی دەکوتن‌و شل کوتی مەرگی دەکەن تا رایدەخەن‌و لە گولو گۆی دەخەن! تا عەبباس دەچێ‌و خۆی دەدا بە سەریاو دەڵێ: خانە

خراپینە! ئەدی خۆتان نازانن کە ئەمە غیفارییە، ڕێگەی بازرگانی خۆشتان کە دەچن بۆ شام بەسەر ئەو هۆزەوەیە، جا بەم شێوەیە ڕزگاری دەکا لە دەستیان، لە پاشا لە ڕۆژی دواییشدا هەروا دەکاتەوەو ئەوانیش پەلاماری دەدەنەوەو دیسانەوە سەرو گوێلاکی دەکوتنەوەو جەزرەبەی دەدەنەوە، هەمدیسان عەبباس خۆی دەداتەوە بە سەریاو ڕزگاری دەکاتەوە لە دەستیان (ش) لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی دەفەرموێ: ئەرێ دەتوانیت لە جیاتی من پەیامی من بە گەلی خۆت ڕابگەیەنیت؟ سا بەشکوو خودا بەهۆی تۆوە سوودیان پێ بگەیەنێ‌و تۆیش بەهۆی شارەزاکردنی ئەوانەوە پاداشی خودات دەست دەکەوێ جا ئەبو زەڕ دەگەڕێتەوە، ئەوجا ئونەیسی برای‌و دایکیان ئیسلام دەبن، ئینجا دەچن بۆ لای هۆزەکەیان ئەوانیش نیوەیان ئیسلام دەبن، وە شەیمای کوڕی ڕەحەضەی ئەلغیفاری، کە ئاغایان بوو، بەر نوێژییان بۆ دەکا، کاتێ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچ دەکا بۆ مەدینە ئەو نیوەکەی تریشیان ئیسلام دەبن، جا هۆزی ئەسلەمیش هاتن گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! برا هاو پەیمانەکانمان لە هۆزی غیفار لە سەرچی ئیسلام بوون، ئێمەش بەبێ چەندو چوون لەسەر ئەوە ئیسلام دەبین، ئیتر ئەوانیش موسوڵمان بوون جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا لە هۆزی غیفار خۆش بێ‌و هۆزی ئەسلەمیش بێوەی بکات!

**٣٥٠٨-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللّهُ عَنـهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيـهِ وَسَلّمَ) مَا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ وَلاَ أَقَلَّتِ الْغَبْرَاءُ مِنْ ذِي لَهْجَةٍ أَصْدَقَ وَلاَ أَوْفَى مِنْ أَبِي ذَرّ شِبْهِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ. فَقَالَ عُمَرُ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) كَالْحَاسِدِ لَهُ: أَفَنَعْرِفُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ لَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ فَاعْرِفُوهُ لَهُ. رواه الترمذی بسند حسن[٢]:

ئەبو زەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نە لە ژێر ئاسانی شینداو نە لەسەر ڕووی زەوی کەسێکی تری وەکو ئەبو زەڕ

---

[٢] بسند حسن عند الترمذي.

ئاوا راستگۆو سەر راستی تیادا نییە مانەندی عیسای كوڕی مەریەمە، (درودی لەسەر بێ) عومەریش (وەكوو خۆزگەی پێ بخوازێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم پایەیە لە یاد نەكەین بۆی؟ فەرمووی: بەڵێ لە یادی مەكەن‌و ددان بەم بەهرەیەیدا بنێن (ت-س/ح).

٣٥٠٩- جَاء فِي الشرح: فَقَد مَثَّلَ بِهَذَا أحسَن الصّدق وَأرفَع الجهاد الذى قَالَ: فيه النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ حَقّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ[٣]:

دانەر (نوقمی میهرو رەحمەتی خودا بێ) لە راڤە (شەرحە)كەیدا دەڵێ: ئەبو زەڕ (رەزای خوای لێ بێ) زۆر بە جوانی، وەك خەباتگێڕێكی راست‌و دروست‌و كۆڵنەدەر بە ئەركی سەرشانی خۆی هەڵساوە بە پێی ئەم فەرموودەیە كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: باشترین غەزاو خەبات قسەیەكی رەوایە لە رووی پاشاو كاربەدەستی ستەمكاردا! (غایەتولمەئموول).

## ٦٠) دوو كەسی تریان سەلمانی فارسی‌و صوهەیبی رۆمین (رەزای خوایان لێ بێ) ومنهم سلمان الفارسى وصهيب الرومى (رَضِيَ اللّهُ تعالى عَنهُمَا)

٣٥١٠- عَنْ عَائِذِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَتَى عَلَى سَلْمَانَ وَصُهَيْبٍ الرُّومِيِّ وَبِلاَلٍ فِي نَفَرٍ فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَخَذَتْ سُيُوفُ اللَّهِ مِنْ عُنُقِ عَدُوِّ اللَّهِ مَأْخَذَهَا. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَتَقُولُونَ هَذَا لِشَيْخِ قُرَيْشٍ وَسَيِّدِهِمْ فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ. فَأَتَاهُمْ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: يَا إِخْوَتَاهْ أَغْضَبْتُكُمْ قَالُوا: لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ يَا أُخَيَّ. رواه مسلم[١]:

عائیزی كوڕی عەمر (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئەبو سوفیان لە پێش موسوڵمان بوونیا، لە كاتی پێكهاتن (هودنە)ی حودەیبییەدا بەلای سەلمان‌و صوهەیبی رۆمی‌و بیلالی حەبەشی‌و چەند موسوڵمانێكی تردا رەت دەبێ،

---

[٣] ذكره الشارح بصيغة الجزم (مترجم).

[١] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٦١.

دەڵێن: بە خودا ئەم دوشمنی خودایە هەر مایەوەو گەردنی بەر شیری قاری خودا نەکەوت! ئەبو بەکریش دەڵێ: چۆن قسەی وا بەسەر گەورەو ئاغای هەموو قورەیش دەڵێن؟! ئینجا دەچێ بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و ئەم باس‌و خواسەی عەرز دەکا، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی ئەبو بەکر! رەنگە تووڕەت کردبن، بزانە ئەگەر ئەوانت تووڕە کردبێ ئەوە بەبێ گومان خوداشت تووڕە کردووە! ئەبو بەکر (خودای لێ رازی بێ) دەچێتەوە بۆ لایان، دەڵێ: ئەی گەلی براینە! خۆ خوا نەخواستە تووڕە نەبوون لە قسەکەی من؟ دەڵێن: نەء، تووڕە نەبووین، خوا لێت خۆش بێ ئەی برالە! (م- نوقمی شەپۆلی میهری خودا بێ).

٣٥١١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْجَنَّةَ لَتَشْتَاقُ إِلَى ثَلاَثَةٍ عَلِيٍّ وَعَمَّارٍ وَسَلْمَانَ. رواه الترمذى بسند حسن[٢]:

لە ئەنەسەوە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) بەهەشت تا سەمەندی ئەم سێ کەسەیە: عەلی‌و عەممارو سەلمان (ت- س/ح).

٣٥١٢- عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَا مِنْ رَامَ هُرْمُزَ[٣]:

سەلمانی فارسی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: من خەڵکی رامە هورمزم (ب).

٣٥١٣- وَعَنْهُ أَنَّه تداوله بضعة عشر من رب إِلى ربٍّ[٤]:

دیسان سەلمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: زیاتر لە دە جار ئاییینی خۆم بە دڵ نەبووەو گۆڕیومە تا سەرەنجام لە سایەی خوداوە گەیشتم بە ئاواتی خۆم‌و ئاییینی راست‌و دروستی ئیسلامم دۆزییەوە (بوخاری. رەحمەت لە گۆڕی نازداری).

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٩٤٧.

[٤] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٩٤٦.

٣٥١٤- وَعَنْهُ قَالَ: فَتْرَةٌ مَابَيْنَ عِيسَى وَمُحَمَّدٍ سِتُّمِائَةِ سَنَةٍ. روى الثلاثة البخاري في مقدم النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) المدينة[٥]:

دیسان سەلمان (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: ماوەی بێ پێغەمبەری ناوەندی عیساو موحەممەد شەش سەد ساڵە (ب).

٣٥١٥- ورد في الشَّرح: وقد ورد في صُهيبٍ حديث: نعم العبد صُهيبٌ لو لم يخف الله لم يعصه[٦]:

لە شەرحەكەدا دەڵێ (خودای لێ ڕازی بێ): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: بە ڕاستی صوهەیب بەندەی چاكە، ئەگەر لە خواش نەترسێ‌و لێی ئەمین بێ هێشتا هەر نافەرمانی ناكا (غایەتولمەئموول).

## ٦١) یەكێكی تریان عەبدوڵڵای كوڕی سەلامە كە ئیسرائیلی بووە (ڕەزای خودای لێ بێ):

## ومنهم عبدالله بن سلام الاسرائيلي (رَضِيَ اللهُ عَنْه)

٣٥١٦- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ لأَحَدٍ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. إِلاَّ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمٍ قَالَ وَفِيهِ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ( وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ) عَلَى مِثْلِهِ[١]:

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم نەژنەوتووە بە كەسێ كە هێشتا لەسەر دنیابێ‌و بەسەر عەردەوە بگەڕێ بفەرموێ: ئەمە بەهەشتییە جگە لە عەبدوڵڵای كوڕی سەلام، گوتی: ئەم ئایەتەیش دەربارەی عەبدوڵڵا هاتە خوارەوە كە دەفەرموێ: وشهد شاهد من بني اسرائيل عَلى مثله (١٠/٤٦) واتە: شایەتێكی ڕاستگۆی قسە ڕەوای وا

---

[٥] بخارى مناقب الأنصار: ٣٩٤٨.

[٦] رواه الشارح بصيغة شبه جازمة.

[١] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٨١٢. مسلم. فضائل الصحابة/ ٦٣٣٠.

كە خودای گەورە ڕێزو مۆرك‌و دەگەرو قەدرو ئیعتیباری بۆ شایەتییەكەی داناوە كە لە نەوەی یەعقوب پێغەمبەرە، شایەتی دا لەسەر ئەوە كە ئەم قورئانە فەرموودەی خودایە (ش).

٣٥١٧- عَنْ قَيْسُ بْنُ عُبَادٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ فِي حَلْقَةٍ فِيهَا سَعْدُ بْنُ مَالِكٍ وَابْنُ عُمَرَ فَمَرَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ فَقَالُوا هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُمْ قَالُوا كَذَا وَكَذَا. قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ مَا كَانَ يَنْبَغِي لَهُمْ أَنْ يَقُولُوا مَا لَيْسَ لَهُمْ بِهِ عِلْمٌ، إِنَّمَا رَأَيْتُ كَأَنَّمَا عَمُودٌ وُضِعَ فِي رَوْضَةٍ خَضْرَاءَ، وَفِي رَأْسِهَا عُرْوَةٌ وَفِي أَسْفَلِهَا مِنْصَفٌ - وَالْمِنْصَفُ الْوَصِيفُ - فَقِيلَ لِي: ارْقَهْ. فَرَقِيتُ حَتَّى أَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ. فَقَصَصْتُهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَمُوتُ عَبْدُ اللَّهِ وَهُوَ آخِذٌ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى. وَفِي رِوَايَةٍ: تِلْكَ الرَّوْضَةُ الإِسْلاَمُ وَذَلِكَ الْعَمُودُ عَمُودُ الإِسْلاَمِ وَتِلْكَ الْعُرْوَةُ عُرْوَةُ الْوُثْقَى وَلَنْ تَزَالَ مُمسِكاً بِهَا حَتَّى تَمُوتَ. رواهما الشيخان[٢]:

قەیسی كوڕی عوبادە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەناو كۆڕێكا بووم سەعدی كوڕی مالیك‌و ئیبنو عومەریان تێدابوو، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام هات، گوتیان: ئەم پیاوە بەهەشتییە عەبدوڵڵا كە هاتە ناو مزگەوتەكەوە دوو ركات نوێژی سووكەڵەی پاك‌و پوختی كرد ئەوجا منیش هەڵسام چووم بۆ لای‌و پێیم گوت: ئەوانە وا وا دەڵێن‌و دەڵێن تۆ بەهەشتیت، گوتی: سوبحانەڵڵا! چۆن قسەی وا دەكەن؟ نەدەبوو شتێ كە بە باشی ئاگایان لێی نییە بیڵێن‌و بڵاوی بكەنەوە، شتەكە خۆی ئاوابوو وەك من پێت دەڵێم: لە خەوما دیم وەكو كۆڵەكەیەك لەناو باخێكی سەوزدا داچەقابێ ئاوا بوو، قوڵفەیێ بە نووچكەكەیەوە بوو، نۆكەرێ لە بنیا بوو، پێیان گوتم: ئادەی پیادا سەركەوە، منیش پیا سەركەوتم تا سەری سەرەوەو چووم قوڵفەكەیم گرت (گوتیان: دەست مەحكەم بگرە، كە خەبەر بوومەوە ئەڵقەكە لەناو دەستما بوو!) جا كە

---

[٢] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨١٣ ، ٧٠١٠ ، ٧٠١٤ (تجرید/ ٤ / ١٨٢ رقم: ١٤٩٧ / ٣٨١٣). مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٣١ — ٦٣٣٣.

ئەمەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: عەبدوڵڵا تا دەمرێ دەستبەندو قوڵفەی قایم (ئەل-عوروەتول ووثقا) بەر نادات لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو باخە ئیسلامەو ئەو کۆڵەکەیەش کۆڵەکەی ئیسلامە کە بریتییە لە پێنج روکنەو ئەو قوڵفەیەش قوڵفەی قایمە، واتە: عوروەتول ووثقا، کە بریتییە لە ئیمان، وەکوو خودا دەفەرموێ: فمن يكفر بالطاغوت وَ يؤمن بالله فَقَدْ استمسك بالعروة الوثقى (٢٥٦/٢) واتە: دەی هەر کەسێ باوەڕی بە شەیتان‌و دەستەی شەیتان نەبێ‌و حاشایان لێ بکاو لە هەمان کاتا باوەڕی تەواوی بە خودای خۆی هەبێ‌و ڕێگەی هەق بگرێ کە ڕێگەی خوداو پێغەمبەرەو بەس ئەوە بەڕاستی دەستی گرتووە بە دەستە بەندێکی ئەستووری مەحکەم‌و قایمی وا کە هەرگیز پسانی بۆ نییە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموشی: ئەی عەبدوڵڵا! تۆ لەسەر ئایینی ئیسلام دەمری‌و تا مردن ئەو قوڵفەو دەسبەندی ئیسلامە بەر نادەیت (ش= بوخاری‌و موسلیم: نوقمی میهری خودا بن).

٣٥١٨- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ فَقَالَ: أَلاَ تَجِيءُ فَأُطْعِمَكَ سَوِيقًا وَتَمْرًا، وَتَدْخُلَ فِي بَيْتٍ ثُمَّ قَالَ: إِنَّكَ بِأَرْضٍ، الرِّبَا بِهَا فَاشٍ، فَإِذَا كَانَ لَكَ عَلَى رَجُلٍ حَقٌّ فَأَهْدَى إِلَيْكَ حِمْلَ تِبْنٍ، أَوْ حِمْلَ شَعِيرٍ أَوْ حِمْلَ قَتٍّ، فَلاَ تَأْخُذْهُ، فَإِنَّهُ رِبًا. رواه البخاري[٣]:

ئەبو بوردە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: چوومە مەدینە تووشی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بووم، گوتی: بۆ نایەیت لەگەڵما بچین لە ماڵەوە قاوت‌و خورمات بدەمێ بیخۆی، وە بشچیتە ناو ئەو ماڵەی منەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چووەتە ناوی‌و پیرۆزی کردووە؟ لە دواییدا، عەبدوڵڵا گوتی: ئەو وڵاتی عێراقە کە تۆی لێیت سوودی تیا بڵاوبۆتەوە، جا ئەگەر دنیا بوو هەقێکت لەسەر کابرایێ بوو، کابرا بارێ کا، یا بارێ جۆی بە دیاری بۆ

---

[٣] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٨١٤ ، ٧٣٤٧.

هێنای لێی وەرمەگرە، چونكە ئەوەیشە هەر سوودەو سوودیش حەرامە، وەك لەم فەرموودەدا دەفەرموێ: هەر قەرزێ قازانجی تیا بێ ئەوە سوودە (ب).

٣٥١٩- لَمَّا حَضَرَ المَوت مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) قِيلَ لَهُ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَوْصِنَا. قَالَ أَجْلِسُونِي. فَقَالَ إِنَّ الْعِلْمَ وَالإِيمَانَ مَكَانَهُمَا مَنِ ابْتَغَاهُمَا وَجَدَهُمَا قَالَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثم قَالَ: الْتَمِسُوا الْعِلْمَ عِنْدَ أَرْبَعَةِ رَهْطٍ عِنْدَ عُوَيْمِرٍ أَبِى الدَّرْدَاءِ وَعِنْدَ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ وَعِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ وَعِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمٍ الَّذِى كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّهُ عَاشِرُ عَشَرَةٍ فِى الْجَنَّةِ[٤]:

لەكاتی سەرەمەرگا عەرزی موعازی كوڕی جەبەل كرا (خودای گەورە لێی خۆش نوود بێ) ئەی باوكی ئەوڕەحمان! ئامۆژگاریمان بكە، گوتی: دام نیشێنن! ئینجا سێ جار گوتی: زانست‌و بڕواو عیلم‌و ئیمان لە جێگەی خۆیانن، هیچیان لێ نەهاتووەو بە مردنی من‌و وێنەی من خوا یار بێ نافەوتێن هەر كەسێ هەوڵیان بۆ بدات وە دەستیان دێنێ، لە پاشدا گوتی: لەلای ئەم چوار كەسەیە عیلم‌و زانین وەربگرن‌و فێری شەریعەتی ئیسلام ببن: لەكن عووەیمیر (واتە: ئەبو دەردا)و سەلمانی فارسی‌و عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودو عەبدوڵڵای كوڕی سەلام، (ئەوەی كە لە پێشدا جوولەكە بوو ئێستا موسوڵمانە) چونكە خۆم بە گوێی خۆم ژنەوتم لە زاری پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: عەبدوڵڵای كوڕی سەلام دەهەمی دەكەسە بەهەشتییەكانە (ت-س/ص).

٣٥٢٠- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا أُرِيدَ قَتْلُ عُثْمَانَ جِئْتُ، فَدَخَلْتُ فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ؟ قُلْتُ: جِئْتُ فِى نَصْرِكَ. قَالَ اخْرُجْ إِلَى النَّاسِ فَاطْرُدْهُمْ عَنِّى فَإِنَّكَ خَارِجًا خَيْرٌ لِى مِنْكَ دَاخِلاً. فَخَرَجْتُ فَقُلْتُ أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ كَانَ اسْمِى فِى الْجَاهِلِيَّةِ فُلاَنٌ فَسَمَّانِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَبْدَ اللَّهِ وَنَزَلَتْ فِيَّ آيَاتٌ

---

[٤] رواه الترمذي بسند صحيح.

مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَنَزَلَتْ فِيَّ (وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِى الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) وَنَزَلَتْ فِيَّ (قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ) إِنَّ لِلَّهِ سَيْفًا مَغْمُودًا عَنْكُمْ وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ قَدْ جَاوَرَتْكُمْ فِى بَلَدِكُمْ هَذَا الَّذِى نَزَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاللَّهَ اللَّهَ فِى هَذَا الرَّجُلِ أَنْ تَقْتُلُوهُ فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَتَلْتُمُوهُ لَتَطْرُدُنَّ جِيرَانَكُمُ الْمَلاَئِكَةَ وَلَتَسُلُّنَّ سَيْفَ اللَّهِ الْمَغْمُودَ عَنْكُمْ فَلاَ يُغْمَدُ عَنْكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. قَالُوا اقْتُلُوا الْيَهُودِىَّ وَاقْتُلُوا عُثْمَانَ. رواهما الترمذى الأول بسند صحيح والثانى بسند غريب[٥]:

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: لەوکاتەدا کە دەیانویست عوسمان بکوژن من چووم بۆلای گوتی: بۆچی هاتوویت؟ گوتم: بۆ یارمەتی تۆ هاتووم، گوتی: دەبڕۆ دەرەوە بۆلای ئەم خەڵکەو لە دەورم دەریان کە چونکە تۆ لە دەرەوە قازانجت زیاترە بۆ من تا لە ژوورەوە، منیش دەرچووم‌و چووم گوتم: ئەی خەڵکینە! من لە سەردەمی نەزانی پێش ئیسلامدا ناوم فیساربوو، بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناوی نام عەبدوڵڵا، وە دەربارەی من چەن ئایەت لە نامەی خودا هاتنە خوارەوە، کە ئەمە یەکێکیانە:

{وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ – ٤٦ / ١٠}.

واتە: ئەی خۆشەویست! تۆ پێیان بفەرموو: ئا پێم بڵێن: ئەگەر ئەم قورئانە پیرۆزە لە لایەنی خودای گەورەوە بێ‌و ئێوە بە لاساری باوەڕی پێ نەکەن‌و وەڵحاڵ شایەتێکی ڕاستگۆی قسە ڕەوا لە کۆمەڵی نەوەی ئیسرائیل شایەتی دا لەسەر ئەوە کە ئەم قورئانە فەرموودەی خودایەو خۆی باوەڕو ئیمانی هێنا، بەڵام ئێوە دیسان باوەڕتان نەکردو خۆتان بە زل زانی‌و دەمار گرتنی‌و فیزو دەعیەو خۆ بە زل گرتن نەیهێشتن حەق قەبووڵ بکەن‌و نەچونە ژێری ئەوسا چۆن ئێوە لە تۆڵەی خودا دەردەچن؟ بەڵام بە داخەوە ئەمانە لە

[٥] رواه الترمذي بسند غريب.

دەستەی ستەمکارانن، قسەی هەق ناژنەون، چونکی بە راستی خودای گەورە ستەمکارەکان شارەزا ناکا. وە ئەمە یەکێکی تریانە کە دەفەرموێ:

{قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ – ٣ /٤٣}.

واتە: دەڵێن: تۆ لەلای خوداوە نەنێرراوی! بفەرموو: بەسە خودای دانا و زانا بە شایەت لەسەر پایەی رەهبەری من، من شایەتی ئەوم بەسە، هەر ئەویش بەسە کە خۆی دادوەربێ و مەحکەمەی من و ئێوە بکا، وە ئەو کەسانەش کە شارەزان لە تەورات و ئینجیل) ئەوجا عەبدوڵلا لەپاش خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە لەسەر قسەکەی رۆیشت و درێژەی پێدا و گوتی: خانە خراپینە! چاوتان بکەنەوە، دەزانن ئێوە خەریکی چی گۆبەنێکن، ئێوە خەریکن بە دەستی خۆتان گۆڕ بۆ خۆتان هەڵ دەکەنن و خودا لە خۆتان دەرەنجێنن و فریشتەکانی دراوسێتان دەتۆرێنن؟! باش بزانن کە شمشێری خودا لە ئاستی ئێوە لە کالاندایەو نووقاوەو لەم شارە پیرۆزەدا کە رەوگەو مەهجەری پێغەمبەری ئێوەیە فریشتەکان لە خۆشی ئەوە هاوسێتیتان دەکەن، بۆ خاتری خودا دیسان بۆ خاتری خودا واز لەم پیاوە بێنن و نەکەن بیکوژن و دەستتان بچێ بە خوێنیدا! چونکە بە خودا ئەگەر شتی وا بکەن و خوێنی بڕێژن و شەهیدی بکەن ئەوا فریشتەکانی هاوسێتان دەردەکەن و شمشێرەکەی قاری خودا کە ئێستا لە کالاندایە لە خۆتانی دەخەن کار، ئەو شمشێرەیش کە رووتکراو هەڵکێشرا لێتان ئیتر تا رۆژی قیامەت ناخرێتەوە کێلان و هەتا هەتایە موسوڵمانان لەناو خۆیاندا خوێنی یەکتری دەڕێژن! (وەك ئەمەی کە ئێستا ئێمە لەپاش هەزار و چوار سەد ساڵ لە هەموو لایێ بە چاوی خۆمان دەیبینین) عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کەچی کە ئەمەم پێ گوتن گوتیان: ئادەی ئەم جوولەکەیەش لەگەڵ عوسماندا بکوژن! (ت–سەنەد غەریب).

سوێندم بە خودا ئێستاش هەر وایە
رێی هەق نیشاندان تۆڵەی سزایە!
دەمێ زیندانی بێ زمانت بێ
ترسی زەمانە و دوو زمانت بێ!!

هەزار رەحمەت لە ئیمامی جەزەری کە لە (ذات الشفا)دا دەڵێ:

فـذَبَحُوهُ تَالِي القُـرْآنِ * بَيْنَ يَدَيهِ الْمُصْحَفُ العُثماني

واتە:

وەک بەرخ سەربڕی، سەربڕا عوسمان

کاتی شەهید بوون قورئان لەسەر ڕان

-وەرگێڕ-

## ٦٢) یەکێکی تریان ئەبو هورەیرەیە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ): ومنهم أبو هريرة (رَضِي اللّٰهُ تعالى عَنه)

٣٥٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: يَقُولُونَ إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَدْ أَكْثَرَ وَاللّٰهُ الْمَوْعِدُ وَيَقُولُونَ مَا بَالُ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ لاَ يَتَحَدَّثُونَ مِثْلَ أَحَادِيثِهِ وَسَأُخْبِرُكُمْ عَنْ ذَلِكَ إِنَّ إِخْوَانِي مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَلُ أَرَضِيهِمْ وَإِنَّ إِخْوَانِي مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ وَكُنْتُ أَلْزَمُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى مِلْءِ بَطْنِي فَأَشْهَدُ إِذَا غَابُوا وَأَحْفَظُ إِذَا نَسُوا وَلَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا « أَيُّكُمْ يَبْسُطُ ثَوْبَهُ فَيَأْخُذُ مِنْ حَدِيثِي هَذَا ثُمَّ يَجْمَعُهُ إِلَى صَدْرِهِ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْسَ شَيْئًا سَمِعَهُ. فَبَسَطْتُ بُرْدَةً عَلَيَّ حَتَّى فَرَغَ مِنْ حَدِيثِهِ ثُمَّ جَمَعْتُهَا إِلَى صَدْرِي فَمَا نَسِيتُ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ شَيْئًا حَدَّثَنِي بِهِ وَلَوْلاَ آيَتَانِ أَنْزَلَهُمَا اللّٰهُ فِي كِتَابِهِ مَا حَدَّثْتُ شَيْئًا أَبَدًا (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى) إِلَى آخِرِ الآيَتَيْنِ. رواه مسلم والبخاری والترمذی[1]:

➡ (ب- ٥ ز- ١٨ رقم: ٢/ ٣٣٥٣) لێرەدا ئاوایە: ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەڵێن: ئەبو هورەیرە فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە، وادەی من‌و ئەوان دیوانی خودا بێ، دەڵێن: ئەی بۆ کۆچکاران‌و یاریدەدەران بە قەد ئەو

---

[1] تجرید / ١ ل – ١٢٠ رقم: ٩٧ / ١١٨ ، ١١٩ ، ٢٠٤٧ ، ٢٣٥٠ ، ٣٦٤٨ ، ٧٣٥٦ (راجع رقم: ٢ / ٣٣٥٣ فی هذا المجلد) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٤٧ – ٦٣٥٠.

فەرموودەو حەدیثی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناگێڕنەوە؟ دەی خۆم پێتان بڵێم كە ئەمە بۆ وایە، چونكە برا یاریدەدەرەكانمان خەریكی خۆش كردنی زەوی‌و زار بوون‌و برا كۆچكارەكانیشمان خەریكی سەواو ئاڵو وێڵی ناو بازار بوون، بەڵام من (بە نانە سكی) دەلكام بە پێغەمبەرەوەو خزمەتی ئەوم بەرنەدەدا، ئەوانیش لەوێ نەبوونایە من هەر لە خزمەتیا دەبووم، گەلێ شت هەبوو ئەوان دەستیان نە دەپەرژا لەبەری بكەن لەبەرئەوە لە بیریان دەچۆوە، بەڵام من مەودام هەبوو، لە بەرم دەكردو بە باشی رەوانم دەكرد، سەرەڕای ئەوەش هۆیەكی گرنگتر هەیە: رۆژێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كامتان دەیەوێ كە فەرموودەی من وەربگرێ‌و لە بیری نەچێ، با جلەكەی داخات‌و لەم فەرموودانەی منی تێكاو لەپاشا كە من لێ بوومەوە لە قسەكردن جلەكەی كۆ بكاتەوەو بینێت بە سینگیەوە، ئیتر هەر فەرموودەیێ لە من ببیستێ قەت لە بیری ناچێ جا منیش بەرماڵێكم بەسەر شانەوە بوو، رام خست هەتا لە فەرمایشتەكەی لێ بۆوە، ئینجا چمەكەكانی بەرماڵەكەم كۆ كردەوەو گرتم بە سینگ‌و بەرۆكمەوە، ئیتر لەو رۆژە بە دواوە پێغەمبەر هەرچی فەرموو بێ پێم فەرامۆشم نەكردووەو قسەی ئەوم لەبیر نەچووە! لەبەر ئەم دوو ئایەتەش نەبێ كە خودا لە نامەی خۆیدا ناردوونی، بڕای بڕای هیچ فەرموودەیەكم نە دەگێڕایەوە، ئەمەیش ئەو دوو ئایەتانەیە:

{إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ. إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ – ٢/١٥٩-١٦٠}.

واتە: بەڕاستی ئەو زانایانە كە ئەو ئایەت‌و بەڵگە رۆشنانە دەشارنەوە، كە ئێمە نازڵمان كردوون بۆ شارەزا كردنی بەرەی ئادەم بۆ رێگەی راست، پاش ئەوەی كە زۆر بە جوانی بە پێی پێداویست‌و شوێن رۆشنمان كردنەوە لە تەوراتا، كە نامەی خودایە، تا ئەو خەڵكە تێ بگەن. بەڕاستی ئەم بە ناو زانایانە، ئەم جۆرە مالووم‌و قەشە هەق حەشار دەرانە هەموویان خودای

گەورە خۆی لەعنەت‌و نەفرینیان لیٚ دەكا، وە هەروەها نەفرینكەرانی تریش لەعنەت‌و نەفرینیان لیٚ دەكەن، وەك فریشتەكانی خوداو پیاوانی سەر بە ئایین، مەگەر ئەوانەیان كە پەشیمان ببنەوە لە شاردنەوەی زانستی ئایینی وە خوو رەوشت‌و رەفتارو كرداری خۆیان چاك بكەن، وە شتە حەشاردراوەكەیان ئاشكرا كردو دەریان بڕی، تەنیا ئەمانەیان تەوبەو پەشیمانبوونەوەیان لیٚ گیرا دەكەم، چونكی من تەوبەو پەشیمانی بەندەی تەوبەكاری پەشیمانی خۆم قەبووڵ دەكەم من لە هەموو كەسیٚ میهرەبانترم بۆ بەندەی خۆم (ش/ت).

٣٥٢٢- وَعَنْهُ قَالَ: كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ وَهِيَ مُشْرِكَةٌ، فَدَعَوْتُهَا يَوْمًا فَأَسْمَعَتْنِي فِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا أَكْرَهُ فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا أَبْكِي قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ فَتَأْبَى عَلَيَّ فَدَعَوْتُهَا الْيَوْمَ فَأَسْمَعَتْنِي فِيكَ مَا أَكْرَهُ فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَهْدِيَ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَالَ اللَّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ. فَخَرَجْتُ مُسْتَبْشِرًا بِدَعْوَةِ نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا جِئْتُ الْبَابَ فَسَمِعَتْ أُمِّي خَشْفَ قَدَمَيَّ فَقَالَتْ: مَكَانَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ. وَسَمِعْتُ خَضْخَضَةَ الْمَاءِ قَالَ: فَاغْتَسَلَتْ وَلَبِسَتْ دِرْعَهَا وَعَجِلَتْ عَنْ خِمَارِهَا فَفَتَحَتِ الْبَابَ ثُمَّ قَالَتْ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا أَبْكِي مِنَ الْفَرَحِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَبْشِرْ قَدِ اسْتَجَابَ اللَّهُ دَعْوَتَكَ وَهَدَى أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ. فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ خَيْرًا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُحَبِّبَنِي أَنَا وَأُمِّي إِلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ وَيُحَبِّبَهُمْ إِلَيْنَا، قَالَ: اللَّهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ هَذَا - يَعْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ وَأُمَّهُ - إِلَى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ وَحَبِّبْ إِلَيْهِمُ الْمُؤْمِنِينَ. فَمَا خُلِقَ مُؤْمِنٌ يَسْمَعُ بِي وَلاَ يَرَانِي إِلاَّ أَحَبَّنِي. رواه مسلم[٢].

دیسان گوتی: دایكم بتپەرست بوو، دەم ویست ئیسلامی بكەم ملی نەدەدا، جا رۆژیٚ دام بە گوییٚ دا كە موسوڵمان بیٚ، كەچی قسەی ناشرینی

---

[٢] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٤٦.

بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوت، منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو، بە گریان چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ماوەیەکە دەمەوێ دایکم موسوڵمان بکەم، بەڵام مل نادا، ئەمڕۆ رووم لێ نا کە موسوڵمان ببێ، بەڵام بە گوێی نەکردم‌و سەرەڕای ئەوەش قسەی ناخۆشی بە تۆ گوت، کە زۆرم پێ ناخۆشە، جا لە خودا داوا بکە کە رێگەی راستی پێ نیشان بدا، فەرمووی: ئەی خودایە! رێنموونی دایکی ئەبو هورەیرە بکە جا منیش بە دڵێکی خۆشەوە بە هۆی نزاکەی پێغەمبەرەوە گەڕامەوە، کە گەیشتمە بەر دەرگا دایکم گوێی لە دەنگ‌و خشپەی پێم بوو، گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە! لە جێی خۆت بوەستە. لە هەمان کاتا گوێشم لە خوڕەو شڵپە شڵپی ئاو بوو. گوتی: تەمەز ئەمە خۆی دەشۆرێ، لەپاشا کراسەکەی لەبەرکردو دەرگاکەی کردەوە، لە خۆشیانا لە بیری چوو بوو سەرپۆشەکەی بداتەوە بەسەر خۆیدا، ئینجا دایکم گوتی: اشهد ان لا الـه الا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله: شایەتی دەدەم بە زوبان‌و بە دەم وە بە دڵ باوەڕ دەکەم کە هیچ خودایێ نییە یەزدانی پاك نەبێ، وە گەواەو شایەتی دەدەم بە دەم‌و بە دڵ کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری ئەوە. ئیتر منیش بە دڵخۆشی گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەڵام لە خۆشیانا دەستم کرد بە گریان، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! موژدەت لێ بێ خودا دووعاو نزاکەی تۆی گیرا کرد، دایکم لە سایەی خوداوە موسوڵمان بوو، رێی هەقی گرت، جا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ستایش‌و سوپاسی خودای کردو گەلێ قسەی باشی فەرموو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بپارێرەوە لە خودا کە من‌و دایکم لەلای موسوڵمانانی بەندەکانی خۆی خۆشەویست بکاو ئەوانیش لەلای ئێمە خۆشەویست بکا، فەرمووی: ئەی خودایە! ئەم بەندۆ کە بەندە بچکۆلەی خۆت لەگەڵ دایکیا هەردووکیان خۆشەویست بکە لەلای موسوڵمانانی بەندەکانی خۆت وە موسوڵمانانیش خۆشەویست بکە لەلای ئەمان! ئەبو هورەیرە (خوای لێ خۆش نوود بێ) گوتی: بۆیە ئەوەی موسوڵمان بێ‌و ناوی من ببیستێ منی خۆش دەوێ، با خۆشم نەبینێ! (م– نوقمی میهری خودا بێ).

٣٥٢٣- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ: لِي رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مِمَّنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِنْ دَوْسٍ. قَالَ: مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ فِي دَوْسٍ أَحَدًا فِيهِ خَيْرٌ[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: لە چی تیرەیەکیت؟ عەرزیمکرد: لە تیرەی دەوسم، فەرمووی: لەمەو پێش وام دەزانی، کە کەس نییە لە تیرەی دەوس خێری پێوەبێ وەلێ لە خودا بە زیاد بێ، کە لە بەرەکەتی ئیسلامەوە لە تیرەی دەوسا پیاوی باشی وەك تۆ هەیە (ت-ص).

٣٥٢٤- وَعَنْهُ قَالَ: لَيْسَ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنِّي إِلاَّ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرٍو فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَكُنْتُ لاَ أَكْتُبُ[٤]:

دیسان دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری لێ دەرچێ کەسی تر بە قەد من ئاوا زۆر فەرمایشتی پێغەمبەری لەبەر نییە، چونکە ئەو خوێنەواربوو دەینووسییەوە، بەڵام من خەتم نەبوو، نەم دەنووسی (ت-ص).

٣٥٢٥- وَقِيلَ لأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لِمَ كُنِّيتَ أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: كُنْتُ أَرْعَى غَنَمَ أَهْلِي فَكَانَتْ لِي هُرَيْرَةٌ صَغِيرَةٌ فَكُنْتُ أَضَعُهَا بِاللَّيْلِ فِي شَجَرَةٍ فَإِذَا كَانَ النَّهَارُ حَمَلْتُهَا مَعِي فَلَعِبْتُ بِهَا فَكَنَّوْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ[٥]:

گوتیان بە ئەبو هورەیرە (رەزای خودای گەورەو مەزنی لێ بێ) بۆ پێت دەڵێن: ئەبو هورەیرە (بە کوردی واتە: پشیلەوان، یاخود: باوکی پشیلووکە)؟ گوتی: شوانی رانی ماڵی خۆمان بووم، پشیلۆکەیەکی بچکۆلەم هەبوو، بە شەو لە ناو درەختێکا دام دەناو بە رۆژ هەڵم دەگرت‌و یاریم پێ دەکرد، ئیتر بەم بۆنەیەوە ناویان نام ئەبو هورەیرەو ئەم ناوە بوو بە کەسناو (کونیە)م (ت-س/ح).

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٣٥٢٦- وَعَنْهُ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِتَمَرَاتٍ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ فِيهِنَّ بِالْبَرَكَةِ. فَضَمَّهُنَّ ثُمَّ دَعَا لِي فِيهِنَّ بِالْبَرَكَةِ فَقَالَ لِي: خُذْهُنَّ وَاجْعَلْهُنَّ فِي مِزْوَدِكَ هَذَا كُلَّمَا أَرَدْتَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا فَأَدْخِلْ فِيهِ يَدَكَ فَخُذْهُ وَلاَ تَنْثُرْهُ نَثْرًا. قَالَ: فَقَدْ حَمَلْتُ مِنْ ذَلِكَ التَّمْرِ كَذَا وَكَذَا مِنْ وَسْقٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَكُنَّا نَأْكُلُ مِنْهُ وَكَانَ لاَ يُفَارِقُ حَقْوِي حَتَّى كَانَ يَوْمُ قَتْلِ عُثْمَانَ فَإِنَّهُ انْقَطَعَ.روى الترمذى هذه الأربعة[٦]:

دیسان دەڵێ: چەند دەنكێك خورمام برد بۆلای حەزرەت (دروودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەو مەزن‌و پیرۆزی لێ بێ) عەرزیمكرد: قوربان! ئەی رەوانەكراوی خودا! لە خودا داوا بكە كە پیت‌و فەڕیان تێ بخات، ئەویش كۆیكردنەوەو دووعای بەرەكەتی بە سەریاندا خوێندو فەرمووی: هەڵیان گرەوەو بیانكەرە ئەم نانە بەرەیەی خۆتەوە، هەموو جارێ كە ویستت هەنێكی لێ دەركەی دەستی پیابكەو هەنێ دەركە، بەڵام هەڵی مەرێژەو تەواو خاڵی مەكە گوتی: لەو تۆزە خورمایە چەندەها ربەم لێ بەخشیوە بەم‌و بەو لە رێگەی خوادا، خواردنی خۆشمانی لەسەر بوو، خۆشمان لێمان دەخوارد، هەمیشە ئەو نانە بەرەیە لە پشتمابوو، هەتا ئەو رۆژەی عوسمان كوژرا، ئیتر پچڕایەوەو لە شوومی ئەو رۆژە رەشەوە پیت‌و فەڕی چوو بە حەوادا (ت- سەنەد غەریب) مەولەوی (نوقمی رەحمەتی خودای میهرەبان بێ) لە مەدحی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) بە شیعر دەڵێ:

لەمە عەجیب تر موعجیزە مەشنەو

نۆمی‌و عەللامەو هەتیو بە نەدەو[١]:

---

[٦] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١] نە خوێندەواری‌و هەتیوی بۆنی كەمییان لێ دێ، بۆیە مەولەوی پێش ئەوەی بیانكا بە صیفەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دایناون بە موعجیزەو بەهرەیەكی گەورە، وەلێ من ئەم ئایەتە پیرۆزەم كردووە بە سەرمەشق كە دەفەرموێ: ما كنت تدرى ما الكتاب ولا الايمان ولكن جعلناه نورا نهدى به من نشاء. مەبەستم ئەوەیە ئەم جۆرە تەعبیرەی منیش سەر چەشمەكەی رۆشنە بێ ویڵی نییە لە خزمەت ئەم زاتانەدا. (وەرگێڕ)

بەندەیش لە مەدحی فەقێ دڵسۆزەکەی پێغەمبەری نازداردا، ئەبو هورەیرەی خۆشەویستی هەموو ئوممەتی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر خۆی و رەحمەتی خودا لە ئوممەتی پیرۆزی) بەندەیش لە مەدحی ئەودا دەڵێم:

ئەبو هورەیرەی شوانی بزن و مەڕ
نە خوێندەواری نە دارای بێدەر
لە سایەی خواوەو نزای پێغەمبەر
بوو بە مەحبووبی ئوممەتی رەهبەر
بوو بە شاسواری فەرموودەی سەروەر
بوو بە زانایێ، داناو بەهرەوەر
یادی گوڵێکە بۆ دڵ و جگەر!!
ناوی تاجێکە شا دەیکاتە سەر!!
یادو ناوەکەی گوڵ و بۆی باخە
دڵ (بە ناز) داویە لە هەردوو یاخە
بۆیە هەمیشە وا بە دەماخە
لەو بۆو بەرامەی لەناو دەماخە

(وەرگێڕ)

## ٦٢) دووکەسی تریان ئەبو مووساو ئەبو عامیری ئەشعەرین (خوایان لێ رازی بێ)
## ومنهم أبو موسى وأبو عامر الأشعريان (رَضِي اللّهُ تعالى عَنهما)

٣٥٢٧- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَهُوَ نَازِلٌ بِالْجِعْرَانَةِ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَتَى أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ أَلاَ تُنْجِزُ لِي مَا وَعَدْتَنِي يَا مُحَمَد، فَقَالَ لَهُ رَسُولَ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) أَبْشِرْ. فَقَالَ لَهُ الأعرابيُّ: أَكْثَرْتَ عَلَيَّ مِنْ أَبْشِرْ. فَأَقْبَلَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَلَى أَبِي مُوسَى وَبِلاَلٍ كَهَيْئَةِ الْغَضْبَانِ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا رَدَّ الْبُشْرَى فَاقْبَلاَ أَنْتُمَا. فَقَالاَ: قَبِلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ ثُمَّ دَعَا رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِقَدَحٍ

فِيهِ مَاءً فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ، وَمَجَّ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: اشْرَبَا مِنْهُ، وَأَفْرِغَا عَلَى وُجُوهِكُمَا وَنُحُورِكُمَا، وَأَبْشِرَا. فَأَخَذَا الْقَدَحَ فَفَعَلاَ مَا أَمَرَهُمَا بِهِ النَّبِى، فَنَادَتْ أُمُّ سَلَمَةَ مِنْ وَرَاءِ السِّتْرِ أَنْ أَفْضِلاَ لأُمِّكُمَا. فَأَفْضَلاَ لَهَا مِنْهُ طَائِفَةً. رواه الشيخان والترمذى[1]:

ئەبو مووسا (خوای لێ خۆش نوود بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، لە جیعرانە دابەزیبوو (کە لە نێوانی مەککەی پیرۆزو مەدینەی نازدار دایە) بیلالیشی لە خزمەتا بوو، عارەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی گوتی: ئەی موحەممەد! گفتت داومەتێ، کوا گفتەکەت! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: موژدەبێ لە تۆ. ئەویش پێی گوت: زۆرت پێ گوتووم موژدەبێ لە تۆ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەك كەسێ دڵگیر بێ لە قسەكەی رووی کردە ئەبو مووساو بیلال‌و فەرمووی: ئەمە مژدەی ناوێ‌و دایەوە بە سەرما، دەی ئێوە وەریبگرن بۆ خۆتان ئەوانیش گوتیان: قوربان! ئێمە قبووڵمانە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) داوای جامێ ئاوی کردو هەردوو دەست‌و دەم‌و چاوی خۆی تیا شۆردو قومێ ئاوی هەڵگرت‌و لە دەمی خۆی وەرداو تفانیەوە ناو جامەکە. ئینجا فەرمووی: لێی بخۆنەوەو لێی بپرژێنن لە دەم‌و چاوو سینگ‌و بەرۆکی خۆتان، وە موژدەبێ لێتان ئەوانیش جامەکەیان لێ وەرگرت‌و فەرمانەکەی پێغەمبەریان بەجێ هێنا، ئوممو سەلەمەیش لە پشتی پەردەوە بانگی لێ کردن: لە ئاوی جامەکەتان بەشی ئەم دایکی خۆشتانە بهێڵنەوە، ئەوانیش چۆڕێکیان تیادا هێشتەوە بۆی (ش/ت- خوایان لێ رازی بێ).

٣٥٢٨- عَنْ أَبِى بُرْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا فَرَغَ النَّبِىّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ حُنَيْنٍ بَعَثَ أَبَا عَامِرٍ عَلَى جَيْشٍ إِلَى أَوْطَاسٍ فَلَقِىَ دُرَيْدَ بْنَ الصِّمَّةِ فَقُتِلَ دُرَيْدٌ وَهَزَمَ اللَّهُ أَصْحَابَهُ فَقَالَ أَبُو مُوسَى وَبَعَثَنِى مَعَ أَبِى عَامِرٍ، فَأَصَابَهُ بِسَهْمٍ فِى رُكْبَتِهِ، رَجُلٌ مِنْ بَنِى جُشَمٍ فَلَحِقْتُهُ فَقَتَلْتُهُ ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى أَبِى عَامِرٍ، فَنَزَعْتُ السَّهْمَ مِنْ رَكْبَتِهُ فَنَزَا مِنْهُ الْمَاءُ وَاسْتَعْمَلَنِى أَبُو عَامِرٍ عَلَى النَّاسِ، وَقَالَ: انْطَلِقْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

[1] بخارى. مغازى: ٤٣٢٨ (تجريد / ٤ / ٣٣٩ رقم: ١٥٩٤ / ٤٣٢٨ ، ١٨٨ ، ١٩٦). مسلم. فضائل: ٦٣٥٥.

فَأَقْرِئْهُ مِنِّي السَّلَامَ وَقُلْ لَهُ استغفر لأبِي عَامرٍ وَمَكَثَ يَسِيرًا وَمَاتَ رَحْمَهُ اللهِ فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي بَيْتٍ عَلَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وَعَلَيْهِ فِرَاشٌ وَقَدْ أَثَّرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بِظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَنْبَيْهِ فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِنَا وَخَبَرِ أَبِي عَامِرٍ وَطَلَبِهِ الإستغفارَ. فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدِكَ أَبِي عَمرٍ اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ أَوْ مِنَ النَّاسِ. فَقُلْتُ: وَلِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَاسْتَغْفِرْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلاً كَرِيمًا. قَالَ أَبُو بُرْدَةَ إِحْدَاهُمَا لأَبِي عَامِرٍ وَالأُخْرَى لأَبِي مُوسَى. رواه الشيخان[٢]:

ئەبو بوردە (رەزای خودای لێبێ) گوتی: باوکم گوتی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە غەزای حونەین لێ بووەوە، ئەبو عامیری مامەی کرد بە سەرکردەی لەشکرێك‌و ناردی بۆ دۆڵی ئەوطاس، لەوێ بەرەنگاری دورەیدی کوڕی صیممە بوو، وە دورەید خۆی کوژراو هاوڕێکانی (لە سایەی خواوە لە شەڕەکەدا دەشکێن‌و هەڵدێن)، ئەبو مووسا گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) منیشی لەگەڵ ئەبو عامیردا ناردبوو، لە شەڕەکەدا کابرایەکی بەنی جەشەمی تیرێکی لە ئەژنۆی ئەبو عامیردا، منیش نیشتمە سەری‌و کوشتم، گەڕامەوە بۆلای ئەبو عامیر کە تیرەکەم لە ئەژنۆی دەرکێشا لەجێی تیرەکەوە ئاوی لێ هات، ئەبو عامیر منی لە جێی خۆیکرد بەسەر لەشکرو گوتی: کە چوویتەوە بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سڵاوی منی پێ بگەیەنەو عەرزی بکە: بۆ ئەبو عامیر بپاڕێرەوە، ئیتر نەختێ ژیاو لەپاشا گیانی پاکی سپارد (رەحمەت‌و رەزای خودای گەورەی لێ بێ)، کە گەڕامەوە چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵەوە بوو، لەسەر تەختێ بوو، رایەڵی تەختەکە بە پووشی پەلکە خورما چنرابوو، ئەوەی پێی بڵێی بەڕەو رایەخ بە سەریەوە نەبوو، پەلکە خورماکانی رایەڵی چارپایەکە چەقیبوونە پشتوو هەردوو

---

[٢] بخاری. جهاد وسیر: ٢٨٨٤ (تجرید/ ٤ / ٣٣٤ ذمارة / ١٥٩٠ ، ٤٣٢٣ ، ٢٨٨٤ ، ٦٣٨٣). مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٥٦.

تەنیشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ)و شوێنی شریتی تەختەکە وەك نەخش نەخشابوو، جا دەنگ‌و باسی خۆمان‌و باسو خواسی ئەبو عامیرم بۆی گێڕایەوە، ئەوەشم بۆی گێڕایەوە کە ئەبو عامیر داوای کردووە لێی کە بۆی بپاڕێتەوە، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەسنوێژی گرت‌و هەردوو دەستی ئەوەندە هەڵبڕی هەتا سپێدەی هەردوو بن باخەڵیم دی، وە فەرمووی: خودایە! خۆش ببە لە بەندە بچکۆلەکەی خۆت لە ئەبو عامیر، ئەی خودایە! لە ڕۆژی قیامەتا لە سەرووی زۆر لە دروستکراوانی خۆتەوە داینێ یا فەرمووی: لە سەرووی زۆر کەسی ترەوە دایبنێ! منیش گوتم: قوربان! دەبۆ منیش داوای لێ خۆش بوون بکە، فەرمووی: خودایە! لە گوناهی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس خۆش ببەو لە ڕۆژی قیامەتا لە پایەیەکی بەڕێزدا دایبنێ ئەبو بوریدە گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم دوو نزایەی کرد، یەکێکیان بۆ ئەبو عامیرو ئەوی تریشیان بۆ ئەبو مووسا (ش).

٣٥٢٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي لأَعْرِفُ أَصْوَاتَ رُفْقَةِ الأَشْعَرِيِّينَ بِالْقُرْآنِ، حِينَ يَدْخُلُونَ بِاللَّيْلِ، وَأَعْرِفُ مَنَازِلَهُمْ مِنْ أَصْوَاتِهِمْ بِالْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ، وَإِنْ كُنْتُ لَمْ أَرَ مَنَازِلَهُمْ حِينَ نَزَلُوا بِالنَّهَارِ، وَمِنْهُمْ حَكِيمٌ، إِذَا لَقِيَ الْخَيْلَ - أَوْ قَالَ الْعَدُوَّ - قَالَ لَهُمْ إِنَّ أَصْحَابِي يَأْمُرُونَكُمْ أَنْ تَنْظُرُوهُمْ. رواه مسلم[٣]:

ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەنگی کاروانی هاوڕێیانی ئەشعەری دەناسمەوە، لە شەودا کە دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە، بە هۆی خوێندنی قورئانەوە دەیان ناسمەوە، گەرچی بە ڕۆژیش ماڵەکانیانم نەدیوەو نازانم لەکوێ دادەنیشن، حەکیم یەکێکە لەوان، پیاوی دانای وایان تیادایە کاتێ دەگا بە سوار گەل یا فەرمووی: کاتێ دەگا بە لەشکری دوشمن، بەبێ پەروا پێیان دەڵێ: هاوڕێکانم فەرمانتان پێ دەکەن

---

[٣] بخاری. مغازی (تجرید/ ٤ / ٣٢٠ . رقم: ١٥٧٧ / ٤٢٣٢) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٥٧.

کە چاوەڕوانیان بکەن واتە: دەڵێ بە هاوڕێیانی خۆی: ئەی دەستە سوار! با پێکەوە بڕۆین بۆ سەر دوشمن، یا دەڵێ بە لەشکری دوشمن: ئەی سوپای دوشمن! ئەگەر ئێوە ئازان‌و مەردن‌و کوونی نین مەڕۆن‌و رامەکەن هەتا کۆمەڵەی منیش دێن، ئەوسا بۆتان دەردەکەوێ کە کێ ئازایە (م/ب).

٣٥٣٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ، أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ. رواه الشيخان[٤]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەشعەرییەکان مەردایییەکیان هەیە، ئەگەر لە غەزادا توێشوویان هاتە کزی (یاخود لە ناو شاردا نان‌و خۆراکی خێزانیان هاتە کەمی) دێن ئەوەی ماوە لە کنیان هەمووی لە یەك دەفرا کۆ دەکەنەوە، ئەوجا بە قاپێ، بە حاجەتێ لە بەینی خۆیانا وەك یەك، یەکسان، بەشی دەکەن، ئەوان لە منن‌و من لەوانم! (ش).

٣٥٣١- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ: لِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُعْطِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ[٥]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەبو مووسا! بە راستی خودا دەنگ‌و ئاوازێکی خۆشی پێ داویت، دەڵێی دەنگ‌و ئاوازە خۆشەکەی داوود پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) (ت- خوای لێ رازی بێ).

٣٥٣٢- عَنْ أَبِي عَامِرٍ الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نِعْمَ الْحَيُّ الأَشْعَرِيُّونَ لاَ يَفِرُّونَ فِي الْقِتَالِ وَلاَ يَغُلُّونَ هُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ. رواهما الترمذي[٦]:

---

[٤] بخاری. شرکة (تجرید / ٣ / ١٦٧. رقم: ١٠٧٦ / ٢٤٨٦.مسلم. فضائل/٦٣٥٨.

[٥] سكت الشارح عن درجة الحديث.

[٦] سكت الشارح عن درجة الحديث.

ئەبو عامیر ئەل- ئەشعەری (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەشعەرییەكان هۆزی چاكن نە لە شەڕدا هەڵدێن‌و نە دزی‌و گزی‌و فزی دەكەن، ئەوان لە منن‌و من لەوانم! (ت- خوای لێ ڕازی بێ).

## ٦٤) یەكێكی تریان جەریری كوڕی عەبدوڵڵای ئەل- بەجەلییە (خودای لێ ڕازی بێ)

## ومنهم جرير بن عبدالله البجلي (رَضِيَ اللّهُ تعالى عَنْه)

٣٥٣٣- عَنْ جَرِيرٌ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلاَ رَآنِي إِلاَّ ضَحِكَ. وَكَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ بَيْتٌ يُقَالَ لَهُ ذُو الْخَلَصَةِ، وَكَانَ يُقَالُ لَهُ الْكَعْبَةُ الْيَمَانِيَةُ، أَوِ الْكَعْبَةُ الشَّأْمِيَّةُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَلْ أَنْتَ مُرِيحِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ. قَالَ فَنَفَرْتُ إِلَيْهِ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ مِنْ أَحْمَسَ فَكَسَرْنَاه، وَقَتَلْنَا مَنْ وَجَدْنَا عِنْدَهُ، فَأَتَيْنَاهُ، فَأَخْبَرْنَاهُ، فَدَعَا لَنَا وَلأَحْمَسَ[1]:

جەریر (خوای لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: ئەوەتی موسوڵمان بووم، هەموو كاتێ كە دەچووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) یەكسەر ڕێگەی دەدام‌و دەچوومە خزمەتی، هەموو جارێكیش كە چاوی پێم دەكەوت پێ دەكەنی، لە سەردەمی نەزانیدا (كە گەلێ لە نیوەی دووەمی چەرخی بیستەم‌و لەنیوەی یەكەمی چەرخی بیستویەكەم باشتربوو! بوتخانەیێ لە یەمەن هەبوو، ناوی زولخەلەصەبوو، پێیان دەگوت: كەعبەی یەمانی، لەبەرئەوەی كە لە وڵاتی یەمەن بوو، هەروەها پێشیان دەگوت كەعبەی شامی، چونكە ڕووی دەرگاكەی لە شام بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئەرێ بوتخانەی زولخەلەصەم لە كۆڵ ناكەیتەوە؟ منیش بە سەدو پەنجا سوارەوە لە هۆزی ئەحمەس، كە هۆزی خۆمە، تاوم دایەو چوومە وێزەی‌و ڕمانم! وە

---

[1] بخاری. جاهد (تجرید / ٣ / ٣٥٨. رقم: ١٢٣٧ / ٣٠٢٠ ، ٣٠٣٦ ، ٣٠٧٦ ، ٣٨٢٣ ، ٤٣٥٥ ، ٤٣٥٦ ، ٤٣٥٧ ، ٦٠٩٠ ، ٦٣٣٣). مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣١٥ ، ٦٣١٣ — ٦٣١. أبو داود. جهاد: ٢٧٢.

ئەوەشی لەوێ بوو کوشتمان، ئینجا هاتینەوە بۆ خزمەتی و هەواڵەکەمان عەرزی کرد، ئەویش نزای بۆ ئێمەو بۆ هۆزی ئەحمەس کرد (ش/ت).

٣٥٣٤- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا جَرِيرُ أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ. بَيْتٍ لِخَثْعَمَ كَانَ يُدْعَى كَعْبَةَ الْيَمَانِيَةِ. قَالَ فَنَفَرْتُ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ وَكُنْتُ لاَ أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَضَرَبَ يَدَهُ فِي صَدْرِي فَقَالَ: اللّٰهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا. قَالَ: فَانْطَلَقَا فَحَرَّقْنَاهَا بِالنَّارِ وَبَعَثْنَا رَجُلاً مِنَّا يُكْنَى أَبَا أَرْطَاةَ يُبَشِّرُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَاه فَقَالَ لَهُ: مَا جِئْتُكَ حَتَّى تَرَكْنَاهَا كَأَلْجَمَلِ الأَجْرَبِ. فَبَرَّكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى خَيْلِ أَحْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ. رواهما الشيخان والترمذى. والله أعلم[٢]:

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی جەریر! ئادەی بوتخانەی زولخەلەصەم لە کۆڵ بکەرەوە گوتی: زولخەلەصە بوتخانەی هۆزی خەسعەم بوو، پێیان دەگوت: کەعبەی یەمەن! منیش خۆم بەسەر ماینەوە بۆ نەدەگیرا، ئەوەم عەرزی حەزرەت کرد، دەستی ماڵی بە سینگماو فەرمووی: اللهم ثبته واجعله هاديا مهديا: خودایە! راگیری بکەو بیکە بە رەهبەرو رێگەی راستی پێ نیشان بدە جەریر گوتی: جا چووینە وێزەی و بە ئاگر سووتانمان! پیاوێکمان تیا بوو پێیان دەگوت: ئەبو ئەرطەئە، ئەومان نارد مزگێنی بدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە دەچێتە خزمەتی عەرزی دەکا: قوربان! کە من هاتم بوتخانەکە سووتا بوو رەش هەڵگەڕابوو، دەتگوت ووشتری گەڕەو قەترانی رەشی پیاکراوە! (نوخشە بێ لە بتخانەکانی سەدەی ئێمەیش!) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێنج جار نزای پیت و فەڕو پیرۆزی دەکا بۆ هۆزی ئەحمەس، بۆ پیاویانو بۆ سوارەیان و بۆ پیادەیان و بۆ رەوگیان و دەفەرموێ: پەروەردگار پیت و فەڕ بخەرە هۆزی ئەحمەسەوە بە پیادەو سوارو ماین و ئەسپ و رەوگیەوە (ش/ت).

---

[٢] بخاری. تقدم تخرجه بمثل الحديث الذى قبله ٠الحديث ١ / ٣٤٩٤).

## ٦٥) باشترینی چینی دووەمی موسوڵمانان کە پێیان دەگوترێ (تابیعین- پەیڕەوان) وەیسی قەرەنییە (خودای لێ خۆش نوود بێ): خیر التابعین اویس القرنی (رَضِي اللّهُ تعالی عَنه)

٣٥٣٥- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: إِنَّ خَيْرَ التَّابِعِينَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أُوَيْسٌ وَلَهُ وَالِدَةٌ وَكَانَ بِهِ بَيَاضٌ فَمُرُوهُ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ[1]:

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: لە حەزرەتم بیست (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: باشترینی چینی دووەمی موسوڵمانان (التابعین) پیاوێکە ناوی ئووەیسە، دایکێکی هەیە، وەیس زۆر باشە بۆی، لە پێشا بەڵەك دەبێ، لەپاشا چاك دەبێتەوە، داوای لێ بکەن با بۆتان بپاڕێتەوە (م).

٣٥٣٦- عَنْ أُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ أَهْلَ الْكُوفَةِ وَفَدُوا إِلَى عُمَرَ وَفِيهِمْ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ يَسْخَرُ بِأُوَيْسٍ فَقَالَ عُمَرُ: هَلْ هَا هُنَا أَحَدٌ مِنَ الْقَرَنِيِّينَ فَجَاءَ ذَلِكَ الرَّجُلُ فَقَالَ عُمَرُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَدْ قَالَ: إِنَّ رَجُلاً يَأْتِيكُمْ مِنَ الْيَمَنِ يُقَالُ لَهُ أُوَيْسٌ لاَ يَدَعُ بِالْيَمَنِ غَيْرَ أُمٍّ لَهُ قَدْ كَانَ بِهِ بَيَاضٌ فَدَعَا اللَّهَ فَأَذْهَبَهُ عَنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ الدِّينَارِ أَوِ الدِّرْهَمِ فَمَنْ لَقِيَهُ مِنْكُمْ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ[2]:

ئوسەیری کوڕی جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کە خەڵکی کووفە هاتن بۆ لای عومەر پیاوێکیان لەوانە تیابوو کە تیزیان دەکرد بە ئووەیس. عومەریش (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لێرە کەسێ لە قەرەنییەکان هەیە؟ جا ئەو پیاوە هات، عومەر گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە یەمەنەوە پیاوێ دێ بۆ لاتان، پێی دەڵێن: ئووەیس، تەنیا دایکێکی دەبێ، کە خۆی دێ دایکی لە یەمەن بەجێ دەمێنێ، لە پێشدا بەڵەك دەبێ، لە خودا دەپاڕێتەوە خودا چاکی دەکاتەوە، تەنیا بە قەد جێگەی دینارێکی نەبێ،

---

[1] مسلم. فضائل الصحابة، ٦٤٣٨.

[2] مسلم. فضائل الصحابة، ٦٤٣٧.

دەی ئەوەی لە ئێوە تووشی ئەو پیاوە بوو با بۆتان بپاڕێتەوەو داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکا (م).

٣٥٣٧- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِذَا أَتَى عَلَيْهِ أَمْدَادُ أَهْلِ الْيَمَنِ سَأَلَهُمْ أَفِيكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ حَتَّى أَتَى عَلَى أُوَيْسٍ فَقَالَ أَنْتَ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ فَكَانَ بِكَ بَرَصٌ فَبَرَأْتَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: لَكَ وَالِدَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ كَانَ بِهِ بَرَصٌ فَبَرَأَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ لَهُ وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكُمْ فَافْعَلْ. فَاسْتَغْفِرْ لِي. فَاسْتَغْفَرَ لَهُ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: الْكُوفَةَ. قَالَ: أَلاَ أَكْتُبُ لَكَ إِلَى عَامِلِهَا قَالَ: أَكُونُ فِي غَبْرَاءِ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ حَجَّ رَجُلٌ مِنْ أَشْرَافِهِمْ فَوَافَقَ عُمَرَ فَسَأَلَهُ عَنْ أُوَيْسٍ فَقَالَ: تَرَكْتُهُ رَثَّ الْبَيْتِ قَلِيلَ الْمَتَاعِ. فَأَسْمَعَهُ الحَدِيثُ السَّابق فلمَّا عاد هذا الرَّجُل أتى أُوَيْسًا فَقَالَ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: أَنْتَ أَحْدَثُ عَهْدًا بِسَفَرٍ صَالِحٍ فَاسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ اسْتَغْفِرْ لِهُ. قَالَ: أَنْتَ أَحْدَثُ عَهْدًا بِسَفَرٍ صَالِحٍ فَاسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ لَقِيتَ عُمَرَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَاسْتَغْفَرَ لَهُ. فَفَطِنَ لَهُ النَّاسُ فَانْطَلَقَ عَلَى وَجْهِهِ. رَوى الثلاثة مسلم. والله أعلى وَأعلم[٣]:

دیسان گوتی: جاران کە لەشکری کۆمەکیی یەمەن بۆ عومەر دەهات، عومەر لێیانی دەپرسی: ئەرێ ئووەیسی کوڕی عامیرتان تیادایە؟ هەتا بە پرسیار ئووەیسی دۆزییەوە، گوتی: تۆ ئووەیسی کوڕی عامیری؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: لە خێڵی قەرەنی کە دەچنەوە سەر هۆزی بەرە بابی موراد؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: لەمەو پێش بەڵەك بووی، بەڵام ئێستا چاکبوویتەوەو تەنیا بەقەد جێ درەمێکی ماوە؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: دایکت هێشتا ماوە؟ گوتی: بەڵێ، عومەر گوتی: ژنەوتم لە پێغەمبەری خودا دەیفەرموو: لەناو ئەو لەشکرانەدا کە لە یەمەنەوە دێن بۆ کۆمەکی و یاریدەتان پیاوێ دێ، ناوی

---

[٣] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٣٩.

ئووەیسی كوڕی عامیرە، لە هۆزی قەرەنەكە دەچنەوە سەر عێڵی موراد، لە پێشدا هەنێ بەڵەك دەبێ، لە پاشدا چاك دەبێتەوە بە قەد شوێنی درەمێكی نەبێ، دایكێكی هەیە زۆر بۆی باشە، ئەو ئووەیسە ئەوەندە نازی هەیە لەلای خودا ئەگەر سوێند بخوا لە خودا كە دەبێ ئەو ئیشەی بۆ بكا، خودا دڵی ناشكێنێ‌و سوێندەكەی ناخات‌و داواكەی جێ بەجێ دەكا، ئەی عومەر! (یا ئەی كەسێ كە ئەم حاڵە دەزانێ) ئەگەر بۆت دەلوێ با ئەو پیاوە بۆت بپاڕێتەوە چونكە هەمیشە دووعاو نزای ئەو گیرایەو رەت نابێتەوە دەی كەواتە ئەی ئووەیس! بۆم بپاڕێرەوە، ئەویش بۆی دەپاڕێتەوە، عومەر پێی دەڵێ: بە تەمای كوێی‌و دەتەوێ لە كوێ نیشتە جێ بی؟ دەڵێ: لە كووفە، گوتی: با نامەیەكت بۆ بنووسم بۆ كاربەدەستی شاری كووفە كە ئاگای لێت بێ؟ گوتی: حەزناكەم ناوم بكەوێتە ناو ناوانەوە، حەزدەكەم خۆم لە مەردوومە رەشوو رووتەكە جیا نەكەمەوەو ناو ئەوانم پێ خۆشە. گوتی: لە ساڵی ئاییندەدا پیاوێكی خانەدانی كووفەیی هات بۆ حەج، عومەر هەواڵی ئووەیسی قەرەنی لێ پرسی، گوتی: كە من هاتم ماڵێكی پڕ پووت‌و كەمێ شتوومەكی هەبوو، عومەریش فەرموودەكەی پێغەمبەری گێڕایەوە بۆی كە لە پێشەوە باس كرا، پیاوەكە كە دەگەڕێتەوە دەچێتە لای وەیس، دەڵێ: بۆم بپاڕێرەوە. دەڵێ: تۆ تازە لە سەفەری خێر گەڕاویتەوە تۆ بۆ من بپاڕێرەوە!" دەڵێتەوە: دە تۆ بۆم بپاڕێرەوە، وەیسیش دەڵێ: ئاخر تۆ تازە لە رێبوارییی باش گەڕاویتەوە هەق وایە تۆ بۆ من بپاڕێیتەوە، لەپاشا وەیس پێی دەڵێ: دیارە عومەرت دیوەو ئەو ئەم تەگبیرەی بۆ كردووی؟ دەڵێ: ئا دیم جا بۆی دەپاڕێتەوە، ئیتر خەڵك پێی دەزانن‌و پیاو باشییەكەی ئاشكرا دەبێ‌و نزا خوازان‌و خاوەن مرازو نیازەكان سەری تێ دەكەن ئیتر ئەویش سەری خۆی هەڵ دەگرێ‌و دەڕوا! (م).

هـــەزاری ساچـــاو بـــە بەشـــی خـــودا

پاشـــا لـــە چـــاویا مانەنـــدی گـــەدا

ڕەنگە زەردەکە کەپرشنگ دەدا

زەردەپەڕ نییە: خۆر گزنگ دەدا

خۆشە بێوەیی چەتری سەرت بێ

کاڵای هەژاریی بەرگی بەرت بێ!

نە خەمی مەزراو رانە مەڕت بێ

نە ترسی گورگی دەشت‌و دەرت بێ

ئاسمان لێفەو زەوی بەرت بێ

نە لەگەڵ کەسێ هەراو شەڕت بێ!

ئاڵای دەروێشی لە کەمەرت بێ

وەیسەکەی خۆمان بە ڕەهبەرت بێ!

ترسی روو زەردی لای سەرەوەرت بێ

کردەوەی باشی خۆت سوپەرت بێ!

دڵی رووناکی خۆت خەفەرت بێ!

چرای رۆشنی دەورو بەرت بێ

تا لە ریسوایی سواڵ قوتارت بێ

حاڵ‌و عاڵێکی سەرو بەرت بێ

مزگەوتێ نزیک بەرابەرت بێ

خەڵوەکای کیانی بەخەبەرت بێ

هەڤاڵێ هاوبیر قەلەندەرت بێ

کاتێ پێویستی، هاوسەرنگەرت بێ

نەک لەسەر سینی برادەرت بێ

کــــە پـــشتی هـــەڵکرد، لـــەزەرەت بـــێ

نەفـــسێ چـــون دەبـــان پـــڕ جەوهـــەرت بـــێ

ژنێکـــی وەک خـــۆت بـــە هاوســـەرت بـــێ!!

## ٦٦) پاشەکی: باسی چاکێتیی چەن هۆزێکی عەرەب:
## خاتمة فی ذکر قبائل من العرب

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـاكُم مِّـن ذَكَـرٍ وَأُنثَـى وَجَعَلْنَـاكُمْ شُـعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ – ١٣/٤٩}.

ئەی ئادەمیزادینە! ئێمە کە خودای ئێوەین، ئێوەمان دروست کردووە لە نێریێ و لە مێیێ، لە پیاوێ و لە ژنێ، لە ئادەم و حەووا، وە من ئێوەم کردووە بە چەن گەلێ، وە هەر گەلێکم کردووە بە چەن هۆز و ئێڵ و خێڵ و تیرەو بەرەیێ، بۆ ئەوە کە لە ناو خۆتانا وەك براو دۆست بژین و یەکتری بناسن و بە هاواری یەکترەوە بن و لە کاری ئایین و جیهاندا یاریدەی یەکتری بدەن نەك بۆ فیزو دەعیە بە سەریەکتردا، یا بۆ زۆڵم و زۆر لە ناو یەکدا، گەورە کەسێکە کە لەلای خودای گەورە گەورەبێ، گەورەیی و بەڕێزیش لەلای خودا بەوەیە کە لە خودای مەزن بترسیت و نا فەرمانیی نەکەیت و بە گوێی بکەی.
شێخی بەیضاوی (خوای لێ رازی بێ) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: دەگێڕنەوە: رۆژێ دوو پیاو لە یاران، سەلمان دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە پێخۆریان بۆ بێنێ، ئەوکاتە ئوسامە کلیل بە دەستی خۆراکی پێغەمبەر دەبێ، دەڵێ: هیچم لەلا نییە، سەلمانیش قسەکەی ئوسامەیان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر بی نێری بۆ سەر سیروان ووشکی دەکا! جا کاتێ دوو پیاوەکە دەچنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێیان دەفەرموێ: بۆ دڕنی گۆشتی کاڵ لە دەمتان دێ! دەڵێن: قوربان! تامی گۆشتمان نەکردووە! دەفەرموێ: با، غەیبەتتان کردووە! ئیتر ئەم ئایەتە دێتە خوارەوە.

٣٥٣٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: الشُّعُوبُ الْقَبَائِلُ الْعِظَامُ، وَالْقَبَائِلُ الْبُطُونُ. وفي لفظ: الشُّعُوبُ النَّسَبُ الْبَعِيدُ، وَالْقَبَائِلُ دُونَ ذَلِكَ. رَوَاهُ البخاري[1]:

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: گەل (شەعب) بریتییە لە چەن هۆز (قەبیلە)ی گەورە گەورە، هۆزیش بریتییە لە تیرەو بەرە لە گفت (لەفظ)ێکا: مەبەست لەگەل رەگەزی دوورە، مەبەست لە هۆزیش رەچەڵەکی نزیکە! (ب).

٣٥٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ فَخِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلامِ إِذَا فَقُهُوا وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ فِي هَذَا الأَمْرِ أَشَدُّهُمْ لَهُ كَرَاهَةً قَبْلَ أَنْ يَقَعَ فِيهِ وَتَجِدُونَ شَرَّ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ الَّذِي يَأْتِي هَؤُلاءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلاءِ بِوَجْهٍ. رَوَاهُ الشيخان[2].

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سەرنج دەدەن ئەم خەڵکە وەك كان وان‌و هەر كەسە رەگەزی دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەكی خانەدان، یا بنەچەی دەگەڕێتەوە سەر بەرە بابێكی نا رەسەن، وە بە زۆری كردارو رەفتاریان بە پێی رەسەنی‌و نارەسەنییانە جا بۆیە ئەوانەیان كە لە سەردەمی نەزانیدا رەسەن‌و باش بوون ئێستاش لە سەردەمی ئیسلامەتیدا دیسان رەسەن‌و باش دەردەچن، بە مەرجێ شارەزا بن‌و بن بە زاناو مامۆستا لە شەریعەتدا وە هەروەها سەرنج دەدەن باشترین كەس بۆ ئەم كارە (*) ئەو كەسانەن كە لە پێشا حەزیان لێی نەبووەو زۆریش رقیان لێی بووە، تا كاتێ دەكەونە ناوی، هەروەها سەرنج دەدەن بەدترین كەس بۆ ئەم كارە ئادەمیزادی دوو رووە، كە لەلای ئێوە قسەیێ دەكەن‌و لەلای ئەوان قسەیەكی تر دەكەن‌و بەپێی سوودو قازانجی

---

[1] بخاری. مناقب: ٣٤٨٩.

(٢) بخاری. مناقب: ٣٤٩٣ ، ٣٤٩٦ ، ٣٥٨٨ (تجريد / ٤ / ١١٣ رقم: ١٤٣١ / ٢٥٨٧ + تجريد / ١٢٠٣ = ٢٩٢٨ فەتح. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٤٦. ترمذي. أمثال: ٢٨٧٢.

خۆیان گفت دەگۆڕن! (ش) (*) پێشەوا نەوەوی (پڕ گۆڕەکەی لە نوورو ڕەحمەتی خودای گەورە بێ) لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێ: قازی دەڵێ: مەبەست لە ئەم کارە هەڵ دەگرێ ئایینی ئیسلام بێ، ئەمەیش وەك حاڵی عومەری کوڕی خەططاب‌و خالیدی کوڕی وەلیدو گەڵێ لەو موسوڵمانانەی کە لەپاش گرتن (فەتح)ی مەککە موسوڵمان بوون، کە لە سەرەتاوە زۆر ڕقیان لە ئیسلام بووە، بەڵام لەپاش ئیسلام بوون هەریەکێ لەوان بوو بە پایەیێ بۆ ساختمانی ئیسلام، یا بوو بە چرایێ بۆ ئیسلام، هەڵیش دەگرێ مەبەست لەم کارە بۆ مرۆی دوو ڕوو سەرۆکایەتی‌و فەرمانڕەوایی بێ، چونکە ئەگەر لەسەر داوای خۆی نەبێ خودا یارمەتی دەدا. فەرمایشتەکەی پێشەوا نەوەوی کە نەقڵ کرا لە شەرحی صەحیحی موسلیمەوە تەواو... خودایە! بە ڕەحمەتی خۆت ئەنجاممان بە خێر بگێڕەو ئەنجامی ئەم گەلە کوردە ڕەسەنە خانەدانەش بە خێر بگێڕە..

خودا! تو خودا، تو گەورەیی خۆت
دەماخی دڵمان پڕبکە لە بۆت
ئەم گەلی کوردەش بە بەرگی ڕەحمەت
بڕازێنەوەو پێی بەردە لە کۆت!![*]

(وەرگێڕ)

---

[*] لە فیستیفاڵی نالیدا، کەیانەی ئیلێ بەگی جاف، لە سلێمانی، سازیانکرد، مامۆستا محمدی مامۆستا عبدالکریمی مُدرس گێڕایەوە: (کاتێ سوپای تورك لە سلێمانی دەردەکرێت، لەبەر زوڵم‌و زۆر، کاك ئەحمەدی شێخ پێش خەڵکەکە دەکەوێ، هەتاقلیاسان بەردبارانیان دەکەن، بەڵام کاتێ بابانەکان لە جێگەی ئەوان، دەسەڵات دەگرنە دەست، سەردەکەنە بێ دینی‌و تاوان‌و داوێنپیسی‌و خوێن ڕشتن‌و مەی‌و بادە نۆشی‌و چەوسانەوەی ملەت. کاك ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێبێ) نزا دەکا کە لەشکری تورك بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، وەکاتێ تورکان دەگەڕێنەوە، کاك ئەحمەد هەتا بەکرەجۆ دەچێ بەپیریانەوەو لەوێ سجدەی شکردەبا. جا خوابکا ئێمەیش وامان لێ نەیەت. ٢٠٠٧/١٠/١٠ — ٢٨ ڕەمەزان ١٤٢٨. (وەرگێڕ)

٣٥٤٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْفَخْرُ وَالْخُيَلاَءُ فِي الْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْوَبَرِ، وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ، وَالإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: شانازی کردن و فیزو دەعیە نواندن پیشەی ووشتردارەکانە، بەڵام هێمنی و سەلاری پیشەی خاوەن پەزو خاوەن رانە، ئیمان و باوەڕیش سەر بە یەمەنن، هەروەك حیکمەت و داناییش سەر بە یەمەنن و سەرچاوەیەکی رۆشنە بۆ ئیسلامەتی و شەریعەت (ش/ت).

٣٥٤١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مِنْ هَا هُنَا جَاءَتِ الْفِتَنُ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالْجَفَاءُ وَغِلَظُ الْقُلُوبِ فِي الْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْوَبَرِ عِنْدَ أُصُولِ أَذْنَابِ الإِبِلِ، وَالْبَقَرِ فِي رَبِيعَةَ وَمُضَرَ[٤]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئا لێرەوە لە رۆژهەڵاتەوە پشێوی و فەرتەنە گەل بەرپا دەبن! بێ وێڵی و لووت وشکی و دڵڕەقی پیشەی زیقنە دەنگدڕاوەکانە، کە خاوەنی کوڵك و مووی زۆرن، کە هەمیشە بن کلکی ووشترو گاگەل بەرنادەن، وە لە کاتی لێخوڕیندا تێیان دەخوڕن و دەیکەن بە قاڵە قاڵ و گاڵە گاڵ! کە ئەمەش پیشەی هۆزی رەبیعەو هۆزی موضەرە! (ش/ت).

٣٥٤٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الإِيمَانُ يَمَانٍ وَالْكُفْرُ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ وَالْفَخْرُ وَالرِّيَاءُ فِي الْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْخَيْلِ وَالْوَبَرِ. روى هذه الثلاثة الشيخان والترمذى[٥]:

---

[٣] بخاری. مناقب: ٣٣٠٨ . مسلم. إيمان: ١٨٦ ، ١٨٥ — ١٩٠.

[٤] بخاری. بدء الخلق (تجريد / ٢ / ٤٥٦ رقم: ١٣٣٠ / ٢٣٠١ ، ٤٣٨٩ ، ٤٣٨٨ ، ٣٤٩٩ ، ٤٣٩٠). مسلم. إيمان: ١٧٩.

[٥] تجريد/٤/٤٥٧رقم/١٣٣١/٢٣٠٢، ٣٤٩٨،٤٣٨٧،٥٣٠٣.

**دیسان دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: یەمەن کانگەی باوەڕو ئیمانە، کوفرو بێ دینی لە لای ڕۆژهەڵاتەوە سەر هەڵ دەدات! هێدیی‌و هێمنی‌و دڵنیاییش پیشەی خاوەن مەڕو بزنەکانە، بەخۆ نازین‌و خۆهەڵکێشان‌و ڕواڵەتبازیش پیشەی قیژنە دەنگدڕاوەکانە! ئەوانەی کە خاوەنی ڕەوگ‌و ووشترو گاو گۆلك‌و كوڵك‌و تووکن! (ش/ت).**

## ٦٧) پایەی هۆزەکانی غیفارو ئەسلەم‌و ئەشجەع‌و جوهەینەو موزەینە: غفار واسلم واشجع وجهينة ومزينة

**٣٥٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: قُرَيْشٌ وَالأَنْصَارُ وَجُهَيْنَةُ وَمُزَيْنَةُ وَأَسْلَمُ وَأَشْجَعُ وَغِفَارُ مَوَالِيَّ لَيْسَ لَهُمْ مَوْلًى، دُونَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ[1]:**

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هۆزی قوڕەیش‌و یاریدەدەران (ئەنصار)و هۆزی جوهەینەو هۆزی موزەینەو هۆزی ئەسلەم‌و هۆزی ئەشجەع‌و هۆزی غیفار ئەمانە یارو یاوەری منن، جگە لە خوداو پێغەمبەری خودا دۆست‌و یاریدەدەری تریان نییە! (ش).**

**٣٥٤٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ وَغِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا أَمَا إِنِّي لَمْ أَقُلْهَا وَلَكِنْ قَالَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ. رواهما الشيخان[2]:**

**دیسان لەوەوە، لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (درودی خودای لەسەربێ)**: هۆزی ئەسلەم لەگەڵ خودادا ئاشتن، خودا خۆش‌و بێوەییان کات، هۆزی غیفاریش خودا هەتا سەر لێیان خۆش بێ، ئەدی بزانن ئەم قسەیە من لە خۆمەوە نایکەم، بەڵام خودای گەورەو سەروەر خۆی وا دەفەرموێ (ش).**

---

[1] بخاری. مناقب (تجريد/٨٢/٤ رقم: ١٣٩٢ = تجريد = ٣٥٠٤ ، ٣٥١٢ فەتح/). مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٨٦.

[2] بخاری. مناقب (تجريد / ٤ / ٨٨ رقم: ١٣٩٧ / ٣٥١٣ (٣٥١٤). مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٧٩ ، ٦٣٨٠.

٣٥٤٥- ولهما وللترمذى: غِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، وَأَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ، وَعُصَيَّةُ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ[٣]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هۆزی غیفار خودا لێیان خۆش بێ، هۆزی ئەسلەمیش خودا سەلامەت‌و خۆش‌و بێوەییان كا، هۆزی عوصەییەش لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی بوون! (ش/ت).

٣٥٤٦- وَعَنْهُ عَنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الأَنْصَارُ وَجُهَيْنَةُ وَمُزَيْنَةُ وَغِفَارُ وَأَشْجَعُ وَمَنْ كَانَ مِنْ بَنِي عَبْدِ اللَّهِ مَوَالِيَّ دُونَ النَّاسِ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ مَوْلاَهُمْ. رَوَاهُ الشيخان والترمذى[٤]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: یاریدەدەران‌و جوهەینەو موزەینەو غیفارو ئەشجەع‌و بەنی عەبدوڵلاییەكان ئەمانە یارو یاوەری خۆمن‌و سەر بە كەسی تر نین، لەبەرئەوە خوداو پێغەمبەری خودا دۆست‌و یارمەتیدەری ئەوانن! (م/ت- موسلیم‌و تیرمیذی. رەحمەتی خودایان لێ بێ).

٣٥٤٧- وَجَاءَ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّمَا بَايَعَكَ سُرَّاقُ الْحَجِيجِ مِنْ أَسْلَمَ وَغِفَارَ وَمُزَيْنَةَ - وَأَحْسِبُ وَجُهَيْنَةَ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ أَسْلَمُ وَغِفَارُ وَمُزَيْنَةُ - وَأَحْسِبُ وَجُهَيْنَةَ - خَيْرًا مِنْ بَنِي تَمِيمٍ وَبَنِي عَامِرٍ وَأَسَدٍ وَغَطَفَانَ أَخَابُوا وَخَسِرُوا؟ فَقَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُمْ لأَخْيَرُ مِنْهُمْ. رواه الشيخان والترمذي[٥]:

ئەقرەعی كوڕی حابیس (خودای لێ خۆش نوود بێ) هاتە خزمەتی حەزرەت (درووددو صەلات‌و سەلامی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) گوتی: كێ پەیمانی بە تۆ داوە؟ مەگەر ئەو جەردەو دزو چەتانەی كە حاجیان رووت دەكەنەوە، كە لە هۆزی ئەسلەم‌و غیفارو موزەینەو جوهەینەن (بۆ جوهەینە باش لێم روون نییە،

---

[٣] بخاری. مناقب: ٣٥١٣. مسلم. فضائل: ٦٣٨٢ . ترمذي. مناقب: ٣٩٤١.

[٤] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٨٥. ترمذي. مناقب: ٣٩٤٠. بخاری. مناقب: ٣٥٠٤ ، ٣٥١٢.

[٥] بخاری. مناقب: ٣٥١٥ ، ٣٥١٦ ، ٦٦٣٥. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٩١. ترمذي. مناقب: ٣٩٥٢.

بەلام وا بزانم ناوی جوهەینەیشی هێنا) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەدی پێم بڵێ: ئەگەر ئەسلەم و غیفارو موزەینە وا بزانم فەرمووشی جوهەینە چاتر بن لە بەنی تەمیمو بەنی عامیرو ئەسەدو غەطافان (لەلای خودا) ئایا ئەمانە مایە پووچ و زیانەو مەند دەر ناچن؟ گوتی: با، فەرمووی: دەسا بەو کەسە کە گیانی منی بە دەسە ئەوانە لە مانە باشترن! (ش/ت).

٣٥٤٨- وللشيخين: أَسْلَمُ وَغِفَارُ وَشَيْءٌ مِنْ مُزَيْنَةَ وَجُهَيْنَةَ أَوْ قَالَ: وَشَيْءٌ مِنْ جُهَيْنَةَ وَمُزَيْنَةَ خَيْرٌ عِنْدَ اللَّهِ أَوْ قَالَ: يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَسَدٍ وَتَمِيمٍ وَهَوَازِنَ وَغَطَفَانَ[٦]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەسلەم و غیفارو هەنێ لە موزەینەو هەنێ لە جوهەینە یا فەرمووی: هەنێ لە جوهەینەو هەنێ لە موزەینە باشترن لەلای خودا یا فەرمووی: باشترن لە رۆژی قیامەتا لە ئەسەدو تەمیم و هەوازین و غەطافان (ش= ب/م= بوخاری و موسلیم).

٣٥٤٩- ولمسلم والترمذي: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَغِفَارُ وَأَسْلَمُ وَمُزَيْنَةُ وَمَنْ كَانَ مِنْ جُهَيْنَةَ خَيْرٌ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَسَدٍ وَطَيِّءٍ وَغَطَفَانَ. والله أعلى وأعلم[٧]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەو خودایەی کە رەوانی موحەممەد وا لە دەستی تەوانایی ئەوا غیفارو ئەسلەم و موزەینەو جوهەینە لەلای خودا، لە رۆژی قیامەتا گەلێ چاکترن لە ئەسەدو طەیی و غەطافان (م/ت= موسلیم و تیرمیذی).

چاک نەو چاکەیە لای خودا چاک بێ
نیتر لە تانەی ناپاک بێ باک بێ
دەروێشێ دەیگوت: من چاک و پاکم
بۆیە لە تانەی خەڵکی بێ باکم

---

[٦] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٩٠.

[٧] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٨٩. ترمذي. مناقب: ٣٩٥٠.

## ٦٨) پایەی بەنی تەمیم‌و دەوس‌و تەیی:
## بنو تميم ودوس وطيء

٣٥٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لاَ أَزَالُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ لِثَلاَثٍ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَمِعْتُهُ يَقُولَ: هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ. وَجَاءَتْ صَدَقَاتُهُمْ فَقَالَ: رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا وَكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنهُمْ عِنْدَ عَائِشَةَ فَقَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَعْتِقِيهَا فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ. رواه الشيخان[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەوتێ ئەم سێ شتە باشەم لە دەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بیستووە ئیتر بەنی تەمیمم خۆش دەوێ، لێیم ژنەوت دەیفەرموو: ئازاترینی ئۆمەتم لە ئاستی ججال بەنی تەمیمن! كە زەكاتەكەشیان هات پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە زەكاتی خزمانی ئێمەیە ژنێكی بە تالآنی گیراویشیان كەنیزەكی عائیشە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئازادی بكە، چونكە ئەمە لە نەوەی ئیسماعیلە (ش).

٣٥٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَدِمَ الطُّفَيْلُ وَأَصْحَابُهُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّ دَوْسًا قَدْ كَفَرَتْ وَأَبَتْ فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهَا. فَقِيلَ هَلَكَتْ دَوْسٌ فَقَالَ « اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَائْتِ بِهِمْ. رواه الشيخان[2]:

دیسان گوتی: طوفەیل‌و برادەرەكانی (خودایان لێ رازی بێ) هاتن، گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەڕاستی دەوس خودا ناناسن‌و مل نادەن‌و لە كێش دەرچوون! كەواتە لەلای خودا نزای خراپیان لێ بكە، خەڵكەكەش گوتیان: تازە دەوس فەوتان! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) لە باتی ئەوەی

---

[1] بخاری. عتق (تجرید / ٣ / ١٨١ رقم: ١٠٩٠ تجرید = ٢٥٤٣ ، ٤٣٦٦ فتح الباری. مسلم فضائل الصحابة: ٦٣٩٩.

[2] بخاری. مناقب: ٤٣٩٢. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٩٧.

**نـزای خراپیـان لێ بكـا نـزای باشـی بـۆ كـردن‌و فـەرمووی: ئـەی خودایـە! ڕێنموونی دەوس بكەو كەمەن كێشیان كە! (ش).**

٣٥٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ لَمَّا قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قُلْتُ فِي الطَّرِيقِ:

يَا لَيْلَةً مِنْ طُولِهَا وَعَنَائِهَا عَلَى أَنَّهَا مِنْ دَارَةِ الْكُفْرِ نَجَّتِ

وَكَانَ مَعِي غُلاَمٌ" فَأَبَق فِي الطَّرِيقِ فَلَمَّا قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَايَعْتُهُ، فَبَيْنَا أَنَا عِنْدَهُ إِذْ طَلَعَ الْغُلاَمُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، هَذَا غُلاَمُكَ. فَقُلْتُ: هُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ. فَأَعْتَقْتُهُ. رواه البخاری[٣]:

**دیـسان گـوتی: كـە هـاتم بـۆ لای پێغـەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لـە ڕێگـە دەمگوت:**

يَا لَيْلَةً مِنْ طُولِهَا وَعَنَائِهَا عَلَى أَنَّهَا مِنْ دَارَةِ الْكُفْرِ نَجَّتِ

**بە شیعر لە بەحرەكەی خۆی كە بەحری طەویلە واتە:**

**شەوێ بوو درێژ، پڕ ئێش‌و ئازار، بەڵام بە جوانی**

**سوپاس بۆ خودا ڕزگاری كردین لە كافرسانی!**

**خـوڵامێكم هـەبوو لەگـەڵما بـوو، وەلێ لـە ڕێ هـەڵهات‌و ڕای كـرد جـا كـە گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەیمانم دایێ، هێشتا هەر لە خزمـەتیا بـووم ئەوەنـدەم زانـی خوڵامەكەشـم سـەری هەڵـداو پەیـدا بـوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەمە خوڵامەكەتـە منیش گوتم: ئەوا ئەوم بەخشی بۆ ڕەزای خودا، وە ئازادم كرد (ب-خ).**

٣٥٥٣- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) فَقَالَ لِي: إِنَّ أَوَّلَ صَدَقَةٍ بَيَّضَتْ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَوُجُوهَ أَصْحَابِهِ صَدَقَةُ طَيِّئٍ أَلَّتِي جِئْتَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رواهُ مسلم[٤]:

---

[٣] بخاری. مناقب: ٤٣٩٣.

عەدی كوڕی حاتەم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چوومە لای عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) پێی گوتم: یەكەم صەدەقەیێ كە ڕووی پێغەمبەرو یارانی پێغەمبەری گەشاندەوە صەدەقەكەی هوزی طەیی بوو كە تۆ خۆت هێنات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) (م).

٣٥٥٤- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ أَتَيْنَا عُمَرَ فِي وَفْدٍ، فَجَعَلَ يَدْعُو رَجُلاً رَجُلاً وَيُسَمِّيهِمْ فَقُلْتُ: أَمَا تَعْرِفُنِي يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: بَلَى أَعْرِفُكَ، أَسْلَمْتَ إِذْ كَفَرُوا، وَأَقْبَلْتَ إِذْ أَدْبَرُوا، وَوَفَيْتَ إِذْ غَدَرُوا، وَعَرَفْتَ إِذْ أَنْكَرُوا. فَقَالَ عَدِيٌّ فَلاَ أُبَالِي إِذًا. رواه البخاري فِي قِصَّةِ وَفْدِ طَيِّئٍ. والله أعلم[٥]:

دیسان عەدی (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: لەگەڵ دەستەیەكا چووینە خزمەتی عومەر، عومەر یەك لەدوای یەك بانگی دەكردین بۆ لای خۆی‌و دەیپرسی ئەم پیاوە كێیە، كە سەرە گەیشتە سەر من عەرزیم كرد: ئەی فەرمانداری موسوڵمانان! ئەدی نام ناسیتەوە؟ گوتی: با، چاكت دەناسمەوە تۆ ئەو پیاوە مەردەی كە خەڵكی بڕوایان نەبوو تۆ موسوڵمان بووی‌و كە ئەوان هەڵیان دەتیزان تۆ دەهاتیتە پێشەوەو لە ئیسلام نزیك دەبوویتەوەو كە ئەوان پەیمانیان دەشكان‌و پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام تۆ بەوەفاو بە ئەمەك بووی! عەدی گوتی: منیش گوتم: دەئیتر دەربایستی هیچی تر نایەم (ب-ڕەزای خوای لێ بێ).

## ٦٩) باسی ثەقیف‌و بەنی حەنیفە : (ثقيف وبنو حنيفة)

٣٥٥٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْرَقَتْنَا نِبَالُ ثَقِيفٍ فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهِمْ. قَالَ: اللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفًا[١]:

---

[٤] مسلم. فضائل: ٦٣٩٦.

[٥] بخاري. مغازي: ٤٣٩٤.

[١] رواه الترمذي بسند صحيح.

**جابیر** (خودای لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: گوتیان: ئەی فرستادەی یەزدان! تیری هۆزی ثەقیف سووتاندووینی، دەی لەلای خودا دووعای شەڕیان لیٚ بکە، فەرمووی: ئەی خودایە! ڕیٚگەی ڕاست نیشانی هۆزی ثەقیف بدە (ت-س/ص).**

**٣٥٥٦- وَأَهْدَى أَعْرَابِيٌّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَكْرَةً فَعَوَّضَهُ مِنْهَا سِتَّ بَكَرَاتٍ فَتَسَخَّطَهَا فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ فُلاَنًا أَهْدَى إِلَيَّ نَاقَةً فَعَوَّضْتُهُ مِنْهَا سِتَّ بَكَرَاتٍ فَظَلَّ سَاخِطًا وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لاَ أَقْبَلَ هَدِيَّةً إِلاَّ مِنْ قُرَشِيٍّ أَوْ أَنْصَارِيٍّ أَوْ ثَقَفِيٍّ أَوْ دَوْسِيٍّ[٢]:**

**عارەبیٚکی دەشتەکی نیٚوونە ووشتریٚکی بە دیاری هیٚنا بۆ پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **لەوەو دوا پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **بە شەش نیٚوونە ووشتر تۆڵەی بۆ کردەوە، کەچی کابرا هیٚشتا هەر لا لووت بوو، کە ئەمە بە پیٚغەمبەر گەیشتەوە ستایش‌و سوپاسی جوانی خودای کردو فەرمووی: فیسارە کەس ووشترە" میٚچکەیەکی بە دیاری هیٚنابوو بۆم، لە تۆڵەی ئەوەدا شەش نیٚوونە ووشترم داوە پیٚی کەچی هیٚشتاکوونیٚ هەر لووتە لایە! بە ڕاستی نیازم هەبوو کە ئیتر دیاری لە کەس وەرنەگرم، مەگەر لە قوڕەیشی‌و ئەنصاری‌و ثەقەفی‌و دەوسی (ت).**

**٣٥٥٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: مَاتَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهو يُكْرِمُ ثَلاَثَةَ أَحْيَاءٍ ثَقِيفًا وَبَنِي حَنِيفَةَ وَبَنِي أُمَيَّةَ. روى الثلاثة الترمذي[٣]:**

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (خودای لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **هەتا مرد قەدری ئەم سیٚ خیٚڵەی دەگرت: ثەقیف‌و بەنی حەنیفەو بەنی ئومەییە (ت).**

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

### ٧٠) پایەی عەرەب‌و بەڕێزی خاکی حیجاز : (فضل العرب والحجاز)

**٣٥٥٨- عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) غِلَظُ الْقُلُوبِ وَالْجَفَاءُ فِي الْمَشْرِقِ وَالإِيمَانُ فِي أَهْلِ الْحِجَازِ. رواه مسلم[1]:**

**جابیر** (خۆشنوودی خودای لێ بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: دڵ ڕەقی‌و بێ وێڵی لەناو ڕۆژهەڵاتدا باوە، ئیمان‌و باوەڕیش لەناو حیجازدا باوە! (م).**

**٣٥٥٩- عَنْ أُمُّ شَرِيكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَيَفِرَّنَّ النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ حَتَّى يَلْحَقُوا بِالْجِبَالِ. قَالَتْ أُمُّ شَرِيكٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَأَيْنَ الْعَرَبُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: هُمْ قَلِيلٌ. رواه الترمذي. ومسلم في الفتين[2]:**

**ئوممو شەریك** (خۆشنوودی خودای لێ بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: مەردوم لەتاو ججاڵ هەڵ دێن، تەنانەت لە تاوانا پەنا دەبەنە بەر کێوەکان. منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو ڕۆژو سەردەمە عەرەب لە کوێن؟ فەرمووی: لەو ڕۆژەدا عەرەب زۆر کەمن (ت/م) لە خودا بە زیاد بێ کە لە کوردستان چیاو کێو ئەوەندە زۆرن وەکوو داری قەراخ وان، خودای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی بیانکا بە پەناگای ڕەحمەت بۆ ئەم گەلە خواناسە سەر بە موحەممەدە لە هەموو دەردو بەڵایێ، بە تایبەت لە ئاژاوەو فەرتەنەی ججاڵە کوێرو پێشکارو پێکوڕەو پێشڕەوەکانی (وەرگێڕ).**

**٣٥٦٠- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سَامٌ أَبُو الْعَرَبِ وَيَافِثُ أَبُو الرُّومِ وَحَامٌ أَبُو الْحَبَشِ[3]:**

**سەموورە** (خۆشنوودی خودای لێ بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: سامی کوڕی نووح بابە گەورەی عەرەبەو، یافیثی کوڕی نووح بابە**

---

[1] مسلمز إيمان: ١٩١ ، ١٧٩ — ١٩١.

[2] مسلم. الفتن: ٧٣١٩ ، ٧٣٢٠. ترمذي. مناقب: ١٨٣٣٠

[3] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

گەورەی روومەو حامی كوڕی نووح (درودی خودا لەسەر خۆی‌و كەسوكارو نەوەی باشی بێ) بابە گەورەی حەبەش ورەشەكانە (ت-س/ح).

٣٥٦١- عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَا سَلْمَانُ لاَ تَبْغَضْنِي فَتُفَارِقَ دِينَكَ. قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَبْغَضُكَ وَبِكَ هَدَانَا اللَّهُ؟ قَالَ: تَبْغَضُ الْعَرَبَ فَتَبْغَضُنِي[٤]:

سەلمان (خۆشنوودی خودای لەسەر بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی سەلمان! رق لە من نەگریت‌و لە دڵەوە كینەم لێ نەكێشیت ئەگینا لە ئیسلامەتی بێ بەش دەبیت! گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن رق لە تۆ دەگرم، لە كاتێكا كە ئێمە خودا بەهۆی تۆوە رێگەی راستی نیشان داوین؟ فەرمووی: مەبەست ئەوەیە ئەگەر رق لە نەتەوەی عەرەب بگریت ئەوە رق لە منیش دەگریت! (ت-س/ح).

٣٥٦٢- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَنْ غَشَّ الْعَرَبَ لَمْ يَدْخُلْ فِي شَفَاعَتِي وَلَمْ تَنَلْهُ مَوَدَّتِي. روى الترمذي هذه الثلاثة[٥]:

عوسمان (خۆشنوودی خودای لێ بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی ناپاكی لە گەڵی عەرەب بكا نە بەر تكاو شەفاعەتی من دەكەوێ‌و نە بە دۆستی من دەژمێررێ! (ت- سەنەد غەریب).

٣٥٦٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَوْصَى بِثَلاَثَةٍ فَقَالَ: أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مِمَّا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ وَسَكَتَ عَنِ الثَّالِثَةِ كَأَنَّهُ نَسِيَهَا. وَقَلَ: هِيَ لَاتَتَّخِذُوا قَبْرِي وَثَناً. رواه الثلاثة:

ئیبنو عەبباس (خۆشنوودی یان لەسەر بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم سێ راسپێرییەی كردین فەرمووی: هاوبەش پەیداكەر (موشریك)ەكان لە

---

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

دوورگەی عەرەب دەرکەن‌و، وەك خۆم بە جوانی وەفدو نوێنەر بەرێ کەن‌و قەدرو رێزیان بگرن ئیتر بێ دەنگ: بوو، باسی راسپێری سێیەمی نەکرد، وەك لە یادی چووبێ وابوو دەڵێن: ئەویش ئەمەیە: گۆڕەکەم نەکەن بە بت‌و بیپەرستن (ش/د).

٣٥٦٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ تَكُونُ قِبْلَتَانِ فِي بَلَدٍ وَاحِدٍ. رواه أبو داود والترمذى[٧]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: یەك وولات‌و دوو ئایینیان نەگوتوە! د/ت).

٣٥٦٥- وَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّي اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: لأُخْرِجَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ فَلاَ أَتْرِكَ فِيهَا إِلاَّ مُسْلِمًا. رواه الخمسة إلا البخارى[٨]:

عومەر (خۆشنوودی خودای لێ بێ) دەڵێ: بە گوێی خۆم لە دەمی پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): جوولەکەو دیان لە دورگەی عەرەب دەردەکەم‌و، موسوڵمان نەبێ کەسی تری تیانایەڵم (ش/د/ت–رەحمەتی خودایان لێبێ).

## ٧١) گەورەیی یەمەن‌و عومان: (فضل اليمن وعمان)

٣٥٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ هُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً الإِيمَانُ يَمَان وَالْفِقْهُ يَمَان وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ. وفى رواية: أَتَاكُمْ أَهْلُ الْيَمَنِ هُمْ أَلْيَنُ قُلُوبًا وَأَرَقُّ أَفْئِدَةً الإِيمَانُ يَمَانٍ وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ وَرَأْسُ الْكُفْرِ قِبَلَ الْمَشْرِقِ. رواه الشيخان والترمذي[١]:

---

[٧] سكت عن درجته الشارح.

[٨] مسلم. جهاد: ٤٥٦٩. أبو داود. خراج: ٣٠٣٠.

[١] مسلم. إيمان: ١٨٠.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خەڵکی یەمەن هاتوون، دڵیان گەلێ ناسکەو گەلێکی نەرم‌و نیانن یەمەن سەرچاوەی ئیمان‌و باوەڕە، هەروەها سەرچاوەی شەریعەت‌و حیکمەتە لە گێڕانەوەیەکا: ئەوا خەڵکی وولاتی یەمەن بە خێرو خۆشی هاتوون بۆ لاتان، گەلێکی ناسك‌و دڵ نەرمن، میللەتێکی خۆش باوەڕو، دڵپاکن، یەمەن سەرچاوەی ئیمان‌و باوەڕە، هەروەها سەرچاوەی زانستی رێك‌و پێك‌و حیکمەت‌و شەریعەتە کوفرو بێ باوەڕیش لەلای رۆژ هەڵاتەوە سەر هەڵ دەدات (ش/ت).

٣٥٦٧- وَقَالَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) إِنْ لَمْ نَكُنْ مِنَ الأَزْدِ فَلَسْنَا مِنَ النَّاسِ[٢]:

ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەگەر لە هۆزی ئەزد نەبین ئەوا ئادەمیزادێکی بێ تیرەو هۆزین! (ت-س/ص).

٣٥٦٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الأَزْدُ أُسْدُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ يُرِيدُ النَّاسُ أَنْ يَضَعُوهُمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلاَّ أَنْ يَرْفَعَهُمْ وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَقُولُ الرَّجُلُ يَا لَيْتَ أَبِي كَانَ أَزْدِيًّا يَا لَيْتَ أُمِّي كَانَتْ أَزْدِيَّةً[٣]:

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هۆزی ئەزد شێری خودان لە وولاتدا، خەڵك دەیانەوێ سووکیان بکەن، بەڵام خودا دەیەوێ بەرزیان بکاتەوە، رۆژێ دەبێ پیاو دەڵێ: خۆزگە باوکم ئەزدی دەبوو، خۆزگە دایکم ئەزدی دەبوو! (ت- سەنەد غەریب).

٣٥٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمُلْكُ فِي قُرَيْشٍ وَالْقَضَاءُ فِي الأَنْصَارِ وَالأَذَانُ فِي الْحَبَشَةِ وَالأَمَانَةُ فِي الأَزْدِ[٤]:

---

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دارایی‌و پادشایی‌و سەرداریی پیشەی هۆزی قورەیشە، داوەری‌و قازێتی‌و قەزاوەتیش پیشەی یاریدەدەرانە، بانگدانیش پیشەی حەبەشییەكانە، ئەمینداریی‌و دەسپاكیش پیشەی هۆزی ئەزدە! (ت- سەنەد غەریب).

٣٥٧٠- وَعَنْهُ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ قَيْسٍ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ الْعَنْ حِمْيَرًا. فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ جَاءَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ فَأَعْرَضَ عَنْهُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَحِمَ اللَّهُ حِمْيَرًا أَفْوَاهُهُمْ سَلاَمٌ وَأَيْدِيهِمْ طَعَامٌ وَهُمْ أَهْلُ أَمْنٍ وَإِيمَانٍ. روى الترمذي هذه الأربعة[٥]:

دیسان گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتبووین، پیاوێ (لە هۆزی قەیس) هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نەفرین بكە لە حیمیەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رووی لێ وەرگەڕان‌و رووی كرد بەولاوە، بەلاّم پیاوەكە لەولاوە چووە بەردەمی‌و دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رووی كردەوە بەولاوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لە هۆزی حیمیەر بێ، هەمیشە دەمیان بە سلاّووەیەو میللەتێكی نانبدەن‌و بێوەین‌و ئاسایش پەروەرن‌و خاوەنی باوەڕو بڕوان‌و بەدینن (ت- سەنەد غەریب).

٣٥٧١- بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلاً إِلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَسَبُّوهُ وَضَرَبُوهُ فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَوْ أَنَّ أَهْلَ عُمَانَ أَتَيْتَ مَا سَبُّوكَ وَلاَ ضَرَبُوكَ. رواه مسلم[٦]:

---

[٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٦] مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٤٢.

ئەبو بەرزە (خۆشنوودی خودای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی نارد بۆ ناو خێڵێ لە خێڵانی عەرەب لەوێ لێی دەدەن‌و جنێویشی دەدەن، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرو حاڵەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ئاخر ئەگەر بچوویتایە بۆ ناو خەڵکی عومان نەجنێویان پێ دەدایت‌و نەلێیان دەدایت (م).

## ٧٢) گەورەیی وڵاتی عەجەم: (فضل فارس)

٣٥٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْ كَانَ الدِّينُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَذَهَبَ بِهِ رَجُلٌ مِنْ فَارِسَ - أَوْ قَالَ مِنْ أَبْنَاءِ فَارِسَ - حَتَّى يَتَنَاوَلَهُ. روه مسلم[1]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای لەسەر بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر موسوڵمانەتی لەسەر ئەستێرەی کۆبێ بەو دوورییە، پیاوێ لە خەڵکی وڵاتی فارس یا فەرمووی: پیاوێ لە رۆڵەکانی وڵاتی فارس دەچێ بۆی‌و خۆیی دەگەیەنێتی‌و دەیقۆزێتەوە! (م).

٣٥٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ أُنْزِلَتْ حَتَّى عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ فَلَمَّا قَرَأَ (وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ) قَالَ لَهُ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِنَا؟ فَلَمْ يُكَلِّمْهُ. سَأَلَهُ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، قَالَ وَسَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ فِينَا. قَالَ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ فَقَالَ: لَوْ كَانَ الإِيمَانُ بِالثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلاَءِ. رواه الشيخان والترمذي[2]:

دیسان گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەربێ) دانیشتبووین، لەو کاتەدا سوورەتی جومعە هاتە خوارەوە بۆی، کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: {وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ - ٣/٦٢}.

---

(١) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٤٤.

(٢) مسلم. فضائل الصحابة: ٦٤٤٥.

واتە: هەر وا ئەم ڕەهبەرە نازدارە بەهۆی نامەی پیرۆزی خودایی‌و، فەرموودە بەرزەکانی خۆیەوە گەلێ کەسانی تریش لە موسوڵمانان فێری شەریعەتی خوداو خێری هەردوو جیهان دەکا، کە هێشتا ئەمانە وان لەبن پەردەی غەیب داو جارێ پەیڕەوی ئەمانەیان نەکردووە، بەڵام بە زوویی ئەوانیش وەك ئەمانە ئەم ڕێگە هەقە دەگرن. کە حەزرەت ئەم ئایەتەی خوێندەوە پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کێن کە ئەم ڕێگەی هەقی ئێمەیە بە زوویی دەگرن؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی نەدایەوە، تا پیاوەکە دوو جار یا سێ جار هەمان پرسیاری لێ دووبارە کردەوە، گوتی: لەو کاتەدا سەلمانی فارسیش لەناو کۆڕە کەمان دابوو جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی خستە سەر سەلمان‌و فەرمووی: ئەگەر ئیمان‌و ئیسلامەتی لەسەر ئەستێرەی کۆش بێ پیاوانێ لەمانە خۆیانی دەگەیەنێ! (ش/ت).

٣٥٧٤- ذُكِرَتِ الأَعَاجِمُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لأَنَا بِهِمْ أَوْ بِبَعْضِهِمْ أَوْثَقُ مِنِّي بِكُمْ أَوْ بِبَعْضِكُمْ. رواه الترمذي بسند غيب. والله التوفيق[٣]:

دیسان گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) باسی عەجەم کرا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) دەی من بەوان بە قام پترە تا بە ئێوە یا فەرمووی: دەی من بە هەندێ لەوان بتمانەم زیاترە هەتا بە هەندێ لە ئێوە! (ت- سەنەد غەریب).

٣٥٧٥- شرح المصنّف - (رضوان الله عليه) - كلمة (فضل فارس) بما يلي: أي أهل فارس وهم العجم سُكّان البقاع الشرقية الواقعة في شرقي الخليج الفارسي، كفارس وكرمان، وسجستان، وما وراء النّهر وخُراسان، تلك الّتي أنبتت رجال الحديث كالبخاري وأبي داود والترمذي والنّسائي والبيهقي والدّار قطني، رضى الله تعلى عنهم،

---

[٣] رواه الترمذي بسند غريب.

ومسلم وإن كانت إقامته مع هؤلاءِ الشُّمُوس ولكنَّه عربي الأصل فإِنَّه قُشيريٌّ – (رَضيَ اللهُ عَنْهُ)[٤]:

– المترجم –

دانـەر (رەزای خـوای لێ بێ) لـە راڤـەی ووشـەی (فـەضـلَی فـارس)دا دەڵـێ: مەبەست ئەو گەلانەیە كە عەرەب نین‌و خەڵكی ئەو وولاتەن كە لە كۆندا لەناو عەرەبەكانـدا بـە وولاتـی فـارس ناوبـانگی دەركـردووە، كـە بەمانـە دەگـوترێ عەجـەم، كـە بـرێتین لـە دانیشتووانی ئـەو ناوچـانە كـە خۆرهـەلاتن‌و دەكـەونـە خۆرهــەلاتی كەنــداوەوە، وەك ئێــران‌و كرمــان‌و سیــستان‌و ئــەو دیــو چــەم (ماوەرائەننـەهرەین)و: خۆراسـان، كـە ئـەم ناوچـانە ئـەو ناوچـە پیرۆزانـەن كـە پیـاوانی فـەرمـوودە زانـی وایـان تیـا هەڵكـەوتووە كـە بـوون بـە بـەردی بناغـەی عولـومی حـەدیـث (زانـستەكانی فـەرمـوودە) وەكـوو ئـەم پێـشەوا نـاودارو، بەرێزانە: بوخاری‌و ئەبو داوودو تیرمیذی‌و نسائی‌و بەیهەقی‌و دارە قوطنـی‌و موسـلیم (رەزای خوایـان لەسـەر بێ) ئیمـامـی موسـلیم (خـودای لێ رازی بـێ) ئەگـەر چـی لـە بنەڕەتـدا عەرەبـە، چـونكە لـە عـەرەبی هـۆزی قوشـەیرە، بـەلام ئـەویش پەروەردەی ئەو خاكەیە‌و لەناو ئەو ئەستێرە گەشانەدا رسكاوەو ژیاوە.

### ٧٣) گەورەیی وولاتی شام: (فضل الشام)

٣٥٧٦– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) إِنَّ رَسُول اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَـالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا. قَالُوا: وَفِي نَجْدِنَا. قَالَ: اللَّهُمَّ بَـارِكْ لَنَا فِي شَأْمِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا. قَالُوا: يَا رَسُـولَ اللَّـهِ وَفِـي نَجْـدِنَا قَـالَ: هُنَـاكَ الزَّلاَزِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا أَوْ قَالَ: وَمِنْهَا يَخْرُجُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ.رواه الترمذي هنا والبخـارى فى الفتن: فَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ: هُنَاكَ الزَّلاَزِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ[١]:

---

[٤] من شرح المصنف لا داعى للتخريج.

[١] بخارى. فتن: ٧٠٩٤.

ئیبنو عومەر (خۆشنوودی خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): پەروەردگارا! پیت‌و فەڕو بەرەکەت بڕژێنە بەسەر وولاتی شامماناا، پەروەردگارا! پیت‌و فەڕو بەرەکەت بڕژێنە بەسەر وولاتی یەمەنماناا یارانیش عەرزیان کرد: وە بیڕژێنێ بەسەر وولاتی نەجدیشماندا، فەرموویەوە: خودایە! پیت‌و فەڕ بڕژێنە بەسەر وولاتی شامماناا، پەروەردگارا! پیت‌و فەڕ بڕژێنە بەسەر وولاتی یەمەنماناا یارانیش عەرزیان کردەوە: وە بیڕژێنێ بەسەر وولاتی نەجدیشماناا فەرمووی: لەوێوە ئاژاوەو ئاشووب‌و پشێوی بەرپا دەبێ وە فەرمووشی: هەر لەوێشەوە شەیتان شاخ قوت دەکاتەوە (ت/ب) گفتەی (ب): لە جاری سێیەما فەرمووی: لەوێوە پشێویی‌و فەرتەنە دەکەونەوەو هەر لەوێشەوە شاخی شەیتان هەڵ دێ!

٣٥٧٧- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا فَسَدَ أَهْلُ الشَّامِ فَلاَ خَيْرَ فِيكُمْ لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ[٢]:

موعاوییەی کوڕی قوڕە (خۆشنوودی خودای لێ بێ) گوتی: باوکم گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکاتێ خەڵکی شام گەند بوون ئیتر کەڵکتان نامێنێ، کۆمەڵەیێ لەم ئۆمەتی منە هەر سەرکەوتوو دەبن، تا ڕۆژی قیامەت هەڵ دەسێ‌و تەواو نزیك دەبێتەوە، ئەوەی پاشقولیان لێ دەدا زیانیان پێ ناگەیەنێ (ت-س/ص).

٣٥٧٨- عَنْ بَهْزِش بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ تَأْمُرُنِي، قَالَ: هَا هُنَا. وَنَحَا بِيَدِهِ نَحْوَ الشَّامِ[٣]:

لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خۆشنوودی خودایان لێ بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ کام لایێ فەرمانم پێ دەکەی کە

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

لەکاتی روودانی فەرتەنەکاندا بچم بۆ ئەویٚ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی درێژ کرد بەرەو شام‌و فەرمووی: بۆ ئێرەوە! (ت-س/ص).

**٣٥٧٩**- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سَتَخْرُجُ نَارٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ تَحْشُرُ النَّاسَ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَمَا تَأْمُرُنَا قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالشَّامِ. روى هذه الثلاثة الترمذي في الفتن[٤]:

ئیبنو عومەر (رەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمویٚ: لە پێش رۆژی قیامەتدا ئاگریٚ لەلای حەضرەمەوتەوە سەر هەڵ دەدات مەردوم کۆدەکاتەوە بۆ حەشر. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! دەی فەرمانت بە چییە پێمان؟ فەرمووی: خۆتان بگەیەننە شام. (ت-س/ص).

**٣٥٨٠**- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نُؤَلِّفُ الْقُرْآنَ مِنَ الرِّقَاعِ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) طُوبَى لِلشَّامِ. فَقُلْنَا لأَيِّ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: لأَنَّ مَلاَئِكَةَ الرَّحْمَنِ بَاسِطَةٌ أَجْنِحَتَهَا عَلَيْهَا. رواه الترمذي بسند حسن. نسأل الله حسن الحال[٥]:

زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) لە پارچە چەرم‌و بەردو ئێسقانەکان ئایەتەکانی قورئانمان کۆدەکردەوە، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆشی لە خەڵکی شام گوتمان: قوربان! ئەوە لەبەرچی وا دەفەرمووی؟ فەرمووی: چونکە فریشتەکانی خودای میهرەبان باڵیان کێشاوە بەسەریدا (ت-س/ح).

## ٧٤) راسپێری (وەصیٚت)ەکەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربیٚ) دەربارەی خەڵکی میصر: (وصية النبي (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باهل مصر)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ادْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَاء اللّٰهُ آمِنِينَ - ١٢/٩٩}.

---

[٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٥] رواه الترمذي بسند حسن.

دەی بفەرموون بە خێرو خۆشی و ئاسوودەیی بڕۆنە ناو شاری میسر خۆیەوە!

٣٥٨١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا. أَوْ قَالَ: ذِمَّةً وَصِهْرًا فَإِذَا رَأَيْتَ رَجُلَيْنِ يَخْتَصِمَانِ فِيهَا فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ فَاخْرُجْ مِنْهَا. قَالَ: فَرَأَيْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ شُرَحْبِيلَ بْنِ حَسَنَةَ وَأَخَاهُ رَبِيعَةَ يَخْتَصِمَانِ فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ فَخَرَجْتُ مِنْهَا.وفي رواية: إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ أَرْضًا يُذْكَرُ فِيهَا الْقِيرَاطُ فَاسْتَوْصُوا بِأَهْلِهَا خَيْرًا فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا. رواه مسلم. نسأل الله السلام وكمال الإيمان: آمين[1]:

ئەبو زەڕ (خۆشنوودی خودای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درووودو ئاشتی و سڵاوی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: بەزوویی وولاتی میسر دەگرن و فەتحی دەکەن، لەو خاکە پارەیەکی لێیە ناوی قیراطە، خەڵکەکەی بە زۆری سەوداو مامەڵە بەو دراوە دەکەن، هەر کاتێ ئەویێتان فەتح کرد ئامۆژگاری و راسپێری من ئەوەیە کە زۆر زۆر باش بن بۆ خەڵکەکەی و ئامۆژگاری یەکتریش بکەن کە بۆیان باش بن، چونکە خەڵکی میسر سەرەڕای ئەوەی کە ئەهلی زیممەن و پەیماندارن و لەبەرئەوەی خاوەن نامەن، خاترو ڕێزو قەدری تایبەتی خۆیان هەیە، سەرەڕای ئەم پلەو پایە باشەیش خزمیشمانن (چونکە خاڵوانی ئیسماعیل پێغەمبەرن، کە بابە گەورەی پێغەمبەرە، چونکە دایکە هاجەرە لەوانە کە دایکی حەزرەتی ئیسماعیلە، - درووودی خودا لەخۆیی و خانەوادەو نەوەی پیرۆزی بێ). یا فەرمووی: چونکە ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە خاوەنی پەیمان و ئەمانن، خەزوورانیشمانن (چونکە مارییەی قیبطییە کە دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەرە لەوانە، – درووودی خودا لە خۆیی و نەوەو هاوسەرانی بێ). جا هەرکاتێ لەوێ دوو پیاوت چاو پێکەوت لەسەر جێگەخشتێ هەرایان بوو لەوێ

[1] مسلم. فضائل الصحابة. ٦٤٤٠.

مەمێنە. ئەبو زەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەوڕەحمانی کوڕی شورەحبیل و ڕەبیعەی برایم دی، لەسەر شوێنی خشتێ هەرایان بوو، ئیتر منیش لەوێ نەمام. لە گێڕانەوەیەکا: ئێوە بە زوویی خاکێ دەگرن، لەوێ باوباوی قیراتەو کڕین و فرۆشتن بەو دراوەیە، وەصیێت و ئامۆژگاری و ڕاسپێریتان دەکەم کە فرە خاس بن لەگەڵ دانیشتووانی، چونکە ئەو گەلی میسرە سەرەڕای خاوەن پەیمانی، خاڵوانیشمانن! (موسلیم گێڕاویەتەوە، نوقمی لێشاوی میهری خودا بێ).
بەندە (کە وەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەیەم) بە پێی ڕەفت و عەمەل بە چەمك و مەفهوومی ئەم فەرموودەیە، بە نیازی وەشاندنی تۆوی برایەتی لە نێوانی گەلە موسوڵمانەکانا، کە هەریەکەی لقێکن لە ئۆمەتی موحەممەدی پیرۆز دەڵێم لە پەسنی میسردا:

میسر! کیژێکی چەن خان و مانی!
بووکی ڕوو سووری هەردوو جیهانی
گوڵی گەشاوەی، چون کوردستانی
جێگەی زانست و دین و قورئانی!
بەستە بۆ قەدرو سەربەرزی و جوانی
کە بۆ حەزرەت و کوڕی خاڵوانی!
لە سایەی خواوە خاکی یەزدانی
بۆ ئیسلام بوویتە وەتەنی سانی!!
ئەزهەر گوڵێکە، گوڵ بە گوڵی خۆی
شەیدای ڕوویەتی و ئاشقە بەبۆی!
ئێستاش هەمیشە وەکوو بیارە
سەرچاوەی عیلم و دینی ئازادارە!
فێرگەی بیارە، لەو دێ کەنارە

وەک زانکـــۆی ئەزهـــەر بـــەرزو نـــاو دارە

شــــێخی بیـــــارە لـــەو ســــەر ســـــنوورە

چـون شـێخی ئەزهـەر وەک کـێوی نـوورە!

لــــە کــــۆن‌و نوێــدا ئـــەم پــەنا جوانـــە

جێــــی حەوانـــەوەی نـــەوەی کوردانــــە!

گــەلێ کــوردی مــەرد لــەو شــارە جوانــە

شـــاکاری جـــوانی لـــەوێ میوەانــــە!!

کــەی نیــل زێــی نــاوە؟ رووبــاری عیلمــە

هــەرلا ســەیر دەکــەی نمــێ لــەو نمــە!

دەبــارێ وێنــەی تیــشکی مــانگ‌و خــۆر

شـاگوڵ شـین دەکـا، زەردو سـپی‌و سـۆر

گــوڵی هەمــە رەنــگ، بــاخی هەمــە جــۆر

خـــەمڵیوە وێنـــەی دەشـــتی شـــارەزۆر!

ئـــەم تاجـــە کـــەوا تـــاجی مەردییـــە

دانــەر میــصرییەو وەرگێــڕ کوردییــە!

گوڵێکـــە وێنـــەی چـــامەی بوردییـــە

موتوربــەی دوو رەنــگ: چــون ئەحمەدییــە

ئێمـــــە قـــــسەمان لــــــە موســــوڵمانە

لــــە گــــەلی میــــصری بـــراى، خۆمانــــە

دەنــــا دەبــــانی دەســــتی زەمانـــــە

دەجنــێ بــە ئــۆرە جــەرگی ئــەم دوانــە

مــــەلای بیــــارە! تـــۆ دەنکــــی دوڕی

نازانم بۆچی ناوی خۆت گۆڕی؟
ئاخ بۆ بیارە! کەی بێ جارێ تر
لەوێ سوختەبم، یاخۆ مجێوور
ئەرکی سەرشانم بە پێی پشکی دەو:
سەماوەر جۆش دەم بە فووی زۆر بتەو(*)
جار جار دەستی شێخ: شێخی عەلادین
زیارەت بکەین لەگەڵ مەحاسین!
نووری بەوەندەش ڕازییە قوربان
بەخەو ڕێی بدەن بێ بۆ خزمەتتان
لەگەڵێ وایە وەحشی ئەو کێوەم
لێ خۆم دەزانم دەروێشی نێوەم!!

## ٧٥) باسی گەورەیی‌و بەهرەوەری ئۆمەتی موحەممەد (درووودی بێ شومارو بێ پایان لەسەر خۆی‌و ئۆمەتی بێ) (کە گەلی کوردیش لە سایەی خوداوە سەرجەم لەم ئۆمەتە پیرۆزەن):

**فضل الأمة المحمدية** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ صدق الله العظيم – ٣/١١٠}.

---

(*) خۆزگەم وەکوو جاران دەبووم
بەپێ هەتا بەغدا دەچووم
نەکوو وەکوو ئێستام دەبووم
دەڵێی دیلی ژێر دەستی جووم

- ٢٠٠٧ – ٢٧/١٠ * وەرگێڕ-

واتە: ئێوە ئەی ئۆمەتی موحەممەد! چاكترین ئۆمەتێكن كە خودا بە خێرو خۆشی هێناونییەتە ناو كایەوەو زۆر بەرێك‌و پێكی خودا لە كڵ دەری كردوون‌و كردوونی بە گوڵێ لە پێشانگای جیهان‌او لە نمایشتگای دەورانا‌و لەبەر چاوی ئەو خەڵكانە داینـاون، هۆی سەرەكی ئەم دەستی قەدر لێنانەی خودای گەورەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سێ پیشە باشانە:

**یەكەم:** فەرمان دەكەن بە چاكەو لە هەمان كاتا رەفتی پێ دەكەن.

**دووەم:** بە كردارو بە رەفتارو بەدەم‌و دەس‌و دڵ جڵەوگیری دەكەن لە هەموو جۆرە خراپەیێ.

**سێیەم:** ئیمان‌و باوەڕتان هەیە بە خودا لەسەر شێوەیەكی جوان، دیارەو بەڵگە نەویستە كە خاوەن باوەڕی راستیش هەمیشە نزیكە لە چاكەو دوورە لە خراپە ئەگەر خاوەن نامەكان (ئەهلی كیتابە ئاسمانییەكان) باوەڕ بهێنن‌و وەكوو ئێوە ئەم رێگە هەقەیە بگرن ئەوە بۆ خۆیان باش دەكەن، بازێ لەوان خاوەن باوەڕو بڕوان‌و بڕوادارن بەڵام بەشی زۆریان بەدكارو نابارو ناهەموارن.

٣٥٨٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَثَلُ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَأْجَرَ قَوْمًا يَعْمَلُونَ لَهُ عَمَلاً يَوْمًا إِلَى اللَّيْلِ فَعَمِلُوا إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ، فَقَالُوا لاَ حَاجَةَ لَنَا إِلَى أَجْرِكَ فاسْتَأْجَرَ آخـرين فَقـال أكملـوا بقيَّة يومكم ولكم الَّذى شَرطَت هؤلاءِ فَعَمِلُوا حَتَّى إِذَا كَانَ حِينُ صَلاَةِ الْعَصْرِ قَالوا لَكَ مَا عَمِلْنَا فاسْتَأْجَرَ قَوْمًا فَعَمِلُوا بَقِيَّـةَ يَـوْمِهِمْ حَتَّـى غَابَـتِ الـشَّمْسُ، وَاسْـتَكْمَلُوا أَجْـرَ الْفَرِيقَيْنِ[1]:

ئـەبو مووسـا (رەزای خـوای لێ بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: داستانی موسوڵمانەكان‌و جوولەكەكان‌و دیانەكان وەك داستانی

---

[1] بخاری. فضل صلاة العصر: ٥٥٨ ، ٢٢٧١. (تجرید/ كوردی / ١ / ٣٣٠ رقم/ ٣٢٨. ٥٥٧ ، ٢٢٦٨ ، ٢٢٦٩ ، ٣٤٥٩ ، ٥٠٢١ ، ٧٤٦٧ ، ٧٥٣٣. اخرجه مسلم. العینی/ ٥ / ٥١ رقم/ ٤٣).

پیاوێ وایە کە دەستەیێ بەکرێ بگرێ کە هەتا ئێوارێ کارێکی خۆیی بۆ تەواو بکەن، کرێکارەکان تا نیوەڕۆ ئیش دەکەن‌و دەڵێن: نە کرێی تۆمان دەوێ‌و نە ئیش دەکەین، کارەکە بە نیوەچڵی بەجێ دەهێڵن، پیاوەکەش تاقمەیەکی تر بەکرێ دەگرێ‌و پێیان دەڵێ: ئێوە ئەم تاقی ئێوارەیە تەواو بکەن ئەو کرێیەی دەمدا بەوان هەمووی دەدەم بە ئێوە، جا ئەوانیش هەتا کاتی نوێژی عەصر ئیش دەکەن‌و دەس هەڵ دەگرن‌و دەڵێن ئیتر کارناکەین‌و هەرچیشمان کردووە بۆ خۆت‌و چیمان کرێ دەکەوێ نامانەوێ ئەویش بۆ تۆ بێ! ئەوجا پیاوەکە دەستەیەکی تر بە کرێ دەگرێ، ماوەی ئەو ڕۆژە (واتە لە نوێژی عەسرەوە تا خۆر ئاوا دەبێ) کاردەکەن‌و سەر ڕاست دەردەچن‌و بە تەواوی کرێی هەردوو تاقمەکانی تریان وەرگرت بۆ خۆیان. (ب/مالك/ئەحمەد/ت– خودایان لێ ڕازی بێ)

٣٥٨٣– عَنْ ابنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: إِنَّمَا بَقَاؤُكُمْ فِيمَا سَلَفَ قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ، أُوتِيَ أَهْلُ التَّوْرَاةِ التَّوْرَاةَ فَعَمِلُوا بِهَا حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ عَجَزُوا، فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُوتِيَ أَهْلُ الإِنْجِيلِ الإِنْجِيلَ فَعَمِلُوا إِلَى صَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ عَجَزُوا، فَأُعْطُوا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، ثُمَّ أُوتِينَا الْقُرْآنَ فَعَمِلْنَا إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ، فَأُعْطِينَا قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، فَقَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ أَيْ رَبَّنَا أَعْطَيْتَ هَؤُلاَءِ قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، وَأَعْطَيْتَنَا قِيرَاطًا قِيرَاطًا، وَنَحْنُ كُنَّا أَكْثَرَ عَمَلاً، فَقَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ أَجْرِكُمْ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ فَهُوَ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ أَشَاءُ. رواهما البخاری ومالك وأحمد والترمذی[٢]:

ئیبنو عومەر (خۆش نوودی خودایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودو ئاشتی‌و سڵاوو سۆزی خودای گەورەو میهرەبانی لەسەر بێ) فەرمووی: ماوەی مانەوەی ئێوە لەچاو ئەو نەتەوانەی تردا کە لە پێش ئێوەوە ڕۆیشتون بەقەد نێوانی نوێژی عەسرو نوێژی شێوانە، تەورات خەڵات کرا بە دەستەی تەورات، هەتا نیوەڕۆ ڕەفت‌و

---

[٢] بخاری. مواقیت الصلاة: ٥٥٨ ، ٢٢٧١.

كاریان پێكردو ئیتر كۆڵیاندا، وە هەر یەكەی سەرو قیراتیان پێدرا، لەپاشا ئینجیل خەڵات كرا بە دەستەی ئینجیل، ئەوانیش هەتا نوێژی عەسر رەفت‌و كاریان پێكردو كۆڵیاندا، ئەوانیش یەكی سەرو قیراتی خۆیان وەرگرت، ئینجا ئەم قورئانە بە خەڵاتی درا بە ئێمە، وە ئێمە تا نوێژی شێوان كارمان پێكرد، وە یەكی سەرو دوو قیراتمان وەرگرت، جا دەستەی تەورات‌و ئینجیل گوتیان: پەروەردگارا! بۆ بەمانە یەكی دوو قیراتت داو بەڵام بە ئێمە یەكی یەك قیرات؟ لەگەڵ ئەوەشا كە ئێمە كارمان زۆرتر كردووە! خودای گەورەو سەروەریش دەفەرموێ: ئایا لە پاداشی خۆتان هیچ كەمترم داوە پێتان؟ دەڵێن: نەخەیر، دەفەرموێ: دەئەوە بەش‌و بارەی خۆمە بەكێ ئارەزوو بكەم دەیدەمێ (ب/مالیك/ئەحمەد/ت).

٣٥٨٤- عَنْ سَعْدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلَ النّبى (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْعَالِيَةِ فَمَرَّ بِمَسْجِدِ بَنِي مُعَاوِيَةَ دَخَلَ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ وَصَلَّيْنَا مَعَهُ وَدَعَا رَبَّهُ طَوِيلاً ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَيْنَا وَقَالَ: سَأَلْتُ رَبِّى ثَلاَثاً فَأَعْطَانِي إِثْنَتَيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً: سَأَلْتُ رَبِّى أَنْ لاَ يُهْلِكَ أُمَّتِى بِالسَنَةِ فَأَعْطَانِيهَا وَسَأَلْتُهُ أَلاَّ يُهْلِكَ أُمَّتِى بِالْغَرَق. وفى رواية: أَلاَ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَلاَّ يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذى[٣]:

سەعد (خودای لێ خۆش نوودو رازی بێ) گوتی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئەلعالییەوە تەشریفی برد بۆ مزگەوتەكەی بەنی موعاوییە، چووە ناو مزگەوتەكەوەو دوو ركات نوێژی تیا كرد، ئێمەش لەگەڵیا ئەو نوێژەمان كرد، وە زۆر پاڕایەوە لە خودا، ئینجا هاتەوە بۆ لای ئێمە فەرمووی: سێ شتم لە خودا داواكرد، دوو شتیانی پێمدا بەڵام ئەوی تریانی نەداپێم: داوام لە خودای خۆم كرد كە ئۆمەتم بە ساڵی گرانی‌و قاتی‌و قڕی قڕنەكا، خودا ئەمەی پێمدا، وە داوام لێكرد كە ئۆمەتم بە نوقم بوون‌و لافاوی گەورە لەناو

---

[٣] مسلم. فتن: ٧١٨٩.

نەبا، خودا ئەمەیشی پێ خەڵات کردم لە گێڕانەوەیەکا: کە دوشمنی خۆشیان بەسەردا زاڵ نەکا کە لە موسوڵمانان نەبێ، خودا ئەمەشی دامێ وە داوام لێکرد کە خۆخۆر نەبن بەڵام ئەمەی نەدامێ (م/د/ت).

٣٥٨٥- ولأبي داود: إِنَّ اللَّهَ أَجَارَكُمْ مِنْ ثَلاَثِ خِلاَلٍ: أَنْ لاَ يَدْعُوَ عَلَيْكُمْ نَبِيُّكُمْ فَتَهْلِكُوا جَمِيعًا، وَأَنْ لاَ يَظْهَرَ أَهْلُ الْبَاطِلِ عَلَى أَهْلِ الْحَقِّ وَأَنْ لاَ تَجْتَمِعُوا عَلَى ضَلاَلَةٍ[٤]:

ئەبو داوود (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: خودا لەم سێ شتە پەنای داون: لەوە کە پێغەمبەرەکەتان نزای شەڕتان لێ بکاو بە نزای ئەو سەرجەم لەناو بچن، لەوەش کە دەستەی ناهەق زاڵ بن بەسەر دەستەی هەقدا" لەوەش کە لەسەر گومڕایی و ناهەقی رای هەمووتان یەك بگرێ!

٣٥٨٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قالَ: أُمَّتِي هَذِهِ أُمَّةٌ مَرْحُومَةٌ لَيْسَ عَلَيْهَا عَذَابٌ فِي الآخِرَةِ عَذَابُهَا فِي الدُّنْيَا الْفِتَنُ وَالزَّلاَزِلُ وَالْقَتْلُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ واطبراني والحاكم بسند صحيح[٥]:

ئەبو مووسا (خودای لێ خۆش نوود بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم ئۆمەتی منە خودا بە رەحمە لە گەڵیاناو گەلێکی رەحم پێکراون، لە قیامەتا سزای سەخت نادرێن، سزای جیهانیشیان برێتییە لە پشێوی و فەرتەنەو بوومەلەرزەو کوشتن و برین و شەڕوشۆڕ (د/تەبەرانی/حاکم:ص).

٣٥٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم والبيهقي[٦]:

---

[٤] رواه ابو داود في الفتن والملاحم (شرحه).

[٥] رواه أبو داود في الفتن والملاحم (شرحه).

[٦] رواه أبو داود في الفتن والملاحم (شرحه).

**ئەبو هورەیرە** (بە شەوو بە رۆژ نوورو رەحمەت‌و رەزای خودای گەورە لە خەوگەی پیرۆزی وەك بەهارە باران بباریێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرمویێ: لەسەری هەموو سەد ساڵێکا خودا بە لوتفی خۆی کەسێ دەنێرێ بۆ ئەم ئۆمەتە، سەر لەنویێ ئایینەکەی بۆ نویێ دەکاتەوە (د/حاکم/بەیهەقی-س/ص).**

**٣٥٨٨- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنْ النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَثَلُ أُمَّتِي مَثَلُ الْمَطَرِ لاَ يُدْرَى أَوَّلُهُ خَيْرٌ أَمْ آخِرُهُ. رواه الترمذى والحاكم ولفظه: أمَّتى أمَّةٌ مرحومةٌ مغفورٌ مُتابٌ لها عليها[٧]:**

**ئەنەس** (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نوورو رەزای خودای گەورەو مەزن بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درووددو سڵاوو ئاشتی خودای گەورەی لەسەر بێ) **دەفەرمویێ: ئۆمەتی من وەك بارانی رەحمەت وایە، خوا حەزکاو خوا یاربێ بۆ باشی‌و چاکی فەرقی ئەوەڵ‌و ئاخری نییە (ت-س/ح-حاکم) گفتەی (لەفز)ی حاکم** (خودای لێ رازی بێ) **ئاوایە: ئۆمەتی من خودا بە رەحمە لەگەڵیا، ئۆمەتێکی خودا پێداوە، خودا گوناهی دەپۆشێ‌و تەوبەو پەشیمانیی لێ گیرا دەکا.**

**٣٥٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لاَ يَجْمَعُ أُمَّتِي - أَوْ قَالَ أُمَّةَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى ضَلاَلَةٍ**

---

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

وَيَدُ اللّٰهِ مَعَ الْجَمَاعَةِ وَمَنْ شَذَّ شَذَّ إِلَى النَّارِ. رَوَاهُ الترمذى فى كتاب الفتن. نَسْأَلُ الله السلامة من الفتن فى الدنيا والآخرة. آمين[٨]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای مەزن نایەڵێ كە ئۆمەتی من یا فەرمووی: كە ئۆمەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ) هەموو پێكەوە لەسەر گومڕایی‌و ناهەقی كۆببنەوە! خوداش بۆ خۆی پشتیوانی كۆمەڵە، جا ئەوەی لەگەل تەرابێ‌و لە كۆمەڵەی موسوڵمانان خۆی جیا بكاتەوە ئاگری دۆزەخ زوو یا درەنگ دەیقۆزێتەوە! (ترمیذی ریوایەتی كردووە، ڕەزای خودای لێ بێ).

((ڕەواهو دداره قوطنی حەددثەنە تترمیذی))

تۆ كلی چاوی منی، چیمە لە تۆپ‌و دەرزی

مەلا مەسئوولی دینە، ئەركی ئەو دین زانینە

ئەو نە پسپۆڕی پیشە، نەكاری كان دۆزینە!

لە كیسچوونی ئەمانە، سووچی پسپۆڕەكانە

سووچی پیشە سازەكان لەگەڵ میری زەمانە!!

ئەوەی لە جێی خۆی مابێ لەو وولاتی خۆمانە

(لە فەزڵی خوا بەزیاد بێ) تەنیا مەلاو قورئانە!!

---

[٨] رواه الترمذي في كتاب الفتن.

دیـــنم دینـــی خودایـــە، خـــاوەنی خـــۆی وریایـــە

تیـشکی خـۆری نیـوەڕۆ، قـەت بـەفوو لـەبن نایـە!

مـــەلا زانـــاو دانایـــە، خۆشەویـــستی خودایـــە

دۆسـتی دۆسـتی خودایـە، لـەجێی ڕەسـولەڵڵایە"

خۆزگـەم بـەوەی مەلایـە، سـەر بـەرزی لای مەولایـە

سـنگی قورئـانی تیایـە، هەناسـەکەی شـیفایە!

مـەلاو مێـزەری سـەری، ریـش و جبەکـەی بـەری

دەزانـی چـییە نـووری!؟ ئاسمـانی پـڕ لەپـەری![1]

---

[1] پەری: مەلەك، مەلاك (فەرهەنگی ئەستێرە گەشە) مامۆستا مـەلا مەنـصوور عـەلی ناصیف (گـۆڕی پـیرۆزی نـوقمی بلێسەی تیشکی خـودا بـێ) لێـرەدا دەفـەرموێ: لـە سایەی خـوداوە چاپکردنی بەرگی سێیەمی تاج تەواو بوو، وە ژمارەی فەرمووده (حەدیس)ەکانی (١٣١٥) هەزارو سێ سەدو پازدە فەرمودەیە، وە بەدوای ئەما بەرگی چوارەم دێ، سـەرەتاکەی (نامـەی قورئـانی پیرۆزو تەفسیری قورئانە).

بەندەیش دەڵێم: لە سایەی لوتف و کەرەمی خوداوە لێ بوومەوە لە وەرگێڕانی ئەم بەرگە لـە ١/ سـەفەری/ ١٣٩٤ کۆچـی بـە ڕێکـەوتی ١٩٧٦/٢/٢ زاینـی. ئەمڕۆکـەش کـە سـێ شـەممەیە (٢٢)ی رەجـەبی سـاڵی ١٤٠٩ك بـە ڕێکـەوتی ١٩٨٩/٢/٢٨ لـە نووسـینی پاکنووسـی ئـەم بەرگـە (کـە لـە کوردییەکەی لای مندا بەرگی پێنجەمە) بوومەوە ژمارەی حەدیسەکان تـا ئێـرە دەکاتـە (٣٩٠٠) حەدیس. لە خودا بەزیادبێ. - وەرگێڕ -

نووری فارس حمە خان حەسن - کەرکووك – مستشفی کرکوك العسکری

ئەمرۆکـەش کـە ڕێکـەوتی ٢٠٠٨/٧/٧/ بـە دەسـتی خـۆم لەسـەرتاوە هـەتا ئێـرە، تـەنقیحم کردووە، خوا پارمەتیمان بدا سەر تەنقیحی بەرگەکانی تریشی. ئـەم چاپە بەپـشتی خـودا زۆر نایاب دەردەچێ، چونکە سوپساو بۆ خودا حەدیسەکانیشم تەخریج کردووە. (وەرگێڕ)

# فهرس المواضيع

| زنجیرە | پێڕستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٢٩ | فەرمانڕەوا وەزیرو شالیارو کاربەدەستی باشی لێهاتوو هەڵ دەبژێرێو.... | ٨٩ |
| ٣٠ | دڵسۆزی بۆ فەرمانڕەوا | ٩٢ |
| ٣١ | بەرتیلو دیاری بۆ کاربەدەست ناڕەوایە | ٩٤ |
| ٣٢ | فەرمانڕەوا هەقی هەیە کە کەسێکی بڕوا پێکراو بکا بە جێگری خۆی | ٩٨ |
| ٣٣ | **بەشی چوارەم: باسی دادوەری (القضاء) خودا لەگەڵ دادوەر (قازی)....** | ١٠٠ |
| ٣٤ | کۆکردن لە دادوەریی | ١٠٢ |
| ٣٥ | دەستوورو یاسای دادوەریی | ١٠٢ |
| ٣٦ | بەڵگەو نیشانە لەسەر داواکارە داوالێکراویش (ئەگەر نەچووە ژێری) ... | ١٠٤ |
| ٣٧ | چۆنێتیی سوێند خواردن | ١٠٦ |
| ٣٨ | باسی شایەت | ١٠٦ |
| ٣٩ | هەڕەشەکردن لە شایەتی درۆ | ١٠٨ |
| ٤٠ | **بەشی پێنجەم: باسی تێکۆشین (إجتهاد)** | ١١٠ |
| ٤١ | دادپرس بۆی هەیە گومانبار (موتتەهەم) حەپس بکا | ١١٥ |
| ٤٢ | بڕیاری دادپرس (قازی: دادوەر) ناڕەوا ناکا بە ڕەوا، واتە بە حوکمی.... | ١١٥ |
| ٤٣ | دانانی ناو بژێکەر (حەکەم) دروستە | ١١٧ |
| ٤٤ | دوا وتار باسی ڕێککەوتن (صوڵح) | ١١٨ |
| ٤٥ | **نامەی سوێندو نەزر** | ١٢٠ |
| ٤٦ | **باسی یەکەم: باسی سوێند خواردن.** | ١٢٠ |
| ٤٧ | سوێند تەنیا بە ناوێ لە ناوەکانی خودای گەورە دەخورێو بەس | ١٢٠ |
| ٤٨ | کەسێ بە شتێکی تر (جگە لە خودا) سوێند بخوات گوناهبار دەبێ | ١٢٢ |
| ٤٩ | سوێندی ماڵ وێرانکەر | ١٢٤ |
| ٥٠ | ڕقە بەرێو پێلێداگرتن لە سوێندا نابێ | ١٢٦ |
| ٥١ | سوێندی بێ بایەخ- سوێندی بێ هوودە | ١٢٧ |
| ٥٢ | سوێند بەپێی نیازی سوێند دەرە نەك بەپێی نیازی سوێند خۆر | ١٢٨ |
| ٥٣ | ئەگەر لە دوا سوێندەوە گوتی خودا حەزکا (ان شاو الله) سوێندی ناکەوێ | ١٢٩ |
| ٥٤ | **باسی دووەم: باسی نەزر (فوتوو)** | ١٣٠ |
| ٥٥ | گێڕانەوە (قەزا)ی نەزری مردوو | ١٣٤ |
| ٥٦ | نەزرکردنی شتێ کە لە دەستی نەبێ دانامەزرێ، هەروەها گوناه نەزرکردنیش | ١٣٥ |

| زنجیرە | پێرستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
|  | ٣٠٧ |

| زنجیرە | پێڕستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|

# التَّاجُ
# ألجَامِعُ لِلأُصُولِ
## في أحاديث الرَسُول ﷺ

تأليف الشيخ منصور علي الشريف
من علماء الأزهر الشريف

المجلّد الثالِث

دار المعرفة
بيروت . لبنان